پرۆفیسۆر . دکتۆر . وەدیع جوەیدە

# جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد

## بنەماو پەرەسەندنی



لەئینگلیزیەوە : ی. پرۆفیسۆر . د. یاسین سەردەشتیی

چاپی یەکەم

٢٠٠٨ ز

پرۆفیسۆر. دکتۆر. وەدیع جوەیدە

# جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد
## بنەما و پەرەسەندنی

لە ئینگلیزییەوە: پرۆفیسۆر.ی.د. یاسین سەردەشتیی

سلێمانی 2008

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە :

- هەموو ئەو رابەرانەی وەك پێشەوا قازیی محەمەد و گاندی و ماندێلا کاتێك چوونە سەر تەختی دەسەڵات خۆیان لێنەگۆڕرا و سەلماندیان کە خاوەن رەوشتی بەرز و گیانی مرۆڤدۆستانەن و نەبوونە دیکتاتۆری کوێر و بازرگانێکی چاوبرسیی بەسەر ئازار و نەهامەتیی رەش ورووتی گەلەکانیانەوە .

- ئەو قارەمانانەی لە زاب و ئورەمار لوتی سوپای تورکی فاشیستیان شکاند .

- ئەو کوردە ئازادیخوازانەی نزیکەی مانگ و نیوێکە لە زیندانەکانی رژێمی کۆماری ئیسلامییدا مانیان لە خواردن گرتووە .

- نووسەری کورددۆستی راستبێژی تورك بەرێز ئیسماعیل بێشکچی .

- یادی نووسەری ئەم کتێبە رەوانشاد پرۆفیسۆر دکتۆر وەدیع جوەیدە

## نێوەرۆك


گوتەی وەرگێڕ ٦

پێشەکیی ١٧

بەشی یەکەم : پێشینەیەکی جوگرافیی ، مێژوویی ، کەلتووریی ٢٢

بەشی دووەم : ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی کورد ٧١

بەشی سێیەم : سەرکوتکردنی ڕژێمە نیمچە ئۆتۆنۆمەکانی کوردستان ١٢٤

بەشی چوارەم : شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی ١٦٩

بەشی پێنجەم : کاریگەریی شۆڕشی تورکە لاوەکان لەسەر نەتەوایەتیی کوردیی ٢٢٤

بەشی شەشەم : سیاسەتی ڕووسیا لەحاست کورد ٢٥٣

بەشی حەوتەم : کورد و جەنگی یەکەمی جیهانیی ٢٧٥

بەشی هەشتەم : هەلومەرجی کورد لە تورکیا ، ئێران و سوریا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی ٢٩٢

بەشی نۆیەم : ئاڵۆزییەکانی لیوای موسڵ و هەولێر لە کوردستانی عێراق پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی ٣٢٠

بەشی دەیەم : شێخ مەحموود و سەرهەڵدان و لەناوچوونی هاوپەیمانیەتیی باشووری کوردیی لە کوردستانی عێراق پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی ٣٤٥

بەشی یازدەیەم : دووەمین ڕاپەڕینی شێخ مەحموود ٣٩٦

بەشی دوازدەیەم : شۆڕشەکانی کورد لە تورکیا ٤٣٣

بەشی سیازدەیەم : ڕاپەڕینی بارزانیی ١٩٣١-١٩٣٢ ٤٨٦

بەشی چواردەیەم : ڕاپەڕینی بارزان بەڕێبەری مەلامستەفا (١٩٤٢-١٩٤٥) و پەرەسەندنی ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکان ٣٨٩

بەشی پازدەیەم :کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد ٥١٥

بەشی شازدەیەم : کێشەی کوردستان پاش کەوتنی مەهاباد ٥٦١

دەرئەنجام ٦٠٧

# گوتەی وەرگێڕ

ئاشکرایە کە نەتەوایەتیی بەگشتیی پرۆسەیەکی مێژووکردە و لەگەڵ قۆناغە جیاوازەکان و رەوتی رووداوەکانی ژیانی مرۆڤایەتیی کارلێك و ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و لەقاڵبێکی چەقبەستوودا نامێنێتەوە ، هەربۆیە ئەستەمە بتوانرێت بۆ نەتەوایەتیی هەر نەتەوەیەك ساڵێك یان رووداوێکی مێژوویی دیاریکراو خاترجەمانە بکرێتە خاڵی دەستپێکردنی، بێ ئەوەی جێگەی مشتومڕو پەسەندکردن و رەتکردنەوە بێت .چونکە نەتەوایەتیی ریشە و بنەماگەلێکی فرەی هەیە ، کە هێندێکیان مێژوویەکی دێرینیان هەیە و لە کوانووی پرۆسەیەکی مێژووییدا دەخەمڵێن و پاشتر بەرەو مەیین دەچن . ئەوەش وادەکات نەتەوایەتیی هەر نەتەوەیەك لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی خۆیدا بە ئاست و تین‌وتاو و پێگەیشتنی جیاواز خۆی بنوێنێت ، چونکە نەتەوایەتیی وەك چەمك ، هەست و سۆز ، هۆشیاریی ، گوتار و ئیدۆلۆژیا هەروەها جوڵانەوە ، بەیەك ئاست و لەیەك کات و بە یەك رەوتی نەگۆڕ خۆدەرناخەن .

لەو رووەشەوە نموونەی مێژووییمان هەیە ، نەتەوە و نەتەوایەتیی فەرەنسیی لەرۆژی هەڵکوتانە سەر قەڵای باستیل و شۆڕشەکەی ساڵی ١٧٨٩وە دەستپێناکات ، بەڵکو ریشەیەکی فرە قووڵتری هەیە . وێڕای ئەوەی نەتەوایەتیی فەرەنسیی لە سەردەمە جیاوازەکانی شۆڕش و دواتر سەردەمی ناپلیۆن و شەڕەکانی و هەروەها لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیی و دواتر لە قۆناغی دیگۆلدا یەك شێوە و رووخسار و نێوەرۆکی نەگۆڕ و لەقاڵبدراو نین . گوتەیەکی وەها بۆ ئەڵمانەکان و نەتەوایەتیی ئەڵمانییش راستە ، چونکە ئەو نەتەوایەتییە لە سەردەمی بسمارك و لە ساڵانی جەنگی یەکەم و دواتر قۆناغی دەسەڵاتی نازێتیی هێتلەریی یەك نۆرم و یەك فۆرم نین و تایبەتمەندییەکانیان لە یەکتر جیاوازە .بەڵام خاڵە هاوبەشەکان لە تەواوی قۆناغەکاندا دەگونجێت پاراستنی بەرژەوەندیی وڵات و یەکخستنی نەتەوە و بەهێزکردنی دەسەڵاتی نەتەوەیی و خۆشەویستی نیشتیمان و وەستانەوە دژی هەڕەشە و مەترسییەکانی سەر سەروەریی و ژیانی نەتەوەیی بەشێوەی جیاواز خۆبنوێنن . جگەلەوەی هەلومەرج و تایبەتمەندییەکانی ناوچە جیاوازەکانی جیهان وایکردووە نەتەوایەتیی نەتەوەکانیش لە قۆناغی جیاوازدا خۆبنوێنن و گەشە بکەن . بۆ نموونە نەتەوایەتیی ئینگلیزیی پێش

ئەمەریکییەکانە ، نەتەوایەتیی گەلانی ئەورووپای رۆژئاوا پێش گەلانی ئەورووپای رۆژهەڵاتە ، نەتەوایەتیی گەلانی ئەورووپا پێش گەلانی ئاسیا و ئەفریقایە ، وێڕای ئەوەی مەرج نیە رەگەزەکانی نەتەوایەتیی گەلانی ئەورووپا لە ئاسیا و ئەفریقا ریشەدارترو لە مێژوودا رەگ داکوتاوترین گەر بە پێچەوانەوە نەبێت.

سەبارەت بە نەتەوایەتیی کوردیی ، دەبێت دان بەو راستییەدا بنرێت کە ریشە و رەگەزە پێکهێنەرەکانی نەتەوەیی کورد لە : رەگەز ،زمان ، کەلتوور ، داب‌ونەریت ..هتد بە قوڵایی مێژوودا رۆچووە و بە سەرەدەمێکی زۆر کۆن دەگەڕێنەوە ، خۆشەویستی زێد و شانازیی بە خۆوەکردن و بەرگریی لە خاك بەدژی پەلاماری بێگانەی داگیرکەریش لە قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی کوردا نموونەی هەیە.ئەحمەدی خانی لە شاکاری مەم و زین دا سێ سەدە لەوەپێش خۆشەویستیی نێوان دوورەگەزەکە تێکەڵ بە خۆشەویستی زێد و خاك دەکات و بەشێوەکی کوردانە لە هۆنراوەدا دایدەڕێژێت . هەروەها پاشتر لەسەدەی هەژدەیەم و سەرەتای نۆزدەیەمدا گوتاری کوردبوون و بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی رامیاری‌و کارگێڕیی لەلایەن کورد خۆیەوە و ملنەدان بە خواستی بێگانەی سوڵتان و شاهەنشا ستەمکارەکانی تورك و عەجەم لە بەرهەم و گوتاری هێندێك لە هۆنەرانی کورددا دەردەکەوێت .بەڵام ئەوەی جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی رامیاریی و کۆمەڵایەتیی جەماوەریی پێگەیشتووی کوردیی بە گوتارێکی نەتەوەیی رووتی ئاشکرای سەربەخۆخوازانەوە تا نزیکەی ناوەراستی سەدەی نۆزدەیەم سەریهەڵدابێت ، ئەوەیان مێژوو نایسەلمێنێت .

جوڵانەوەی نەتەوەیی وەك دیاردەیەکی رامیاریی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و رۆشنبیریی هاوچەرخ ، دیاردەیەکی جیهانیی و بەرهەمی قۆناغی مۆدێرنەیە و لەسایەی ئاکامەکانی قۆناغی رۆشنگەریی و جوڵانەوە ریفۆرمخوازییە ئایینییەکان وگۆڕانکارییە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانی پاش شۆڕشی پیشەسازیی لە ئەورووپای رۆژئاواوە سەریهەڵدا و بناغەی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخ لەوێوە دەستپێکرد بەشێوەیەك کە سەدەی نۆزدەیەم بە (سەدەی نەتەوایەتیی) ناودەبرێت و لەکۆتایی ئەو سەدەیە و سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەنگاوێکی مەزنیان لەو رووەوە هاویشت و بەدرێژایی ئەو ماوەیەش کاریگەریی و رەنگدانەوەیان لە دەرەوەی خۆیان و لە ژیانی گەلانی ئاسیا و رۆژهەڵاتدا و جیهانی نامۆدێرن هەبوو ، لەوانە گەلانی رۆژهەڵاتی

ناوەڕاست ، بە کوردیشەوە ، ئەوانەی لەو کاتەدا لە سایەی دوو ئیمپراتۆریی گەندەڵ و پەککەوتووی عوسمانیی و قاجارییدا بە پلەی جیاوازی گەشەکردنی ئابووریی و کۆمەلایەتیی ژیانیان دەگوزەراند . ئەو دوو ئیمپراتۆرییەی کە لە ئەنجامی پەیوەستبوونیان بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهانییەوە تا دەهات وابەستەیی ئابووریان بە دەوڵەتە زلهێزە سەرمایەدارەکانی ئەورووپای رۆژئاواوە پتر دەبوو ، لە رووی رامیاریی و سەربازییشەوە تا دەهات ئەو زلهێزانە ورووژمیان دەهێنا و دەخزانە ناوچەکەوە و دەستیان لە کاروباری ئەم دوو ئیمپراتۆرییە وەردەدا، کردبوویانە نیمچە کۆلۆنییەك و پیلانی ئاییندەییان بۆ قوتدانیان دادەتاشیی . هێندێك لەو هێزانە لەرێگای پەلامارو جەنگەوە هەوڵی بەدیهێنانی خواستە ئابووریی و سەربازییە فراوانخوازییەکانی خۆیان دەدا و لەو رووەشەوە جەنگە زۆرو زەوەندەکانی رووسیا-عوسمانیی و رووسیا-قاجاریی لە سەدەی نۆزدەیەمدا نموونەیەکی زەقن.

کاتێك سەیری مێژووی نوێی کوردستان دەکەین هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە و بەرەوسەر هەوڵی ژمارەیەك گەورەپیاوانی کورد دێتەبەرچاو بۆ وەستانەوە بە دژی دەسەلاتدارانی عوسمانیی و قاجاریی ، بەتایبەتیی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا کاتێك ئەو ئیمپراتۆرییانە خوازیاری ئەوەبوون لە پێناوی دەرچوون لە قەیرانە سەختەکان و خۆگوڕجکردنەوە بە دژی سەرمایەداریی نەتەوەیی ئەورووپیی لە دەرەوە، بەدژی خواستی رزگارییخوازانەی گەلانی بێدار و رابووی نێو ئیمپراتۆرییەکە لە یۆنانیی ، سلاڤیی ، ئەرمەن و پاشتر عەرەب و کورد ، بەناوی ریفۆرم و چاکسازییەوە دەسەلاتێکی سەنترالیستیی بەهێز دابمەزرێنن کە یەکێتیی و سەروەریی ئیمپراتۆرییەکە لە سایەی چینی دەرەبەگیی-نیمچەسەرمایەداریی تورکیی تازەپیاکەوتەی وابەستەدا لە ئەستەمبوڵ بپارێزێت .لێرەوە تێکڕای سەدەی نۆزدەیەم پێشاندەری زنجیرەیەك راپەڕین و رووبەڕوو بوونەوەی خوێناوییە لە مێژووی کوردستاندا ، ئەو راپەڕینانەی لە زۆربەی کاتدا سەدەها کوردی تێدا بەشداربوون ، ئەوانەی لە رووی مێژووییەوە دەتوانین بیکەین بە دوو قۆناغەوە ، یەکەمیان قۆناغی بەرگرییە کە تێیدا میرە دەسەلاتخوازە میراتگرەکانی کورد لە کاتی جیاوازدا هەوڵیاندا لاوازیی و پەڕپووتیی ئیمپراتۆرییەکە بە قازانجی چەسپاندن و فراوانکردنی دەسەلاتی خۆیان بقۆزنەوە و بەرگریی لەو دەسەلاتە رەوایەی خۆیان بەرووی پەلاماری سەنترالیستگەرای دەسەلاتدارانی تورکە عوسمانییەکان بکەن .ئەو

راپەڕینانەی لەبەر زۆر هۆکاری ناوەکیی و دەرەکیی شکستیان خوارد .قۆناغی دووەم ، قۆناغی رزگاریی و کۆتاییپێهێنانە بە ستەمی راستەوخۆی بێگانەی تورك و عەجەم لە کوردستان و پاشتر بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتدرایەتیی نەتەوەییە لە سەرخاکی کوردستان و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییە .

شایەنی باسە لەپاش شکستی جوڵانەوەی بەرگریی میرە میراتگرەکانی کورد و رووخاندنی میرنشینە نیمچە سەبەرخۆکانی کوردستان ، گەلی کورد لەلایەن بێگانەی داگیرکەرەوە بە دڕندانەترین شێوە ستەمی رامیاریی ، کارگێریی ، ئابووریی ، کۆمەڵایەتیی و نەتەوەیی بەسەردا سەپێنراوە و بە نامرۆڤانەترین شێوە لەرووی مادیی و مرۆییەوە بە قازانجی فەرمانڕەوا بێگانە کوردکوژەکانی پایتەختەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دادەدۆشرێت . هەربۆیە بەرهەڵستیی و سەنگەرگرتن و خۆڕاتەکاندن لەکۆتی بێگانە و هێرشی دڕندانەی نەتەوەی داگیرکەر چیرۆکی ئەو قۆناغە مێژووییەیە کە نەتەوایەتیی کوردیی و زۆربەی نەتەوایەتیی گەلانی دیکەی ناوچەکەی تێدا خەملیوە ، ئەوەی جێگەی بایەخە ئەو راستییەیە کە نەتەوایەتیی کورد جگە لە ململانێ و رووبەڕووبوونەوەی داگیرکەرانی دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی رۆژئاوا، بە تایبەت بەریتانیا ، تووشی داگیرکارییەکی سەختی هەرێمیی و نێوخۆییش بووەتەوە ، بە تایبەتی لەلایەن چینی فەرمانڕەوای نەتەوەپەرستی تەنگەتیلەی رەگەزپەرستی فارس و تورك و دواتر عەرەبەوە ، ئەوانەی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان لەسەر بناغەی کاسەسەری پەڕێنراوی کورد بنیاتنا و بۆ تواندنەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوەی زاڵدا هیچ رێگەیەك نەماوە بە جینۆسایدیشەوە نەیگرنەبەر .

هەر لە سەدەی نۆزدەیەمیشەوە ، فاکتەری نێودەوڵەتیی لە ژیان و چالاکییەکانی نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا ئامادەیی هەیە . کوردستان لە سۆنگەی گرنگی شوێنی ستراتیژیی لەلای دەوڵەتە زلهێزە سەرمایەدارەکانی ئەورووپا جێگەی بایەخ بووە . ئەو دەوڵەتانەی هەمیشە بەدوای بەدیهێنانی بەرژەوەندییە ئابووریی و رامیاریی و قازانجە مادییەکانیانەوە بوون و کردوویانەتە ستانداری مامەڵەکردنیان لەگەڵ هێزە خۆماڵییەکانی ناوچەکە ، لەوانەش نەتەوایەتیی کورد کە نەیتوانیوە ببێتە هێزێکی مەزنی ئەوتۆ زلهێزەکان راستەوخۆ لەگەڵیدا مامەڵە بکەن . لەلایەکی دیکەوە ململانێی زلهێزەکان بۆ پاراستنی هاوسەنگیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هێشتنەوەی یەکپارچەیی ئیمپراتۆرییە

داڕزاوەکانی عوسمانیی و قاجاریی ، تێکڕای جولانەوەکانی کوردی خستۆتە سەنگەری دژ بە بەرژەوەندی رامیاریی و ستراتیژیی و مادیی زلهێزەکان ، بە چەشنێك وێڕای ئەوەی هەمیشە رابەرانی جولانەوەکانی سەدەی نۆزدەیەم و پاشتریش نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم خوازیاری پەیوەندییگرتن بە زلهێزەکانەوە بوون و چاویان لە هاوکاریی ئەوان بووە پشتگیریی کێشەکەیان بکەن ، یان لانی کەم لەو ململانێیەی نێوان کورد و دەسەلاتە بێگانە داگیرکەرەکانی کوردستان بێلایەن بن ، کەچی ئەوان قازانج و دەستکەوتەکانیان لە هاوکارییکردنی گەرمی دوژمنانی نەتەوایەتیی کورد و داگیرکەرانی کوردستاندا بینیوەتەوە . هەر بۆیە کەمترین سەرنج لەمێژووی نەتەوایەتیی کورد بەروونی ئەو راستییەمان بۆ دەسەلمێنێت . بۆ نموونە ، کۆمپانیای ئینگلیزیی هیندی رۆژهەلاتی لە بەغدا رۆلێکی مەزنیان لە نەهێشتنی ناکۆکییە سنوورییەکانی عوسمانیی و قاجاریی لەسەر حسابی کورد بینی و بەوەش رێگەیان بۆ رووخاندنی میرنشینی بابان رەخساند .هەروەها رووسەکان و بەریتانییەکان رۆلی گەورەیان بینی لە هاوکارییکردنی عوسمانیی و ئێرانییەکان بۆ لێدانی میری سۆران و رووخاندنی میرنشینەکەی .خۆ راستکردنەوەی نەستورییەکان بە رووی بەدرخان بەگی بۆتان و هاندانی عوسمانییەکان بۆ هێرشکردنە سەر میرنشینەکە و لەناوبردنی دەستی بەریتانییەکانی بە ئاشکرا تێدا بوو . رووسەکان و بەریتانییەکان هەریەك بەجۆرێك رۆلیان لە مایەپووچبوونی راپەڕینەکەی یەزدانشێردا بینی کە لەکاتی جەنگی قرەمدا قەوما .خۆ مێژووی راپەڕینەکەی کورد لە سالی ١٨٨٠دا بە رێبەری شێخ عوبەیدوللا بە روونی رۆلی نەرێنیی هەریەك لە رووسیا و بەریتانیامان بۆ دەردەخات کە چۆن و بۆچی دژی ئامانجە نەتەوایەتییەکانی کورد وەستاونەتەوە، راستییەکی وا کە لە تەواوی مێژووی نەتەوایەتیی و جولانەوەی ئازادییخوازی کورد لە سەدەی بیستەمیشدا ئامادەیی هەیە.

بەریتانییەکان و فەرەنسییەکان کە لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی بە گوێرەی پەیمانی ژێربەژێری سایکس–پیکۆ نەخشەی رامیاریی رۆژهەلاتی ناوەڕاستیان بەپێی بەرژەوەندییە کۆلۆنیالییەکانیان داڕشتەوە و بە هیچ جۆرێك بەرژەوندییە نەتەوایەتییەکانی کوردیان لەبەرچاو نەگرت ، بەوەش گەورەترین دەرفەتیان لە دەست جولانەوەی نەتەوەیی کورد دەرکرد تا بتوانێت پاش هەلوەشاندنەوەی ئیمپراتۆرییە ستەمکارەکانی عوسمانیی و قاجاریی، دەولەتی نەتەوەیی خۆی لەسەر خاکی کوردستان

دابمەزرێنێت . پاشتریش لە رێگەی هاوکاری داگیرکەرانی کوردستان و هێنانە سەرکاری رژێمی بەکرێگیراو و وابەستە لەو ولاتانەی کوردیان بەسەردا بەخشرایەوە ، هەروەها پشتگیریی تەواوی چالاکییەکانیان و ناراستەکردنی بە دژی هەر خواستێك و جولانەوەیەکی نەتەوەیی کوردیی لە رێگەی پەیمانی دوو لایەنە و چەند لایەنەی وەك (سەعد ئاباد) لە سالی ١٩٣٧ ، هەولی بەدەستهێنانی بەرژەوەندیی خۆیان دەدا .پاش هەلگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانیش ، شورەوییەکان و ئەمەریکییەکانیش هاتنە ناو کێشەکەوە ، لەئاکامی ئەم قۆناغەی جەنگی سارد و ململانێی زلهێزەکان دا نەتەوەی کورد تووشی نەهامەتیی و کارەساتی مەزن بووە ، هەموو ئەو هەولانەی بۆ ئازادیی کورد و بەدەستەوەگرتنی دەسەلاتی نەتەوەیی دران ، لە لایەن داگیرکەرانەوە و بە پشتگیریی زلهێزەکان ، بەتایبەت دەولەتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپای رۆژئاوا مایەپووچ کران .هەر لە رووخاندنی کۆمارە ساواکەی مەهاباد پاش نزیکەی سالێك لە دامەزراندنی ، هەروەها لەلانکدا خنکاندنی جولانەوە چەکدارانەکەی کۆمیتەی شۆرشگێری حیزبی دیموکراتی کوردستان لە سالانی ١٩٦٧-١٩٦٨ ، تا ئاشبەتالپێکردنی شۆرشی چواردەسالەی ئەیلول لەسالی ١٩٧٥ بەفیرۆدانی خوێنی هەزارەها لاوی کورد و پاشتریش چاونوقاندنی زلهێز و رێکخراوە نێودەولەتییەکان کە ئەوان ئاراستەکەرین لە پرۆسەی کۆمەلکوژیی و جینۆسایدی کورد بە هۆی بەکارهێنانی قەدەغەترین چەکی کۆکوژی کیمیایی و بایەلۆجییەوە . دیارە پەیمان و رێکەوتننامە دوو قۆلێکانی هاوشێوەی (رێکەوتننامەی جەزائر) و چەند قۆلییەکانی وەك (پەیمانی بە غدا) و پاشتر (سەنتۆ) هەموو ئەوانە ئەو راستییە دەردەخات کە نەتەوایەتیی کوردیی قوربانییەکی هەمیشەیی ململانێی نێودەولەتیی و پشتگیریی بەرژەوەندییخوازانەی زلهێزەکانی ئەوروپا بووە لە داگیرکەرانی کوردستان و پرۆسەی کۆمەلکوژیی کورد .

شایەنی باسە لە ئاکامی پرۆسەی مێژوویی داگیرکاریی و تالانکاریی کوردستان لەلایەن بێگانەگەلێکی فرەکەلتوورەوە ، بەتایبەت شەپۆلی خێلە عەرەبە شیرتیژە لەبرسامردووەکانی ئیسلامیی لە چارەکی دووەمی نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی زایینیی و دواتر شەپۆلی خێلە تورکەکان تالانخوازەکان لە ناوەراستی سەدەی یازدەیەم و پاشتر مەغۆلە سەرەتاییەکان کە لە قۆناغی دڕندایەتییدا ژیانیان دەگوزەراند لە سەدەی سیازدەیەم. ئەوانەی بەچەند شەپۆلێك کوللەئاسا روویان کردە ناوچەکە . هەموو ئەوانە

جگەلەوەی دابڕانێکی مێژوویی مەزنیان لەنێوان کورد و رابردوویدا پێکهێنا ، گورزێکی کاولکەری مەزنیشیان سرەوانده ژێرخانی ئابووری کوردستان ، ئەمە وێڕای ئەفرەتی جوگرافیا کە ئەو نیشتمانەی بە زنجیرەیەك چیای سەخت دەورەداوە و دابڕدابڕی کردووە بۆ چەند هەرێمێك کە پەیوەندیی و هەموو ئاڵوگۆڕێکی لەنێوانیاندا تا ئەوپەڕی ئەستەم کردووە. ئەمانە چەند تایبەتمەندییەکی مێژووییان بەکوردەوە لکاندووە کە کاریگەرییەکی یەکجار نەرێنیی لە نەتەوایەتیی کوردیی کردووە . چونکە ئەم هۆکارانە بوونەتەهۆی ئەوەی کورد دەسەڵاتێکی رامیاریی مێژوویی درێژخایەن و دانەپچڕاوی خاوەن سەروەریی ، شارستانیەتێکی نەتەوەیی پتەوی تایبەت بەخۆی ، ئابوورییەکی بەهێز و وێژەیەکی نووسراوی کۆنی نەبێت و زمان و کەلتووری تووشی شێواندن و پەلامار بێتەوە .بێگومان ئەوەش وایکردووە تاڕادەیەکی زۆر نەتەوایەتیی کوردیی لە رووی هەست و هۆشیاریی و گوتار و هزر و تیۆریزەکردنەوە کاڵوکرچ و لە رووی زەقکردنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی و ئاستی پەیوەستەگیی نەتەوەیی و زاڵبوونی بەسەر پەیوەستەگییە لۆکاڵییە عەشیرەتیی و تەریقەتیی و هەرێمچێتییەوە لاواز بێت ، ئەوەش دیاردە نالەبارەکانی وەك : دووبەرەکی نێوخۆ ، گەلەجاشایەتیی ، بێگانەپەرستیی وخۆبەکەمزانی لەبەردەم بێگانە ، رێزنەگرتن لە خەبات و خوێنی تێکۆشەرانی نەتەوەیی راستەقینە ، بێ پلاتفۆرمی و کاری هاوبەشی راستەقینەی نەتەوەیی ، لاوازیی رۆڵی بۆرجوای نیشتمانیی و بازاڕ لە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی ، قڕوقەپ لەمەسەر بازرگانییکردن بە کێشەی نەتەوایەتیی ..هتد لێبکەوێتەوە.

سەبارەت بە ئایین و پەیوەندیی بە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کوردییەوە ، مێژووی جوڵانەوە کوردییەکانی سەدەی نۆزدە و بیست ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو جوڵانەوانە ئایینیی نەبوون و بەرنامەی ئایینییان نەکردۆتە ئامانج . گەلی کورد لەپێش هاتنی عەرەبە داگیرکەرە موسوڵمانەکان بۆ ناوچەکە لەسەر ئایینی جیاواز بوون و کوردستان زۆربەی کات لەڕووی ئایینییەوە هیترۆجین بووە . گەلی کورد هەر لە سەدەی حەوتەمەوە تا چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم لە سایەی دەوڵەتێکی تیۆکراتیی خەلافەتدا گوزەراندوویانە ، لەگەڵ گەندەڵبوون و پەڕپووتبوونی خەلافەتی عوسمانیی لە کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە ، جوڵانەوە کوردییەکان لە پێناو جێگیرکردنی پاراستنی دەسەڵاتی لۆکاڵیی و پەرەپێدانی دژی دەوڵەتی خەلافەت

سەریانهەڵدا ، ئەو جوڵانەوانەی کە پشتگیرییەکی تەواوی توێژی ئایینیی لە کوردستاندا بۆخۆی رانەکێشا ، چونکە ناوی سوڵتان و خەلیفەی موسوڵمانان لای رۆحانیانی سوننەی کورد ئەوەندە مەزن بوو کە ئامادە نەبوون نەك هەر خۆیان تێکەڵ بە جوڵانەوەکان بن ، بەڵکو دڵی خەڵکانی دیکەشیان لێ سارد دەکردەوە ، لەم رووەوە دەگونجێت (مەلای خەتێ) ناوێك بێت بە گوێچکەی زۆربەی کورد ناشکرابێت . شایەنی باسە دەوڵەتی عوسمانی پایەیەکی مەزنی لەسەر دەزگای ئایینیی دامەزرابوو کە موچە و بەراتی مەلا و رۆحانییەکانی دەدا و رۆحانیانی دەوڵەتی عوسمانیی وەك رۆحانیانی شیعەی ئێرانیی دەزگایەکی ئایینیی سەربەخۆیان نەبوو . وێرای ئەوەش راپەرین و جوڵانەوە لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا دژی دەسەڵاتی گەندەڵی خەلافەتی عوسمانیی و شاهەکانی قاجار بەردەوام بوو . بەتایبەتی گەر سەیرێکی جوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا بکەین بە روونی بۆمان دەردەکەوێت وێرای ئەوەی شێخ خۆی پیاوێکی رۆحانیی و ئاینپەروەرێکی کەموێنە و خواپەرستێکی دروستکارە ، کەچی گوتاری رامیاریی شێخ نەتەوەیی و کوردستانییە و ئامانجی رزگارکردن و یەکخستنی خاك و بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی میللیە و دەسەڵاتدارانی خەلافەت بە سەرچاوەی نەهامەتییەکانی گەلی کورد لەقەڵەم دەدات .

پاش بەزینی دەوڵەتی عوسمانیی لە جەنگی یەکەمی جیهان و شکستی ئایدۆلۆژیای خەلافەت و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆرییەکە ، گەلانی ناوچەکە هەریەکەیان پەلەپروزێی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆیان بوون . کوردیش کە ئاگری جەنگ هەڵیقرچاندبوو ، پاش جەنگ شەتەك و بریندار و کاس ، بەپەلە کەوتەخۆی لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەییدا . سەرجەم هەوڵ و جوڵانەوە و تێکۆشانەکانی کورد لەپێناوی دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بوون و بنیاتنانی دەوڵەتی تیۆکراتیی ئایینیی لەبەرنامە و ئامانجی هیچ لایەکیاندا نابینرێتەوە .رابەرانی کوردی وەك سمکۆ ، شێخ مەحموود بەرزنجیی ،مەحموودخانی دزڵیی، شێخ ئەحمەد ، سەید تەها و برایانی بەدرخانیی نەتەوەخوازبوون و لەپێناو سەربەخۆیی کوردستان تێکۆشاون . تەنانەت راپەرینەکەی ساڵی ١٩٢٥ یش بەرنامەی کۆمەڵەی سەبەخۆیی کوردستان بوو ، راکێشانی کەسایەتیی وەك شێخ سەعید و ختووکەدانی سۆزی ئایینیی بۆ راکێشانی زۆرترین ژمارە لە خەڵکی کورد و نەیارانی مستەفاکەمال و پارتی کۆماریی گەل بوو. لەوەش زیاتر هەر

لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دوو ئەزموونی فەرمانڕەوایی کوردیی لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەرکەوتوون کە حکومەتەکەی مەلیك مەحموود لە سلێمانیی ۱۹۲۲-۱۹۲۳ و کۆماری میلیی دیموکراتی کوردستان ۱۹٤٦، کە هەردووکیان نەتەوەیی و نیشتمانیی بوون . لەلایەکی ترەوە داگیرکەرانی کوردستان هەمیشە ئایینیان وەك ئامرازێك بەکارهێناوە بۆ دژایەتیی بیری نەتەوەخوازیی و سەربەخۆخوازیی لەنێو کورددا ، ئەوانە بەردەوام ئایەتەکانی وەك "واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا" ، " انما المؤمنون اخوة" و فەرموودەی دروستکراویان سەبارەت بە خۆشەویستی عەرەب و عەرەبایەتییەوە کردۆتە بنێشتەخۆشەی سەرزمانیان . لە هەمووی سەیرتر ئەو وێنەیەیە کە مستەفا کەمالی دینسز و هۆمۆسێکسواڵ بە مێزەر و جلکی مەلایەتییەوە دەرکەوتووە ، ئەو کاتەی بەنێو کوردە ساویلکەکانی باکووردا دەگەڕا تا پارەیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی تورکیی کورنکوژ لێ کۆبکاتەوە ، هەروەها ئەو بانگەوازانەی بە ناوی جیهاد و ئیسلامەوە دەیانکرد تا لیوای موسڵ لە بندەستی ئینگلیزەکان دەربێنن . لەمێژوودا زۆرجار گەورەپیاوانی کورد بە سوێندی درۆ و قورئانی مۆرکراو هەڵخەڵەتێنراون و لەناوبراون .

لەراستییدا هێندێك نەتەوەی وەك عەرەب ، جوو ، ئێرلەندی بە چەشنێکی سەیر لەپێناو خۆجیاکردنەوە و کۆکردنەوەی ئەندامانی نەتەوە و هاندان و ئاراستەکردنیان بۆ بەجێهێنانی ئەرکە نەتەوایەتییەکانیان ، نەتەوایەتییەکەیان تێکەڵ بە ئایین یان مەزهەب کردووە ، بەمجۆرە نەتەوەخوازیی و ئایینپەرستییان کردۆتە دوو رووی یەك دراو .دیارە ئەوەی بۆ ئەو نەتەوانە لواوە ، هیچ کات بۆ کورد نەلواوە و نالوێت ، چونکە ئیسلام کە ئاینی بەشێکی گەورەی نەتەوەی کوردە هەڵقوڵاوی ریالیتە و ناوجەرگەی کۆمەڵگەی عەرەبییە لە رووی زمان و گوفتارەوە بە کورد نامۆیە .

شایەنی باسە گوتاری نەتەوایەتیی کوردیی بەدرێژایی مێژوو کەموکورتی زۆربووە و هەلومەرجی ئەشە و گەشەو پێگەیشتنی بۆ نەڕەخساوە ، ئەو گوتارە لە واقعێکی وادا سەری هەڵداوە کە سەرەتاییترین بنەماکان و کردارەیی هیومانیزم، لیبرالیزم ، پلورالیزم ، سێکیولاریزم ، تۆلێنرانسیزم و دەوڵەتی یاسا و کۆمەڵگەی مەدەنیی تێدا نەبووە ، بەڵکو بە پێچەوانەوە دیسپۆتیزم ، تیۆکراتیی ، ئۆتۆکراتیی و میلیتاریستیی و کانیبالیزم و دیکتاتۆریی و تۆتالیتاریزم سەرتاپای ژیانی رامیاریی و کۆمەڵایەتیی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستانیان تەنیوە . هەربۆیە پێویستە گوتاری

نەتەوایەتیی کوردیی لە رووی تیۆر و پراکتیکەوە بە رووی هزرە هاوچەرخەکانی مرۆڤایەتییدا بکرێتەوە و ئەرکی کۆمەڵایەتیی هەمەجۆر بگرێت ئەستۆ و لە قۆناغە کێویلەیی و سەرەتاییەکەیدا نەچەقێت و نویێ بێتەوە و ئێکسپایەرنەبێت .

خوێنەری ئازیز ، ئەم بەرهەمە وەرگێڕاوی کتێبەکەی ( پرۆفیسۆر دکتۆر وەدیع جومەیدە ) یەو لەبنەڕەتدا نامەی دکتۆراکەیەتی کە ساڵی ١٩٦٠ پێشکەشی بەشی هاووڵاتیبوون و کاروباری گشتیی لە زانکۆی سەرەکۆسەی کردووە ، کە یەکێکە لە زانکۆ رەسەن و دێرینەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لە ساڵی ٢٠٠٦دا وەك کتێب لەلایەن دەزگای چاپی سەرەکۆسەوە بڵاوکراوەتەوە . لەراستییدا ئەم کارە یەکێکە لە رەسەنترین و ئەکادیمییترین و پڕزانیارییترین کۆڵینەوە کە بەزمانی ئینگلیزیی لەسەر بنەماکان و پەرەسەندنی کێشەی نەتەوایەتیی گەلی کورد ئەنجامدرابێت وەك یەك لەسەرچاوە کلاسیکییەکان لەقەڵەم ئەدرێت .

وەدیع کوڕی ئیلیاسە و لە بنەماڵەی ناسراوی جومەیدەیە لە خێزانێکی کریستیانیی عەرەبیی زمان لە دەورانی سەرەتای داتاشینی دەوڵەتی عێراقی هاوچەرخدا لە شاری بەسرە لەدایك بووە ، پاشتر خێزانەکەیان رووی کردۆتە بەغدا و وەدیع قۆناغەکانی خوێندنی لە بەغدا بەسەرکەوتوویی تەواو کردووە و پاشتر لە ساڵی ١٩٤٢ دا کۆلێجی ماف لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە . ناوبراو بێ ئەوەی دوای تەواوکردنی کۆلێج کاری پارێزەریی بکات ، هەوڵی دامەزراندنی داوە لە وەزارەتی (تەموین /خۆراك) بووەتە کارمەند و وەك پشکنەر راژەی کردووە و لە کۆتایی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانییدا بۆ راپەڕاندنی کارەکەی سەردانی شار و شارۆکە کوردییەکانی لە عێراقدا کردووە، پاشان لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٢دا لە عێراق چووەتەدەر و رووی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردووە . پاش خوێندن و تەواوکردنی نامەی دکتۆراکەی لە ساڵی ١٩٦٠، پەیوەندیی بە زانکۆی ئیندیاناوە کردووە و بۆتە دامەزرێنەرو سەرۆکی بەشی زمانەکان و ئەدەبیاتیی رۆژهەڵاتی نزیك و وەك پرۆفیسۆرێکی مێژوو تا خانەنشینبوونی لە ساڵی ١٩٨٥دا لەو بەشە راژەی کردووە . دواتر چۆتە زانکۆی کالیفۆرنیا لە سانت دیاگۆ و وەك پرۆفیسۆرێکی مێژوو راژەی کردووە .

د.وەدیع وێڕای ئەوەی بۆخۆی کورد نیە و لە وڵاتێکی وەك ئەمەریکای ئەندازیاری پەیمانی بەغدا و لە هەمان ئەو ساڵانەدا لەسەر کێشەی کورد کاری کردووە،

وێڕای ئەوەی زۆربەی سەرچاوەکانی رۆژئاوایین و تێڕوانینێکی تایبەت و دیارییکراویان لەهەمبەر پرسی کورد هەیە ، بەلام ئەو وەك کۆلەرێکی رەسەن و شارەزا و ئەکادیمیی ، هەولیداوە چەندەی توانیبێت سەرچاوە کوردییەکان و عەرەبییەکان لەسەر کورد بسەر بکاتەوە و بە سەلیقە و گیانێکی زانستیانەوە ، بە لێکدانەوەی ورد و هەلهێنجان و رامانی قوولەوە سەبارەت بەو پرسە و رووداوەکانی کۆلینەوەیەکی نایابی پێشکەش کردووە و ئەنجامگیریی ورد و دروستی پێشان داوە . گەلێك لە نووسەران و بایەخداران لە رابردوودا و تائێستاش پێیان وایە و بلاویدەکەنەوە کە نەتەوایەتیی کوردیی تەنیا کاردانەوەی توێژیی بالادەستی کۆمەلگەی کوردەوارییە دژی مۆدێرنە و ریفۆرمی کارگێڕییە و لە دەمی لاوازی دەولەتی ناوەندیی و بە پالپشتیی بێگانە ئەورووپییەکان جاروبار خۆدەنوێنێت ،بێ ئەوەی باس لەو هەزرە گێڕ و ناکارە رەگەزپەرستانەیە بکەن کە ئەو مۆدێرنە شەل و شکستە و ریفۆرمە وێرانکەرترەی لەلایەن دەسەلاتی بۆرجوا میلیتاریستی شۆڤێنیستی تورك و فارس و پاشتر عارەبەوە پێی ئەنجامدراوە و چۆن ئەو لێکدانەوە نازانستییەیان کردۆتە سەرپۆشێکی رزیو و تاوانی کۆمەلکوژیی و جینۆسایدی کوردیان پێ داپۆشیوە .وەدیع جوەیدە لەم کارەیدا زانستییانە دەیسەلمێنێت کە ئەهامەتیی و ئازارەکانی کورد ریشەیەکی قوولیان هەیە ، نەتەوایەتیی کورد جولانەوەیەکی رەسەنە و پرسی کورد پرسی خەباتە دژی سڕینەوەی ناسنامە و چەوسانەوە و هەلاواردن ، جولانەوەی نەتەوەی کوردیش جولانەوەیەکە بۆ رزگارکردنی خاك و بەدەستەوەگرتنی دەسەلاتی نەتەوەیی .هەربۆیە جێگەی سەرسوڕمان نیە کە پاش ئەوەی لە سالی ١٩٩٩دا لە تورکیا ئەو کارەی د.وەدیع بۆ زمانی تورکیی وەرگێڕا و چاپ و بلاوکرایەوە، دەسەلاتدارانی فاشیستی تورك بەپەلە کەوتنەخۆ سانسۆریان خستەسەر فرۆشتنی کتێبەکە و لە کتێبخانەکان کۆیانکردەوە و زیندانییان کرد .

لە کۆتاییدا بە ئەرکی خۆمی دەزانم سوپاسێکی گەرمی هەردوو برای ئازیز (کاك سەدیق سالح و مامۆستا رەفیق سالح ) بکەم کە هانیاندام ئەم کارە بایەخدارە بۆ زمانی کوردیی وەربگێڕم و کۆپییەکی کتێبە ئینگلیزییەکەیان بۆ ناردمە مالەوە، بەش بە حالی خۆم هەولمداوە لە وەرگێرانەکەدا ورد بم و لەئەستۆگرتنی ئەم ئەرکەشم تەنیا لە پێناو پێویستیی کتێبخانەی کوردیی مێژوویی بەم کارە نایابەی د.وەدیع جوەیدە و هیوادارم شوێنی خۆی بگرێت، لەگەل تەندروستیی و سەربەرزیی بۆ هەمووان.

## پێشەکیی :

کورد گەلێکی لێوەشاوە و چالاکن . رۆڵێکی بایەخداریان لە مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕستدا بینیوە . ئەوان پیاوانێکی دەرکەوتە و بەرچاویان وەك جەنگاوەر ، دەوڵەتمەند ، کارگێڕ و هەروەها کۆڵەر و پیتۆڵ هێناوەتەبەر و ژیان و کەلتووری وڵاتانی موسوڵمانی رۆژهەڵاتی ناوەراستیان دەوڵەمەند کردووە . ئەوان لە پاش عەرەب و تورك و فارس مەزنترین گروپی ئیتنی رۆژئاوای ئاسیا پێکدەهێنن . تا ئێستاش گەلێکی جەنگاوەر و فرە سەرکێشن ، زۆربەی جار لەگەڵ خێڵەکانی سەدەی حەڤدەیەمی سکۆتلەند بەراورد دەکرێن . وێڕای ئەو شانازییەی وەك تاك بە رەگەزی خۆیانەوە دەیکەن ، بەڵام وەك گەل ، ئەوان تا سەردەمانێکی هاوچەرخیش قنیاتیان بەوە بووە رۆڵێکی لاوەکیی لەنێو دراوسێکانیاندا ببینن کە بەژمارە لەوان زێدەتر و باشتر رێکخراوترن .

وەك نەتەوە ، کورد لەحاست عەرەب ، تورك و فارسدا وەك گەلی سکۆتلاند لەمەمبەر ئینگلیزەکاندا وایە . هەرچەندە ئەوان بەشدارییان بە کەسایەتیی مەزنی جەنگاوەری وەك سەلاحەدینی ئەیوبیی کە ئیمپراتۆریی ئیسلامیی فەرمانڕەوایەتیی کرد ، هەروەها مەلائیدریسی بدلیسیی کە یەك لە راوێژکارە سەرەکییەکانی سوڵتان سەلیم یاوز بوو ، هەروەها کەریم خانی زەند کە بۆ ماوەی ٢٠ساڵ ئێرانی بەڕێوەبردووە ، کردووە . بەڵام هەرگیز ئیمپراتۆرییەکی مەزنی تایبەت بەخۆیان دانەمەزراندووە . ئیمپراتۆریی میدیا ، کە یەك لە باپیرانی بەناوبانگی کوردن ، تەنیا دەوڵەتێکی مەزنی نەتەوەیی بوو کە دەگونجێت بگوترێت لەلایەن کوردەوە دامەزرێنراوە .

رابوونی کورد بە نەغمەی هەستی نەتەوایەتیی زیاتر لە خەڵکانی دی دواکەوت . ئەوەش هۆکاری ئەو تراژیدیا و بارە نالەبارەیانە لەپاڵ ئەو گەلانەی لەگەڵیاندا دەژین .دەیانەوێت دەست بەسەر ئەو خاکەدا بگرنەوە کە بە وڵاتی دابەشکراوی خۆیانی دەزانن و کەوتۆتە بەردەستی تورك ، عەرەب و فارس ، ئەو کارەی کە لە ئەستۆگرتنی ئەستەم و مەترسییدارە . ژینگەی کوردیی کە

کەسایەتیی تاکی کوردی لەقاڵبداوە ، وەك گەلیش چارەنووسی وێناکردوون . ئەو ژینگەیەی لەمپەری چیایی سەخت لێکی دادەبڕێت ، جیاوازییە زمانیی و مەزهەبییەکان دابەشی دەکات ، لایەنگریی تەسکی خێڵەکیی پەرتەوازەی دەکات ، هەروەها سنووورە نێودەوڵەتییەکان جیای دەکاتەوە . ئەوان بەدوای شتێکدا وێڵن کە زۆربەی گەلە خواپێداو و بەختەوەرەکان هەیانە ، ئەویش : دەوڵەتی نەتەوەییە .

ئەمڕۆ کورد دەکەونە ناوچەیەکی فرە بایەخدار لەنێو جەرگەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ، ئەوان تاکە مەزنترین کەمینەی نەتەوەیین لە ناوچەکەدا ، رێژەیەکی گرنگی دانیشتووانی تورکیا ، ئێران ، عێراق و سوریا پێکدەهێنن . نەتەوایەتیی کورد سەرچاوەیەکی بەردەوامی نیگەرانییەکی قووڵی حکومەتگەلی ئەم وڵاتانەیە .

نەتەوایەتیی کوردیی بە سەرکەوتنی نەتەوایەتییەکانی دەوروبەری-تورکیی ، فارسیی و هەروەها عەرەبیی ورووژا ، هەروەها بە شکستی خۆشی رووی لە بێ هیوایی کرد ، بەوەش زیاتر بێئۆقرە و سەرسەخت و تیژتر بوو . لەبەر ئەم هۆیانە ، کورد رۆڵێکی زێدە بایەخدار لە کاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەبینن . ئاکار و هەڵسوڕانیان نەك بە تەنیا یەك لە فاکتەرە گرنگەکانی ئارامیی و ئاسایشی ئایندەیی لەو وڵاتانەدا پێکدەهێنێت کە کوردیان تێدا نیشتەجێیە ، بەڵکو لە سەراسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا . هەر لەبەر ئەوەشە کە گرنگە کورد بناسین و لە ئامانجەکانیان ، خولیای رامیاریان ، هەروەها ئەو ئاراستەیەی دەگونجێت بیگرنە بەر تێبگەین .

ئامانجی ئەم کۆڵینەوەیە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی خوارەوەیە :

١- ئایا نەتەوایەتیی کوردیی بە هۆشێکی بەرزی پەرەسەندوویی نەتەوەیی و تایبەتمەندییەکی بەرجەستەوە هەیە کە ئەندامانی ئەو نەتەوایەتییەی تێدا بەشداربن ؟

٢- ئەگەر ئا ، ئایا هۆشی نەتەوایەتیی کورد ئاوێتەی ئەو خواستەیە کە جەخت لە ناسنامەی نەتەوایەتیی دەکاتەوە و خوازیاری فەرمانڕەوایەتییەکی خۆیی رامیارییە ، ئەوەش ئەوەندە بەهێزە تاکو بگوترێت جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی

کوردیی هەیە ؟

٣- باوادابنێین ئەو دوو پرسیارەی سەرەوە بە ئەریْ وەلامی دەرێتەوە ، ئایا پەیوەندیی ئەو جولانەوە نەتەوایەتییە بە سیاسەتی نێودەولەتییەوە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا چۆنە ؟

بە وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە ، ئەم مێژووەی کورد ، وەك بابەتی کۆلینەوەیەك سوودبەخش دەبێت بۆ ئەوانەی بەرژەوەندییان بە نەتەوایەتییەوە وەك جولانەوەیەکی جەماوەریی هەیە .

هەولمداوە لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی رابردووی ئەو دەولەتانەی کوردیان تێدایە و هەروەها زلهێزەکانی جیهانەوە ، بچمە نێو کێشەی کوردەوە ، ئەوەش تاکو پێشانی بدەم کە هیچ زلهێزێکی جیهانیی نیە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بەرژەوەندیی هەبێت و ئامادەبووبێت کێشەی کورد پشتگوێ بخات ، یاخود خۆی لەگەلاْلەکردنی سیاسەتێکی تایبەت بەکورد لە چوارچێوەی سیاسەتە گشتییەکەی لەحاست رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بەدوور بگرێت .

هەروەها مەبەستم بوو لەم لێکۆلینەوەیەدا ئەو کەلێنە لە ئەدەبدا پڕبکەمەوە کە بە کورد تایبەتە ، ئەویش بۆ ئەوەی چەندە بتوانرێت وێنەیەکی گشتگیرتر لەمەڕ کێشەی کورد بخرێتە بەرچاو . کۆلینەوەکانی پێشوو ئاماژەی بەنرخیان بۆ چەند لایەنی ئەو کێشەیە کردووە ، بەلام پێشتر هەولێکی بەوشێوەیە نەبووە کە لەگەل سەرجەم لایەنەکانی کێشەکەدا مامەلە بکات ، لەوانەش پەرەسەندنی مێژوویی ، بە شێوازێکی وردتر و زانیارییەکی زێدەترەوە .

پەیوەندیی من بە کوردانەوە بۆ سالی ١٩٤٣ و ١٩٤٤ دەگەڕێتەوە ، ئەو کاتەی وەك چاودێری کەلوپەلی گەنجینەکانی پێنج لیواکەی باکوور راژەم دەکرد . ئەو پێنج لیوایەی لە چواردە لیواکەی عێراق کە بە تەواویی ناوچە کوردییەکانی ئەو ولاتە دەگرێتەخۆ . ئەرکەکەم ئەوەی لێدەخوازیم بە بەردەوامیی بەنێو کوردستاندا بگەڕێم ، ئەوەش وایکرد پەیوەندیی بە ژمارەیەکی فرە لە کوردانەوە بکەم کە هەریەکە و سەر بە چین و توێژێکی جیاوازیی کۆمەلایەتیی بوون وەك :

کارمەندی میریی ، سەرەك خێڵ و هەروەها ڕێبەرانی ئایینیی .

زۆربەی ئەو کەرەسانەی ئەم لێکۆڵینەوەی لەسەر بنیاتنراوە لە وڵاتانی ئینگلتەرا و فەرەنسا کۆمکردوونەوە . لەوێ ، توانیم سوود لەو ئاسانکارییانەی دەزگای پاشایەتیی بۆ کاروباری نێودەوڵەتیی ، هەروەها خوێندنگای ڕۆژهەڵاتناسیی و کۆڵینەوەکانی ئەفریکایی لە زانکۆی لەندەن ، کتێبخانەی بۆدلیان ، کتێبخانەی مۆزەخانەی ئەشمۆلین ، هەروەها کتێبخانەی کۆلێجی سانت ئەنتۆنی زانکۆی ئۆکسفۆرد ، بیبلۆگرافیای نیشتمانیی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە پاریس ببینم. هەروەها زانیاریی زێدەترم لە کتێبخانەی کۆنگرس ، کتێبخانەی هاوگستۆن لە زانکۆی هارڤارد ، کتێبخانەی گشتیی نیۆرك ، کتێبخانەی پەیمانگای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کۆلێجی کۆڵینەوە پێشکەوتووەکانی نێونەتەوەیی لە زانکۆی جۆن هۆکینس لە واشنتەن دی سی دەستکەوت.

پێم خۆشە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاراستەی چەند کۆڵەرێکی ناوازە لە بواری کۆڵینەوە کوردییەکاندا بکەم ، بەتایبەت سی.جەی ئیدمۆندز ، وانەبێژ لە خوێندنگای ڕۆژهەڵاتناسیی و کۆڵینەوەکانی ئەفریکایی لە زانکۆی لەندەن و ڕاوێژکاری پێشووی وەزارەتی ناوخۆی عێراق ، هەروەها ڤلادمیر مینۆرسکی ، پرۆفیسۆی فەخریی لە زانکۆی لەندەن ، کە هەردووکیان بەشێك لە کاتی بەنرخی خۆیان تەرخان کرد بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەسەر چەندین خاڵی نێو کۆڵینەوە کوردییەکان هەروەها چەندین کەرەسەیان خستە بەردەستم کە ئەستەم بوو لە هیچ جێگەیەکی دی دەستم کەوتبان . هەروەها لەلایەن کامەران بەردخانیشەوە ، پرۆفیسۆر لە خوێندنگەی کۆڵینەوەی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان لە پاریس ، بە هەمان شێوە هاوکاریی کرام ، ئەو وێڕای ئەوەی کۆڵەرێکی خاوەن تێبینیی کوردە ، یەك لە ڕێبەرانی پێشووی جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کوردیشە .

هەروەها پێم خۆشە پێزانینی خۆم بۆ بەڕێز هاملتون جیب ، پرۆفیسۆری پێشووی زانکۆیی و هەروەها پسپۆڕی عەرەبیی لە زانکۆی هارڤارد و زانکۆی ئۆکسفۆرد دەربڕم. ئەوەی ئاسانکاریی بۆ کردم تا دەستم بە کتێبخانەکانی بۆدلیان

**و دەزگای مۆزەخانەی ئەشمۆلین و ئەلبێرت حۆرانی لە کۆلێجی سات ئەنتۆنی زانکۆی ئۆکسفۆرد رابگات و سوود لە دەزگای پاشایەتیی بۆ کاروباری نێودەوڵەتیی و کتێبخانەی کۆلێجی سات ئەنتۆنی بکەم .**

**هەروەها سوپاسی زۆرم بۆ رۆس ئەلفینیستۆن ، خانمی دەبڵیو.جی.ئەلفینیستۆن کە بەشێك لە پێپەرە بڵاونەکراوەکانی تایبەت بە مێردەکەی خستە بەردەستم . هەروەها سوپاس بۆ کۆلۆنێل کایلی بێل ، ئەفسەری پێشووی رامیاریی بەریتانیی لە باکووری سوریا و لە باشووری تورکیا ، سەبارەت بەو زانیارییانەی پێی بەخشیم.**

**لە کۆتاییدا خوازیارم پێزانینی خۆم ئاراستەی دەزگای فۆرد ، سەنتەری کاروباری نێودەوڵەتی و بەشی خوێندنی باڵا لە زانکۆی ئیندیانا بکەم بۆ ئەو یارمەتیە مادییەی پێشکەشیان کردم تا بتوانم ئەو لێکۆڵینەوەیە تەواوکەم کە ئەم کارەی لەسەر بنیاتنراوە .**

# جوگرافیی

**سنوور :**

**کوردستان ناوچەیەکی فراوانی چەماوە رووخسارە لە دڵی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا ، لە زۆربەی رۆژهەڵاتی تورکیا ، باکووری عێراق ، بەشێکی بەرچاوی رۆژئاوای ئێران ، چەند بەشێك لە باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی سوریا ، هەروەها هێندێك ناوچە لە باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی ئەرمینیا پێکدێت .[1] رووی چاڵی چەماوەکە بە ئاراستەی باشووری رۆژئاوایە ، کە سەرێکیان لەسەر لێوارەکانی رۆژئاوای چیای کورداغی نزیك ئەسکەندەورنە رادەوەستێت و سەرەکەی دیکەشیان لەسەر مانیشت خوی کۆتایی باکووری رۆژئاوای چیاکانی لوڕستان رادەوەستێت .**

**بە کورتی سنووری کوردستان دەتوانرێت بەم شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان بکرێت :[2] لە کورداغەوە دەستپێدەکات ، ئەو چەماوە سنوورییەی بە ئاراستەی باکووری**

---

[1] کوردستان چەمکێکە بەشێوەیەکی رێژەیی نوێیە و مەبەست لە بەکارهێنانی ئەو خاکەیە کە دانیشتووانی کوردزمانی لەسەر دەژی ، ئەم چەمکە یەکەمین جار لەلایەن سەلجووقییەکانەوە بەکارهاتووە ئەوان بۆ هەرێمێك بەکاریانهێناوە کە تەنیا بەشێکی کەم لە کوردستانی ئەمڕۆ دەگرێتەوە

V. Minorsky , "Kurdistan", Encyclopaedia of Islam,1 st ed.,4:1130-32.

[2] ئەم ناساندنەی سنووری کوردستان لەسەر بنەمای ئەم کارانە دەستنیشانکراوە :

E.B.Sone," Limits of Kurdistan," in Soane .Report on Sulaimania District of Kurdfistan,1-3; Rambout, Lucien. Les Kurds et el droit: Des texts, dest fait . Paris: Editions du Cerf , 1947,1-2; Maunsell, F.R. " Kurdistan ," Geographical Journal 3,no.2,(Feb,1894):81-82;

هەروەها ئەو نەخشەیەی محمد امین زکی لە خلاصة تاریخ الکرد دا بڵاویکردۆتەوە ، ئەوەی ساڵی ١٩٢٩ لەلایەن محمد علی عونی یەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی و بڵاوکراوەتەوە هەروەها ئەو نەخشەی کوردستانەی کە کۆمەڵەی کوردان بڵاویکردۆتەوە

ڕۆژهەڵات بە درێژایی کەناری ئەمانۆس و چیاکانی بەرامبەری زنجیرە چیای تۆرۆس هەڵدەکشێت ، بەنزیک مەرعەش و پاشتر مەلاتیە و بەدرێژایی کەنارەکانی ڕۆژئاوای فوراتدا تێدەپەڕێت . لەوێوە بەرەو باکوور بەردەوام دەبێت و ئینجا بە توندیی بەرەو ڕۆژهەڵات بادەداتەوە ، بەدرێژایی ئەو ئەڵقە مەزنەی کە قەرەسو (فوراتی ڕۆژئاوا) پێکیدەهێنێت و بەرزاییەکانی دەرسیم دەگرێتەخۆ . لێرەوە بە درێژایی کەنارەکانی سەرووی قەرەسودا دێتەخوار و بە دەوروبەری ئەرزڕۆمدا تێدەپەڕێت . لەم خاڵەدا بە ئاراستەی باکووری باکووری ڕۆژهەڵات هەڵدەکشێت و چەند بەشێکی هەرێمی قارس لە تورکیا دەگرێتە خۆ و لە سنووری تورکیا-شورەویی تێدەپەڕێت بە درێژایی زنجیرە چیای ئەلەگۆز لە ئەرمینیادا گوزەر دەکات .لەم خاڵەشەوە بەرەو باشوور دەکشێت و بە ڕۆژهەڵاتی خۆی دا تێدەپەڕێت و بە درێژایی ڕۆخی ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێدا دەڕوات بەچەشنێك : سەڵماس ، ورمێ هەروەها شنۆ لەخۆ دەگرێت . لە باشووری ئەم دەریاچەیەوە بەهێواشیی بەرەو ڕۆژهەڵات بادەداتەوە و لەپشت مياندواو و ئینجا بێجارەوە دەڕوات و بە ئاراستەی باشوور بۆ کنگاوەر بەردەوام دەبێت ، کەنارەکانی سەرووی ڕووباری قزڵئۆزوون دەبڕێت ، لێرەشەوە بەشێوەی چەماوەییەك بەرەو باشووری ڕۆژئاوا دادەگەڕێت و کرماشان دەگرێتەخۆ ، لە مانیشت خۆ لەسەر سنوورەکانی باکووری لوڕستان کۆتایی دێت .

سنوورەکە لەم خاڵەوە بەدرێژایی ڕووچاڵی چەماوەکە بە ئاراستەی باکووری ڕۆژئاوا هەڵدەکشێت ، لە خانەقینەوە بە نزیك سنووری عێراق-ئێراندا تێدەپەڕێت و دەشتی زەهاو و ماهیدەشت لەخۆدەگرێت . لێرەوە ڕووباری دیالەی نزیك قزڵ ڕبات دەبڕێت و بەئاراستەی باکووری باکووری ڕۆژئاوا سەردەکەوێت ، بە نزیك کفری و کەرکوکدا و بەدرێژایی زێی بچووك لە ئاڵتون کۆپرییەوە تێدەپەڕێت . لێرەوە بەرەو ڕۆژئاوا بادەداتەوە و چیاکانی قەرەچوغ و دەشتی هەولێر دەگرێتەخۆ . زێی گەورە لە ئاسکی کەڵەکەوە تێدەپەڕێنێت و بە درێژایی ڕۆخی جەبەل مەقلوب لە دهۆك و لەوێشەوە بۆ سێمێل هەڵدەگەڕێت . لەوێشەوە دیجلە دەبڕێت و بەرەو باشوور و دواتر

بەرەو باکوور دەکشێت ، نزیك لە پیشخابور تێدەپەڕێت و چیاکانی شەنگار لەخۆ دەگرێت . لەوێشەوە بەروە رۆژئاوا دەڕوات ، بەبەشی باکووری جەزیرەی ژووریدا تێدەپەڕێت ، لەوێشەوە بەرەو قەدپاڵەکانی باشووری تۆڕعابدین و قەرەچەداغدا بادەداتەوە و بە ئاراستەی رۆژئاوا نزیکی سنوورەکانی تورکیا–سوریا دەبێتەوە . بەنزیك ماردین ، ویرانشەهر ، ئۆرفە هەروەها کلیس دا تێدەپەڕێت و لەکورداغ کۆتایی دێت .

## جوگرافیای فیزیکیی

(فیشەر) ئاماژەی بەوە داوە کە یەکێتییەکی فیزیکیی کەم لە رۆژهەڵاتی تورکیادا هەیە .[3] ئەم سەرنجە دەگونجێت بەهەمانشێوە بەسەر تەواوی کوردستانیشدا بچەسپێت . گەلێك زنجیرەچیای ئەوتۆ کەلەپڕ ئاراستەی خۆی دەگۆڕێت وەك ئەوەی لە ناوەندی کوردستاندا هەیە . چەندین چاڵاوی رووباری وەك دیجلە و فورات . دەشتی داپرۆای وەك لە موش و خینس هەیە ، چاڵاوی نزم (ئۆڤە) وەك ئەوەی لە ورمێ و خۆی هەیە ، هەروەها بڕێکی بەرفراوانی نیشتەنییە گڕکانییەکان وەك ئەوەی کە زۆربەی بانە بەرزەکانی ئەرمینیای داپۆشیوە ، هەموو ئەوانە دەتوانرێت وەك بەڵگەیەك بۆ جیاوازیی مەزن و لاوازیی یەکێتی فیزیکیی تایبەتمەندی کوردستان ئاماژەی بۆ بکرێت .

## بەرزونزمیی

دەتوانرێت بگوترێت کە سێ زنجیرەچیا کوردستان پێکدەهێنن ، ئەرمەنیی یا تۆرۆسی رۆژهەڵات ، تۆرۆسی ناوەوە ،[4] لەگەڵ زاگرۆس . کۆتاییەکانی باشووری رۆژئاوا و باکووری رۆژهەڵاتی زنجیرەی تۆرۆسی ناوەند یان دژەتۆرۆس بەگشتیی دەبێتە

---

[3] Fisher,William Bayne.The Middle East, London, 1950 , 303.

[4] لە رووی کۆچەمکییەوە لە کاتی ئەم گفتوگۆکردنەدا ئەو چەمکەم بەکارهێناوە کە لەلایەن ئەخشەنامەی مەزنی شورەوییەوە سەبارەت بە زنجیرە چیای تۆرس لە تورکیادا بەکارهێنراوە کە تۆرۆسی رۆژئاوا ، تۆرۆسی ناوەند و تۆرۆسی رۆژهەڵاتە و تۆرۆسی ناوەوەیە

کۆتاییەکانی ڕۆژهەلات–ڕۆژئاوای هەردوو تۆپۆسی ڕۆژهەڵاتی یان ئەرمەنیی و تۆپۆسی ناوەوە . ئەم دوو زنجیرە چیایە لەسەرەتادا بەشێوەیەکی تەریب بەیەکتر دریژدەبینەوە و ماوەی نێوانیان تادێت فراوانتر دەبێت . تۆپۆسی ناوەوە بەشێوەی کەوانێك لە باکووری دەریاچەی وانەوە دریژ دەبێتەوە و بە ئاراستەی باکووری ڕۆژهەلات تا دوا خاڵی دریژیی دەکشێت ، لەکاتێکدا تۆپۆسی ڕۆژهەڵاتی کە بە نەرمیی بەرەو باشووری ئەو دەریاچەیە بادەداتەوە و بە ئاراستەی باشووری ڕۆژهەلات دریژ دەبێتەوە .

لەو چیایانەی دەرسیم کە کوردی لێ نیشتەجێیە ، تۆپۆسی ناوەوە بە مزووورداغی مەزن و دریژبوونەوەی ڕۆژهەڵاتی میرجانداغ دەستپێدەکات . کە دەکەوێتە ئاراستەی ڕۆژهەلات–ڕۆژئاواوە .[5] بەدریژایی ئەو هێڵەی بەئاراستەی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەم ناوچەیەدا دادەگەرێت چیای بینگوڵداغ (چیای هەزار دەریاچە) ، تاندروکداغ ، هەروەها ئارارات هەیە ، لەکاتێکدا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەم ناوچەیەدا : ئەمروودداغ ، سیپانداغ ، هەروەها ئەلاداغ هەیە ، هەموو ئەو چیایانە گرکانین.[6]

تۆپۆسی ڕۆژهەلات یا ئەرمینیایی ، کە بە چیای مەلاتیە و ئەلعەزیز دەستپێدەکات بۆ باشووری دەریاچەی وان لە ئاگرۆڤداغ ، ئەرنۆست میلیتۆ ، هەروەها باشیتداغ بەردەوام دەبێت .حەوزی ئۆردوز دەکەوێتە باشووری ئەم ناوچەیە ، کە لە هەوارگەی ناوچە بەرزاییەکان پێکدێت . هەر لەم ناوچەیەدا کە قەدپاڵە دریژبوومکانی ریزبەندی ئەم چیایانە نیشانەی گۆڕانی کتوپڕ و لەناکاو پێشاندەدەن . دیاردەی بەرچاوی ئەم ناوچەیە دیوارێکی بەردینیی مەزنە بە دەمازیر(دەریا–زیر)ناودەبرێت ، کە بە ئاراستەی باشووری ڕۆژئاوا دریژ دەبێتەوە و گردێك بە بەرزایی ١٠٥٠٠پێ

---

[5] Molyneux , -seeL, L ." A Journey in Dersim." , Geographical Journal 44,no.1,49-68.

[6] (ئۆسوالد) دەڵێت کە شکانەوەیەك بە ئەرمینیادا تێدەپەرێت لە گەرەجداغەوە دەردەپەرێت بەرەو ئەمرود . سیپان ، تاندورەك و هەروەها ئارارات بەرەو شێماخە لە قەفقاسیا بیست ساڵ پێشتر (کلایتۆن) بڕوای وابووە کە پەیوەستەگییەگی ژێرزمینی لەنێوان ئە گرکانانەدا هەیە .

Oswald, Felix. A Treatise on the Geology of Armenia ,London,1906,10;Clayton,E."The Mountains of Kurdistan".Alpine Journal 22,no.97(Aug 1887),296.

پێکدەهێنێت .[٧] لەپشت ئەم خاڵەوە ، بەرەو رۆژهەڵات ، ناوچەی چیایی هەکاریی دەستپێدەکات . پێکهاتەی ئاڵۆز لە شاخی گەردن کەش و دۆڵی قووڵ و گەرووی بەرتەسك دروست دەکات کە لە جیلۆ و ساتداغ دەکاتە ترۆپك ، کە هەر یەکەیان زیاتر لە ٤٠٠٠پێ بەرزە .لێرەوەیە کە تۆرۆسی رۆژهەڵاتی کتوپڕ بەرەو باشوور بادەداتەوە و لەگەڵ زنجیرە چیای زاگرۆسدا تێکەڵ دەبێت ، بە زنجیرەی باش-روان ، کە پێکهاتەیەکی مەزنی بەردیی گڕکانی رەشە و لە دوندی گومریاز گەڤەدان دەگاتە زیاتر لە ١١٠٠٠پێ .[٨]

بەگوێرەی فیشەر ، ئەو زەوییانەی بەشەکانی باکووری رۆژئاوای دەرووبەری زاگرۆس بۆ ئەنەدۆڵ پێکدەهێنن لە بنەڕەتدا ئاکامی جوڵانێکی تیکتۆنیی جیاوازن بە درێژیی درزی ئاشکرای لە خاکەکەدا دروستکردووە .[٩] ئەو ئاماژەی بەو دیوارە بەردیینە سروشتییە بەرز و حەوزە نزمانە داوە کە لەم ناوچەیەدا هەن ، کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا دەرچووەکانی بەشێوەیەکی نەرم تووشی خورانی ئاوەکیی بووە .[١٠] هەلومەرجەکە لە زاگرۆسی ناوەند جیاوازە ، زیاتر چەماوەیە وەك لەوەی تیژ و درزدار بێت . گەرووی قووڵی فرە کە لای خەڵکە خۆماڵییەکە (تەنگە)ی پێدەگوترێت ، ئەو چیایانە دەبڕێت و لەئاکامدا نموونەی رێڕەوی ئاویی ئاڵۆز پێکدەهێنێت .[١١]

---

[7] بۆ ئایابترین کۆڵینەوە لەسەر ناوچە چیاییەکانی باشووری دەریاچەی وان ، بڕوانە :

Frodin, Jhon." La morphologie de la Turquie sud-est.",1-28.

[8] بۆ زیاتر لەسەر ناوچەی هەکاریی ، بڕوانە :

W.T.Wigram and and Sir Edgar T.A. Wigram, The Cradle of Mankind, Life in Estern Kurdistan ,2d ed , 262-310.Cf.Basile Nikitine ,"Les Kurdes,30.

[9] Fisher,256.

[10] Ibid.

[11] Ibid.,258-59; Cressey , George Babcock. Asia's Lands and People :A Geography of One-Theird the Earth and Two Thirds Its People . New York:McGraw-Hill,1951,404; Lees,G.M " The Middle East ." 164-165.

## سەرچاوەی ئاو

سەرچاوەیەکی سەرەکیی رووباری دیجلە لە باشووری دەریاچەی گۆلکوکەوە لە شوێنێکدا بەناوی (دیڤەمبۆینوو/گەلی حوشتر ) هوە زۆر لە ئەرغانەوە دوورنیە ، هەربۆیە هێندێك جار ئەرغانەسوش ی پێدەگوترێت .بیست مایل لەخوار سەرچاوەکەیەوە ، سبێنەسو(دیبێنەسو) ی دەچێتەسەر ، ئەم دوو چەمە رووباری دیجلە پێکدەهێنن . لێرەوەدەتوانرێت ببینرێت کە بەرایی رووباری دیجلە دەرژێتە باشووری قەدپاڵەکانی تۆرۆسی رۆژهەلاتی یا ئەرمینیایی . بەگوێرەی (کوینت) ، رووباری دیجلە لەنێوان ئەم خاڵەوە و تا بە بۆتان سو دەگات ، زیاتر لە سی‌وچوار چەمی دەرژێتەسەر . لەهەموویان گرنگتر کە لەلای کەناری چەپییەوە دەرژێتە سەری بریتیە لە باتمانچای ، چەکلاتی سو ، هەروەها غارزان سو . ئەم چەمانە لە ساسۆن ، بەرزاییەکانی ئۆرۆش هەلدەقوڵێن و هەروەها بەشێك لە تۆرۆسی رۆژهەلات . بەشێك لەو چەمانەش لە کەناری راستییەوە لەم ناوچەیەوە پێیدەگەن ، لە چیاکانی قەرەجەداغ و تۆرعابدینەوە هەلدەقوڵێن . بەنێو ئەم رێرەوە چیاییانەدایە کە رووباری دیجلە لە دۆڵە قووڵەکاندا بەشێوەی پێچاوپێچ دەردەکەوێت . بۆتان سو کە ماوەیەك بە دیجلەی رۆژهەلات دەناسرا ، لە بەرزاییەکانی فەراشینەوە کە دەکەوێتە حەوزی ئۆردوزەوە و یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی ئاسیای رۆژئاوا هەلدەقوڵێت .ئەم رووبارە دەرژێتە حەوزی ئۆردوز و چیا بەرزەکانی دەریاچەی وان کە بە زنجیرەی ئەرنۆست دەناسرێت ، کە تێیدا سەرچاوەی موکس و شاتاخ ،بدلیس چای ، هەروەها کازەرسوری دەچێتە سەر .

دوای ئەوەی دیجلە بۆتان سوی دەچێتە سەر ، بەجەزیرەی ئیبن عومەردا دەروات و لەباکووری دەشتی میسۆپۆتامیادا دەردەکەوێت و دەرژێتە نزمایییەکی بەرفراوانەوە ، نزیك پیشخابوور ، ئینجا رووباری خاپووری دەچێتە سەر ، کە لەگەل ئەو چەمەی بەناوی هەزیل ، دەرژێنە حەوزی ئۆردوزەوە .

نزیکەی سی‌مایل لە باشووری پێکەیشتنی دیجلە لەگەل زێی گەورە ، زێی بچووکی دەچێتەسەر ، کە لەبانی ئێران و چیاکانی زاگرۆسەوە هەلدەقوڵێت . لە هەشتا مایلی باشووری ئەو خاڵەوە ، رووباری عوزێم دەرژێتە دیجلەوە ، کە لە گردۆلکە بەرزەکانی زاگرۆسەوە لە ویلایەتی کەرکوك لە عێراق هەلدەقوڵێت . رووباری دیالە کە

بەشی سەرەوەی بە سیروان ناسراوە ، لە دەمایلی باشووری بەغداوە ، دەرژێتە دیجلەوە . زێی بچووك و رووباری دیالە لە بانەکانی ئێران و چیای زاگرۆسەوە هەڵدەقوڵێت .[12]

فورات لە پێکەیشتنی دوو رووباری گەورە کە قەرەسو(فوراتی رۆژئاوا) و مورادسو(فوراتی رۆژهەڵات )ە پێکدێت . قەرەسو لە دوملوداغی باکووری ئەرزنجان بە بەرزایی ٨٦٢٥ پێ هەڵدەقوڵێت . ئینجا بەرەو رۆژئاوا –باشووری رۆژئاوا بە ئاراستەی ئەرزنجان دەڕوات . لەنێوان سەرچاوەکەی و ئەوشارەی دواییدا ، ژمارەیەك چەمی دەڕژێتە ناو ، کە گرنگترینیان : تۆقەجیك سو ، میرجان سو ، هەروەها چاندوخ سو لە کەناری راستی رووبارەکەن ، هەروەها تۆزلوسوش لەکەناری چەپەوە دەڕژێتە ناو رووبارەکە . لە پشتی ئەرزنجانەوە ، قەرەسو بە ئاراستەی باشووری رۆژئاوادا بەنێو گەرووی بەردیندا تا کەماخ دەڕوات ، لەوێ چەمی کوموسوی دەڕژێتە ناو . لەو خاڵەوە تا لەگەڵ مورادسو دا بەیەك دەگەن ، گەرووەکە بە جوانی سروشتەکەی ناسراوە .

مورادسو لە لاپاڵی باکووری ئەلاداغەوە لە باشووری رۆژئاوای دیادینەوە بە بەرزایی ١١٥٠٠ پێ هەڵدەقوڵێت . بە ئاراستەی رۆژئاوا و بەرەو دەشتی ئەریشکەر دەڕوات . لەوێ شاریان سوی دەڕژێتە ناو ، پاش ئەوەی بەخێرایی بەنێو چیاکاندا دەڕوات ، لەلای چەپەوە پاترۆتز و لەلای راستەوە خەنیس سوی تێدەڕژێت . لێرەوە ئاراستەی باشووری رۆژئاوا دەگرێتەبەر و یەکەمجار بە دەشتی بولامبیك دا تێدەپەڕێت و پاشان بەنێو دەشتی موش دا ، کە لەوێ قەرەسوی بچووکی تێدەڕژێت . لەپشت موشەوە ، ئەو دۆڵی مورادسوی پێدا دەڕوات زۆر تەسك دەبێتەوە ، بەوەش مورادسو ئاراستەی رۆژئاوای باشووری رۆژئاوا دەگرێتەبەر . بەشێوەیەکی باریك بەنێو گەروویەکی بەرەدڵاندا تێدەپەڕێت . لێرەدا گەنیك سوی تێدەڕژێت . لەپشت (پالو)وە دۆڵەکە برێك فراوانتردەبێت . نزیکەی ١٠مایل لە رۆژهەڵاتی –باکووری رۆژهەڵاتی خەرپوتەوە ، مورادسو یەك لە گرنگترین چەمەکانی دەڕژێتە ناو کە (پەری سو)وە . کە لەناوچەی

---

[12] Cuinet,Vital. La Turqi d'Asie, geographi administrative, statistique,descriptive et rasionnee de chaque province de l'Asie-Miineure.Vol. 2.Paris:E.Leroux,1891. Handbook of Mesopotamia ,London,1917-180,1:22; Hartmann ,R."Dicla, Dicla,"in Islam Ansiklopedisi,3:582-85,Istanbul,1955;Fisher,340ff.

ناوەوەی دەرسیم هەڵدەقوڵێت . مورادسو لەخاڵێك لەگەڵ قەرەسو بەیەك دەگەن کە زۆر لە (کابان مادین) ەوە دوور نیە ، درێژی مورادسو هەر لە سەرچاوەکەیەوە تا دەگاتە قەرەسو ٤١٥ مایلە ، لەکاتێکدا ئەوەکەی قەرەسو ٢٧٥مایلە . هەرچەندە مورادسو لە قەرەسو درێژترە ، بەڵام ئەو بایەخە بازرگانیی و مێژووییەی قەرەسوی نەبووە ، لەوانەیە بەهۆی تەسکی و داخراوی رەوت و ئاراستەکەیەوە بێت . لەوانەیە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بێت کە قەرەسو زیاتر لە مورادسو بەگشتیی وەك سەرچاوەیەکی سەرەکیی فورات لەقەڵەم بدرێت

لەپاش ئەو خاڵەی دوو رووبارەکەی تێیدا بەیەك دەگەن ، فورات بە ئاراستەی باشووری رۆژئاوادا دەڕوات ، ئەو چاڵاوە نیشتەنییەی کابان مادێن تێدەپەڕێنێت ، لێرەوە بەدەوری موشێرداغدا بادەداتەوە و پێچێکی گەورە دروستدەکات ، یەکەمجار کاروچای تێدەڕژێت ، پاشتریش دوای ٧مایلی دیکە تۆکماسو. لەپشت ئەو خاڵەوە ، تۆرۆس دەبڕێت ، بەخێرایی بەنێو قوڵترین و چۆڵترین دۆڵی ئاراستەکەیدا تێدەپەڕێت . لێرەوە بە ئاراستەی باشووری رۆژهەڵاتدا دادەگەڕێت لە سەرچاوەکەی دیجلەوە نزیك دەبێتەوە ، لەناکاو بادەداتەوە و بەئاراستەی باشووری رۆژهەڵاتدا دەڕوات ، چەند مایلێك لەسەروو ساەسات (سامسۆتا) وە چیاکان جێدەهێڵێت .

فورات لەدوای ئەم خاڵەوە دوو لقی گرنگی تێدەڕژێت کە ئەوەیش بالیخ و خابورە . ئەم دوو لقە زۆر جێگای بایەخی ئێمە نین ، چونکە بەشی زۆری لەبەر ئەوەی دەڕژێنە نێو خاکێکەوە کە کوردیی نیە .[١٣] جگە لە بەشە باکوورەکەی خاپور و چەمەکانی نەبێت : جوبجوب ، زێرگان و هەروەها جەغجەغ کە سەرچاوەکانیان لە قەدپاڵەکانی باشووری قەرەجەداغ و تۆرعابدینن .

### دابەشبوونی بەرهەمە سروشتییەکان

زۆربەی بەشەکانی بانەکانی ئەرمینیای باکووری دەریاچەی وان رووتەڵ و بێ

---

[١٣] "Euphrates," in Encyclopaedia Britannica,9:894-98. Hartmann ,R."Al Furat,"in Encyclopaedia of Islam 1 st ed 3:118-20;Fisher,340ff.

داره چونکه نیشتەنییە گرکانییەکان زۆربەی ئەو ناوچەیەی داپۆشیوە . هەرچەندە لەم چەند شوێنێکی وەك چیاکانی سۆغانلی لە باکوور هەلومەرجەکە جیاوازە . لە باشووری دەریاچەی وانەوە ، لە کوردستان باروذۆخەکە گونجاوترە ، وێڕای ئەوەی کە خاکەکەی بۆ ماوەیەکی زۆر بەدەست بڕینەوەی داری دارستانەکان و پشتگوێخستنەوە زیانێکی زۆری پێکەوتووە ، بەلام داروردەختێکی زۆری تێدا دەروێت . لەزۆربەی بەشەکانی کوردستاندا چیاکان بە داروردەختی هەمەچەشنی وەك کورتەبەڕوو داپۆشراون کە هەلگری مازووی بازرگانین. داوردرەختی دیکە لەم ناوچەیەدا دەبینرێت : حەیزەران ، چنار و شۆڕەبی یە . زۆربەی درەختەکانی وەرزیین ، هەرچەندە کاژ و سنەوبەر لە هێندێك شوێندا دەبینرێن .

میوەکانی ناوچەی فێنك وەك : ترێ ، هەنجیر ، سێو ، هەرمێ ، شیلانە ، هەنار ، قۆخ و توو لە گەل گوێزدا بەشێوەیەکی بەرفراوان لەو کوردستاندا بەرچاودەکەوێت . گەنم ، گاڵ ، جۆ ، گەنمەشامی و برنج دەروێنرێت ، لەگەڵ توتندا کە یەکێکە لەبەرهەمە بازرگانییە سەرەکییەکانی ناوچەکە . هەروەها بەلەك یش لە زۆربەی بەشەکانی کوردستاندا دەبینرێت . لەو سەوزەواتەی کە لە ناوچەکەودا دەرویت : باینجان ، کودیی ، سپێناخ ، بامێ و لۆبیای سەوز ، وێڕای هەموو ئەو سەوزانەی لەناوچەی فێنکدا دەروێنرێن . لەوەرزی بەهاردا ، بەشێوەیەکی تایبەت ناوچەکە بە گوڵ و گژوگیای کێویی دەرازێتەوە وەك : نەسرین ، گولیکەزار ، گوڵەباخ ، گوڵەمیلاقە ، هەروەها لە زۆزانی چیاکاندا جۆرەها مامیرانی ئەلپی ، سوێسنە ، شەهلا ، شلێر و گوڵەبەهارە هەیە .

ئاژەلانی ماڵیی کە لەنێو کورددا دەبنرێن بریتیە لە : مەڕ ، بزن ، ئەسپ ، هێستر ، گاو مانگا ، گامێشی ئاوییش لەهێندێك شوێن هەیە ، سەگ بەتایبەتیی (تانجی) کە کوردان گەلێك حەزیان پێیەتی ، هەروەها جۆرێکی زیت‌ودڕ کە کۆچەر یان سەگی شوانیی پێدەگوترێت ، پەلەوەریش وەك قەل و مریشك . لەنێو ئاژەڵە کێوییەکانی کوردستان : گورگ ، ورچ ، بەور ، پشیلەکێویی ، ڕێویی ، چەقەڵ ، کەڵەکێویی ، مەڕەکێویی ، بزنەکێویی ، بەرازەکێویی ، دەڵەك ، بۆرەسمۆرە . خشۆکەکانیش وەك : کیسەڵ ، جۆرەها مار ، قۆڕیی . لەو باڵندانەش کە لەم ناوچەیەدا هەن : پێ‌سوورە ، سوێسکە ، جۆرە سوێسکەیەکی گەورە (نورکەکلیك) ی پێدەلێن ، قەتێ ، لەقلەق ، چێرگ ، ماسیگرە . هەروەها سەبارەت بە باڵندە نێچیرەوانەکانیش هەلۆ هەیە . لەنێو ماسیشدا کە لە

کوردستان دەبینرێت ماسی خاتوونە لە سەرچاوە و کانیاوی چیاکاندا هەیە ، جۆرێکی سالمون ، سمێڵە ، هەروەها سورەماسی لە زێی گەورەدا هەیە .[14]

## ئاووهەوا :

کوردستان ئاووهەوایەکی کیشوەریی هەیە ، زستانێکی درێژ و سارد لەگەڵ هاوینێکی وشك و گەرم . هەروەها ئاووهەوای کیشوەری باکووری دەریاچەی وان دەگرێتەوە ، بەشێوەیەکی تەواو لە ئەرمینیای پێش کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیی . لەم ناوچەیەدا زستان ئەوەندە ساردوسەختە کە دانیشتوانەکەی ناچارن خانووەکانیان لەژێر زەویدا بنیاتبنێت . شاری ئەرزیرۆم هێندێك جار بە "سیبریای تورکیا" ناودەبرێت . لەم ناوچەیەدا شەش مانگ زستانە و زۆربەی کات پلەی گەرما لەژێر ١٥ پلەی فەهرەنهایتییە . لەم ناوچەیەدا بۆ ماوەی سێ هەفتە شەوانە پلەی گەرما دادەبەزێتە خوار ١٧پلەی فەهرەنهایتیی . کەمترین پلەی جێگیر ٣٠پلەیە کە تۆمارکرابێت . لە هێندێك بانە بەرزەکاندا ٤٠ پلە ئەبینراوە . ناوچەیەکی ساردی دیکە ، حەوزی ئۆردووزە کە دەکەوێتە باشووری دەریاچەی وانەوە ، ئەم ناوچەیە بە تایبەت لە زستاندا چۆڵدەبێت . هاوین گەرم و وشکە ، بەتایبەت بەرەو باکوور و رۆژهەڵات . بەرزترین پلەی گەرما لەهاویندا لە ١٠٠پلەی فەهرەنهایتیی تێدەپەرێت و زۆربەی جار لەهێندێك دۆڵدا دەگاتە

---

[14] سەبارەت بە گژوگیا و ئاژەڵانی ناوچە جیاوازەکان بڕوانە :

Hay,Major W.R.Two Years in Kurdistan ,London , 1921,13-34; Molyneux , -seeL,49-50; Lees," The Middle East ."192; Huntington, E."The Valley of the Upper Euphrates River and Its People,"306-8; Harris ,Walter B." A Journy in Persian Kurdistan.",453-57;Rambout,13-14; Bedir Khan, Kamuran. "The Kurdish Problem ." Journal of the Royal Central Asian Society 36,Parts 3and4 (July-Oct. 1949):238-39.

۲۱۰-۱۲۰پلەی فەرمنایتیی .[15]

## سەرچاوەکانی ژێر زەوی

کوردستان لە سەرچاوەکانی ژێرزەویدا دەوڵەمەندە ، بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کان و کەرەسەی خاوی سروشتیی لەلایەن گەڕیدە و خەڵکانی دیەوە لە بەشەکانی کوردستان باسی لێوەکراوە . هەرچەندە لەبەر چەند هۆیەك نە جۆر و نەبڕی ئەو کەرەسە و کانانە بەتەواویی دەستنیشان نەکراون . من لێرەدا ئاماژە بەچەند کەرەسەیەك دەکەم کە بەکارهێنراون . کرۆم لە گولمان دۆزراوەتەوە ، کە دەکەوێتە رۆژئاوای دەریاچەی وانەوە . ئەوەی لە گولمان دەردەهێنرێت ٦٠لەسەدی تێکڕای بەرهەمهێنانی کرۆمی تورکیا پێکدەهێنێت . کۆپەر کەرەسەیەکە لە ئەرغان مادێن لە ژوورووی دیجلەوە هەیە . زینگ و کاربۆن هێندێك جار پێکەوە دەبینرێنەوە ، لەگەڵ برێك لە زێڕ و زیو یاخود لەگەڵ مسدا هەروەك لە ئەرغان مادێن هەیە . سولفۆر لە زۆربەی ناوچەکەدا هەیە ، ئەسبێستیش لە قارس بینراوەتەوە .

نەوت لە بابەگوڕگوڕی نزیك کەرکوك دۆزراوەتەوە ، هەروەها لە ناوچەی نەفتخانە (نەفتشا) بەدرێژایی سنووری ئێران-عێراق . هەروەها بەشێوەی پەرت‌وبڵاو لە شوێنی دیکەی وەك نەفتداغ لە نزیك سلێمانی (کفری)لەعێراق ، لە دەوروبەری زاخۆ لەعێراق ، بەدرێژایی بۆتان لەتورکیا هەیە . هەروەها باس لە خەڵوز بەشێوە جیاجیاکانی دەکرێت . خەڵوزی رەش لەنزیك ساڵحییەوە هەروەها لە شەرانش لەعێراق هەیە . جۆرەها شێوەی بەردی بنیاتی وەك : گرانیت ، بەردەگەچ ، مەرمەڕ ، بەردی سپی لە زۆربەی ناوچەکانی کورستاندا هەیە . چەندین کانیاوی گەرم و مەعدەنیی لە ناوچە جیاجیاکاندا هەیە . بەردەخوێ لەچەندین شوێنی جیاوازی وەك توزخورماتو ،هەروەها گەچیش لە گردە نزمەکانی کوردستانی عێراقدا زۆرە .[16]

---

[15] Stamp.L.Dudley. Asia:A Regional and Economic History.London.1959.81.Fisher.309.

[16] Fisher.324-26; Soane .Report on Sulaimania District .14-15;Rambout.14-15:K. Bedir Khan. 239.

## دانیشتووان

ئامارەکانی قەبارەی دانیشتووانی کوردستان بەشێوەیەکی فرە جیاوازن . ناکۆکیی لەسەر ئەم بابەتە شتێکی نوێنیە ،جیاوازیی بەرچاو لەنێوان ئەو ژمارانەدا هەیە کە سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی لەپێش و راستەوخۆ پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی داویانە .[17] وێڕای ئەو راستییەی کوردان ئەمڕۆ تا سەردەمانی پێشوو باشتر دەناسرێت ، کەچی قەبارەی دانیشتووانی کورد بابەتێکە جێگەی مشتومڕە . ئەوەی لە بڵاوکراوە رۆژنامەکاندا بەشێوەیەکی تایبەتیی جێگای سەرنجە ، لەوەدا ئامارەکان نەك تەنیا لە رۆژنامە جۆربەجۆرەکاندا جیاوازیی هەیە[18] بەڵکو لە بابەتەکانی هەمان لاپەڕەی رۆژنامەیەکدا جیاوازە .[19]

ئەم ئاکامە بەشێکی لەو راستییەوە سەرچاوەدەگرێت کە تا ساڵی ١٩٥٠ ئامارێکی چەسپاوی دانیشتووانی ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدا نیشتەجێیە نەبووە . حکومەتگەلی ئەو وڵاتانە وێڕای ئەوەی ئامادەنەبوون زانیاریی تەواو لەمەڕ ئەو بابەتە بەدەستەوە بدەن ، ویستووشیانە ژمارەی کوردانی خۆشیان کەمتر لەوەی هەیە

---

[17] (لیڤەر جۆونی) کە لەلایەن حکومەتی فەرەنساوە لە ساڵی ١٨٩٢ دا چاپکراوە ، ژمارەی کوردەکانی نێو ئیمپراتۆریی عوسمانیی بە ٣٠١٢٨٧٩ کەس داناوە .لە بڵاوکراوەیەکی فەرمیی بەریتانیی سەبارەت بە ئەرمینیا و کوردستان ، ژمارەی کوردەکانی دەوڵەتی عوسمانیی تا پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی بە ١٥٠٠٠٠٠کەس دانراوە (ویلسن و راولینسۆن) ژمارەی ١٦٥٠٠٠٠یان داوە

Wilson C.F. and Rawlinson, H.C."Kurdistan ,"5:946-51.

[18] ژمارەیەك رۆژنامە بەشێوەیەکی رەمەکیی هەڵبژێردراون کە بەم شێوەی خوارەوە ژمارەی کوردیان داوە :

Chicago Daily News( Mar. 20, 1946),8 million;Manchester Guardian (Mar.21,1946)2.5 million;Times (London) (Mar.20,1946)3 million;Tribune des Nation (Apr.17,1952),9 million; The Scotsman, (Jan. 9,1951) 2.5million;New York Times, (Apr.7 , 1952)3-6 million;La Bourse Egyptienne(Oct.8,1952),4 million.

[19] بۆ نموونە رۆژنامەی (لیمۆند) لە ٤ی دیسەمبەری ١٩٤٥ دا ژمارەی کوردی بە ٨-٩ ملیۆن لەقەڵەمداوە ، کەچی لە ٧ی دیسەمبەری ١٩٥١ دا ژمارەی کەمی ئەو وڵاتانەی داوە کە تێکڕایانی بە ٣١٢٠٠٠٠ لەقەڵداوە

پێشانبدەن .[٢٠] سەرچاوە نەتەوەخوازەکانی کوردیش ، بەپێچەوانەوە ، ئارەزووی زیادپێوەنانی ژمارەی کوردانیان کردووە . هۆکارێکی دیکەی ئەم جیاوازییە ، کەمی کۆکبوونە سەبارەت بە پێکهاتەی کورد . بۆ نموونە ، نەتەوەخوازە کوردەکان گرووپی گەورەی وەك لوڕەکان بە بەشێك لە کورد دادەنێن ، لەکاتێکدا حکومەتی ئێران نکۆڵی لە کوردبوونی لوڕەکان دەکات . بایەخداران تا ئێستا سەبارەت بەو بابەتە کۆك نین . وێڕای ئەوەی ژمارەی دانیشتووانی کورد لە ئێران جیا لە ژمارەی کۆنفدراسیۆنی لوڕ واتە : لوڕ ، بەختیاریی و مامەسانیی دەخرێتە بەرچاو . بەهەمان شێوە ناکۆکیی سەبارەت بە کورد لە قەڵەمدانی ئەوانە هەیە کە بەشێوەزاری دملی قسان دەکەن وەك : زازاکانی تورکیا ، هەورامییەکانی سنووری ئێران–عێراق ، هەروەها گۆرانەکانی ئێران . هەرچەندە هێدی هێدی ئەم ناکۆکییانە کەمدەبنەوە ، بەوەی ئەم دەستە و گرووپانە وەك کورد پەسەند کراون کە بە شێوەزاری کرمانجی نادوێن .

ئەفسەری بەریتانیی (سی.جەی.ئێدمۆندز) ، یەکێکە لە نووسەرە سەرەکییەکانی سەبارەت بە کورد نووسیویەتیی ، ئەو لەنووسینێکیدا لە ساڵی ١٩٥٠ ، تەواوی ژمارەی کورد ، بەوانەی سوریا و یەکێتی شورەویشەوە ، لەسەروو ٥ملیۆن کەس داناوە .[٢١] ئەو دەڵێت کە کوردی عێراق دەتوانرێت بە ١,١ ملیۆن دابنرێت و پێنجیەك یاخود شەشیەکی تێکڕای دانیشتووان پێکدێنن . بەگوێرەی ئێدمۆندز ، کوردی ئێران لە کوردی عێراق

---

[20] پێدەچێت بڕواپێکراوترین ژمارەی دانیشتووانی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەتا ساڵی ١٩٦١ ئەرەکەی عێراق بێت لە ساڵی ١٩٥٧دا ئێدمۆندز بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ هەستاوە بە دیاریکردنێکی گشتیی و بەرفراوانی دانیشتووانی کورد لە ناحیە و قەزاو لیواکاندا

Edmonds ,C.J, ,Kurds, Turks and Arabs,438-40.Cf. Edmonds,C.J. " the Kurds of Iraq ." Middle East Journal 11,no 1 (winter 1957):52; Hourani ,A.H. Minorities in the Arab World,12-13; Randot,Pierrer. "La Nation Kurde en face des mouvements Arabes ."Orient 2, no 7 (1958):61.

هەرچەندە لە ئامارێکی فەرمییدا وەك کورد هیچ ژمارەیەك نەدراوە ، بەڵام ١٩٠٠٠٠٠بۆ ئەوانە دانراوە کە هەمان زمانی دایکیان هەیە کە کوردییە

[21] Edmonds,C.J. " Middle East Focus on the Kurd " Daily Telegraph (London), July 22 1958.

**فرەترن . بەڵام ڕێژەی پێکهاتەیان لەسەر ئاستی گشتیی بەشێوەیەکی بەرچاو کەمترە . ئەو ژمارەی کوردی تورکیای بە ٢,٥ ملیۆن داناوە .[٢٢]**

**دەبلیو.جەی.ئەلفینیستۆن ئەم ژمارانەی خوارەوەی لەمەڕ دانیشتووانی کورد بەدەستەوەداوە :[٢٣]**

| | |
|---|---|
| **تورکیا** | **١٥٠٠٠٠٠** |
| **عێراق** | **٨٠٠٠٠٠** |
| **ئێران** | **٦٠٠٠٠٠** |
| **سوریا** | **٢٥٠٠٠٠** |
| **یەکێتی شورەویی** | **٢٠٠٠٠** |
| **گشتیی** | **٣١٧٠٠٠٠** |

**(پیەر ڕاندۆت) بابەتەکەی بەم ژمارەیەوە وەرگرتووە ، بەشێوەیەك وای لەقەڵەم داوە کە ئەم ژمارەیە زۆر کەمە .[٢٤]**

**(ڕۆبێرت زێدنێر) ژمارەی کوردی ئەم وڵاتانەی خوارەوەی بەم شێوەیە داناوە :[٢٥]**

| | |
|---|---|
| **تورکیا** | **٢٠٠٠٠٠٠** |
| **ئێران** | **٧٥٠٠٠٠** |
| **عێراق** | **٧٠٠٠٠٠** |
| **سوریا** | **٢٥٠٠٠٠** |
| **ئەرمینیا و ئازەربایجانی شورەویی** | **٢٠٠٠٠** |
| **گشتیی** | **٢٨٠٠٠٠٠** |

[22] Ibid.

[23] W.G. Elphinston, " Kurds and the Kurds Question ,"41.

[24] Rondot, Pierrer, " La qestion Kurde dans l'Orient Contemporain, 4.

[25] Zeidner, Robert. "Kurdish Nationalism and New Iraqi Government ,26.

بەپێچەوانەی ئەو ژمارە کەمەی کە ئیلفێنستۆن و زێدنێر داویانە ، کۆمەڵەی کوردان لەساڵی ١٩٤٩دا ژمارەی کوردانی بەم شێوەیەی خوارەوە پێشکەش کردووە [٢٦] :

| | |
|---|---|
| تورکیا | ٣٨٠٠٠٠٠ |
| ئێران | ٣٠٠٠٠٠٠ |
| عێراق | ١٢٠٠٠٠٠ |
| گشتیی | ٣٨٠٠٠٠٠ |

لەساڵی ١٩٤٧ دا (لوسیان رامبۆت) ژمارەیەکی وەك ئەوەی سەرەوەی بۆ ئەو وڵاتانە داناوە و رێژەی سەدییەکەشی بە بێ ژمارەی گشتی دانیشتیووان داناوە [٢٧] :

| وڵات | کورد | رێژەی سەدی |
|---|---|---|
| تورکیا | ٤٠٠٠٠٠٠ | ٢٥ |
| ئێران | ٣٥٠٠٠٠٠ | ٢٣ |
| عێراق | ١٠٠٠٠٠٠ | ٢٨ |

لوسیان رامبۆت (بابە تۆماس بۆیس) ژمارەی کوردی سوریای بە ٢٥٠٠٠٠ و ئەوانەی لە یەکێتی شورەویی دەژین بە ١٦٠٠٠٠ داناوە و هەموویانی بە ٨٩١٠٠٠٠ داناون .

ئەمەی خوارەوە خشتەیەکە ژمارەی دانیشتووانی کورد دەردەخات بەو شێوەیەی لە چاپی ١٩٣٧ و ١٩٥٣ ی ئینسایکلۆپیدیای مەزنی شورەویی دا هاتووە [٢٨] :

---

[26] Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds and Their Claims,5

[27] Rambout,19.

[28] Kurdy,"Bolshaia Sovetkaia Entsiklopediia,2d ed (Mosco,1953).

| ولات | ١٩٣٧ | ١٩٥٣ |
|---|---|---|
| تورکیا | ١٧٠٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠٠٠-٢٥٠٠٠٠٠ |
| ئێران | ١٢٠٠٠٠٠ | ٢٥٠٠٠٠٠-٢٠٠٠٠٠٠ |
| | | به ٣٠٠٠٠٠ی خوراسانیشەوە. |
| عێراق | ٥٠٠٠٠٠ | ١٢٠٠٠٠٠ |
| سوریا | ٢٠٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠٠ |
| یەکێتی شورەویی | ٨٠٠٠٠ | ٤٥٨٦٦ |
| ئەفغانستان و پاکستان | —— | ٢٠٠٠٠٠ |
| گشتیی | ٣٦٨٠٠٠ | ٧٢٤٥٨٦٦ |

کۆی گشتیی ژمارەی دانیشتووانی چاپی دووەمی ئەو ئینسایکلۆپیدیایە دوور هێندەی چاپەکەی ١٩٣٧ گەورەترە . شایەنی سەرنجە ، ئەو گوتارەی سەبارەت بەکوردان لە قەبارە گەورەکەدا هاتووە زیاترە لەهەمبەر کورداندا دۆستانەترە و کەمتر لەگەڵ حکومەتگەلی ئەو وڵاتانەی کوردانیان تێدا نیشتەجێیە .

## مێژووی کورد

### رەسەنی کورد و مێژووی ناوی "کورد"

وێڕای ئەوەی کوردان بەشێوەزارێك قسان دەکەن کە لە فارسییەوە نزیکە ، ئەوان ، هەرحاڵ بەشێك لە رەسەنترین خەڵکانی ئێرانین . ئەو خاکەی ئەوان ئێستا لەسەری نیشتەجێن هەر لە دێر زەمانەوە بێوچان شانۆی هاتوچۆ و دەربەڕینی گەلانی جۆراوجۆر بووە . شەپۆلی یەك بەدوایەکی داگیرکەران ، سوپاگەلی ئیمپراتۆرییەکان و دەستەوتاقمە کۆچەر و دڕندە سەرەتاییەکان ئەم خاکەیان تەنیوە و هەریەکەشیان ناسەواری خۆی بە ئەندازەیەك لەسەر رەگەز ، زمان ، کەلتوور و تایبەتمەندیی دانیشتووانەکەی بەجێهێشتووە .

بەڵگەی ئەم ئاسەوار و خستنەسەرە دەتوانرێت لەو شێوازو سیفەتە فیزیکییە جۆراوجۆرانەدا ببینرێتەوە کە سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی وەك شێوەی کەللە ، قژ ، رەنگی چاو و هەروەها جەستەدا ، لەنێو کورددا هەن . هەروەها لە رووی زمانیشەوە ئاسەوار و پاشماوەی جۆراوجۆری لەسەر دەردەکەوێت . کاریگەریی سامیی لە هێندێك پیتی سەرەتایی وشەکانی وەك (حەوت) و (ئەسپ) دا ئاشکرایە . هەروەها کاریگەریی سکیسیشی لە هێندێك نموونەی وەك (تە) دا لەشێوەزاری بەشێك لە کوردانی باکوور لەکاتی بەکۆ کردنی وشەدا دەردەکەوێت ، بۆ نموونە (کەلەشتە/واتە چەتەکان-سەردەشتیی).[29] زۆر لە بیروڕا ئایینییەکانی ئایینی سانسکریتیی لەنێو کورداندا بەرجەستەیە ، وەك شکۆمەندیی خۆر لای ئێزیدییان و داروبەردیش لای دەرسیمییەکان ، ئەوانەی بەڵگەی زۆری کەلەپورێکی هەمەرەنگن .

سەرەتاییترین دانیشتووانی کوردستان ئەو خەڵکە رەسەنەی زاگرۆس و تۆرۆسی رۆژهەڵاتن . لەنێو دانیشتووانە جۆربەجۆرەکەی زنجیرە چیای زاگرۆسدا دەتوانرێت سێ گروپەکەی : گۆتیی ، لولوبیی ،و کاشییەکان بەنوێنەری ئەوانە دابنرێن . هەموو ئەم گەلانە نزیکایەتییان لەگەڵ ئیلامییەکاندا هەیە . سەرەتاییترین دانیشتووانی تۆرۆسی رۆژهەڵات ، هۆرییەکانن ، ئەوانەی هەروەها وا بیریان لێدەکرێتەوە کە لەگەڵ کۆمەڵی ئیلامییەکاندا نزیکایەتییان هەبێت .[30]

پەرەسەندنی تایبەتمەندیی کوردی ئێران لەسەرەتادا پرۆسەیەکی هێواش و پلەبەپلە بوو . یەکەمین داگیرکاریی هیندۆئەوروپییەکان بۆ ئاسایای رۆژئاوا لە هەزارەی سێیەمی پێش زاین و لە ئاستێکی بەرتەسکدا دەستپێکرد . تاکو هەزارەی دووەم ، ئینجا هیندۆئەورپییەکان بەشێوەیەکی بەهێز لەو ناوچەیەدا دەرکەوتن . هیتییەکان کە گەلێکی هیندۆئەوروپیی بوون ، زۆربەی ئەنەدۆڵ ، ئەرمینیا ، کوردستان ، میسۆپۆتامیا و هەروەها ناوچەکانی رۆژهەڵاتیان داگیرکرد .ئێرانیزەکردنی زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆس لەگەڵ دەرکەوتنی میدەکان ، فارسەکان و گەلانی دیکەی ئێرانییدا گەلاڵە بوو .

---

[29] V. Minorsky . "Kurds",in Encyclopaedia of Islam,1 st ed.,4:1132-55; V. Minorsky . "Les Origines des Kurdes,",152.

[30] Speiser, Ephraim Avigdor, Mesopotamia Origins.

دەگونجێت یەك لە باشترین کلیلەکانی رەسەنی رەگەزی کوردان لە کۆڵینەوەی بنج‌وبناوانی هەروەها مێژوویی وشەی (کورد)دا ببینرێتەوە . (جی.ئار.درایڤەر) هەوڵیداوە لە کۆڵینەوەیکی بایەخداردا بنج‌وبناوانی ئەو وشەیە شی بکاتەوە .ئاکامی ئەو کۆڵینەوەیە لەنێو نووسەر و بایەخداراندا جێگای پەسەندیی بوو . جگە لەو بڕوایەی کە باس لە سەرەتاییترین ئاماژەدان بە کورد دەکات لەسەر تابلۆ قوڕینەکانی هەزارەی سێیەمی پێش زاین .[٣١]

قسەکردنی زەینەفۆن سەبارەت بە کاردۆخییەکان لە (ئەناباسیس)ەکەیدا ، یەکێکە لە سەرەتاییترین ئەو ئاماژانەی سەبارەت بە کورد . لێرە بەدوا ، ئەم وشەیەی لەلای نووسەرە جۆربەجۆرە یۆنانیی و رۆمانییەکان بەشێوەیەکی کەم و جیاواز دەردەکەوێت . ناوی (کارداك) دەبینین وەك ئامازەیەك بۆ ئەو توێژە ئاسیاییە کرێگرتەیەی کە وەك بەشێك لەمێزە چەکدارەکان راژە دەکەن و خەڵکی ئەو هەرێمەن کە کاردۆخییەکانی تێدا نیشتەجێیە . بە گوێرەی درایڤەر ، یەك لەوانەی لێکدانەوەیان بۆ کارەکەی ستراپۆ کردووە ، گوتوویەتی بۆیە پێیان گوتوون (کارداك) " چونکە لەسەر دزیی و تالأنیی ژیاون ، کاردا خۆی مانای ئازا یان جەنگاوەر دەگەیەنێت."[٣٢] جێگەی سەرنجە ، لە ئاشوورییدا وشەی (کاردۆ) واتە "بەهێز یا قارەمان" ، هەروەها (کارادو) بە واتای "بەهێز بیت"[٣٣] ئەم ناوە بەگشتیی هاوتای وشەی (بێث کاردۆ) یا (بەکاردا) یەکە لە سەرچاوە سریانی و عەرەبییەکاندا دەبینرێتەوە . (بێث کاردۆ) بەو خاکە دەگوترێت کە دەکەوێتەوە نێوان دیجلە و شاخی جودییەوە . لەگەن نووسەرە کلاسیکییەکان ، (پاکتیکا) زۆر لەم ناوچەیەوە دوورنیە ، بەگوێرەی هیرۆدۆتس ، ئەرمەنییەکان و دانیشتووانی پاکتیکا هەڵبەندی سیازدەیەمی ئیمپراتۆری فارسی پێکدەهێنا .

ناوێکی دیکەی سەرنجراکێش (کاڵدی)یە ، کە پرۆفیسۆر ڤلادیمیر مینۆرسکی وەك (لێکچوویەکی گونجاوی دیارییکراو) بۆ ناوی (کورد) وەسفکردووە . کاڵدییەکان کە ئیمپراتۆری وانیان دامەزراندووە ، سەرەتا لە دەوروبەری کۆتایی سەدەی نۆیەمی پ.ز

---

[٣١] Driver ,G.R."The Name Kurd and Its Philological Connections,"393-403.

[٣٢] Ibid.,394.

[٣٣] Ibid.Cf. Minorsky , "Kurds," 1133.

دەرکەوتن و وەك دەسەڵاتێکی بەتوانا لە ناوچەکەدا تا دەرکەوتنی ئەرمەنییەکان لە دەوروبەری سەدەی حەوتەمی پ.ز خۆیان چەسپاند . کاڵدییەکان لە رۆژگاری خۆیاندا دەستیان بەسەر زۆربەی ئەرمینیا و باکووری کوردستاندا گرت و زۆربەی جاریش سەرکەوتووانە دژایەتیی ئاشوورییەکانیان دەکرد . گاشەبەردە چیاییە بەناوبانگەکەی کێلەشین لەنێوان رەواندز و شنۆدا ئاسەوارێکی (وان) یە بەڵگەی بڵاوبوونەوەی ئەو گەلەیە لە باشووری کوردستاندا .[34]

تەنانەت دوای نەمانی کاڵدییەکان وەك هێزێکیش ، ناوەکەیان وەك بەشێك لە جوگرافیای ناوچەی دەوروبەری واندا هەر مابوو ، بۆ نموونە : خیلات (ئەخلات) ، چاڵدێران ، چاڵدێر و زۆری دیکە ، مینۆرسکی ئاماژەی بەوە داوە کە باوەڕوایە هاوشێوەی ئەوە لە باکووری قەفقاسیش هەبێت ، بەوەی بە گورجییەکان دەگوترێت (خارشف ئەل) ، لەلای ساڤانییەکان (خیارد) و لای مینگرالییەکان (خۆرت–وو) .[35]

داخۆ کاردۆخییەکان یا کاردو سامیی بن یاخود خەڵکی رەسەنی ناوچەکەبن ، ئەوانە لە هەمان هەرێمدا ژیاون کە ئێستا کوردی لەسەرە . ئەو دەرئەنجامەی کە کاردۆ و کورد دەبێت هەمان شت بن . بەگوێرەی گوتەی پرۆفیسۆر مینۆرسکی بۆتە " راستییەکی بەڵگە نەویست لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا."[36]

ناوێکی ناسراوی دیکەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە (کرتی)یا(کیرتۆ) یە ، کە سترابۆ وەك ناوێك بۆ دانیشتووانی میدیای بچووك و فارس ئاماژەی پێداوە ، هەروەها عەرەبەکانیش ئاماژەیان بەو کوردانە داوە کە لەم دوو ناوچەیەدا ژیاون . عەرەبەکان بە (کورد)و(ئەکراد) ناوی ئەو گەلەیان بردووە . ئەمە هەمان ئەو ناوەیە کە ساسانییەکان بەکاریان هێناوە . ئاماژە هەیە کە لە (کارنامەکی ئەردەشێری پاپەکاندا) ناوی (کورد) یا (کوردان) هەبێت . پاشای میدیی بە "کوردان شاهی مادیگ"ناوبراوە .[37]

مینۆرسکی سەرنجی بۆ ئەو راستییە راکێشاوە کە ناوی (کورد) لە دەمێکی زۆر

---

[34] Driver ."The Name Kurd," 394.

[35] Adontz, Armenia v epokhu Iustiniana,398,Cited in Minorsky . "Kurds," 1133.

[36] Minorsky . "Kurds," 1133.

[37] Ibid.;see also Safrastian, Arshak.Kurds and Kurdistan,London,1948,16.

زوودا وەك هاوتای کۆچەر بەکارهاتووە . ئەو ئاماژەی بەو گوتەیەی حەمزە ئەلئەسفەهانیی داوە کە دەڵێت :" فارسەکان ، دەیلەمەکان بە کوردی تەبەرستان و عەرەبەکانیش بە کوردی لورستان ناودەبەن ."[38] لێرەوە ، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە نووسەرانی عەرەب کاتێك ناوی کورد دەبەن ، مەبەستیان تەنیا ئەو گەلە نیە کە بە زمانی کوردیی دەدوێن ، بەڵکو مەبەستیان هەموو ئێرانییانی کۆچەرە .

مینۆرسکی کە خۆی لە چوارچێوەی دیالێکتی کرمانجییدا هێشتۆتەوە وێڕای ئەوەی ئاماژەی بەوەداوە کە جیاوازیی و ناکۆکیی مەزن ، یەکێتییەکی شێوەزاری کرمانجیی دیاریدەکات ئەم یەکێتییە هەرگیز گومانی لێناکرێت کاتێك شێوەزارە هەمەڕەنگەکانی کرمانجیی لەگەڵ زمانی فارسیی یاخود زمانە جۆربەجۆرەکانی باکووری رۆژئاوای ئێراندا بەراورد دەکرێت . بەگوێرەی مینۆرسکی ، ئەم یەکێتییە دەبێت لە پێش دەورانی بڵاوبوونەوەی کوردەوە بوو بێت . ئەو کاتەی کە لە کۆمەڵگایەکی پێکەوەییدا دەژیان . زمانی کوردیی زمانێکی باکووری رۆژئاوای ئێرانییە ، ئەوەی ئەو بڕوای وایە کە لە سەرەتادا زمانی پارسەکان و تا رادەیەکی دیاریکراویش زمانی میدەکان بوو . دەرئەنجامەکەی ئەو بەو شێوەیەیە کە میدەکان و پارسەکان رۆڵێکی گرنگیان لە ئەخشاندنی تایبەتمەندیی و پێکهاتەی رەگەزی کورد و زمانەکەیدا بینیوە.[39]

مینۆرسکی گفتوگۆی لەمەڕ هەلومەرجی رۆژهەڵات لە سەروبەندی سەدەی نۆیەمی پ.ز دا کردووە ، کاتێك بۆ یەکەمجار گوێمان لە داگیرکارییەکی چەکدارانەی رەگەزە ئێرانییەکان بۆ ئەم ناوچەیە دەبێت ، پێشتر دوو هێزی رکابەری ئاشووریی و ئۆرارتۆکان هەبوون . ئەو ناوچانەی بە درێژایی سنوورە جیاجیاکانی رۆژهەڵاتەوەیە خەڵکانێکی نائێرانیی تێدا نیشتەجێ بوون ، وەك خارخار ، ئیلپی و زۆری دیکە . ژمارەیەك هێزی بچووك لەولاتری رۆژهەڵاتەوە هەبوون کە پاشایەتیی پارسوس بوو لە باشووری دەریاچەی ورمێ ، لای رۆژهەڵاتی ئەویشەوە پاشایەتیی ماننابیەکان بوو ، دواجار لە رۆژهەڵاتی ماننائانیشەوە ، میدەکان بوون . لەسەدەی حەوتەمی پ.ز ، ناوچەکە لە ئاکامی داگیرکارییەکی لەناکاوی کۆچەرەکان تووشی ئاڵۆزیی بوو .

---

[38] V. Minorsky ."The Guran," 75.

[39] Minorsky , "Kurds,"1133-34; armatta.Janos." Studies in the Languages of the Iranian Tribe in South Russia.",261-314.

کیمیرییەکان لەبەردەم دوژمنەکەیان کە سکیسییەکان بوو هەڵاتن ، دەستیان بەسەر ناوچەکانی باشووری قەفقاسدا گرت و پاشایەتیی ئۆرارتۆیان لە وان راماڵی و رێگایان بۆ ئاشوورییەکان خۆشکرد بەرەو رۆژهەڵات فراوانخوازیی بکەن . هەر زوو پاش گەیشتنی کیمیرییەکان ، سکیسییەکان کە بەدوایانەوە بوون لەسەر شانۆی ناوچەکە دەرکەوتن لە ماوەیەکی کەمدا توانیان فەرمانڕەوایی پاشایەتییە جۆربەجۆرەکانی باشووری دەریاچەی ورمێ بکەن ، بەتایبەت ، مانایییەکان و میدەکان ، لە کۆتاییدا میدەکان وەك هێزێکی باڵادەست لەم ناوچەیەدا دەرکەوتن پاش ئەوەی کۆمەڵکوژییەکیان دژی سەرانی سکیسییەکان ئەنجامدا . هەر زوو میدەکان ئەوەندە بەهێز بوون کە هاوپەیمانیەتییەکیان بۆ هێرشکردنە سەر ئاشوورییەکان پێکهێنا بووە هۆی رووخاندنی . کەوتنی ئاشوورییەکان بۆشایییەکی لە ناوچەکەدا پێکهێنا کە لەلایەن میدەکان و رەگەزە ئێرانیی یا ئێرانیزەکراوەکانی دیکەوە پڕکرایەوە . هەرچەندە دەرکەوتنی ئەرمەنییەکان لە سەر شانۆی ناوچەکە و داگیرکردنیان بۆ ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە باکووری دەریاچەی وانەوە ، فراوانخوازیی ئێرانییەکانی لەو هەرێمەی کە دەکەوێتە باشووری دەریاچەکەوە سنووردار کرد.[40]

## کورد و داگیرکاریی موسوڵمانەکان

واندەرەکەوێت کوردان بەشێوەیەکی بەرچاو لە قۆناغی فەرمانڕەوایەتیی ساسانییەکاندا هێزودەسەڵاتیان پەیدا کردبێت . لەکۆتایی ئەو قۆناغەدا بەرەو زۆربەی ناوچە چیاییە سنوورییەکانی رۆژئاوای ئێران کشان و دەسەڵاتی خۆیان لەوناوچانەدا چەسپاند . عەرەبە فراوانخوازەکان کوردیان وەك خاوەنی زۆربەی ئەم ناوچە سنوورییانە دیتەوە ، لەوێ کوردان بەرەنگاریی تێپەڕینی یەکەمین هێزەکانی عەرەبیان بەرەو ئێران کرد ، دواتریش کە داگیرکاری عەرەبیی بووە راستییەکی چەسپاو ، کوردان وەك رەگەزێکی یاخیبووی خەتەرناك بەردەوام بوون .

گەلی کورد پاش داگیرکاریی عەرەبیی لە لێڵیی ونارووونییەکی مێژوویدا سەریان

---

[40] Minorsky , "Les origins des Kurds,"147ff.

دەرهێنا ، چونکە نووسەرانی عەرەب بۆ یەکەمین جار زانیارییەکی دەوڵەمەند و فرەیان لەبارەی کوردەوە پێبەخشین . بەرگریی و بەرەنگاریی توندیی بەرایی کوردان لەماوەی قۆناغی یەکەمی فراوانخوازییەکانی عەرەب و یاخیبوون و ملنەدانی بەردەوامیان بووە هۆی دەرکەوتنی زیاتریان لە نووسراوە مێژوویە بەراییەکانی عەرەبدا. زانیارییمان سەبارەت بە کورد بەهۆی ئەو ئاستە مەزنایەتییەی گیانی حەز بە زانین و فێربوونەوەیە کە شارستانییەتی ئیسلامیی بەرهەمی هێنا . ئەوەی ئەدەبێکی جوگرافیی بەرفراوانی پێداین کە زۆربەی جار زانیاریی و گێڕانەوەی ورد و سەرسوڕهێنەری لەمەڕ گەل و ناوچەی جۆراوجۆر لەخۆ گرتووە .

واپێدەچێت بۆ یەکەم جار کوردان لە ساڵی ١٥ک/٦٣٧ز پەیوەندییان بە عەرەبەوە کردبێت ، ئەوەش پاش داگیرکاریی تکریت لە باکووری عێراق و هەروەها حەلوان لە رۆخی رۆژئاوای بانی ئێران . سێ‌ساڵ پاش ئەوە ، دەگوترێت فەرماندارە کوردەکەی ئەلزاوزان(ناوچەیەکە لە باکووری سنووری ئێستای عێراق) خەراجی داوەتە عەرەبە داگیرکەرەکان لەلایەن ئەوانیشەوە لە شوێنەکەی خۆی دانراوەتەوە . عەرەب کەوتنە شەڕی کوردان ، کاتێك ئەوان بۆ یاریدەدانی ئەلهەرزەبانی فەرمانداری فارسیی لە ئەحوازی باشووری ئێران لە ساڵی ٦٣٩ز بەرێکەوتن . عەرەبەکان لە ساڵی ٢٢ک/٦٤٣ز پاش جەنگێکی خوێناوی دژی کورد هەرێمی شارەزووریان داگیرکرد . هەواڵی ئەوە هەیە کوردان بەشداریی ژمارەیەك لە راپەڕینی ئەو کاتەیان کردبێت ، ئەوەیان کە زۆر بەرچاوە راپەڕینەکەی (ئەلخریت) ی نزیك ئەلئەهوازە لە فارس ، کە تێیدا کوردان بە هاوبەشیی لەگەڵ فارس و کریستیانییەکاندا بەشداریی ئەو راپەڕینەیان کرد . لەوکاتەدا کوردانی بەزۆر بە ئیسلامکراو پەشیمان دەبوونەوە و وازیان لە ئایینە نوێیەکەیان دەهێنا .[41]

لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتیی خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا ، کوردان چالاکانە لە یاخیبوونەکەی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەشعەسدا بەشدارییان کرد ، دەگوترێت کە عەبدولڕەحمان لەگەڵ کوردانی سابورانی هەرێمی فارسدا لەساڵی ٨٣ک/٧٠٢ز هاوپەیمان بووە . حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیی ، والی ئەمەوی لە عێراق ، لەساڵی ٩٠ک/٧٠٨ز دا سزای کوردانی هەرێمی فارسی بەهۆی کاری تێکدەرانە لەو

---

[41] Minorsky , "Kurds."

هەرێمە داوە . لەساڵی ١١٧ك/٧٣٥ز دا ، کوردان لە ململانێ و ڕکابەریی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی ئەمەوییەوە تێوەگلان و لەپاڵ خەلیفە مەروانی دووەمدا دژی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیك جەنگان . ئەو سولەیمانەی کە بەزی و تێکشکا .[٤٢]

کوردان پەیوەست بوون بە دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسییەوە ، کە یەکێکە لە ڕووداوە هەستیارە زۆر گرنگەکانی مێژووی ئیسلامیی . دەگوترێت ئەبوموسلمی خۆراسانیی کە ڕابەر و سەرکردەی هێزە هاوپەیمانەکانی عەباسیی بوو ، ئەوەی کە لە شەڕێکی توندوتیژدا سوپای ئەمەوی تێکشکاند و توانی بنەماڵەی ئەمەویی لەسەر تەختی دەسەڵات بێنێتە خوار ، ئەوەو ڕۆڵەیەکی کورد بووە .

بەدرێژایی مێژووی فەرمانڕەوایەتیی بنەماڵەی عەباسیی ، کوردان سەلماندوویانە کە یەکێك لە سەرسەختترینی ئەو ڕەگەزانە بوون فەرمانداریيان بەسەردا بکرێت . لەدەمی داگیرکردنی خازەر لەلایەن ئەرمینیاوە لەساڵی ١٤٧ك/٧٦٤ز دا ، کوردان ژمارەیەك ڕاپەڕینیان تەقاندەوە . لەساڵی ٢٢٠ك/٨٣٥ز دا ، لەسەردەمی موعتەسەمدا ، ڕاپەڕینێکی کوردیی بە سەرکردایەتیی جەعفەری کوڕی فەهارجیس لەناوچەی موسڵ سەریهەڵدا . لە ساڵی ٢٥٢ك/٨٦٦ز ، کوردانی موسڵ بە موساویری یاخییبووی خەوارجییەوە پەیوەست بوون . لەکاتی ڕاپەڕینی مەزنی زنجەکاندا ، کە هۆکارێکی ڕووخاندنی ئیمپراتۆریی عەباسیی بوو ، کوردان بەڕێبەرایەتیی سەرکردەکەیان کە ناوی محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی هەزارمەرد بوو ، لەگەڵ یاخییبوواندا هاوپەیمان بوون . لەو یاخییبوونەی سەرکردەی خەواریجی کورد کە ناوی دەیسەمی کوڕی ئیبراهیم بوو ، یاخییبووەکان کە زۆربەیان کورد بوون ، توانیان لە ساڵی ٣٢٧ك/٩٣٨ز دەست بەسەر ئازەربایجاندا بگرن .

---

[42] Ibid.

سەرهەڵدانی بنەماڵە فەرمانڕەوا خۆماڵییە کوردییەکان لە سەدەکانی نۆیەم ، دەیەم و یازدەیەمی زایینییدا بەشێکە لە دیاردەیەکی گشتیی کە لەسەراسەری خاکی ئێران و رۆژهەڵاتی خەلافەتدا خۆی پیشاندا . ئەم سەرکردنە لەپرەی وزەی ئێرانییان کە خۆراسانیی ، دەیلەمیی و هەروەها کوردی گەیاندە سەرتەختی دەسەلات ، نموونەیەکی هێنایە ئارا ، کە وێرای جیاوازیی لە رەنگی خۆماڵییدا ، بەلام لە نومێد و پێکهاتە و نێوەرۆکدا هاوشێوە بوون . پرۆفیسۆر مینۆرسکی بەشێوەیەکی گونجاو وەسفی ئەو قۆناغەی ململانێی و بالادەستیی رەگەزە ئێرانییەکان دەکات و بە "رابوونی ئێرانییان" ی ناودەبات ، هەروەك ئەو ئاماژەی پێداوە ، ئەم رابوونە خاڵی وەرچەرخان لە نێوان دوو قۆناغی هەستیاری مێژووی ئیسلامیی پێکدەهێنێت کە کەوتنی بالادەستی عەرەب و سەرهەڵدانی دەسەلاتی تورکانە .[43]

بنەماڵەی فەرمانڕەوایەتیی شەدادییەکان لەساڵی ٣٤٠ك/٩٥١ز دا لەلایەن محەمەد کوڕی شەداد کوڕی قەرتاقەوە پاش کەوتنی دەسەلاتی فەرمانڕەوای موزەفەرییەکان لە ئازەربایجان دامەزرا . شەدادییەکان لە لە رۆژهەڵاتی دەورووبەری قەفقاس فەرمانڕەوایەتییان کرد ، لەو ناوچەیەی رووباری کور و رووباری ئاراس سنووردار کرابوو . یەك لە لقەکانی شەدادیی ، گەنجەیان کردبووە پایتەختی خۆیان ، هەروەها لە دوێنی پایتەختی کۆنی ئەرمەنییەکاندا . لە گەنجە دە لە فەرمانڕەواکانی شەدادیی فەرمانڕەوایەتییان کرد . فەرمانڕەوایەتیی ئەم بنەماڵەیە لەساڵی ٤٦٨ك/١٠٧٥ز بە دەستی ئەلپ ئەرسەلانی سوڵتانی سەلجوقیی لەناوبران . لقەکەی دیکەی شەدادییەکان لە ئانی بەوە کە پایتەختی کۆنی ئەرمەنییەکان بوو ، فەرمانڕەوایەتییان دەکرد ، لە ئانی ، حەوت کەس لەم بنەماڵەیە فەرمانڕەوایەتییان کرد و دەسەلاتەکەشیان لە ٤٦٥ك/١٠٧٢ز بۆ ٥٩٦ك/١١٩٩ز خایاند .[44]

بنەماڵەی مەروانیی لەلایەن کوردباد ئەبو عەبدوڵڵا ئەلحوسەین کوڕی دۆستەك

---

[43] V.Minorsky ,"Studies in Caucasian History,109ff.

[44] Ibid.,1-104;also E.Denison Ross,"Shaddad." in. Encyclopaedia of Islam ,1st.ed.,7:246

ئەلهەربوختیی دامەزرا کە کوردێکی بە رەسەن خەڵکی چیای بەهاسانەی نزیك خیزین بوو ، دەرکەوتنی بەرچاوی ئەم میرە لەساڵی ٣٧٤ك/٩٨٤ز دابوو ، دوای مردنی عیزەدین ئەلدەولەی میری بوەیهیی ، توانی میافارقین بگرێت و لەگەڵ باقی دیکەی هەرێمی دیاربەکردا بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و دژی سەمسام ئەلدەولەی کوڕی ناسرئەلدەولەی حەمدانیی بوەستێت . باد کە لە شەڕێکدا لەگەڵ حەمدانییەکاندا کوژرا ، پاش ئەوەی خۆی بە ئەبوعەلی ئەلحوسەین کوڕی مەروانی کوڕی لەکاك ئەلهوربەختیی خوشکەزای شوێنی گرتەوە . ئەبوعەلی کە لە دیاربەکر دەسەڵاتی خۆی دامەزراند دەتوانێت بەیەکەم فەرمانڕەوای مەروانییەکان بدرێتە قەڵەم . قەڵەمڕەوەکەی نەسیبین ، جەزیرە و تۆرئەلعابدینی دەگرتەوە .

درەوشاوەترین ئەندامی بنەماڵەی مەروانیی بریتیبوو لە ناسرِ ئەلدەولەی ئەبو ناسرِ ئەحمەد ، ئەوەی بۆ ماوەی پەنجاویەك ساڵ فەرمانڕەوایەتیی کرد ، هەر لە ٤٠١-٤٠٢ك/١٠١٠ز بۆ ٤٥٣ك/١٠٦١ز . مێژوونووسان لەسەر ئەو کۆکن کە ناسرِ ئەلدەولە فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر و رۆشنبیر بووە ، مزگەوت ، نەخۆشخانە و پردی بنیاتناوە و نموونەی شاعیرێکی چاك و پیاوێکی خوێنەوار و زانا بووە . بنەماڵەی مەروانیی کە پێنج فەرمانڕەوایان هەبووە ، لەساڵی ٤٧٦ك/١٠٨٣ز دا کۆتایی هاتووە .[٤٥]

بنەماڵەی حوسنەوەی لە دەوروبەری ساڵی ٣٤٨ك/٩٥٩ز و لەلایەن حەسنەوەی کوڕی حەسەنی سەرۆکی خێڵی بەرزیکانەوە دامەزرێنرا ، ئەوەی سەرەتای کارەکانی خۆی بە هاوکارییکردنی روکن ئەلدەولەی بۆیهیی دەستپێکرد ، هەرچەندە بۆیهییەکان چاویان بڕیبووە قەڵەمڕەوی میرایەتیی حەسنەوەی ، کە ناوچەیەکی بەرفراوانی لە خوزستانەوە تا شارەزوور گرتبووەخۆ . بنەماڵەی حەسنەوەی بەو پێنج میرەی هەیانبوو تا ساڵی ٤٤٨ك/١٠٩٥ز لە فەرمانڕەوایەتییدا بەردەوام بوون .[٤٦]

بنەماڵەی دیکەی کورد بریتییە لە عەنەزمییەکان کە لەساڵی ٣٨١ك/٩٩١ز بۆ ٥١١ك/١١١٧ز فەرمانڕەوایەتییان کردووە . ئەوەی لەلایەن ئەبوئەلفەتح کوڕی محەمەد کوڕی عەنەزەوە دامەزراوە کە پایتەختی خۆی لە هەڵوان جێگیر کرد . دەوڵەتی عەنەزە

---

[45] Amedroz , H.F."The Marwandi Dynasty at Mayyafariqin in the 10th and 11th Centuries." Journal of the Royal Society ( Jan.1903 ):123-54.

[46] Minorsky , "Kurds," 1137.

ناوچە سنووربییەکانی نێوان عێراق و ئێرانی لەبندەستدا بوو . ئەوان حەوت فەرمانڕەوای عەنەزەیی بوون .[47]

مەزنترین و بەناوبانگترین بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کوردستان ئەوەکەی ئەیبوبییەکان بوو . ئەوەی لەلایەن سەلاحەدینی کوڕی یوسف کوڕی ئەیوب کوڕی شادییەوە دامەزراوە . ئەو سەلاحەدینەی لەکاتی شەڕی خاچهەڵگرەکاندا ناوی دەرکرد . بنەماڵەکە ناوی خۆی لە نەجمەدین ئەیوبی باوکی سەلاحەدینەوە وەرگرت . وا پێدەچێت تێکرای سەرچاوەکان لەسەر مێژوو و بنەماڵەی ئەیوبیی هاوکۆکن . ئەوان کوردی دوێن بوون و واپێدەچێت لە دەستوپێوەندەکانی فەرمانڕەوای کوردی ئەو شارەدا بووبن کە لە بنەماڵەی شەدادیی بوون . هەواڵی ئەوە هەیە کە باپیری سەلاحەدین ، واتە شادیی کوڕی مەروان لەگەڵ دوو کوڕەکەیدا کە ئەسەدەدین شێرکۆ و نەجمەدین ئەیوب بوون ، شاری دوێنی جێهێشتبێت و رووی کردبێتە بەغدا . لەوێوە گەشتێکی بۆ تکریت کردووە ، ئەیوبی کوڕی لەوێ بۆتە فەرماندەی شار . لەساڵی ٥٣٢ک/١١٣٧-١١٣٨ز دا ، دوای بیست ساڵ بەسەر هاتنی شادیی لە دوێنەوە ، سەلاحەدین لە تکرێت لە عێراق لەدایک بوو .[48]

باوکی سەلاحەدین و مامی لەئاکامی رووداوێکدا تکریتیان بەجێهێشت ، بۆ ئەوەی راژەی نورەدین زەنگیی ئەتابکی موسڵ بکەن ، کە پێشتریش لە سایەی ئەودا لە تکریت دامەزرابوون . پاش ئەوەی چەند ساڵێك وەك سەرباز و جەنگاوەر لە سوریا هەڵسوڕان و وەك نوێنەرێکی زەنگیی لەوێ بوون ، سەلاحەدین لە شوێنی شێرکۆی مامی وەك وەزیری خەلیفە ئەلعیزدی فاتمییەکان لە میسر دامەزرا .[49] سەلاحەدین دەرفەتی ئەخۆشی خەلیفەی فاتمیی قۆستەوە وەك کەسێکی مردوو و لێخراو رایگەیاند و فەرمانیدا بە گوتاربێژی مزگەوتەکان لە گوتارەکانیان بە ناوی خەلیفەی عەباسیی لەبەغدا بخوێننەوە ، ئەم کودەتایە بووە هۆی ئەوەی میسر بخرێتە سایەی بەناوی سەروەریی

---

[47] V.Minorsky ,"Annazids." Encyclopaedia of Islam ,New Addition,1:512-13.

[48] بۆ زیاتر لەمەڕ سەلاحەدینی ئەیوبیی بڕوانە : Minorsky ,"Studies in Caucasian History,107-57.

[49] نامادەکاریی بۆ گەیاندنی سەلاحەدین بە وەزارەت لەلایەن زیائەددین عیسای هەکاریی کوردەوە بوو .بڕوانە :

Ibid.,137-38; Lane-Poole ,Stanley .Saladin ,NewYork,1901.

بەغدا ، هەروەها لە هەمان کاتیشدا سەلاحەدین ببێتە سەرداری میسر . بەوەش سەلاحەدین بناغەی دەسەلاتی خۆی لە میسر چەسپاند و بەرەو سوریا جولاو زۆربەی ئەو ناوچانەی کە نەکەوتبوونە بندەستی خاچپەرستەکانەوە هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە . دروست هەر لەم ماوەیەدا بوو کە سەلاحەدین ئەوەندە خۆی بە دەسەلاتدار و بەهێز دەزانی کە هێزەکانی موسولمانی رێکخست و دژی خاچپەرستەکان سەرکردایەتیی کردن .

کاری سەلاحەدین لە جەنگی حیتین لە ٥٨٣ك/١١٨٧ز دا گەیشتە ترۆپك . ئەو جەنگەی توانای خاچپەرستەکانی تێکشکاند و زەمینەی بۆ خۆبەدەستەوەدانی ئۆرشەلیم تەختکرد .[50] سەلاحەدین پاش شەش ساڵ دواتر لە ٥٨٩ك/١١٩٣ز دا مرد . ئەو پێش مردنی، ئیمپراتۆرییەتە مەزنەکەی خۆی لەنێوان کوڕ و براکانیدا دابەش کرد . هەرچەندە هەر زوو پاش مردنی ململانێ و ناکۆکیی لەنێو بنەماڵەکەیدا سەریهەڵدا . مەلیك ئەلعادیلی برای توانی بەشی زۆری قەڵەمڕەوی ئەیوبیی بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە ، بەڵام ئەویش بە دابەشکردنی قەڵەمڕەوەکەی بەسەر کوڕەکانی هەمان هەڵەی سەلاحەدینی دووبارە کردەوە ، ئەلکامیل میسری بەرکەوت ، ئەلموعەزەم دیمەشقی بەرکەوت ، هەروەها ئەلفایز عێراقی بەرکەوت . ئەلفایزیش سەرەتا لەلایەن ئەلئەوحەدی برایەوە شوێنی گیرایەوە و پاشتر لەلایەن ئەلئەشرەفەوە . تەنیا حەڵەب مایەوە کە لەلایەن نەوەکانی سەلاحەدینەوە بەڕێوەدەبرا .[51]

## مەغۆل وکورد

داگیرکاریی و پەلاماری مەغۆلەکان لە سۆنگەی تایبەتمەندیی کتوپڕیی و توندوتیژییەوە . دەگونجێت زیاتر لە داگیرکاریی و وێرانکاریی تورکان وێرانکاریی و کاولکارییەکی مەزنتری بەسەر کوردستاندا هێنابێت ، هەرچەندە کاریگەرییەکەشی بە شێوەیەکی بەردەوام نەبوو . وادەردەکەوێت مەغۆلەکان سەبارەت بە تایبەتمەندیی

---

[50] بۆ گفتوگۆ لەمەڕ رێکخستنی سوپاکەی سەلاحەدینی ئەیوبیی ، بڕوانە :

Gibb.H.A.R."The Armies of Saladin.",Cairo,1951, 304-20.

[51] بۆ گفتوگۆیەکی گشتگیر لەمەڕ بنەماڵەی ئەیوبیی ، بڕوانە :

Cahen, Claude." Ayyubids"In Encyclopaedia of Islam,2ed Edition, 1:796-807.

جەنگاوەریی کوردانیان زانیبێت تەنانەت پێش ئەوەی بگەنە کوردستان . جێگەی سەرنجە مانگوخانی گەورە ئەم فەرمانەی خوارەوەی بە هۆلاکۆخان داوە ، ئەو هۆلاکۆیەی خەریکی هەڵکوتانەسەر رۆژئاوای ئاسیا بوو بۆ ئەوەی دەوڵەتی خەلافەت داگیر بکات :" بە باشی مامەڵە لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بکە ملکەچ دەبن ! هەموو یاخییەك تێکبشکێنە ! هەموو ئەو قەڵایانەی دەکەونە سەر رێگەت تەختیان کە ... لە تورانەوە هەڵکوتەسەر ئێران و کاتێك لەوێ بوویتەوە . بەرەو عێراق بکشێ . ئەو کورد و لورانە تەفروتوناکە و قەڵاکانیان لە کەرداخکۆ و لێمبێهسەر وێرانکە ، ئەو خەڵکەی ئەوێ هەموو ئەو گەشتکەرانە بەهۆی جەردەکانیانەوە دەخەنە دڵەراوکێ ."[52]

ئەو کاولکاریی و وێرانکارییەی لە ئاکامی داگیرکاریی مەغۆل لە کوردستاندا هاتە ئارا . ئەوەندە تایبەتمەند و توندوتیژ بوو کە بە پێی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان ، زۆر بەشی کوردستان لە ئاکامی کاری کۆمەڵکوژیی و هەڵاتنی دانیشتووانەکەیەوە بە تەواویی چۆڵ بوو . زانیاریی وا هەیە کە چەند عەشیرەتێکی ناوچەی شارەزوور لە ترسی داگیرکاریی مەغۆل هەڵاتبێتنە میسر . ئەم هەڵاتنە لە ترسی مەغۆل هێندێك لە عەشیرەتە کوردەکانی گەیاندۆتە ناوچە دوورەکانی رۆژئاوای جەزائر و بەگوێرەی ئیبن خەلدون دوو لە عەشیرەتە کوردەکان بەناوی (لاوین) و (بادین) هوە چوونەتە جەزائر لەوێ لەلایەن خەلیفە ئەلمورتەزی ئەلموحەدیسەوە پێشوازیی کراون .[53]

ئەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوان لەناوچوونی دەسەڵاتی مەغۆل و دەرکەوتنی سەفەوییەکان ، دەرکەوتن و کەوتنی دوو بنەماڵە لە فەرمانڕەوا تورکمانەکانی لەسەر خاکی کورد بەخۆوە بینی کە (بنەماڵەی ئاق قۆینلو/مەڕی سپی) و (بنەماڵەی قەرەقۆینلو/ مەڕی رەش ) بوون . هەروەها دەرکەوتن و داگیرکاریی تەیمورلەنگ ، کە لە وێرانکاریی و توندوتیژییدا رکابەریی و پێشبڕکێی داگیرکاریی مەغۆلەکانی دەکرد .[54]

---

[52] Safrastian,37.

[53] Minorsky , "Kurds."

[54] Ibid.;also V. Minorsky ,"Ak Koyunlu," in Encyclopaedia of Islam ,New Addition,1:311-12.

دوای سەرهەڵدانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی و سەفەوییەکان لە تورکیا و ئێران ،، لە راستییدا کوردان و وڵاتەکەیان بووە گۆڕەپانی ململانێی نێوان ئەم دوو دەوڵەتە بەهێز و دەسەڵاتدارە . سەفەوییەکان کە توانیان بەشی زۆری باکووری کوردستان لە بنەماڵە فەرمانڕەوا تورکمانەکان بستێنن و بیخەنە بندەستی خۆیانەوە ، هەر زوو کوردیان بە قازانجی عوسمانییەکان لەدەست چوو . جەنگی چاڵدێران لە ساڵی ١٥١٤زدا بەروارێکی فرە گرنگە لە مێژووی کورددا . هەرچەندە عوسمانییەکان توانیان لەمپەر لەبەردەم توانا و هێزی سەفەوییەکان دابنێن و بیانوەستێنن ، بەڵام نەیانتوانی بە تەواویی تێکیان بشکێنن و لەناویان بەرن . لە ئاکامی ئەم بەزینەدا ، سەفەوییەکان ناوچەی مەزنی کوردستانیان لەدەستدا . بەدرێژایی سێ سەدەی داهاتوو ، شەڕوپێکدادان لە نێوان عوسمانیی و ئێرانییەکان تاوتاو بەردەوام بوو ، لە سۆنگەی ئەوەشەوە کوردان زیانێکی مەزنیان بەرکەوت . نەك تەنیا لەبەر ئەوەی وڵاتەکەیان وەك گۆڕەپانێکی جەنگ وێران دەبوو ، بەڵکو چونکە هەر دوو هێزە دوژمنکارەکە کوردیان لەنێو هێزە چەکدارەکانی خۆیان دادەنا و شەڕیان پێدەکردن .

پاش جەنگی چاڵدێران ، ئەو سیاسەتەی کە سوڵتان سەلیم یاوزی عوسمانیی لەمەڕ کوردان گرتبوویە بەر پێچەوانەی ئەوەی کە شائیسماعیلی سەفەویی بوو . دەگوترێت شا ئیسماعیل ئەو یازدە سەرۆکە کوردەی دیلکردووە کە بەمەبەستی دەربڕینی لایەنگریی و پشتگیریی چوونەتەلای و سەردانیان کردووە و کوردیشی فرە بێزار کردووە بەوەی فەرمانداری عەجەمی بەسەردا سەپاندوون .[٥٥] سوڵتان ، بە پێچەوانەوە ، سیاسەتێکی دووربینیی و بەخشندەیی مەزنی لەهەمبەر کورداندا گرتەبەر ، ئەو متمانەی خۆی بە ئیدریسی بدلیسیی دا کە دەوڵەتمەندێکی کوردی لێهاتوو بوو تاکو رێکخستنی کوردستان و بەستنەوەی میرنشینە نۆتۆنۆمە کوردییەکان بە رژێمی ئیمپراتۆریی عوسمانییەوە بخاتە ئەستۆی خۆی . ئەو دەسەڵاتە بەرفراوانەی کە بە ئیدریسی بدلیسیی

[٥٥] Minorsky , "Kurds."

داراوە لەو فەرمانەدا دەردەکەوێت کە سوڵتان لە ساڵی ٩٢١ك/١٥١٥ز دەریکردووە.[٥٦]

لە ساڵی ١٦٣٩زدا ، ڕێکەوتننامەی زەهاو لەنێوان سوڵتان مورادی چوارەم و شا سەفیەدیندا مۆرکرا و تێیدا سنووری نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەکە دیاریکرا .[٥٧] ئەم ڕێکەوتنە کوردی بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەنێوان هەردوو وڵاتدا دابەشکرد .

ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی کە لەنێوان کورد و عوسمانییەکاندا لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا هەبوو هەر زوو تێکچوونی بەسەردا هات . واپێدەچوو چیدی حکومەتی عوسمانیی ترسی لە دەسەڵاتی ئێرانییەکان نەمابێت ، ئەو هەلومەرجیان لەبیر کرد کە کوردی تێدا هاتەپاڵ عوسمانییەکان و پەسەندی کرد هاوکارییان لەگەڵدا بکات . لەساڵی ١٦٥٠ بۆ ١٧٣٠ ، عوسمانییەکان زۆربەی میرنشینە ئۆتۆنۆمە کوردییەکانیان لەناوچەی دیاربەکر و وان سەرکوت کرد ، ئەو پرۆسەیەی نەهێشتنی میرنشینە کوردییەکان لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەیەمدا تەواوبوو .

کەوتنی بنەماڵەی سەفەویی و خۆسەپاندنی نادرشا بەسەر تاج‌وتەختی ئێرانیی لە ساڵی ١٧٣٦دا ، کوردی تووشی قۆناغێکی پڕ نەهامەتیی نوێی کرد . نە هەر لەبەر ئەوەی ئەم شا پەلاماردەرە بەشێوەیەکی فرە کوردی لە هەڵمەتە سەربازییەکانیدا بەکاردەهێنا ، بەڵکو لەبەر ئەوەی جەنگە زۆر و زەوەندەکانی لەگەڵ ئیمپراتۆریی عوسمانیی لەناوچوونی خەڵك و ماڵوێرانییەکی گەورەی لێکەوتەوە . لەنێو ئەم کارو هەنگاوانەی نادرشا ، گواستنەوەی هەزارەها خێزانی کورد بوو بۆ خۆراسان بە مەبەستی پاراستنی سنووری ئێران لە پەلاماردان و داگیرکاریی تورکمانەکان .[٥٨]

ئەو قۆناغە نائارامیی و پرکێشە و هەرایەی دیکە کە مردنی نادرشا لە ساڵی ١٧٤٧دا بەدوای خۆیدا هێنا ، بووە هۆی هاتنە سەرشانۆی کەسایەتییەکی بەرچاوی کورد ئەویش کەریم خانی زەندە ، ئەوەی بۆ ماوەی نزیکەی سی ساڵ وەك بریکاری شا فەرمانڕەوایەتیی ئێرانی کرد . بەگوێرەی تێکڕای سەرچاوەکان ، کەریم خان فەرمانڕەوایەکی بەخشندە و ڕووناکبیر بووە و لەماوەی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا

---

[٥٦] بۆ تەواوی دەقی ئەم فەرمانە، بڕوانە : زکي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ١٨٤-٩٠

[٥٧] سەبارەت کێشەی ئاڵۆزی سنووری تورکیا-ئێرانیی و وەرگێڕانی دەقی ئەم ڕێکەوتنە بڕوانە :

Edmonds .Kurds. Turks and Arabs,125-39.

[٥٨] سەبارەت بە وردەکارییەکانی ژیانی نادرشا،بڕوانە: Lockart. Laurence. Nadir Shah. London. 1930

(١٧٥٠-١٧٧٩) ، وڵات  لە دەست ئەو توندوتیژیی و وێرانکاریی و خوێنڕشتنەی فەرمانڕەوایانی پێش کەریم خان بۆ ماوەیەك ڕزگاری بوو و حەوایەوە .[٥٩] کەریم خان لەلایەن لوتف عەلی خانی بەدبەختەوە شوێنی گیرایەوە . ئەوەی پاش ململانێیەکی درێژ لەگەڵ ئاغا محەمەد خانی وەزیریدا ، کە پاشان بووە دامەزرێنەری بنەماڵەی فەرمانڕەوای قاجاریی ، بووە قوربانیی غەدر و ناپاکیی وەزیرباشیی .[٦٠]

واپێدەچێت کوردان لە سایەی یەکەمین فەرمانڕەوای قاجاردا چاك نەهاتبێتە ڕێگەیان . ئاغا محەمەد خان کە پیاوێکی دڵڕەق و دڵڕەش بوو ، هەوڵیدا تەواوی خێڵی زەند و هەموو ئەوانەی هاوپەیمانین ،لەناوبەرێت .[٦١] هەرچەندە بۆخۆی نا ، بەڵام یەك لە شایانەی دوای ئەو هاتن ، ئەویش ناسرەدین شایە ، کۆتایی بە دەسەڵاتی خۆجێی کورد لە ئەردەڵان و وڵاتی موکریان هێنا . ئەو ڕاستییەی کە بنەماڵەی فەرمانڕەوای ئەردەڵان خزمایەتییان لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتییدا هەبوو هیچی لەومەسەلەیە نەگۆڕی .

غولام شاخان دوامیری ئەردەڵان بوو ، کە لەساڵی ١٨٦٥ دا دەسەڵاتی گرتەدەست . پاش مردنی ئەم میرە دوای چەند ساڵێك ، ناسرەدین شا وەك شایەك و وەك خزمێکی مەزنیش مافی خۆی بەکارهێنا و ڕێگەی نەدا کەسی دیکە لە بنەماڵەی ئەردەڵان شوێنی بگرێتەوە . بەوەش کۆتایی بەتەمەنی بەتەمەنترین مرنشینی کوردیی هێنا .[٦٢] بابەمیرییەکانیش کە لە سابلاغی پایتەختەکەیانەوە فەرمانڕەوایەتیی هەرێمی موکریانیان دەکرد ، پاش چەند ساڵێك تووشی هەمان چارەنووس بوونەوە . واپێدەچێت هەر دوای داگیرکارییەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ ئێران (بڕوانە بەشی چوارەم) لێخرابن .[٦٣]

---

[59] Browne, Edward. A Year Amongst the Persian: Impressions as to the Life , Character, Though of the People of Persia.3rd ed .London :A and C. Black, 1950.94; Nikitine ,"Les Kurdes,178,187.

[60] Browne, A Year Amongst the Persian,310ff; Nikitine ,"Les Kurdes,169.

[61] Huart ,C.,and L. Lockart, "Agha Muhammad Sah" in Encyclopaedia of Islam ,New Edition,1:246-47.

[62] E.B. Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise,"2d ed , 218 and 378-79.

[63] Mirza Muhammad Djewad al-Kazi,"Studien aus dem Rechtsleben in Kurdistan,

سەیر دێتە بەرچاو ، سەرکوتکردنی ئەم دوو میرنشینە کوردییە زۆر کەم یان هەر هیچ ورووژانێکی لە ئێراندا بەرپا نەکرد ، لەکاتێکدا هەنگاوی بەو شێوەیە لە تورکیا ئاکامی جیاوازی لێکەوتەوە .

## ئاین

زۆربەی کورد موسوڵمانی کوردی شافعین . پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان ، لەوانەیە زۆربەی کورد زەردەشتیی بووبێتن .[٦٤] هێندێکیان بتپەرست بوون ، لەکاتێکدا هێندێکی دیکەیان کریستیانیی بوون . هێشتا لەنێو کورداندا بیروباوەڕ و هەڵسوکەوت و ئاکاری زەردەشتیی و کریستیانیی و بتپەرستیی بەربڵاوە .

واپێدەچێت کریستیانیی هەر لەسەرەتای قۆناغێکی بەرایی کریستیانییەوە خزابێتە کوردستان ، (مارماری) کە لە ٢٢٦ز لە ئۆرفە مردووە ، دەگوترێت کە پاشاو خەڵکی شەرگاتی هێناوەتە سەر ئایینی کریستیانیی ، ئەوانەی " داریان پەرستووە و قوربانییان بۆ بتی لە قورقوشم دروستکراو کردووە."[٦٥] هەروەها ئەو دەزانین کە (ئیشایابە) کڵێسایەکی لە نزیك تامانین لە دەوروبەری جەزیرە بنیاتناوە " لەو شوێنەدا کوردان قوربانییان بۆ شەیتان دەدا."[٦٦] ئەو کوردانەی لە لایەن (مارسابە)وە کەلە ٤٨٥ز مردووە ، کرابوونە کریستیانیی بەوە ئاسرابوو کە پێشتر خۆرپەرست بوون .

---

Stuttgart,1909,345.

[64] Minorsky , "Kurds,"1151.

بەگوێرەی (مارك سایکس) ، ژمارەیەك لەو کوردانەی بینیونی پێیان راگەیاندووە کە پێش هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە، باپیرانیان زەردشتیی بوون

Sykes,Mark.The Caliphs Last Heritage:A short History of Turkish Empire,London,1915,425.

[65] Hoffman,Ausuzge,270,quoted by Minorsky , "Kurds."

[66] Minorsky , "Kurds," 1151.

**ئەلمەسعودیی مێژوونووسی عەرەب کە لە سەدەی چوارەمی کۆچییدا نووسیویەتی ، ئاماژە بەو کوردە یەعقوبیی و جورقانییانە ئەدات کە لەدەوروبەری چیای جودییدا هەبوون .[٦٧] لە نووسەری (پسیۆدۆ-ماجریتی)وە کە لە دەوری سەدەی پێنجەمی زاییینییدا نووسراوە ، چیرۆکی سەرنجڕاکێش دەبیستین کە چۆن کوردانی کریستیانیی بە ئاشکرا وەرگەڕان و دەیانەوێت ببنە جادووگەر .[٦٨]**

**تەنانەت لەم سالانەی دوایشدا ، بەڵگەی زۆر هەیە کە ئاینی کریستیانیی لە یەك کاتدا لە کوردستاندا بلاوبۆتەوە . بەگوێرەی نووسەرێکی هاوچەرخی کورد ، لەنێو هێندێك لە خێڵە کوردەکاندا پێش ئەوەی هەویر بکەن بە نان وێنەی خاچێکی لەسەر دەکێشن .[٦٩] ویگرام و ویگرام پێمانڕادەگەیەنن کە لەماوەی کۆچی سالانەی خێڵە مەڕدارەکانی هەرکیی ، ئەندامەکانیان لەگەڵ خۆیاندا سندوقێکی لەدار دروستکراویان لەشێوەی پەیکەرێکدا پێیە و وا مەزەندە دەکرێت کە سەری (سانیت جۆرج) بێت .[٧٠] باسیل نیکیتین ، رابەری کوردناسیی ، ئاماژەی بەهەمان چیرۆك داوە و ئەوەشی خستۆتە سەر کە خێڵی دیکە کوردیش وەك عەبدۆیی و نیسانیی ئاکاری لەو شێوەیان لێدەبینرێت .[٧١] بە گوێرەی نیکیتین ، زۆر لە خێڵەکانی بۆتان ، میدیات ، ساسۆن و ناوچەکانی تر هێشتا بیرەوەریی پێشینەی کریستیانیی کۆنی خۆیان لا ماوە ، ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە ساسۆن پێیان دەگوترێت "ئەوانەی نکۆڵییان لە خاچ کرد."[٧٢]**

**دۆزینەوەی بەودواییەی نوێژ و پاڕانەوەی کریستیانیی کە بە زمانی کوردیی نووسراوە تیشکێکی سەرنجڕاکێش دەخاتە سەر مێژینەی کریستیانیی لەنێو کورددا .**

---

[67] المسعودي ، مروج الذهب ، ج٣،٢٥٤، وەرگیراوە لەلایەن:Minorsky , "Kurds," 1135

[68] پیاوێکی ئاعەرەب لەنێو کوردانەوە چۆتە لای شێخێکی بابلیی و پێیگوتووە :قوربان دەمەوێت فێری جادووم بکەی ، شێخەکەش پرسیاری لێکردووە کە سەر بە چ ئاینێکی ؟ پیاوەکە وەڵامی داوەتەوە ئەمێستا شوێنکەوتەی ئاینی کریستیانییم "بڕوانە :

Ritter, Helmut Werner, "Picatrix", London,1962, 316.

[69] احسان نوری ، تاریخ ریشە، نژاد کرد ، تهران ، ١٩٥٥

[70] Wigram and Wigram,162-63.

[71] Nikitine ,"Les Kurdes et le Christianisme.155.

[72] Ibid.

مینۆرسکی ئەم پارچەیەی بە تێبینییەکی کورتەوە بۆ فەرەنسیی وەرگێڕاوە . هەرچەندە مێژووی کۆپی دەستنووسەکە کە پارانەوەکەی لەسەرە بۆ سەرەتای سەدەی پازدەیەم دەگەڕێتەوە ، بەڵام مینۆرسکی لەو بڕوایەدایە کە نووسراوە رەسەنەکە خۆی بۆ ماوەیەکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە . بە گوێرەی ئەو ، نووسراوەکە بەشێوەزاری کوردی باکوورە و بۆ ناوچەی حەوزی ئاراس دەگەڕێتەوە .[٧٢]

واپێدەچێت وەرگەڕانی کورد بەرەو ئیسلام پرۆسەیەك بێت زیاتر خاو بەرێوەچووبێت ، جگە لەو ناوچانەی کە تێدا کورد پەیوەندییەکی نزیکەی و بەراییان لەگەڵ عەرەبە موسوڵمانەکاندا کردووە وەك : خێڵەکانی کوردی فارس ، هەلوان ، شارەزوور ، جەزیرە و دیاربەکر ، لەناوچە دوور دەست و سەختەکانی دیکەدا ، ، کوردان لە دەستگرتن بە بیروباوەڕە کۆنەکانیانەوە بەردەوام بوون ، جا چ زەردەشتیی یا کریستیانیی یاخود بتپەرستیی و هەرچییەکی دیکە بووبێت . سەبارەت بەو قۆناغە لەلایەن (بار هیبرایۆس)ەوە داوەریی کراوە ، وەرگەڕانی کورد بەرەو ئیسلام تەنانەت تا سەدەی سێزدەیەمی زایینییش بە تەواویی نەهاتۆتە دی :

" هەروەها لە ساڵی ٦٠٢ی عەرەبیی (١٢٠٥ز) رەگەزی کوردان ، ئەوانەی لە چیاکانی میدیا بوون و (تیرەهایە) یان پێدەگوترا ، لە چیاکان هاتنە خوار و وێرانکارییەکی مەزنیان لەو وڵاتەدا بەرپاکرد . سوپا لە ئێرانەوە کۆکرایەوە و لەگەڵیاندا کەوتنە شەڕەوە و ژمارەیەکی یەکجار زۆریان لێکوشتن . ئەمێستا ئەو چیاییانە نەهاتوونەتە نێو ئاینی ئیسلامەوە ، بەڵکو ئەوان پابەندی بتپەرستییەکی سەرەتایی جادووگەریی بوون کە هەڵقوڵاوی (وڵاتەکەیانە) ، کاتێك موسوڵمانەکان دەکەوتنە

---

[٧١] بەگوێرەی مینۆرسکی ، ئەم تۆمارە لەلایەن (ئەبۆڵدەز)ی پرۆفیسۆری گورجییەوە لە کتێبخانەی پاتریارکی ئەرمەنیی لە (ئەچمیادزین) لە یەکێتی شورەویی لە ساڵی ١٩٣٧دا دۆزراوەتەوە بە بڕوای ئەو، ئەوە کێشەیەك نیە کە ئەم تۆمارەی رەسەن نیە بەڵام لەسایەی مێژوونووسی ناسراوی تەیمورلەنگ دا کۆپی کراوە پاڕانەوەکە کە کراوەتە ئەلفبێتی ئەرمەنیی بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە :" پاکژ خودێ ، پاکژ زاهم ، پاکژ ئیمەرك ، خۆی هاتی خاچ ئێسکەرمە ، رەحمەت ئیمە "

V.Minorsky , "Le plus ancient texte Kurds," Bulletin Mensuel du Centre d Etude Kurdes, no. 1950 , 8-10.

دهستیان به ئازار و ئهشکهنجهیهکی دڵڕەقانه دهیانکوشتن .[٧٤]

نووسەری شەرفنامه کە له ساڵی ١٥٩٦دا نووسیویەتیی ، وەسفی خێڵی پازوکیی دهکات و دهڵێت :" ئهوان نه پابەندی ئایینێکی دیارییکراو بوون و نه بەدووی فەرمان و باوەڕێکی ئەوتۆن چی راسته ئەمه بکەن و چیش خراپه خۆیانی لێ به دوور بگرن ."[٧٥] تەنانەت لەسەدەی نۆزدەیەمیشدا ژمارەیەك له نووسەران هەواڵی ئەوەیان پێداوین که خێڵی کورد هەیە ناوی (بالەکی) یه له بەرزاییەکانی ساسۆن ، نه موسوڵمان ، نه کریستیانیی ، نه قزڵباشن .[٧٦]

سروشتی ناوچه لێکدابڕاوەکانی کوردستان ، ناتەواویی و بەناو بوونه ئیسلامی بەشێك له کوردان له سەدە بەراییەکانی ئیسلامدا . هەروەها ئەو پەناگەیەی چیاسەختەکان بۆ دەستە ئایینییە لادەر و پەرگرەکان فەراهەمی کردووە ، وەك لێکدانەوەیەك بۆ بوونی فرە ئایینزایی لەنێو کورددا باسی لێوە بکرێت . کورتە گفتوگۆیەك سەبارەت به ئایینزا جیاوازەکانی کوردستان دەگونجێت تێگەیشتنێکی باشترمان لەمەڕ فرە ئایینیی و هەمەڕەنگیی بیروباوەڕی کۆمەڵایەتیی بەشێکی بەرچاو له خەڵکی کوردستانمان پێ ببەخشێت .

## ئێزیدیی :

ئێزیدیی ئایینزایەکی تاقانەیە و وێڕای چەندین لێکۆڵینەوەی بەرچاو ، هێشتا بنەماکانی ناڕۆشن و نهێنین .[٧٧] ئێزیدیی ئایینێکی ناوێتەیە و رەگەزەکانی خۆی له

---

[74] Bar, Hebraruse. The Chronography of Gregory Abdu al-Faruj the Hebrew Physician Commonly Knoen as Bar Hebrause.Vol.1. Translated from Syriac by Ernest A. Wallis Audge. London : Oxford Univ. Press ,H. Milford , 1932,362.

[٧٥] امیر شرفخان البدلیسي ، شرفنامه : في تاريخ الدول والامارات الكردية ، ترجمه من الفارسية : جميل بندى رۆژبەیانى ، بغداد ١٩٥٢، ٣٥٩ . Minorsky , " Kurds." .

[76] Taylor,I.G."Travels in Kurdistan,with the Notices of the Sources of the Eastern and Western Tigrisand Ancient Ruins in the Neigborhood." 28-29.

[77] Menzel,T."Yezidi."in E.J.Brills First Encyclopaedia of Islam,1 st ed .,8:1163-70.

زەردەشتیی ، مانیزم ، ئیسلام ، کریستیانیی ، جوو ، سابئە و شامانیزم وەرگرتووە .

ئێزیدیی بڕوای وایە جیهان لەلایەن حەوت فریشتەوە ئەفرێندراوە . باوەڕی ناوەندی ئایینەکەیان وا دەردەکەوێت کە دوالیزمی نێوان خوا و مەلەك تاوس یا شەیتانە . بەگوێرەی ئەوان ، خوا بوونێکی سست و پاسیڤە و تەنیا دروستکەرە و پارێزەر و راگری جیهان نیە . مەلەك تاوس بوونێکی کارا و جێبەجێکەری ویستی خوداوەندە ، شێخ ئادی کە گیانی خوداوەندی تێچووە ، باوەڕ وایە کە مەلەك تاوسە . بە پێچەوانەی تێڕوانینی گشتیی ، ئێزیدییان شەیتان پەرست نین ، مەلەك تاوس وەك ئەو فریشتە گوناهبارە لەقەڵەم دەدرێت کە بەهۆی پەشیمانیی و تۆبەکارییەوە خودا رێزی لێگرتووە و هێناویەتە پێشەوە ، ئەوان بوونی شەڕ رەتدەکەنەوە و بڕوایان بە سزا و دۆزەخ نیە . ئێزیدییان بڕوایان بە تاقانەیی و جیایی تەواوی خۆیان لە باقی دیکەی مرۆڤایەتیی هەیە . ئەوان وا دادەنێن بە پێچەوانەی مرۆڤەکانی دیەوە زادەی ئادەم و حەووا نین ، بەڵکو ئەوەی منداڵێکن بەناوی (شادید کوڕی جەڕە) کە تەنیا لەتۆوی ئادەمەوە پەیدا بووە ، پاش ئەوەی بۆ ماوەی نۆمانگ خراوەتە گۆزەیەکەوە .

ئێزیدییەکان تا نزیکەی سەرەتای ١٨٠٠ ەکان ژمارەیان زۆر و خاوەن هێز و دەسەڵات بوون ، کۆمەڵکوژیی بەردەوام و بەرنامەدارێژراویان لەلایەن عوسمانییەکانەوە بەشێوەیەکی مەزن ژمارەیانی کەمکردەوە . لەوانەیە حەفتا هەزارێکیان مابێتەوە کە بەسەر عێراق ، سوریا ، تورکیا و یەکێتی شورەوییدا دابەشبوون . بارەگای سەرۆکی رۆحیی و دنیایی ئێزیدییەکان لە قەزای شێخانە لە لیوای موسڵ لە عێراق ، ئەو شوێنەی مەرقەدی شێخ ئادی کە پیرۆزترین ئارامگایە لای ئێزیدییەکان ، گرتۆتەخۆ .

## سارلیی

سارلیی ، لەهەرێمی موسڵ لە عێراق هەن ، ئایینزایەکی دیکەی خاوەن بیروڕای ئایینیی ناناساییە .[78] باس لە یەکتاپەرستییان دەکرێت و دان بە چەند پەیامبەرێکی دیارییکراودا دەنێن و بڕوایان بە مردن ، زیندووبوونەوە ، بەهەشت و دۆزەخ هەیە .

---

[78] Karmers ,J.H."Sarliyah." in Encyclopaedia of Islam,1 st ed .,7:174;

هەروەها :عبدالمنعم الغلامي ، بقايا الفرق الباطنية في لیواء الموصل، موصل العراق ، ١٩٥٠ .

سارلیی نە نوێژ ئەکەن و نە ڕۆژوو ئەگرن ، دەگوترێت کە ئەوان بەهەشت لە ڕۆحانییە پیرۆزەکانیان دەکڕن . دوژمنەکانیان ئەوان بەوە تاوانبار دەکەن کە لە هەموو سەری ساڵێکی قەمەرییدا بەزمێکیان هەیە تێیدا کەڵەشێر سەردەبڕن و پێکەوە دەیخۆن ، پاش شێوکردن کە ژن و پیاوی تێدا ئامادە دەبن ، دەگوترێت چرا خامۆش دەکەن و لێکبەردەبن .

## قزڵباش

قزڵباشەکان ، ئایینزایەکی دیکەی شیعەگەرای پەرگرە لە تورکیا کە لە ناوچەیەکدا نیشتەجێن کە دەکەوێتە نێوان موش و پێچی باشووری ڕۆژئاوای ڕووباری فورات ، لەوانە بەرزاییەکانی دەرسیم .[79] چەمکی (قزڵباش/سەرسوور) چەمکێکە لەلایەن تورکە موسوڵمانە ڕاستەڕێخوازەکانەوە و بۆ سووکایەتیی پێیانەڵێن . قزڵباشەکان بەخۆیان دەڵێن (یوڵ ئۆشاگیی/ڕۆڵەکانی ڕێگەی ڕاست) .

قزڵباشەکان بڕوایان بە تاقانەیی خواوەند و توانای بێکۆتایی هەیە و ئەوەی " نە کوڕ و نە هاوبەشیی هەیە " ، هەرچەندە باوەڕیان بە هەستانەوەی عیسای مەسیح هەیە ، بەڵام هەروەک پەیامبەرێك لەقەڵەمی دەدەن و لەگەڵ عەلی دا جووتی دەکەن . ئەوان ، ئادەم ، نوح ، ئیبراهیم ، موسا ، محەمەد و عەلی بە مەزنترین پەیامبەران لەقەڵەم دەدەن .هەرچەندە عەلی لە محەمەد بە مەزنتر دەزانن . ئەوان دوازدە ئیمامەکە بە دوازدە حەواریی لەقەڵەمدەدەن و هەریەکەیان بە ناوێکی جیاوازەوە . قزڵباشەکان دوو کوڕەکەی عەلی کە حەسەن و حوسێنن ، لەگەڵ ساینت پوڵ ی پیرۆزدا لێك دەچوێنن ، ئەوان ئینجیل ،تەورات و قورئانیان لا پەسەندە . ئەوان کتێبێکی پیرۆزی تایبەت بەخۆیان نیە و فەرمان و پەیڕەو لە سەیدەکەیانەوە وەردەگرن ، کە سەرۆکی دینیی و دنیاییانە . هەموو سەیدەکانیان خۆیان بە ئەوەی ئیمام باقر دادەنێن ، ئەوەی بناغەی ئایینەکەی بۆ دامەزراندوون . واباوە کە ئیمام باقر بەشێوەی موعجیزەیەك و لەکچێکی پاکیزەی کەشیشێکی ئەرمەنیی لەدایك بووە . قزڵباشەکان دار ، بەرد و ڕەگەزە سروشتییەکانی دیکەش بە پیرۆز دەزانن . هەموو

[79] باشترین گفتوگۆکردن لەمەڕ بڕوا و سێرەمۆنیاکانی قزڵباش ، بڕوانە :.Molyneux . -seeL.49-68

سالێك لەیەكەم ڕۆژی یەنایەردا ، لە بۆنەیەكدا كۆدەبنەوە و دوای نوێژ و پاڕانەوە ، سەیدەكەیان دوعا بەسەر نانێكدا دەخوێنێت و پیرۆزی دەكات ، كە پێیدەگوترێت (حەق لوقمەسیی) ، پاشان بەسەر ئامادەبووندا دابەش دەكات . دوژمنیان بەوە تاوانباریان دەكەن كە مەبەستی قزڵباشەكان لەم جۆرە كۆبوونەوانە ، ڕەشەگانە .

## ئەهلی حەق

ناوی " ئەهلی حەق " (شوێنكەوتەی ڕاستیی) دەگەیەنێت و هەرچەندە ناوبەناویش (عەلی ئیلاهیی) شیان پێدەگوترێت . بەڵام ئەمە ناوێكی هەڵەیە و لەو ڕاستییەوە هاتووە كە پاشماوەی شیعەگەریی پەرگریان لەنێودا دەبینرێت . بیروباوەڕی سەرەكیی ئەهلی حەق لە دەركەوتنی یەك بە دوا یەكی خواوەندایە ، ئەو دەركەوتنانەی خواوەند حەوت جارە و لە شێوەیەكی ئاڵۆزدا ڕوودەدات . یەكەم جار ئەوەی خواوەندگارە كە لەپێش ئەمرییدا لەشێوەی دوڕێكی داپۆشراودا بووە ، دووەمیان عەلی بووە و بەو شێوەیە ، هەرچەندە گرنگترینی تێكڕای ئەو حەوت دەركەوتنە ئەوەكەی سوڵتان سۆهاكە ، چوارەمین بەرجەستەی خواوەندە و كەسایەتییەكی سەرەكییە لە ئایینی ئەهلی حەقدا .

بەگوێرەی ئەهلی حەق مرۆڤ دوو جۆرە ، باش و بەد ، یەكەمیان لە قوڕێكی زەرد و ئەوی دووەمیشیان لە قوڕی ڕەش ئەفرێندراوە . گیان گوێزانەوە یەكێكە لە بنەما سەرەكییەكانی بیروباوەڕی ئەهلی حەق ، بۆنە ئایینییەكانیان ، وەرگرتنی بەرفراوانیان لە سەرچاوە ئایینییەكانی دیكە پێشاندەدات . ئایینە ئاوێتەكەیان بە ئاشكرا كاریگەریی گنۆسیی ، مانیزم ، زەردەشتیی ، هیندو ، جوو ، كریستیانیی و ئیسلامی بەسەرەوەیە . ئەو بیروباوەڕە بتپەرستییە زۆرەش لەنێویاندا دەبینرێت بەرجەستەی بیروباوەڕە كۆنەكان دەكات . هەرچەندە دەگونجێت بەشێك لەو باوەڕانە لەڕێگەی ئیسلام و كریستیانییەوە بۆ ئەهلی حەق پەڕیبێتەوە ، بەتایبەتیی ئەوانەی لەنێو ئیسماعیلییە موسوڵمان و پۆڵسییەكانی ئەرمینیاوە سەرچاوەیان گرتووە . یەك لە بیروباوەڕە سەرنجڕاكێشەكانی لەنێو ئەهلی حەقدا هەیە بریتییە لە ڕۆژی قیامەت ، كە بڕوایان وایە لە دەشتی شارەزووری باشووری كوردستاندا دەبێت و هەموو سوڵتانەكان سزا دەدرێن .

ئەهلی حەق ئایینی چینەكانی خوارەوەیە و لەنێو كۆچەر ، گوندنشین و

دانیشتووانەکانی شاریشدا دەبینرێت . باوەڕدارانی ئەم ئایینە لە رۆژئاوای ئێران ، وڵاتی گۆران و لوڕستاندا هەیە . بەشێوەی کۆمەڵگەی پەرتوبڵاویش لە ئازەربایجانی ئێران ، دەوروبەری قەفقاس ، مازندەران ، خۆراسان ، تاران و هەمەدان دا هەیە . هەروەها چەند گروپێکی گرنگیشیان لە کەرکوک ، سلێمانی ، هەروەها ناوچەی موسڵ لە عێراقدا هەن و بە (کاکەیی) ناسراون .[80]

## ئەدەبی کوردیی و چالاکییە کەلتوورییەکان

### ئەدەبی کلاسیکیی : فۆلکلۆر و شیعر

بوار و بایەخی ئەدەبی کوردیی ، بەشێوەیەکی بەرچاو ، لە ئاکامی ئەو کۆڵینەوانەی ئەورووپییەکان و کۆڵەرانی کورد ئەنجامیان داوە ، زیادی کردووە . ئاگادارییمان لەمەڕ ئەدەبی کوردیی نووسراو و گوتراو بەشێوەیەکی قووڵ گۆڕانی بەسەردا هاتووە . ئەو هەنگاو و پەرەسەندنانەی بەو ئاراستەیەدا هاتووەتەئارا دەگونجێت لەو راستییەوە سەرچاوەی گرتبێت کە (ئەلیکساندەر ژابا) لە کتێبەکەیدا ( Recueil de notices et de recits Kourdes , St. Petersburg, 1860) ئاماژەی بەناوی ٨ هۆنەری کورد داوە ، لەکاتێکدا عەلائەدین سەجادی بەدرێژیی گفتوگۆی لەسەر ٢٤ هۆنەر کردووە و ئاماژەی بە لیستێکی ٢١٢ هۆنەری دیکەش لە (مێژووی ئەدەبی کوردیی ، بەغدا ، ١٩٥٢) داوە . ئەو زانیارییەی ئەمڕۆ لەمەڕ دەوڵەمەندیی و هەمەڕەنگیی فۆلکلۆری کوردیی هەمانە تەواو پێچەوانەی ئەو بێئاگاییەیە کە لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا سەبارەت بەم مەسەلەیە لە گۆڕێدا بووە .

جێگەی سەرنجە ئەوە بەبیر خۆمان بهێنینەوە کە جێمس فرێزەر ، ئەو نووسەرە

---

[80] بۆ زیاتر لەمەڕ ئەهلی حەق وکاکەیی، ئەبڕوانە :

V.Minorsky ."Ahl-I Hakk," in Encyclopaedia of Islam .New Edition,1:260-63; Ivanov,W.ed,"The Truth Worshipperof Kurdistan:Ahl-I Hakk Texts,Leiden:1953; Edmonds .Kurds, Turks and Arabs,182-201.

شارەزایەی گەشتێکی بەرفراوانی لەساڵی ١٨٣٠دا بەنێو کوردستاندا کردووە ، نەیتوانی هیچ بەڵگەیەك بۆ بڕوابوون بە پەریی یان هەر هێزێکی دیکەی سەروسروشت لەنێو کورددا بدۆزێتەوە .[81] ئەو قەبارە و چەندە هەمەڕەنگەی ئەمڕۆ سەبارەت بە کەرەسەی فۆلکلۆری کوردیی لەبەردەستمانە . وێڕای ئەوەی ، کوردۆلۆجستێکی شورەویی ، بە گوێرەی نیکیتین ، فرەیی ئەو کەرەسانەی بە حاڵەتێکی "پەنەمینی خێرا" ناوبردووە .[82] سەرچاوە شورەوییەکان پەرەسەندنی ئەم جۆر و ژانرە وێژەییانەی کوردییان لەسەر حسابی ئەدەبی نووسراو ، بۆ بڵاویی نەخوێندەواریی لەنێو کورددا گەڕاندووەتەوە ، هەروەها لە هەندێ نموونەی تایبەتیی وەك ئێزیدییەکان ، کە نەخوێندەواریی بۆ هەمووان جگە لە کەمینەیەك نەبێت داوا و ئەرکێکی ئایینییە .

سەبارەت بە زانیارییمان لەمەڕ فۆلکلۆری کوردیی ، بەشێوەیەکی مەزن قەرزداری چەند نووسەرێکین ، ئەوانەی تیشکێکی گەورەیان خستۆتە سەر ئەو کەرەسانەی تا ئێستا چاپنەکراون . لەنێو ئەوانەدا : باسیل نیکیتین ، مەرەکان : سورەییا و جەلادەت و کامەران بەدرخان ، رۆگەرلی سکۆت ، عەرەبی شامیلۆڤ ، عەلائەدین سەجادی و تۆماس بۆیس .

فۆلکلۆری کوردیی بەشێوە جیاوازەکانییەوە : چیرۆك ، چیرۆکی ئاژەڵان ، چیرۆکی فریشتە و پەریی ، داستان ، شیعرە گۆرانیی ، جادوو ، پەندی پێشینان ، مەتەڵ ، بابەت و بیرۆکەی جیاواز لەخۆ دەگرێت . خۆشەویستیی ، نیشتمانپەروەریی ، جەنگ ، هەروەها میواندۆستیی ، ئەمانە بابەتی بایەخ پێدراون . دەتوانرێت بگوترێت کە ئەم بابەتانەی فۆلکلۆریی بۆ سێ جۆر دابەش دەکرێت : یەکەم ئەوانەی کە بەرهەم و هەڵقوڵاوی ئەزموونی کوردی خۆین ، دووەم ئەوانەی لەسەر بنەمای کەلتووری میراتگری تەواوی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رادەوەستێت . هەروەها سێیەم ئەوانەی پشت دەبەستێت بە کەلتووری گەلانی دراوسێ . هەرچەندە تەواوی ئەو چیرۆك و گێڕانەوانەی لەسەر زمانی پەریی و فریشتە و دێوەکان هێشتا تۆمار نەکراون ، بەڵام ئەو کۆکراوەیەی ئێستا لەبەر دەستە ، بێگومان نموونەیەکی ئاشکرا و شیاومان پێدەبەخشێت .

---

[81] Fraser,James Baillie. Travels in Koorsiatan, London ,1840,140-41.

[82] Basile Nikitine . "La poesi lyrique Kurde,".39.

تایبەتمەندییەکانی چیرۆکی کوردیی بریتییە لە ساکاریی و زۆربەی جاریش هەستێکی گاڵتە ئامێزی تێدا بەدی دەکرێت . هێندێك لەو چیرۆکانەی لەبەردەستدان وەك "چیرۆکی سوتۆ و تاتۆ" [83] وریایی و شارەزاییەکی بەرچاوی تێدا دەردەکەوێت و بە هەموو توندوتیژییەکیەوە گیانی ژیاندۆستیی و گاڵتەئامێزی تێدا بەرجەستەتە دەبێت . ئەم چیرۆکە باس لەو شەپۆلە توندوتیژییە دەکات کە زادەی تۆڵەی خوێنێکە و لەئاکامی سەرکوتکردنی خێڵێکەوە لەلایەن خێڵێکی دیکەوە سەرهەڵدەدات . ئەو تۆڵەیەی کە لە هەلومەرجێکی پڕ دڵڕەقیی ، غەدر و ناپاکیی و ئازایەتیی و بوێرییەکی کەموێنەدا دەسێنرێتەوە . کەم چیرۆکی کوردیی هەیە وەك ئەم چیرۆکەی سەرەوە بەگوێرەی ئاماژەی باسیل نیکیتین " وێنەیەکی پرشنگدار لەمەڕ ئاکار و هەڵسوکەوتی کوردان" بخاتە بەرچاو . [84]

چیرۆکی "شێخ سلێمان" [85] باس لە دزێکی ساختەچیی دەکات کە بەرگی شێخێکی خواپەرستی کردۆتەبەر و کۆتاییەکەی بە دزیکردن لە مەرقەدێکی پیرۆز دوایی دێت ، بۆخۆی رەخنە و ریسواکردنێکی ئاشکرایە سەبارەت بە دزیکردن ، لە ئالەبارترین هەلومەرجدا کە شایەنی سەرزەنشت و ریسواکردنە . چونکە بۆ دزێکی چاوقایم و شارەزا ، هیچ شوێنێك ، تەنانەت جێنزرگەی کەسێکی پیرۆزی پارێزراویش رێزلێگیراونیە ، جێگەی سەرنجە تێبینیی ئەوە دەکرێت کە چۆن دزەکە هەوڵی ئەوەی داوە پاساو بۆ ویژدانی مردووی خۆی ، دەگونجێت بۆ شوێنکەوتەکانی بێنێتەوە و بەرگێکی عەقڵانیی بەبەردا بکات بەوەی : گەر خاوەن مەرقەدەکە پیاوێکی پیرۆزی راستەقینە بێت ئەوە بە دڵنیاییەوە دەزانێت کە زیندوو لە مردوو زیاتر پێویستی بە شتومەك و بەکارهێنانی هەیە ، گەر واش نەبێت ، ئەوە هیچ ترسێکی پێناوێت . [86]

لە چیرۆکی " حەسەن بەگ ، میری هەکاریی و مژدەی باڵندەی بەهار " [87] قەلەباچکە لە سەرتاپای باڵندە کۆچەرەکانی بەهار بەرزتر نرخێنراوە ، ئەو بە پێچەوانەی

---

[83] Basile Nikitine and E.B Sone , "The Story of Suto and Tato,"69-106.

[84] Basile Nikitine , "Kurdish Stories from My Collection,"129-40.

[85] Ibid.,126-28.

[86] Ibid.,128.

[87] Ibid.,132-33.

باڵندەکانی دیکەوە کە تەنیا لەکات و وەرزی خۆشییدا دۆست و هاوەڵین ، وەك مير دەڵێت :" قەلەباچکەی چڵکن هەمیشە لەگەڵمانە ، ئەو کاتەی خۆشە و بەپێچەوانەشەوە ، ئەو دۆستێکی متمانە پێکراوە ، هەرگیز لەسەرما ناترسێت ، لە خۆشیی و ناخۆشییماندا هاوبەشە. "[88] لەم چیرۆکەدا قەلەباچکە بەرجەستەی پیاوانی خێڵەکیی دەکەن ، ئەوانەی بە توندیی بە خێڵەکەیانەوە بەستراونەتەوە و پابەندی تەواویان بە خزم و براخێڵەکییەکانیانەوە هەیە . لە ئەدەبی کوردییدا ، قەلەباچکە سیمبوڵی پیاوی تێگەیشتوو و هەستیارە .

" کەڵەشێر و ڕێویی " ناوی چیرۆکێکی ناژەڵانە کە لە زمانی فارسییشدا بە هەمان ناونیشان هەیە .[89] چیرۆکێکی دژ بە ڕۆحانییەکانە و مەبەستی شێخەکانە کە ڕێبەری باڵای تەریقەتە ئایینییەکانن لە کوردستان . زۆر بە جوانیی و بە کەمێك گاڵتەوە ، دووڕوویی و چاوبرسێتی هێندێك لەو شێخانە پێشاندەدات . ڕێوییەکە کە خۆی بە سەید و نەوەی پەیامبەر پێشاندەدات ، هانی کەڵەشێرێك ، قازێك ، مراوییەك و قەلەباچکەیەك دەدات کە لە ڕێگەی حەج کردنەوە بەرەو مەککە هاوەڵی بن . بەهۆی متمانەی کوێرانەیانەوە ، هەموویان جگە لە قەلەباچکەکە دەبنە قوربانیی ڕێوییە فێڵبازەکە . بە گوێرەی نیکیتین ، کەڵەشێرەکە لە چیرۆکەکەدا بەرجەستەی جووتکارە ساکار و چەوسێنراوەکان دەکات ، قازەکەش خاوەن ماڵێکی دەوڵەمەندە و بەدوای ڕێز و ناوێکی مەزندا دەگەڕێت . مراوییەکەش بەرجەستەی کەرخێڵەکییەکی دەشتەکی دەکات کە بە پیاهەڵدان و قسەی لووس هەڵدەخەڵەتێت ، قەلەباچکەکە ، کەرۆکێکی سووکەڵە ، بەرجەستەی کەسێکی دنیادیتە دەکات و لە سۆنگەی ئەوەوە متمانەی بە ڕێوییەکە نیە ، بە تەنیا لەنێو ئەوانی دیکەدا گیانی دەربرد و نەخورا .

بەیتی قەڵای دمدم یەکێکە لە بەرجەستەترین داستانە کوردییەکان ، چیرۆکی دەستەیەك کوردی بێئومێدی سەرسەختە کە سەربەرزانە خۆیان لەنێوقەڵای دمدمدا حەشاردابوو ، ئەو قەڵایەی لە نزیك ورمێیە و لە ساڵی ١٦٠٨دا گەمارۆدرابوو . بۆ بەرگرییکردن لەو قەڵا گەمارۆدراوە ، ئەمیر خانی لەپزێڕین بەخۆی و ئەندامە

---

[88] Ibid.

[89] Basile Nikitine , "Un Sujet de fable:Variantes Kurdes et Persanes," 129-40.

خێڵەکییەکانی خێڵی برادۆستەوە ئازایانە بۆ ماوەی چەندین مانگ خۆیان لەبەر هێزە گەمارۆدەرەکانی سەفەوییدا بە سەرکردایەتیی شاعەباسی یەکەم راگرت و ئازار و نەهامەتییەکی زۆریان چێژت . بەرگرییەکەران تا لەناوچوونی دواکەسیان لەسەر شەڕکردن و ملکەچ نەکردن بەردەوام بوون .[90]

"مەمی ئالان" بەربڵاوترین داستانی کوردییە ، لەنێو هەموو ئەو داستانە کوردییانەی دەگێڕنەوە ، تەنیا داستانە تایبەتمەندیی نیشتمانیی راستەقینەی هەبێت ، وەرگێڕانێکی یەکگرتووی ئەم داستانە لەبەردەستدا نیە ، وێڕای ئەوەی لە تێکڕای کوردستاندا ناسراوە ، هەر لە کورداغەوە بۆ دەریاچەی ورمێ . نەک تەنیا وەرگێڕانەکان لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاوازە ، بەڵکو هەر دەنگبێژەی شێوەی گێڕانەوەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە . مەمی ئالان تەنیا داستانی کوردییە تێیدا موعجیزە رۆڵێکی مەزنی تێدا دەبینێت و رووداوەکان خەیاڵیین و لەمێژوودا بنچینەیان نیە .(لێسکۆت) پێشنیازی ئەوەی کردووە کە دەگونجێت کورد ئەم داستانە کۆنەیان لە گەلێکی دیکەوە وەرگرتبێت ، هەروەها ئەو بیری لە ئەگەری رەسەنی (ئەلەنیکیی) ئەم داستانە کردۆتەوە .[91]

ئەحمەدی خانی هۆنەری مەزنی کورد ، بەپەرۆشەوە هەوڵی داهێنانی ئەدەبێکی نەتەوەیی راستەقینەی کوردیی داوە ، ئەفسانەی مەمی ئالانی کردۆتە بناغەیەک بۆ (مەم و زین) ەکەی کە بە هۆنراوە دایڕشتۆتەوە. خانی لە داڕشتنەوەی ئەو ئەفسانەیەدا ، هەمان

---

[90] بۆ دەقە فەرەنسییەکەی بڕوانە :

Jaba ,Alexander.Recueil de notices et recits Kourdes servant a la connaissance se la languue(St.Peterburg:Eggers,1860),87-90.

ژابا دەڵێت ، مەلای باتێ ی هۆنەری کورد بە هۆنراوەیەک ئەم رووداوەی گێڕاوەتەوە

[91] وەرگێڕانەکەی مەموزین لەلایەن (لێسکۆت)ەوە پشتی بە سێ سەرچاوەی بنەڕەتی بەستووە، میشۆی دەنگبێژی کورد ،سەبری نووسەری کورد ، هەروەها گۆڤاری (هاوار) کە لە سوریا دەردەچوو جگە لەوەی هاوکارییەکی زۆری لە لایەن میر جەلادەت بەدرخانەوە کراوە .

Lescot,Roger .Textes Kurdes,vol 2 :Mame Alan , Paris,1940,iii-xxiii.

ڕێچکەی فارسیی و عەرەبیی گرتۆتەبەر و بەرگێکی ئیسلامیی بە بەردا کردووە .[٩٢]

گۆرانییە فۆلکلۆرییە کوردییەکان ، هەروەک گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی گەلانی دی بەرجەستەی نموونەی ژیانی خۆماڵیی و چالاکییەکانی دەکات . هەروەها سروشتیی گشتیی لەگەڵدا دەگونجێنێت .[٩٣] پایزۆک گۆرانییەکە لەلایەن پیاوان و ژنانەوە لەکاتی دابەزینی خێڵە کۆچەرەکان لە زۆزانەکانیانەوە بەرەو دەشتەکان دەگوترێت . دیلۆک گۆرانییەکە بە هەڵپەڕکێوە لەگەڵ تەپڵ و شمشاڵدا دەگوترێت . بەرەوڵاڤیی لەلایەن ژنانەوە دەگوترێت کاتێک بەرە و قاڵییە رەنگینەکانیان لە تەونەکان دەکەنەوە . لۆریی گۆرانی بەرێشکەیە و بە سۆز و ساکاریی جیادەکرێتەوە . هەروەها گۆرانیی گەلیی لەنێو کورددا هەن بە (لاوک) دەناسرێت لە کورتە هۆنراوە پێک دێت و باس لە کاری جەنگاوەری ، جوامێریی و شۆڕەسواریی ، هەروەها چیرۆکی خۆشەویستیی دەکات .

هێندێک خوێندنگەی تایبەت هەن بۆ فێرکردنی لاوک و بەیت وبالۆرە لە کوردستاندا ، فێرخوازان لە باکووری رۆژئاوای کوردستان (دەنگبێژ) و لە وڵاتی موکریی و باشووری کوردستانیش (شایەر /کە لە شاعیری عەرەبییەوە هاتووە) یان پێدەگوترێت ، ئەو فێرخوازانە ، کە دەنگێکی خۆشیان لێ چاوەڕێ دەکرێت ، بڕێکی زۆر بەیت و هۆنراوە و ئەفسانە لەبەر دەکەن ، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوانە نەخوێندەوارن ، هەربۆیە بەشێکی زۆری ئەدەبی کوردی فۆلکلۆری کوردیی تا ئێستاش نەنووسراوەتەوە .[٩٤]

هۆنراوە بڕێکی زۆرینەی ئەدەبی نووسراوی کورد پێکدەهێنێت . ئەمەش تەنیا لەنێو ئەو گەلانەدا سروشتییە کە رادەی نەخوێندەواریی زۆری تێدا بڵاوە . چونکە شیعر وەک ژانەرە ئەدەبییەکانی دیکە : پەخشان ، رەخنە ، شانۆنامە ، رۆمان ، ئەوەندە پێویستی بە خەڵکانی خوێندەوار و بەفەرهەنگ نیە . دەوڵەمەندیی و هەمەڕەنگیی شیعری کوردیی ، شانبەشانی ژانەرە ئەدەبییەکانی دیکە ، لە ئاکامی رابوونی ئەدەبی

---

[92] سەبارەت بە کورتەیەک لە مەموزینەکەی خانیی .بڕوانە:

Bois,Thomas."Coup d'oeil sur la litterature Kurdse."Revue al-Mashriq (Beirut) 49 (Mar-Apr. 1955):201-208,239.

[93] بۆ گفتوگۆ لەمەڕ گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان. بڕوانە:

Bois,Thomas. L' ame des Kurdes a' la Lumiere de leur folklore.Beirut:n.p., 1946.

[94] Nikitine , "La poesi lyrique Kurde,"51.

کوردیی زیاتر پەرەی سەندووە و فرەتر بووە .

بەشێوەیەکی گشتیی ، شیعری کوردیی سەروکاری لەگەڵ دوو بابەتدا هەیە ، خۆشەویستییەکی رۆمانسیی و پەیوەستەگییەکی قووڵ بە زێد و خاکی نیشتمانەوە . ئەحمەدی خانی لەسەدەی حەڤدەیەم و حاجی قادری کۆیی لەسەدەی نۆزدەیەمدا بە دوو هۆنەری مەزنی کورد دادەنرێن . ئەوەی یەکەمیان خەڵکی هەکارییە و لە بایەزید ژیاوە و هەر لەوێش مردووە ، خاوەنی داستانی (مەم و زین) ە وەك پێشتر ئاماژەی پێدراوە ، فیردەوسیی لای فارس چۆنە ، ئەویش بۆ کورد هەمان پایەی هەیە ، ئەو هەروەها خاوەنی هۆنراوەی ئایینییە (عەقیدەی ئیمانی) ، هەروەها فەرهەنگێکی شیعریی کوردیی-عەرەبیی بەناوی (ئەوبەهار) کە بۆ منداڵان نووسراوە .[95] حاجی قادری کۆیی (١٨١٥-١٨٩٢) بە هۆنراوە توندە نیشتمانییەکانی ناسراوە و هەر لەبەر ئەوەشە بە یەکێك لە باوکانی نەتەوەخوازیی کورد دادەنرێت . هێندێك لە هۆنراوەکانی بەلای ماتەریالیستیی و ئەگنۆستیکیی(نازانمێتیی/ئەوانەی لە بوون و نەبوونی خواوەند دڵنیانین /سەردەشتیی) ، هەربۆیە لەنێو چەپەکانی کورددا بەربڵاوە .[96]

## چالاکییە کەلتوورییەکان لە کوردستان

عێراق و سوریا دوو سەنتەری گرنگی چالاکییە کەلتوورییەکانی کوردن ، دۆخی سیاسیی لە تورکیا دژی پەرەسەندنێکی ئەوتۆ لە کارایە و لە ئێرانیش بوارەکەی بە تەواویی بەرتەسك کردۆتەوە . وێرای ئەو برە کەمەی کۆمەڵگەی کوردیی کە لە ئەرمینیا و ئازەربایجاندا هەیە ، یەکێتی شورەویی هانی دەرخستن و بڵاوکردنەوەی چالاکییە کەلتوورییەکان لەو وڵاتەدا نادات .

لە عێراقدا ، کە دانیشتووانێکی بەفراوانی کوردیی لێیە ، چالاکییە کەلتوورییەکان ( بە پێچەوانەی چالاکییە رامیارییەکانەوە) لە لایەن کوردەوە هەمیشە رێپێدراو بووە . هەرچەندە دەگونجێت بە شێوەیەکی کرداریی هان نەدرابێت ، هەر لە

---

[95] بۆ گفتوگۆکردن لەمەڕ ژیان و کارەکانی ئەحمەدی خانیی بڕوانە :

عەلائەدین سەجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، بەغدا، ١٩٥٢ ، ١٨٩-٢١٣

[96] هەمان سەرچاوە ، ٩-١٠ . Bois."Coup d oeil."210-11.

سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ، جوڵانەوەیەکی کەلتووریی چالاك لە عێراق بە شێوەزاری کوردیی سلێمانی پەرەیسەند ، ئەو شێوەزارەی کە پەیوەندییەکی نزیکی بە شێوەزاریی موکریی لە ئێراندا هەیە .

حاجی تۆفیق پیرەمێرد لە عێراق تا مردنی لە ساڵی ١٩٥٠ ، بەرچاوترین کەسایەتیی ئەدەبی کوردستان بوو ، ئەو کەسێکی هۆنەر ، چیرۆکنووس ، رۆژنامەنووس ، خاوەن بەهرە و ئەزموونێکی بەرفراوان و هەمەرەنگ بوو ، کارەکانی ئەدەب ، مێژوو و رامیارییان دەگرتەخۆ . پیرەمێرد لە میانەی کاروانی ئەدەبیی درێژخایەنیدا ، ژمارەیەکی فرە هۆنراوە ، چیرۆك ، پەخشان و چەند وەرگێڕانیشی هەیە . وەرگێڕانی وەستایانەی داستانە مەزنەکەی (مەم وزین)ی ئەحمەدی خانی بۆ شێوەزاری سلێمانی کە ئێستا شێوازی دەربڕینی ئەدەبی باشووری کوردستانە ، بە یەك لە نایابترین دەستکەوتەکانی لەقەڵەم دەدرێن.[97] هۆنەرێکی بەتوانا و بەهرەمەند ، خاوەنی گیانێکی قۆشمە و تەنزئامێز بەچەشنێك هەموو ئەوانەی دەیانناسی خۆشیان دەویست . چەندین ساڵ سەرنووسەر و بەڕێوەبەری (ژین) بووە کە گۆڤارێکی ئەدەبیی بەرجەستەی کوردستانی عێراق بوو .[98]

کەسایەتیی هەڵسوڕ و بەرهەمدار ، حوسێن حوزنی موکریانیی ، کە ئیدمۆندز بە (کاکستۆن) ی کوردی ناوبردووە ، بۆ ماوەی چەند ساڵێك گۆڤارێکی ئەدەبیی و مێژوویی بەناوی (زاری کرمانجی) لە هەولێر لە عێراق بڵاودەکردەوە .ئەو کارەکانی خۆی بە هونەری تەختەهەڵکۆڵین ، کە ئەخش و نیگاری دەستی لەسەر هەڵدەکۆڵین ، کۆتایی پێدەهێنا .[99] کۆلۆنێل تۆفیق وەهبی بەگ ، کە بۆ ماوەیەکی درێژ ئەندام پەرلەمان و هەروەها وەزیری حکومەتی عێراق بوو . کۆلەرێکی کەموێنەی کورد و نووسەرێکی بوارەکانی مێژوو ، فۆلکلۆر ، فەرهەنگسازیی و هەروەها ئایینییش بوو. لەماوەی ساڵانی

---

[97] معروف خزندار ، ملحمة (مەم وزین) الرسالة الجدیدة ، قاهرة ، ١٩٧١.

[98] Edmonds.C.J. "A Bibliography of Southern Kurdish.1937-1944." Journal of the Royal Central Asian Society 32, (Apr. 1945),185-91;Bois,"Coup d'oeil,"21; Rajkowski,Witold."A Visit to Southern Kurdistan ." Geographical Journal 107,no.3-4,(1946)128.

[99] Edmonds. "A Bibliography. 1937-1944,"185.

جەنگی دووەمی جیهانییدا ، تۆفیق وەهبی بەگ لەگەڵ ئەو دەستەیەدا هەڵدەسووڕا کە گۆڤاری (اخبار الحرب) یان دەردەکرد ، ئەو گۆڤارەی لەلایەن کۆنسولخانەی بەریتانیی لە بەغدا چاپدەکرا . ئەم بڵاوکراوەیە بەوە ناسرابوو کە بایەخی بە پەخشان نووسین دەدا ، بایەخی تایبەتیی بە هێنانە کایەی وشەی نوێی تەکنیکیی لە زمانی کوردییدا دەدا .[100]

عەبدوڵڵا سلێمان کە بە (گۆران) ناسراوە ، لەوانەیە بە بڕشتترین هۆنەری هاوچەرخی کورد بێت لە عێراقدا . گرنگترین بەرهەمی (بەهەشت و یادگار) ە . کەشیشی دۆمەنیکی کوردۆلۆجست (تۆماس بۆیس) هۆنراوە گۆرانییەکەی گۆرانی (گوڵی سووری خوێناویی) بە هاوتایی (Ode to the Skylark) ی شیللی داناوە . یەك لە بەرچاوترین دەستکەوتە ئەدەبییەکانی کوردیی لە عێراقدا بریتییە لە (مێژووی ئەدەبی کوردیی ) کە لەلایەن عەلائەدین سەجادییەوە نووسراوە ، ئەوەی بۆیس بە (مۆنۆمێنتی فێربوون و کەلتوور) پەسنی داوە .[101]

جوڵانەوەی کەلتووریی کورد لە سوریا زادەی هەلومەرجێکی تایبەتە ، جوڵانەوەیەك کە هەر لە سەرەتای ١٩٢٠مکانەوە لەپەرەسەندندا بووە و بوون و ئەشەو گەشەی لە ناکامی بوونی ژمارەیەکی فرە لە پەنابەرە کوردەکانی تورکیا بووە . رێکخراوی نەتەوەخوازی کوردیی (خۆیبوون) کە بارەگای سەرەکیی هەر لە ساڵی ١٩٢٧ەوە لە سوریا بووە ، بۆتە ناوك و خاڵی گردبوونەوەی چالاکییە ئەدەبییە کوردییەکان شانبەشانی چالاکییە رامیارییەکان . برایانی بەدرخانیی ، سورەییا ، جەلادەت و کامەران ، رێبەری گیانی ئەو جوڵانەوەیە بوون ، وێڕای ئەوەی رۆڵی رێبەرییان لە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کوردییشدا دەگێڕا ، ئەوانە هەرسێکیان بەچەندین زمان نووسەری بەتوانا بوون .

میر جەلادەت بەدرخان کە پێشڕەوی جوڵانەوەی ئەدەبیی کوردیی بوو لە سوریا ، ئەلفبایەکیی لاتینیی ساکار و گونجاوی بۆ زمانی رەسەنی خۆی داهێنا . لە هەردوو بڵاوکراوەکەیەوە (هاوار و روناهی) توانی هانی کورد بدات کە پابەندی ئەلفباکەی بن . ع بە ناوی خۆی و ع لەژێر نازناوی (هێریکۆڵ ئازیزان)دا چەند کۆڵینەوەیەکی ئەدەبیی ، فەرهەنگسازیی رێزمانیی بە زمانی کوردیی و فەرەنسیی نووسیوە .

---

[100] Ibid.,187.

[101] Bois,"Coup d'oeil,"219.

هەروەها کامەران بەدرخانی برای ، کە پرۆفیسۆری زمانی کوردیی بوو لە پەیمانگای زمانە رۆژهەڵاتییەکان لە پاریس ، بۆ ماوەی چەندین ساڵ کەسێکی بە بڕشت و خاوەن بەرهەمێکی ئەدەبیی هەمەجۆر بووە . ئەو قورئان و ئنجیلی بۆ زمانی کوردیی وەرگێڕا . هەروەها دەگوترێت کە کاری بۆ دانانی فەرهەنگێکی فەرەنسیی –کوردیی کردووە . هەروەك تۆماس بۆیس ئاماژەی پێداوە ، ئەو بە سروشت شاعرێکی خەیاڵاویی و تێکەڵ بەهەست و گیانێکی ئەنزئامێزی بووە .

دیارترین هۆنەری کوردی سوریا جگەر خوێنە ، ئەوەی دەگوترێت پێیان خوێندووە تا ببێت بە مەلا ، بەڵام وازی لەکاری ئایینیی بۆ کاری ئەدەبیی هێناوە . شیعرەکانی وەك بۆیس باسی لێوەکردوون ناسك و هەست هەژێن و ئەتەوەیین ، باس لە بابەتە کۆمەڵایەتیی و رامیارییەکان دەکەن .[102]

دیارترین کەسایەتیی ئەدەبیی لەنێو کوردانی شورەوییدا ، وەزیرە ئەزیر ، ئەتامی تاهیر ، جاسمی جەلیل ، هەروەها عەرەبی شامیلۆڤە ، شیعر و چیرۆکەکانی وەزیرە ئەزیر لەمەڕ دۆستایەتیی نێوان کورد و ئازەریی و ئەرمەنەکان و هەروەها بەرزنرخاندنی (کۆڵۆخۆز/کێڵگە هەرەوەزییەکان) و شێوەی ژیانی شورەویی . هێندێك لە هۆنراوەکانی ئاراستەی (ستالینی مەزن) کرابوو . ئەتامی تاهیر و جاسمی جەلیل هەردووکیان وەرگێڕ بوون . یەکەمیان بەرهەمی پوشکین ، لێرمۆنتۆڤ ، تۆلستۆی ، هەروەها گۆرکی کردۆتە کوردیی . عەرەبی شامیلۆڤ کە چەند کتێبێکی بە رووسیی داناون ، لەسەر ئەو بیۆگرافیەی بە ناونیشانی (شوانی کورد) دایناوە ، پاداشتکرا و رێزی لێنرا ، ئەوەی کە بۆ زمانی عەرەبیی وەرگێڕاوە. ئەدەبی کوردیی شورەویی لە نێوەرۆکدا زۆر لە ئەدەبی گەلانی موسوڵمانی دیکە دەچێت کە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێن .[103]

چالاکییەکانی ئەدەبی کوردیی لە ئێران زۆر کاریگەر و بەرفراوان نین . بەشێکی بەهۆی ئەوەوە کە بە فەرمیی هانی چالاکیی لەو چەشنە نادرێت ، بەشەکەی دیکەی ئەو راکێشان و کاریگەرییەیە کە ئەدەبی فارسیی بەسەر کوردەوە هەیەتیی . هاوچەرخترین هۆنەری کوردی ئێران (هێمن و هەژار)ن . ئەوانەی لەماوەی تەمەنی کورتی کۆماری

[102] Ibid.223-29.

[103] Ibid.,226-28.

کوردستاندا (لە بەشی پازدەیەم باسی هاتووە) لە لایەن قازیی محەمەدی دامەزرێنەر و سەرۆکی کۆمارەکەوە پاداشت کران. محەمەد موکریی کارمەندی وەزارەتی فێرکردنی ئێرانیی ، کۆمەڵە گۆرانییەکی کوردیی بە وەرگێڕانە فارسییەکەیەوە چاپ و بڵاوکردۆتەوە . شێخ ئایەتوڵڵای کوردستانیی مێژووی کوردی لە کوردستان لە کۆتایی ساڵی ١٩٥٠دا بەچاپ گەیاندووە .[١٠٤]

[104] Ibid.,222-23.

# بەشی دووەم : ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی کورد

## ڕەگەزە خێلەکیی و نا خێلەکییەکان

بەگشتیی ، دەتوانرێت بگوترێت کە گەلی کورد بە سەر دوو چینێدا دابەش دەبێت ، خێڵەکیی و ناخێڵەکیی ، خێڵەکییەکان بەگشتی کۆچەرن یا نیمچەکۆچەر ، شوانکارەیی بەشی زۆری ژیانیان پێکدەهێنێت و بە تایبەتمەندیی جەنگاوەریش جیادەکرێنەوە . نا خێڵەکییەکان بەشێك لە جەستەی کۆمەڵگەی نیشتەجێ پێکدەهێنن و جووتکارن .[1] سەرباری ئەو ڕاستییەی کە کوردانی نا خێڵەکیی لەزۆربەی حاڵەتەکاندا لە کوردە خێڵکییەکان فرە ترن ، کەچی چینی فەرمانڕەوا لەو دەستەیەی دواییان پێکدێت .

(کلۆدیۆس جێمس ریچ) ، یەکەمین نووسەری هاوچەرخە ئاماژەی بە جیاوازییەکانی نێوان ئەو دوو چینە داوە ، لەساڵی ١٨٦٣دا نووسیویە:" ئەوەی چەند وەخت بوو گومانم لێی هەبوو ، ئەمێستا بە بەهۆی چەندێك لە باشترین بەڵگە و بنەماوە لێی دڵنیا بووم ، ئەوەی کە جووتکارانی کوردستان بە تەواویی ڕەگەزێکی جیاواز لە خێڵەکان پێکدەهێنن ، ئەوانەی یان زۆر کەم ، یا هەرگیز ، زەوی ناکێڵن . لە کاتێکدا ، لەلایەکی دیکەوە ، جووتکاران هەرگیز جەنگاوەرنین . کوردە خێڵەکییەکان بەخۆیان دەڵێن (سوپا) ، یا کوردی سەرباز ، بەپێچەوانەی جووتکارە کوردەکانەوە ، بەڵام جووتکارەکان لەم بەشەی کوردستاندا ناوێکی جیاکەرەوەی دیکەیان جگە لە ڕەعییەت و کیولیی نیە . جارێکیان خێڵەکییەك لەلای من دانی بەوەدا نا کە ئەوان لەو بڕوایەدان جووتکارەکان تەنیا بۆ خزمەتی ئەوان دروست بوون ، لە ڕاستییدا بارودۆخی ژیانی جووتکاران لە ئەهامەتیی و داماوییدایە ، زیاتر لە ژیانی ڕەشپێستێکی کۆیلەی هیندی ڕۆژئاوا دەچێت ، هەروەها لە هەمووی خراپتر ئەوەیە ، هەرگیز ڕۆژێك ئەمدی ئەگەری ئەوە

---

[1] مینۆرسکی ئاماژەی بەوەداوە کە کشتوکاڵ لەنێو کیرتییەکانی فارسدا زانراوە ، ئەوانەی بڕوا وایە یەك لە باپیرانی کورد پێکبهێنن بڕوانە :

Minorsky , "Kurds",1133.Cf. Driver ,G.R."Studies in Kurdsh History,"491-511.

هەبێت ئەو دەسەڵاتدارە مەزنانەی کورد لەبەرامبەر ئەو دڵڕەقییەی دەرحەق بە ڕەعییەتەکەیانی دەکەن ، شەرم بیانگرێت ."[٢]

ئەم دابەش بوونە ژمارەیەك نووسەری گەیاندۆتە ئەو ناکامگیرییەی کە کوردە خێڵەکییەکان بەرجەستەی شەپۆلێکی داگیرکەر دەکەن کە لە چیاکانەوە بەرەو خوار کشاون و ملیان بە کۆمەڵگەی ڕەسەنە کۆنەکە کەچکردووە . ریچ یەکەمینی ئەوانەیە کە لەسەر ئەم پرسە راوەستاون ، ئەو دەپرسێت :" تۆ بڵێی ئەمانە ئەو دانیشتووانە ڕەسەنەی وڵاتەکە نەبن کە پاشتر لەلایەن خێڵە توندوتیژەکانی چیاکانەوە تووشی داگیرکاریی بوونەتەوە؟ "[٣] کۆڵینەوەکانی سەدەی بیستەم پشتگیریی چەسپاندنی ڕەوایەتیی ئەم تێبینیی و بۆچوونە دەکات . بەگوێرەی مینۆرسکیی :" کوردە نیشتەنییەکان زۆرجار واپێدەچێت کە بەرجەستەی کۆمەڵگە و دانیشتووانە کۆنەکە بکەن ، ئەوانەی تووشی داگیرکاریی عەشیرەتە جەنگاوەرەکان بوونەتەوە یاخود لەپێناو زامنکردنی پاراستنی خۆیان دژی هاوسێکانیان دەسەڵاتی ئەوانیان پەسەند کردووە ."[٤] (بارس) تیشکێکی سەرنجڕاکێشی خستۆتە سەر ئەم بابەتە ، کاتێك گفتوگۆ لەسەر ملکەچپێکردنی مسکێنە گوندییەکان لەلایەن هەمەوەندە خێڵەکییەکانەوە لە دەورووبەری سەدەی رابردوودا دەکات .[٥]

ئەم دابەشبوونەی کورد بۆ دەستەی عەشیرەتە باڵادەستەکان و دەستەی جووتکارە ڕەعییەتەکان لەزۆربەی بەشەکانی کوردستاندا باوو بەربڵاوە .[٦] لەناوچەی سلێمانی و لەنێو هەردووعەشیرەتەکانی جاف و بلباس دا ، چینی جووتکاران بە (گۆران) ناسروان .[٧] لەنێو عەشیرەتەکانی سۆران ، بادینان و هەکاریی ، (کرمانج) یان پێدەڵێن[٨]

---

[٢] Rich, Claudius James, Narrative of a Residence in Kurdistan, 1:88-89.

[٣] Ibid.,153.

[4] Minorsky , "Kurds",150.

[٥] Barth, Fredric . Principles of Social Organization in Southern Kurdistan . Universitets Entongrafiske Museum Bulletin no.7. Oslo : Brodrene Jorgensen ,1953, 53ff.

[6] وێڕای بەڵگەیەکی زۆر ، یەك لە دادوەرە خوێندەوارەکانی کورد لە سابلاغ دژی ئەم بۆچوونەیە و لە ڕووی هاندەری نیشتمانییەوە دەڵێت ئەم دابەشبوونانە کارناکاتە سەر یەکێتی کوردان

[٧] زیاتر لە سەدەیەك لەمەوبەر ، ریچ تێبینیی کردووە :" بلباسەکان لەنێوخۆیاندا خەڵکانێکیان هەبوو کە

لەکاتێکدا لەنێو هەمەوەندەکاندا بە (مسکێن) ناسراون .[٩]

## ڕێکخراوی خێڵەکیی و دەزگاکانی

### خێڵ ، تیرە ، هۆز

**وادەردەکەوێت کاتی ئاماژەدان بە یەکە جۆربەجۆرە خێڵەکییەکانی کورد جۆرێك**

---

جووتکاربوون . ئەوانە هیچ قسەیەکیان لە ژیانیاندا نەبوو و لەبەشی هەرە خوارەوەی کۆمەڵگادا بوون .ئەم خەڵکە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا پەرتەوازە بوون و سەر بە هیچ خێڵ و عەشیرەتێك نەبوون .خێڵەکییەکان پێیان دەڵێن کلاوسپی . هەروەها گۆرانیشیان پێدەڵێن  ئەوەی دواییان ناوێکی شیاوە بۆ خەڵکی سنە .لەلایەن خێڵەکییەکانەوە وەك سووکایەتییەك بە تایبەت بۆ خەڵکانێکی ترسنۆك بەکاردەهێنرێت . پێویستە تێبینیی ئەوە بکرێت کە ناوی " گۆران " هەمیشە بۆ خەڵکانی پلەی خوارەوەی کۆمەڵگا بەکارناهێنرێت . بدلیسی مێژوونووسی کورد، گۆرانی بە یەك لە چوار لقەکەی گەلی کورد داناوە . هەروەها گۆران ناوی یەك لەو کۆنفدراسیۆنە خێڵەکییە بەهێزانەیە کە لە ناوچە چیاییەکانی کەرەند-زەهاو لەسەر ڕێگەی کرماشان-بەغدا نیشتەجێن . مینۆرسکی کە ئاماژەی بەگۆران وەك ناوی خێڵێکی جەنگاوەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا داوە . ئەوەی ڕەتکردۆتەوە کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان خەڵکە جووتیارەکە و ئەو خێڵەدا هەبێت کە ناوی گۆرانیان هەڵگرتووە . بۆ زیاتر لەسەر ناوی "گۆران" و ڕەسەن و فەرهەنگیان بڕوانە :البدلیسی ، ٢٩،

Minorsky , "The Guran",75-103;Rich, 1:152-53.

[8] سەبارەت بە پێگەی کرمانجیی لەنێو عەشیرەتەکانی سۆراندا بڕوانە :

Edmonds,C.J. "A Bibliography of Southern Kurdish, 1920-1936." Journal of the Royal Central Asian Society 24, (July. 1937)488.

[9] ڕیشەی ئەم وشەیە بۆ سەردەمانێکی کۆن دەگەڕێتەوە . ئەم وشەیە لە یاسانامەکەی حامورابیدا ئاماژەی بۆ چینێك پێدەکرا کە دەکەوتە نێوان کۆیلە و ئەوانەی هاوڵاتی تەواو بوون . بەگوێرەی (ئێل.دەبلیو.کینگ) ئاماژە بوو بۆ ئەو ئازادانەی بەشێك نەبوون لە چینی فەرمانڕەوا .وشەکە لای ئاشوورییە کۆنەکان بە (مشکینو)هاتووە کە مانای هەژار دەگەیەنێت . هەمان وشە بۆ نێو زمانەکانی ئەرمەنیی ، ئارامیی ، عیبریی ، عەرەبیی ، ئیسیوپیی ، عەرەبیی باشوور و دواتر لە عەرەبییشەوە بۆ فەرنسیی و ئیتاڵیی پەڕیوەتەوە . ئەم وشەیە لە قورئان و فەرموودەشدا هاتووەو لێکدانەوەی جیاوازی بۆ کراوە

Buhl,Frants."Miskin". In E.J.Brills` First Encyclopaedia of Islam,1st ed .,5:520.

بۆ زیاتر سەبارەت بە پێگەیان لەنێو هەمەوەندەکاندا : Barth,53-59.

له ناڕێکیی و سەرلێتێکچوون دێتە پێشێ . ئەم سەرلێتێکچوونەش بەشێکی بۆ ئەو ڕاستییە دەگەڕێتەوە کە ئەم چەمکانە هەموویان وەك یەك لە سەراسەری کوردستاندا بەکار نایەن و هەروەها بەشێکی تریش بۆ ئەو ڕاستییە دەگەڕێتەوە کە چەمکەکان بەشێوەیەکی ڕەمەکیی و جێگۆڕ لەلایەن خێڵەکان خۆیانەوە بەکاردەهێنرێن .[10] وەرگرتنی چەند نموونەیەك بەسە بەڵگە بێت بۆ ئەو سەرلێتێکچوونەی لە سروشتی بەکارهێنانی ئەو چەمکانەدا دێتە پێش .

عەشیرەتی بالیك لەناوچەی ڕەواندز چەمکەکانی : عەشیرەت ، تایفە و تیرە بەکاردەهێنن بۆ بەرجەستەکردنی دابەشبوونی خێڵەکییان .[11] لەکاتێکدا لەنێو خێڵی سنجابیی کوردانی ئێراندا لەبەرامبەر ئەو چەمکانە : ئێل ، تیرە و تایفە بەکاردەهێنن.[12] ئەو چەمکانەی لەنێو عەشیرەتی ئۆرەمار و ڕێکانییدا بەکاردەهێنرێت ، کە بەدرێژایی سنوورەکانی تورکیا–عێراق ژیان بەسەردەبن ، بریتییە لە : عەشیرەت ، وەجاغ و ماڵ .[13] کەچی ئەو چەمکانەی لەنێو عەشیرەتی جاف دا لە باشووری کوردستانی عێراقدا دەبینرێت : عەشیرەت ، تیرە و هۆزە .[14]

لەسۆنگەی ئەو ڕاستییەوە کە ڕێکخراوە خێڵەکییەکان لەبنەڕەتدا لەسەراسەری کوردستاندا هاوشێوەیە ، وێڕای ئەو جیاوازییەی لەبەکارهێنانی چەمکەکاندا هەیە ، ئەم گفتوگۆیەی خوارەوە لەمەڕ ڕێکخستنی خێڵەکیی هاوپەیمانێتیی جافەکانە لە باشووری کوردستانی عێراق . بەگوێرەی بارس ، عەشیرەتی جاف بەسەر ژمارەیەك تیرەدا دابەش دەبێت کە هەریەك لەوانەش بەسەر ژمارەیەك هۆزدا دابەش دەبن . تیرە دەستەیەکی بنەڕەتیی ڕامیاریی و یەکەیەکی خاوەن زەوییە .[15] وێڕای ئەوەی هۆزیش ، بەرجەستەی

---

[10] سەبارەت بە بەکارهێنانی ناڕێکی ئەم چەمکانە لەلای کوردە خێڵەکییەکان ، بڕوانە :

Leach , E.R, Social and Economic Organization of the Rawanduz Kurds,14;Barth,37.

[11] Leach, 13-14.

[12] محمد موکری ، عشائر کرد ، ئیل سنجابی تاریخچە جغرافیا ، تیرەها ، تهران ، ٥٨–١٠٨

[13] Nikitine and Soane, 68-106.

[14] Barth , 35-38.

[15] Ibid.,36.

بارس ئاماژەی بەوەداوە کە هەر تیرەیەك سەرۆکێکی میراتگری خۆی هەیە ، هەرەیەك لەو دەستە خێڵەکییانەش ماڵ

دەستەیەکی ساکاری ئەوەکان دەکات کە تەواوی ئەندامەکانی خۆیان لە بەرەبابێکی هەمان باپیران دەزانن . بەوەش هەموو ئەندامەکانی دەستە خێڵەکییەکەی هۆزی کاکە حەمە بەرەی پیاوێکن کە ناوی کاکە حەمەیە . هەرچەند مەرج نیە هەموو بەرەبابێک ناوی هۆزی لێبنرێت . بۆ نموونە هۆزی جارویز مانای بنەماڵە یاخود ماڵی جارویز دەگەیەنێت و بەهۆی رێکخستنەکەیەوە وەك دەستەیەکی رامیاریی بە تیرە لەقەڵەم دەدرێت .[16]

بارس گفتوگۆی لەسەر ئەو پرۆسەیە کردووە کە چۆن دەگونجێت لقێك لە تیرەیەك جیابێتەوە و دەستەیەکی نوێ پێکبهێنن . ئەو دەستە نوێیەش هەموویان دەبێت سەر بە بەرەبابێك بن . بەڵام جەخت لەسەر جیابوونەوە و سەربەخۆیی خۆی دەکاتەوە . هێندێك لەو دەستانە بۆ نموونە بنجووتن وەك لقێك لە تیرەی شێخ سمایلیی . ویڕای ئەوەی هێندێکیان خزمن وەك شاتریی . ئەمانە بەردەوامیی بە پەیوەندییەکانی خۆیان لەسەر بنەمای یەکسانیی و وەك یەکیی تەواو دەدەن . ئەو راستییەی کە جەخت لەوە دەکاتەوە یەك ئەوەن و "کوڕی یەك باوکن". ئەم تیرانە چەشنە هاوکارییەکی رامیاریی دیارییکراویان لەنێواندا هەیە . کاتێك رووبەڕووی بڕیارێکی گرنگ وەك جەنگین دەبنەوە . سەرۆکی تیرە جۆربەجۆرەکان لە ئەنجومەنێکدا کۆدەبنەوە و بە گفتوگۆ و وتووێژ لەسەر بڕیارەکە رێکدەکەون ، بەڵام ئەنجومەنەکە وەك جەستەیەك خاوەن هێز و توانایەکی بەرجەستە نیە .[17]

## خێڵ

خێڵ یەکەیەکە بەمەبەستی ئابووریی دادەمەزرێت ، تیرە مافی لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی لە پاوانەکاندا بە هاوبەشیی هەیە . بەڵام هەمیشە وەك یەکەیەك هەوار ناخەن . زیاتر بۆ چەند هەوارگەیەك دابەش دەبن کە هەریەکەیان پێیدەڵێن (خێڵ) . خێڵ بەشێکن

---

تایبەتیی لەوەڕگاکان و هەوارگەکانیان هەیە

[16] Ibid.

[17] Ibid.,37-38.

له بەرەبابی هۆزێك بەهۆی پەیوەندیی ئابووریی و خوێنەوە پێكەوە بەستراون .[18] لەلایەن بەتەمەنترینیانەوە بەڕێوەدەبرێن ، ئەوەی بەشێوەیەكی نافەرمیی دەستنیشان دەكرێت و بەهۆی چالاكیی و پایەكەی دەسەڵاتی پەدرێتێ .

بەگوێرەی بارس ، زۆربەی جار خێڵ لەچەندین خێزان پێكدێت كە ژمارەیان لەنێوان بیست‌وسێ بۆ سی خێزانە . هەریەكەیان دەوارێكی جیایان هەیە ، ئاژەڵەكانیان بەشێوەی مێگەلە و نزیكەی پێنج سەد سەرە . هەر مێگەلێك شوانی خۆی هەیە . مێگەلەكان لەسەر بەنەمای هێڵێكی خزمایەتیی پێكدەهێنرێت ، لەگەڵ باوكان ، براكان یان لەگەڵ خزمانی دیكەدا سەرەكانیان دەكەنە یەك . دەگونجێت شوانەكان ، رەنجبەرەكان ، هەروەها كەسی دیكەش بەشێك لە خێڵ پێكبهێنن بەبێ ئەوەی ئەندامی عەشیرەتەكە بن . خزمە هەژارەكان زۆر كات بۆ ئەم مەبەستە بەكاردەبرێن .[19]

وادەردەكەوێت كە خێڵ لە باشووری كوردستاندا هاوشێوەی (تۆبە) یە لە هێندێك لە بەشەكانی باكووری كوردستان .[20] بەگوێرەی نیكیتین ، ژمارەی ئاژەڵەكانی تۆیە جیاوازن و لەنێوان پێنج سەد بۆ دەهەزار سەرە . ئەو لەسەری دەڕوات و دەڵێت كە تۆیە لەنێوان هەشت تا پەنجا رەشماڵ پێكدێت . لەباشووری كوردستان ، ژمارەی ئەو رەشماڵانەی تۆبە پێكدێنن جیاوازن و لە نێوان بیست بۆ پەنجا دانەدان ، هەروەها ژمارەی ئەو سەرمەڕانەی ئەم یەكانە دەیگرنە خۆ لەنێوان هەزار بۆ دووهەزار سەرە .[21]

## سەركردایەتیی خێڵەكیی

---

[18] Ibid.,38.

[19] Ibid.

[20] شتێكی سەیرە ، كە نە بارس ، كە لەبارەی خێڵەوە نووسیویەتی ، نە نیكیتینیش كە سەبارەت بە تۆبە نووسیویەتی ، ئەو دووانەیان لەگەڵ یەك نەناساندووە  لێی كە ئاماژەی بەم دوو چەمكە داوە ، دەڵێت خێڵ لەنێوە رەوەندە مەڕدارەكاندا هەیە و تایفەش لەنێو عەشیرەتە نیشتەجێكاندا  هەروەها گوتوویەتی كە هۆبە یان تۆبە " چەند دەوارێكی نیشتەجێی بچووكن لە شوێنێكدا" كە بە گوێرەی ئەو، هاوشێوەی "گوند" ە لەلای عەشیرەتە نیشتەجێكانیان .

[21] بۆ گفتوگۆی زیاتر لەمەڕ تۆبە و بایەخی ، بڕوانە : Nikitine ."Les Kurdes ,148ff.

هەر تیرەیەک لەلایەن رەئیسێک یان ئاغایەکەوە سەرۆکایەتیی دەکرێت و پایەکەشی بە میرات بۆ دەمێنێتەوە ، رەئیس یا ئاغا بەرجەستەی خانەدانی تیرە دەکات ، وێڕای ئەو پەیوەستە خزمایەتییەی سەرۆک بە ئەندامانی تیرەکەیەوە دەبەستێتەوە . بەشێوەیەکی رێژەیی چەند حاڵەتێکی کەمی ژنخوازیی لەگەڵ خانەدانی بەرەبابی هۆزەکانی دیکەدا بەرچاو دەکەوێت . ژن‌ومێردایەتیی نێوخۆیی کەلەسەر بنەمای خزم خواستن رادەوەستێت لەنێو بنەماڵە خانەدانەکاندا باوە . پێویست بە گوتن ناکات ، ئەو کردارە یارمەتیی بەهێزبوونی پێگەی سەرۆک دەکات لەنێو تیرەکەی خۆیدا .[22] ژن‌ومێردایەتیی دەرەکی شتێکی ناوازەیە ، گەر رووبدات ، ئەوا لەنێوان سەرۆک و خێزانێکی سامانداریی ئاسایی نێو هەمان تیرەی خۆی بەڕێوە دەچێت .

سەرکردایەتیی جاف بۆ بەگزادەکان یا (بنەماڵی میران) دەگەڕێتەوە .[23] بارس دەڵێت کە بەگزادەکان زۆربەی جار بەرجەستەی تیرەیەکی سەربەخۆی تایبەت بە خۆیانن ، بەڵام لەراستییدا دەگونجێت فرەشیاوتربێت وەک بنەماڵەیەک یان هۆزێک باسیان لێوەبکرێت . بەگزادەکان بۆ سێ لق دابەش دەبن : کەیخوسرەوبەگیی ، بەهرامبەگیی و وەڵەدبەگیی . خسرەوبەگیی و بەهرام بەگیی هەردووکیان لە حەوت پشتەوە نەوەی زاهیربەگن . بەڵام وەڵەدبەگیی لەو رووەوە دوورترن . ئەمێستا هەموو بەگزادەکان وەک موڵکداری دوور لە زەوییەکانیان ژیان بەسەر دەبەن . پەیوەندیشیان لەگەڵ جافە کۆچەرەکاندا روون نیە و ئەستەمە بنرخێنرێت .[24]

بەگزادەکانی جاف دەزگایەکی تایبەتیان بەناوی(پشتماڵە) وە هەیە ، ئەمەش ئامرازێکی گرنگە بۆ پتەوکردنی توانا و هێزی باڵادەستی بەگزادەکان بەسەر تیرە هەمەجۆرەکانی دیکەدا . پشتماڵە لەو پیاوانە پێکدێت کە هەریەکەیان سەر بە تیرەیەکی جافن . ئەرکیان پاراستنی بەگە یان سەرۆکێکی بەرچاوە و جێبەجێکردنی چەندین ئەرکە لە ماڵەکەیدا . بارس ئەم دەزگایەی لەگەڵ (هیرد/hird) ی ڤایکینگەکاندا لە رووی

[22] Barth . 40.

[23] العزاوی رادەگەیەنێت کە بە گوێرەی دابی خێزانیی ، جافەکانی بەگزادە رەسەنی خۆیان بۆ پیر خدرشاهۆی دەگێڕنەوە کە چیایەکە لە نزیکی جوانڕۆ کە زۆرینەی کوردەکانی سەیدن، لەوانەش جاف ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە باپیرانیان شێخ بوون و پاشتر بوونەتە میری دنیایی بڕوانە :عباس العزاوي ، عشائر العراق ، ج٢،بغداد،٣١.

[24] Barth . 41.

پێکهاتەو ئەرکەوە بەراورد کردووە . راستیی ئەوەی کە ئەندامانی پشتماڵە لە تەواوی تیرەکانەوە بانگدەکرێن بۆ ئەوەیە کە بۆ ئەزم و پابەندیی شیاوترن و لە بەرمگەرایی و دوژمنایەتیی خوێن پارێزراوترن .[25]

## سەرنجی رامیاریی و بواری کرداریی

ئێمە گێرانەوە و لێکدانەوەی بەنرخمان لەمەڕ سەرنجی رامیاریی کوردیی و بەکرداریکردنی لەلایە ، کە وێڕای سروشتە پەرش و بڵاوەکەی تیشکێکی بەرچاو دەخاتە سەر هزری رامیاریی کوردیی . پێویستە ئاماژە بەوە بدەین ، لەلایەکی ترەوە ، کە سیستمی ئۆتۆنۆمیی رامیاریی کوردیی هەرگیز لە دۆخی خێڵەکیی تێنەپەڕیوە . ئەو سەرکردە کوردانە لە بەدیهێنانی ئەم سیستمەدا سەرکەوتوو بوون زیاتر بەدوای نموونە ئیسلامییەکەدا کەوتن تا نموونەی رێکخستنی رامیاریی کوردیی . لە ئاکامدا دەزگای لەسەر بنەمای خێڵەکیی دامەزراو ، زیاتر تا دەزگای لەسەر بناغەی دەوڵەتیی دامەزراو بە پلەی نایاب دەزگا رامیارییە کوردییەکانی پێکهێنا . هاتنە ناوەوەی کارگێڕیی جۆربەجۆری بیانیی وەك (تورك ، فارس ، عێراقیی ، سوریی و رووسەکان بۆ کوردستان ، هاوجووتبوو لەگەڵ بەردەوام بوونی پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییە خێڵایەتییەکان ، ئەوەش لەوانەیە لە کۆتاییدا ببێتە هۆی لەناوچوونی یەکجارەکیی دەزگا رامیارییە کوردییەکان . کۆڵینەوەی ئەم دەزگایانە لەوانەیە ، هێندێك بەڵگە لەمەڕ رەوت و خولیا رامیارییەکانی ئێستا و ئایندە لە کوردستان بخاتە بەردەست .

تایبەتمەندیی و رووخساری دەزگا خێڵەکییە کوردییەکان کاردانەوەی ئەو پێکهاتە راوێژکارییەیە کە بڕیار لە کاروبارەکانی خێڵی کوردیی دەدات ، لەسەر بنەمای هەڵبژاردن کە زۆربەی جار رۆڵێکی بنەڕەتیی لە بەدوایەکهاتنی سەرۆکەکاندا دەگێڕێت و هەروەها لەسروشتی پەیوەندییەکانی نێوان خێڵ و سەرۆکەکەیاندا یەك لە سەرنجراکێشترین و بەرچاوترینی ئەو بەڵگانە ، باسکردنەکەی ریچە سەبارەت بە

---

[25] Ibid.

بەڕێوەبردنی کاروباری گشتیی لەنێو کۆنفدراسیۆنی گەورەی بلباسدا :" لەنێوان ئەو هۆزانەی کە بلباس پێکدەهێنن ، هەموو پیاوێك تەنانەت لە نزمترین پایەشدا ، دەنگی خۆی لە کاروبارە گشتییەکاندا هەیە . دەگونجێت تۆ کارێکی سەودا و مامەڵەت لەگەڵیاندا هەبێت ، کەچی لەناکاو لەنێو خەڵکەکەدا کەسێك هەبێت راپەڕێت وبڵێت : من بەمە رازیی نابم ! هێندە بەسە بۆ ئەوەی سەراپای سەودا و مامەڵەکە لە خولەکێکدا هەڵبوەشێتەوە."[٢٦]

ریچ لە رێگەی نموونەیەکی ئاشکراوە چیرۆکی ئەو پیاوە بلباسییە دەگێڕێتەوە کە دژایەتیی ئەو ئامادەکارییەی کردووە کە بۆ کۆتاییهێنانی دوژمنایەتییەکی نێوان هۆزەکەی و میرنشینی بابان کراوە . لە کۆبوونەوەیەکدا کە نوێنەری هەردوولای تێدا بەشدار بوون ، هەموو پیاوە خێڵەکییەکانی بلباس ئەوەیان پەسەندکرد کە سەرۆکی بلباس سەردانی سلێمانی بکات بۆئەوەی لەگەڵ میری باباندا گفتوگۆ بکەن ، لەکاتێکدا برای میر لەلای بلباسەکان وەك بارمتە دابنرێت . وێڕای ئەوە ، ئامادەکارییەکە بەهۆی نارەزایەتیی تاقە بلباسێکەوە گۆڕانی بەسەردا هات .[٢٧] لێرەشەوە دەردەکەوێت تاکی خێڵەکیی بلباس ئەو مافەیان هەبووە کە ئێستا (ڤیتۆ)ی پێدەگوترێت .

نووسەرانی جۆراوجۆر جەخت لە بایەخداریی ئەنجومەنەکان لە ژیانی خێڵایەتیی کوردستاندا دەکەنەوە . بەگوێرەی نیکیتین ، سەرۆك لەلایەن ئەنجومەنێکی ریشسپییانەوە هاوکاریی دەکرێت . ئەرکی ئەنجومەن چارەسەرکردنی ناکۆکیی و کێشەکان و بەدیهێنانی دادپەروەرییە بەگوێرەی یاساو دابە خێڵەکییەکان .[٢٨] هەروەها هەڵسوڕاندنی هێندێك کێشەی وەك جەنگ ، کوژانەوەی خوێن ، گێڕانەوەیماڵی دزراو ، داوەرییکردنی ناکۆکییەکان وەك : ژن هەڵگرتن ، هەروەها ماف لەوەڕاندن و ئاودان . یەك لە سەختترین سزا کە لەلایەن ئەم ئەنجومەنانەوە دەسەپێنرێت بریتیە لە سزای لەخێڵ دوورخستنەوە یان دەرکردن .[٢٩]

سەبارەت بە بەستنی کۆبوونەوەکانی خێڵ ، بارس ئاماژەی بە نموونەی

---

[26] Rich, 1:150.

[27] Ibid.

[28] Nikitine, "Problem Kurde,"254;Cf.Rich,1:152.

[29] Nikitine, "Problem Kurde,"254.Ace also his ," les feodalite Kurde",4.

سەرنجڕاکێش لەنێو تیرەی شاتریی سەر بە هاوپەیمانیەتیی عەشیرەتی جاف کردووە . بەگوێرەی ئەو ، سەرتیرە جۆربەجۆرەکان لە رەشماڵی ئەندامێکی دەوڵەمەندی ئاسایی خێڵەکە کۆدەبنەوە نەك لە رەشماڵی هیچ یەك لەو سەرۆکانە ، بۆ ئەوەی هیچ یەك لەوانە بایەخ و بەهایەکی زیاتری لەوی دیکە نەبێت ."[30]

خواستی کۆمەڵگەکە ، چ لەرێی ئەنجومەنی ریشسپییانەوە یاخود لە کۆبوونەوەیەکی گشتییدا رابگەیەنرێت ، زۆربەی جار رۆڵی بنەڕەتیی لە دەستنیشانکردن و شوێنگرتنەوەی سەرۆك عەشیرەتدا دەگێڕێت ، وێرای ئەوە شتێکی باوە کە کوڕەگەورە شوێنی باوکی بگرێتەوە ، بەڵام مافی کوڕەگەورە لەنێو کورددا یاسایەکی چەسپاو نیە . ریچ بەم شێوەیە باس لە بەدوایەکهاتن لەنێو بلباسەکاندا دەکات :" کاتێك سەرۆك بمرێت ، ئازاترین یا دلێرترین پیاوی بنەماڵەکەی شوێنی دەگرێتەوە ، بە پەسەندکردنی گشتیی پیاوانی خێڵەکەی ، بەڵام گەر کوڕە گەورە نالەبار و نەشیاو بێت ، یەك لە دلێرترین و چاکترین براکانی شوێنی دەگرێتەوە ."[31]

لەنێو جافەکانیشدا هەلومەرجەکە بەشێوەیەکی بنەڕەتیی هەر هەمان بوو ، ریچ نووسیویە :" گەر سەرۆك بمرێت ، ئەگەر کوڕەکەی گەنج بێت ، شوێنی باوکی ناگرێتەوە ، چونکە تیرەیەك بە مێرمندالێك بەڕێوە ناچێت ، لە حاڵەتێکی وادا بۆشایی سەرۆکایەتیی لەلایەن برایەك یا مامی بەگە کۆچکردووەکەوە پڕ دەکرێتەوە."[32] شوێنگرتنەوە لە مێرنشینی هەکاریدا لەلایەن ئەنجومەنەوە بڕیاری لەسەر دەدرا . ئەندامانی ئەنجوومەنەکە پەنایان بۆ شێوازی نائاسایی دەبرد تا خۆیان لە خۆپالاوتووی ناشایستە رزگاربکەن .

سەبارەت بە شوێنگرتنەوەی خانەکان بەندوباوی سەیروسەمەرە دەگوترێت ، هەرچەندە مەسەلەکە میراتییە ، بەڵام گەر خان هێندە بۆ ئەو پایە بڵندە شیاو نەیەتە بەرچاو ، بانگی کۆبوونەوەیەکی پیاوە گرنگەکان دەکرێت ، ئەگەر دوای راوێژ دەرکەوت ئەو خانە نەشیاوە ، جوتێك پێلاو دەخەنە بەردەمی ، ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرێت

---

[30] Barth . 38.

[31] Rich,1:152 .

[32] Ibid.,1:112.

ئەوەیە لەپێیان بکات و زوو زوورەکە جێبهێڵێت . بەوەش رەزامەندیی خۆی بۆ گواستنەوەی شوێنگرتنەوە بە کەسێکی خۆپالآوتووی دیکەی پیشاندەدات . ماڵ‌وموڵکی خانی پاڵپێوەنراو هەر لای خۆی دەمێنێتەوە و لێی ناسەنرێتەوە .[33]

لانی کەم لە ناوچەیەکی کوردستاندا ، وادەردەکەوێت سەرۆکایەتیی بە شێوازێکی هەڵبژاردن بێت کە نوێنەری تەواوی خەڵکی تێدا بەشدار بێت . بەگوێرەی کامەران بەدرخان ، " لە ژیانی رامیاریی کوردستاندا تەنانەت لەناوچەی شێرناخ کۆمارێك بینراوە ، کە تێیدا سەرۆك لە لایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرا ."[34]

فرە لە نووسەران قسەیان لە پەیوەندییەکانی نێوان کورد و سەرۆکەکانیان کردووە ، هێندێکیان جەختیان لەوە کردۆتەوە کە کوردە خێڵەکییەکان کوێرانە دوای سەرۆکەکانیان دەکەون و بێ ئەملاولا ملکەچیی و گوێڕایەڵیی خۆیان پیشاندەدەن ، لەسەر داوای سەرۆکەکەیان بێ سێ‌ودوو ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە . سۆن ، لە ساڵی ١٩١٨ ، هەواڵی ئەوەی داوە کە بەرێکەوت چاوی بەدەستەیەك لە جەنگاوەرانی کورد کەوتووە کە لە شەڕێکی خوێناویی گەڕاونەتەوە و تێیدا نزیکەی پەنجا پیاوێکیشیان لێ شەل‌وشکست بووە . کاتێك سەبارەت بە هۆی شەڕەکە پرسیاری لێکردبوون ، وا دەرکەوتبوو کە لەنێو دەستەکەدا کەسێك نەبووە هۆیەکە بزانێت ." سەرۆك پێمانی گوت شەڕی پیاوەکانی حەمەبەگ بکەین و ئێمەش کردمان ". بەم شێوەیە وەلامدرابووەوە .[35]

لایەنگریی کوردان لە رێبەرە ئایینییەکانیان یان شێخەکان مەزنە گەر لە لایەنگرییان بۆ سەرکردەکانیان مەزنتر نەبێت . وێڕای ئەوەی لە قۆناغی هاوچەرخیشدا

---

[33] Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan."347n.1

[34] K.Bedir Khan,242.

ئەو بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش باس لە هەڵبژاردنی سەرۆك خێڵی ناوچەی شێرناخ دەکات ئەوانەی ریشسپییەکانیان بۆ ئەو مەبەستە کۆدەبنەوە و تەسبیحەکانیان بەدەستەوە دەگرن و بەبەردەم کاندیدەکاندا تێدەپەڕن و لەبەردەم کاندیدی شیاودا بەرێزەوە سەرداەنەوێنن و تەسبیحەکانیان دەخەنە بەر پێی ئەوەش مانای ئەوە دەگەیەنێت کە باوەڕیان بەو کاندیدەیە و دەنگی خۆیان پێداوە

Bulletin du Centre d Etude Kurdes,1(1948),12-13.

[35] Soane ,Report on Sulaimania District ,40.

ڕۆڵی شێخەکان بایەخێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە ، ئەوەی وای لێکردین لە باسێکی سەربەخۆدا و هەر لەم بەشەدا بەدرێژیی قسەی لێوە بکەین .

سەبارەت بە گفتوگۆ لەمەڕ پەیوەندییەکانی نێوان کورد و سەرکردەکانیان لەساڵی ١٩٢١دا ، (مێجۆر دەبلیو .ئار.هەی ) کە هەروەها کارمەندی کارگێڕی بەریتانییەکان لەعێراق بووە ، سەرۆکەکانی کوردی بۆ دوو دەستە دابەش کردووە ئەویش (ئاغای باش ) و (ئاغای بەد) . یەکەمیان بەرژەوەندیی ئەندامانی خێڵەکەی لەبەرچاوە و بۆ خەڵکەکەی باوکێکی راستەقینەیە . لەکاتێکدا دووەمیان بەدەستێکی ئاسنین دەستوپێوەندەکەی بەڕێوە دەبات ، هیچ دەرفەتێك بۆ بەکاربردن و بێگار پێکردن و سەرکوتکردنیان بەفیڕۆ نادات .[36]

هەی ئاماژەی بەوەداوە کە ئەو سەرۆکانەی لەناوچە چۆڵ و دووردەستەکاندان زیاتر بەتەنگ دەستوپێوەندەکانیانەوە دێن وەك لەوانەی کەوتوونەتە نزیك ناوەندەکانی حکومەتەوە .[37] بایەخی ئەم جیاوازییە لەو راستییەدا دەردەکەوێت کە ئەو ناوچانەی نزیك ناوەندەکانی حکومەتن ئەو کوردانەی تێدا نیشتەجێن کە جووتکاری گوندنشینن و خێڵەکیی نین ، لەکاتێکدا ئەوانەی ناوچە دووردەست و چۆڵەکان کوردانێکن لەسەر بنەمای پەیوەندییە خێڵەکییەکان دەگوزەرێن ، جا چ کۆچەرین یاخود نیشتەجێن . دەلوجی کە سەبارەت بە هەمان بابەت لە ناوچەی بادیناندا گفتوگۆی کردووە ملکەچیی و گوێڕایەڵیی کوردانی نیشتەجێی بۆ ئەو راستییە گێڕاوەتەوە کە ئەوان بە زەوییەوە بەستراونەتەوە کە سەرچاوەی ژیان و گوزەرانیانە ، بەوەش ناتوانن لەدەستی ئاغا رزگاریان بێت و بۆ شوێنێکی دیکە بگوێزنەوە .[38] لەم قسەیەی دەلوجییەوە ئەوە دەردەکەوێت کە لای ئەو بە شێوەیەکی سەرەتایی ئەو کوردانە رێکخستنی خێڵایەتییان لەنێودا لاواز بووە .

---

[36] Hay.Two Years in Kurdistan , 62.

[37] Ibid.

[38] دەلوجي ، امارة بهدينان ،١٣٥.

یەك لە دەرکەوتەترین روخساری ژیانی خێڵەکیی کوردیی بریتیە لەو هاوبەستەگییەی تایبەتە بۆ سۆزی خێڵەکیی کوردیی .[٣٩] لە بۆنەی جیاوازدا ، ئەو سۆزە سەلماندوویەتی کە تەنانەت لە سۆزیی ئایینییش بەهێز ترە . هەرچەندە لە یەکەمین سەرنجدا دەگونجێت زیاتر لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا ئاڕام بێت ، بەڵام لەراستییدا هێندە بەرتەسك و نائاو نیە وەك دەردەکەوێت .[٤٠]

پێش جەنگی یەکەمی جیهانیی ، دەستەی مەزنی ئەرتۆشیی کە لە کوردە کۆچەریی و تیارییە کریستیانییەکان پێکدەهاتن و هەردوولایان بە پێی داب و قسەی باپیرانیان دەچنەوە سەر یەك پشت و لە تەختاییەکی لای چەپی زێی سەروو نیشتەجێ بوون ، زۆربەی جار لە شەڕ و ململانێدا بوون لەگەڵ ئەو نەستوورییە کریستانیانیی و کوردە موسوڵمانانەی پێکەوە لەبەری راستی زێیەکەوە نیشتەجێ بوون . ئەو دوو هاوپەیمانیەتییەی کە بە باسکی چەپ و باسکی راست ناسرا بوون .[٤١] لە راستییدا پێشتریش ، لەسەردەمی سەرکوتکردنی میرنشینە کوردییەکاندا ، ئەرمەنییە کریستیانییەکان و کوردە موسوڵمانەکانی بەرزاییەکانی ساسۆن شان بە شانی یەك دژی سوپای عوسمانیی بە سەرکردایەتیی رەشید محەمەد پاشا شەڕیان کرد تا ئەو کاتەی سوپای عوسمانیی هەردوولایانی تێکشکاند .[٤٢]

لەوانە بەرچاوترین نموونەی سۆز و هاوبەستەگیی خێڵەکیی کە سۆزیی ئایینیی تێپەڕاندبێت بریتیبێت لە یەکێتیی موسوڵمان و کریستیانییەکانی هەکاریی ، کە لە

---

[39] Nikitine ," les feodalite Kurde".

[40] سەبارەت بەو بابەتە و بەراوردکردنی لەگەڵ ناوچەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەراست ، هەروەك ناوچە چیاییەکانی لوبنان ،بڕوانە : Pierrer Rondot,Les tribus Montagnardes de l Asie Anterieure,5ff .

[41] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1921, ,( Baghdad Government Press, 1922).

[42] Brante, J."Notes of Journey Through Part of Kurdistan , in Summer of 1983." Journal of the Royal Geographical Society 10,(1841):341-434.

نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا گەشەی کرد .[43] لەکاتی ئەمانی میری هەکاریی ، پاتریارکی ئەستووریی میرنشینەکەی بەڕێوەبرد ، وەك یەك فەرمانڕەوایی کریستیانیی و موسوڵمانەکانی دەکرد ، تەنانەت پێشوازیی نێردراوانی سوڵتانیشی دەکرد . ئەو خاڵەی دواییان بایەخێکی مەزنی هەیە ، چونکە مانای ئەوەیە کە مەسەلەکە تەنیا پێکهاتنێکی خۆجێ نەبووە ، بەڵکو ڕاستییەك بووە لەلایەن باڵاترین دەسەڵاتەوە زانراوە و پەسەندیش کراوە .

## تۆڵەی خوێن

وەك هەر کۆمەڵگەیەکی خێڵەکیی ، دوژمنایەتیی و کێشەی خوێن لە سەراسەری کوردستاندا بەربڵاوە . شێوە و توندیی دیارە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە و چەند هۆکارێك کاری لێدەکەن . لەو ناوچانەدا کە بەتەواویی خێڵەکیین بەهێزە و لەو ناوچانەش کە لە ئەنجامی چەندین هۆوە پرۆسەی هەڵوەشاندنەوەی ژیانی خێڵایەتیی تێیدا پەرەی سەندووە و کاریگەریی دەرەکیی لەسەری مەزنە ، لاوازە .

بێگومان ، پێکهاتەی خزمایەتیی ئەو پەیوەستە بەهێزەی ژنوژنخوازیی کۆمەڵگەی خێڵایەتیی بەو ئاراستەدا دەڕوات کە کێشەی خوێن توندتر دەبێت . دەستەی خێڵەکیی خۆی بە یەکەیەکی سەربەخۆ و تاقانە دەزانێت و لەدەرەوەی خۆشی بەو چاوە سەیری دەکرێت ، ئەو ڕاستییەی کە سەرئەنجام بیرۆکەی بەرپرسیارێتیی گشتیی و نێوکۆیی پێکدەهێنێت ، لەگەڵ ئاکامی تۆڵەسەندنەوە دژی تاوانکارەکە یاخود هەر ئەندامێکی دەستەکەی خۆی لەلایەن هەر ئەندامێکی دیکەی دەستەی قوربانییەکە . بەگوێرەی (لیچ) " هاندەرەکانی کێشەی خوێن دەتوانرێت لەو دەربڕینەدا بەرجەستە بکرێت کە : هەڵە و تاوانی کەسێك دەبێت لەلایەن کەسوکار و ئەوەی ئەو کەسەی تاوانەکەی دەرحەق کراوە تۆڵەی بسێنرێت ، هەروەها دەبێت دەستبەجێ ئەوە تێبینیی بکەین ، کە ئەو سیستەمەی دەستەیەکی خێڵەکیی باوکایەتیی داخراوە و لەسەر بنەمای ژنوژنخوازیی نێوخۆ دامەزراوە ، زۆر گونجاوە بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارە

---

[43] Rondot,"Les tribus Montagnardes,"70.

دوژمنکارییانه."[44]

نیکیتین تۆڵە بە یەکێك لەو سێ شتە دادەنێت کە بیرکردنەوەی مرۆڤی کورد داگیردەکات و شێوازی لایەنگریی و وەفاداریی و ناکاری دیارییدەکات .[45] ئەنجامدانی کوشتن نیشانەی سەرەتای دەستپێکردنی دوژمنایەتییە لە کێشەکانی وەك : ئاژەڵ دزیی ، ماف لەوەڕاندن و ئاودێریی ، هەروەها لەهەمووی ناڵەبارتر مەسەلەکانی ئابڕوو و ژن هەڵگرتن و دەستدرێژیی سێکسیی و لاقەکردنە .[46] بەگوێرەی نیکیتین ، کە لەسەر کوردانی کوردستانی ناوەندیی نووسیوە ، بنەماڵەی کوژراوەکە داوای مافی تۆڵەسەندنەوە لە بکوژەکە دەکەن ، کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ یا زیاتر لەخێڵەکە دوور دەخرێتەوە . لەکۆتایی ئەو ماوەیەدا ، هەوڵی پێکهاتنەوە دەدرێت ، دەگونجێت بکوژەکە بگەڕێتەوە نێو خێڵەکەی پاش ئەوە لەلایەن ریشسپییانەوە پشتگیریی دەکرێت یا لەسەر داوی سەرخێڵەکەی دەبێت ، وێڕای ئەوەی خێزانی قوربانییەکە دەست لە مافی تۆڵەسەندنەوەی خۆی بەرنادات .[47]

سەرۆك لە گرتنەبەری هەنگاوی کاریگەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە هیچ کاتێك بەفێڕۆ نادات بۆ ئەوەی بەر لە گەورەبوونەوەی دوژمنایەتییەکە بگرێت ، ئەو دوژمنایەتییانەی سەرۆکەکان خۆیانی تێوەگلاون ، کوژانەوەیان یەکجار گرانە .[48] فەسڵ پێویستی بە پارە هەیە کە لە کوردەوارییدا (خوێن) ی پێدەڵێن .[49] سەرباری خوێنبایی ،

---

[44] Leach,55.

[45] لای نیکیتین ئەو سێ شتە بریتیین لە : تۆڵە ، خێڵ ، کوردستان کە کورد بە خاکەکەیەوە دەبەستێتەوە

Nikitine ," les feodalite Kurde"4.

[46] Cf. Leach,55-56.

[47] Basile Nikitine ,Qualeques observation sur les Kurdes," ,669.

[48] Hay,Two Years in Kurdistan , 72.and Leach ,56-57.

العزاوی دەڵێت کە کوشتنی محەمەد پاشای جاف لەلایەن تیرەی کەریم وەیسیی تایفەی شاترییەوە بۆتە هەڵگیرساندنی ئاگری تۆڵەی دڕندانە کە بە تەواویی کەریم وەیسیی تێدا تارومار بوو بێ ئەوەی دەست لە ژن و منداڵەکانیشیان بپارێزرێت سەختی ئەو سزایەی بەسەر ئەم تایفەیەدا درا لەلای (سۆن) جەخت لەخۆی دەکاتەوە کە ئەو خێڵە ناچار بوو پەنا بەرێتە بەر هەمەوەندەکان تا بیانپارێزن

[49] بەگوێرەی العزاوی ، بڕی پارەی خوێن لەنێو چینە هەژارەکانی کورد لە ساڵی ١٩٤٧ دا لەنێوان بیست بۆ چل

وا باوه كه بنەماڵەی تاوانكارەكه ئەسپ و هەروەها ژن ئەدەن بە ئەندامانی بنەماڵەی قوربانییەكه بۆ ئەوەی هێوریان كەنەوه و گیانی تۆڵەسێنییان لاواز بكەن و هەردوو خێزانەكه لە ڕێی ژنوژنخوازییەوه پێكەوه گرێبدەن .[50]

لە كوژاندنەوەی كێشەی خوێندا متمانە بە كەسایەتییەكی ناسراو و خاوەن پایەی كۆمەڵایەتیی ئەدرێت یاخود بە ئەنجومەنی سەرۆكەكانیان یان ریشسپییان تا قسە و بڕیاری خۆیانی تێدا بدەن . حكومەتیش هەمیشە جەخت لە پێویستی پابەندبوون بە بڕیارەكانی ئەنجومەن ئەكاتەوه.[51] زۆربەی جار پاش پێكهاتنیش دوژمنایەتیی هەڵئەگیرسێتەوه . بۆ نموونە ، نوێبوونەوەی دوژمنایەتیی نێوان سیتۆ ئاغای ئۆرەمار و تاتۆ ئاغای ڕێكان . وێڕای ئەو ڕاستییەی كە سیتۆ ئاغا لە كوژاندنەوەی كێشەكەدا دەستپێشخەریی كرد و كچەكەی خۆی دا بە تاتۆ ئاغا ، بەڵام چەند ساڵێك دواتر ، كاتێك زاوا و برایەكی تاتۆئاغا لەلای سیتۆ ئاغا میوان بوون ، بە غەدر كوژران .[52]

یەك لەو مەسەلە گرنگانەی پەیوەندیی بە كێشەی خوێنەوه هەیە بریتیە لە پەنادانی تاوانكارەكه . پێشێلكردنی پەنادانی تاوانكار بە بایەخەوه سەیر ئەكرێت و ئەوانەی ئەو پێشێلكارییە ئەنجام ئەدەن ئەگونجێت تووشی سزا و تۆڵەسەندنەوەی پەنادەرەكه بن ، كە لە زۆربەی كاتدا كەسێكی بەدەسەڵاتە . چارەسەركردنی كێشەی پێشێلكاریی پێویستی بە دانی بڕێك پارە هەیە كە (ووشیر) ی پێدەڵێن وەك قەرەبوویەكی ئەو بێ ڕێزیی و سوكایەتییەی بە كەسایەتیی پەنادەرەكه كراوه .[53]

بارس سەبارەت بە "نەبوون یا فرە لاوازیی پەرەسەندنی كێشەی خوێن لە باشووری كوردستان" نووسیویەتی .[54] بەگوێرەی ئەو ، ئەوەی لەو ناوچەیە هاتۆتە دی

---

پاوەندە .هەی ئەڵێت لەنێو كرمانجەكاندا یان كوردانی چیینی ناوەڕاست ٩٠ جونەیه ، نافرەت ٤٥ و قاچ یان دەست

٢٠ پاوەندە پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت كە كرمانج چەكێكە بۆ جووتیاران لە ناوچەی ڕەواندز بەكار ئەهێنرێت

ئەك بۆ چیینی ناوەندی كورد العزاوی ،٢: ٢٤١، Hay,Two Years in Kurdistan , 72.and Leach ,56.

[50] العزاوي ،٢: ٢٤١ بەگوێرەی هەی، ژن و ڕەشەولاخ لەجیاتی پارەی خوێن ئەدرێت.نەك سەرباری پارەی خوێنەكه

[51] Ibid, 72-73.

[52] سەبارەت بە كێشەی خوێن بڕوانە :.Nikitine and Soane, 69-102

[53] العزاوي ، ٢: ٢٤٣

[54] Barth . 73.

**تۆڵەسەندنەوەی تاکەکەسیی رووتە زیاتر لەوەی شێوازێکی دەزگایی کێشەی خوێن بێت و لەسایەی بیرۆکەی تۆڵەسەندنەوەیەکدا بێت کە لەسەر بنەمای یەکسانیی و بەرپرسیارێتیی گشتیی بنیادنرابێت ."[55] بارس ئەو هەلومەرجە لەگەڵ ناوچەی رەواندزدا بەراورد دەکاتکە کێشەی خوێنی تێدا یەکجار بڵاوە . ئەو ئەم جیاوازییە بۆ مانەوەی رێکخستنە خێڵایەتییەکان لەناوچەی رەواندز و لاوازبوونی ئەو رێکخستنەش لە باشووری کوردستان بەهۆی کارگێڕیی فیوداڵیی بابانەکان کە لەسەر بنەمای ناهۆزایەتیی چەسپا بوو ، گەڕاندووەتەوە .[56]**

**ئەو بنەمایەی بارس لێکدانەوەکەی خۆی لەسەر بنیاتناوە ، جێگای پرسیارە . بارس خۆی دانی بەوەدا ناوە ئەو کەرەسانەی کە لێکدانەوەکانی لێوە هەڵهێنجاوە "زۆر ناتەواو"بووە .[57] سەرباری ئەوەش ، دەگونجێت کە ئەو زیاتر ئەو ناوچە ناخێڵەکییانەی دەوروبەری سلێمانی لەبیرمابێت و بەسەر کردبێتەوە . دەگونجێت دەرئەنجامەکانی ، ئەو بەشە نیمچە کۆچەرییەی هاوپەیمانیەتیی مەزنی جاف پێشان نەدات کە لەسەر بنەمایەکی خێڵەکیی لە بەشی باشووری ناوچەکە رێکخراوە ، یاخود هاوپەیمانیەتیی پشدەر لە بەشی باکووری رۆژهەلات . وێڕای ئەوەش ، جێی گومانە ، کە فەرمانڕەوایەتیی بابان هەمیشە دەزگا خێڵەکییەکانیان لە باشووری کوردستاندا لاواز کردبێت. ئەوەی زانراوە کە لەپاش نەمانی دەوڵەتی فیوداڵی بابان ، ناوچەکە بەتەواویی نوقمی نائارامیی و پاشاگەردانیی ببوو . لەئاکامدا زۆربەی رەگەزە جۆربەجۆرە خێڵەکییەکان گەڕانەوە سەر هەمان شێوازی کۆنی ژیانی خێڵایەتیی . لە راستییدا ، بارس هەر خۆی ئاماژەی بەوە داوە کە عەشیرەتی جاف هێندە بەهێز بووە ، زۆربەی خێڵەکانی کە مابوون لەنێو خۆیدا تواندووەتەوە . لەکاتێکدا هەمەوەندەکان کەوتبوونە کاری جەردەیی و راووڕووت .[58] سۆن لەساڵی ١٩١٨دا ، بەم چەشنەی خوارەوە باسی لە جافەکان کە یەک لە مەزنترین عەشیرەتەکانی کوردستانی باشوورە کردووە :**

**"عەشیرەتی جاف (کە بەگشتیی قسە لەسەر جافی مورادییە) یاخیی ، کێویی ،**

---

[55] Ibid.

[56] Ibid.,77.

[57] Ibid.,73.

[58] Ibid.,14.

درنده ، دوژمنایەتییان لەگەڵ هێندێك لە عەشیرەتەکان هەیە کە بەتوندیی جاروبار لەگەڵیاندا شەڕدەکەن ، دوژمنایەتیی و کێشەی خوێن زۆر خراپ لەنێو تیرە جیاوازەکاندا هەیە ، وێڕای ئەوەی هەر کارێك بۆ ڕێکەوتن بەتایبەتیی بۆ ئەوان زۆر ئەستەمە . تەواوی عەشیرەتەکە نوقمی کێشەی خوێن و دوژمنایەتیی بووە ، ئەو مەسەلەیەی کە بەشێکی گەورەی کاتی خێڵەکانی داگیر کردووە .[٥٩]

ئاکامە دوورمەوداکانی کێشەی خوێن ، هەروەها ئەو شێوازەی کە کاریگەریی پێدەکاتە سەر نەك هەردوو بەرە تێوەگلاوەکە و لایەنگرنیان ، بەڵکو تەواوی کۆمەڵگاش ، دەگونجێت بە باشترین شێوە لەو دوژمنایەتییە بەرجەستە بێت کە لەنێوان هەردوو بنەماڵەی خانەدانی باویل ئاغا و عەبدوڵلاپاشا لە ڕەواندز هەبووە . ئەم دوژمنایەتییە کە ماوەیەك پێش داگیرکاریی بەریتانییەکان بۆ کوردستانی عێراق دەستی پێکردووە . ئەو دوژمنایەتییەی ئاگرەکەی تا ماوەیەکی درێژخایەن بەردەوام بوو ، لەساڵانی بەرایی داگیرکاریی بەریتانییەکاندا ، تێکەڵ بەکارگێڕیی هەرێمەکە بوو و گۆڵەمزێکی مەزنی بۆ دروستکرد .

دانانی ئیسماعیل بەگی کوڕەزای عەبدوڵلاپاشا بە فەرمانڕەوای ڕەواندز وای لە بنەماڵەی باویل ئاغا کرد ببنە هاوپەیمانی سورچییە خێڵەکییە ناڕازییەکان ، ئەوانەی دواجار ڕاپەڕین و توانیان بۆ ماوەیەکی کاتیی بەریتانییەکان لە زۆربەی ناوچەی ڕەواندز وەدەرنێن .[٦٠] ئێمە لە (ئەی .ئێم.هامیلتۆن) هوە دەزانین ، کاتێك لە ساڵی ١٩٢٠دا وەك ئەندازیارێك لە عێراق بەرپرسی بنیاتنانی ڕێگا مەزنەکەی ڕەواندز بووە ، کە ئەم دوژمنایەتیی و کێشەی خوێنە چۆن سەرنجی گشتیی ڕاکێشاوە .

ئیسماعیل بەگ دواجار لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ ڕەواندز خرایە بۆسەوەو کوژرا.[٦١] قوربانییەکی دیکەی ئەم دوژمنایەتییە ، بەگوێرەی لیچ ، بریتیبووە لە برازاکەی حامید ئەمین ئاغای دەرگەڵە ، کە خزمی هەردوو بنەماڵە دوژمندارەکەیە و لە ساڵی ١٩٣٧دا کوژراوە . دوا قوربانیی لەچوارچێوەی ئەو دوژمنایەتییەدا کە لیچ ئاماژەی پێداوە ئەوە

---

[59] E. B .Soane. Notes on the Tribes of Southern Kurdistan ,( Baghdad Government Press. 1918) ,20.

[60] Hay.Two Years in Kurdistan , passim.

[61] Hamilton.A.M. Rode Through Kurdistan.270-309.

بوو کە ساڵی ١٩٣٨ کوژراوە .[٦٢]

کاریگەریی گرنگی ئەم دوژمنایەتییە بە تێپەڕبوونی کات تایبەتمەندییەکی رامیاریی گرتۆتەخۆ . لیچ گوتوویە:" مەسەلەکە بەشێوەیەك ئاڵۆز بووە کە تێکەڵ بە پرسە بەرفراوانەکانی دیکە بووە ، بەتایبەت نەتەوایەتیی کوردیی . تۆمەتبارکردنی بەوەی ئینگلیزخوا بێت ، یا عەرەبخوا ، یا دژەکورد لەنێو هەمووواندا بەشێوەی جیاواز هەیە و لەکاتی دیارییکراوی ئێستادا ئەو دەرفەتە نیە کە هەموو ئەو دوژمنایەتییە شەخسییە ئاڵۆزانە و بەرژەوەندییە دژبەیەك و ئاڵۆزکاوانە چارە بکرێت ."[٦٣] لە ساڵی ١٩٥٤ دا ، لە کتێبێکدا کە لەلایەن نووسەرێکی کوردەوە نووسراوە ، ئەو دوژمنایەتییە لە چوارچێوەی ململانێیەکی پارتیزانیی سەخت کە پەیوەندیی بە چالاکییە رامیارییەکانی ئیسماعیل بەگەوەیە ئاماژەی پێدراوە .[٦٤]

پێدەچێت لێرەدا گونجاوبێت کە تۆڵە و حەقلێکردنەوە وەك دیاردەیەکی بەربڵاو لەنێو چەند خێڵێکی دیارییکراو لە قەڵەم بدرێت . بەگوێرەی (ئار.زێرنواڵد) " تۆڵەکردنەوە هەروەها لەهەمبەر ئاژەڵان و شتی بێگیانیش وەك دار و چەك ئەنجامدەدرێت ."[٦٥] بۆ نموونە لە ساڵی ١٨٥٣دا (سێر ئۆستن هێنری لایارد) شایەتحاڵی گێڕانەوەی رووداوێکە کە کابرایەکی مارگری ئێزیدیی لەتۆڵەی ئەوەی مارێك گازی لە کوڕە حەوت ساڵەکەی گرتووە کە هاوکاریی باوکی کردووە لە کارەکەیدا و لەئەنجامدا خوێنی لێهێناوە ، ئەمیش گازی لەسەری مارەکە گرتووە .[٦٦] فرێزەر ئاماژەی بەو چیرۆکەی محەمەدپاشای رەواندز داوە ، کە لە تۆڵەی کوشتنی مرۆڤێك لەلایەن گورگێکەوە ، گورگەکەی پاش شکەنجەدانێکی توند کوشتووە .[٦٧]

---

[62] Leach,57.

[63] Ibid.

[64] معروف جیاوك ، ماساة بارزان المظلومة ، بغداد، ١٩٥٤، ١٢٨-٢٩

[65] Thurnwald, R. "Blood Vengeance Feud."2:598-99.

[66] Layard ,Sir Susten Henry ,Discoveries in the Ruins of Nineveh and Babylon,2:257.

[67] پێدەچێت ئەم چیرۆکە بەتەواویی هەڵبەستراوبێت بەمەبەستی پیشاندانی رادەی دادپەروەریی میرەکوێر ، لەچیرۆکەکەوە دیارە مەبەست لێی تۆقاندنی گوندییەکان بووە بۆئەوەی بە بینینی شکەنجەی ئەو گورگە ئەوێرن کوشتنی راستیی ئەنجام بدەن . وێڕای ئەوەی بیرۆکەی سزادانی گورگێك بەهۆی کوشتنی مرۆڤێکەوە شتێکی

هەرچەندە بوونی ئەم کردارانە لەنێو کورد دا لەسەر ئاستی تاکە کەسیی بۆخۆی سەرنجڕاکێشە ، ئەو شێوازەی کە لەم کردارانە لەسەر ئاستێکی گشتییدا تێدا بەرجەستە دەبێت لە کاتێک لە پرسە رامیارییەکانەوە تێوەدەگلێت ، بایەخێکی تایبەتیی دەبێت . لەم رووەوە ، گێرانەوەکانی نیکیتین ئەم بابەتە ئاشکرا دەکەن . هێزێکی تەمێکەری عوسمانیی کە لەلایەن ژێنڕاڵ فازیل پاشاوە دژی شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی ، فەرمانەدیی دەکرا ، لەلایەن مریدەکانی شێخەوە خرایە بۆسەوە و بەشێکی زۆری ئەندامەکانی یا کوژران یا گیران . لەلایەن هێزە عوسمانییەکەوە دوو تۆپ دژی خێڵەکان بەکارهات ، تەنیا یەکێکیان بەشێوەیەکی شیاو کاری کرد . ئەوەی دیکەیان هەر لەدەستپێکی شەڕەکەدا تەقیی و تێکشکا و دەنگی بڕا . دوای ئەوەی سەرکەوتنیان بەدەستهێنا ، موریدەکان لە دەوری تۆپە شکاوەکە کۆبوونەوە ، باوەشیان پێدا دەکرد و بە بڕوادار و شەهیدیان دادەنا چونکە ئامادە نەبووە دژی شێخ بجەنگێت . تۆپەکەی دیکە کە بە کافریان دادەنا ، بەوە تۆڵەیان لێکردەوە کە لە سەری چیاکەوە بەریاندایەوە و پارچەپارچە بوو .دەستەی تۆپچییانی تۆپە بڕوادارەکە ، بە شێوەیەکی میهرەبان مامەڵەیان لەگەڵدا کرا ، دیارییان پێدان و ئازادیان کردن ، بەڵام دەستەی تۆپە کافرەکە مامەڵەیەکی توندیان لەگەڵدا کرا و زیندانیی کران .[٦٨]

## پلەوپایە

پیرۆکەی پۆست و پێگە لە سیستمی خێڵایەتیی کوردییدا ، هەروەک هەموو سیستمەکانی دیکە لەسەر دەسەڵاتی سونەتیی رادەوەستێت و بەچاکیی پەرەی ئەسەندووە . لەئاکامدا پلەوپایە روخسارێکی گشتگیریی وەرگرتووە . ئاخوازم لێرەدا سەرنجێک لە سروشتی دەروونناسیی پلەوپایە بدەم ئەوندە دەڵێم کە ئەو بابەتە لەچەند سەرچاوەیەکەوە هەڵدەقوڵێت وەک : پشتوبنەچە ، سامان ، پێگە و هێزی پیرۆز ، پلەوپایە لەنێو کورددا رۆژانە لەچەندین رێگەوە جەخت لەخۆی دەکاتەوە . بۆ نموونە ،

---

بایەخدارە Fraser, Travels,1:66-67

[68] Basile Nikitine ."Les Kurdes racontes par eux-memes,"153-54.

خۆی له هەڵسوکەتی کەسەکان له پلەوپایەی یەکسان و جیاوازدا له یەکتری دەردەخات ، وەك مەسەلەی سڵاو لەیەك کردن یان شێوەی ناخاوتن لەگەڵ بەرامبەر ، هەروەها شێوەی ڕێکخستن و دانانی جێگەی دانیشتنەکان له دیوەخانی سەرمکخێڵ یان شوێنی کۆبوونەوە گشتییەکانی دیکە .

ئەو داب‌ونەریتە سەرنجڕاکێشەی کوردستان بە ڕاشکاویی وردیی جەختکردنەوە لە یەکسانیی پلەوپایە لەنێو کەسانێك دەکاتەوە کە لەشوێن و پێگەی وەك یەکدان . ئێمە لە دەلوجییەوە دەزانین کاتێك هەردوو ڕێبەرە نەقشبەندییەکە ، شێخ عەبدولسەلامی بارزان و شێخ بەهائەدینی بامەڕنێ ، لەساڵی ١٩٠٥دا ، لە ئامێدیی یەکتریان بینیوە ، دەستی یەکتریان ماچ کردووە . وەك ئەو لەسەری ڕۆیشتووە ، بەگوێرەی داب‌ونەریتی کوردەواریی بووە .[٦٩] (جۆستین پێرکن) ی مسیۆنێری ئەمەریکیی وەسفێکی زیندووی ئەم نەریتەی کردووە کە بەچاوی خۆی لە نزیك ڕەواندز لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠ بینیویەتیی :"لەنێو ئەو ئاکارە ساکار و سەرەتاییانەی لەسەر ڕێگاکەی خۆمان لەنێو کوردان دا تێبینیمان کرد ، شێوازی چاك و خۆشی و سڵاوی هاوبەشیان سەرنجیان ڕاکێشاین ، کاتێك دوو پیاو یەکتری دەبینن ، دەستی ڕاستی یەکدی دەگرن و هەردووکیان پێکەوە بەرزی دەکەنەوە ، ئینجا هەریەکەو دەستی ئەو دیکە ماچ دەکات."[٧٠]

کوردان سەبارەت بە مەسەلەی (لەپێشیی) وەك بەرجەستەیەك بۆ پلەوپایە فرە هەستیارن . بەگوێرەی بارس ،" لە کەلتووری کورددا ، هەروەك لە زۆربەی کەلتوورەکانی دیکەدا ، یەکەمین کەس لە پلەبەندیی ، هەروەها لە ڕاستییدا لەپێشخستندا بە گشتیی ، بە نیشانەی پلەوپایەی لەقەڵەم دەدرێت ."[٧١] لە ڕاستییدا ، مێژوو نموونەی زۆرمان سەبارەت بەو بایەخ و گرنگییە دەخاتە بەردەست کە کوردان بۆ پلەوپایەیان سەرخستووە . ئێمە لە ڕێی شەرەفخانی مێژوونووسی کوردەوە سەبارەت بە کێشەی ئەو لەپێشییەی

---

[٦٩] دەلوجي ، امارة بهدينان ، ٩٠.

[70] Perkins . Justin . Journal of a Tour from Oroomiah to Mosul Through th Koordish Muntains, and a Visit to the Ruins of Neneveh. 101.

بارکینز سەبارەت بە بایەخی ئەم دیاردەیە قووڵ نەبۆتەوە . هەروەها ئەو ئەنسرۆپۆلۆجستانەی دوایش کە لەریان وەرگرتووە

[71] Barth . 114.

لەنێو میرە کوردەکاندا لە دیوەخانی ئەسکەندەرپاشای جێگری سوڵتانی عوسمانیی لە وان هەبووە زانیارییمان هەیە . ئەسکەندەر پاشا ئەوەندە بە بایەخەوە لەم بابەتەی ڕوانیوە کە بۆ سوڵتان سلێمانی مەزنی گێڕاوەتەوە . ئەویش فەرمانێکی ئیمپراتۆریی سەبارەت بەوە کردووە کە کام لەو میرە کوردانە لەپێش ئەوی دیکەیانەوە دێت .[72] بەهەمان شێوە ، ریچ گوتوویەتی کە سەرۆکەکانی مزووریی بەمیرات ئەو مافەیان هەبوو کە لەدیوەخانی میری بادیناندا لە سەرخێڵەکانی دیکە لەپێشتر بوون .[73]

بایەخی قووڵی بنجداکوتراوی کورد سەبارەت بە پرسی لەپێشیی هاوجووت بوو لەگەڵ ڕێزگرتنیان لە نەریتی باو . ئەوەش بە ڕوونی لە جیاوازیی نێو ئەندامانی بنەماڵە میراتییەکاندا دەردەکەوێت کە چیدی ئەو پێگەی دەسەڵاتداریەتییەی پێشوویان نەماوە . نیکیتین سەبارەت بە بنەماڵە ڕێبەرییە جۆراوجۆرەکانی نێو هەرکییەکان دەڵێت :کۆنترین بنەماڵە ئەوەکەی مەلاشابی ئاغایە لە شیوە هەرکیی ، ئەوان چیدی دەسەڵات و سامانیان لەدەستدا نەماوە ، بەڵام ئەو پێگە و پلەوپایەی پێشترهەیانبووە هەر ماویانە ، لە تەواوی کۆبوونەوەی کوردانی هەرکییدا ، یەکەمین جێگە بۆ ئەو بنەماڵەیە تەرخان کراوە ."[74]

گفتوگۆیەکی نێوان (کاپتن وولی) ئەفسەری ڕامیاریی بەریتانیی و عەبدولرەحمان ئاغای سەرخێڵی خەرواتیی لەساڵی ١٩١٩دا ، لەو دەمەی سەبارەت بە دامەزراندنی پاشایەتییەکی کوردیی قسە دەکرا و هەروەها بەریتانییەکان بەدوای کەسێکی گونجاودا دەگەڕان بیکەنە پاشا ، تیشکێکی دیار دەخاتە سەر ئەو بابەتە . پاش ئەوەی گفتوگۆ لەسەر شیاویی و لێهاتوویی بنەماڵەکانی کورد دەکرێت ، عەبدولڕەحمان ئاغا دەڵێت :" بە چاوپۆشین سەبارەت بە بنەماڵەی بەدرخان ، تەواوی سەرۆکە کوردەکان وەك دانی ئەسپ لەهەمان ئاستدان ، دەگونجێت یەکێك لە ڕووی سامان یا توانای جەنگاوەرییەوە لەوی دیکە باڵادەستتربێت ، بەڵام نە لە ناو و نە لە پێشینەی مێژوویشدا ."[75] شایەنی باسە ئەم سەرخێڵە خەڵکی بۆتانە کە لانکی بەدرخانیانە .

---

[72] البدليسي ، ٣١٩ ـ دملوجي،امارة بهدينان ، ١٠٧

[73] Rich,1:154 .

[74] Basile Nikitine,"Shamdinan," , in Encyclopaedia of Islam "1 st .ed.7: 303-306.

[75] G.R. Driver ,"Kurdistan and The Kurds , London ,1919, 22.

## ژیانی ڕۆژانەی کورد

کۆچی وەرزیی خێڵە کۆچەریی و نیمچە کۆچەرییەکان لە کوردستاندا بەهەمان شێوازە کە لە ئێراندا بەڕێوە دەچێت . لە کۆتایی بەهاردا ، خێڵەکان دەشت و دۆڵەکان جێدەهێڵن و بەرەو هەوارگە و لەوەڕگاکانیان لە ناوچە چیاییە جۆربەجۆرە بەرزەکان (زۆزانەکان) ملدەنێن .[٧٦] لەوێ هاوین بە لەوەڕاندنی ماڵاتەکانیانەوە بەسەردەبەن . لە پایزدا لەوەڕگای بەرزاییەکان جێدەهێڵن و بەرەو ناوچە گەرمەسێرە زستانەییەکانیان لە نزمایییەکاندا دەگەڕێنەوە .

وێڕای ئەوەی خێڵە جۆربەجۆرەکان ساردەسێر و گەرمەسێری زانراوی خۆیان هەیە کە بەگشتیی لە لایەن خێڵەکانی ترەوە ڕکابەریی لەسەر ناکرێت . بەڵام هێندێك جار لەو ڕووەوە کێشە پەیدا دەبێت . هەمیشە خێڵێکی بەهێز و دەسەڵاتدار ئەگەرێکی زێدەتری لە دەستکەوتنی ساردەسێر و گەرمەسێرێکی باشتری هەیە بەهۆی ئەوەی دەسەڵاتەکەی ئەو مافەی بۆ دەچەسپێنێت .[٧٧] بەهەمان شێوە ، مافی تێپەڕین بەرەو شاخەکان و گەڕانەوەش بەگشتیی چەسپاوە ، بەڵام زۆربەی جار کۆچە وەرزییەکان دەبێتە بۆنەیەك بۆ پێکدادانی توند لەنێوان خێڵە کۆچەریی و نیشتەنییەکاندا ، ئەوانەی زەوییەکانیان دەبێتە ڕێڕەوی کاروانی کۆچەرییەکان .[٧٨] هەروەها هێندێك جار پێکدادان

---

[76] هاوینە هەوار لە وڵاتی موکریی پێیدەڵێن (ساران) ، لەلای تورك زمانانی دانیشتووی ئێران و تورکیا (یەلاق)ی پێدەڵێن ، ئاسورییەکانیش (زوما)ی پێدەڵێن .

[77] لەسەرەتای هاتنی سەدەی بیستەمدا ، بەهێزترین بەشی ڕەوەندی کۆنفدراسیۆنی خێڵەکانی ئارتووشیی لە سایەی حاجی بەگدا بەرزاییەکانی فەرمشینیان گرت ، کە نایابترین هەوارگەی تەواوی ناوچەی زۆزان بوو

Maunsell.F.R. " Central Kurdistan .",124.

[78] سەبارەت بەو وێرانکارییەی لەکاتی تێپەڕینی ڕەوەندەکان دەرحەق بە مەزرای نیشتەجێکان ئەنجام ئەدرێت بڕوانە : دملوجي،امارة بهدينان ،٧٤.

Wigram and Wigram,127-28,159-60;Hamilton,89-91;Hay,Two Years in Kurdistan,79-80;Leach, 27.

لەنێوان خێڵەکۆچەرییە جۆراوجۆرەکان خۆیاندا ڕوودەدات .[٧٩] هێندێک جار لەوەڕگا سارەسێرەکان فرە لە گەرمەسێری خێڵەکانەوە دوور نین . زۆربەی ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان سنووری تورکیا–عێراق و دەریاچەی وانەوە بە گشتیی زۆزانی پێدەگوترێت . زۆربەی ئەم لەوەڕگا چیاییانە سەرچاوەی ئاویان زۆرە ، وەک بەرزاییەکانی مێروانێن و فەراشین ، کە بۆ تەواوی هەرێمەکە سەرچاوەیەکی مەزنە .[٨٠]

لەپاش جەنگی یەکەمی جیهانیی ، کۆچی وەرزیی زۆرینەی خێڵە کۆچەرییەکان کە وا ڕاهاتبوون هاوین لە تورکیا و زستانیش لە عێراق بەرنەسەر ، لە ئاکامی دیاریکردنی سنووری تورکیا –عێراق لە سەرەڕێگەی ئەو خێڵانە ، بە تەواویی پەکی کەوت . وەستانی تێپەڕینی خێڵە کۆچەرییەکان لەنێوان تورکیا و عێراقدا لە بنەڕەتەوە ئاکامی ئەو پەیوەندییە نادۆستانەیە بوو لەنێوان هەردوو وڵاتدا هەبوو ، هەرچەندە هەلومەرجەکە پاش چاکبوونی ئەو پەیوەندییانەش هێشتا بە نەگۆڕاوی مایەوە ، دەگونجێت بەهۆی نەش‌ونمای نەتەوایەتیی کوردیی لە کوردستانی عێراقدا بێت .

## شوێنی ژیان

شوێنی ژیانی کورد ، جگە لەوەی لەناوەندی شارەکاندان ، دەکرێت بە دوو بەشەوە ، خەڵکە نیشتەجێکە و ئەوانەی کۆچەر یا نیمچە کۆچەرن ، خەڵکە نیشتەجێکە لە خانووی بچووکدا نیشتەجێن کە لەبەرد و قوڕ دروستکراوە ، بانەکەی سپیدار رایدەگرێت و لقەدار و گڵی پەستێوراوی دەکرێتە سەر . ئەم ماڵانە بەگشتیی بە شێوەیەکی لار بنیات دەنرێت ، بەشێوەیەک کە سەربانی ماڵێک دەبێتە سەکۆ بۆ چوونە

---

[79] ڕاپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی باس لەو هەلومەرجە ناسەقامگیرە کردووە کە لە ئەنجامی کۆچی ساڵانەی ناوچە سنوورییەکانی تورکیا –عێراق دەکرێتەوە

Great Britain , Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1921,8.

[80] بۆ پتر لەمەڕ وەسفی ئەم ناوچەیە : Maunsell, " Central Kurdistan .",121-40

هەیوانی ماڵێکی دیکەوە کە لە سەرێوە بنیاتنراوە .[81] لە ناوچەی دیاربیکراوی کوردستاندا ، بەتایبەت لە بەرزاییەکانی دەرسیمدا[82] و هەروەها لە بەرزاییەکانی هەکاریدا[83] هەواڵ هەیە کە خانووەکان لە بەرد و گەچ دروست دەکرێن و فرە پتەو و خۆراگرن .

کۆچەرییەکان لە دەوار و رەشماڵدا دەژین کە لە مووی بزن دروستدەکرێت ، ژمارەیەکی کەمی کورد تەواوی ساڵ لەم جۆرە دەوارانەدا بەسەردەبەن . دەگونجێت زۆرینەی ئەوانە ناوی نیمچەکۆچەرییان لێبنرێت کە زستانان لەنێو خانووەکانیان و هاوینانیش لە دەواردا دەژین . لە مانگەکانی هاویندا ، بەشێکی زۆر لە کوردان لەنێو کەپری هاوینەدا دەژین کە چەرداخی پێدەڵێن ،[84] ئەوەی جۆرە کەپرێکی کراوەیە بە دار سەری دەگیرێت و بەلق وچڵەداریش دادەپۆشرێت .

### خۆراك

خۆراکی کورد بەشێوەیەکی بنەڕەتیی دانەوێڵە و بەرهەمەکانی شیرە ، ئەوەی دواییان وەك : پەنیر ، جۆرەکانی شیریی مەییوی وەك (دۆ ، ماست و ماستاو) ، هەروەها کەرە و پێکهاتەکانی .[85] نیسك ، جۆ ، گەنمەشامیی ، نۆك ، ساوەر ، هەروەها برنج ئەو خۆراکانەن کە بە گشتیی کورد پشتیان پێدەبەستێت . مێوژ بەشێکی گرنگ لە خۆراکی کورد پێکدەهێنێت بە بەراورد بەو خواردنانەی کە لەنێو عەرەبدا هەن . بەگوێرەی هەی ، ئەو خۆراکانەی لەنێو کورددا بڵاون : نانی گەنم ، مێوژ ، سەوزە ، ماست و ساوەر .[86] هەروەها نانی جۆش بە شێوەیەکی فراوان بڵاوە ، بەتایبەت لەنێو ئێزیدییەکاندا .

---

[81] Barth,102;Leach,48; Hay,Two Years in Kurdistan , 45-46; Nikitine Basile, La vie domestique Kurde," 334-35.

[82] Molyneux-Seel ,49 .

[83] Dickson, Bertram. "Journeys in Kurdistan ",375.

[84] Hay,Two Years in Kurdistan , 46-47.

[85] Ibid.,56.

[86] Ibid.

لەهێندێك بەشی كوردستاندا ، لەناوچە چەپە چیاییەكاندا كە كێڵگەی تێدا زۆر كەمە ، بەڕوو دەهاڕرێت و دەكرێتە نارد بۆ نان ، بە تایبەت لە كاتی قاتوقڕییدا .[87] میوە و سەوزەش هەركاتێك دەستكەوێت دەخورێت . ژمارەیەك نووسەران ئاماژەیان بە پیاز ، وەك یەكێك لە مادە خۆراكییە گرنگەكان لەلای كورد ،داوە .[88] هەنگوین و گەزۆ خواردنی پەسەندن . لەم ساڵانەی دواییدا ، چا بۆتە شتەكێكی گرنگ لە كوردستاندا .

گۆشت زۆر بەكەمی دەخورێت مەگەر لای كوردانی دەوڵەمەند نەبێت ،[89] بەرخ بە باشتر دەزانرێت ، بەڵام گۆشتی بزن ، گا و پەلەوەریش دەخورێت . كورد زۆر حەزیان لە راوە ، وەك ئاسك لە دەشتەكان ، كەڵەكێویی لە چیاكان و مەڕەكێویش لە ناوچە گردۆڵكەییەكاندا . هەروەها راوی باڵندە ، وەك : مراویی ، كەو ، پۆڕ و سوێسكە .[90] زۆربەی ناوچەی كوردستان بەرازەكێویی لێیە ، چونكە موسوڵمان ، ئێزیدیی و ئەهلی حەق ئایینەكەیان رێگەیان نادات گۆشتی بەراز بخۆن . ئەوەش گریمانی ئەوەیە كە كورد ئەو گۆشتە ناخۆن ، هەرچەندە هەواڵی ئەوە هەیە كە ئەندامانی هەرسێ دەستەكە جاروبار ئەو تابۆیە دەشكێنن .[91]

كورد لە رووی ئاكاری خۆراكییەوە خەڵكێكی بەخۆراك نین ،[92] هەی ئاماژە بەوە دەكات كە لە ناوچەی هەولێر كوردانێك ئەو تێبینی كردوون تەنیا دوو ژەم نان دەخۆن ، لەنیوەڕۆ و هەروەها لە سەرلەئێوارەشدا ، جگەلە كوردە دەوڵەمەندەكانیان كە بەیانیش نان دەخۆن .[93] هەرچەندە نووسەرێكی كورد كە گفتوگۆی لەسەر نەریتی خۆراكی كوردانی بۆتان كردووە ، لەساڵی ١٩٣٠دا ئاماژەی بەوەداوە كە ئەوان شەش ژەم نان

---

[87] Ibid.

[88] Newin ,C . " Le number des repas chez Les Kurdes,276.

[89] Hay,Two Years in Kurdistan , 52-53.

[90] Leach, 29-31.

[91] Ivanov,97; Hay,Two Years in Kurdistan , 29-30,Cf. Wigram and Wigram,281; Fraser, Travels, 1:186-89; دملوجي ، اليزيدية ،٥١.

[92] Nikitine, " La vie domestique Kurde,"335; Noel, E.W.C, "The Character of the Kurds as Illustrated by Their Proverb, 83-84 .

[93] Hay,Two Years in Kurdistan , 56.

دەخۆن ، یەکەمیان سەرلەبەیانی زوو هەروەها دواژەم کاتێك دەچنە جێگاوە ، هەروەها دانیشتووانی ئەو شارە ژەمێکی زێدەش دەکەن بە سەریدا .[٩٤]

## جل وبەرگ

جل وبەرگی کوردیی بەشێوەیەکی بەرچاو لە بەشێکی کوردستانەوە بۆ ئەوی دیکە جیاوازە .[٩٥] ئەم جیاوازییە لەو کڵاوپێچەدا دەردەکەوێت کە بە گشتیی زۆربەی کورد لەسەری دەکەن . کوردانی هەکاریی و موکریی پارچەیەکی گەورەی لە ئاوریشم یا لۆکە دروستکراو ، کە ریشوودارە لەکڵاوێکی تایبەتی دەپێچن و لەسەری دەکەن و ریشووەکان بەسەر چاوانیاندا شۆڕدەبێتەوە .[٩٦] بڵاوترین کڵاوو جامانە لە بەشی ناوەند و باشووری کوردستان دەبینرێت کە پارچەیەکی ئاوریشمە و لەکڵاوێکەوە دەپێچرێت .[٩٧] هێندێك لە خێڵە کوردەکان سەریان بەجۆرێك دادەپۆشن کە کەمتر یان هەر هیچ لە کڵاوپێچ ناچێت . جوبرانلییەکانی باشووری کوردستان لبادێکی درێژی سپی لەسەر دەکەن کە تەنیا پارچەیەکی بچووکی ئاوریشمی لێدەبەستن .[٩٨] لە کاتێکدا شکاك کڵاوێکی پتەوی خوریی دەکەنە سەر کە درێژە و گوڵنگدارە .[٩٩] ئەمە چەند نموونەیەکی کەمی کڵاوپێچی کوردانە ، هەرچەندە هەموو ئەم کڵاوو پێچانە بۆ چاودێرێکی ئاسایی وادەردەکەوێت کە وەك یەکن و زۆر جیاوازنین . بەڵام کوردێك بە ئاسانیی دەتوانێت لەرێی تێبینییکردنی شێوازی بەستنی کڵاوپێچی کەسێکەوە ناوی خێڵ و ئەو شوێنەش بڵێت کە ئەو کەسەی

---

[٩٤] Newin,8-10. ئەم نووسەرە بەدرێژیی باسی لەم خواردنانە کردووە

[٩٥] Minorsky,V , "Sawdj Bulak."in Encyclopaedia of Islam, 1st ed .,7:186-92; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 401.

[٩٦] Fraser, Travels, 1:86.Cf. Hay,Two Years in Kurdistan , 41.

[٩٧] M.Sykes,582.

[٩٨] Bois,. L' ame des Kurdes.

[٩٩] Cf. Hay,Two Years in Kurdistan , 41; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 401; الگورانی،علي سیدو ، من عمان الی العمادیة ، قاهرة ،١٩٣٩، ١٥٢

بۆ دەگەڕێنەوە .[100]

کوردە باکوورییەکانی دەشتی ئەرمینیا ، کە خەریکی ئەسپدارین ، پانتۆڵێکی تەسکی توندکەمەر دەکەنە بەر ،[101] بەرەو باشوور ، لەناوەند و باشووری کوردستاندا ، شەرواڵ نموونەیەکی باوە ، لەسەروو ئەژنۆوە فشە و لای قولەپێشەوە تەسک ئەبێتەوە .[102] لێرەدا ، بەتایبەت لە دەڤەری بادینان و بەشێوەیەکی دیارییکراو لەناوچەی ڕەواندز ، کوردان شەرواڵێکی دەرلنگ پان دەکەنەبەر (رانك)ی پێدەگوترێت کە زۆر لەو پانتۆلانە دەچێت دەریاوانەکان لەبەری دەکەن .[103]

جۆرێکی دیکەی پۆشاکی کورد کە سەرنجڕاکێش دێتەبەرچاو بریتیە لە پشتێن کە پیاوان لەنێوقەدیانی دەبەستن . هێندێك لەم پشتێنانە چەند پێیەك درێژە و بەشێوەیەکی ئاڵۆز دەبەسترێت . خەنجەر ، دەمانچە و شتی دیکەش دەکرێت بە لاکانیدا.[104]

تایبەتمەندییەکی دیکەی جلوبەرگی کوردیی ، فەقیانەی درێژی سپییە . فەقیانەدار کاتی کارکردن ، خواردن ، شتن ، یا شەڕکردن سەری فەقیانەکانی پێکەوە گرێ ئەدات و دەیهاوێتە پشتیەوە .[105] کوردان چاکەتی جۆراوجۆر دەکەنەبەر ، لەوانە چاکەتی لبادی بێ قۆڵە کە لە سەراسەری باشووری کوردستاندا بڵاوە هەروەها چاکەتێکی دیکە هەیە (سەڵتە)ی پێدەڵێن .[106] لە دۆخی سەرماشدا ، چاکەتێکی لبادی ئەستوور لەبەر دەکەن .

---

[100] Dickson , 362.

[101] Wigram and Wigram, 9; Hay,Two Years in Kurdistan,41; Binder,Henry . Au Kurdistan en M'esopotamie et en Perse , mission scientifique du Ministere de J Instruction Publique .Paris:Maison Quantin, 1887,109-110;Fraser,Travels,1:86; Layard ,Sir Susten Henry ,Nineveh and Its Remains,2-8-207.

[102] Hay,Two Years in Kurdistan,41;. ١٥٢ ،لکورانی

[103] Hay,Two Years in Kurdistan , 40; Hamilton , 137.

[104] Hay,Two Years in Kurdistan , 42; Minorsky , "Sawdj Bulak."

[105] Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 401; Wigram and Wigram, 9

[106] Hay,Two Years in Kurdistan , 41.

پێڵاوی کوردیی بەگشتیی بە قەبارەی پێ دەبێت ، کە نووکەکەی چەماوە و بێپاژنەیە ، وەك باوە لە پێستی گا دروستدەکرێت . جۆرێك لەو پێڵاوانەی کورد لەپێی دەکەن رەنگی سوورە بە (زێرگول) یا (کالیك) ناوی دەبرێت ، کە پێستی گای رەنگکراوە و بە ئاوریشم چنراوە یان گوڵنکەی خوریی پێوەیە . هێندێك پێڵاوی لباد بۆ شاخەوانیی لەپێ دەکەن . کوردە باکورییەکانی دەشتی ئەرمینیا هەروەها دزەییەکانی هەولێر پۆتینی درێژ لەپێ دەکەن .[107] گێوەی ئێرانی کە لە ئاوریشم یان لۆکەی چنراوی ورد دروست دەکرێت و بنێکی پان و تەختی هەیە زۆر بڵاوە . گۆرەوی خوریی تاسەرئەژنۆ لە رانیە ، ئاکرێ ، رەواندز و هەکاریی لەپێ دەکرێت ، کە زۆربەی جار لەسەرەوە بە قەیتان و گوڵنکەی درێژ دەبەسترێت . لەو شوێنانەی کورد و عەرەب دەگەنە یەك ، وەك لە باشووری کوردستان ، جەزیرەی سەروو ، باشووری قەرەجەداغ و تۆرئەلعابدین ، کوردان رۆبی عەرەبی بە شانیاندا دەدەن .هێندێکیان تەنانەت بۆ کۆفیە و عەگالی عەرەبییەکە وازیان لە کڵاو جامانەی کوردیش هێناوە .[108]

## پایەی ژن

وا دەردەکەوێت زۆربەی نووسەران لەسەر ئەوە کۆك بن کە ژنی کورد بەبەراورد لەگەڵ زۆربەی ژنانی عەرەبدا بە پلەیەکی بەرچاو ئازاد بن کە بە رێگەی هەمەجۆر دەردەکەوێت . ژنی کورد بەپێچەوانەی زۆربەی ژنانی موسوڵمانەوە ، گۆشەگیر و داپۆشراو نیە و رووی خۆی بە پەچە داناپۆشێت . ئەو ئازادانە تێکەڵ بە پیاو دەبێت و چ شەرم و ترسێکی وەها پێشان نادات کە هەڵقوڵاوی نەریتێکی گۆشەگیرانە بێت .[109] لە کاتی جەژنەکان ، بووك گواستنەوە و بۆنەو ئاهەنگەکانی دیکەدا ژن‌وپیاو پێکەوە سەما

---

[107] Wigram and Wigram, 9; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan,"401:٤١٠الگورانی

[108] سەبارەت بە باسی جل‌وبەرگی کوردانی موکریی :

Minorsky . "Sawdj Bulak,"; Fraser,Travels,1:86; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 401.

[109] K.Badir Khan . 241; Bois,. L` ame des Kurdes,32; Soane ,Report on Sulaimania District ,92-93; Nikitine, "Quelques observation," 671.

دەکەن .[110] سۆن تێبینیی کردووە کە ئەو سەما و رەشبەڵەکە لەنێو خەڵکی موسوڵماندا شتێکی نائاساییە ، بەگوێرەی پاساگەلێك کە رێگە بەشتێکی وەها نادات . ئەو ئاماژە بەوە دەدات کە لەو رووەوە کوردان لە گەلانی ئەورووپای رۆژهەڵات دەکەن تاکو لەوانەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست .[111] بۆ ژنی کورد نائاسایی نیە کە لەکاتی نەبوونی پیاوەکەی لەماڵدا وەك سەرداری ماڵ رەفتاربکات پێشوازیی لە میوانی بێگانە بکات .[112] ئەم ئازادییە زۆر بەکەمیی بەشێوەیەکی خراپ بەکاردەهێنرێت . ژنی کورد پاکیزەن ، لەنێو کورددا لەشفرۆشیی نەزانراوە ، زۆر لە نووسەران تێبینیی ئەوەیان کردووە کە لە زمانی کوردییدا وشەیەکی تەواو نیە پربەپێستی ئافرەتی فاحشە و لەشفرۆش بێت .[113] لەدۆخێکی توندی ئایینییدا لە کوردستان ، مردن سزای هەر لادانێکە لە رەوشت و ئاکاری گشتییدا روویدات .[114]

ژنی کورد خانمخاسی ماڵی خۆیەتیی ، دەسەڵات و کاریگەریی لە بازنەی خێزاندا یەکجار بەرچاوە ، گوێ لە راوێژی دەگیرێت و رێزی لێدەنرێت .[115] بەگوێرەی هەی " زۆربەی سەرۆکەکان زۆر یان کەم دەکەونە ژێر کاریگەریی ژنەکانیانەوە ، کە بە بۆچوونی من ، رۆڵێکی مەزن دەبینن کاریگەریی باش یان کاری زۆر دەکەن کە رێگە لە مێردەکانیان بگرن خۆیان بکەنە گاڵتەجاڕ ."[116]

---

[110] Bois,. L' ame des Kurdes,38-39; Soane ,"The Southern Kurds,"45.

[111] Soane ,"The Southern Kurds,"45.

[112] K.Badir Khan . 241; Soane ,Report on Sulaimania District ,92-93; Nikitine, "Quelques observation," 671; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 397; Layard ,Nineveh,1:153;Layars;Discoveries,315.

[113] Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 397; Nikitine, "Quelques observation," 67;E.M. Noel, Diaryof Major E.M. Noel,10.

[114] Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 397; Hay,Two Years in Kurdistan , 69-70;Leach,56.

[115] Soane ,Report on Sulaimania District ,93; Nikitine, "Quelques observation,"670; Hay,Two Years in Kurdistan , 43; K.Badir Khan , 241.

[116] Hay,Two Years in Kurdistan , 43.

ژنی کورد لەنێو خێڵە کۆچەریی و نیشتەنییەکاندا ئەرکی فرەگران ئەنجام دەدەن . [117] هەرچەندە ، وەك سۆن ئاماژەی پێداوە ، ئەوە نیە ئەوان ناچار بکرێن هەموو ئەرکە گرانەکان ئەنجام بدەن و مێردەکانیشیان تەمەڵ و بێکار بۆی بکەون . دابەشکردنێکی بەرچاوی کار لەنێوان ژنان و پیاواندا هەیە .پیاوان بەگشتیی لە کێڵگە خەریکی کارن ، بایەخ بە مێگەل و ئاژەڵەکانیان دەدەن ، زەوی دەکێڵن ، بایەخ بە دارە بەردار و پەڵە توتنەکانیان دەدەن ، یان بەروبومەکانیان دەبەنە بازاڕەکانی دەورویەر ، لەکاتێکدا ژنەکانیان خەریکی میوە وشککردنەوە و توتن هەڵخستن و بەڕەتەکاندن ، هەروەها چەندین کارتی دیکەی ماڵ ئەنجام دەدەن . [118] بارس ئەم سەرنجە دەچەسپێنێت :

"خێزان یەکەیەکی ئابووریی سەربەخۆیە ، بەشێوەیەکی نموونەیی لە خانەوادەیەکی سەرەتایی پێکدێت : مێرد ، ژن ، هەروەها منداڵەکانیان . لەنێو ئەمانەدا ، رۆڵی ئابووریی بەهەمان ئەو هێڵە دابەشکراوە کە بۆ خێزانە لادێییەکانی ئەوروپا ئاشنایە . شتێکی پێویست نیە بە درێژیی هەمووی باس بکرێت . پیاوەکە زۆربەی کاتی خۆی لەنێو کێڵگەدا بەسەر دەبات ، ئەو مافەی هەیە بایەخ بە ئەسپەکان بدات و ئاگای لێیان بێت ، ئاژەڵەکانی دی لەلایەن ژنەوە بایەخی پێدەدرێت ، شیریان دەدۆشێت و خۆراکیان لێ دروست دەکات . هەروەها ئەرکەکانی دیکەی ماڵ ، وەك قوڕەکاریی ناوەوەی ژوورەکان و چاکردنی سەربان ، ئەمانە لەسەر پیاون . هەروەها ژنان لەوەرزی پڕکاریدا لە کێڵگەکان هاوکاریی دەکەن ، بەتایبەتیی لەکاتی دروێنەی دانەوێڵە و هەڵگرتنەوەی توتندا ." [119]

زۆر لە ژنانی کورد جەنگاوەری باش یاخود بازرگانی لێهاتوون . ئەوان لەنێو خێڵە فرە جەنگاوەرەکاندا زۆرجار بە ئازایەتییەکی مەزنەوە شانبەشانی پیاوەکانیان دەجەنگن . [120] هەروەها بەشێك لەوان تەنانەت وەك سەرۆکی خێڵەکانیان دانیان پێدانراوە

---

[117] Soane ,Report on Sulaimania District ,93; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 397.

[118] Soane ,"The Southern Kurdistan," 45.

[119] Barth , 24-25.

[120] Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 396-97;. جیاوك،٢٤

هامیلتۆن هەواڵی شەڕێکی توند لەنێوان پیاوە خێڵەکییەکانی سورچیی دانیشتوو لە گەرووی سپیلك و رەوەندە هەرکییەکان لە کۆتایی ١٩٢٠دا دەکات ، کە تێیدا ژمارەیەك ژنیشی تێدا بەشدار بوون بەگوێرەی زانیارییەکانی وی

. [121] کورتە سەرنجێك سەبارەت بە ژمارەیەك لەو ژنانەی پێگە و دەسەڵاتێکی مەزنیان لەنێوخەڵکەکانیاندا بەدەستهێناوە تیشکێك دەخاتە سەر پلەوپایەی ژنان لە کۆمەڵگەی کوردەوارییدا .

بەگوێرەی (کیونیت) کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا نووسیویەتی ، حەلیمەخانمی هەکاریی ، فەرمانڕەوایەکیی دەسەڵاتداری باش قەڵا بووە ، تا ئەو کاتەی ناچاربوو پاش سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی بەدرخان لەساڵی ١٨٤٥ دا ، شارەکە رادەستی دەسەڵاتدارانی عوسمانیی بکات . [122] لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٩دا ، فاتمە ، کە ژنێکی کوردی گەنجی تەمەن سی‌وشەش ساڵە بووە ، پاش مردنی مێردی دووەمی ، کە برای مێردی یەکەمی بووە و بەگوێرەی ماڵ فەرمانڕەوایەتیی میراتیی شوێنی گرتۆتەوە ، بووەتە سەرخێڵی ئیزدینان ، ئەم ژنە لەنێو خێڵەکەیدا بە (قرالیستە) کە واتای شاژن دەگەیەنێت ناوی دەبرا . [123] مریەم خانم لە بنەماڵەی شێخانی ئەمرییە ، رۆڵی رێبەرێکی لێوەشاوەی لە ماوەیەکی هەستیاردا کە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانییە، بینی . هەر لەگەڵ ئەودا بوو کە سوپای هاتووی رووسیی لە قەفقاسەوە بۆ ئەوەی پێشڕەویی بکەن و بەو ناوچەیەدا تێپەڕن کە لە بندەستی بنەماڵەکەی ئەودایە دەستیان بە گفتوگۆ کرد . نیکیتین کە لەو کاتەدا راوێژکاری رامیاریی پەیوەست بە سوپای رووسیی بووە ، زانایی و شکۆمەندیی ئەم ژنە بەرز دەنرخێنێت و دەسەڵاتی بەسەر دەست‌وپێوەندەکانی بە راشکاویی پێشان دەدات . [124]

بۆ ماوەی چەندین ساڵە ، عادیلەخانم ، ژنی وەسمان پاشای جاف ، کاروباری

---

، یازدە پیاو و چوار ژن لە شەڕەدا کوژراون Hamilton,90.

[121] هەروەها بارس "ناوەجاخیی" ی وەك لەمپەرێك لەبەر دەم سەرکردایەتییکردن ریزکردووە و نموونە بە سەلیم بەگ دەهێنێتەوە کە لەلایەن نادرشای ئێرانەوە پێشنیازی ئەوەی پێکراوە ببێتە فەرمانڕەوای کوردستان ، بەڵام ئەو رەتی کردۆتەوە چونکە "پێگەی خۆی دەزانی" ، هەرچەندە پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە بارس بیروبۆچوونەکەی خۆی سەبارەت بەوەی " رەگەزی مێ" و " ناوەجاخیی" بە شێوەیەکی رەها وەك لەمپەرێك بۆ گەیشتن بە سەرکردایەتیی دادەنێت ، چونکە دەگونجێت هەردوو حاڵەتەکە بەهۆی هۆکاری دیکەوە شوێنیان بگیرێتەوە

[122] Quinet,2:717.

[123] H.A.,"L hospitalite Kurdes ,"Hawar1(Aug 8,1932):7-8.

[124] Nikitine, "Quelques observation,"670; Nikitine, "Probleme Kurde,"255.

جافەکانی بەتوندی لە بندەستدا بوو . ج لەسەردەمی ژیانی مێردەکەیدا ، کاتێك وەك راوێژکار و نوێنەری وەسمان پاشا هەڵدەسوڕا و ج دوای مردنی پاشای مێردیشی ، کاتێك بەرپرسیاری تەواوی خێڵەکەی بە ماف خۆی دەزانی ، ئەو دەسەڵاتێکی مەزنی بەسەر دەشتی شارەزوور و ناوچە سنوورییەکانی تورکیا–ئێرانی دەوروبەرییدا هەبوو . بەشێوەیەکی بنەڕەتیی بەهۆی فەرمانڕەوایەتیی بەهێزی ئەوەوە بوو کە ژیانی بازرگانیی لە هەڵەبجە بوژایەوە و سێبەری یاسا و هێمنیی باڵی بەسەر هەرێمە ناثارامەکەدا کێشا . [١٢٥] حەفسەخانی ئامۆزا و براژنی شێخ مەحموود ، یەکێکە لە ژنە مەزنەکانی دیکەی باشووری کوردستان . هەواڵی ئەوە هەیە کە تێکۆشانی ئەو بۆ رزگارکردنی ژیانی ژمارەیەك لە گیراوە بەریتانییەکانی کاتی راپەڕینەکەی شێخ مەحموود ، بۆتە هۆی ئەوەی فەرمانی سزادانی کوشتنەکەی ئەو سەرکردە کوردە جێبەجێ نەکرێت و دواتریش حوکمەکەی بۆ دواخرا و کەمکرایەوە . [١٢٦]

دواجار مینا خاتوونی خانمی ئێزدییەکان هەیە کە ئافرەتێکی بەرچاو و خاوەن توانایەکی بەهێز بووە ، بەچەشنێك بۆ ماوەی نیوسەدەی رابردوو بەدەسەڵاتترین کەسایەتیی نێو ئێزدییەکان بووە . ئەو لەگەڵ عەلی بەگی مێردیدا کە میری ئێزدییەکان بوو ، بەشداریی بەڕێوەبردنی تەواوی کاروباری ئێزدییەکانی دەکرد . تا ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩١٣دا مێردەکەی کوژرا . دەسەڵات و پێگەی میناخاتوون لەسەردەمی میرایەتیی سەعید بەگی کوڕەکەشیدا بێ کەمبوونەوە بەردەوام بوو . وەك سێبەر لەپشت کوڕەکەیەوە وەستا بوو ، پاشتریش دوای مردنی سەعید بەگ لە ساڵی ١٩٤٩ و بوونی تەحسین بەگ بە میری ئێزدییان ، مینا خاتوون ئەرکی سەرپەرشتییکردن و ئاراستەکردنی کوڕەزاکەی گرتە ئەستۆ . بەگوێرەی دەملوجی ، ئەم ژنە جانانە و زیت و وریایە رێزلێگیراوترین کەسایەتیی نێوئێزدییەکان بوو کە هەمووان بەدڵ لێی دەترسان . [١٢٧]

---

[125] Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," passim, Less, " Two Years in South Kurdistan ", Journal of the Royal Central Asian Society 15, parts 3 (1928): 253-77; Soane ,"The Southern Kurd,"44-45.

[126] Barth , 120-21.

[127] دملوجي ، امارة بهدينان ،٣٢-٣٣ و ١٨ ، ٢٠

## ژن‌ومێردایەتیی

ژن‌ومێردایەتیی لەنێو کورددا بە پێی یاسای موسوڵمانان و نەریتی خۆماڵیی بەڕێوە دەچێت . هەرچەندە کورد وەك تاکێکی موسوڵمان ڕێگەی پێدراوە چوار ژن بهێنێت ، بەڵام تەنیا سەرخێڵەکان و هێندێك موڵکداری دەوڵەمەند لە توانایاندایە ئەوە بکەن ، بەگشتیی هەر ژنێك دەهێنن .[128] لە سۆنگەی ئەوەوە کە ژنانی کورد لە هەڵسوکەوتیاندا ئازادن و خۆ دانابڕن و بەئازادیی تێکەڵ بە پیاوان دەبن ، هەربۆیە زۆربەی جار ژن‌ومێردایەتیی لە ڕێگەی خۆشەویستییەوە دەبێت زیاتر لەوەی خێزان ڕێکی بخات .[129] بەشێوەیەکی گشتیی ، کورد لەنێو خێزانەکانیاندا دڵسۆزانە هەڵدەسوڕێن و پەیوەندیی گەرموگوڕ و بەتینیش ئەندامەکانی پێکەوە دەبەستێتەوە ، جیابوونەوەش ، هەروەك فرەژنیی ، بەگشتیی لەنێو کورداندا کەموێنەیە و زیاتر لەنێو چینی دەسترۆیشتووەکاندا دەبینرێت .[130]

کاتێك پیاوێکی کورد ئارەزووی ژنهێنان بکات ، کەسێکی بەتەمەن لە خزمانی یا دۆستانی خۆی ، کە زۆربەی جار خاوەن پلەوپایەیەکە ، دەنێرێت ، تا داوای دەستی ئەو کچە بکات کە هەڵیبژاردووە . ئەو کەسە لەگەڵ باوکی کچەکەدا بابەتەکە دەکاتەوە و باسی شیاویی و کەسایەتیی داواکەرەکەیان بۆ دەکات و پێکەوە بوکانەکەی دیاریی دەکەن .[131]

---

[128] "Kurdiatan" in The Encyclopaedia of Mission,530; Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 396; Hay,Two Years in Kurdistan , 44; Nikitine, "Quelques observation."670,Leach,21; Bois,. L` ame des Kurdes,31-32;١٧٠ دملوجي ، امارة بهدينان

[129] K.Badir Khan , 241;Soane ," To Mesopotamia and Kurdistan," 237,397;
دملوجي ، امارة بهدينان ١٧٠

[130] K.Badir Khan , 241;Bois,. L` ame des Kurdes,39. ١٧٠ دملوجي ، امارة بهدينان

[131] Barth , 26.
هەی، گێڕانەوەیەکی سەرنجڕاکێش دەخاتەبەرچاو لەمەڕ ئەزموونی خۆی وەك ئەندامی دەستەیەك کە لەلایەن ئاغایەکی کوردەوە بۆ داواکردنی دەستی کچی ڕێبەرێکی ئایینیی نێردراون ئەو گفتوگۆی لەمەڕ بوکانە کردووە و دەڵێت هێندێك سەرخێڵ زیاتر لە پێنج سەد پاوەند بە ئافرەتێکی وەجاخزادە دەدات لێم ئەم ژمارەیە بە زۆر زێدە لەقەڵەم دەدات. Hay,Two Years in Kurdistan , 257-59,44;Leach,44-45.

بوكانه بڕێك پارەیه كه داواكەر به باوكی كچەكه یا بەخێوكەرەكەی ئەدات .[132] بەگوێرەی كامەران بەدرخان ئەو بڕە پارەیه بریتیه له مارەیی ژنومێردایەتییەكه و بۆ ماوەیەكی دیارییكراو لای ماڵی بوكێ دەمێنێتەوە و وەك زامنێكه بۆ هەڵسوكەوتی باشی مێردەكه پاش چەند ساڵێك پێی ئەدرێتەوە .[133] دملوجی چەكی ئیسلامی (سەدەق) ی بۆ ئەو بڕە پارەیه بەكارهێناوە ، بەڵام ئەوەی دیاریی نەكردووە لای كێ هەڵدەگیرێت .[134] وێڕای مارەیی یان بوكانه ، وا باوە كه زاوا دیاریی بۆ بوك و باوك و براكانی بنێرێت .هەی ئاماژەی بەوە داوە كه لەكاتی تەڵاقدان هەمان بڕە پارەی دیارییكرلو ئەخرێتە سەر بووك.[135]

سێرمۆنیای ژنومێردایەتییەكه و مارەیی‌كردن به ڕێ وڕەسمێكی موسوڵمانانه لەلایەن مەلایەكەوە بەڕێوەدەچێت . گواستنەوە بۆنەیەكی گرنگه بۆ شایی و زەماوەند كه هەمووان تێیدا بەشداریی ئەكەن . ئەریتێك هەبوو كه زۆر باوی نەماوە ئەویش دانانی (برازاوا) یه كه له ئەرمووەی پەردەی زاوایەتیی ڕائەوەستا وەك نیشانەیەك بۆ ئەنجامدانی كاری بوون به زاوا تەقەی خۆشیی ئەكرد .[136] بەگوێرەی نیكیتین ، ئەو تەقەیه له لایەن زاوا خۆیەوە ئەكرا .[137] بەربووك كه وەك ئاراستەكەرێكی بووك ڕاژە ئەكات ، بەرپرسە

---

[132] Barth , 28.

[133] K.Badir Khan ,241.

[134] دملوجي ، امارة بهدينان ، ١٦٩ بەگوێرەی یاسای موسوڵمانان ، مارەیی یان سەدەق بۆ كچەكه ئەگەڕێتەوە ، لەلای عەرەبی پێش ئیسلام ، سەدەق ئەدرا به ژنەكه و مارەییش به باوكی یان سەرپەرشتیاری كچەكه ، بەڵام پاش هاتنی ئیسلام هەردووكیان تێكەڵ بەیەك كران و وای لێی هات هەردووكیان تێكەڵ بەیەك كران هەربۆیه ئێستا هەردوو وشەكه یەك مانا ئەگەیەنێت . دوو جۆر مارەیی هەیه ، مارەیی دیارییكراو (مهرالمثل) ئەوەی كه لەگەڵ پێگەی كۆمەڵایەتیی و ئابووریی و دارایی و شیاویی بوكێدا ئەگونجێت . مارەیی دیارییكراو (مهر المسمی) كه ئەویش بۆخۆی دوو جۆرە كه پێشەكیی و پاشەكییه (مقدم) و (مؤخر) ، پێشەكیی هێندێك جار هەر پێش ئەنجامدانی هاوسەرگیرییەكه ئەدرێت ، پاشەكییەكەش لەكاتی مردنی پیاوەكه یان كاتی جیابوونەوە ئەدرێت .

[135] Hay,Two Years in Kurdistan . 44.

[136] Bois,. L' ame des Kurdes,39.

ئەم دیاردەیه وەك بۆیس سەرنجی بۆ ڕاكێشاوە ، لای عیبرییه كۆنەكاندا هەبووە

[137] Nikitine, " La vie domestique Kurde,"342.

لەوەی "نیشانەی پاکیزەگیی" لەپێش باوك و دایك و دۆستانی بووك و زاوا دابنێت .[138]

ژنومێردایەتیی برازاکان ، بەتایبەت هێنانی کچە مام ، یەکێکە لە شێوازەکانی ژنومێردایەتیی لەنێو کورددا ،[139] بەتایبەتیی لەنێو کۆمەڵگە خێڵەکییەکاندا کە سیستمی باوکایەتیی پێکهاتەی ژیانی کۆمەلایەتیی تەنیوە . ئەم جۆرە ژنومێردایەتییە ، بە گشتیی پەیوەستە بەمەسەلەی زەویداریی و هێزیی رامیاریی[140] و قازانجی ئابووریی و رامیاریی دیارییکراو بۆ هەردوو لا دێنێتە ئارا . برازا مارەییەکی کەم یان هەر هیچ مارەییەك بە مامی خۆی نادا ، مامەکەش لایەنگریی و وەفاداریی گەنجێك بۆ خۆی مسۆگەر دەکات . ئەو هۆکارەی بایەخێکی مەزنی لەهێزی داواکارییدا دەبێت لەکاتی رکابەری و ململانێیدا .[141] هەرچەندە ژنومێردایەتیی برازاکان ، لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا لەسەراسەری جیهاندا باوە ،[142] بڵاوبوونی لەنێو کورددا مەرج نیە بنەمایەکی ئیسلامیانەی هەبێت .[143]

شێوازێکی ژنومێردایەتیی هەیە بە (ژن بە ژن) دەناسرێت ، تێیدا دوو پیاو خوشکی یەکتری دەهێنن . ئەم شێوازە جاروبار لەنێو کورددا روودەدات . زۆر ئاساییە لە حاڵەتی وادا کە شیربایی چاوی لێ بپۆشرێت . ئەو رێکەوتنەی سوودی ماددیی بۆ

---

[138] Bois,. L' ame des Kurdes,39.

[139] Leach,19-21:Barth,26ff.

[140] Barth,28.

[141] Ibid.

[142] سەبارەت بە ژنومێردایەتیی برازاکان یان ئامۆزاکان لە نێو عەرەب و رەگەزە سامییەکان بەگشتیی ، هەروەها بوونی بە دابێکی بەربڵاوی رێکخراوی ئایندەیی کۆمەلایەتیی موسوڵمانان بڕوانە :

Seligman, Brende , Z." Studies in Semitic Kinship,263-79.

[143] بارس گومانی هەیە کە ئارەزووی ژنومێردایەتیی نێوخۆیی لە ناوچەکەدا لە ئاکامی دەسەڵات و کاریگەریی ئیسلامییدایە ، ئەو لەگەڵ (لەتیزینتەك) دا کۆکە کە ژنومێردایەتیی نێوخۆیی لەنێو غەیرە موسوڵمان و خەڵکانی پێش ئیسلامدا هەبوون . ئەو دیاردەیە لە میسر ، سۆمەر ، ئیلام ، عەرەبستان ، فارس هەبووە کە هاوسەرگیریی براوخوشك لەنێو چینی فەرمانڕەوادا هەبووە . هەروەها لە ناوچەی قەفقاس-ئەرمینیاکە ژنومێردایەتیی خزمە نزیکەکان بەشێك بووە لە رێکخستنی کۆمەلایەتییدا .Barth ,136ff.

هەردوولا تێدایە ،[١٤٤] ژنومێردایەتیی نێوخۆیی وەك ئاماژەی پێدرا ، زیاتر لەنێو كۆمەڵگە خێڵەكییەكاندا بڵاوە ، لەكاتێكدا ژنومێردایەتیی دەرەكیی لەنێو ئەو شارنیشین و گوندنشینانەدا باوە كە پەیوەندییە خێڵەكییەكانیان هەڵوەشاونەتەوە .

ژنومێردایەتیی لەنێو كورددا بە پەیڕەوكردنی یاساكانی مەزهەبی شافیعیی بەڕێوەدەچێت . باوك دەسەڵاتی تەواوی هەیە كە كچە پاكیزەكەی بە بێ ویستی خۆی بەشوو بدات ، جا گەیشتبێتە تەمەنی پێگەیشتوویی یان نا ، هەرچەندە وا بۆ ئەو شیاوترە كە ڕەزامەندیی كچەكەی بەدەست بێنێت . بە پێی پەیڕەویی شافیعیی ، ژنومێردایەتیی ئەو دەمە شەرعییە كە لەنێوان زاوا و سەرپەرشتیاری كچەكەدا ڕێكەوتنی لەسەر بكرێت .ئەگەر باوكی مردبوو ، براكەی لەپێشترە . پێویستە ئاماژە بەوە بكرێت كە تەنیا باوك و باپیر ئەو دەسەڵاتەیان هەیە كچ بە شوو بدەن . هەر بۆیە ئەوانە بە (وەلی موجبیر) ناسراون .[١٤٥]

هەرچەندە ، نەریتی باو هێندێك جار لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەی شەرع بۆ باوك یا سەرپەرشتییكەری دابینكردووە ناوێتەدەبن . لە ڕاستییدا ناوێتەبوونەكە زۆربەی جار ئەوەندە بەهێزە كە شوێنێك بۆ ڕێ و شوێنە شەرعییەكە ناهێڵێتەوە . بۆ نموونە ، لە ناوچەی بارزان ، وەك جیاوك دەڵێت ، ژنومێردایەتیی ئەو كاتە ڕوودەدات كە هەردوو كەسەكەی خوازیاری ژنومێردایەتین دەچنە لای شێخی بارزان و خۆشەویستیی خۆیان ئاشكرا دەكەن ، ئینجا شێخ دەیاننێرێتە لای مەلا تا مارەیان بكات " باوك یا سەرپەرشتیاریان پشتگیریی لەو ژنومێردایەتییە بكات یان نا " جیاوك ، هەرچەندە ، ئەوەش دەڵێت كە ژنومێردایەتیی لە زۆربەی حاڵەتەكاندا بە ڕەزامەندیی سەرپەرشتیاران ڕوودەدات .[١٤٦]

هەڵگرتن نموونەیەكی زیاتر لەو بارەیەوە دەخاتە بەردەست كە تێیدا باز بەسەر ڕەزامەندیی و پشتگیریی باوك یا سەرپەرشتیاردا دەدرێت ، ئەم باز بەسەردانە هێندێك بە وروژاندنی بڕیارێكی شەرعیی بەدی دێت كە دەسەڵاتی سەرپەرشتیار پووچ دەكاتەوە .

---

[144] Ibid.27.

[145] Muhyi al-Din Abu Zakarriya Yahya al- Hizami al Nawawi, Minhaj Al-Talibin,321-23;Schachet,"Nikah."Cf.Barth,30.

[146] جیاوك ، ٥٤

بەگوێرەی دملوجی ، هەرچەندە هەڵگرتن لە هێندێك بەشەكانی كوردستاندا نەخوازراوە ، بەڵام لەزۆربەی ناوچەكاندا بەربڵاوە .[١٤٧] ئەو ئامارژەی بەوەداوە كە هەڵگرتن بەگشتیی ئاكامی خۆشەویستیی هاوبەشیی دوو كەسە و ئارەزووی ئەو دوانەیە بۆ پێكەوە ژیان ، فڕاندن و ناچاركردن كەموێنەیە .

بەگوێرەی دملوجی ، مەسەلەكە وەك باوە ئەوەیە كە هەڵگرەكە ئافرەتەكە دەبات و دوو قۆناغ دووری دەخاتەوە و لەوێ هەردووكیان زەماوەند دەكەن و دەبنە ژن‌ومێرد .بە پێی مەزهەبی شافیعیی ، دەسەڵاتی باوك وەك سەرپەرشتیارێكی ژن‌ومێردایەتییەكی لە دووری ئەو مەودایەوە پوچەڵ دەبێت . بەگشتیی پاش هەڵگرتنەكە پێكهاتن لەگەڵ ماڵە كچدا ڕوودەدات لەرێی تێكەوتنی چەند كەسێكی خانەدان و ریشسپییەوە ، دوای ئەوەی (سەدەق) دەدرێت و مەسلەت دەكەن . وێڕای سەدەق بڕێك پارە دەدرێت پێیدەڵێن (حەق كریتی) وەك قەرەبوویەكی ئەو ئەو بێڕێزیی و ئابڕووچوونەی بەهۆی هاەڵگرتنەكەوە ڕوویداوە ، گەر یەكسانی كۆمەڵایەتیی لەنێوان هەردوولادا نەبێت ، هێندێك جار مەسلەت ئەستەم دەبێت و دوور نیە گۆبەند و توندوتیژیی گەورەشی لێ بكەوێتەوە .[١٤٨]

هەڵگرتنی ژنی مێردار ، كە كەم ڕێدەكەوێت ، ئابڕووچوونێكی گەورەیە .[١٤٩] دملوجی لەم ڕووەوە باسێكی سەرنجڕاكێشی گێڕاوەتەوە . بۆ ئەوەی كەسێك خۆی لە پەڵەی زنا بەدوور بگرێت ، هێندێك جار پەنا بۆ حیلە شەرعیی دەبات ، كە تێیدا لە ڕێی كۆلكە مەلایەكی پارەخۆرەوە تەڵاقی ئافرەتێك لە مێردی یەكەمی و دواتر بەشوودانی بە پیاوێكی تر ئەنجام دەدرێت . مەلاكە بە ژنەكە دەڵێت واز لە ئیسلام بهێنێت و ببێتە كریستیانیی یان جوو . پاش ئەوەی ژنەكە قسەی مەلای جێبەجێكرد دەستبەجێ مێردەكەی تەڵاقی دەكەوێت ، چونكە ژنەكە لە ئیسلام وەرگەڕاوە ، ڕۆژی دواتر مەلا داوا ژنەكە دەكات ببێتەوە بە موسوڵمان ، ئیدی ژنە لەگەڵ مێردی دووەمییدا زەماوەند دەكەن

---

[147] بەگوێرەی دملوجی، ئەم كارە لای ئێزیدییەكان پەسەندە : دملوجي ، اليزيدية ، ٢٨٠-٨١

[148] دملوجي ، امارة بهدينان ، ١٦٨-٦٩

[149] ڕەدووكەوتنی كچ بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ كوڕێكدا لەلای ئێزیدیی باوە تا لای موسوڵمانەكان ئەوەش بەگوێرەی دملوجی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە كچ لای ئێزیدییان پێگەیەكی كەمی هەیە . ئەوان لەلایەن سەرپەرشتیارەكانیانەوە هەر زوو بێ ئارەزووی خۆیان بە شوو دەدرێن . ئەوەش تووشی بارێكی ناهەمواریان دەكات. دملوجي ، اليزيدية ، ٢٨١-٨٢

و بەشێوەیەکی گونجاو لەیەکتر مارەدەبڕێن .[١٥٠] بەگوێرەی نیکیتین ، لەناوچەی شنۆ ، وەختایەکی ژنێکی مێردار یان کچێك هەڵدەگیرێت ، هەڵگرەکە ناچار دەبێت بڕێك پارە بداتە مێردی یان باوکی کە بە (داویتانە) ناودەبرێت . ئەو چەمکەی کە لە وشەی داویتەوە داتاشراوە واتە پێنووس .[١٥١]

## منداڵبوون

کاتێك منداڵێك خەریکە لەدایك بێت ، ژنێکی دراوسێ ، بەتایبەت بەتەمەن ، بۆ یارمەتییدان بانگدەکرێت و لەکاتی لەدایك بوونەکەدا وەك مامان هەڵدەسوڕێت .[١٥٢] بەگوێرەی بارس ، دایکەکە و منداڵە ساواکە ، بەتایبەتیی گەر کوڕ بێت ، بۆ ماوەی حەوت شەو و حەوت ڕۆژ لەگیانێکی شەڕەنگێز کە (شەوە)ی پێدەڵێن ئاگاداریی دەکرێت . بڕوا وایە کە شەوە ژنێکی وەجاخ کوێر بووە و ئیرەیی بە منداڵبوونی ژنان دێت ، بەتایبەتیی منداڵی کوڕ . بۆ ئەوەی منداڵە کوڕەکە لە شەوە بپارێزرێت ، چەقۆیەك ، دەرزییەکی گەورە ، یا توێکڵەپیاز دەخرێتە ناو کەژاوەکەیەوە . هەرچەندە باوەڕ وایە کە شەوە زۆر بەلای منداڵی کچدا ناچێت ، بەڵام بۆ ئەویش هەر چەقۆ و توێکڵە پیاز دادەنرێت .[١٥٣]

بەگوێرەی نیکیتین ، کە سەبارەت بە کوردستانی ناوەند نووسیوویەتی ، منداڵی کوڕی تازەبوو بۆ ماوەی شەش ڕۆژ لە لایەن ژنانی ئامادەبوو و خزمانەوە ئاگاداریی دەکرێت . مانەوە و چاودێریی لە کاتی شەودا دژی ئەو گیانە شەڕەنگێزەی کە شەشەی پێدەڵێن گرنگە ، ئەو ناوەی کە نیکیتین دەڵێت لە وشەی (شەش) ی کوردییەوە هاتووە . بڕوا وایە کە شەشە هەوڵ دەدات دایکەکە و منداڵە ساواکە بکوژێت ، هەر بۆیە ئاگر و ڕووناکیی بەکاردێت بۆ دەرکردنی ئەو گیانە شەڕەنگێزە . لەماوەی ئەو شەش ڕۆژەدا پارچە کراسێك لەلایەن شێخێکی ناسراوەوە وەك مەفەرك لەوماڵەدا دادەنرێت بۆ ئەوەی

---

[150] دملوجي ، امارة بهدينان ، ١٦٩-٧٠ شایەنی باسە لە هند و ئەندەنووسیاش گەر ئافرەتێك بیەوێت لەمێردەکەی جیابێتەوە ئەم ڕێگەی لەدین وەرگەڕانە دەگرێتەبەر

[151] Nikitine, " La vie domestique Kurde,"341.

[152] Ibid.,339-40.

[153] Barth , 112.

لەو گیانە شەڕەنگێزە بەدوور بن .[١٥٤]

منداڵی کوڕ پێش ئەوەی پێبگات خەتەنە دەکرێت . بۆنەکە زۆربەی جار لەلایەن سەرتاشێکەوە بەڕێوەدەبرێت ، زۆرجاریش سێ کوڕ یان زیاتر لە یەك کاتدا خەتەنە دەکرێن . وباوە دەوڵەمەندترین باوك خەرجی بۆنەکە دەکێشێت .[١٥٥] هێندێك لە کوردان منداڵە کچەکانیشیان(خافد) خەتەنە دەکەن .[١٥٦]

## شێخەکان

ئەو رۆڵە بایەخدارو پەرەگرتووەی شێخەکان لەژیانی کۆمەڵایەتیی و رامیاریی کوردستاندا گێڕاویانە و دەیگێڕن وا دەکات گفتوگۆ لەسەر پێگەیان لە کوردستاندا بکرێت . تەنانەت تروسکایی خستنێك بۆ سەر مێژووی کورد دەریدەخات کە رێبەرایەتیی شێخەکان لەنێو کورداندا و لەماوەی زیاتر لە سەد ساڵ ، چەسپاوترین شێوازی سەرکەوتووی رێبەرایەتیی بووە . بەتایبەت پاش نەمانی میرنشینە ئۆتۆنۆمە کوردییەکان

## بنەما و دەرکەوتنی شێخەکان

مێژووی سەرەتایی دامەزرێنەرانی بنەماڵە شێخایەتییەکانی کوردستان ، وەك پیاوانێکی لێهاتووی بەرچاو پێشانیان دەدات . وێڕای ئە لێکنەچوونەی کە لە باری کەسایەتییانەوە ، تایبەتمەندیەتییان ، سروشتیان و هەروەها ئەو وزەیەی کە لەنێو زۆرینەی هاوچەرخەکانیاندا خستوونیەتیە پێش . لەوانەیە ئەو لێکچوونەش هەبێت کە

---

[154] Nikitine, " La vie domestique Kurde,"340.

جێگەی سەرنجە هەمان بروا بە شەشە لای نەستورییەکانی دەشتی ورمێش هەیە

[155] Barth , 150.

[156] Arkelian . H. "Lea Kurds in Prese"In Verhanlungen des XIII International Orientalisten Kongresses-Hamburg,September 1902, 148-50. Leiden: E.J.Brill ,1904.

سەبارەت بە دەركەوتنیان وەك ڕێبەرانێکی ئایینیی و رامیاریی هەمان گێڕانەوە دەبێتە سەرمەشق و بە سانایی درکی پێدەکرێت .

لەناوەراستی ساڵی ۱۹۳۰دا ، (پیەر ڕۆندۆت) لە مێژووی ژمارەیەك لە بنەماڵەی شێخەکانی کۆڵیوەتەوە و گەیشتووەتە دەرئەنجامێك . بەگوێرەی دەرئەنجامەکەی ، ئەم بنەماڵانە بەگشتیی لە دەرەوە دێن و لەناوچەیەکی دیارییکراودا جێگیر دەبن ، لایەنگریی پەیدا دەکەن ، ناوبانگێکی باش لە خواپەرستیی و چاکەکاریی بەدەستدێنن . لەگەڵ بنەماڵە دەسەڵاتدار و دەستڕۆیشتووەکاندا لە ڕێگەی ژنوژنخوازییەوە تێکەڵ دەبن .[157] ئەو دیاریی و بەخشینەی لە مورىدەکانیەوە وەریدەگرێت وایان لێدەکات سامان و موڵك و ماڵێکی بەرچاو پێکەوەنێن ، ئەوەش پێگە و دەسەڵاتیان بەهێز و چەسپاوتر دەکات .[158] دەرئەنجامەکەی ڕۆندۆت ئەو ئاکامانە دەچەسپێنێت کە نووسەرانی دیکە لەکاتی کۆڵینەوەیان لەمەڕ بنەماڵەی چەند شێخێك بەدەستیان هێناوە .

بەگشتیی و بەدەر لە هەموو شت ، دامەزرێنەرانی شێخایەتییەکان لە دەرەوە هاتوون ، نە ئەندامی خێڵێکن و نە خەڵکی ڕەسەنی ئەو شوێنەش کە یەکەمجار ناوبانگی تێدا پەیدا دەکەن ، بەگوێرەی ڕۆندۆت ، ئەم ڕەوتی کۆچکردنە ، کە هێندە دیاردەیەکی زەقی مێژووی سەرەتایی دامەزرێنەرانی بنەماڵە شێخایەتییەکانە ، دروستیی ئەو گوتەیە دەسەلمێنێت کە "هیچ پەیامبەرێك لەنێو خەڵکەکەی خۆیدا ڕێز و بایەخی نیە"[159] ئەم نموونانەی خوارەوە بەڵگەی ئەوەن کە ئەو ڕەوتە لەنێو بنەماڵە شێخایەتییە گەورە و بچووکەکاندا چەندە باوی بووە .

شێخانی نەهریی لە هەرێمی شەمدینان لە تورکیا خۆیان بە نەوەی شێخ عەبدولعەزیزی کوڕی شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە بەغدا دەزانن ،[160] لەکاتێکدا شێخانی بەرزنجە لە هەرێمی سلێمانی لە عێراق خۆیان بە نەوەی دوو برا دەزانن کە شەش سەدە پێشتر لە کوردستانی ئێرانەوە هاتوون .[161] لەنێو بنەماڵەی شێخە گچکەکاندا ، شێخی

---

[157] Rondot, " Les tribus Montagnardes,"42-47.

[158] Ibid.

[159] Ibid.,44.

[160] Ibid.,45.

[161] Barth , 62.

خالان و زینۆی شێخی هەرێمی ڕەواندز لە عێراق خۆیان بە نەوەی شێخێك دەزانن کە لە ناوچەی لاهیجانەوە هاتوونەتە ئەو هەرێمە .[162] شێخانی پالو لە تورکیا خۆیان بە نەوەی کەسێك دەزانن کە لە بنەڕەتەوە خەڵکی هەرێمی سلێمانی بووە .[163]

پاش ئەوەی شێخ لەو شوێنە نوێیەی بۆی دەچێت نیشتەجێ دەبێت ، یەکەمین کاری بریتیە لەوەی ناوبانگێکی خواپەرستیی و چاکەکاریی بۆ خۆی بەدەستبێنێت . نوێژی بەردەوام ، ڕۆژوو ، هەروەها سادەیی و خاکیی بوونی ئەم چەشنە پیاوە لەخواترسانە کاریگەرییەکی مەزن دەکاتە سەر کوردە چیاییەکان ، ئەوانەی لەسەر بێنەزمیی و ژیانێکی پڕ ئارەزووکاریی ڕاهاتوون .[164] بەگوێرەی چاودێرێك کە ماوەی چەندساڵێك لەنێو کورداندا ژیاوە " زوهد و خۆگرتنەوە زیاتر ناوبانگی شێخ بەرز دەکاتەوە ، هەواڵی شێخێك هەیە کە ماوەی ئۆساڵ لەسەر یەك ، هەر ساڵەی چل ڕۆژ بەڕۆژوو بووە و ڕۆژانەش یەك هەنجیری خواردووە و قومە ئاوێکی خواردۆتەوە ."[165]

دامەزرێنەری بنەماڵەی شێخانی خەلان و زینۆی شێخی ، خانەقایەکیان بۆ حەوانەوەی ئەو میوانانە بنیاتنابوو کە لە کاتی سەرمای سەختدا بەو ناوەدا تێدەپەڕن و ڕێیان دەکەوێتە خەلان .[166] وەك هەی دەڵێت :" بەم شێوەیە ، ناوبانگێکی بەرفراوانی خواناسیی و چاکەکارییان بەدەستهێنا بوو ."[167]

---

[162] Hay,Two Years in Kurdistan . 257.

ئەو شێخانەی ئاماژەی بۆکراوە بریتییە لە شێخ عوبەیدوڵڵا و شێخ عەلائەددین . هەی بە هەڵە ئەوانەی بە ئامۆزای یەکتر ناوبردووە . هەرچەندە لە ڕاستییدا ئەوەی پێشوویان مامی ئەوەی دواتریانە . Leach,8

[163] Rondot, " Les tribus Montagnardes,"46.

[164] سەبارەت بە ئاکاری ئاینیی و کاروکردەوەی خواپەرستیی سۆفییەکان بڕوانە :

Massinnon, Louis . " Tarika" ,8:667-72; Macdonald,D.B."Derwish.",2:949-51.

[165] Wilson S.G , Persian Life and Customs, ,103.

[166] Hay,Two Years in Kurdistan , 257.

لەسەردەمی هەی دا . وادیدەچێت ئەم گوندە بە ناوی دارئەلئەمانە ناسراوە لیچ ئاماژەی بۆداوە کە ئەم ناوە ناوێکی دیکەی گوندی خەلانە . Leach,8

[167] Hay,Two Years in Kurdistan , 257.

شێخ بەردەوام ویستی خێرخوازانەی خۆی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و ئاشتکردنەوەی دژەکان دەخاتە گەڕ . ریچ ، نموونەیەکی سەرنجڕاکێش لەمەڕ تێکۆشانی ئەندامانی بنەماڵەی بابان لە سلێمانی بۆ دەسەڵات وەرگرتن دەخاتە بەردەست و دەڵێت :

" کاتێک مەحمودپاشا دواجار بڕیاریدا سەر بۆ تورکان دانەوێنێت ، ماوەیەکی کورت پێش ئەوە ، خۆی و وەسمان پاشای مامی و هەردوو براکەی ، وەسمان و سلێمان ، چوونە لای شێخ خالیدی خواناسی مەزنی سلێمانی ، ئەم سیانە سوێندی لایەنگرییان بۆ مەحموود پاشا خوارد ، هەروەك پێشبینییان دەکرد کە شازادەی کرماشان لە تەقەلای ئەوەدا بێت یەکێکیان بەلای خۆیدا رابکێشێت و دژی پاشا و بەرژەوەندیی تورکان هانی بدات . لەوێ سوێندیان بە شمشێر و قورئان و تەڵاق خواردبوو ،[١٦٨] کە هەر نامەیەك لەلایەن تورك یا ئێرانییەکانەوە بۆ هەر کامیان بنێردرێت ، دەبێت لەماڵی شێخ خالید و بە ئامادەبوونی هەموو لایەنەکانی ئەو رێکەوتنەیان بەستووە ، بکرێتەوە ."[١٦٩]

مورید پەیداکردن یەکێکی دیکەیە لەو چالاکییانەی کە شێخ بەو پەڕی تواناوە لەو شوێنە نوێیەی تێیدا نیشتەجێ بووە کاری بۆ دەکات . زۆربەی جار ئەوانەی دەیانکاتە مورید و شوێنکەوتەی خۆی کەسانێکی ناخێڵەکین کە پێویستیان بە پاراستنە . بنەماڵەی شێخانی بارزان لەوانەیە دیاترین نموونە بێت بۆ ئەو پاراستنەی کە لەلایەن شێخەوە پێشکەش بە خەڵکانێکی لادێیی ناخێڵەکیی دەکرێن . دەرکەوت ئەو بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی لەو کاتەوە دەردەکەوێت کە وەك قارەمانێك لە پرسی گوندنشینەکانی زێبار دژی چەوسانەوە و بەکاربردنی نادادپەروەرانەی ئاغای ناوچەکە دەرکەوت . لە ئاکامی چەند جەنگێکی خوێناویی دژی ئەو ئاغایانە ، بارزانیی بووە سەرداری راستەقینەی تەواوی ناوچەی زێبار .[١٧٠] هەروەك بارس دەڵێت ، تەنانەت لەو قۆناغەی دواییشدا ، موریدەکانی شێخی بارزان خەڵکی ناخێڵەکیی بوون و سەر بە چینی

---

[168] سوێندخواردن بەم سێ شتە لە تەواوی وڵاتانی ئیسلامیدا باوە کاتێك پیاو سوێند بە تەڵاقی دەخوات، کاتی شکاندنی سوێندەکە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی تەڵاقەکەی دەکەوێت تا چوار مانگ کە تەڵاقەکەی تێدا چاك دەکرێتەوە ناتوانێت بچێت بەلای ژنەکەیدا

J.Pedersen."Kasam,"in Encyclopaedia of Islam,1st ed,4:783-85 .

[169] Rich,1:147-48 .

[170] دملوجي ، امارة بهدينان ، ١٣١-١٣٢ .

(مسكێن) بوون .[١٧١]

هەروەها شێخ ، مینەی کەسانی دەسەڵاتداری لەنێو لایەنگر و موریدەکانییدا دەکرد . ریچ دەڵێت کە مەحموودپاشاو زۆربەی ئەندامە بەرچاوەکانی بنەماڵەی بابان ، لە هەمان کاتدا بەشێك بوون لە مورید و شوێنکەوتەکانی شێخ خالید نەقشبەندیی .[١٧٢] ئەو دەسەڵات و بالادەستییەی شێخ عوبەیدوڵلا بەسەر تەواوی چینەکانی کورددا هەیبوو لەکاتێکدا پەلاماری ئێرانی دا زۆر بە زەقیی دەردەکەوێت . سەرۆکە مەزنەکان ، بە خۆیان و دەست‌وپێوەند و پیاوەکانیانەوە چوونە ژێر سایە و سەرکردایەتیی شێخ . هەمزاغای سەرۆکی ناودار و دەسەڵاتداری خێڵی مەنگوڕ ، کاتێك لە شەڕێکدا فشاری بۆ دێت و نامەیەك بۆ شێخ عوبەیدوڵلا دەنووسێت و داوای چەك و چەکداری لێدەکات . نامەکە بە چەمکی (جناب جلالت متعال) شێخ ناو دەبات و بەشێوەیەکی تکاکارانەش کۆتایی پێدەهێنێت و دەڵێت " متمانەم هەیە کە جەنابتان لەکاتی دوعاکردندا منتان لەیاد ناچێت ".[١٧٣]

هاوپەیمانیەتیی ژنوژنخوازیی کە شێخ پاش جێگیربوونی لە شوێنە نوێیەکەی پێکی دەهێنێت یەکجار گرنگ و بایەخدارە بەهۆی ئەو پێگە و دەسەڵاتەی ئەو پەیوەندییە پێی دەبەخشێت . ئەم ژنوژنخوازییە بەهەمان شێوەی هاوپەیمانیەتیی ئەریستۆکراتیی پاشایەتییەکانە ، کە زۆربەی جار لەسەر بنەما و لەبەرچاوگرتنی دەسەڵاتە .

یەکەمین پەیوەندیی ژنوژنخوازیی شێخ لەگەڵ سەرداری گوندێك یا سەرخێڵێکی لاوەکییدا دەبێت .[١٧٤] دواتر کە بنەماڵەی شێخ پێگە و دەسەڵاتی بەدیهێنا ، ئنجا مینەی

---

[171] Barth , 83.

مسکێن ئەو جووتیارە خێڵەکییە بوون لەسەر خاکی هەمەوەندەکان لە لیوای سلێمانی نیشتەجێبوون .

[172] Rich,1:141 .

[173] Enclosure in No.48, Letter from Mr. Thomson , British Minster in Persia ,to Earl Granville, British Foreign Secretary , Teheran.Sec. 23.1880,in Great Britain ,Correspondence Respecting the Kurdiah invation of Persia. Turkey No. 5 (1881),C.2851(London:H.M. Stationary Office,1881),(hereafter Turkey No.5).

[174] Rondot. " Les tribus Montagnardes,"44.

ژنوژنخوازیی لەگەڵ بنەماڵە شکۆمەند و ناودارەکان دەکات . دوای ئەوەی ئەمە سەری گرت . هاوپەیمانیەتییەکی بەهێزی بۆ پێکهات . بەم شێوازە ، دوو لە مەزنترین و ناسراوترین بنەماڵەی شێخایەتییەکانی کوردستان ، کە بنەماڵەی شێخانی شەمدینان و بارزانن ، پەیوەندیی ژنوژنخوازییان لەگەڵ میرە بەناوبانگەکانی ئامێدییدا دامەزراندووە .[175] گێڕانەوەیەکی سەرنجڕاکێش و سەرنج و ئەنجامگیرییەک لە لایەن هەی یەوە سەبارەت بەم شێوە ژنوژنخوازییە پێشکەش کراوە ، ئەو کەسەی کە لەلایەن شێخ مەحموودی ئاغای والأشەوە[176] داوای لێکراوە لەگەڵ ئەو دەستەیەدا بۆ داواکردنی دەستی خوشکەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای خەلان و زینۆی شێخی بڕوات .[177]

بایەخی رامیاریی ئەو تێکەڵییەی لە ئاکامی ژنوژنخوازییەوە هاتۆتەئارا ناتوانرێت زێدەڕۆیی تێدا بکرێت . شێخ سەعید لەرێی دانایی و لێهاتوویی لە بەکارهێنانی ئەو تێکەڵییە ژنوژنخوازییەدا ، توانی دەسەڵاتی هەراخوازیی هەمەوەندەکان راگرێت و بگرە دەستیشی بەسەردا بگرێت . بەگوێرەی سۆن :

" پاش رووداوەکانی ساڵی ١٨٨١ ، کاتێک هەمەوەندەکان خەریک بوون سلێمانی بگرن و بنەماڵەی (شێخانی بەرزنجە) تێکبشکێنن ، شێخ سەعید گرنگی و بایەخی خێڵ و بەکارهێنانی وەک چەکێک درک پێکرد ، بۆ ئەوەی بیانخاتە بندەستی خۆیەوە ، ئەو لە رێگەی ژنوژنخوازییەکی زۆر شارەزایانەوە ، خستنیە ژێر سایەی خۆیەوە ... ئەم سیاسەتە زۆر بە باشی سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەچەشنێک کاتێک لە ساڵی ١٩٠٨دا فەرمان بە خێڵەکە درا راپەڕینی خۆی راگەیەنێت ، نەیتوانی بێفەرمانی شێخان بکات و

[175] Soane ,Report on Sulaimania District ,98.

بەگوێرەی سۆن ، شێخەکانی بارزان دوای ئەوەی لە رێگەی ژنوژنخوازییەوە لەگەڵ میرەکانی ئامێدییدا تێکەڵ بوون ، ئاونیشانی "خان"یان بۆ کێ و رەگەزە مێیینەکانیان بەدیهێنا ، ئەوەی کە تەنیا خێزانە کۆنەکان ماڵ ئەو ئیدعایەیان هەبوو

[176] شێخ محەمەدی سەرەکخێڵی ناسراوی خێڵی بالیک ، پیاوێکی شکۆمەندی ئایینیی نەبووە ، ئەو لە کاتی لەدایک بوونیدا لەلایەن خزمێکییەوە ناونراوە کە شێخێکی راستەقینە بووە .Leach,3.

[177] Hay,Two Years in Kurdistan , 257-59.

گوێڕایەڵ نەبێت .[١٧٨]

لەساڵی ١٩٤٤دا ، لە کاتێکدا شێخی بارزان بە ئاشکرا لە دژی حکومەتی عێراق ڕاپەڕیبوو ، لەگەڵ ئاغاکانی زێباردا ژنوژنخوازییان پێکهێنا ، ئەو ئاغایانەی دوژمنی سەرسەخت و مێملی چەندین پشتی شێخانی بارزان بوون ، لە ئاکامی ئەم هەوڵە زیرەکانەیە ، وەك لونگریك دەڵێت ، توانا و هێزیان "دوو هێندە" زیندەتر بوو .[١٧٩]

یەك لەو ڕاستییە بەڵگە نەویستانەی بەگشتیی پەسەندە ئەوەیە کە سامان شێوەیەکی دەسەڵاتە . لە کەشێکی سەرەتایی و ساکاری وەك لەنێو کورددا هەیە ، دەسەڵات تەواوی بنەمای کۆمەڵایەتیی دیاریی دەکات و چالاکییەکانی خەڵك ئاراستە دەکات . سامان هێزێکی هاندەری مەزنە و لەنەستی هەموو تاکێکی دەسەڵاتخوازدا ئامادەگیی هەیە . هەربۆیە بەدەستهێنانی سامان یەکێکە لە خولیا و ئارەزووانەی شێخیان لە شوێنە تازە نیشتەجێبوونەکەیدا سەرقاڵکردبوو .

بەدەستهێنانی سامان وای دەکرد شێخ موریدی زیندەتر بەلای خۆیدا رابکێشێت و بتوانێت بەڕێوەیان بەرێت . خواردن و چەك بۆ پاسەوانەکانی دابین بکات ، هەروەها بەو کەسانەدا رابگات کە ڕوو لە خانەقاکەی دەکەن و پێویستیان بە یارمەتیی و هاوکاریی و پاراستنی دەبێت . سامانی شێخ لەو بەخشین و دیارییانەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەلایەن مورید و شوێنکەوتەکانیەوە بەسەریدا دەبارێت ، جا کەم بێت یان زۆر ، شتێکی باوە ، هەرچەندە بە زۆریش نیە ، هەر موریدێك سەردانی شێخ بکات دیارییەکی بچووك پێشکەش دەکات ؛[١٨٠] هەرچەندە میر و سەرداره مەزنەکان سەرچاوەی سەرەکیی ئەو خەڵات و بەرات و دیارییانە پێکدەهێنن .

بەگوێرەی بارس ، سامانی شێخانی بەرزنجە دەگونجێت لەو خەڵات و بەراتانەوە سەرچاوەی گرتبێت کە بنەماڵەی بابانییەکان پێیان بەخشیبوون.[١٨١] ئەو سەبارەت بە

---

[178] Soane ,To Mesopotamia and Kurdistan,190.Also Soane ,Report on Sulaimania District ,99.

[179] Longrigg, Stephen H. Iraq, 1900-1950: Political, Social, and Economic History. London : Oxford Univ. Press for the Royal Institute of International Affairs, 1953,326.

[180] Barth , 84.

[181] Ibid.,62.

چۆنێتی بەدەستهێنانی ئەو سامانە و ئەو رێگا هەمەجۆرانەی لە پەیدابوونی گیراوەتەبەر زیاترمان بۆ روون دەکاتەوە و دەڵێت :

" هەر لەسەرەتای دەستپێکردنی سەردەمی باباندکانەوە ، توانای ئابووریی بنەماڵەکە بە شێوەیەکی خێرا پەرەی دەسەند و تۆکمەدەبوو . ئەگەری میراتگریی تاپۆی زەوییەکان کە لە دەوڵەتی عوسمانییدا بەرێوە دەچوو وادەردەکەوت قازانجی هەبووبێت . دوای دامەزراندنی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ سوڵتاندا ، شێخەکان توانیان دەست بەسەر ژمارەیەکی زۆر گونددا بگرن بەوەی کە بە نرخێکی کەم لە میرییان دەکڕییەوە . ئەو باج و دەستکەوتە زۆرەی کە لەم جۆرە مامەڵەیەدا پەیدا دەبوو بووە هۆی خاوەندارێتیی بازاڕی سلێمانی (تەنانەت ئەمڕۆش) چارەکی بازاڕ بۆ بنەماڵەی شێخ دەگەڕێتەوە." [182]

خاوەنداریەتیی شێخ بۆ گوندو زەوییە کشتوکاڵییەکان هێز و دەسەڵاتێکی مەزنی بەسەر لادێیی و جووتکارەکاندا پێدەبەخشێت . ئەو پاراستنەی دەیاندرێتێ بەهۆی ئەوەوەیە کە لەسەر ماڵ و موڵکی شێخ ژیانیان دەگوزەرێنن و هەستی پابەندبوون بە کەسایەتییەکی پیرۆزەوە دەیانکاتە وەفادارترین دەروێش و دەستوپێوەندیی شێخ . جێگای سەرنجە ، ئەو گوندانە زۆرجار دەبنە گرنگترین بنکە و پێگەی گرنگی دەست و توانای شێخ . جێگای سەرنجە ، شێخ عوبەیدوڵڵا پێش ئەوەی پەلاماری ئێران بدات ، سەرقاڵی کڕینی ژمارەیەکی زۆر گوندەکانی سەر سنووری تورکیا–ئێران بوو . [183]

## کاریگەریی و باڵادەستیی شێخان

زۆربەی ئەوانەی پەیوەندییان بە کوردانەوە هەبووە لەسەر ئەوە کۆکن کە کوردان بە گشتیی لەمەڕ بابەتی ئاین لێبوردەن و جیاوازیی ناکەن . لەبەر ئەوە زیاتر ئەگەری کەوتنە ژێر دەسەڵاتی شێخیان هەیە . پرۆفیسۆر (مینۆرسکی) ئاماژەی بەوە داوە کە کوردان زۆر دید و سەرنجی دەمارگیر و پەرگیریان نیە و بەشێوەیەکی مەزن لە

[182] Ibid.,63.

[183] Enclosure 2 in Letter from Consul-General Abbott to Earl Granville, Tbriz,July 13,1880, Turkey No. 5 (1881),9.

کاروفەرمانە جۆربەجۆرەکاندا بەدوای شێخ دەکەون .[١٨٤] بەگوێرەی (کوینت) ، "هەرچەندە کورد بەگوێرەی سروشتی خۆی بەلای لێبوردەیی ئایینییدا لادەدەن ، بەڵام بەهۆی نەزانیی و ساکارییەوە ، بە ئاسانیی بەرەو دەمارگیریی ئایینیی دەهاژورێن ، زیاتریش بەهۆی بڕوایان بە موعجیزە و دیاردە ناسروشتییەکان ."[١٨٥]

کوردانی نەخوێندەوار و نەزان زۆر بڕوایان بە موعجیزە و دیاردە ناسروشتییەکان هەیە ، ئەوەش بە تەواویی دەیانخاتە بندەستی شێخەوە . ئەوەی بۆتە سەرچاوەی گوتارێك و لەلایەن بەڕێوەبەرێکی بەریتانییەوە لە ساڵی ١٩٢٠دا نووسراوە و زانیاریی بنەڕەتیی و وردی لەمەڕ کورد تێدایە و دەڵێت:" کوردان بەگشتیی ئایینپەروەری خۆپارێز و خۆتەرخانکردوو نین ، بەڵام ساکاریی و سروشتی پوچگەرایی و ترسیان لە نادیار بە تایبەتیی وا دەکات بە ئاسانیی بکەونە ژێر کاریگەریی شێخە پیرۆزەکەیان ، جا چ بە باش یان بە خراپ ."[١٨٦]

نووسینەکەی ریچ لە ساڵی ١٨٢٠ ، وەسفێکی ئاشکرا و سەرنجڕاکێشمان لەمەڕ رێزوشکۆی خەڵکی سلێمانی بۆ شێخ خالید نەقشبەندیی ، دامەزرێنەری مەزنی لقی خالیدیە لە تەریقەتی نەقشبەندیی لە کوردستان بۆ وێنا دەکات :

" سلێمانی پیاوچاکێکی مەزنی موسوڵمانی تێدا دەژی ناوی شێخ خالیدە ، بەڵام کوردان پێیان وایە دەنگییە جگە لە حەزرەتی مەولانا بەناوێکی دیکەوە بانگ بکرێت ، بە کەسێکی پیرۆز و خۆشەویست دادەنرێت و گوتەکانیشی حەدیس و فەرموودەی پێدەگوترێت ...تێکڕای کورد بە وەلی دادەنێن و زۆری تریشیان لە ریزەی پەیامبەرەکەیاندا دایدەنێن . وەسمان بەگ ، کە خۆی و پاشا و زۆربەی میرزادەکانی کورد موریدی ئەون ، پێیگوتم کە شێخ خالید بەلای کەمەوە لە هەمان پلەوپایەی وەلی موسوڵمانی بەناوبانگ شێخ عەبدولقادردایە ."[١٨٧]

ریچ جەخت لەو پایە مەزنەی شێخ خالید دەکاتەوە بەوەی ئاگادارمان دەکات کە

---

[184] Minorsky , "Kurds".

[185] Quinet ,2:638.

[186] Less, " Two Years in Southern Kurdistan ",254.Cf. Hay,Two Years in Kurdistan .38; and Safrastian,92.

[187] Rich,1:140-41.

کەسێك نەبووە جگە لە پاشای سلێمانی خۆی نەبێت "لەبەردەم شێخدا بە پێوە دەوستا و قەنەکەی بۆ شێخ تێدەکرد ."[١٨٨]

سەرباری ئەوەش ، چەندین جار موریدەکان بێئەوەی هیچ گوێ بە ژیانیان بدەن ئامادەبوون لەو راپەڕینە جۆربەجۆرانەی لە لایەن ئەم پیاوە پیرۆزانەوە رێبەرایەتیی کراوە بەدەم شێخەکانیانەوە بچن . بۆ نموونە شوێنکەوتەکانی شێخی بارزان کە (دێوانە)یان پێدەڵێن ، ئەوەندە باوەڕیان بە شێخ هەبوو و پابەندیی بڕیارەکانی بوون گەر فەرمانی پێبکردنایە خۆیان بە تەواویی لە بەرزاییەکەوە فڕێبدەنە کەندەڵانێکەوە دەیانکرد .[١٨٩] هەرچەندە نابێت پێمان وابێت ئەم (گوێڕایەڵییە کوێرانەیە)[١٩٠] وەك هێندێك نووسەر ناوی لێدەنێن ، بە ئاسانیی بەدەستدێت . ئازایەتیی سەرکردە ، دانایی و لێهاتوویی ، پێگە و کەسایەتیی ، هەروەها توانا و ئامادەیی بۆ بەرگرییکردن لە بەرژەوەندیی مورید و مەنسوبەکانی ، یەکجار گرنگن بۆ ئەوەی بتوانێت بەڵادەستیی خۆی بەسەریاندا رابگرێت

## کەسایەتیی جەماوەرکێشی شێخەکان

باوەڕ وایە کە شێخان خاوەن پیرۆزیی و توانایەکی ناسروشتیی دیارییکراون کە هێزێکی نائاسایی و موعجیزەئاسایان دەداتێ کە (کەرامات)ی پێدەگوترێت .[١٩١] ئەوە وای لێکردوون وەك کەسێکی پیرۆز بە رێز و شکۆمەندییەکی بەرچاوەوە سەیر بکرێن ، وەك کوینت لە ساڵی ١٨٩١دا ئاماژەی بۆ کردووە ، مورید و شوێنکەوتەکانیان لەو

---

[188] Ibid.,320.

[189] جیاوك ،٥٤.

[190] زكي ، خلاصة تاريخ الكرد ،٢٩١ ؛ دملوجي ، امارة بهدينان ، ١٣٥؛ العزاوي ، ٢ : ١٦ ؛

Hay.Two Years in Kurdistan . 65.

[191] Macdonald,D.B."Karama." Encyclopaedia of Islam,1st ed,4:744 .

باوەڕەدان کە شێخەکان لەگەڵ پیاوچاکانی ئیسلام و تەنانەت لەگەڵ خوداوەندیشدا لە پەیوەندییەکی گیانییدان . ئەوان لەو باوەڕەدان شێخ کەسێکی پارێزراوە کەس ناتوانێت زیانی پێبگەیەنێت و کاری ناسایی دەخەنە پاڵی . دوعای شێخ شیفا و چارەسەری هەموو دەرد و نەخۆشییەکە . مورید و مەنسوبەکانی ، کاتێک سوێند بە سەری شێخ دەخۆن ، چ قورمتە سوێندەکانیان بشکێنن و درۆ بکەن .[192]

یەک لە سەرنجراکێشترین و بەراییترین وەسفی ئەو هێزە ناسروشتییەی کە دراوەتە پاڵ یەکێک لەو شێخانەوە ، لە لایەن ریچ موە باسی لێوەکراوە ، ریچ ئەو زانیارییانەی خوارەوەی لە موریدێکی سوڵتان حەسەنەوە کە دەروێشێکی بەناوبانگە ، راگواستووە:

" ئەو گوتی : قوربان ، جەنابی سوڵتان ، مەبەستی دەروێشەکەیە ، بەهۆی موعجیزەوە هەموو شتێک دەزانێت ، ئەگەر بە زمانەکەی خۆشت قسەی لەگەڵدا بکەیت ، ئەو بێ ئەوەی ئەو زمانەش فێربووبێت ، لێت تێدەگات . ئەو بێ ئەوەی خوێندبێتی هەموو زانستێک دەزانێت ، تەنانەت دەزانێت چیشت لە دڵدایە ، گەر نیازیشت هەبێت راوێژی پێ بکەیت ، ئەوا بێ ئەوەی وشەیەکیش لە دەمت دەرچووبێت ، وەڵامت دەداتەوە ، ئەو ئێستا دەزانێت ئێمە سەبارەت بەو دەدوێین ، هەروەها دەچێتە خەوی خەڵکیش ، تەنانەت بەرۆژیش لەبەر دەمیاندا ئامادە دەبێت ، جا لە هیند یاخود لە ئێران ."[193]

دەگونجێت ئەم توانا ناسایی و ناسروشتییە لەسەر بنەمای جەماوەرکێش و کاریزمای میراتگر بنیادنرابێت ، کە ئەو خێزانەی هەڵگری سیفەتی کاریزمایین تێیدا بەشدارن ، بەتایبەت خزمە نزیکەکانی ، یاخود لەسەر بنەمای کاریزمای تاکەکەسیی کە ئاکامی شیاویی و لێهاتوویی کەسەکەیە و وادەکات لەنێو پیاوانی دیکەدا دەرکەوێت و بناسرێت .[194]

---

[192] Quinet ,2:638.

[193] Rich,1:141,footnote.

[194] سەبارەت بە گفتوگۆی تەواو لەمەڕ سروشتی کاریزمایی ، دەسەڵاتی کاریزما ، هەروەها پەیوەندیی نێوان کەسی کاریزما و شوێنکەوتەکانی .بڕوانە :

Max Weber , Theory of Social and Economic Organization , (New York: Oxford Univ. Press, 1950), 358-92

بارس لەبارەی شێخ مەحموودەوە نووسویەتیی و دەڵێت :" وەك ئەوەی پەیامبەر ، بنەماڵەی شێخ وا لە قەڵەم دەدرێن کە خاوەنی توانای ناسروشتیین و بەشێوەیەکی لاوەکیش لە باپیری پیاوچاکیان کاك ئەحمەدەوە بەدەستیان هێناوە . ئەمەش توانایەکی تایبەتیی دەداتە شێخ کە نووشتەی گوللەبڕ بنووسێت و هەڵگرەکەی لە گولله و چەقۆ بپارێزێت ."[195] شێخ مەحموود ، وێڕای ئەو کارێزما میراتگرییەی کە بەهۆی لەدایك بوونیەوە لەو بنەماڵەیە بەدەستی هێنابوو ، خۆشی خاوەن کەسایەتییەکی کارێزما و جەماوەرکێش بوو ، بارس دەڵێت زۆر ئەستەمە ئەو دووانە لە یەکتری جیا بکەیتەوە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوەی پێشتریان لە ئاکامی ئەوەی دواتریانەوە هاتۆتە ئارا . بارس سەبارەت بە توانای کارێزمایی شێخ مەحموود خۆی ، دەڵێت:" ئەوان ئەوەیان دەخستە پاڵی کە توانای خوێندنەوەی بیر و تایبەتمەندیی خەڵکی هەیە ، ئەو بێ ئەوەی وشەیەك لەدەمی ئەو کەسەوە ببیستێت کە چۆتە لای دەزانێت بە چ مەبەستێك سەردانی کردووە."[196]

شکۆی شێخ مەحموود هاوجووت بوو لەگەڵ ئەوەی کە لە چەندین شەڕ و شۆڕدا بە ساغیی گیانی دەرکردبوو . ئەوەش ناوبانگی ئەوەی پێبەخشیبوو کە کەسێکە لەخواوەندەوە پارێزراوە زیان نابینێت . بەپێی هەواڵێك کەسێك دەیگێڕێتەوە ، گوایە شایەتحاڵ بووە ، شێخ مەحموود بە پێچەوانەی ئەوانەی دیکەوە کە لەگەڵی بوون ، گولله نەیبڕیوە :" شایەتحاڵەکە گوتی : خوا ئاگادارە ، بەچاوی خۆم بینیم گوللەکە راست‌وراست بە نێو لاشەی شێخدا تێپەڕیی و پیاوێکی کوشت کە راست لەپشتیەوە بوو ، بێئەوەی شێخ هیچ زیانێکی پێ بکەوێت ، ئەو لە جەنگدا ناکوژرێت ."[197]

پاش ئەوەی شێخ پیرۆزیی و توانای کارێزمایی بەدەست دەهێنێت ، ئیدی دەسەڵاتێکی بێ لێپرسینەوەی بەسەر مورید و شوێنکەوتەکانیدا دەبێت ، چ بەرهەڵستیی و بەرەنگارییەك چاوەڕێ ناکرێت و خواستەکانیشی جگە لە ملکەچیی تەواو، کەمتر پەسەند ناکات . وەفاداری و دەروێشی بۆ ئەو دەبێت رەها و بێ چەندوچوون بێت . ئەو وا دەبینێت کە دانپێدانانی دەسەڵاتە کارێزماییەکەی لەلایەن موریدەکانییەوە ئەرکێکە و

---

[195] Barth , 63-64.

[196] Ibid.,64.

[197] Quoted by Hamilton , 201.

پێویستە جێبەجێ بکرێت ، ئەو بەشێوەیەك بەخۆیەوە وابەستەیان دەکات کە شایەنی ئەوە بێ هەموو جۆرە قوربانییدانێکیان لێ داوا بکات .

بانگەشەی چەندبارەوەبووی چەك هەڵگرتن کە شێخان پاش پەلامارە بەرچاوەکەی ئێران لەلایەن شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییەوە دەیانکرد لەنێو مورید‌ەکاندا چالاکانە وەڵام دەدرایەوە و بە پەرۆش ویستێکی هەمیشەیی بەرەوپیری دەچوون . شێخان ، کە ئەرکی گرانیان دەخستە ئەستۆی موریدانیان ، کەم رێکدەکەوت کە موریدەکانیان لە جێبەجێکردنیدا شکست بخۆن ، دەستەو ئەژنۆ لەبەردەم فەرمانەکانی شێخ دا دەوەستان و بێ چەندوچوون چیان لێ دوا بکرایە بەشێوەیەکی وا جێبەجێیان دەکرد کە زۆرجار دەبووە کارێکی نازایانەی ئەوتۆ شایەنی گێرانەوەبێت .

شێخ زۆرجار پەنا بۆ دانانی خەلیفە دەبات تا ناوبانگ و دەسەڵات و پێگەی خۆی لەناوچەکەی خۆی و هەروەها لە دەرەوەشدا بەهێز و پتەو بکات دامەزراندنەکەشی کارکردنە بۆ کردنەوەی تەکیەك کە بۆنە ئایینییەکانی تێدا جێبەجێ بکرێت و هەروەها بەخشینی بەشێکیشە لە توانا و دەسەڵاتی شێخ بە خەلیفەی دانراو . خەلیفە جێگری شێخە لە کاتی ژیانی و تەنانەت دوای مردنیشی ، هەروەها لە شوێنێك یان وڵاتێکیش دادەنرێت کە تا رادەیەکی زۆر دووردەستە و لەوێش خەلیفە لە تەکیەکەیدا جێگیر دەبێت .[198]

دیاردەی بڵاوبوونەوەی تەریقەتی نەقشبەندیی لە کوردستان ، کە بووەهۆی لاوازیی و پاشەکشەی تەریقەتیی قادریی ، بەهۆی کەسایەتیی و جۆشی پەرەگرتووی شێخ خالید و خەلیفە بەراییەکانییەوە بوو . لەنێو ئەو خەلیفە جۆربەجۆرانەی لەلایەن شێخ خالیدەوە دانران ، سەیدعەبدوڵڵای نەهریی[199] و شێخ تاجەدینی بارزان[200] بوو . ئەو دوو پیاوەی دامەزرێنەری دوو بنەماڵەی شێخایەتین کە بەشێوەیەکی مەزن لە رووداوەکانی ئەم بەشەی جیهاندا کاریگەرییان هەبوو .

پتەویی و چەسپاوی دەسەڵاتی شێخ لەنێو موریدەکانیدا لەسایەی

---

[198] سەبارەت بە دانانی خەلیفە لای قادریی و تیجانییەکان بڕوانە:

Arnold, T.W. "Khalifa" In Brill s First Encyclopaedia of Islam , 1st ed., 4:881-85.

[199] Nikitine ,"Shamdinan." 7:303-6.

[200] دملوجي ، امارة بهدينان ، ٦٥

هەلومەرجێکی ناسابیدا ، ناتوانرێت هەتا ماوەیەکی درێژخایەن بەختی سەرکەوتنی هەبێت . وەك (وێبەر) ئاماژەی پێداوە ، شکستی توانای کارێزمای سەرکردە دەبێتە هۆی نەمانی دەسەلاتی کارێزمایی .[٢٠١] کەوتنی شێخ خالید و هەلاتنی لە سلێمانی نموونەیەکی بەرچاوی لەدەستچوونی دەسەلاتی کارێزماییە . ریچ وا رێکەوتووە کە لەو سالانەدا لە سلێمانی بووە ، لێکدانەوەیەکی بەرچاوی سەبارەت بەو هەلاتنە پێشانداوە . ئەو باسی لەوە کردووە کە چۆن شێخ پاش دیارنەمانی لەلایەن شوێنکەوتەکانی پێشوویەوە جنێوی پێدراوە و نەفرەتی لێکراوە و ئەو هەلوێستەشی لەگەل ئەو رێز و شکۆیەی پێشوو بەراورد کردووە کە لەلایەن کوردانەوە لەهەمبەر شێخ نوێندراوە . ریچ هۆکاری گرنگی ئەوەی بۆ کەوتن وشکستی شێخ گەڕاندووەتەوە " ئەو بەهۆی مردنی کوڕی پاشاوە پایە و پرستیژی خۆی لەدەستدا ، ئەو گوتبووی کە چاکی دەکاتەوە و چارەنووسیشی لە قەدەری ئیلاهیدا کەشف کردووە .[٢٠٢]

[201] Weber , Theory of Social and Economic Organization , 360.

[202] Rich,I:320 .

## بەشی سێیەم : سەرکوتکردنی رژێمە نیمچە ئۆتۆنۆمەکانی کوردستان

**پێشینە:**

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا ، لاوازیی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بۆ هەمووان ئاشکرا بوو . هێزە ئەورووپییەکان هیچ دەرفەتێکیان بۆ سوودوەرگرتن لەو لاوازییە بۆ قازانجی خۆیان لەکیس نەدا ، هەروەها رەگەزە جیاوازەکانی نێو ئیمپراتۆرییەکەش هەستیان بە ئاوابوونی دەسەلاتی سەردارانیان دەکرد و کەوتبوونەخۆ. تورکان خۆیان بەناسۆرەوە لەو ئەهامەتییەیان دەروانی و لێی بەئاگابوون. لەو سالانەی دواییدا ، لاوازییەکە گەیشتبووە رادەیەك دەبوایە تورکان زیاتر لە جارێك لە نێوان کارەسات یاخود هێورکردنەوەی ترسنۆکانەی دۆست و دوژمنەکانیان لە هەردوو دەرەوە و ناوەوەی ئیمپراتۆرییەکە هەڵبژێرن .

بەلام تورکان خاوەن خەڵکانێکی خاوەن داب و ئەزموونێکی لەمێژینەی سەربازیی و فەرمانڕەوایەتیی چەندین سەدەیی بوون ، هێشتا تا ئەو رادەیە بە تەواویی بێبەهرە نەبوون لەو توانایای وەك نەتەوەیەك مسۆگەریی پێبەخشیبوون ، هەروەها پیاوانێکی بریاردەرەی بەهێز و بەتوانیان لە نێودا نەبڕابوو . سوڵتان مەحموودی دووەم ، وێڕای شکست و بێهودەیی کارە بەراییەکانی ، توانی چاکسازییەکی گشتیی مەدەنیی و سەربازیی بسەپێنێت و ئامانجیش لەوە ژیاندنەوەی ئیمپراتۆرییەکە و بەبەرداکردنەوەی گیانی مەزنێتی لەوەوپێشی بوو . یەك لە گرنگترین خاڵەکانی بەرنامە چاکسازییەکەی سوڵتان مەحموودی دووەم بریتیبوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئەو میرنشینە دەرەبەگایەتییە میرایەتییە بەهێزانەی (سەردارانی دۆڵەکان) کە نیشانەکانیان وەك رەعییەتێکی متمانەپێنەکراوی مەترسیدار تادەهات زێدەتر دەبوو .

لە دەیەی سێیەمی سەدەی نۆزدەیەمدا ، وادیێدەچوو سوڵتان مەحموودی دووەم بڕیاری سەرکوتکردنی رژێمە نیمچەئۆتۆنۆمە میرایەتییەکانی لە کوردستاندا دابێت . ئەمەش تەنیا هەوڵێك نەبوو بۆ تەمێکردنی یاخییبووان و گێڕانەوەی دەسەلاتی عوسمانیی . بەڵکو زیاتر هەوڵێکی شێلگیرانە بوو لەپێناو سەرلەنوێ داگیرکردنەوەی هەرێمەکانی ناوچەکە و سەپاندنی دەسەلاتی راستەوخۆی عوسمانیی بوو بەسەریاندا . لەسەر

بنەمای ئەو ئامانجەی دوایی ، رەشید محەممەد پاشای والی سیڤاس و سەدری ئەعزەمی پێشوو ،[1] بەهێزێکی مەزنەوە رەوانەی کوردستان کرا . عەلی رەزاپاشای والی بەغدا ،[2] هەروەها ئینجە بەیرەقدار محەممەدپاشا ،[3] کە هێزەکان لەکاتی پێویستدا بخەنە خزمەت رەشیدپاشا . پاش مردنی رەشیدپاشا ، ئەرکەکەی بەتەواویی خرایە ئەستۆی حافزپاشا[4] و ئەوانی دیکە کە بینیان چیدی لە کوردستان دەرەبەگێکی بەهێز نەماوە بەڕووی دەسەڵاتی سوڵتاندا بوەستێت .

رەشیدپاشا ، وەك ئامرازێکی هەڵبـژێردراو بـۆ سـەرکوتکردنی میرانـی کـورد چـەند دەسـتکەوتێکی بەدەسـت هێنـا . گرنگترینیـان ، بێگومـان ، بریتیبـوو لـە گـرتنی محەممەدپاشای میرمکۆرەی رەواندز و گواستنەوەی بۆ ئەستەمبوڵ ، ئەوەی کە یەکەمین و هـەروەها بەهێزترین میرانـی کورد بـوو کە دەسـەڵاتەکەی لەناوببرێت . هـەروەها وەك لـەو باسـەدا کـە دێـت دەیبینین ، رەشید محەممەدپاشا لـە مامەڵەکردنیدا لەگـەڵ فەرمانڕەوا بەهێزەکەی رەواندز زیاتر پەنا بۆ دیپلۆماسیی دەبات تا ئـەوەی ڕێگـەی شـەڕ و پێکدادان بگرێتەبەر .

دەسـتکەوتەکانی دیکـەی رەشیدپاشـا بریتیبـوو لـە کۆتـایی پێهێنـانی یاخیبوونەکـەی مـاردین،[5] سـەرکوتکردنی فیدراسیۆنی خێڵـەکانی میللیی لە ناوچـەی

---

[1] رەشید محەممەد پاشا ، کە بە رەگەز گورجییە ، پۆستی سەرعەسکەری رۆژهەڵاتیی سوپای عوسمانیی هەبوو ، هەروەها لە شەڕی قۆنیەدا لە ئۆکتۆبەری ١٨٣٢دا فەرماندەی گشتیی سوپای ئیمپراتۆریی بوو . لەو شەڕەدا تێکشکا و لەلایەن ئیبراهیم پاشای میسرەوە بە دیل گیرا . زکي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٤٦

[2] سوڵتان، حاجی محەممەد عەلی رەزای هەڵبژاردبوو کە بە رەگەز لاز بوو ، بۆئەوەی داودپاشای دوا فەرمانڕەوای مەملوکیی لە بەغدا پێ سەرکوت بکات ، ئەو لە ساڵی ١٨٣١ەوە تاکو ١٨٤٢ والی بەغدا بوو .

Longrigg, Stephen H. Iraq,Four Centuries Of Modern Iraq,264ff.

[3] محەممەدپاشای ناسراو بە ئینجەبەیرەقدار لە ساڵی ١٨٣٥تا مردنی لە ١٨٣٠دا والی بەغدا بوو Ibid.,283.

[4] حافز پاشای سەرعەسکەری سوپای عوسمانیی ، چەرکەسیی بوو . ئەو لە شەڕی (نەزیب) لە ژوونیەی ١٨٣٩دا فەرماندەی سوپای ئیمپراتۆریی بوو کە تێیدا ئیبراهیم پاشای میسر گورزێکی شکستهێنەری دیکەی لە سوپای عوسمانیی وەشاند زکي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٥١

[5] پاش بەزینی سوپای عوسمانیی لەسەردەستی میسرییەکان ، واپێدەچێت ماردین یەکەمین شار بێت دژی چاکسازییەکان راپەڕیبێت ، کە بە سەرچاوەی هەموو نەگبەتییەکان دادەنرێت راپەڕینەکە هەرزوو پاش شکستی

ژووری میسۆپۆتامیا ،[6] گرتن و گواستنەوەی سەرخێڵی شەممەر بۆ ئەستەمبوڵ ، تەمێکردنی ئێزیدییەکانی شەنگار و تورکومانەکانی تەلەعفەر ،[7] سەرپێدانەواندنی هەرێمی ساسۆن –مۆتکان ، ئەو ئەرکەی حافزپاشا سەرکەوتنی کۆتایی تێیدا بەدەستهێنا .

لەم هەرێمە چیاییە سەختەدا ، رەشیدپاشا دەبوو بەسەر هێزگەلی ژمارەیەك لە سەرخێڵە بەهێزەکانی کوردستاندا زاڵبێت . رەجەب بەگی هازۆ ، حوسێن ئاغای ئلیجە ، تەمر بەگی هاینی ، هەروەها میرزا ئاغای بانوکەی سەرخێڵی سلیڤانیی ، ئەمانە کەوتبوونە بەربەرەکانییەکی توند و راپێدەچوو لە لایەن رەعییەتە کورد و ئەرمەنییەکانیانەوە بە بڕواوە پشتگیریی بکرێن . دوای تێکشکاندنیان ، زۆربەی ئەم سەرخێڵانە بۆ ناوچەی ئەدرنە لەبەشە ئەورووپییەکەی تورکیا دوورخرانەوە.[8] رەشید محەمەدپاشا لەساڵی ١٨٣٦ دا[9] لە دیاربەکر بە کۆلێرا تێدا چوو . پاشان حافز محەمەدپاشا شوێنی گرتەوە ، ئەوەی لەنێو شتەکانی دیکەدا ، ئەرکی جێگیرکردنی ئارامیی تەواوی لەم ناوچەیە جێبەجێکرد . حافز پاشا هێرشی کردە سەر حاجی زیلان ئاغا ، کە دوا سەرکردەی بەهێز بوو لەم ناوچەیەدا مابۆوە و سەری پێدانەواند . هەروەها خێڵی خارزانیش تووشی هەمان چارەنووس بوون .[10]

قۆنیە روویدا ، ئەو شەڕەی لە ئۆکتۆبەری ١٨٣٢ قەوما.

Ainsworth, William . "Notes Taken on a Journey from Constantinople to Mousl , in 1839-1840." Journal of the Royal Geographical Society 10 ( 1841 ) :524.

[6] رەشیدپاشا لە ١٨٣٤دا پەلاماری کۆنفدراسیۆنی میللی دا .بڕوانە : Longrigg,Four Centuries,286.

[7] Ibid.,285.

[8] جێگەی سەرنجە تێبینیی ئەوە بکرێت کە دەگوترێت رەجەب بەگ ، حوسێن ئاغا هەروەها تەمیبەگ بە گشتیی لەگەڵ میرزا ئاغادا لە شەڕدا بوون . بەڵام وا دەردەکەوێت ناکۆکییەکانیان راگرتبێت و پێکەوە دژی سوپای عوسمانیی راوەستابێتن ئەرمەنییەکانیش کە هەمان پێگەی یەکسانیان لەگەڵ کورداندا هەبوو . هەواڵەکان دەڵێن زۆرباش جەنگاون پاش ئەوەی میرزا ئاغا کە بەهێزترینیان بوو ملکەچی پێشاندا ، بەگەکانی دیکەش سەریان دانەواند بۆ زیاتر : Brant .,385-60.

[9] زکي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٤٦.

[10] Brant .,376.

## دەرکەوتنی محەمەد پاشای رەواندز

بێگومان ، محەمەدپاشا بریتییە لە دیارترین نموونەی میرەکانی سۆران.[١١] سەبارەت بە پێشینەی ژیانی ئەم میرە بەرچاوە تا سەردەمی فراوانخوازییەکانی زۆر کەم دەزانرێت . ئەو لەساڵی ١١٩٨ک/١٧٨٣ز لە رەواندز لەدایك بووە ، زانیارییە سەرەتاییەکانی لەلای مەلا ئەحمەد ئەبین ئەنجام تەواوکردووە ، کە زانایەکی ئایینیی خۆماڵیی کوردی رێزلێگیراو بووە .[١٢] لە ساڵی ١٨١٤دا ، لە تەمەنی سی ویەك ساڵیدا و لە کاتێکدا مستەفابەگی باوکی لە ژیاندا ماوە ، شوێنی باوکی گرتۆتەوە .[١٣] ئەو راستییەی کە زیاتر هەواڵی چۆنێتیی بەدەسەڵاتگەیشتنی میر زەقدەکاتەوە . بەپێی هێندێك لێکدانەوەکان ، باوکە بەتەمەن و دووربینەکەی ، درکی بەوە کردبوو کە چیدی ناتوانێت ئەرکی گرانی بەڕێوەبردنی ئەو میرنشینە پڕگێرمە و کێشەیە لە ئەستۆی خۆیدا بهێڵێتەوە ، هەربۆیە داوای لە کوڕەکەی کرد کاروباری میرنشینەکە بگرێت دەست . بەگوێرەی سەرچاوەیەکی دیکە ، میر محەمەد باوکی ناچار کردووە بە قازانجی خۆی شوێنەکەی بەجێبهێڵێت .[١٤] ئەو گومانەی کە زۆر بەهێز بوو سەبارەت بەو تۆمەتەی کە میر محەمەد دڵڕەقانە چاوی باوکی کوێر کردبێت بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجەکەی ، تۆمەتێکی وا کە لە لایەن ئەو دکتۆرە بەریتانییەوە رەتکرایەوە کە سەردانی باوکە پیرەکەی میری کردووە .[١٥] بەوەش پرسی وازهێنانی ئارەزوومەندانەی مستەفابەگ لای

[11] محەمەد پاشا لەنێو کوردا بە (میرە کوێرە) یان (پاشا کوێرە) ناسراوە ئەو بەهۆی ئازاری ئاوساویی چاوێکییەوە دەیناڵاند ، هەربۆیە گونجاوە بە شێوە ئینگلیزییەکەی بە (یەك چاو) وەسفبکرێت

[12] الگوراني ، علي سيدو ، من عمان ال العمادية ، ١٣٠ ـ زكي ،محمد امين ، تاريخ الدول والامارات الكردية في العهد الاسلامي ، ٢٠٧

[13] الگوراني،١٣٠

[14] Fraser, Travels,1:64.

[15] دکتۆر رۆس ، پزیشکێکی بەریتانیی کە لە بەغدا نیشتەجێ بوو ، لە سەردانێکی بۆ قەڵای دوەدمی نزیك رەواندز، ئەو شوێنەی مستەفا پاشای لێدەژیا ، بینی کە ئەو پیرەمێردە بە شێوەیەکی سروشتی چاوی لەدەست داوە رۆس ئەوەی رەتکردۆتەوە کە میر بەهۆی میلەوە یاخود پێنووسی ئاسنینەوە چاوی باوکی کوێر کردبێت Ibid.,1:72.

هەمووان پەسەندە .[١٦]

خولیا و پەرۆشی ئەو میرە لاوە ، گیانی هێرش و پیاکێشانی ، بڕیاروەرگرتنی بەهێز و دەستبەجێی ، هەر زوو لە لایەن ئەوانەوە هەستی پێکرا کە لە بەدبەختیی خۆیاندا کەوتبوونە بەردەم ڕێگای شکۆمەندیی میر . ئەوانەی پێش هەرکەسێکی دیکە بەر چەپۆکی میر کەوتن بریتیبوون لە پیاوانی دەوروبەری ، کە لەنێویاندا خزمانی نزیکی خۆی بوون .[١٧] عەبدوڵڵا پاشای خەزنەدار کە پێشتر لەسەردەمی باوکی میردا ئەو کارەی پێسپێردرابوو و میر محەمەدیش لە شوێنەکەی خۆی هێشتبوویەوە ، تۆمەتی پیلانگێڕانی لەگەڵ مامەکانی میردا ، واتە تەمیرپاشا و یەحیا بەگ ، خرایە پاڵ و لەسێدارەدرا .[١٨] محەمەدپاشا لەپێناو تەمێکردنی مامەکانی و هەڵکوتانەسەریان هیچ کاتی بەفیڕۆ نەدا .

لەیەکەم ڕۆژی موحەرەمی ساڵی ١٢٣٠ک/١٤ی دیسەمبەری ١٨١٤ ، میر بەئامانجی لێدانی تەمەرخان بەگی مامی پەلاماری هاودێیانی دا ، ئەو مامەی کە بە پەلە خۆی لە نێو قەڵای شەیتانەدا توندکرد . پاش ئەوەی بۆ ماوەی چوارهەفتە لەبەرامبەر گەمارۆدا خۆڕاگریی نواند ، لە ١٠ی یەنایەری ١٨١٥ دا هێرشێکی وێرانکەر کرایە سەر قەڵاکە و لەنێو دیمەنی لاشەی کوژراوانێکی فرەدا ، تەمەرخان و محەمەدبەگی کوڕی دەستبەسەرکران و هەڵواسران . پاش ئەوەی میر بەم شێوەیە مامێکیانی فتکرد ، ئینجا ڕووی کردە ئەوەکەی تریان و هێرشی کردە سەر قەڵای سیدەکان کە یەحیابەگی مامی و

---

[16] وێڕای گێڕانەوەکەی فرێزەر، بڕوانە: الگورانی، ١٣٠ ،. زکي، تاریخ الدول،٤٠٦ ، زکي، خلاصة تاریخ الکرد،٢٤٨

Longrigg,Four Centuries,285.

[17] میر ئەوەندە بەدناوبوو کە هێندێک نووسەر لە چەندبارەکردنەوەی ئەو دەنگۆیانەی باس لە دڵڕەقیی میر لەحاست براکانی دەکەن سستیان نەنواندووە بەگوێرەی (شێڵ) ئەو لە سەروبەندی چوونە سەر تەختی میرایەتییدا جگە لە ڕەسوڵ بەگ ، تەواوی براکانی دی کوشتووە فرێزەر گوتوویەتی کە میر چوار برای هەن ، دووانیان تەمیرخان و سولەیمان بەگ . دەگوترێت کە کوێر و بەند کراون و لەیەک لە قەڵا دووردەستەکاندا زنجیرکراون . ئەحمەد بەگ وەک فەرمانداری هەولێر ڕازەی کردووە ، ڕەسوڵ بەگیش (دواتر پاشا) بەتوندیی بە میرەوە پەیوەست بووە و بەگشتیی وەک جێنشین دادەنرا

Scher, Addia, Episodes de l histoire du Kurdistan, 133;Fraser,1:72.

[18] الگورانی ، ١٣٠

عوسمان بەگی کوڕی خۆیان تێدا حەشاردابوو . پاش گرتنی قەڵاکە هەردووکیانی کوشت . هەر لە هەمان هەڵمەتیدا ، پەلاماری قەڵای ڕۆستی دا و فەرمانڕەواکەی کوشت [19].

پاش لەناوبردنی تێکڕای ئەو ناحەزە مەترسییدارانە ، دەسەڵاتی میر لەتەواوی ناوچەکەدا چەسپا ، بەوەش دەستی واڵا بوو تا ئاوڕ لە هاوسێ نزیکەکانی بداتەوە . ئەو هەستا بە پەلاماردان و ملکەچپێکردنی خێڵەکانی برادۆست ، شێروان ، سورچیی ، خۆشناو و مامش بەشێوەیەکی یەک بەدوا یەک . [20] چارمنووسی بەشێك لەو سەرخێڵەبەزیوانە ئەو ویستەی پێشاندا بۆ تێکشکاندنی تەواوی ئەوانەی دژایەتیی خواست و ئامانجەکانی میر محەمەد بوون . بەوەش ، وەك دەگوترێت ، ئەو سەرۆکەکانی میر ماهمالیی ، میر یوسفیی ، هەروەها پوشتگالیی کە سێ خێڵە سەرەکییەکەی کۆنفدراسیۆنی خۆشناون ، کوشتن . [21] بەهەمان شێوە ، دەگوترێت ئەو حەمزەئاغای سەرۆکی ناسراوی خێڵی مامشی کوشتووە . هەروەها زۆربەی سەرۆك بنەماڵە ناسراوەکانی ئاوارە و دەربەدەر کرد . [22]

---

[19] هەمان سەرچاوە

[20] زکي،خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٣،الگوراني،١٣١ ـ زكي، تاريخ الدول،٤١٢ ـ Longrigg,Four Centuries,288

[21] بەگوێرەی دوو نووسەر، ئەوەی سەرخێڵی ناسراوی میرمەهمالیی بەبەردەوامیی لەمەڕ کوشتنی عوسمان بەگی باپیریان لەلایەن میرەوە دراون . هەروەها هەڵگەڕانەوەی دواتری محەمەد بەگی کوڕی بۆ حکومەتی عوسمانیی لەوکاتەی عوسمان بەگ لەلایەن هێزەکانی ئیمپراتۆرییەوە هێرشی کرایەسەر الگوراني ، ٤٦،. العزاوي ،عباس ،عشائر العراق، ٢: ١٣٢.

[22] بەگوێرەی العزاوي ، محەمەد پاشا ، حەمزەئاغا و دوو کوڕ و هەردوو برا و چوار لە خزمەکانیشی کوشتووە مامەڵەی دڕندانەی میر لەگەڵ سەرخێڵی تێکشکاوی مامش لەلایەن فریزەرەوە بە ڕوونی باسکراوە ، کە خۆی ماوەیەکی کەم پاش ئەو ڕووداوە لەو ناوچەیە بووە . ئەو ئاماژەی بەوەداوە کە چل سەرۆکی مامش ، کە پاش پەرتەوازەکردنی خێڵەکەیان لە ڕەواندز زنجیرکرابوون ئامادەکارییان کرد بۆ ئەوەی دەرفەتی تەقینەوەی ئاڵۆزیی شارەکە بقۆزنەوە و هەڵبێن بەگوێرەی ئەو ، زۆربەی ئەوانە و هاوکارەکانیان گیران و ڕەوانەی مەرگ کران

Fraser,Travels,1:102; Rawlinson, H.C, Note on a Journy from Tabriz .Through Persian Kurdistan , to the Runis of Takhti-Soleiman, 32.

وادەربەکەوت محەمەدپاشا بڕیاری دابێت کە تەواویی ئەو هەرێمانەی کەوتوونەتە نێوان هەردوو زێوە ، هەر لە دیجلەوە بۆ سنووری ئێران بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە . لەچوارچێوەی بەدیهێنانی ئەم ئامانجەدا ، نەیدەتوانی خۆی لە پێکدادان لەگەڵ بابەنییەکاندا ، کەتەنیا هێزی دەرەکیی بوون لە ناوچەکەدا ، ببوێرێت . لەساڵی ١٨٢٢ دا حەریری کۆنە پایتەختی میرنشینی سۆرانی داگیرکرد و فەرمانڕەوا بابانییەکەی دەرپەڕاند . هەمان چارەنووسیشی لە ئۆکتۆبەری ١٨٢٣ دا کردە بەشی کۆیسنجەق و هەروەها رانیەش لە فێبرایەری ١٨٢٤ دا .هەروەها هەولێر و ئالتون کۆپریش لە سێپتامبەری ١٨٢٣ دا کەوتنە بندەستی میر . ئەم فراوانخوازییانە بوونە هۆی ئەوەی کە زێی بچووك ببێتە سنووری نێوان قەڵەمڕەوی میر و میرنشینی بابان ، هەروەك پێشتر وابوو . عەلی رەزاپاشای والی بەغدا کە لە هەلومەرجێکی وادا نەبوو بە رووی میردا بوەستێت ، بەناچاریی دانی بە فراوانخوازییەکانی میردا نا و نازناوی پاشاشی پێبەخشی .[23]

## هێرش و پەلامارەکانی محەمەدپاشای رەواندز

### پەلامارەدانی ئێزیدییەکان

دووەمین قۆناغی کارەکانی میر لەگەڵ پەلاماردان و تالانکردنی هەرێمی زێی گەورە دەستپێدەکات کە هەڵمەتێکی تەمێکارانە بوو دژی ئێزیدییەکانی شێخان . ئەو هەڵمەتەی کە دەگوترێت لە ئاکامی کوشتنی عەلی ئاغای باڵتی ، سەرۆکی ئەلقوشی کە خێڵێکی سەر بە عەشیرەتی مزوورییە ، لەلایەن عەلی بەگی میری ئێزیدییەکانەوە بوو .

ئێزیدیی و مزوورییەکان لە مێژەوە دوژمنایەتییان لە نێواندا بووە ، سەرکردەکانیشیان وەك دوژمنی سەرسەختی یەکدی دەناسران . رۆژێکیان عەلی بەگ نامەیەکی بۆ عەلی ئاغا نووسیبوو ، تێیدا خواستی خۆی بۆ هێنانەدی ئاشتیی و دۆستایەتیی دەربڕیبوو ، هەروەها بانگیشی کردبوو کە لەکاتی خەتەنەسورانی کوڕەکەیدا وەك (کریڤ)[24] بەشداربێت . سەرۆکی مزووریی بە ئەرێ وەڵامی عەلی بەگی

---

[23] . Longrigg,Four Centuries.285; زکي،خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٢ ،الكوراني، ١٣١ .

[24] لای ئێزیدییەکان (کریڤ) ئەو کەسەیە سەرپەرشتیی بۆنەی خەتەنەکردنەکە بکات ئەو لەوکاتی

دابووەوە ، پاش چەند رۆژێك و بە هاوەڵی چەند پاسەوانێکی، گەیشتبوونە بارەگای میری ئێزیدیی لە باعەدرێ .[25] سەردانەکەی عەلی ئاغا لە گەڵ چەند سوارێکی کەمی پاسەوانەکانیدا هەڵقوڵاوی متمانەی بووە بە خانەخوێکەی یاخود لەسۆنگەی سوکایەتییکردنی بووە ، مەسەلەیەکە هێشتا بە تەواویی دیار نیە .[26] هەرچییەك هانیدابێت کارێکی وا بکات ، مەسەلەکە بە ماڵوێرانی کۆتاییهات. میری ئێزیدیی کە کۆنەدوژمنەکەی خۆی بەو شێوەیە لە سایەی بەزەیی خۆیدا بینی ، نامەردانە کوشتی . پاشان بانگی چل سەرتیرەی ئێزیدیی کرد تا خەنجەری خۆیان لە لاشەی سەرخێڵی مزووریی گیرکەن بۆ ئەوەی تەواوی خەڵکی ئێزیدیی لەو کوشتنەدا بەشدار و بەرپرس بن.[27]

بۆ ماوەیەك ، وا دەهاتە پێش چاو کە جەنگێکی خێڵەکی بەرفراوان هەڵبگیرسێت .مزوورییە خێڵەکییەکان هەر هێندەی هەواڵی کوشتنەکەیان بیست وروژان و ئاژاوەی کەللەیی بوون توڕەبوون و بۆ ئەنجامدانی پەلامارێکی گەورە بۆ سەر باعەدرێ

---

خەتەنەکردنەکەدا منداڵەکە لە باوەش دەگرێت ، کە زۆربەی کات سەرتاشێك کاری خەتەنەکە ئەنجامدەدات  ئەو پەیوەندییەی کە دروست دەبێت پێی دەڵێن (کریڤخوێنیی) ، کریڤخوێنیی پەیوەندییەکی پتەو لەنێوان هەردوو بنەماڵەی کریڤ و منداڵە خەتەنەکراوەکەدا پێکدەهێنێت . ئێزیدییەکان بایەخێکی مەزن بەم پەیوەندییە دەدەن و بەوردیی چاودێری پەرەسەندنی ئەو پەیوەندییە دەکەن . ئەو دوو بنەماڵەیەی لەو رێگەیەوە پەیوەندیی دروست دەکەن چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت لەکاتی تەنگانەدا بەدەم یەکترەوە دەچن و ئابڕووی ئافرەتەکانی یەکتری دەپارێزن و لە رووی داراییشەوە کاتی پێویست هاوکاریی یەکتری دەکەن .دەگونجێت کریڤخوێنیی لەنێوان ئێزیدییەك و غەیرە ئێزیدییەکدا یاخود لەنێوان دوو ئێزیدییدا پێکبێت  ئەمە تەنیا رێگەیەکە دەرەوە بتوانێت تێکەڵ بە ئێزیدییەکان بێت ، ئەوەش تەنیا رێگەیە بۆ چوونە ژوورەوەی کۆمەڵگای توند داخراوی ئێزیدییەکان کریڤخوێنیی پەیوەندییەك دێنێتە ئارا کە تێیدا لەمپەر دەخاتە نێوان ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیریی لەنێوان ئەندامانی هەردوو بنەماڵەکەدا کە دەگونجێت هێندێك جار بۆ پێنج پشت یان پتر بەردەوام بێت . بڕوانە :

دملوجي ، اليزيدية ، ٦٤،٦٨ Jaba ,Alexander.,Dictionnaire Kurdo-Francais,310

[25] دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٣ ،. دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦١.

[26] بەگوێرەی دملوجی . سەرۆکی مزووریی لە بێئاگایی و کەمتەرخەمییەوە ئەو ژمارە کەمە پاسەوانەی لەگەڵ خۆی بردووە  دملوجي . امارة بهدينان، ٤٣ .

[27] دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦١ ،. دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٣

کۆبوونەوە. هەمان کات ، ژمارەیەکی زۆر لە رەوەندە ئێزیدییەکان روویان لە بارەگای میری ئێزیدییان کرد و پێشبینیی هێرشی مزورییەکانیان کرد.[28] ئەو کێشەیە لەئاکامی نارەزایەتیی پاشای ئامێدیی بە جۆرێکی دیکەدا کەوتەوەو هێرشی مزورییەکان ئەنجامنەدرا . ئەم پاشایە وەک میری بادینان و خاوەن لوتکەی دەسەلات ، فەرمانی بەسەر خێڵەکانی مزوریی و ئێزیدییدا دەڕۆیشت .بەکەمگرتن و پێشێلکردنی خواستی کەسێکی بەو هێز و دەسەلاتە نەدەتوانرا بێسزادان تێپەڕێت . سەرباری ئەوەش مزورییەکان بێگومان لەوە دەترسان کە بەهەند وەرنەگرتنی ئارەزووی میری بادینان ، کە بۆ خۆی گومانی بەشداری تاوانی کوشتنەکەی عەلی ئاغای لێدەکرا ، دەگونجێت ببێتە هۆی ئەوەی هێزەکانی میری بادینان لەپشتەوە پەلاماریان بدەن .

تکای مەلا یەحیای مزوریی ، کە پیاوێکی ئایینیی رێزدار و ئامۆزا یاخود برازای سەرۆکە کوژراوەکە بوو ، نەیتوانی میری بادینان بجولێنێت . میر سەبارەت بە پاساوی بڕیارنەدانی کارێکی تەمێکارانە دژی ئێزیدییەکان ، لۆمەی عەلی ئاغای کردووە کەوا ساکارانە ئامادەبووە داوای میری ئێزیدییەکان پەسەند بکات و بێبوونی هێزێکی پاسەوانیی گونجاو سەردانی دوژمنەکەی کردووە و چۆتە ناوچەکەیان .[29] دەگوترێت بە ناکامیی و تووڕەیی ئامێدی بەجێهێشتووە و بڕیاری تۆڵەسەندنەوەی خزمەکەی داوە . مەلایەحیا ئەوەندە پیاوێکی لێزان و لەسەر بڕیاری خۆی پێداگر بوو ، زۆری نەخایاند توانی رێگا بۆ شەپۆلێکی توندوتیژیی و ئاژاوە خۆشبکات کە تەواوی هەرێمی بادینانی لەنێو مردن و وێرانییدا نغرۆکرد، ئەوەش بووە هۆی لێخستنی بنەماڵەی فەرمانڕەوا میرایەتگرەکەی میرنشینەکە و پاکتاوکردنی ئێزیدییەکانی شێخان .

سەبارەت بەو شێوازەی مەلا یەحیا ئامانجەکەی پێهێناوەتەدی قسەی جۆراوجۆر هەن . بەگوێرەی هەواڵێک ، مەلا توانیویەتی یارمەتی والی بەغدا بەدەستبهێنێت . پاش ئەوەی والی گوێ لە دەردەدڵی مەلا دەگرێت و بەنامەیەکەوە رەوانەی میری رەواندزی دەکات . دەگوترێت والی بەغدا لە نامەکەیدا داوای لە محەمەد پاشا کردووە هێزێک بنێرێتە سەر ئێزیدییەکان تا تۆڵەی ئەو بەدکارییەیان لێبسێنێت

---

[28] دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٢ ، دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٤

[29] دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٤ ، دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٢

. [٣٠] بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە مەلایەحیا لەسۆنگەی ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی بە میری ڕەواندزەوە ڕاستەوخۆ خۆی چۆتەلای و پەیوەندیی پێوەکردووە. [٣١] ڕاستیی بابەتەکە هەرچییەك بێت ، ئەو چاوتێبڕین و خولیایەی میری کۆرە بوو لە ترۆپکی توانا و دەسەڵاتیدا ،کە سەلماندی بۆتە ئامرازی تۆڵە سەندنەوە .

باس لەوە دەکرێت کە لەکاتی چاوپێکەوتنی محەمەدپاشادا ، مەلایەحیا ئەوپەڕی بێزاریی تاڵی خۆی سەبارەت بەکوشتنی نامەردانەی خزمەکەی بەدەستی میری ئێزدییانی شێخان دەربڕیوە و باسی لەو ئازار و نەهامەتییەکردووە کە ڕۆژانە خەڵکانی موسوڵمانی بادینان بەدەست ئێزدییەکانەوە دەیچێژن .دەگوترێت کە تکای لە پاشا کردووە موسوڵمانان لە ستەمی ئێزدییە سەرکوتکەرەکانیان بپارێزێت . مەلایەحیا جەختی لەو ڕاستییە کردەوە کە میرانی بادینان لاواز و پەرپووتن و ئەوەش تەواو ئاشکرای کرد کە میرنشینەکەی بادینان لە قۆناغی هەڵوەشاندنەوەدایە هەروەك میوەیەکی گەییو چاوەڕێی چنینە . [٣٢] ئەو تکایەی مەلایەحیا لە محەمەدپاشا لێزانانە بۆ جوڵاندنی گیانی بەرزەفڕیی و ئومێدنەنگێزی بوو ، تکایەك سۆزی ئایینیی و هەروەها گیانی سامانخوازیی و چاوتێبڕینی میری وورووژاند .

داخۆ محەمەدپاشا هەر لەبنەڕەتەوە لە ئەنجامی تکای مەلایەحیا بۆ یارمەتی و تۆڵەسەندنەوە کەوتۆتەخۆ یاخود پەژارەکەی مەلای وەك بیانوویەکی گونجاو بۆ پەلاماردانی هەرێمی بادینان قۆزتۆتەوە ، مەسەلەیەکە هیچ کات بە تەواویی روون نەبۆتەوە . خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە محەمەدپاشا بڕیاری پەلاماردانی ئێزدییەکانی دا ، بۆئەوەی بەرگێکی ئایینیی بە بەری هێرشەکەیدا بکات ، داوای لە مەلامحەمەدی خەتێی موفتییەکەی خۆی کرد فتوایەك دەربکات و جیهادی تێدا رابگەیەنێت . [٣٣]

محەمەدپاشا لە لەساڵی ١٨٣١ دا سەرکردایەتیی هێزێکی مەزنی کرد و لە

---

[30] دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٢ ـ دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٤ -٤٥

[31] دەگوترێت مەلا یەحیا میری ڕەواندزی باش لەهەلومەرجە شلۆقەکەی میرنشینی بادینان ئاگادار کردۆتەوە و هانی داوە داگیری بکات ، ، دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٤ ،.دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٢.

[32] دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٢ ،. دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٤

[33] بەگوێرەی دملوجي ، ئەوەی لەوبارەیەوە فەتواکەی دەرکردووە هەر مەلایەحیا خۆی بووە

دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٤ ، دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٢ ،. زكي،خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٣ ،الگوراني، ٦٠

گوندی کەڵەکەوە[34] لە زێی گەورە پەڕییەوە.[35] پاش ئەوەی دانیشتووانی ئێزیدیی ئەم گوندەی دایە بەر نێزە ، ئینجا بەرەو باکوور کشا . تەواویی دانیشتووانی ئێزیدیی ناوچە بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی موسڵی ، هەر لە زێی گەورەوە بۆ ڕووباری خاپور ، لە ئاگروخوێندا گەوزاند . هەزارەها پیاو ، ژن و منداڵ گیران و سەربڕدران . هەروەها کۆمەڵگەیەکی گەورەی ئەو ناوچەیە گسکی لێدرا . ژمارەیەک لەو ئێزیدییانەی بەختیان هەبوو پەنایان بردبووە بەر دارستانەکان و هەڵاتبوونە ناوچە شاخاوییە سەختەکان و هێندێک لەوانە زوو فریای ڕاکردن کەوتبوون گەیشتبوونە ناوچە دوورەکانی تۆرعابدین ، چیای جودی ،هەروەها چیای شەنگار.[36] ژمارەیەکی زۆر لەوانەی زارەترەک بوون و لەهەوڵی ئەوەدا بوون بە ئاراستەی موسڵ لەدەست هێرشبەرەکان هەڵبێن ، کاتێک گەیشتنە پردەکە لەو شوێنەدا پچڕابوو ، هەربۆیە گیران و لە کۆینجیک ، کە دەکەوێتە کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلە و بەرامبەر موسڵە ،[37] کۆکوژکران [38] .گومانی تێدا نیە ئەو زیانەی تووشی ئێزدییەکان بوو تۆقێنەر بوو .[39] تەنیا زیندووانێک ، جگە لەوانەی

---

[34] ئەم گوندە بە (کەڵەکی ئەلدەواسین) یش ناودەبرێت العزاوي بە (یاسین کەڵەك) ناوی بردووە دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٣ .، دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٥ ـ العزاوي ، عشائر العراق ، ٢: ١٣

[35] مێژووی ئەم ڕووداوە بەشێوەیەکی جیاواز وەك لای خوارەوە دراوە : دملوجي لە (امارة بهدينان، ٤٥)دا ساڵی ١٢٤٧ك ١٨٣١ز داوە ، بەڵام لە ( اليزيدية ، ٤٦٣ ) دەڵێت لەسەرەتای پاییزی ١٢٤٨ك ١٨٣٢دا بووە . زکي لە (خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٣)دا دەڵێت لە ١٢٤٧ك ١٨٣١دا بووە سليمان الصائغ لە (تاريخ الموصل ،١: ٣٠٦)دا ساڵی ١٢٤٧ك ١٨٣١ز داوە . الگوراني،١٣٢ ش هەروەها بەڵام شێر ٩ی مارتی ١٨٣٢ی داناوە

[36] سليمان الصائغ ،تاريخ الموصل ،١: ٣٠٧ .، زکي، خلاصة تاريخ الكرد ،٢٤٤.

[37] کۆینجیك کومەڵە گردێکی پانە بە داروپەردووە دێرینەکانی نەینەوا سنووردارە ، ئەم ناوە لەبنەڕەتدا تورکییە و بەمانای (بەرخە) ، بەگوێرەی ویگرام و ویگرام ، وشەکە لە (قەسابخانەی مەڕ)ەوە هاتووە ، دەگونجێت مەبەست لێی ئەو کۆمەڵکوژییە بێت کە لەو شوێنەدا دەرحەق بە ئێزیدییەکان کراوە .Wigram and Wigram,122

[38] بەگوێرەی لایارد پردەکە بەهۆی لافاوەوە لادرابوو ، بەڵام نووسەری دیکە دەڵێن سەعید پاشای والی موسڵ بە ئەنقەست و لەترسی هێزەکانی ڕەواندز پردەکەی لابردووە .Layard, Nineveh, 1:229 ؛ الصائغ ،١: ٣٠٧ ؛ زکي، خلاصة تاريخ الكرد ،٢٤٤ ، دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٣

[39] یەك لە سەرچاوەکان تا ئەو ڕادەیە زێدەڕۆیی لە زیانی ئێزیدییەکاندا کردووە و گوتوویەتی کە تەنیا پێنج لە سەدی دانیشتووانی ئێزیدیی کە سەدهەزار بوون لەو کۆمەڵکوژییەدا گیانیان دەرکردووە.دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٣.

**هەڵاتبوون ، ئەو ئافرەتانە بوون ، وەك سەدیق دملوجی دەڵێت ، كە بەپێی جوانییان بەسەر پەلاماردەراندا دابەشكران .[40]**

**هەرچەندە ئێزیدییەكان زۆریان چێشت ، بەڵام ئەوان یەكەمینی ئەو گروپانە بوون تووشی ئەهامەتیی بوون .كۆمەڵگەی كریستیانییش كە كەوتبوونە سەرە ڕێگای سوپاكەی میر ، یاخود لە دەوروبەری ئەو ناوچانەدا بوون كە هێرشیان كرابووە سەر ، تووشی كۆمەڵكوژیی و تاڵانكردن بوونەوە .گوندی ئەلقوش تاڵانكرا وزۆربەی دانیشتووانەكەشی كوژران .[41] مەزنە كڵێساكەی رەبان هورمز كە لە نزیك ئەو ناوچەیە تاڵانكرا و قەشە گابریل دامبۆ كوژرا . بڕێكی زۆر دەستنووسی كۆن لەنێوبران یان ونبوون و دەستنەكەوتەوە .[42] كڵێساكەی شیاك مەتاشیش تووشی هەمان چارەنووس بووەوە .[43]**

**چارەنووسی عەلی بەگی میری ئێزیدییانی شێخان دەتوانرێت بەچەند وشەیەك بگوترێت . هەروەك (ئەدای شێر) دەڵێت :لەلایەن محەمەدپاشاوە بەدیل گیراوە و رەوانەی رەواندز كراوە ، پاش ئەوەی لەوێ ئامادە نەبوو ببێتە موسوڵمان ، كوشتیان .[44] سەدیق دملوجی نووسیویەتی ، پێش ئەوەی هێزە پەلاماردەرەكانی رەواندز پێشڕەویی بكەن ، عەلی بەگ هەڵاتۆتە چیاكانی ئاكرێ و خۆی لەوێ حەشارداوە ، بەڵام دوای چەند ساڵێك لەلایەن ئینجە بەیرەقدار محەمەد پاشای والی موسڵەوە گیراوە و هێناویەتی لە شوێنێكدا**

---

[40] دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٥. وادەردەكەوێت گرتن و فرۆشتنی ئێزیدییەكان پاش ئەم ڕووداوانە بووبێتە شتێكی باو ، ئێمە لە لایاردەوە دەزانین كە (سێر ستراتفۆرد كانین) ی باڵیۆزی بەریتانیی لە قوستەنتینییە دەسەڵاتی خۆی لەلای كاربەدەستانی عوسمانیی بەكارهێناوە بۆ ئەوەی فرۆشتنی ئێزیدییە گیراوەكان كۆتایی پێ بهێنرێت .
Layard, Nineveh, 1:203ff; Layard, Discoveries, 4.

[41] بەگوێرەی (شێر) ١٧٢ كەس كوژراون ، ژن ومندال و غەریبە نەژمێردراون . ڕۆژی پەلامارەكەش ١٥ی مارتی ١٨٣٢ . دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٣ .. Scher,134

[42] Scher,134; Badger, George percy. The Nestorians and their Rituals, with the Narrative of a Mission to Mesopotamia and Coordistan 1842-1844, and a Late visit of Those Countries in 1850.2 Vol. London: J.Mastres, 1852,1:265; الصائغ ،١: ٢٠٧

[43] Badger, 1:265; Bar Hebraeus,1:lix

[44] Scher,134 and n.3.

که به کفر محەمەد عەرەب ناسراوە و لەسەر رووباری گۆملە سەری پەڕاندووە .[٤٥]

## هێرشکردنە سەر میرنشینی بادینان و رووخاندنی

قەڵتوبڕکردنی ئێزیدییەکان ئەنجامدرا ، وێڕای ئەوەی لەسایەی میری بادیناندا بوون . ئەو کارە نە لەلایەن ئەو میرە و نە لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە کە مەزنی هەمووان بوو دژایەتیی نەکرا . ئینجا محەمەدپاشا رووی هێزەکانی کردە ئاکرێ کە پاوانێکی میرنشینی بادینان بوو . پاش چەند رۆژێکیی کەم گەمارۆدان ، قەڵای ئاکرێ کە بە سەختترین قەڵا لەقەڵەم دەدرا ، کەوتەدەست گەمارۆدەران ، میرە فەرمانڕەواکەی کە ئیسماعیل پاشا بوو ناچار بە هەڵاتن کرا .[٤٦] هەرچەندە کوردانی زێباریی بەتوندیی دژی داگیرکاریی سۆرانییەکان بەرگرییانکرد . گیانی تورەیی و تاڵی داگیرکاریی ، بەڵام ئەچەمینی زێبارییەکان بە روونی لە هەڵوێستی چەلەنگیی زێبارییان و ئەو سووکایەتییەی بە دوژمنەکەیان کرد دەردەکەوێت . یەك لەو زێبارییانەی گوندی سوات ، کە داوای لێکرا ملکەچیی لەمەمبەر میردا بنوێنێت ، وەڵامێکی سووکایەتیی ئامێزی بە میر دایەوە ...[٤٧]

ئینجا محەمەدپاشا بەرەو ئامێدی پایتەختی میرنشینەکەی بادینان کشا ، گرتنی ئامێدیی و هەڵاتنی سەعیدپاشای فەرمانڕەوای . محەمەدپاشای کردە دەسەڵاتداری تەواوی ناوچەکە ، هەر لە زێی گەورەوە تا رووباری خاپوور ، بە دوو ناوەندە بایەخدارەکەشییەوە : دهۆك و زاخۆ .[٤٨] پاش گرتنی ئامێدیی و هەڵاتنی سەعیدپاشا ، محەمەدپاشا ، موساپاشای کردە فەرمانڕەوای پایتەختی بادینان ، موساپاشا کە خزمی سەعیدپاشا بوو ، پەیوەندییەکی خراپی لەگەڵ ناوبراودا هەبوو ،

---

[٤٥] دملوجی دەڵێت ، بەگوێرەی ساڵنامەی ساڵی ١٣١٣کۆچیی ویلایەتی موسڵ ، عەلی بەگ و ژمارەیەکی دی لە سەرخێڵەکانی کورد بەو چەشنە کوژراون کە باسکراوە . ئەو ساڵی ١٨٢٨ بە بەرواری کوشتنی عەلی بەگ داناوە.
دملوجي ، اليزيدية ، ٤٦٤ ، ٤٦٨-٦٩

[٤٦] Longrigg. Four Centuries.286; ٣٠٧ :١، الصائغ ،.٤٦دملوجي ، امارة بهدينان

[47] Basile Nikitine ,"Rawandis-Ruiyndiz," Encyclopaedia of Islam,1st ed .,6:913-14.

[48] Longrigg. Four Centuries,286;٤٦،دملوجي ، امارة بهدينان

هەربۆیە هاوکارییەکی بەنرخی محەمەدپاشای لەهێرشەکەیدا بۆ سەر ئامێدیی کرد .[49]

محەمەدپاشا بەهۆی ئەو توانا داگیرکارییەی کە لەبەر دەستیدا بوو ، واپێدەچوو نەتوانێت جڵەوی سەرەڕۆیی و فراوانخوازیی خۆی بەدەستەوە بگرێت . ئامانجی داهاتووی بریتیبوو لە داگیرکردنی میرنشینی بۆتان کە ناوچەیەکی سەختە و دەکەوتە باکووری ناوچەی بادینانەوە . ئەو بەرەو جەزیرەی ئبن عومەر کشا و بێ گرفتێکی ئەوتۆ داگیری کرد ، بەوەش خۆی لەبەرامبەر فەرمانڕەوا بەهێزەکەی کە میر بەدرخان بۆتانە ، بینییەوە .ئینجا میرمحەمەد بە ئاراستەی باکوور هێرشی برد . ترس و تۆقاندنی لەنێو بەرگریکەرانی حەسنکێف بڵاوکردەوە هەروەها هەردوو شاری نسێبین و ماردینیشی خستە مەترسییەوە .[50] دواتر گەمارۆی خستە سەر ئازیخ ، بەڵام نەیتوانی بیگرێت ، ئەویش بەشێکی بەهۆی بەرهەڵستی توندی دانیشتووانەکەی و بەشەکەی تریشی بەهۆی پەرەسەندنی ئاژاوە لە ئامێدیی .[51] میر ناچار بوو فراوانخوازییەکەی لەو ناوچەیەدا رابگرێت بەپەلە بگەڕێتەوە سەر شارە یاخیبووەکە ، ئەوەی سەعیدبەگی کۆنە فەرمانڕەواکەی ، بەیارمەتی دانیشتووانەکەی راپەڕیبوون و موسابەگی فەرمانڕەوایان لێخستبوو و ناچاریانکردبوو هەڵبێت .[52]

محەمەدپاشا گەمارۆی ئامێدیی دا ، پاش شەڕ و بەرگرییەکی کەمی دانیشتووانە بێهیواکە ، توانی گەمارۆی توندی سەر هێزەپارێزەرە گەمارۆدراوەکانی شارەکە لابەرێت و جارێکی دیکە دەستی بەسەر ئامێدییدا گرتەوە . پاشای شێتگیر رق‌وتۆڵەی خۆی بەدانیشتووانی شارەکە رشت . زۆربەی مەزنەپیاوانی شاری کوشت و بەشێکی گەورەی خەڵکی شارەکەش بەدەردی برسێتیی و رشانەوە فەوتان .[53]

ئەمجارە پاشا بێنەوەی بچووکترین بایەخێک بە هەستی دانیشتووانەکە بدات

---

[49] الصائغ ، ۱: ۳۰۹ .، زکي ، خلاصة تاريخ الكرد

[50] Longrigg. Four Centuries.286; زکي ، خلاصة تاريخ الكرد،۲٤٥.، دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٦

[51] الصائغ ،۱: ۳۰۷

[52] زکي ، خلاصة تاريخ الكرد،۲٤٥.، الصائغ ،۱: ۳۰۹

[53] گرانت کە وا رێکەوتووە ماوەیەکی کەم پاش ئەو رووداوانە لە ئامێدیی بووە ، باس لەو حاڵەتە وێرانەییە دەکات کە شارەکەی تێدا بووە بەگوێرەی ئەو ، لەو ۱۰۰۰ماڵەی رووبەکی قەشەنگی بەرەواندزی کورد دابوو ، تەنیا ۲۵۰ یان بە پێوە مابوو . بڕوانە : Grant, Ashahl. The Nestorians Or , The Lost Tribes,60-61.

تەولویی ناوچەکەی بە میرایەتیی رەواندزەوە بەستەوە و رەسوڵبەگی برای لەجیاتی میرە بادینییە رەتکراوەکە واتە موساپاشا ، دانا .[54] بەم کارەش محەمەدپاشا کۆتایی بە میرایەتیی بادینانی خاوەن مێژووی چەندین سەدە هێنا . هەرچەندە ئیسماعیل پاشا ، دوا میری بادینان ، توانی پاش کەوتنی میر محەمەد پاشا بگەڕێتەوە بۆ ئامێدیی ، بەڵام زۆری نەخایاند لە لایەن حکومەتی عوسمانییەوە لێدرا .

## کەوتنی محەمەدپاشای رەواندز

ئەمێستا محەمەدپاشا بەخێرایی لە چارەنووسی خۆی نزیک دەبێتەوە ، حکومەتی عوسمانیی کە تا ئەوکاتە بێبایەخییەکی سەیری لەهەمبەر چالاکییەکانی ئەم فراوانخوارە کوردە پێشاندەدا ، ئەمێستا دەستی کردووە بەوەی کە بە تەواویی لەحاست سەرکەوتنە بێشکستەکان و بڵندپەروازیی و چاوبرسێتی ئەو میرە بەئاگا بێتەوە .ئێومرۆکی مەزنی پێشڕەویی بێناستەنگی میر ئەوەندە ئاشکرایە ناکرێت لەوەزیاتر پشتگوێ بخرێت . بەتایبەت کە سەرنج دژی ئەوە بوو کە لەبەشەکەی دیکەی ئیمپراتۆرییەکەدا روویدەدا .

حکومەتی عوسمانیی ناچاربوو بۆ بەرەنگاریی هەڕەشەی پەرەسەندووی محەمەد عەلی پاشای میسر بەسەر کەموکورتیی و دوودڵییەکانیدا زاڵبێت . تێکۆشان دژی بنەماڵەی فەرمانڕەوای میسر ، بێگومان پێویستی بەوەگەڕخستنی تەواوی هێزوتوانای حکومەتی سوڵتان هەیە . هەرچەندە سەرقاڵبوونی عوسمانیی بە هەڕەشەی محەمەد علییەوە مانای لاوازیی ئاگایی دەوڵەتی لەهەمبەر مەترسییە راستەقینە پەرەسەندووەکەی تری نەدەگەیاند . ئەگەر شتێك هەبێت ، ئەوەیە ، تێکۆشان دژی محەمەد عەلی دەوڵەتی عوسمانیی لەمەڕ مەترسیی خواستە فراوانخوازییەکانی بەئاگاهێنا و بووە هۆی پتەوبوونی پێداگریی و ویستی دەوڵەت تا شێلگیرانەتر مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە کێشانەدا بکات . سەرباری ئەوەش ، چاکسازییەکان و سیاسەتی نوێی سوڵتان مەحموودی دووەم ، بەڵگەی روونی خواستی حکومەتی ناوەندییان سەبارەت بە کۆتاییپێهێنانی خواستی فراوانخوازیی یەك بەدوا یەکی فەرمانڕەوا هەرێمییەکان

---

[54] الصائغ ،١: ٣٠٩ .. زكي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٤ .

خستەبەرچاو .کاتەکە بەخێرایی لەوە نزیک دەبووەوە دەوڵەت لە حاڵەتێکی وادا خۆی ببینێتەوە کە لەدەست:دەرەبەگەکانی ئەنەدۆڵ ، میرەمیراتگرەکانی کوردستان ، مەمالیکە نیمچەسەربەخۆکانی بەغدا ، میری لوبنان ، هەروەها پاشای عەکا رزگاری بووە .

دەگوترێت محەمەدپاشای رەواندز پەیوەندیی بە ئیبراهیم پاشاوە هەبووە کە کوڕی محەمەد عەلی میسر و هەروەها سەرکردەی سەربازیی بەناوبانگی هێزەکانی بووە ، بێگومان ئەم پەیوەندییە بە ئامانجی هەماهەنگیی کارە جەنگییەکانیان دژی دەوڵەتی عوسمانیی بووە .[55] ئەگەر ئەمە راستبێت ، هەر ئەم پەیوەندییە بوو کە بووە هۆی خێراکردنی پرۆسەی لێدان و خستنی میری رەواندز.

لەساڵی ١٨٣٤ ، رەشید محەمەدپاشای سەرکردەی عوسمانیی بەهێزێکی مەزنەوە لە باکووری میسۆپۆتامیا دا دەرکەوت . رەشیدپاشا کە پێشتر سەدری ئەعزەم بوو و دواتریش کرابووە والی سیواس ، ئەمێستا ئەرکی سەرکوتکردنی ئەو میرە کوردەی پێسپێردراوە ، رووەو باشوور بە درێژایی رێگای شەنگار-تەلەعفەر پێشرەویی کرد و لەهەردوو ناوچەکە رەگەزە یاخیبووەکانی داپڵۆسی . دوای ئەوە لە ئاسکی موسڵەوە لە دیجلە پەڕییەوە ، گەیشتە وڵاتی سۆران و لە دەشتی هەریر بارگەی خست . لێرەش دوو ستوونی بەهێزی پێوە پەیوەست بوون ، یەکێکیان لەلایەن ئینجە بەیرەقدار محەمەدپاشای والی موسڵەوە و ئەوی دیکەش لەلایەن عەلی رەزاپاشای والی بەغداوە سەرکردایەتیی دەکرا .[56]

پاشا کوردەکەی رەواندز تەواوی هێزەکانی خۆی بۆ پشتی گەرووی رەواندز کێشابووەوە ، ئەم کارەی وا دەردەکەوت بە ئامانجی دوابەرەنگاریی ناکامانە و بەرگرییکردن لە پایتەختی میرنشینەکەی بێت . هەمان کات ، بە وریاییەوە هەستابوو بە قایمکردنی ئەو شوێنە سەختانەی کە بەسەر گەرووەکەدا دەیانڕوانی و لەوێوە تەنیا رێگە بۆ رەواندز تێپەڕ دەبوو . رەشیدپاشا ئەوەی دەزانی کە هێزەکانی تووشی زیانێکی مەزن دەبن گەر بێتوو پەلاماری ئەو شوێنە سەختانەی میر بدات ، هەر بۆیە رێگەی دیپلۆماسیی لەشەڕ پێ چاکتر بوو . بە گوێرەی لێکدانەوەیەک ، سەرکردەی عوسمانیی کە

---

[55] الگوراني ، ١٣٢

[56] Longrigg. Four Centuries,285;

زكي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٥.، الگوراني ، ١٣٢ دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٧

کۆنە هاوڕێی محەمەدپاشا بووە ، ئامۆژگاریی کردووە کە خۆی لە خوێنڕێژیی بپارێزێت و بێت لەگەڵ میرییدا ڕێکەوێت .هەواڵی ئەوە هەیە ڕەشید پاشا ئەوپەڕی بەڵێنی دڵنیاکەرەوەی بە محەمەدپاشا دابێت گەر بێت و واز لە چالاکییە دوژمنکارانەکەی هەڵگرێت و خۆی بەدەستەوە بدات ، ئەوا بەشێوەیەکی ڕێزلێگیراوانەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و دەسەڵاتی میرنشینەکەی خۆی پێدەدرێتەوە . محەمەدپاشا ئەوەی پەسەند کرد و چووە لای سەرکردەی عوسمانی تا گفتوگۆ لەو بارەیەوە بکەن ، لەوێ دەستبەسەر کرا و لەگەڵ هێزێکی پاسەوانی تۆکمەدا ڕەوانەی ئەستەمبوڵ کرا .[٥٧]

بوگوێرەی گێڕانەوەیەکی دیکە ، ڕەشیدپاشا توانیویەتی ژمارەیەکی زۆر پیاوانی ئایینیی ڕێزداری کورد بەلای خۆیدا ڕابکێشێت ، یەک لەوانە موفتییەکەی میری سۆران بوو کە مەلا محەممەدی خەتیّ یە ، مەلا ئامادە بوو فەتوایەک دەربکات سەبارەت بەوەی هەرکەس چەک دژی سوپای خلیفە هەڵگرێت کافرە و بەوەش تەلاقی دەکەوێت و ژنەکەی لێ حەرامە . بڵاوکردنەوەی ئەم فەتوایە کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر شوێنکەوتەکانی میر ، لەترسی ئەم فەتوایە ، وەک دەگوترێت زۆربەی چەکدارانی لەشکرەکەی میر وازیان هێنا و دانیشتن . دوای ئەم فێڵە زیرەکانەیە کە ڕیزەکانی سوپای میری ڕەواندزی هەڵتەکاند ،دەگوترێت ئینجا ڕەشیدپاشا پەیوەندیی بە میرەوە کردووە و ئەو داوایەی خستۆتە بەردەست کە خۆی بەدەستەوە بدات و لەگەڵ حکومەتی عوسمانییدا ڕێکبکەوێت[٥٨] .

---

[57] زكي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٧ـ دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٧.

Millingen ,Fredrick .Wild Life among the Koords,185-86; Ainsworth, William . Travels and Research in Asia Minor , Mesopotamia , Chaldea and Armenia . Vol.1.London:Jhon W. Parker , 1842.1:323.

[٥٨] ئەم گێڕانەوەیەی پێشوو ، بەگوێرەی گۆرانی ، لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانییەوە لە کتێبی (میرانی سۆران)ەوە دراوە . زەکیش هەمان گێڕانەوەی هەیە بەڵام بە شێوەیەکی کورتتر باسی لەوە کردووە کە محەممەد پاشای ڕەواندز ناچار بووە خۆ بەدەستەوە بدات پاش ئەوەی ژمارەیەک کوردی ڕێزداری ئایینیی لە بۆنەی گوتاری ڕۆژی هەینییدا بەرهەڵستییان بە ڕووی هێزەکانی خەلیفە بە بێهوودە و ناشەرعیی زانیوە . ڕاستیی ئەم گێڕانەوەیە ١٢٠ ساڵ بەر لە ئێستا لەلایەن فرێزەرەوە نووسراوە کە بۆخۆی شایەتحاڵی ڕووداوەکانی بووە . بەگوێرەی ئەو :" ئەو شکۆ و پیرۆزییەی ئەوەکانی پەیامبەر و ڕێبەری ئاینەکەیان مابوویان ، ڕێگەیان لە کورد گرت کە بە شێوەی

دەگوترێت سوڵتان بەشێوەیەکی دۆستانە و دڵفراوانییەوە پێشوازیی لە میر کردووە پاش ئەوەی گەیشتۆتە ئەستەمبوڵ ، هەروەها زۆرترین ڕێزی لێناوە .بەپێی گێڕانەوەی (فریدریك میللینجن) لە ساڵی ١٨٧٠دا :"بەپاشا کوردەکە ڕاگەیەندرا کە وەك پیاوێك لە خانەدانترین چینی کۆمەڵگە دانراوە و بەیەکێك لەو پایانەیان داناوە کە تەختی سوڵتان پتەو دەکات .دەروازەی باڵا بڕیاری سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی تەواوی لە کوردستان دا و محەمەدپاشای بە فەرمانڕەوای گشتیی ئەو هەرێمە دانا و دەسەڵاتێکی بێسنووری پێبەخشی ."[59]

لێرەوە دەردەکەوێت کە ڕەشیدپاشا سەبارەت بەو بەڵێنەی بەمیری دابوو وەفادار ماوەتەوە . بەدبەختیی میر لەوەدا بوو کە ڕەشیدپاشای بەسەردا مرد و ئەو هێشتا هەر لە ئەستەمبوڵ مابووەوە . بەجێهێشتنەکەشی بەهەمان ڕێز و شکۆی ئیمپراتۆرییەوە بوو کە کاتی گەیشتنەکەی بۆ ئەستەمبوڵ پێشوازیی لێکرا . ئەو ئەستەمبوڵی بەجێهێشت و بەسواری کەشتییەك بەرەو وڵات گەڕایەوە کە لەبەندەری سامسۆنەوە کەوتە جوڵە . میری ڕەواندز هیچ کات نەگەیشتەوە وڵاتەکەی خۆی . بەپێی گێڕانەوەیەك ئەو کاتەی لەسەر کەشتییەکەی بووە کوشتوویانە ، بەگوێرەی گێڕانەوەیەکی دیکە لە سێواس هەڵیانواسیوە [60].

دەگوترێت هەڵواسینی محەمەدپاشا لەلایەن عەلی ڕەزاپاشای والی بەغداوە بووە ، ناوبراو دەروازەی باڵای لەو ئاگادارکردۆتەوە کە تا میری ڕەواندز لە ژیاندا مابێت ، ئاشتیی و ئارامیی لە پاشاڵکی بەغدادا بەرقەرار نابێت .واپێدەچێت (میستەر وودی) کۆنسوڵی بەریتانیی لە دیمەشق بۆ خۆی بەرژەوەندیی لەو چارەنووسەی محەمەدپاشادا هەبووبێت . لەسەروبەندی سەفەرەکەیدا ، ئەم کارمەندە کە وەك وەرگێڕی باڵیۆزی بەریتانیا لە ئەستەمبوڵ هەڵدەسووڕا ، دیدەنی لەگەڵ سەرکردە کوردەکەدا کردبوو ،

---

چەکدارانە دژی سوپای سوڵتان بەرەنگاری بکەن . الکوراني ، ١٣٢-١٣٤ ، زکي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٧.

Fraser, Travels . 1:81-82.

[59] Millingen,186.

[60] Ibid.,186-87: Ainsworth, Travels and Research, 323.

دملوجي ، امارة بهدينان، ٤٧-٤٨ ، زکي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٧-٢٤٨، الكوراني ، ١٣٤ .

کاتێك ئەو سەرکردەیە هێشتا لە ترۆپکی هێز و دەسەلاتیدا بوو .[61]

## کۆتایی میرنشینی بادینان

چەند وشەیەك بەسە تا چارەنووسی ئیسماعیل پاشای دوامیری سەربەخۆ و کۆتاییهێنانی میرنشینی بەناوبانگی بادینانی پێباسبکەین. پێویستە ئەوە بەبیر خۆمان بێنینەوە کە محەمەدپاشای رەواندز دووجار پەلاماری میرنشینی بادینانی داوە ، جاری یەکەمیان بۆ قەڵتوبڕکردنی ئێزیدییان و بێگومان بۆ تاقیکردنەوەی توانای کاردانەوەی میری بادینان ، دووەمیش ئەو کاتەی هێرشی کردە سەر میرنشینی بادینان تا بیکاتە بەشێك لە ئیمپراتۆرییە زوولەناوچووەکەی . ئیسماعیل پاشا و هەروەها محەمەد سەعید پاشا تێکشکێنران و ناچار بە هەڵاتن کران . کەمێك پاشتر ، ئیسماعیل پاشا بە سوود وەرگرتن لە دەرفەتی ئامادە نەبوونی میری رەواندز لە ناوچەکە ، توانی موساپاشای نوێنەری میر لە ئامێدیی دەرپەڕێنێت . بەلام ئەم سەرکەوتنە زۆری نەخایاند ، گەڕانەوەی پاشای رقهەڵساوی رەواندز ، ئیسماعیل پاشای توشی بەزینێکی دیکە و پایتەختە بەدبەختەکەشی گیرۆدەی نەهامەتییەکی نوێ کرد .

ئیسماعیل پاشا کە توانی بە کەوڵی خۆیەوە رزگاری بێت ، نەیوێرا تا ماوەیەکی دیکەش هەوڵێکی تر بۆ گێڕانەوەی دەسەلاتی لەدەستچووی بداتەوە . وێڕای ئەوەی پاش سەرکوتکردنی محەمەدپاشای رەواندز لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە توانی وەك فەرمانڕەوا بۆ میرنشینەکەی خۆی بگەڕێتەوە ، بەلام ئەم خۆدامەزراندنەوەیە زۆری نەخایاند . ئینجەبەیرەقدار محەمەدپاشای والی موسڵ ، بەهێزێکی مەزنەوە بەرەو ئامێدیی کشا و توانی پاش گەمارۆیەکی درێژخایەن داگیری بکات . ئیسماعیل پاشاش سەرلەنوێ هەلات و ئاوارە بوو .[62]

هەرچەندە ، میر لە گێڕانەوەی میرنشینەکەی بێئومێد بوو ، زۆری نەبرد سەرلەنوێ لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانی ئامێدیی و ناوچەکانی دەوروبەریدا پەیوەندیی

---

[61] Ainsworth, Travels and Research, 33.

[62] بەگوێرەی زەکی ، ئەو بۆ ئێروە کە گوندێکی نزیك ئامێدییە ، هەڵاتووە . زكي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٤٨.

دامەزراندەوە . پاش ئەوەی ژمارەیەك شوێنكەوتەی لێ كۆبووەوە ، نامەیەكی بۆ والی موسڵ نووسی تێیدا داوای لێكردبوو رێگەی بدات بگەرێتەوە ئامێدیی ، بەڵام والی هیچ وەڵامێكی نەدابووەوە . ئینجا هەستا بەرەو جەزیرەی ئیبن عومەر رۆیشت ، كەوەك دەردەكەوێت لەژێر سایەی بەدرخاندا بووە ، لەوێوە كەوتۆتە پەیوەندییكردن بە لایەنگرانییەوە و زۆری نەبرد رێبەری هێزێكی بەرچاوی كرد و هەڵی كوتایە سەر ئامێدیی و گرتی .[63]

كاتێك والی موسڵ هەواڵی ئەم كارەی میری بیست ، كەوتە ئامادەكاریی تا هێرش بۆ سەر شارەكە بكات . ئیسماعیل پاشا لەو هەواڵە ئاگادار كرایەوە و هەوڵیدا هێندێك هەنگاو بنێت تا پارێزگاری لەخۆی بكات . دەگونجێت لەم كاتەدا بێت كە تكای یارمەتیی لە مارشەموونی پەتریاركی نەستورییەكان كردبێت . وەك دەبینین ، مارشەموون سێ‌هەزار چەكداری خۆی بۆ نارد ، بەڵام ناچار بوو لەسەر داواكاری والی موسڵ دواتر پاشەكشێیان پێبكات .[64]

هەمان كات والی موسڵ بەهێزێكی مەزنەوە رێگەی ئامێدی گرتەبەر ، لەپاش پێكدادانێك ، ئیسماعیل پاشا بەزی و گیرا و بەرەو بەغدا دوور خرایەوە ، لەوێ لەگەڵ ئەندامانی خێزانەكەی كە مابوون نیشتەجێ بوو[65] . بەوەش میرنشینێكی دیكەی كوردیی كە لە رووی پلە و پایەوە و زنجیرەی میرە فەرمانڕەواكانی بە دووەم میرنشین لەنێو میرنشینەكانی دیكەی كورددا دادەنرێت، كۆتاییهات .[66]

## بەدرخان بەگی بۆتان

بێگومان بەدرخان بەگ یەكێك لە ناسراوترین ئەندامەكانی بنەماڵەی ئازیزانە كە میراتگری فەرمانڕەوایەتیی بۆتان بوون . ئەم بنەماڵە میرایەتییە لەلایەن مێژوونووسی

---

[63] هەمان سەرچاوە ،٢٤٨-٤٩

[64] Badger,1:265.

[65] Layard, Nineveh, 1:143-44.

[66] كوردان زۆر رێزیان لەم بنەماڵەیە دەگرت كە ئیدیعای ئەوەیان دەكرد نەوەی خەلیفەی عەبباسیین . باشترین وەسفكردنی توانای فەرمانڕەواكانی بادینان و نەریت و رەسمەی لە بارەگاكەیاندا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا جێبەجێ دەكرا لەلایەن ریچەوە دراوە Rich,1:153ff ـ دملوجي ، امارة بهدينان،١٨-٢٣ ، ٣٢ و دواتر

**کورد شەرفخانی بدلیسییەوە وەك یەکێك لە کۆنترین بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کوردستان ئاماژەی بۆکراوە ، کە خۆیان بە نەوەی عەبدولعەزیزی کوڕی خالیدی کوڕی وەلیدی سەرکردەی مەزنی موسوڵمانان و هاوەڵی پەیامبەر داناوە . بەپێی (هارتمان) ئەم فەرمانڕەوایانە ، هەروەك زۆرینەی دەستوپێوەندەکەیان ، لە سەردەمانێکدا ئێزیدیی بوون .[67]**

**بەدرخان بەگ کە لە تەمەنێکی لاویدا دەسەڵاتی میرنشینەکەی گرتە دەست ،[68] بۆ ماوەی چەندین ساڵ هیچ لەبارەیەوە نەبیستراوە . هاتنەسەرکاری هاوکات بوو لەگەڵ دەستپێکردنی قۆناغێکی هەستیار لە مێژووی عوسمانیی و کوردستاندا . ئەو قۆناغەی تێیدا چاکسازیی گەیشتبووە ئاستی سەرکوتکردنی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکانی کوردستان . ئەو لەسەرەتادا ئەوەندە بەهێز نەبوو بتوانێت بەشداریی لە وێناکردنی ڕووداوەکانی سەردەمەکەیدا بکات . بەڵام گومانێکی کەمتر لەوە دەکرێت کە بە وریاییەوە چاودێری ئەو چەوساندنەوە مەترسییدارانەی کردبێت کە لە دەوروبەریدا ڕوویان دەدا .**

**لەساڵی ۱۸۵۳ دا (سێر ئۆستن هێنری لایارد) ئاماژەی بە زانیارییەکی سەرنجڕاکێش سەبارەت بە مێژووی بەرایی بەدرخان بەگ داوە . ئەو گوتوویەتی کە بەدرخان بەگ بە ناوی میر سەیفەدین شێری فەرمانڕەوای میراتگری جەزیرەوە فەرمانڕەوایەتیی کردووە ، هەروەها بۆ ماوەیەکی درێژ سەبارەت بە پێویستییەکانی هەلومەرجەکە وریایی نواندووە . بەپێی لایارد :**

**" میر سەیفەدین سەرۆکی میراتگری بۆتان بووە ، کە بەدرخان بەگ بە ناوی ئەوەوە فەرمانڕەوایەتیی کردووە .کوڕەکەی ، ئەزدانشێر (شکاوەی ئەردەشێرە) بەگ ، ئەمێستا لەنێو تورکاندا لە ژێر چاودێرییدایە . بەدرخان بەگ زۆر وریا بوو سەبارەت بە پاراستنی ئەو دیدە لە نێو کورددا ، کە ئەو دەسەڵاتەی هەیەتی لەلایەن میرەوە پێیدراوە ، ئەو زۆرینەی نووسراوە فەرمییەکانی بە مۆری میر بەڕێدەکرد ، هەرچەندە ئەو تا مردنی**

---

[67] Hartmann ,R."Djazira B.Omar .".2:1030-31:Streck .M. "Bohtan.". 2:739-40.

[68] بەگوێرەی زەکی . بەدرخان لە تەمەنی هەژدە ساڵییدا بۆتە میری میرنشینی بۆتان شێرکۆ ئەو ساڵەی کە بەدرخانی تێدا بووە بە میر بە ۱۸۲۱ داناوە . بەڵام تەمەنەکەی لەو کاتەدا دیاریی نەکردووە .

زكي . خلاصة تاريخ الكرد.٢٤٨. Chirguh.Bleth. La question kurde.14

میریش وەکو زیندانییەك لای خۆی هێشتبوویەوە ."[69]

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کەناوی ئەو میرەی لایارد وەك کوڕەکەی سەیفەدین شێر ئاماژەی پێکردووە ، ئەسەدین شێر کە شکاوەی ئەرمەشێر نیە ، بەڵکو زیاتر عیزەدین شێر (یەزدان شێرە).

ئەگەر هەواڵەکەی لایارد ڕاست بێت ، ئەوا تیشکێکی نوێ و گرنگ پەخش دەکاتە سەر گەلێك خاڵی دیارییکراو کە تا ئێستا لە تەمومژدا مابوونەوە . یەکەم ، هەواڵەکەی ئەو پشتڕاست دەکاتەوە کە بەدرخان بەگ لە پێناوی چەسپاندنی دەسەلاتەکەیدا ساڵانی بەرایی فەرمانڕەوایەتییەکەی بێ هەرارو هوریا بەسەر بردووە ، بێگومان لە هەلومەرجێکی سەخت و لە ئەستۆگرتنی ئەرکێکی گرنگدا.دووەم ، یارمەتی ڕوونکردنەوەی ئەو پەرەسەندنە بایەخدارانە دەدات کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئێکشاکاندن و کەوتنی بەدرخان بەگەوە هەیە ، بە تایبەت ، بادانەوەی عیزەدین شێر لە کاتێکدا کە بەدرخان بەگ لە ململانێ و کێشمەکێشێکی نێوان ژیان و مردن دا لەگەڵ هێزەکانی عوسمانیی تێوەگلا بوو .ئەگەر زانیارییەکەی لایارد سەبارەت بە سەیفەدین شێر دروست بێت ، ئەوا هەڵسوکەوتی عیزەدین شێرمان بۆ ڕوونەبێتەوە کە زۆربەی کات لەلایەن کوردەوە تۆمەتی ناپاکیی و خیانەتکردن لە کێشەی کوردیان خستۆتەپاڵ .[70] ئەوەی وایلێکردووە لە پشتگیرییکردنی خۆی بۆ بەدرخان بەگ پاشگەز ببێتەوە بەهۆی مەسەلەی مامەڵەکردنی بەدرخان بەگ بوو لەگەڵ باوکیدا .

هەرچەندە زانیارییەکان سەبارەت قۆناغی بەرایی فەرمانڕەوایی بەدرخان بەگ پەرش‌وبڵاو بوون ، بەڵام لە ڕووداوی بەرچاو و بەرژەوەندییدار بەدەر نیە . گوێمان لەو دەبێت کە لەساڵی ١٨٣٨دا هێزێکی بەمەبەستی هێرشکردنە سەر عەبدول ئاغای برای خان مەحموود ئامادەکردووە . لەساڵی ١٨٣٩ دا ، کراوەتە میرئالای فەخری سوپای عوسمانیی وەك سەرکردەی تیپێکی سەربازیی هێزەکانی بۆتان بەشداریی شەڕی (نیزیب) ی کردووە ، ئەو شەڕەی ئیبراهیم پاشای میسر سەرکەوتنێکی مەزنی بەسەر

---

[69] Layard , Discoveries, 54.

[70] Minorsky , "Kurds".Chirguh.Bleth. La question kurde.17; Nikitine ."Les Kurdes.134;Safrastian .60; دملوجي ، امارة بهدينان،٤٨-٤٩ ، زكي ، خلاصة تاريخ الكرد،٢٥٢، ٢٦٢.

سوپای عوسمانییدا بەدەستهێنا .[71] دوای ئەم شکستەی عوسمانییەکان ، بەدرخان بەگ بە خۆیی و پیاوەکانییەوە بۆ جەزیرەی ئیبن عومەر گەڕایەوە ، سوودی لە لاوازی تورك بینی و دەستیکرد بە تۆکمەکردن و دەستپێداهێنانەوەی هێزەکانی .[72]

بەدرخان بەگ بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەی سوودی لە هەلومەرجێکی کەموێنەی لەبار بینی ، لە باشوورەوە ، پێکدادان و شەڕوشۆڕەکانی ئەو دواییە و سەرکوتکردنی محەمەدپاشای ڕەواندز ، شانبەشانی کۆتاییپێهێنانی میرنشینی سۆران ، میرەکانی بادینانی بەشێوەیەکی هەمیشەیی لاواز کرد . ئێزیدییەکانی شێخان بە تەواویی لە لایەن میرە کۆرەی ڕەواندزەوە قەڵتوبڕکران ، هەروەها ئێزیدییەکانی شەنگار لە ڕێگای ئەو هەڵمەت و پەلامارانەی دەکرایە سەریان قڕکران و چیدی نەیانتوانی لە ناوچەکەدا دەسەڵاتێك بن .لەباکوورەوە ، دەسەڵاتی دەرەبەگە کوردەکانی بەرزاییەکانی ساسۆن – مۆتکی لەلایەن ڕەشیدپاشا و ئەو سەرکردانەی بەدوایدا هاتن تێکشکێنران ، لە ڕۆژهەڵاتەوە نوروڵلابەگی میری هەکاریی چیدیکە وەك باوباپیرانی ئەو میرە بەهێزەی ناوچەکە نەبوو . ئەو بەهۆ ناکۆکیی و دووبەرەکییەوە سەرقاڵ بوو کە ئاکامی ناکۆکیی نێوان ئەو و سلێمان بەگ بوو ، ئەو میرە لاوەی کە نوروڵلا شوێنی گرتبووەوە . ئەم کێشمەکێشە تەنیا نەبووە هۆی دابەشبوونی تەواویی دەستوپێوەندەکەی ، بەڵکو زیانێکی قەرەبوونەکراوەی بە وەفاداریی و لایەنگریی لە دەسەڵاتەکەی گەیاند . لە نێوان شتەکانی دیکەدا ، بووە هۆکاری دووبەرەکیی هەمیشەیی لەگەڵ مارشەموونداکە سەرکردەی یەکێك لە هەرە بەهێزترین یەکێتییە خێڵەکییەکانی هەرێمی هەکاریی بوون .لە نێو میرنشینە پایەدارەکانی کورددا ، میرنشینی دوورە دەستی بابان هێشتا لە ژیاندا مابوو ، بەڵام ، وەك ڕووداوەکان سەلماندییان ، ئەم میرنشینە تەنیا لە پێچی دوا دەیەی تەمەنیدا دەژیا و مانەوەی تەنیا مەسەلەی کات بوو .هەموو ئەمانە ، بێگومان ، پێگەیەکی کەموێنەیان وەك تاکە سەرکردەیەکی سونەتی کورد کە لە تەواویی نیشتمانی کورددا مابێتەوە بە بەدرخان بەگ بەخشیی ، بگرە کردییە پیاوێکی ناوداریش . لەم هەلومەرجەدا ، لەوانەیە هێمادان بەوەی کە میری بۆتان لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە

[71] E.M.Noel,Diary,53.

[72] Ibid.

هاوکاریی کرابێت شتێك نیه عەقڵ نەیبڕێت ، بەڵام لە کاتی پێویستییدا ، نەگونجێت ناچار بوو بێت هەوڵیدابێت لەگەڵیدا بسازێت . هەرچەندە زەمینەیەکی باش هەیە بۆ بڕواهێنان بەوەی حکومەتی عوسمانیی گەیشتبێتە ڕێکەوتنێك . ئەم هەنگاوانە لە تایبەتمەندیی ئاکاری عوسمانیی بەدوور نیە ، هەروەها ڕێی تێناچێت پیاوێك لە ئاستی بەدرخاندا داواکارییەکی ئەوتۆ رەتبکاتەوە ، گەر کرابێت .

لە میانەی وتووێژێکدا لەگەڵ (د.ئۆستن رایت و میستەر ئێدوارد برێس) کە سەر بە نوێنەرایەتیی ئەمەریکا بوون لە ئێران . ئەوەی ئامادەبوو لەساڵی ١٨٤٦ دا بانگێشتی سەردانەکەی پەسەند بکەن ، بەدرخان راشکاوانە دانی بەوەدا نابوو کە پێش هەشت ساڵ جۆرە ڕێکەوتنێکی لەگەڵ حکومەتی عوسمانییدا هەبووە ، بە پێی هەواڵەکەیان :

" بە ئێمەی گوت هەشت ساڵ بەر لە ئێستا ، کاتێك ئەو لاواز و تورکیا بەهێز بوو ، لەگەڵ ئەوەی دواییاندا تێکەڵ بە پەیمانێك بووە ، ئەمێستا ، هەرچەندە هێزەکانیان گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، ئەو خوازیاری شکاندنی قسەی خۆی نیە...ئەو هەشت ساڵ لەوەوپێش هەژار بوو ، بێدەسەلات بوو ، کەمیش دەناسرا ، حکومەتی تورك دەستی خستە ژێر باڵی ، ئەمێستا سەروەت وسامانی لەژماردن نایەت ."[٧٣]

سروشتی ڕێکەوتنەکەی نێوان بەدرخان و حکومەتی عوسمانیی هەرچییەك بێت ، ئەم هەواڵە بەڵگەی پێکهاتنێکی سوودبەخشی هاوبەشە کە هەردوولا گەیشتوونە . جێگای سەرنجە تێبینیی ئەوە بکرێت کە گەیشتنە ئەم ڕێکەوتنە لە کاتێکدا بوو کە لەلایەن حکومەتەوە سیاسەتی هێورکردنەوەی کوردستان بە شێوەیەکی خێرا لە پەرەسەندندا بوو و ململانێی سەرەکیی مەترسیداری حکومەت لەگەڵ محەمەد عەلی میسردا هێشتا کۆتایی نەهاتبوو . لە هەلومەرجێکی بەو چەشنە مەترسیدار و سەرقاڵییەدا ، بێگومان دوژمنێك کەمتر بە ئامانجەکانی تورکیا ڕازەیەکی چاکتر بوو . هەموو هۆکارەکان وادەکەن بڕوا بەوە بکرێت کە ئەم میوانە ئەمەریکییانە ، ڕاستگۆیانە و بە بڕواوە هەواڵی چاوپێکەوتنەکەی خۆیان لەگەڵ بەدرخاندا ڕاگواستووە . لەوەدەچێت کەسایەتیی میر بەشێوەیەکی چاك شوێنی لەسەر هەردوو پیاوەکە دانابێت و

---

[73] Wright Dr.Austin H. and Edward Breath, a Report of their visit to Bedir Khan as representative of the American Mission in Persia,381 .

هەواڵەکەشیان زۆربەی کات دەتوانرێت لە چوارچێوەی ئەو ترخاندن و سەرسامییەوە بێت .

## کەسایەتیی بەدرخان بەگ

ئەوەی بەدرخان یەکێکە لە کەسایەتییە مەزنەکانی مێژووی کورد بابەتێکە کێشەی لەسەر نیە. ئەو شێوازەی کە خۆی لە هەلومەرجێکی لاوازیی ڕێژەیی و نادیارییەوە پێهێنایە ترۆپک وەك بەهێزترین و بەرچاوترین و نموونەییترین کوردی سەردەمەکەی خۆی بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی خاوەن توانا و لێهاتووییەکی بەرچاو بووە . بێگومان ئەو لای کورد بەرجەستەی نموونەیەکی باڵای سەرکردایەتیی کوردە . ئەو تێگەیشتوو ، ئامادەییەکی باشی هەبوو ، لە ئاکار و رەفتاری باشیش بەدەر نەبوو ، لە ئازایەتییدا کەموێنە بوو ، خاوەن بڕیار ، خولیا و ئومێد و هەروەها خواپەرستیش بوو . پیاوێکی زووجۆش و خاوەن سروشتێکی سەرچڵانە بوو ، وێڕای ئەوەی ئەم تایبەتمەندییانە کە لە خۆیدا شتێکی نایاب بوو ، بەڵام بە ئاسانی تووشی شێواندن دەهاتن ، هەتاوەکو بە هەنگاوی دان بەخۆداگریی و لێبووردەیی نۆژەن نەکرانایەتەوە ،چونکە سەرەڕۆیی ئازایەتیی دەشێوێنێت ، پێداگریی لەسەر بڕیار بەرەو دڵڕەقیی و تاوان پاڵت دەنێت ، ئومێد و خولیاش دەبێتە تەماکاریی و چاوبرسێتییەکی بێمانا ، خواپەرستیش بۆ دەمارگیریی و لێنەبوردەیی .

لەهەمان کاتدا بەدرخان بەهۆی ژمارەیەك لەو هەڵانەی کردوونی و نکۆڵیی لێناکرێت تاوانبارە . سەرکوتکردنی دڵڕەقانەی نەستورییە چیاییەکان لادانێکی پوچە لە شێوازیی مرۆڤدۆستیی و سیاسیی بەڕێوەبەرایەتییەکەی . ئەم کارەی نەك هەر بووەهۆی ئەوەی خوێنێکی بەخۆڕایی بڕژێت ، بەڵکو بووە هۆی رووخاندنیشی ، هێندێك دان بەخۆداگرتن و کەمێك رامان و بیرکردنەوە دەگونجا ئەو تراژیدیایەی بگۆڕیبایە و بۆ بەدیهێنانی شتی مەزنتر راژەی زێدەتری پێکردبا. چارەنووسی محەمەد پاشای رەواندز پێویست بوو وەك ورياکەرەوە و پەندێك راژەی بەو کردبا ، دە ساڵێك پێشتر ئەو میرە تەنیا لە پێناو رازیکردنی گیانی وێرانکارانە و کۆمەڵکوژی ئێزیدییە بێدیفاعەکان ، سەر و میرنشینەکەی خۆی دانا.

بەدرخان بەگ خولیا و ئاواتەکانی بە ئاوادانێکی بوێرانە و دەستپێکێکی کەموێنەوەی نەچەماوەوە بردەپێش . وەك هەموو پیاوەکانی چارەنووس ، هەستی بە پەیامێك دەکرد و بڕوایەکی پتەوی بەوە هەبوو کە خاوەن توانایەکی ناوازەیە . کەسایەتیی و ئاکاریشی بە رووپۆشێکی کاریزمایی و چەماوەرکێش داپۆشرابوو ، لەبەر ئەم رۆشناییەدا ، زۆربەی ئەو هەڵسوکەوتانەی وا دەردەکەوێت کە لێکدانەوەیان بۆ ئەکرێت ، دەبێتە شتێکی روون و ئاشکرا .توندوتیژیی و ئایینگەراییەکەی ، پشگوێخستنی شێوازی پەسەندنەکراو ، بەهەند وەرنەگرتنی مەترسییەکان ، دەتوانرێت وەك بەشێك لە کەسایەتییە کاریزماتیکەکەی لێبپروانرێت .لەچاوی خۆی و هەروەها شوێنکەوتەکانییدا ، سەرکەوتنەکانی مۆری خوداوەندیان پێوە بوو . ئەمە بووکە بۆ میوانە ئەمەریکییەکان دەرکەوتبوو لەکاتێکدا لەترۆپکی دەسەڵاتیدا بوو :

" دەسەڵاتی لە رۆژهەڵاتەوە لە سنووری ئێرانەوە درێژ دەبووەوە و بەرەو ئەوسەری میسۆپۆتامیا لە رۆژئاوا ، هەروەها لە دەروازەکانی دیاربەکرەوە بۆ ئەوانەی موسڵ ، ناوبانگی تەواو بڵاو ببووەوە . کاتێك لەگەڵیدابووین ، بەگشتی تەواویی سەرۆکەکان لە باکووری کوردستان دەهاتن و رێز و بچووکی خۆیان پێشاندەدا ، دیاری وەك: پارە ، ئەسپ ، هێستر ، هەروەها کەلوپەلی بەنرخیان پێشکەش دەکرد . تەنانەت بەگی هەکاری کە لە پلەوپایەیدا لەو بەرزتر و پێشتریش لەو بەدەسەڵاتتر بوو ، هەروەها خان مەحموود کە لەلایەن گەشتیارە ئینگلیزەکانەوە بە (جەردەی کوردستان) ناودەبرێت ، ئەم دووانە وادەردەکەوێت بە چەشنێك بیربکەنەوە گەر دەستەونەزەر لەبەردەم بەدرخاندا بوەستن بەوە شەرەفمەند دەبن . بیرۆکەی قەدەر و ویستی خوداوەند هێندە بەقووڵی لە هزری موسوڵمانانەدا رەگی داکوتیوە ، کە زۆر لە بەهێزکردنی دەسەڵاتیدا رۆڵی بینیوە و ئەو چەکەش دەلەرزێنێت کە دژ بەو بەرزبکرێتەوە . ژمارەیەکی زۆر لەو سەرکردە بوێر و چالاکانەی لەبندەستیدان ، هەرچەندە بێزارن و ناتوانن لەوە زیاتر خۆبخۆنەوە ، ئەمانەش ناوێرن پەنجەی نارەزایەتییان لە ئاستیدا بەرزبکەنەوە ، هەروەك لەسەر زمانی خۆیانەوە دەگوترێت :" خودا ئەو دەسەڵاتەی پێبەخشیوە ، هەربۆیە هەوڵ و ماندووبوونی ئێمە بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات کارێکی بێهوودەیە ."[74]

---

[74] Ibid.

لێرەوە دەتوانین بەباشی ببینین چۆن کەسایەتیی بەدرخان بەتەواویی لەگەڵ پێناسەکەی (ماکس ڤێبەر) دا سەبارەت بە سەرکردەی کاریزمایی دێتەوە . هێندێك لە کارەکانی بەڵگەیەکی چەسپاو لەمەڕ کاریزمابوونی پێشان دەدەن، مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو ئێزیدییانەی وازیان لە ئایینەکەیان هێنابوو شایەنی سەرنج و بایەخپێدانە .بەگوێرەی (رایت و برێس) :"ئەو ج بە گفتوگۆ یا بەشمشێر ژمارەیەکی زۆری لە ئێزیدییەکان لە ئایینەکەیان وەرگێڕا بوو ، ئەو بۆخۆی نزیکەی پەنجا یا شەست دانەی لەوانەلابوو کە ببونە موسوڵمان . هەرچەندە ئەوانە خولامیان پێدەگوترا ، [75] بەڵام باشترین پۆشاکیان لەبەردابوو، باشترین خواردنیان دەدرایە ، هەروەها لە هەموو حاڵەتەکاندا لە خزمەتکارەکانی دیکە باشتر مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا. ئەوانە وەك ئەندامانی بنەماڵەکەی و هەروەك منداڵەکانی لەقەڵەمدەدران ، هیچ یەك لەوانەی بە موسوڵمانی لەدایك بوو کەمترین بێزارییان لەسەر نەبوو ، هەروەها هەموو ئەوانەی بە موسوڵمان مابوونەوە و ماوەیەکی زۆریش دوور لەو دەژیان . [76]

مامەڵەکردنێکی ئازدارانەی بەوشێوەیە لەگەڵ ئەوانەدا کە وازیان لە ئایینی ئێزیدیی هێنابوو هێمایەکە بۆ ئەوەی کە بەدرخان بەگ لە بنەڕەتەوە پەرۆشی (خۆچەسپاندن) بوو تا ئەو کاتەی لەگەڵ هەستیاریی دەستوپێوەندەکەیدا بێت کە هەر لە بنەڕەتەوە موسوڵمان بوون. [77]

---

[75] وشەی (Slaves بەندە) کە لە ئینگلیزییدا بۆ خولام بەکاردەهێنرێت و وەرگێڕاوەکەیەتی شتێکە چەواشەکەرە ، چونکە وشەی خولام وەك ئیدیۆمێك بۆ ئەو دەستەیەی سەرۆکێك بەکاردەهێنرێت کە پاسەوانی دەکەن لەراستییدا ئەو پیاوانە پاسەوانی شەخسیی میر بوون . Nikitine," La feodalit Kurde,"2.

[76] Wright and Breath,382.

[77] وەیبەر ئاماژەی بەوەداوە کە سەرکردەی کاریزمایی دەسەڵاتی بەوشێوەیە بەدەستدەهێنێت و جەختی لێدەکاتەوە کاتێك خۆی بسەلمێنێت . گەر پەیامبەر بێت دەبێت لەرێی موعجیزە یان پەرجووەکانییەوە ئەو کارە بکات . میری جەنگ لەرێی ئەنجامدانی کارێکی پاڵەوانانەوە هەرچەندە پەیامە پیرۆزەکەی دەبێت بەشێوەیەك خۆی بچەسپێنێت کە شوێنکەوتەکانی بەباشی بڕوای پێبێنن ، ئەگەر بە تەواویی نەبێت ، ئەوا بە ئاشکرا ئەو کەسە شایستەیە نیە لەلایەن خواوەندەوە نێردرابێت

Webar , Max. Essay in Economic Sociology, 249.

دوو مسیۆنێرە ئەمەریکییەکە ، رایت و برێس سەریان لەو توندیی سەختییەی ناکاری ئایینیی بەدرخان بەگ سوڕما بوو کە یاسا و ئارامیی پێدەچەسپاند :

" تاوانبار لە سایەی فەرمانڕەوایەتیی ئەودا رزگاری نەدەبوو ، بەرتیلخۆری ، خزمخزمێنە ..هتد ، کە یەکجار لەم ولاتە بەربلاون و دادپەروەرییان گەندەڵکردووە و کاری یاسایان شێواندووە ، لێرە نەزانراوە . بەیانییەکیان لەگەڵ میردا بووین ، دزێکیان هێنایە بەردەمی ، هەرئەوەندە بەڵگەی تاوانباری لەسەر چەسپا ، دەستبەجێ دەستی راستیان قرتاند . بەم چەشنە ئارامیی و هێمنییە ناوچەیەکی بەرفراوانی چۆڵایی کوردستان گەڕاین ، ئەو ناوچەیەی کە وەك زۆر جار بیستوومانە و خوێندوومانەتەوە وەك شانۆی دزیی و کوشتن وێناکراوە ."[78]

بەدرخان بەگ خۆی بە مرۆیەکی راستگۆ و سەرراست دادەنا . بەپێی دکتۆر رایت و هاوەڵەکەی ، ئەو جەختی زۆری لە پابەندبوون بە قسە و بەڵێنی خۆی دەکردەوە . ئەو پێیگوتن:" کاتێك وەك هاوڕێیەك قسەی خۆمتان دەدەمێ ، زۆر لەدڵەوەیە و بەراستییمە ."[79]

بەدرخان بەگ وەك زۆربەی سەرکردە کارێزماییەکان ، خاوەن خولیایەکی ئایینیی بەهێز بوو . ئەم خولیایە بەشێکی گرنگی لە کات و بیرکردنەوەی داگیرکردبوو . هەروەك رایت و برێس دەڵێن :" کاتێکی فرەی بە خواپەرستییەوە بەسەردەبرد ، بەوپەڕی وردییەوە ئەرکە ئایینییەکانی بەجێدەهێنا و لەگەرمەی کارکردندا دەستی بە نوێژکردن دەکرد ."[80] بێگومان بەهۆی ئەو مەیلە ئایینگەراییەوە بوو کە ژمارەیەك لە شێخەکان توانیان کاریگەرییەکی مەزنیان لەسەری هەبێت و واپێدەچێت ئەوانە لەسەر هاندانی میر دژ بە نەستورییە ناموسوڵمانەکان و ئەو مامەڵە توندەی لەگەڵی کردن ،

---

[78] Wright and Breath,381-82.

[79] Ibid.,381.

واپێدەچێت ئەمە پێچەوانەی ئەوە بێت لایارد باسی لێکردووە ، گوایە بەدرخان بەڵێنی داوە بە ژمارەیەکی زۆر لەو نەستورییانەی کە پەنایان بردبووە بەر گاشەبەردێکی مەزن کە دەست نەیەمگەیشتێ تاکو بیانپارێزێت . بەڵام دواتر لە قسەی خۆی پەشیمان بۆتەوە و هەموویانی کوشتووە یان فڕێی داونەتە دۆڵەکەوە

[80] Ibid.,382.

کارابووین .[٨١]

**ئەو هۆکارانەی لە پشت پەلامارەکەی بەدرخانەوە بوون بۆ سەر چیاییە نەستورییەکان**

پەلاماری بەدرخان بۆ سەر وڵاتی چیاییە نەستورییەکان و ئەو کۆمەڵکوژییەی لێیکەوتەوە شایەنی بایەخی ئێمەیە لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز . لەلایەکەوە ئەو زیانە ترسناکەی لە قوربانیانی ئەو جەنگە دڵڕەقانە قەڵتوبڕکەرە کەوتەوە ، کە لە رووی توندوتیژیی و دڕندایەتییەوە خۆی لەو پەلامارە دڕندانەیەدا کە لەلایەن محەممەدپاشاوە دژی ئێزیدییەکان ئەنجامدرا . هۆیەکی دیکەی گرنگی پەلاماردانەکە بریتیە لەوەی کە بووە هۆی دەستێوەردانی بیانیی لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیدا ، هەرچەندە ئەم دەستێوەردانە بە شێوەیەکی چەکدارانە نەبوو ، بەڵام دەرفەتێکی خستە بەردەم زلهێزەکان ماوەیەکی درێژیش پاش ئەو رووداوانە ، دەستبخەنە ناو کاروباری دەوڵەتی عوسمانیی ، بەڵام لەوەدا شکستیانخوارد چارەسەرێك بۆ قوربانییەکان بدۆزنەوە . دواتر کە بێبایەخ نیە ، پەلاماردانی نەستورییەکان بووەهۆی کەوتنی بەدرخان بەوەی بیانووی دایە دەست حکومەتی عوسمانیی هێرش بکاتە سەر میرنشینەکەی و بیڕوخێنێت .چەند هەوڵێك سەبارەت بەلێکدانەوەی ئەو رەشەکوژییەی بەدرخان دژی چیاییە نەستورییەکان ئەنجامیداوە ، دراوە .هێندێك بۆ دەمارگیریی کوێرانەی میریان گێڕاوەتەوە ، کە وەك دەگوترێت ، لەلایەن نوروڵلابەگی هەکاریی چاوبرسیی و تەنگەتیلەوە کە دەسەڵاتەکەی مەترسیی لەسەر بووە هاندراوە ، هەروەها لە لایەن شێخ و پیاوە ئاینییە دەستڕۆیشتووەکانەوە ، دەورووژێنرا . هێندێکی کە رەشەکوژییەکەیان بۆ ململانێی نێوان دەزگا مسیۆنێرەکانی ئینگلیز و ئەمەریکا گەڕاندۆتەوە . دەستەی سێیەمیش بۆ ئەو پیلانەیان گێڕاوەتەوە کە لەلایەن دەسەڵاتی

---

[81] دکتۆر گرانت دەڵێت گوایە لەکاتی سەردانەکەی بۆلای میر بەدرخان . لە سەروبەندی دوا پەلامارەکەیدا بووە بۆ سەر نەستورییەکان . لەوێ کۆمەڵێك دەرویش و مەلای بینیوون کە ئامۆژگاریی ئەنجامدانی جەنگی ریشەکێشکردنیان داوە گرانت بەرواری سەردانەکەی خۆی لە ٥ی ژوونیە داناوە بەهەمان شێوە ، لایاردیش پێش پەلامارەکەی دووەمی بەدرخان بۆسەر نەستورییەکان باس لەوە دەکات گوایە سەید تەهای یەکەم هانی میری داوە سۆز و ورەی ئاینیی خۆی بسەلمێنێت و خوێنی ئەو خەڵکە بەدبەختە بکاتە کاسەوە

Grant, Ashahl. The Nestorians Or . The Lost Tribes.434; Layard , Nineveh. 1:193.

عوسمانییەکانەوە بە وردیی دارێژرابوو . هەروەها دووبەرەکیی چیاییە ئاسورییەکان و چالاکییە نەفامانە و سەرەڕۆییەکانی مارشەموونی پاتریارکیان وەك یەك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو تراژیدیایە ئاماژەی بۆ کراوە .ڕاستییەکەی ئەوەیە کە پەلاماردان و کۆمەڵکوژیی نەستورییەکان لە ئەنجامی چەند هۆکارێکەوەیە کە گومانی تێدانییە هەریەکەیان بە پلەی جیاواز بەشدارییان هەبووە .

کێشمەکێشی بەرژەوەندییەکانی کەسایەتیی و هێزەجیاوازەکان بووەهۆی سەرهەڵدانی ململانێیەکی توند لە پێناو دەسەڵاتدا . کۆنەقین ، دەمارگیریی ئایینیی ، چاوبرسێتیی ، تینوێتی دەسەڵات ، هەموو ئەمانە هەژانەکەیان زێدەتر کرد و لە کۆتاییدا داگیرکاریی و ڕەشەکوژییەکەی خێراتر کرد. مارشەموونی پاتریارکی نەستورییەکان کە پەرۆشی چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی بوو بەسەر خەڵکەکەیدا ، ئیرەییەکی زۆری بەهەر ڕەگەزێکی دەرەکیی دەبرد هەڕەشەی سنووردارکرنی پلەوپایەکەی لە نێویاندا بکات . هەر لەبەر ئەوەش ، لەهەمبەر مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان بێبڕوابوو و پێیان سەغڵەت بوو ، بەلای ئەمەوە ئەوان بەرجەستەی زۆر لەو کارانەیان دەکرد کە مایەی دڵزایەتیی ئەم و جێگای مەترسیی بوو . لەبەر هەمان هۆ ، ئەو لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرکردەکانی کۆمەڵەکەی خۆیدا ئاکۆك بوو ، ئەوانەی دەسەڵاتخوازییەکەی مارشەموون بێزاری کردبوون . مسیۆنێرە ئینگلیز و ئەمەریکییەکان لەم ململانێیەدا لایەنگربوون ، ئینگلیزەکان پشتگیریی دەسەڵاتی پاتریارکیان دەکرد و ئەمەریکییەکانیش دژی بوون . هەریەکەیان لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەوی دیکە دەرپەڕێنێت . وادەردەکەوێت کە ئینگلیزەکان ئەم کارەیان بە سەرکەوتنێکی زیاترەوە کردبێت .

نوروڵلابەگی میری هەکاریی ، پەرۆشی ئەوەبوو دەسەڵاتی خۆی بەسەر مارشەمووندا بسەپێنێت ، نەك تەنیا لەبەر ئەو دەسەڵاتەی پاتریارکی نەستوریی هەیبوو ، بەڵکو بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسییەی ئەوەکا پەتریارك پشتگیریی نەیارەکەی بکات کە سلێمان بەگە . پەتریارکیش بە دوو هۆ لە دەسەڵاتخوازیی نوروڵلابەگ بێزاربوو ، لەلایەك دەیویست لە دەسەڵاتی میر سەربەخۆبێت ، هەروەها چونکە دۆستایەتیشی لەگەڵ سلێمان بەگدا هەبوو . سلێمان بەگ کە ئاگای لە هەڵوێستی مارشەموون بوو ، هاوسۆزیی بۆ هەستی مارشەموون پیشان دەدا و لەژێرەوە دژی ئاحەزی هاوبەش ، پشتگیریی تێکۆشانی ناوبراوی دەکرد.

نوروڵڵابەگ لە دوژمنایەتیی مارشەموون تووڕە بوو ، بەڵام هێندە بەهێز نەبوو بتوانێت بە تەنیا بەگژیدا بچێت . هەربۆیە داوای هاوکاری لە بەدرخان کرد ، ئەویش زۆری پێخۆش بوو پشتگیریی و لایەنگریی نوروڵڵابەگ بگرێت . ئەم کارە جەختی لە پابەندبوونی میرنشینی مەزنی هەکاریی لەحاست ئەو کۆنفدراسیۆنە کوردییەدا کردەوە کە لەلایەن بەدرخانەوە پێکهێنرابوو . بەڵام ئەمە هەموو شتێك نەبوو ، ئەگەری هەڵمەتبردنە سەر نەستورییەکان سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی تاڵانیی خستەبەردەم بەدرخان کە دەیتوانی پاداشتی ئەو ژمارە زۆرەی شوێنکەوتووانی پێبداتەوە ، هەروەها لەهەمان کاتدا دەرفەتێکی کەموێنەی خستەبەردەم تاکو جۆشی ئایینیی خۆی پێشانبدات . هەموو ئەم مەسەلانە بۆ پلەوپایە و پلانە ئاینەییەکانی ئەو بایەخدار بوون

پاشای موسڵ کە چاوی لە سەر وڵاتی نەستورییەکان بوو ، تەنیا خواستی ئەوە بوو بیخاتە سەر قەڵەمڕەوی خۆی . هەر بۆیە بە تەواویی ئاگاداری ئەو هەڕەشەیە بوو کە رووبەڕووی نەستورییەکان ببووەوە . ئەو هیچ کارێکی بۆ رێگریی لە ئەنجامدانی ئەو پەلامارە نەکرد . بە پێچەوانەوە گەر کارێکی بکردایە ئەوە بۆ زووتر دەستپێکردنی پەلامارەکە دەیکرد . پاشای ئەرزڕۆمیش کە قەڵەمڕەوەکەی وڵاتی نەستورییەکانی دەگرتەوە ، نە کەمتر لە رکابەرەکەی کە پاشای موسڵە ، تاوانبارترە و نە لەویش کەمتر لە چارەنووسی تراژیدییای نەستورییەکاندا تێوەگلاوە .

لە پشتیشەوە حکومەتی عوسمانیی راوەستاوە ، بێبایەخە بەڵام بێتاوان نیە ، چاوەڕێی ئەوەیە شەڕی خێڵەکان دەستپێبکات . چی بەسەر قوربانییەکاندا دێت ، ئەوە بابەتی سەرەکیی ئەو نیە ، تەمێکردنی ئەوانی دیکەش شتێك نیە شایەنی پێشوازیی نەبێت . وردبوونەوەیەکی زیاتری دیکە لەو هۆکارانەی وەك دەنگۆ سەبارەت بە بە رەشەکوژییەکە داکەوتن ، لەپاڵ ئەوانەی دیکەدا وایلێکردووین بگەینە تێگەیشتن لە بایەخی رێژەییان ، ئەوەش هەروەها هێمایەکە هەلومەرجی خراپی بڵاوەبووی ئەو سەردەمەی کوردستانی ناوەندی تێدا ئاشکرا دەبێت .

**دووبەرەکیی نەستورییەکان:** گومانێکی کەم لەوەدا هەیە کە دووبەرەکیی نەستورییەکان لەو سەروبەندی پەلامارەکەدا یەکێکە لەو هۆکارە بنەڕەتییانەی وایکرد هێرشەکە روویدات . شتێکی باشە ئەوە بەبیربهێنینەوە کە چەند ساڵێك پێشتر ، میری

رەواندز کە لە بەدرخان بێتواناتر و بێهێزتر نەبوو ، لە هەوڵدان بۆ داگیرکردنی وڵاتی نەستورییەکان ، کاتێک ڕووبەڕووی بەرگریی یەکگرتووی ئەو چیاییانە بووەوە ، شکستیخوارد .[82]

دووبەرەکیی دواتری نەستورییەکان بە ئاشکرا لەو ناحەزییە بەربڵاوەی دژ بە مارشەموونی پەتریارکدا خۆی دەردەخست ، ڕاستییەکی وا بە زیاتر لە شێوەیەک ئاسانکاریی بۆ داگیرکارییەکە کرد . ناکۆکیی نێوان مارشەموون و دوو سەرۆک خێڵی ئەشیتا ، کە شەماشە هینۆ و قەشە جیندۆ بوون ، بووە هۆی بێبەشکردنیان لە پەیوەندی ئایینیی بە پەتریارکەوە . ئەمەش بۆ خۆی کێشەیەک بوو . شەماشە هینۆ دوای دەرکردنی دەگوترێت کە پەیوەندیی بە بەدرخانەوە کردووە و لەوە دڵنیای کردۆتەوە کە لەکاتی نزیکبوونەوەی هێرشەکەیدا پشتگیریی و هاوکاریی خۆی پێشکەش دەکات . بەدرخان بەگ کە ئەم پشتتێکردن و بادانەوەیەی شەماسە هینۆی لە مارشەموون فرە پێخۆش بوو ، نە تەنیا ئەشیتای خستە دەرەوەی بازنەی هێرشەکەی ، بەڵکو دیاری و شانازییەکی زۆریشی بەسەر هینۆدا باراند . برادەرەکەی هینۆش ، واتە قەشە جیندۆ ، هەواڵی ئەوە هەیە کە هەمان خواستی خستبێتە بەردەم نوروڵڵابەگ و لەلایەن هەمان سەرۆکەوە بەهەمان شێوە پاداشت درابێتەوە .[83]

دەخوما ، کە یەکێکە لە خێڵە سەرکردەییەکانی نەستورییەکان ، واپێدەچوو ئەویش لەلایەن پەتریارکەوە بێزێنرابێت . پیاوانی ئەم خێڵە ، کە پشتگیریی نورڵڵابەگیان دەکرد و پشتیانکردە کێشە هاوبەشەکەیان و چالاکانە بەشدارییان لە کوشتوبڕی براکانیاندا کرد .[84] جێگای سەرنجە لەکاتی دووەمین هێرشدا کە بەدرخان کردیە سەر وڵاتی نەستورییەکان ، ئەم خێڵە بوونە ئامانجی تووڕەیی بەدرخان .

[82] Thomas Laurie and Dr. Azeriah Smith ,letter Concerning Bedir Khan and other matters, Middionary Herald, 41 ,no 6(Apr.1845),120 cf.Perkins,92.

[83] Ibid.,118-119.

[84] Ibid.,122.

## پەیوەندیی نەستورییەکان لەگەڵ سەرکردە کوردەکانی میرنشینەکەدا

نەستورییەکان بە گشتیی و پەتریارک بە تایبەتیی وادیاربوو هەموو کەسایەتییەکانی ئەو سەرکردایەتییە کوردییەیان لا ریسوا بوو کە لەو داگیرکارییەدا تێوەگلابوون . ئیسماعیل پاشای ئامێدیی ، نوروڵلابەگی هەکاریی ، بەدرخان بەگی بۆتان ، هەموو ئەمانە داخ وپەژارەیەکی زۆریان دژ بە نەستورییەکان لە دڵدا بوو . ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لە هەموو حاڵەتەکاندا هۆکاری ئەم پەژارەیە هەڵەی نەستورییەکان بێت یاخود بەشێوەیەکی سەرەکی ئەوانی تێدا لۆمە بکرێت.

**١-ئیسماعیل پاشای ئامێدیی :** پەژارەی ئیسماعیل پاشا لەوێوە سەرچاوەی دەگرت دەمێکی ئەو سەرکردەیە لەلایەن سوپای عوسمانییەوە فشارێکی زۆری خرابووە سەر ، مارشەموون نەیتوانی بچێت بە دەمییەوە و یارمەتیی بدات . بە کورتیی رووداوەکە بەم چەشنە بوو : کاتێک ئیسماعیل پاشا ئامادەکارییەکانی ئینجەبەیرەقدار محەمەدپاشای والی موسڵی بۆ هێرشکردنە سەر ئامێدیی بیست ، دەگوترێت داوای یارمەتیی لە مارشەموون کردووە . مارشەموون بێ خۆخلافاندن و بە ئاگاداریی و رەزامەندیی نوروڵلابەگی سەرداری مەزنی ناوچەکە ، سێ هەزار کەسی لە شوێنکەوتووانی خۆی بۆ یارمەتییدانی ئیسماعیل بەگ نارد.[٨٥] هەرچەندە پاش ئەوەی ئینجەبەیرەقدار بە مەسەلەکەی زانی ، هەواڵی ئەوە هەیە کە مارشەموونی لە بڕیاری خۆی سەبارەت بە سەرپێدانەواندنی ئامێدیی ئاگادار کردبێتەوە و فەرمانی پێدابێت هێزەکەی بکشێنێتەوە . پەتریارک خوازیاری ئەوە نەبوو خۆی لەگەڵ حکومەتی عوسمانییدا تووشی کێشە بکات و خۆی بخاتە سەنگەرێکی دژ بە دەوڵەتەوە . هەربۆیە بە پەلە ملکەچیی خۆی پیشاندا . ئەم کارەی مارشەموون دڵی ئیسماعیل بەگی رەنجاند . ئەوەی ، بێگومان ، لە کاتی بڕیاردان لە چارەنووسی نەستورییەکاندا ، بە هەموو قورساییەکی کە هەیبوو ، دژی نەستورییەکان خۆی هاویشتە مەسەلەکەوە .[٨٦]

هۆکار هەیە تا بڕوا بەوە بکرێت کە سەرکردە کوردەکانی دیکەش وەک یەک لەو

---

[٨٥] Badger,1:265.

[٨٦] Ibid.

کـارەی مارشـەموون بێزاربـوون . بـەگوێرەی سەرچـاوەیەکی هاوچـەرخ :" داواکـاریی بەشـداریی تیپـە کوردییـەکانی هـەکاریی دژی ئامێـدیی بـە تـەواویی شکـستی هێنـا . هـەروەها بـڕوا بـەوەدەکرا پـەتریارکی نەسـتوریی هاوکـارییکردنی خـۆی لـەو مەسـەلەیە رەتبکردایەتـەوە . ئـەو قەڵایـەی کوردسـتان کـە ئێـستا لەلایـەن سـوپای عوسمانییـەوە گەمارۆی خراوەتـە سـەر ."[٨٧] بەهـەمان ئەندازەی ئـەو هەماهەنگییـەی میرەکوردەکان دژی حکومەتی عوسمانیی تێدەکۆشان . ئەوە نیـە ئـەگونجێت میرەکان کارەکـەی پـەتریارکیان وەك هێمایەکی دوژمنکارانە دژ بە تێکڕای خۆیان لێکنەدابێتەوە .[٨٨]

٢- **بەدرخان بەگی بۆتان:** وێڕای هەموو ئەو هۆکارە جیاوازانەی بەدرخانی هانـدا دژی نەستورییەکان بکەوێتـە کار ، دەگوترێت ئـەو زۆر لـەو کارانـە تـوڕە بـووە کـە لایـەنی بەرامبەر وەك ململانێك بە رووياندا کردووە ، ئەوەی بۆتـە هەڵگیرساندنی دوژمنایـەتیی لە نێوان هەر دوولادا . بەپێی چەند هـەواڵێك ، لەمیانـەی یـەکێك لـە پەلامارەکانیـدا لەسـەر سـنوور ، دوو کـوردی بۆتانییـان کوشـتووە ، لەبەرامبـەردا ، بـەدرخان چـوار نەسـتوریی لێکوشتوون ، بەهەمان ئەندازە تۆڵەیان کردۆتەوە و هەستاون بە کوشتنی هەشت کـەس لە دەستوپێوەندانی میر . لەم هەلومەرجەدا بوو نوروڵلابەگ لـە بەدرخان نزیك بووەوە و خواستی یارمەتیی و کاری هاوبەشی دژی نەستورییەکان خستە بەردەست .[٨٩]

---

[87] letter from Dr.Grant dated Sept. 12 ,1842, Missionary Herald, 39 ,no 2(Feb.1843),67.

[88] هەڵوێستی کورد لەهەمبەر حکومەتی عوسمانیی لەلایەك و لەهەمبەر سەرۆکەکانی خۆیان لەلایەکی ترەوە لەو رووداوانەدا وێناکراوە کە هەردوو مسیۆنێری ئەمریکیی گێڕاویانەتەوە .بەگوێرەی ئەوان ، پاش ئەوەی گەیشتنە ناوچەی ئەشیتا ، لەدوای پەلاماری دووەمی وڵاتی نەستورییەکان ، ئەوان چوون تا یەك لەو سەرۆکە کوردانە ببینن کەوەك پیاوێکی بەدرخان لەو هەرێمەدا هەڵدەسوڕا ، سەرۆکە کوردەکە سەیری بەڵگەکانی کردن ، کە پێکهاتبوو لە فەرمانێك لەلایەن سوڵتانەوە مۆرکرابوو ، بەڵگەیەك لەلایەن والی موسڵەوە پێیان درابوو ، لەگەڵ نامەیەکی ئیسماعیل پاشا ئەو چاوی بڕییە نامەکان و دروانی یەکەمیانی بە سوکایەتییەوە فڕێدا ، نامەکەی ئیسماعیل پاشای بەرزکردەوە بۆ ئاستی ناوچەوانی و بەرزەپێ هەستا وەك ئەوەی سەرۆك بەخۆی ئامادەبووبێت

Laurie and Smith .118.

[89] Ibid.,122.

راستی ئەم چیرۆکە هەرچییەك بێت . جێگەی سەرنجە . خەڵکانێکی دیکەش پاش چەند ساڵێك ئەو پەلامارەی بەدرخانیان بۆ سەر نەستورییەکان بۆ خواستێکی تۆڵەسێنانە گێڕاوەتەوە

٣-نوروڵڵابـــەگی هـــەکاریی : نەســتورییەکان چ جــۆرە پەیوەندییــەکیان لەگــەڵ ئیسماعیل پاشا یاخود بەدرخان بەگدا هەبێت ، سروشتی ئەو ناکۆکییانە رووکەش و کاتیی بوون . سروشتی ناکۆکییەکان لەگەڵ نوروڵڵابەگی هەکاریی -کە کەسایەتییەکی جیـــاوازی هـــەبوو- قـــووڵتر ، ئـــاڵۆزتر ، درێژخایـــەنتر بـــوو . ناوچـــە چـــیاییەکانی نەستورییەکان بەشێك بوون لە میرنشینی هەکاریی ، هەربۆیە میری هەکاری سەرداری بالا و پەتریارکی نەستورییەکانیش یەکێك بوو لە دەستوپێوەندەکانی . پەیوەندیی نێوان ئەم دوو پیاوە ئاڵۆز بوو ، وەك دواتریش چاوەڕێی لێدەکرا ، کاتێك سەرداری بالا لاوازە و بەلام جەخت لە سەر جیاوك و مافەکانی دەکاتەوە ، هەروەها کاتێك رەعییەت بەهێزە و بە قێزەوە بەدەم خواستی ئەربابەکەیەوە دەچێت .

کێشەکە لەئەنجامی هۆکارە ئاڵۆزەکانی دیکەدا گرژوتاڵتر بوو . نوروڵڵابەگ خزمێکی دووری میری پێشووی هەکاریی بوو ، وێڕای ئەو راستییەی کە سلێمان بەگی کوڕی میری کۆچکردوو لەپێشتربوو کە جێگەی باوکی بگرێتەوە ، کەچی ئەم توانی سەرۆکایەتیی بگرێتە دەست . نوروڵڵابەگ لە ترسی دوژمنایەتیی و کێشەی خوێن ئەو لاوەی دەست لێنەدابوو . بەلام چاودێرییەکی باشی دەکرد و پلەی هێنابووە خوار و لە شـــوێنێکی نـــزم دایمەزرانـــدبوو ، ناونیـــشانی (مـــودەبیر) ی هـــەکاریی پێبەخـــشیبوو ، مارشەموون کە میری پێشووتری دەناسی و دۆستایەتیی نزیکی لەگەڵیدا هەبوو ، هێشتا لەژێر کاریگەریی رۆژانی رابردوو و بیرەوەرییەکانیدا بوو ، ئەوەش وایلێکرد هاوسۆزیی بۆ ئەو لاوە میرایەتیی لێزەوتکراوە پێشانبدات ، ئەو راستییەی بەشێوەیەکی سروشتیی توڕەیی و گومانی نوروڵڵابەگی وروژاند .[90]

وادەردەکەوێت کە نوروڵڵابەگ لەوە سڵەمیبێتەوە کە رۆژێك دادێت سلێمان بەگ بتوانێت لە دەسەڵاتی وەلابنێت .بۆ ئەیارەکەی پشتی بدات لە زەوی ، هەربۆیە هەوڵیدا بە چەند شێوازێك بە خۆیەوە ببەستێتەوە ، وەك پێدانی پارە وپولێکی زۆر . ئەوەش بە خراپیی کاری کردە سەر باری دارایی و گەنجینەکەی لەبنهێنا .[91] لاوازیی دارایی نوروڵڵابەگ بووە هۆی ئەوەی زیاتر ترس و نیگەرانیی بوروژێنێت و کردیە کەسێکی

---

[90] Laurie and Smith ,121-22.

[91] Ibid.,122.

گومانـاویی و سـەرەڕۆ . واپێدەچوو مارشـەموون یـەكێك بێت لـەو كەسـانەی كـە میری هـەكاریی بـەردەوام بە داوای پێدانی باج هەراسـانی كردبێت . پـەتریاركی بێـزار تـا ئـەو رادەیە هەراسان بوو كە وەك باسی لێوە دەكرێت فەرمانی داوە بە خێڵی ئەشیتا كە باجی ساڵانە كە خەڵكەكە دەیدەن بۆ میری هەكاریی رابگرن .[92]

## رۆڵی مسیۆنێرە ئەمەریكییەكان :

فاكتـەرێكی دیكـە كەوادەردەكـەوێت تـرس و دڵـەراوكێ و ئیرەیـی نووروڵڵابـەگی وورووژاندبێت بریتییـە لـە دەركـەوتنی مسیۆنێرە ئەمەریكییـەكان لـەنێو نەستوورییەكاندا . ئـەو ، وەك كـوردانی دیكـە ، دژی مـسیۆنێرەكان بـوو و لـەوە دەترسـا كـە ئـەوان نەستوورییەكان لەسەر خوێندنی نوێ و هونەری ئەورووپییەكان (ئەمەریكییەكان لای ئەوان بە ئەورووپیی لەقەڵەمدەدران) باربهێنن . ئەوەی لە كۆتاییدا وا لـە نەستوورییەكان دەكات بەسەركوردا زاڵبن .[93]

سـەرباری ئـەوەش ، سـەرانی كـورد لـەوە دەترسـان مـسیۆنێرەكان ، هـەروەك ئەورووپییـەكانی دی ، دەگونجێـت پەیوەنـدییان بـە كەسـانی خـاوەن پلـە و پایـەوە لـە ئەستەمبوڵ هەبێت . ئەگەر وابێت ، ئەوان لەبەر ئەوەی دەگونجێت لە شوێن و پایەیەكی وادابن كە سەرنجی ئەستەمبوڵ بە زۆر بابەتی جیاواز رابكێشن . زۆر دەگونجێت بـەهۆی ئـەوەوە چـارەی كوردانیـان نەدەویـست ئەمـە وابكـات هێزەكـانی عوسمـانیی رووبكاتـە وڵاتەكەیان .[94]

بارەگای مسیۆنێری لەلایەن (د.ئەشـەهێل گرانت)ەوە بنیاتنرابوو كە سەرچاوەی

---

[92] بەگوێرەی (لاوری و سمس) نووروڵڵا بەگ ئەم هێما نادۆستانەیەی مارشەموونی "نە چاو لێپۆشیی و نە لەبیری كرد " Ibid.,121-22

[93] letter from Dr,Grant dated Dec. 26 ,1842, Missionary Herald, 39 ,no 8(Aug.1843),317-18; letter from Dr.Grant dated July. 5 .1843. Missionary Herald. 39 .no 11(Nov.1843),435.

[94] تەنیا چەند ساڵێك زووتر . نووروڵڵا بەگ لە كوشتنی (شۆڵتز) ی گەڕیدە و كۆڵەری ئەڵمانی بەرپرس كرابوو . بە گومانی ئەوەی بەدوای گەنجی شاروەدا گەڕاوە دۆزینەوەی ئەوە دەسەڵاتدارانی عوسمانیی هێنایە ناوچەكە

Layard , Nineveh,1:179;Layard , Discoveries, 77.

دڵـەڕاوکێ و وورووژانـدن بـوو . دەنگـۆ کـەوتبوو کـە ئـەو بارەگایـەی وەک قەڵایـەک دروسـتکردووە تـا بەمەبەسـتی دوژمنکارانـە دژی کـورد بـەکاری بهێنێـت . یـاخود وەک بازاڕێـک بـە مەبەسـتی دەوڵەمەنـدکردنی نەسـتورییەکان لەسـەر حـسابی کوردەکـان . نوروڵڵابەگ خۆی لەمیانەی وتووێژێکدا لەگەڵ د.گرانت باسای لەم تۆمەتانە کرد . کاتێک گرانت نکۆڵیی لێکرد و ئاماژەی بەوەدا کە بارەگاکە بەمەبەستی خوێندنگا و هەروەها جێگەی حەوانەوەی مسیۆنێرەکان بنیاتنراوە ، نوروڵڵابەگ داوای لە د.گرانت کرد لەو بارەیـەوە بـە نووسـراو زانیاریـیەکانی بـۆ روون بکاتـەوە ، ئـەویش ئـەو داوایـەی جێبەجێکرد.[٩٥]

دژایەتیی بنیاتنانی بارەگای مسیۆنێری جگە لە سەرچاوە کوردییەکان ، لەلایەن تورکانیشەوە بوو ، سەبارەت بەو دەسـەڵاتەی د.گرانـت خـۆی کـە پاشـای موسـڵ لـە بێزارییدا پلانی بۆ لەناوبردنی دانابوو .[٩٦] ئەو بایەخە ناپێویستەی کە لەلایەن کورد و تورکانەوە بە بارەگای مسیۆنێرەکەوە درابوو ، وێڕای دڵنیاکردنەوەی مسیۆنێرەکان لە بـەدحاڵیبوونی مەسـەلەکە ، هێمایەکـە بـۆ ئـەوەی کـە یەکێکـە لـە هۆکارەکـانی رەشەکوژییەکە .[٩٧]

هێندێک مسیۆنێری ئینگلیزییش قامکیان لەسەر بارەگای مسیونێرەکان داناوە ، لەنێو ئەوانەی تردا ، بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتیی مسیونێری ئەمەریکییەکان سەبارەت بە رەشـەکوژییەکە بچەسپێنن . بـەپێی ئـەو سەرچـاوە ئینگلیزییانـە ، بنیاتنـانی بارەگـای

---

[95] letter from Dr,Grant dated Dec.26,1842,Missionary Herald,39 ,no 8(Aug.1843),317-18.

[96] Ibid.,318;see alsoletter from Dr,Grant dated Apr.18,1843,Missionary Herald. 39 ,no 8(Aug.1843).

[97] Missionary Herald, 40 ,no 3(Mar.1844),82.

ئەم نامەیە لە دکتۆر گرانتەوەیە جەخت لەوە دەکات کە بەدەر لە هۆکاری کۆمەڵکوژییەکە ، ماڵی مسیۆنێرییەکە ئەشیتای پاراست دکتۆر رۆبنسۆن ئەم زانیارییەی وەک سەلماندنێک لەو تێبینییەی کە لە پێشەکیی چاپە ئەمەریکییەکەی کتێبەکەی لایارد لەمەڕ نەینەوا نووسیوە پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت . هەرچەندە ئەشیتا لەیەکەم پەلاماردا بەرنەکەوت ، بەڵام لە دووەمدا چاوی لێ نەپۆشرا . سەرباری ئەوەش ،بەگوێرەی (لاوری و سمس)، ئەشیتا رزگاربوونی خۆی لە پەلاماری یەکەمدا بۆ ئەو راستییە گێڕاوەتەوە کە دوو لە سەرۆکەکانی خۆیان لەگەڵ بەدرخان و نورڵڵا بەگدا کردبووە هاوپەیمان .

مسیونێرەکان ترس و گومانی کورد و تورکانی وروژاندووە ، لەکاتێکدا مەسەلەی گۆڕینی ڕێچکەی ئایینی و کاری مسیونێری ئەمەریکییەکان ، دووبەرەکیی و ناکۆکیی لە نێو نەستورییەکاندا لێکەوتەوە .[98] هەرچەندە دەگونجێت ڕاستییەک لەم تاوانبارکردنەدا هەبێت ، بەلام ، گومانی تێدانیە ، بە هۆی دەستەچێتی خۆیانەوە ڕوانینێکی ساکارانەیان ئاڕادەی هەڵە خستۆتە بەرچاو . هەرچەندە چالاکیی مسیونێرە ئەمەریکییەکان دەگونجێت بە یەکێك لەو هۆکارە زۆر و جۆراوجۆرانەی ڕەشەکوژییەکە دابنرێت ، بەلام بەهیچ شێوەیەك تەنیا هۆکار یاخود هۆکاری هەمەڕەنگی ڕەشەکوژییەکە نیە .لایارد لەساڵی ١٨٥٣ لە کتێبەکەیدا "دۆزینەوەکان لە ژێر داروپەردوی نەینەوا و بابل دا" ئەو قسەلۆکەی مسیۆنێرەکانی ئینگلیزی ڕەتکردۆتەوە ، هەروەها لەو قسانەی کردوونی دەردەکەوێت کە مسیۆنێرە ئینگلیزەکان خۆیان بەتەواویی لەو کێشەیەدا بێنۆباڵ نین .

گوتەیەکی لایارد لەسەر ئەو وتووێژەی دەربارەی ئەو کێشەیە لەگەڵ مارشەمووندا ئەنجامیداوە تیشکێکی سەرنجڕاکێش دەخاتە سەر ئەو دید و لێکدانەوە جۆراوجۆرانە :" کاریگەریی دەسەلاتە کۆنەکە ، کە ناتوانم جگە لەوەی بەداخ بم ، هەروەها ئەوەی لەبەر ڕێزی کڵێسا حەز ناکەم ناوی بەرم ، دەستیان تێدا هەبوو . تەنانەت بینیم کە تاڵتر لە دەنگیدا دژی مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان وەك لەوەی دژی تورك و کوردە سەرکوتکەرەکانی دەردەکەوێت . ئەو وا فێرکرابوو ، هەروەها جێگای داخە کە مامۆستاکانی لە کڵێسای ئینگلیزیی بوون . بەوەی ئەوانە هەوڵییاندەدا کە دەستوپێوەندەکە بکەنە کەسانێکی سیڤیل و بارهێنراو لە کۆمەڵگەی کریستیانیی ڕاستینە دەکشێنەوە ، لەبیروباوەڕدا لادەرن ، هەموو لە ڕێلادان و ئەرکە ئایینییەکانی بیروبڕوای ڕاستیینە ڕەتدەکەنەوە ، مەبەستییانە نەستورییەکانیش بهێننە سەر ئەو دۆخە بێهیوایی و کافرێتییەی خۆیانی تێدان .ترسەکەی ئەو کاتێك دەرووژا کە لەوە دڵنیا بوو ، زۆر ناخایەنێت ، بەهۆی شێوازی ڕاهێنان و فێرکردنی ئەوانەوە ، دەسەلاتی ئایینیی و هەروەها دنیایی ئەو بە تەواویی هەڵدەوەشێت و نامێنێت . دەمبینی بەو پەڕی تواناوە چاکی بۆ کاری توندوتیژیی و سەرکوتکردن لێکردووە بەلادا ، ئەوەی کە

[98] Badgem 1:260.

بۆ دووەم جار نەبووە جێگای هەڕەشەو مەترسیی لەسەر خەڵکەکەی و هەروەها بۆ خۆی ، هەوڵمدا ، بێئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنم ، ئەو توندوتیژییە ناشایستەیەی هێوربکەمەوە."[99]

لەم باسە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان ئامانجی تاوانبارکردنێکی نادادپەروەرانە بوون . هەرچەندە گومانی تێدا نیە کە ئەوان دەستەیەکی ئایینپەروەر و پیاوانێکی خۆپارێز و خۆتەرخانکردوو بوون ، نیازپاکییان بەڵام جۆشی بەدئاراستەکراویان بووە هۆی ئەوەی کێشەی بۆ خۆیان و خەڵکی دیکەش لێپەیدابێت . بە زێدەبڕوایەکی ئەوان بە ئایین و ڕەوایی ئامانجەکانیان هەیانبوو ، چاکیان بۆ کاری مسیۆنێری خۆیان لێهەڵکردبوو ، بێئەوەی لەوە بەئاگابن کە هەوڵ و کارەکانیان هەر لەنێو ئەو کەسانەی ئەوان بۆیان و لەنێویاندا هەڵدەسوڕان ، دەگونجێت ، بەدلێکدانەوە ، بەدحاڵیبوون و هەروەها بێزاریی لێکەوتبێتەوە .

بەهەمان شێوە ، دەرکەوتنی مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان لە ناوچەیەکی چۆڵ و چیایی وەک کوردستاندا شتێکی سەیر و پەرەسەندنێکی چاوەڕواننەکراو بوو کە گومانێکی قووڵ و دڵەڕاوکێی کوردی لێکەوتەوە . لەو بارەیەوە گوێیان بە پشتگیریی دەسەڵاتدارانی عوسمانیش نەدابوو . لەو هەلومەرجانەدا وەک د.گرانت بۆخۆی لە خاڵێکدا باسی لێوەکردووە ، دەگونجا مەسەلەکە لەبارتربێت ، بۆ ئەوەی متمانە بەکاری مسیۆنێری لە نێو چیا سنوورییەکان بکرێت دەبوو ئەرکەکە بەخەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بسپێردرایە .[100] سەرباری ئەوەش قەبارە و شوێنی بارەگای مسیۆنێرییەکە خراپ دەستنیشانکرابوو . لە نامەیەکدا کە ساڵی ١٨٤٥ بۆ دەزگای مسیۆنێری (هیراڵد/مژدە) نێردراوە ، (تۆماس لۆریە و د.ئازەریا سمیس) ئاماژە بەوە دەدەن کە بارەگاکە لە جێگایەکدا بنیاتنراوە کە بناغەیەکی کۆنە و لەنێو کورددا بە (قەڵا) ناسراوە .[101] ئەو ڕاستییەی کە لە سەروبەندی دامەزراندنی بارەگاکەدا بووە هۆی وروژاندن . سەبارەت بەو گومانەی لە پێگەی بارەگای مسیۆنێرییەکەدا دەکرا ، لایارد پارێزەرێکی بەجۆشی مسیۆنێرە ئەمەریکییەکانە ، کە دەڵێت:" ئەوان بەسەر لوتکەی گردێکی پەراگەندەوە

---

[99] Layard , Discoveries, 424.

[100] letter from Dr,Grant dated Aug.1842,Missionary Herald,40,no 1(Jan.1844),24.

[101] Laurie and Smith ,118.

بوون کە بەسەر تەواویی دۆڵەکەدا دەیڕوانی . دەبوایە شوێنێکی کەمتر سەرنجڕاکێش و زیاتر سادەو شاراوە لەو ڕووەوە هەڵبژێردرایە . هەروەها سەیر ئەوەیە ئەوانەی هێندە باش شارەزای تایبەتمەندیی ئەو خێڵانە بوون کە هاتبونە نێویان و دەبوو لەپاڵیاندا نیشتەجێبن . پێویست بوو بەو چەشنە خۆیان جیانەکردایەتەوە ."[102]

**ڕۆڵی حکومەتی عوسمانیی :** پێویستە بایەخدار چاو لە بەرپرسیارێتیی حکومەتی عوسمانیی لە ڕوودانی پێکدادان لە نێوان کورد و نەستورییەکاندا نەپۆشێت . ئەوانە هەردووکیان بۆ ماوەیەکی درێژ دەستوپێوەندێکی سەرکەش بوون . پێکدادانی بەو چەشنە ، وێڕای ئەوەی هەردوو دوژمنەکەی لاواز دەکات و لەوانەیە نەستورییەکانیشی بە تەواویی تێدابچن ، بیانوویەکی نایاب دەداتە حکومەتی عوسمانیی بۆ ئەوەی دەست لە کاروباری کورد وەربدات .

هەڵوێستی والی موسڵ لەسەروبەندی داگیرکاریی وڵاتی نەستورییەکان لەلایەن هێزەکانی بەرخانەوە بنەمایەکی ڕاستەقینە سەبارەت بە سۆراغکردنی نیازپاکیی و مەبەستی ئەو والییە دێنێتەدی . ئەوەی گرنگە ، هێزەکانی والی موسڵ کە بەدرێژایی سنووری وڵاتی نەستورییەکان نیشتەجێکرابوون ، لەماوەی پەلاماری هێزەکانی کورد و دواتر کۆمەڵکوژیی ئەو خەڵکە چارەڕەشە ، لە شوێنی خۆیان نەجوڵان و سستییان نواند . وێڕای ئەوەی چەندین جار مارشەموونیان لەوەدڵنیا کردەوە کە دەیانپارێزن . لەراستییدا ئینجەبەیرەقدار محەمەد پاشا بەشداریی لە کەمارۆدانی وڵاتی نەستورییەکان کرد ، لە جیاتی ئەوەی بەدەم نەستورییەکانەوە بچێت و هاوکارییان بکات ، ئەمەش ئەرکی داگیرکارییەکەی ئاسانتر کرد.[103] لەراستییدا بەڵگەیەکی وانیە گومان بخاتە سەر ئەوەی کە والی موسڵ لەو تاوانکارییەدا هاوبەش نەبووە ،هەڵوێستی نادیار و چالاکییە گوماناوییەکانی فرە لە نامەکانی مسیۆنێرە ئەمەریکییەکاندا ئاماژەی پێدراوە . چ لە کاتی ڕەشەکوژییەکە و چ دواتریش . زانیاریی ئەوە هەیە کە والی موسڵ کاتێک هەواڵی ڕەشەکوژیی نەستورییەکانی بیستووە شادمان بووە و بەشیشی لەو تاڵانییەدا هەبووە

---

[102] Layard . Nineveh. 1:153

[103] letter from Dr.Grant dated July 5.1843.Missionary Herald.39.no 11(Nov.1843).435-37.

که شڕخۆرەکان لە نەستورییەکانیان کۆکردبوووەوە.[١٠٤]

## دوو پەلاماری بەدرخان بۆ سەر چیاییە نەستورییەکان

یەکەمین پەلاماری ڕەشەکوژیی کرایە سەر نەستورییەکان لە ژوئێنی ١٨٤٣ دا ڕوویدا. هەرچەندە خێڵەکانی تیاریی و دیز ئامانجی بنەڕەتی پەلامارەکە بوون ، بەڵام ژمارەیەکی زۆری دیکەی کۆمەڵگەی نەستوریی تێومگلان و بوونە قوربانیی . هەرچەندە هێزە پەلاماردەرەکان لەلایەن بەدرخان بەگەوە ڕێبەرایەتیی دەکران ، بەڵام واپێدەچوو پشتگیریی و هاوکارییان لە والی ئەرزڕۆمەوە وەرگرتبێت ، ئەو هەرێمەی ناوچەی هەکاریی لەخۆ دەگرت .[١٠٥] بە پێی والی موسڵ ، ئەم هێزانە لە ناوچەکانی وانەوە تا ڕەواندز و لە دیجلەوە تا سنوورەکانی ئێران کۆکراونەتەوە . ئەو تەواوی ژمارەی هێزە پەلاماردەرەکانی بە سەدهەزار داناوە ، هەرچەندە دەگوترێت نەستورییەکان خۆیان بە حەفتا هەزاریان قەبڵاندووە .[١٠٦]

پێویست ناکات بچینە وردەکاریی ئەو زیانە ترسناکەی نەستورییەکان لەو پەلامارەدا تووشی بوون ، یان باس لەو وێرانکارییە بکەین کە وڵاتەکەیانی گرتەوە . زۆربەی ئەو شتانە لەلایەن لایارد و کەسانی ترەوە باسکراون. لەوانە مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان ،[١٠٧] ئەوانەی لەلایەن خێڵە پەلاماردەرەکانەوە نەکوژرابوون و گیانیان

---

[104] letter from Dr,Grant dated Aug.1843,Missionary Herald,40,no 1(Jan.1844),23-24.

[105] بەگوێرەی گرانت ، بەدرخان بە فەرمانی والی ئەرزڕۆم هەڵدەسوڕا ، کارمەندانی عوسمانیی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە وڵاتی نەستورییەکان بەرپرسیاربوون . ئەم والیە بەهۆی ئەو کارو تێکۆشانەیەوە بە پێدانی مێدال پاداشت کرا .لەکاتێکدا گرانت لە والی موسڵی وەرگرتووە ، ئەوەی جەختی لەوە کردووەتەوە کە جەنگ دژی نەستورییەکان لە سایەی فەرمانی والی ئەرزڕۆمدا بەڕێوەچووە

Dr.Grant in Missionary Herald 39, n.11 (Nov .1843),436 and 40,no 1(Jan.1844).

[106] letter from Dr,Grant dated Aug.12.1843,Missionary Herald,39.no12(Dec.1843),453.

بەگوێرەی شێرکۆ ئەو هێزەی لە سایەی بەدرخاندا پەلاماری نەستورییەکانیاندا ، دەهەزار کەسێک دەبوون .

[107] لایارد ژمارەی کوژراوانی کۆمەڵکوژییەکەی بە دەهەزار داناوە ، ئێدوار برێسی مسیۆنێری ئەمەریکیی بە حەوت هەزاری داناون Layard . Nineveh. 1:153;

دەربازکردبوو وەك دیل راپێچی زیندانەکان کران . ژمارەیەکی کەم توانیان بەرەو موسڵ یاخود ورمێ هەڵبێن .[108] دوای ریسواکردنێکی توند لەلایەن حکومەتی بەریتانییەوە ، لەگەڵ هەوڵ و تێکۆشانی (سێر ستافۆرد کانین) ی باڵیۆزی بەریتانیا خۆی کە رۆڵی هەبوو لە ئازادکردنی ژمارەیەکی زۆر لە دیلە گیراوەکان .[109]

دووەمین پەلاماری ولاتی نەستورییەکان لەساڵی ١٨٤٦ دا روویدا ، ئەوەش راستەوخۆ دژی تخوما ئاراستەکرا ، ئەو خێڵەی لە پەلاماری یەکەمدا چووبووە پاڵ هێزە داگیرکەرەکان . هەروەها ئەمجارەیان ، ئەشیتا کە لە داگیرکاری یەکەمدا هێرشی نەکرابووە سەر ، پەلاماردرا و کوشتاریان لێکرا . هەروەك داگیرکاریی یەکەم باس لە وێرانکارییەکی سەخت و سەرپەراندنێکی فرە دەکرێت.[110]

## کەوتنی بەدرخان :

ئینگلتەرا ، لەلایەن فەرنساوە پشتگیریی کرا و هەردووکیان بە توندیی ناڕەزایی خۆیان پێشکەش بە دەروازەی باڵا کرد تێیدا داوای کۆتاییپێهێنانی لەنێوبردنی ئاسورییەکانیان و لابردنی بەدرخانیان کردبوو . دەگوترێت ئەو دوو حکومەتە ئەورووپییە بەڵێنی یارمەتییان بە دەروازەی باڵا دابوو . بەوەش ، لەسۆنگەی پێداگریی و

---

letter from Breath dated July.27,1846,Missionary Herald,42,no12(Dec.1846),407.

بەگوێرەی ویگرام و ویگرام، برایەکی بەدرخان بەگ بڕیاریدا لە ترسی ئاکامی کارەساتهێنەری ئابووریی ئەو کۆمەڵکوژییە کە رێگەی پێدرابوو بەردەوام بێت و نەوەستێنرێت، سەرنجی میر بەشێوەیەکی کرداریی رابکێشێت هەربۆیە بەرگی نەستورییەکی قەڵەی کردەبەر و خاکەنازێکیشی دا بەسەر شانیدا و خۆی کرد بە بارەگای میردا و هەموویانی حەپەساند. میر گوتی: "ماشاءالله ، ئەم بەرگ گۆڕینە مانای چی ؟" براکەی میریش ئاماژەی بەوەدا کە گەر بێتوو هەموو نەستورییەکان وەك میر بەتەمایە بەتێکڕای لەناوبچن ، ئیدی هەموو کوردێك دەبێت خەریکی زەوی کێلان بێت ، ئەو گوتی هەربۆیە بڕیاریداوە کە خۆی بۆ کاری ئایندەیی رادەهێنێت Wigram and Wigram.318

[108] letter from Dr.Grant ,Missionary Herald,40 ,no 2(Feb.1844),58;40,no 3(Mar.1844),82-83; 40,no 4(Apr.1844),165; 40,no 5(Jun.1844),166.

[109] Layard , Nineveh, 1:153.

[110] Ibid.,1:189.291.

به لایەنگریی و دەست لەپشتدانی ئەو دوو زلهێزە ، لە کۆتاییدا دەروازەی بالاّ بڕیاری سەرکوتکردنی بەدرخانی دا ، ئەو کارەی بیرلێکردنەوە و خۆئامادەکردنێکی زۆری خایاند .[111]

وێڕای ئەوەی ئەمە ئەرکێکی هێندە ئاسان نەبوو ، بەدرخان توانیبووی لەماوەی چەند ساڵێکدا ، کۆنفدراسیۆنێکی کوردیی فراوان لە ڕێگەی هاوپەیمانێتیی ژمارەیەکی زۆر لە سەرخێڵە کوردەکانی وەك: هەرکیی ، وان ، موکس و هەروەها بدلیس پێکبهێنێت .[112] هەروەها بەدرخان توانیبووی فەرمانڕەواکانی ناوچە دووردەستەکانی وەك فارس و ئەردەلاّن هانبدا کە پەیوەندیی بە کۆنفدراسیۆنەکەیەوە بکەن .[113] هێزەکانی باش ئامادەکراو و ڕاهێنراو بوون ، باس لەوە دەکرێت کە بەدرخان کارگەی تفەنگ و تەقەمەنیشی لە جەزیرەی ئیبن عومەر دامەزراندبوو .[114]

سوپایەك دژی بەدرخان نێردرا ، بەلاّم ئەو زۆری لا گران نەبوو ئەو سوپایە تێکبشکێنێت . دوای ئەم سەرکەوتنە ، بەدرخان بڕیاریدا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئیمپراتۆریی عوسمانییدا بگەیەنێتە ئەوپەڕیی توندیی ، ئەو سەربەخۆیی دەوڵەتەکەی ڕاگەیاند و پارەی خۆی لێدا کە لەسەری " بەدرخان میری بۆتان" هەڵکەنرا بوو .[115]

---

[111] Chirguh, La question kurde,16.

[112] Ibid.

ئەم پیاوانە بریتیبوون لە : نوورولّابەگ ، خان مەحموود و خان عەبدالّی برای ،لەگەڵ شەریف بەگدا . نوورولّا بەگ بەگشتیی لەم لاپەڕەیەدا ئاماژەی پێدراوە و شەریف بەگیش پاشتر قسەی لێدەکرێت . خان مەحموود لە پێگەیەکی ئاڕاندیەك ناوبوونەوە سەری هەڵدا و بووە یەکێك لە کەسایەتییە هەرانێرەوەکانی کوردستانی ناوەند . ئەو و چەند برایەکی بۆ ماوەیەکی زۆر بەشی زۆر دەستیان بەسەر ناوچەی باشووری دەریاچەی وان دا گرتبوو . عەبدالّ خانی برای کە لەگەڵ بەدرخانیش دا زۆر کۆك نەبوو ، بەلاّم لە کۆتاییدا چووە نێو هاوپەیمانییەتەکەیەوە ، ئەوەی قەلاّی مەحموودییەی (خۆش ئاب) ی بەدەستەوە بوو . خان مەحموود توانی وان بگرێت و لەژێر دەستی خۆیدا بیهێڵێتەوە.

Shiel, J.Not on a Journey from Tabriz Through Kurdistan via Van, Bitlis, Serat, and Erbil, to Sulaimaniyah, in July and August, 63-64; Brant ,386-88.

[113] Chirguh, La question kurde,14.

[114] بلەج شیرکوە ، القضیة الكردیة ، ماضي الكرد و حاضرهم ، قاهرة ، ١٩٣٠ ، ٢٧

[115] Chirguh, La question kurde,16.

ئەمێستا کە مەترسیی محەمەدعەلی والی میسر کەم بووەتەوە ، حکومەتی عوسمانیی دەتوانێت سەرنجی خۆی و هێزی سوپاکەی بە ئاراستەی بەدرخان و کۆنفدراسیۆنەکەیدا وەرگێڕێت .سوپایەکی مەزن بە فەرماندەیی فەرماندەی باڵا ژێنراڵ عوسمان پاشا ، کە لەلایەن ژێنراڵ عومەرپاشا وسەبری پاشاوە هاوکاریی دەکرا ، دژی بەدرخان ئاراستە کرا . یەکەمین شەڕی گرنگ لە نێوان سەپای عوسمانیی و هێزەکانی بەدرخان دا ، لە دەوروبەری ورمێ قەوما و دەگوترێت بە قازانجی بەدرخان شکاوەتەوە ، هەرچەندە جیابوونەوەی میر عیزەدین شێر ، کە خزمی بەدرخان و یەك لە فەرماندەسەرەکییەکانی سوپاکەی بووە ، زەمینەی ۆ سوپای عوسمانیی خۆشکرد پایتەختەکەی بەدرخان، واتە جەزیرەی ئیبن عومەر داگیر بکەن .ئەم پەرەسەندنانە بەدرخانیان ناچارکرد بە هێزەکانییەوە بە خێرایی بە ئاراستەی رۆژئاوادا بکشێت و ئامانجی گێڕانەوەی پایتەختەکەی بێت ، کە توانی پەلاماری بدات و سەرلەنوێ دەستی بەسەردا بگرێتەوە و عیزەدین شێر و تورکە هاوپەیمانەکانی دەرپەڕێنێت .[116]

هەرچەندە ئەم سەرکەوتنە زۆری نەخایاند ، سوپای عوسمانیی کەوتنەوە پەلامار و وێڕای بەرگرییەکی سەخت ، بەدرخان پاشا ناچار بوو جەزیرەی ئیبن عومەر جێبهێڵێت و پەنابەرێتە بەر قەڵای ئێڤرە (ئوروخ) .[117] هاوکات خان مەحموود ویستی بە پەلە بەدەم بەدرخانەوە بچێت ، بەڵام رێگەی لێگیرا و لە تیل (تیلە یا تیلۆ) لە نزیك شوێنی یەکگرتنی بۆتان و رووباری دیجلە ، لە لایەن سوپای عوسمانییەوە کە جەنگاوەرانی ئێزیدییان لەگەڵ بوو ، تێکشکێنرا .[118]

بەردخان بۆ ماوەی هەشت مانگ لەقەڵا گەمارۆدراوەکەیەوە لەبەرامبەر کۆهێزەکانی سوپای عوسمانیی و میر عیزەدین شێردا خۆی راگرت . لەبەر ئەوەی پێویستییەکانی شەڕ و تەقەمەنیی بەتەواویی لێبڕابوو ، ناچاربوو داوای ئاشتیی بکات ، داواکەی ئەوەبوو بەمەرجێك خۆی بەدەستەوە دەدات کە مامەڵەیەکی شیاو بکرێت ، بەدرخان بۆ ئەستەمبوڵ گواسترایەوە و لەوێشەوە بۆ کاندیا لە کرێت دوورخرایەوە .[119]

---

[116] Ibid.,17.

[117] Ibid.

[118] Layard , Discoveries, 1:50.

[119] Chirguh, La question kurde,17

ڕێگەی پێدرا کە خێزانەکەی و دووسەد کەس لە دەستوپێوەندەکەی لەگەڵدا بێت . بەدرخان بە پاڵپشتیی ئەم دەستوپێوەندانەی بوو کە لە ساڵی ١٨٥٦ دا توانی ڕاپەڕینی کریتە یۆنانییەکان تێکبشکێنێت .[١٢٠] لەپاداشتی ئەوە ، ڕێگەی درا بگەڕێتەوە ئەستەمبوڵ و لەوێشەوە ڕەوانەی دیمەشق کرا کە تا مردنی لە ساڵی ١٨٦٨ لەو شارە نیشتەجێ بوو.[١٢١] بەدرخان نەوەیەکی زۆری لەپاش بەجێما کە بەشێکیان لە ساڵانی دواییدا بە جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کوردەوە پەیوەست بوون.[١٢٢]

حکومەتی عوسمانیی پاش شکستپێهێنان و دوورخستنەوەی بەدرخان کەوتە ڕیزەی هاوپەیمانە پێشینەکانی و یەك بەدوای یەکدا سەری پێدانەواندن . خان مەحموود پاش ئەوەی ناچارکرا خۆ بەدەستەوە بدات ، دوای شکەنجە و بێڕێزییەکی زۆر کوژرا .[١٢٣] نوروڵڵابەگی هەکاریی ، پاش بەرگرییەکی درێژخایەن ، گیرا و دوورخرایەوە .[١٢٤] شەریف بەگی بدلیس کەوا پێدەچوو بەرگرییەکەی لە هەمووان زیاتر درێژەی خایاندبێت ، لە کۆتاییدا گیرا و ساڵی ١٨٤٩ دوورخرایەوە .[١٢٥]

پاش لابردنی بەدرخان ، عیزەدین شێر لە شوێنی ئەو وەك میری بۆتان فەرمانڕەوایەتیی دەکرد ، کەمتر لە دەیەیەك دواتر ، لە سەروبەندی جەنگی کریمەدا ، عیزەدین شێر دژی تورکەکان ڕاپەڕی ، پاش بەرگرییەکی هیوالێبڕاو سەرکوتکرا و دەسەڵاتەکەشی ڕووخێنرا .[١٢٦]

---

[120] E.M. Noel, Diary,53.

[121] Ibid.;

[122] هەرچەندە بەدرخان خێزانێکی مەزنی جێهێشت ، بەڵام هەواڵی جیاواز سەبارەت بە ژمارەی نەوەکانی هەیە بەگوێرەی سەرچاوەیەك ، ئەو چل کوڕ و چواردە کچی هەبووە بەگوێرەی نێلفینیستۆن ، ئەو شەست و پێنج کوڕی هەبووە .

Letter from Major Trotter to Marquis of Salisbury dated Dec. 28, 1878, in Great Britain , Turkey No. 10 (1879),Cmd .2432(London:H.M. Stationary Office,1879),12; Elphinston,"The Azizan ," 250

[123] Safrastian,58-59.

[124] Layard , Discoveries, 1:36.

[125] Ibid.; Minirsky, " Kurds".

[126] Minirsky, " Kurds"; Nikitine ,"Les Kurdes,194;.زكي،خلاصة تاريخ الكرد، ٢٥٥-٢٥٦

# بەشی چوارەم : شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی

## پێشینە : دەرکەوتنی شێخان وەك ڕێبەرانی نەتەوەیی

پشێویی و ئاڵۆزیی و جەردەیی لە ئاکامی سەرکوتکردن و کۆتاییپێهێنانی میرنشینە نیمچە سەربەخۆ کوردییەکان لە کوردستان سەریهەڵدا . دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەم بارودۆخەش ئەستەم نەبوو . با ئەوە وەبیربێنینەوە کە تورکان لەسەر جێبەجێکردنی سیاسەتی سەرکوتکردنی میرانی کورد و سەپاندنی کارگێڕیی ناوەندیی پێیان داگرت . لەکاتێدا سەبارەت بە بابەتی یەکەم سەرکەوتنیان بەدەستهێنا بەڵام بەگشتیی نەیانتوانی ئامانجی دووەم بێننە دی . دەستەپاچەیی حکومەت بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆی بگەیەنێتە ناوچە سەختەکانی کوردستان و بەشێوەیەکی بەهێز و راستەقینە ئەو دەسەڵاتە بەکاربهێنێت بووە هۆی ئەزۆکیی و ناکارایی رژێمە کارگێڕییە نوێیەکە .

ئەمەش بووەهۆی ئەوەی بەشێکی فراوان لەو ناوچانەی پێشتر لەژێر دەسەڵاتی میرەکانی بابان ، سۆران ، بۆتان ، بادینان و هەکارییدا بوون بکەونە بەر راوڕووتی سەرخێڵە کوردەکان ، ئەوانەی پێشتر لە لایەن میرە بەهێزەکانی ئەو میرنشینانەوە جڵەویان گیرابوو ، ئەمێستا هەوساریان پساندووە و بە ئارەزووی خۆیان لەوناوچانە جرتوفرتیانە و خەریکی راوڕووتن . زۆری نەخایاند دیاردەی جەردەییو تاڵانیی لەوناچانەدا بە بەربڵاویی پەرەیسەند . وەك ناوچەی هەمەوەند لەنێوجەرگەی میرنشینی بابان ، هەروەها زێدی زێبارییەکان لەناوچەی هەکاریی – بادینان .

ئەم هەلومەرجە زادەی شکستی دەسەڵاتی ناوەندیی بوو کە دوای کۆتاییهێنانی دەسەڵاتی میرەخۆجێیەکانی کورد نەیتوانی چالاکانە ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە . تەنیا چارەسەر بەدەست حکومەتەوە بریتیبوو لە ناردنی ناوبەناوی هەڵمەتی تەمێکارانە بۆ سەر ئەو ناوچانە ، ئەو هەڵمەتەی کە تێدا بەشێکی هێزەکان لە خێڵەکییەکان پێکدەهێنران ، ئەوەش بە بەردەوامی دەبووە سەرچاوەیەکی هێنانەکایەی ناتارامیی و بەرەڵایی و نەدەتوانرا ئامانجەکان بەدی بهێنرێن ، هەروەها زۆربەی ناوچە ناڵۆزەکان هیچ کات بە بەردەوامیی هێمنییان تێدا نەدەچەسپا .لە زۆربەی کاتیشدا ئەم چارەسەرە جگە

له شەپۆلێکی دیکەی خوێنڕێژی و توندوتیژیی و نوێبوونەوەی کێشە خێڵەکییەکان بەرهەمێکی دیکەی نەدەبوو .نەدەتوانرا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن چاو لەو هەلومەرجە بپۆشرێت ، نەبوونی ئاسایش ، پەککەوتنی جوڵانەوەی بازرگانیی ، وێرانیی و پەرتەوازەیی بەشێکی مەزنی وڵاتی گرتبووەوە .

لەهەموو ئەو ناوچانەی دەسەڵاتی میرانی پێشووی کوردی تێدا نەمابوو ، قۆناغ و زەمینەکە بۆ دەرکەوتنی شێوازێکی نوێی سەرکردایەتیی لەبار بوو . کەسایەتییەکی نامۆ کە شێخانێکن دەبنە سایەی دەسەڵاتێکی باڵا لە ناوچەیەکی ئاڵۆز و پڕ پشێوییدا . ئەوە یەکەم جارە لە پاش نەمانی دەسەڵاتی میرە کوردەکانەوە ، دەسەڵاتێك هاتە کایەوە کە لە دەسەڵاتی وردە سەرۆکە رکابەرەکان باڵاتر بێت و خۆی بەسەریاندا بسەپێنێت .

بەم شێوەیە ، شێخەکانی شەمدینان دەرکەوتن ، ئەوانەی توانیان لەسایەی شێخ عوبەیدوڵڵادا دەست بەسەر ناوچەیەکی فراواندا بگرن کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی میرەکانی بۆتان ، بادینان ، هەکاریی لە دەوڵەتی عوسمانیی و لە بندەستی میرەکانی ئەردەڵان لە دەوڵەتی قاجاریی ئێرانییدا بوون . هەروەها شێخەکانی بەرزنجە کە بەدوای میرەکانی باباندا هاتن و شێخەکانی بارزانیش کە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر بەشەکانی میرنشینی هەکاریی-بادیناندا چەسپاند . شێخانێکی دیکە هەبوون کە لەڕووی دەسەڵاتەوە لەوان کەمتر بوون . بەڵام هیچ کات لە رووی شکۆمەندیی و ئەو رێزەی لەلایەن شوێنکەوتەکانیانەوە لێیان دەگیرا کەمتر نەبوون ، هەر وەك شێخە قادرییەکانی بریفکانیی و نەقشبەندییەکانی بامەڕنێ کە دەسەڵاتی هەردوو لایان لەو ناوچەیەدا بوو کە پێشتر میرنشینی بادینانی لێبوو .

بەدەستەوەگرتنی پلەی سەرکردایەتیی نەتەوایەتیی لەنێو کورد دا لەلایەن شێخانەکانەوە تەنیا بۆ ئەو شکۆیە نەدەگەڕایەوە کە شێخەکان بەهۆی تایبەتمەندیی ئایینییانەوە هەیانبوو . بەڵکو ئاکامی ئەو بۆشاییە بوو کە نەمانی میرە مەزنەکان لە کوردستان پێکیهێنابوو . نەبوونی سەرکردەیەکی دنیایی کە بە ئەندازەیەك توانای ئەوەی هەبێت ئەو بۆشایی دەسەڵاتە پڕبکاتەوە . کوردان کە بە پەرۆشییەوە روویان لە شێخەکان کرد و ئامادەبوون کە بە رێبەرانی خۆیانیان دابنێن بەهۆی ئەوەوەبوو کە تا چ رادەیەك ئارەزووی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەیان دەکرد کە نەمانی میرەکان دروستیان کردبوو . هەروەها ئەو بۆشاییە سایکۆلۆجییە پێشان دەدا کە لە هزری نەتەوایەتیی کورددا

هاتبووه ئارا . نەبوونی کەسایەتییەکی بەرچاو و دەرکەوتە لەپاش ساڵی ١٨٤٧ەوە کە هەموو بنەما و بەها جوامێرییەکانی خێڵەکیی بگرێتە خۆ بۆ کورد وەك دیاردەیەکی ناسروشتیی و لەهەمان کاتیشدا ناناشنا دەهاتە پێش چاو . لەو کاتەوە سیستمی بەهاکانیان گورزێکی توندی وێکەوتبوو و توشی ترازان هاتبوو ، وادەردەکەوت شتێکی وایان دەست نەکەوێت دڵی خۆیانی پێ خۆش بکەن و لایەنی دەروونییانی پێ ببوژێننەوە . کوردان وەك زۆربەی دەستە مۆرڤایەتییە سەرەتاییە جەنگاوەرەکانی پێشوو ، پاڵەوانخوازیی و قارەمانپەرستیی لە ناخیاندا ریشەی داکوتابوو ، بێگومان ، گەلێکی سەرەتایی ساکاری بەو شێوەیە بەگشتیی لە قۆناغی پاڵەوانێتییدا دەژیان و چاویان لەوەوە بوو کەسێك لەنێو خۆیانەوە رابێت و دەسەڵاتی باڵا بگرێتە دەست .

## دەرکەوتنی شێخ عوبەیدوڵڵا

وەك ئاماژەی پێدرا ، سەرهەڵدانی شێخ عوبەیدوڵڵا دەرکەوتنی شێوازێکی نوێی سەرکردایەتیی بوو لەنێو کورددا . ئەو یەکەمین سەرکردەی ئایینیی-دنیایی کوردستان بوو . دیارە چەندین هۆکار زەمینەیان رەخساند تاکو شێخ دەستی بەم پایایە بگات . وەك پێشتریش ئاماژەی پێدرا سەبارەت بە سەرکوتکردنی میرە کوردەکان و بێبەشکردنی کورد لە سەرکردە نیشتمانییەکانیان و ئەو پشێویی و نائارامیی و قەیرانە ئابوورییەی سەراسەریی کوردستانی گرتبووەوە . هەلومەرجەکە لە ئاکامی جەنگی تورکیی-رووسیی (١٨٧٧-١٨٧٨) بەرەو خراپتر رۆیشت ، بەتایبەتیی ئەو وێرانکارییەی هەرێمەکانی باکووری رۆژهەڵاتی گرتەوە و ئاسەوارێکی کاولکەریان بەسەر ستراکچەری ئابووریی و کۆمەڵایەتییدا هێنا . هەلومەرجێکی نالەباری بەو شێوەیە کە ، توندوتیژیی ، برسێتیی ، پەتا و نەخۆشیی ، ئەمانە کۆمەڵگەی بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەبرد ، بێ ئەوەی حکومەت بۆ چارەسەرکردن و فریاکەوتنی دۆخەکە کارێکی لەدەست بێت .هەموو ئەوانە زیاتر هانی کوردیان دەدا چاویان لەوە بێت سەرکردەیەکی فریادرەس لەنێو خۆیاندا دەرکەوێت .

لەم دەمەدا بوو کە شێخ عوبەیدوڵڵا لەسەر شانۆ دەرکەوت . ئەوەی ئەوەی بنەماڵەی شێخایەتیی دەسەڵاتداری شەمدینان و کوڕی سەید تەهای شکۆمەند و رێزدار بوو . ئەو پاش ئەوەی جێگەی شێخ ساڵحی مامی گرتەوە کە سەرۆکی تەریقەتی

نەقشبەندیی بوو ، ناوبانگی ئایینیی بنەماڵەکەی بە میرات کەوتەدەست . ئەوەی لەلایەن خەڵکە بێ هیوا و بێ دەرەتانەکەوە وەك فریادڕەسێکی خواداد سەیری دەکرا ، لە ڕاستییدا ئەو بۆ خۆشی هەر وای لەخۆی دەڕوانی . پاش ئەوەی توانی ڕێژەیەکی مەزنی ناوبانگ و دەسەلات بەدەست بێنێت ، بەشێوەیەك بووە بەشێکی چەسپاو لەو بیروباوەڕەی لای شێخ هەبوو . ئەویش ئەوەبوو کە هەلومەرجەکە لەوە زیاتر بێدەنگەی لێ نەکرێت و خۆی وەك ئەو پیاوە دەبینی کە کاروبارەکان چاك بکات و ڕاستی کاتەوە . ئەو خۆی وەك خاوەن پەیامێك دەهاتە پێش چاو و خەڵکەکەشی هەر بەو چاوەوە لێیان دەڕوانی .

کەسایەتیی شێخ دوو لای لەخۆگرتبوو ، لایەکیان وەك سەرکردەیەکی نەتەوەیی کە خۆی بۆ ڕازەکردنی گەلەکەی تەخان کردبوو ، ئەوەکەی تریان وەك موسوڵمانێکی لەخواترس کە هەوڵی گێڕانەوەی فەرمانڕەوایەتییەکی بێگەردی موسڵمانەتیی لە سەراسەری نیشتمانەکەیدا دەدا ، ئەو بڕوایەکی پتەوی بەوە هەبوو کە گەندەڵیی حکومەت و کارمەندەکانی هۆی ڕاستەقینەی ئەو نەهامەتیی و مەینەتییەن کە تەواوی کوردستانی گرتۆتەوە ، هەروەها ئەرکی سەرشانی بریتییە لە بەدیهێنانی دادپەروەریی ، گێڕانەوەی ئاسایش و کۆتاییهێنان بەو ئاژاوە و پشێویی و شەڕەنگێزییەی بە هەموو شێوەکانیەوە لەناوچەکەدایە . دەرکەوتنی سەرکردەیەکی وا لە قۆناغێکی ئاڵۆز و هەستیاری بە شێوەیەدا کە بە زمانی پەیامبەر بدوێت و ئاکاری میرێکی دەسەلاتداری هەبێت ، بە پەرۆشێکی بێ‌وێنەوە هەوڵی خۆشگوزەرانی ڕۆڵەکانی گەلەکەی بدات ، ئاسەوارێکی کاریگەریی لەسەر کورد هەبوو ، ئەوانەی گەورەیی بنەماڵە و پیرۆزیی باپیرانی سۆزێکی بێپەروای تێدا چاندبوون ، وێڕای بەهێزیی کەسایەتیی و چاکەخوازیی خۆی کە بە گوتەکانی بێهیواییانی دەڕەواندەوە .

ئەو ڕۆڵەی شێخ چاوەڕێی دەکرد بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بە قەومانی جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ و ئەو ڕووداوانەی بەدوایدا هاتن هاتە پێش . پێدانی سەرکردایەتیی خێڵەکانی کورد لەو جەنگەدا و پێشنیازکردنی ئەرکی بەرپرسیارێتیی لە پاراستنی هەرێمەکانی باکووری ڕۆژهەلات لەلایەن سوڵتان-خەلیفەوە بە شێخ کاریگەرییەکی مەزنی لە ڕەوتی ڕووداوەکانی پاش جەنگ لە کوردستاندا هەبوو ، بە چەشنێك لەوانەیە کە فاکتەرێکی بنەڕەتیی بێت لە دەرکەوتنی شێخ وەك ڕێبەرێکی

نەتەوەیی-ئایینیی ، ئەو رۆڵەی کە پێشتر جگە لە سەلاحەدینی ئەیوبیی بەناوبانگ لە شەڕی خاچهەڵگرەکاندا ! کەسێکی دیکە نەیبینیوە . لە راستییدا ، ئەم دانانەی شێخ ، هیچ گومانێکی لەسەر پێگەی مەزنی ناوبراو لە کوردستاندا نەهێشتەوە ، پایەیەکی وا کە بەشێوەیەکی فەرمیی لەساڵی ١٨٤٧ەوە بە باڵای هیچ کوردێکدا نەبڕاوە .

شێخ عوبەیدوڵڵا کە خۆی لە پلەوپایەی فەرماندەیەکی باڵای بەو چەشنە بەسەر هاونیشتمانەکانی خۆیدا بینیەوە ، ئامادە نەبوو بە ئاسانیی دەست لەو پلەوپایە نوێیە هەڵگرێت . چارەنووسی هەڵبژاردبوو ، شێخ وەك هەر پیاوێکی دیکەی چارەنووس بووە ئامراز و وەبەرهێنی چەند هێزێکی خرۆشاو کە هێنانە ئارای لە توانای لایەکی دیکەدا نەبوو ، لەماوەی چەند ساڵێکی کەمیشدا بوو بە سەرکردەیەکی کوردی دانپێدانراوی قۆناغەکەی خۆی .

ژمارەیەك لە نووسەرانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم تێبینیی بایەخی رەگەزی ئایینییان لە دەرکەوتنی شێخ و دەسەڵات بەدەستەوەگرتنیدا کردووە . (جۆرج کێرزن) نووسیویەتی :" سەرۆکێك ناوی شێخ عوبەیدوڵڵایە ، ناوبانگێکی مەزنی بەهۆی پیرۆزیی کەسایەتییەوە هەیە ...هێدی هێدی بەشێوەی رێبەرێکی نەتەوایەتیی کورد لێی دەڕوانرێت ."[1] (مەیجەر ترۆتەر) ی کۆنسوڵی گشتیی بەریتانیی لە ئەرزیرۆم و هاوچەرخی شێخ باسی لەو رێز و شکۆیە کردووە کە لەلایەن موریدانیەوە لەحاستیدا نوێنراوە :" لەوەدەچێت ئەوە چەسپاوبێت ، کە شێخ عوبەیدوڵڵا بەدەسەڵاترین پیاوی کوردستانی رۆژهەڵاتە ، هەروەها لەنێو کوردانی سەر سنووردا کەسایەتیی و دەسەڵاتی لە سوڵتان بەرێزتر و شکۆمەندترە ."[2] پێگەی ئایینیی شێخ زۆر بە جوانیی لە نووسینەکەی (ئێس.جی.ویلسن)دا دەردەکەوێت :" ئەو لەدوای سوڵتان و شەریفی مەککە ، پیرۆزترین کەسایەتیی لەنێو سوننیەکانی کوردستاندا هەیە ، هەزارەها کەس ئامادەن شوێنی بکەون ، نەك وەك سەرۆکێك ، بەڵکو وەك پەیامبەرێکی خودا ."[3] بەگوێرەی هاوڕێیەك کە بە

[1] Curzon,George N. Persia and Persia Question(London:Longmans,Green,1892)1:53.

[2] Enclo. In No.22. Trotter to Goschen , Therapia .Oct. 20. 1880 . in Great Britain . Turkey No. 5 (1881),17.

[3] Wilson S.G . Persian Life and Customs, 110.See also Robert. E. Speer. "The Hakim Sahib,"74.

باشیی شێخ عوبەیدوڵڵای دەناسی ، شێخ خۆی بە خاوەنی کەسایەتییەك دەزانی کە سێیەمین پلەی بایەخداری لەنێو پلەدارانی ئاینییدا هەیە ، وێڕای ئەوەی خۆی بە پاشایەکی دنیایی کورد لەقەڵەم دەدا ."[4]

## کەسایەتیی و تایبەتمەندییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا

وێڕای ئەوەی زانیارییەکی فرەمان لەمەڕ کەسایەتیی و تایبەتمەندیی شێخ عوبەیدوڵڵا هەیە ، بەڵام وێناکردنی وردی ئەم پیاوە ناوازە و ئاڵۆزە ئەرکێکی هەروا ئاسان نیە . سەبارەت بە شێوە و ڕووخساری ، زانیارییەکی زۆر کەممان لەبەر دەستە . یەك لەو وێناکردنانە ئەوەیە کە دکتۆر (جەیمس.پی.کۆچران) ی مسیۆنێری ئەمەریکیی و ئەو پزیشکەی کە لەکاتی نەخۆشیی شێخدا چۆتە لای لەماڵەوە لە ئەمریی و سەردانی کردووە . کۆچران کە سەبارەت بە تایبەتمەندییەکان و کەسایەتیی شێخ زۆری گوتووە ، لەمەڕ لایەنی ڕەنگ و ڕووخساری زۆر کەمی درکاندووە ، لەو بارەیەوە دەڵێت :" شێخ پەنجاویەك ساڵێکی تەمەنە ، ڕەنگوڕووخساری سەرنجڕاکێشە و دەچێتە دڵەوە ، کەواوسەڵتەیەکی فشی لەبەردایە و مەندیلێکی سپیشی لەسەرێوە پێچاوە ."[5]

وادەردەکەوێت کە شێخ چووبێتە دڵی هەموو ئەوانەی کە ناسیویانە ، یان لەدوورەوە هەواڵ و ئاکاریان گوێ لێبووە ، تێکڕای سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە شێخ لە ئاستێکی خواپەرستیی ، چاکەکاریی ، خۆپارێزیی و دڵسۆزیی بۆ ئەرکەکانی بووە . بەگوێرەی د.کۆچران :" ئاکار و هەڵسوکەوتی بەتەواویی لەگەڵ ئاکاری کارمەندە تورك و فارسەکاندا جیاوازیی هەیە ، خۆی یان کوڕەکەی ، خۆیان سەرۆکاریی ئەو کارانە دەکەن کە دەخرێنە بەردەستیان ، هەرچەندە ئەو کارەش زۆر بچووك بێت ...خۆی و

---

[4] Report by Dr.Cochran, June 1,1880, To Board of Missions ,quoted by Speer , 75.Cf. Enclo. 4. In No.8,extract from Letter to Consul-General Abbott,Urmiya ,July 8,1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),9.

هەرچەندە ناوی د.کۆچران لەو سەرچاوەیەی دواییاندا نەهاتووە ، بەڵام لێکچوونی هەردوو نامەکە بەتەواویی دەیسەلمێنێت کە نووسەری هەردووکیان کۆچرانە.

[5] Quoted in Speer,79.

کورەکەی لە بەیانی زووەوە تا درەنگانی نێوارێ سەرقاڵی کاروباری بەدواداچوونی بەرژەوەندییەکانی خەڵکن ."[6] وادیارە شێوە ژیانی ساکار و خۆگرتنەوەی شێخ شوێنی لەسەر ئەندامانی مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان دانابێت و بەقووڵیی کاری تێکردبن ، کۆچران ئاماژە بەو ژیانە ساکارە دەکات کە شێخ لە ماڵەکەیدا هەیبووە و هەروەها دەڵێت " هیچ جۆرە خواردنەوەیەکی ئەلکهولیی نایەتە شارۆکەکەوە ."[7] هەروەها ویلسن لەوبارەیەوە دەڵێت :"لە رووی جل وبەرگ و خواردنەوە سادەیە ."[8]

لە رووی پاکیی و دادپەروەرییەوە ، وێڕای ئەوەی دادپەروەریی توند سروشتێکی ئاکاری ئەم کەسایەتییە شکۆمەندە بەسامە بوو ، وەك ویلسن دەڵێت " هەم یاسادانەر و هەم دادوەریش بوو ."[9] شێخ بە بەراورد لەگەڵ ئەو گەندەڵیی و بێدادییە بەربڵاوەی وەك دوو پەتا لە قاجاریی ئێرانیی و عوسمانیی تورکییدا هەبوو ، بە چاکەکاریی و دادپەروەریی ناسرابوو . شتێکی بەرچاو بوو کە جەخت لە پێداگریی و سەرکەوتنی شێخ لە سەپاندنی بەهایەکی بەرزی دروستکاریی و پاکیی و رەوشتبەرزیی بەسەر خەڵکەکەیدا دەکردەوە . گومانی تێدانیە کە ئەو دادپەروەرییە زۆربەی جار بە بەشێوەیەکی توندورەق خۆی وێنا دەکرد ، بەتایبەتیی لەهێندێك حاڵەتدا کە پێویست ناکات – ئەویش لەکاتی سەپاندنی ئەو بەهایانە بەسەر گەلێکدا کە پێشتر لێی رانەهاتووە – بەگوێرەی کۆچران " دەگوترێت کە شێخ فەرماندەیەکی دروستکار و دادوەرێکی دادپەروەرە ، خۆی هەرگیز بەرتیل وەرناگرێت و لێناگەڕێت پیاوەکانیشی ئەو کارە بکەن ، کوشتن سزای هەرکەسێکە ئەو یاسایە پێشێل بکات ."[10]

هەرچەندە وادەردەکەوێت ، کە شێخ ع سنوورێکی ئاشکرای لەنێوان یاساوڕێساکان و خواستی خۆیدا رەچاونەکردبێت . هەرکارێك پێچەوانەی خواست و

---

[6] Enclo. 4. In No.8,extract from Letter to Consul-General Abbott,Urmiya ,July 8,1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),9.

[7] Ibid.

[8] Wilson S.G , Persian Life and Customs,110.

[9] Ibid.

[10] Enclo. 4. In No.8,extract from Letter to Consul-General Abbott,Urmiya ,July 8,1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),9.

ویستیەوە بوو‌بێت ڕووبەڕووی سزای توند و دەستبەجێ بۆتەوە . جارێکیان لەوە ئاگادار کرایەوە کە ژمارەیەك لە پیاوەکانی پەلاماری گوندێکیان داوە و تاڵانیان کردووە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی شێخ بەڵێنی پاراستنی بەو گوندە و خەڵکەکەی داوە ، شێخ عوبەیدوڵلا ئەو تاڵانچییە بەدبەختانەی هەڵواسیی .[11] دەگوترێت کۆچران ئەم ڕووداوەی لەیادا مابێتەوە هەربۆیە کاتێك باس لە شێخ دەکات بە دادپەروەر و فەرمانڕەوایەکی بەسۆز وەسفی دەکات " ئەگەر بە ویستی ئەو بجوڵێنەوە – بەپێچەوانەوە زۆر دڵڕەقە ."[12] پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ئەو توندوتیژییە لەو قۆناغەدا دیاردەیەکی ناوازە و نامۆ بە کوردستان نەبووە .

وێڕای ئەو توندیی و زەبرەی شێخ لەهەمبەر خەڵکەکەی خۆی نواندوویەتی ، کەچی لەحاست خەڵکانی دی بەشێوەیەکی سەیر لێبوردە و بیرکراوە بوو . ژمارەیەك لە مسیۆنێرەکان کە شێخ عوبەیدوڵڵایان دەناسی ، بەسەرسوڕمانێکی مەزنەوە ئەم تایبەتمەندێتیەیان تێبینیی کردبوو . (سپیر) بە" ئەو پیاوەی خاوەن سۆزێکی مەزن و لێبوردە بوو " باسی دەکات ، هەروەها ئاماژەی بەهەڵوێستی دۆستانەی شێخ لەحاست بیانییەکان و مامەڵەی دادپەروەرانەی لەگەڵ کریستیانییەکاندا داوە ، ئەو بەو شێوەیە باسی هەلومەرجەکەی خەڵکی کوردستان دەکات :

" شێخ لە نووسراوێکی خۆیدا دیدێکی مەزنی لەهەمبەر نەستورییەکان پێشاندابوو . ئەو نەستورییەکانی بەباشترین ڕەعییەتەکانی سوڵتان ناوهێنابوو . سوڵتان لەسەر ئەو شێوە ناوهێنانە نارەزایەتیی دەربڕیبوو . سێجار نامەکەیان بۆ گەڕاندبووەوە ، شێخ دواجار گوتبووی " فرە لە ڕامیاریی نازانم ، بەڵام سەبارەت بە ڕاستبێژیی شتێك نەزانم ، ئەوەشی نووسیومە ڕاستییەکە ."[13]

بەو پێیەی شێخ ڕێبەرێکی ئایینیی مەزن بوو ، بێگومان شارەزاییەکی قوڵیشی لە هەموو ئەو زانیارییانەدا هەبوو کە لە وڵاتانی موسوڵماناندا بە زانستە ئایینییەکان

---

[11] Extract from letter by Dr.Cochran's sister, quoted in Speer.96.

[12] letter from Dr.Cochran to his friend Mc.Clement, publidhed in Buffalo Comercial Advertiser,July 26,1880, quoted in Speer.80

[13] Speer,74-75.

دەناسرێت .[١٤] لە د.کۆچرانەوە دەزانین کە شارەزایی ئەدەبی عەرەبیی و فارسیی بووە و لەنێو ئەوانەشدا خەریکی خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز (تەورات و ئینجیل) بووە ، کە لەلایەن دکتۆر خۆیەوە کۆپییەکی پێدرابوو . وەك هەر کوردێکی تێگەیشتوو و خوێندەوار ، لەوانەیە شارەزاییەکی فرەی فۆلکلۆر و ئەدەبی کوردیی بووبێت ، کۆچران بە ڕێزێکی زۆرەوە باس لە وریایی شێخ و تێنوێتیی بۆ زانیاریی دەکات :" وادەردەکەوت حەز لەوە بکات سەبارەت بە هەموو بابەتێك گفتوگۆم لەگەڵدا بکات ، لەماوەی ئەو هەفتەیەی کە لە مەزڵەکەیدا مابوومەوە ، چەند جارێك وتووێژی زۆر خۆشمان پێکەوە کرد ، ئەو زۆری پێخۆش بوو سەبارەت بە داهێنانە نوێیەکان و شتە سەیروسەمەرەکانی جیهانی ڕۆژئاوا ببیستێت ."[١٥]

## ئامانجەکانی شێخ عوبەیدوڵلا و چالاکییەکانی

### یەکخستنی کورد و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی

ئامانجی سەرەکیی شێخ بریتیبوو لە یەکخستنی کورد و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی . نازانین بە چ شێوەیەك ئەم هزرە لای شێخ گەڵاڵە بوو ، بەڵام دەزانین ئەو ڕووداوانەی کە هاوکات و پاش جەنگەکەی ساڵی ١٨٧٧-١٨٧٨ ڕوویاندا ڕۆڵێکی زۆری لە خەملینی ئەم هزرەدا هەبوو . وادەردەکەوێت کە بڵندبوونی پایەی ئەو سۆفییە تەواو خۆپارێزە بۆ بەدەستەوەگرتنی فەرماندەی گشتیی لەنێو گەلەکەی و لەو کاتە ئاڵۆزەدا ، کاریگەرییەکی قووڵ و ئاسەوارێکی مەزنی لە گۆڕانی بیرکردنەوەیدا کردبێت . ئەو کارە بۆ ئەو بەڵگەی بەخششێکی خوداوەندبوو بەهۆی چاکەخوازیی و خواپەرستییەوە پێی سپێردرابوو ، ئەوەش بڕوای بە سەرکردایەتیی لێوەشاوەی شێخ پتر کرد و بێگومان دەسەڵاتدارێتی بەرفراوانیشی لەلایەکی دیکەوە گۆڕانێکی توندی لە سروشت و ئاستی ئومێد و دەسەڵاتخوازییدا هێنایە ئارا . پاش

[١٤] ئەوانە بریتین لە :لێکدانەوەی قورئان ، زانستی فەرموودە ، فیقە، زانستی کەلام و سۆفیگەرایی و هتد

[15] Extract from letter by Dr.Cochran's sister, quoted in Speer.80.

ئەوەی راژە و بایەخە کۆنەکەی سەرکردەیەکی خۆجێ شوێنی بۆ بایەخێکی فراوانتر و زیاتر بۆ خۆشگوزەرانی تەواوی گەلەکەی بەجێهێشت ، بیری کوردستانێکی یەکگرتوو و سەربەخۆ لە مێشکیدا خەملّی و بە تەواویی بیروهۆشی داگیرکرد .

چەند نووسەرێکی شارەزا پشتگیریی ئەم بۆچوونەیان کردووە . (کلایتن) ی جێگری کۆنسوڵی بەریتانیی دەڵێت :" لەو بڕوایەدام کە پلانێکی گشتگیریی سەبارەت بە یەکخستنی کورد لە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و لە سایەی خۆیدا هەبێت."[16] (ولیەم ئابۆت) ی کۆنسوڵی گشتیی بەریتانیی لە تەبریز لەکاتی پەلامارە کوردییەکە بۆ ئێران بەم شێوەیە سەبارەت ئامانجی شێخ نووسیویەتیی:" مەبەستی بوو خۆی بکاتە سەرۆکی میرنشینێکی کوردیی و هەروەها یەکخستنی تەواویی کوردستان بەوەکەی تورکیا و ئێرانەوە ."[17] هەروەها (ترۆتەر) بەهەمان شێوە بۆچوونی خۆی سەبارەت بە خولیای دەسەڵاتدارێتی شێخ لە رووی هەرێمییەوە دەربڕیوە و دەڵێت :" گومانێکی وام لانیە کە ئامانجی یەکەمی ئەم پیاوە رزگارکردنی وڵاتەکەیە لە کارمەندەکانی سوڵتان و دانانی خۆیەتی بە فەرمانڕەوای کوردستان واتە بەشی باشووری وان و بەشی باکووری ویلایەتی موسڵ ، هەروەها چەندە بتوانێت دەسەڵاتی خۆی بەهەردوو ئاراستەکەدا فراوان بکات ."[18] (میستەر تۆمسن) وەزیری بەریتانیی لە تاران ، سەبارەت بە پلانەکەی شێخ بۆ دامەزراندنی میرنشینێکی کوردیی سەربەخۆ و ئەو ئامرازانەی کە شێخ دەیەوێت ئەو مەبەستەیان پێ بێنێتەدی گفتوگۆی کردووە و دەڵێت :

" وادەردەکەوێت گومانێك لەم جوڵانەوە و راگەیاندن و نامانە نەبێت کە بەم دواییە بۆ سەرۆکە کوردەکانی هەمەجۆرەکانی بەدرێژایی سنووری ئێران ناردوون ، کە ویستی شێخ راکێشانی لایەنگریی گەلی کوردو جیاکردنەوەیانە لە تورکیا و ئێران و دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردییە لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا ، لەپێناو ئەم ئامانجەشدا ، شێخ لەهەوڵی ئەوەدایە بە گفتپێدان و هەڕەشەلێکردن تەواویی خێڵەکانی کورد هانبدات لە جەنگێکی ئاشکرادا دژی ئەم وڵاتە (ئێران) بدەنە پاڵی ."[19]

---

[16] No.54.Clyton to Trotter.Van,Oct. 27. 1879, Great Britain . Turkey No. 5 (1881).33.

[17] Enclo. 1. No.61.Abbott to Tomson,Urmiya .Oct. 7,1880. in ibid..47.

[18] Enclo. In No.22, Trotter to Goschen , Therapia ,Oct. 20, 1880 in ibid.,16.

[19] No.61.Thomson to Granville.Teheran,Oct. 31, 1880,in ibid..45.

ئەم ئەركە بوو كە شێخ عوبەیدوڵڵا لە ئەستۆی گرتبوو ، هەموو توانا و لێهاتوویەكی خۆی بە برێكی فرەوە لە دووربینیی بۆ خستەگەڕ .

ئەو هۆكارانەی لەلای شێخ پاساوێك بوون بۆ یەكخستنی كورد لە دەوڵەتێكی سەربەخۆدا خۆیان بەسەردا سەپاندبوو بەشێوەیەكی وا كە هەمیشە شێخ لە نووسین و نامەكانیدا ئاماژەی پێدەدان و بەدرێژیی لەبارەیانەوە دەدوا:

١- لێكچوونی رەگەزیی ، كەلتووریی و زمانیی كورد ، ئەوەی وایان لێدەكات نەتەوەیەكی جیا پێكبهێنن .

٢- ئەو وێرانیی و ناثارامییە سەراسەرییە كە لە ئەنجامی بەدكارگێڕیی فەرمانڕەوایەتیی تورك و فارسیی هەموو كوردستانی گرتۆتەوە ، ئەوەی بۆتە هۆی بەدناوی خەڵكی كورد .

٣- ترس لە زاڵبوونی ئەرمەن لە كوردستاندا .

## بنەمای لێكچوونی گەلی كورد

بۆ چوونە نێو قووڵایی هزری شێخ عوبەیدوڵڵا زۆر گرنگە بزانین كە ئەو چۆن لە چەمكی نەتەوایەتیی گەیشتووە و ئەو بابەتە لەهزری ئەودا بە چ شێوەیەكە . وادەردەكەوێت كە شێخ بە تەواویی بڕوای بەوە هەبووبێت گەلی كورد نەتەوەیەكی جیاو سەربەخۆیە . ئەوان لێكچوونێكی تەواو لە رەگەز ، زمان و شێوەی ژیاندا هەیە وێڕای چەندین دیاردەی هاوبەشی دیكە .ئەوەش پێناسێكی ئاشكرا و تایبەتیان پێدەدات . لە نامەیەكیدا بۆ دكتۆر كۆچران نووسیویەتی :" نەتەوەی كورد لە زیاتر لە ٥٠٠٠٠٠ خێزان پێكهاتوون ، گەلێكی جیایە ، ئاینی (لەوانی دیكە)جیاوازە ، داب‌ونەریتی جیا و تایبەت بە خۆی هەیە ."[٢٠]

ئەم گوتەیە هیچ گومانێك لە بڕوای تەواوی شێخ بە یەكێتیی بنەڕەتیی گەلی كورد ناهێڵێتەوە .ئەو قسەیەش كە دەڵێت ئایینی كورد لە ئایینی ئەوانی تر جیاوازە ، جێگەی بایەخێكی زۆرە ، ئەوە بەڵگەیەكە كە تا چ رادەیەك

[20] Enclo.3 In No.61, Sheikh Obeidullah to Dr.Cochran, Oct. 5, 1880, in ibid.,47.

نەتەوایەتیی هەوڵی خۆجیاکردنەوە و خوێندنەوەی جیاوازییەکان ئەدات . چ تورک و چ فارس ، کە شێخ عوبەیدوڵڵا لەکاتی نووسینەکەیدا ئەوانی لەمزردا بوو، وەك کوردی موسوڵمان ، زۆرینەی کورد سوننیی شافعیین ، بەوهۆیەوە لەپێناو زەقکردنەوەی جیاوازیی تەواوی نێوان کورد و ئەو نەتەوانە ، شێخ عوبەیدوڵڵا هەوڵیداوە جیاوازیی مەزهەبیی گەورەتر پێشان بدات ، کە بەشێوەیەکی تایبەت سەبارەت بە کورد و تورك یەك نایەتەوە ، چونکە کوردیش وەك ئەوان سوننییە .

## ئاسەواری وێرانکاریی لە ئاکامی فەرمانڕەوایەتیی تورك و ئێرانییەکان

تێکچوونی ئارامیی و نەبوونی ئاسایش لەپاش سەرکوتکردنی رژێمە نیمچە سەربەخۆکانی کوردستان و هەروەها پاش جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ گەیشتە ئاستێك کە چەسپاندنی فەرمانڕەوایەتیی و کارگێڕییەکی رێکخراو لە ناوچەیەکی بەرفراوانی هەرێمەکانی باکووری رۆژهەڵات کارێکی مەحاڵ بوو . وێڕای ئەوەی تەواویی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە لەسایەی هەلومەرجێکی جەردەسالاریی و راورووتدا دەیان ناڵاند . وادەردەکەوت دەسەڵاتداران نەتوانن یاخود نەخوازن بەر بەو توندوتیژیی و وێرانکارییە بگرن کە هەڕەشەی لە سەراسەری ناوچەکە دەکرد .

بێگومان ئەو هەلومەرجە کە چیدی نەدەتوانرا چاوی لێبپۆشرێت یەك لە کاریگەرترین هۆکاری پێکدەهێنا کە قامکی لەسەر بیروکارە ئایندەییەکانی شێخ دادەنا . زۆری نەخایاند تەواوی کوردستان دەنگی ناڕەزایەتیی شێخیان بیست . ئەو ئۆباڵی باری نالەباری کوردستانی دەخستە ئەستۆی بەدکارگێڕیی فەرمانڕەوایانی تورك و فارسەکان . هەروەها رەخنەی لە گەندەڵیی و بێلیاقەتیی کارمەندەکانی سوڵتان و شا گرت . زیاتر پێی لێ هەڵبڕی و دژی ئەوە وەستا کە تورك و فارسەکان مافی ئەوەیان هەبێت فەرمانڕەوایەتیی کوردستان بکەن . ئەو دژایەتییەی کە تەنیا لە بواری گوفتاردا ئەوەستا ، هەروەك دەبینین چووە بواری کردارەوە و شێخ پەنای بۆ چەك برد . سەرەتا دژی تورکیا

و پاشتر دژی ئێران .

یەك لە رووەكانی نارەزایەتیی شێخ سەبارەت بە باڵادەستیی جەردەسالاریی لە كوردستان ، ئەو پەرۆشییەی بوو لەحاست ئەو بەدناوییەی بەسەر كورددا هاتبوو . لەونامەیەیدا كە لە رۆژانی یەكەمی پەلامارەكەی بۆ ئێران بۆ (ئیقبال ئەلدەولە)ی فەرمانداری ئێرانیی لە ورمێ ناردووە ، ئاماژە بەوە دەدات كە كوردان لە سایەی بێیاسایی و جەردەسالارییدا بەدناوبوون . چونكە جیاوازییەك لەنێوان تاوانكار و بێتاوان ناكرێت . ئەو حكومەتی توركیی و ئێرانیی بەوە تاوانباركرد كە نە ویست و نە توانایەكیان هەیە تا كوردانی خۆیان بەشێوەیەكی شیاو بەرێوەبەرن ، هەربۆیە گەلی كورد هەموو رێزێكی خۆی بۆ فەرمانڕەواكانیان لەدەست داوە .[21] ئینجا شێخ بە فەرمانداری راگەیاند :" لەبەر ئەم هەلومەرجانە ، كوردانی فارس و توركیا بڕیاریانداوە یەكبگرن و دەوڵەتێك بۆ خۆیان پێكبهێنن ، ئارامیی لەنێو خۆیاندا بچەسپێنن ، هەروەها پێكەوە بە نووسراوێك پەیمانی ئەوە بدەن چیدی پشێویی و ئاڵۆزیی لە وڵاتەكەیاندا روونەدات ."[22]

لە نامەیەكی دیكەیدا بۆ دكتۆر كۆچران ، پاش ماوەیەكی كەم لە پەلامارەكەی شێخ بەشێوەیەكی چڕوپڕتر سەبارەت بە تاوانەكانی هەردوو حكومەتی توركیی و ئێرانیی دواوە ، ئەوانەی هانیانداوە هەڵمەتە سەربازییەكەی خۆی ئەنجام بدات ، ئەو سەرلەنوێ پەرۆشیی و تووڕەیی خۆی بۆ ئەو بەدناوییە دەربڕیوە كە لە ناكامی بەدكارگێڕیی و پۆخڵەواتی ئەو دوو حكومەتەوە بەسەر كورددا شكاوەتەوە و نووسیویەتیی :

" لای هەموو نەتەوەكان بە شەڕەنگێز و گەندەخۆر ناسراوە(مەبەستی كوردە/سەردەشتیی) . بەم شێوەیە باس لە كوردستان دەكرێت . گەر یەكێكیان كارێكی ناقۆڵا بكات ، هەزارەها خەڵكی ئاشتییخوا و نەزەدۆستایان بەدناو دەبن . باش بزانە هۆكاری هەموو ئەمانە خەمساردیی دەسەڵاتدارانی تورك و ئێرانییە

---

[21] Enclo.5 In No.61,preis of letter from Sheikh Obeidullah to Ikbal-ed-Dowleh,governor of Urmiya Sept. 15, 1880, in ibid.,49

[22] Ibid.

، چونکە کوردستان دەکەوێتە نێوان ئەم دوو وڵاتەوە ، ئەو دوو حکومەتەی ، لەبەر چەند هۆیەکی تایبەت بەخۆیان ، جیاوازیی لە نێوان کەسانی باشکار و بەدکاردا ناکەن ."[22]

شێخ درێژەی پێدا و ئاماژەی بەو تاڵانوبڕۆیە کرد کە هەردوو خێڵی شکاك لە ئێران و خێڵی هەرکیی لە تورکیا دەیکەن . ئۆباڵی ئەو چەردەساڵارییەی خێڵەکانی خستە ئەستۆی هەردوو حکومەتی ئێرانیی و تورکیی ، ئەو دوو حکومەتەی وەك ئەو پێی لەسەر دادەگرت ناتوانن یان ناخوازن جڵەوگیریی چەردەساڵاریی ئەو خێڵانە بکەن .[24] بەگوێرەی شێخ کوردستان و سەرکردەکانیان هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کە بەردەوام بوون لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە بەم شێوەیە کارێکی بێهوودەیە:" سەرۆك و فەرماندەکانی کوردستان ، رەعییەتی تورك بن یا ئێرانییەکان ، هەروەها دانیشتووانی کوردستان چ بە تەنیا و چ پێکەوە لەوباوەڕەدان کە چیدی ناتوانرێت چاو لە هەلومەرجەکە بەو چەشنە لەسایەی دوو حکومەتەکەدا بپۆشرێت ، لەبەرئەوە پێویستە شتێك بکرێت ، پاش ئەوەی دەوڵەتانی رۆژئاوا راستی مەسەلەکە تێدەگەن ، ئەوسا لەبارەی دەوڵەتەکەمانەوە لێکۆڵینەوەی خۆیان دەکەن ."[25]

لەم خاڵەوە ، شێخ عوبەیدوڵلا خوازیاربوو کە پێویستە رێگە بدرێت کورد خۆیان کوردستان بەڕێوەبەرن ، لەو سۆنگەیەوە کە کارێکی وا راژە بە مەسەلەی چەسپاندنی یاساو ئارامیی دەکات :" دەمانەوێت کاروباری خۆمان بەدەست خۆمانەوە بێت ، لەسزادانی تاوانکارانی خۆمانەوە دەگونجێت هێز و سەربەخۆیی خۆمان دەستکەوێت و پێگەی هەمان گەلانی دیکەمان هەبێت ، سەبارەت بە پەلاماردەر و تاوانکارەکانیشمانەوە ، ئامادەین ئەو بەڵێنە بدەین کە زیان و ئازار بەهیچ نەتەوەیەکی دیکە نەگات ."[26]

لەوەی رابورد دەردەکەوێت کە خواستی چەسپاندنی یاسا و ئارامیی لە

---

[23] Enclo.3 In No.61, Sheikh Obeidullah to Dr.Cochran. in ibid.,47-48.

[24] Ibid.,48.

[25] Ibid.

[26] Ibid.

کوردستاندا شوێنێکی گرنگی له بیرکردنەوەی شێخدا داگیرکردبوو ، پێداگرتنی لەسەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی تەنیا لەپێناو کۆتاییهێنان به جەردەسالاریی جێگەی بایەخە ، ئەگەر مەسەلەکە تەنیا بیانوویەکیش بێت ، ئەگەر دامەزراندنی دەسەلاتێکی دادپەروەرانەی جێگیر و بەنەزم له سایەی فارس و تورکەکاندا لەودەمەدا پێدەچوو زۆر دووربێت ، لەکاتێکدا وا دەردەکەوێت که خولیای کورد بۆ چەسپاندنی یاسا و ئارامیی له ناوچەکەیاندا و لەلایەن خۆیانەوە داواکارییەکی تەواو شیاو و بەپاساوە .

## ترس له زاڵبوونی ئەرمەن له کوردستاندا

پێدەچێت ئەم ترسە یەك له بەهێزترین هۆکارەکانی ئەو هەوڵەبێت که لەلایەن شێخەوە بۆ یەکخستنی کورد لەئارادا بوو . پەیماننامەی بەرلین دەرگای لەبەردەم گفتوگۆ سەبارەت به خولیاکانی ئەرمەن له هەرێمەکانی باکووری رۆژهەلاتدا کردەوە ، ئەو هەرێمانەی گونجاوترین شوێن بوون دەوڵەتێکی کوردیی تێدا دابمەزرێنرێت . دەنگۆیەکی فرە سەبارەت به خواستی زلهێزەکان له دانانی ئەرمەن پلەیەك سەرووتر له کورد له رووی رامیارییەوە ترس و دڵەراوکێیەکی فراوانی پێکهێنابوو . ئەو ترسەش بەهۆی برگەی ٦١ی پەیماننامەی بەرلینەوە بوو . ئەو برگەیەی بەڵێنی (چاکسازیی و بنیاتنانەوە ) ی به ئەرمەن دابوو ، هەروەها "پاراستنیان له کورد و چەرکەس"ی زامنکردبوو .[٢٧] وەك دەبینین گومانی ئەوە له تورك دەکرا که پرۆپاگەندەیەکی بەو چەشنەیان له نێو خەڵکی کورددا بلاوکردبێتەوە و بۆ چەند مەبەستێکی خۆیان خەریکی هاندانی نارەزایەتیی کوردیی دژی ئەو چاکسازییانە بوون .

گەیشتنی دوو سەربازیی بەریتانیی بۆ کوردستان دڵەراوکێی کوردانی پترکرد . (کلایتن)ی جێگری کۆنسوڵ ، به هەڵهێنجان لەچەند سەرچاوەیەکی نەستووریی ئاسوورییەکانەوە نووسیویەتی:" کوردان بەتوندیی له گەیشتنی ئەو

[27] ج پەیماننامەی بەرلین و ج پەیماننامەی نهێنیی بەرگریی نێوان بەریتانیا و تورکیا سەبارەت له چاکسازییەکان دواون . ئەوەی له باسی دواتردا گفتوگۆی لەبارەوە کراوە

کۆنسوڵە ئەورووپییانە بۆ وان راچڵەکین ، ئەوان بە هەستێکی ئاوێتە لە بێزاریی و ترسەوە لەو رووداوەیان دەڕوانی ، لەبەرئەوە نەیاندەزانی چ شتێکی خراپیان بۆ هەڵگرتوون و چ شتێك چاوەڕێیان دەکات ."[28]

بەگوێرەی ئەو سەرچاوانە ، کوردان بە توندیی کاردانەوەیان دەبێت گەر ئەو کار و هەنگاوە چاوەڕوانکراوانەی پێشوو جێبەجێ نەکرێن ." گەر ئاکامێکی وا بەرجەستە نەکەن ، دەبێت ترس لەوە هەبێت کە بۆ کارە شەڕەنگێزییەکانیان هانبدرێن ."[29] بەڵگەی چەسپاو سەبارەت بەوە هەبوو کە ئەو نیگەرانییەی کورد بەرەو رکابەراییەکی ئاشکرا هەنگاوی دەنا ، کلایتن دەڵێت کوردانی دەوروبەری موش و بدلیس " رووبەروو بەوانە دەڵێن کە تاڵانکراون و تێانهەڵداون بڕۆن سکاڵای خۆیان لای کۆنسوڵە بیانییەکان بکەن."[30]

سەرنجێکی شێخ عوبەیدوڵڵا کە راشکاوانە بۆ کارمەندێکی عوسمانیی دەربڕیوە ، بە ئاشکرا هەمان کاردانەوەی دەروونی پێشاندەدات :" ئەوە چیە دەبیستم ئەرمەنەکان دەیانەوێت دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە وان دابمەزرێنن ، هەروەها نەستورییەکانیش ئاڵای بەریتانیایان هەڵبڕیوە و خۆیان بە رەعییەتی بەریتانیی دەزانن؟ هەرگیز رێگە نادەم کارێکی وا سەربگرێت تەنانەت گەر چەکم بە ژنانیش هەڵگرتووە ."[31] زۆر ئەستەم نیە لەم هەڵوێستەی شێخ تێبگەیت ، ئەو دژی چاکسازییەکان وەستا چونکە کۆتایی بە خەونەکەی ئەو لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی دەهێنێت و لەبەر ئەوەی بە بڕوای ئەو تۆوی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنیی لە ناوچەکەدا دەچاند کە تێیدا پلەوپایەی

---

[28] Enclo.2 In No.49, Clyton to Trotter,Van ,Aug. 19, 1879, Great Britain ,Foreign Office,Correspondence Respecting the Condition of the Population in Asia Minor and Syria, Turkey No. 4 (1880),C.2537(London:H.M. Stationary Office,1880),79(hereafter Turkey No.4 1880).

[29] Ibid.

[30] Enclo. In No.30, Clyton to Trotter,Van ,Aug. 19, 1879, in ibid., 53.

[31] Enclo. In No.7, Clyton to Trotter, Bashkale ,July 11, 1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),7.

کورد بە تەواویی دەهاتە خوار .

## بەدەستهێنانی پشتگیریی کریستیانە خۆماڵییەکان

وێرای ناحەزیی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ جێبەجێکردنی چاکسازییەکان ، بەڵام مامەڵەکردنی لەگەڵ کاروبارە هەنوکەییەکان وریایی و دووربینی ئەویان پێشاندەدا . ئەو درکی بەو راستییە دەکرد کە بارودۆخی پڕنەهامەتیی و ناخۆشیی کرسیتیانییەکان هۆکاری سەپاندنی چاکسازییەکان بوون، بەڵام ئەو پێی خۆش نەبوو لەتۆڵەی ئەو بارە نالەبارە هەموو نەتەوەی کورد سزابدرێت . بێگومان ئەو لەو هەموو ئەو کارە نابەجێی و راورووتانە بەئاگابوو کە لەلایەن رەگەزگەلێکی یاساشکێنی کوردەوە دەرحەق بە دانیشتووانی بێدیفاعی کوردستان دەکرا . جێگەی وەبیرهێنانەوەیە ، شێخ کە لەزۆربەی بۆنەکاندا ئەو پیاوکوژییانەی ریسوا دەرکرد کە ئاسەوارە خراپەکانی وەکو یەك کورد و کریستیانییەکان دەگرێتەوە . شکستی بەردەوامی حکومەتەکانی عوسمانیی و ئێرانیی لە چەسپاندنی ئارامیی و ئاسایش ئەوی خستبووە سەر ئەو باوەڕەی کە چاوەڕێکردنی چارەسەرییەك لەو دوو حکومەتەوە کارێکی بێهوودەیە .

وادەردەکەوێت شێخ عوبەیدوڵڵا گەیشتەبێتە ئەو ئاکامەی کە تەنیا رێگە بۆ دەرچوون لەو گرفتانە نەهێشتنی دەسەڵاتی تورکیی و ئێرانییە لە کوردستان و هاوکاریی و هەماهەنگیی پتەوی نێوان کورد و کریستیانییە خۆماڵییەکانە . لەو کاتەدا کە شێخ هەوڵی لەباربردنی چاکسازییەکانی دەدا ، دەیویست وەك وای پێشاندات کە شتێکە پێویست ناکات . بەم پێیەوە ، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو پەیوەندیی بە سەرکردە کریستیانییە خۆماڵییەکانەوە بکات . دەگوترێت کە ئەو پەیوەندیی بە مارشەموونی پەتریارکی نەستورییەکان و بە سەرۆکی ئاینیی تایفەی ئەرمەنییەکانی وان–هەکارییەوە کردووە هانیداون لە دژایەتییکردنی حکومەتی عوسمانیی و ئێرانییدا پشتی بگرن .[32]

---

[32] دەگوترێت شێخ عوبەیدوڵڵا لەکاتی راپەڕینەکەی لە تورکیا لەگەڵ مارشەموونداپەیوەندیی گرتووە هەروەها دواتر پاش ئەوەی هەڵی کوتایە سەر ئێران . هەوڵی ئەوە هەیە کە پەیوەندیی بە مارشەموون و ئۆهانس قارتابیدی مەزنە کەشیشی ئەرمەنی لە باشقەڵا کردووە . بەگوێرەی نامەکە وێرای ئەوەی شێخ چەندین جار بانگێشتی کردووە تا" بێت و سەبارەت بە بارودۆخی وڵاتەکە و ئەو هەنگاوانەی پێویستە بنرێت راوێژی پێ بکات " مەزنە کەشیش

لەبەرامبەر ئەو هاوکارییە ، پەیمانیدا کە کریستیانییە خۆماڵییەکان بپارێزێت .

پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە ناکۆکییەکی راستەقینە لە نێوان دژایەتیی راگەیەنداروی شێخ بۆ پێدانی پلە و بایەخێکی زیاتر بە ئەرمەنیی و نەستورییەکان لە ئەو هەوڵەی کە دەیدا بۆ راکێشانیان بەلای خۆیدا نیە . ئەو لە گرتنەبەری ئەو سیاسەتەدا چەند ئامانجێکی لەبەر چاو بوو . ئەو بە بەدەستهێنانی هاوکاریی و هەماهەنگیی ئەرمەنیی و نەستورییەکان بەرەی نێوخۆی یەکگرتوو و پتەو تر دەکرد و بەوەش توانایەکی زیاتری ماددیی و مرۆیی دەکەوتەدەست تا لە ململانێی داهاتووی دژی تورکیا پشتی پێ ببەستێت ، جگەلەوەی هەمان کات زاڵبوونی رەگەزێکی غەیرەکوردی لە کوردستان مسۆگەر دەکرد . سەرباری ئەوەش پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ کریستیانە خۆماڵییەکان و هەوڵی پاراستنیان لە لایەن شێخەوە ، هیوای پشتگیریی و سۆزی هێزە کریستیانییە ئەورووپییەکانی بۆ خۆی و کێشەکەی پتر دەکرد ، بەوەش خۆی لە هەلومەرجێکی وادا دەبینێتەوە کە دەسەڵاتێکی کوردیی بەسەر تەواوی ئەو ناوچەیەدا لە ژێر سەرکدایەتیی خۆی دامەزرێنێت . بەڵێنی شێخ بۆ پاراستنی کریستیانییە خۆماڵییەکان نرخێکی کەمە بۆ هەموو ئەو سوود و قازانجانەی کە هیوای پێیان بوو بیچنێتەوە.[٣٣]

ئەرمەنەکان پێشنیازەکەی شێخیان بۆ هاوکاریی بە گومان و نیگەرانییەکی بەرچاوەوە وەرگرت .[٣٤] وێڕای ئەوەی لەوە دوودڵ بون کە تێکەڵ بە جوڵانەوەیەکی چەکدارانە بن ، پرۆژەکەی شێخیشیان بە پیلانێکی هاندراوی تورکیی دەبینی بۆ ئەوەی لەو جیاوگانەیان دابڕێت کە پەیمانی بەرلین پێی رەوا بینیبوون .هەروەها نەستورییەکانیش خۆیان لە پابەندبوون بەهەر شتێکەوە بەدوور گرت . هەرچەندە پاشتر کە شێخ دەستی بە پەلامارەکەی خۆی بەسەر ئێران کرد، یەکەیەکی هێزەکانی لە

---

ئامانە ئەبووە چاوی پێی بکەوێت بڕوانە :

No.68.Clyton to Trotter.Van.Nov. 2. 1880. Great Britain . Turkey No. 5 (1881).54.

[33] بەگوێرەی ترۆتەر ، سیاسەتی شێخ ئەوە بووە کە ئاشتەوایی لەگەڵ کریستیانییەکانی دەوروبەریدا بکات نەک لەبەر چاوی کاڵ و بایەخدان بە چارەنووسیان . بەڵکو بۆئەوەی وەک ئامرازێک بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەکاریان بێنێت

[34] No.54.Clyton to Trotter.Van.Oct. 2. 1880, in ibid.,54.

نەستورییە چیاییەکان پێکدەهاتن ، کە لەژێر سەرکردایەتیی یەك لەمەزنە کەشیشەکەیاندا بوون .[35] سەرباری ئەوەش یەك لە پیاوماقوڵانی ئەرمەن کەناوی سیمۆن ئاغا بوو ، بەرپرسی پەیوەستی هێزەکانی شێخی لەئەستۆدا بوو . سیمۆن ئاغا هاوەڵی هێزەکانی شێخ بوو بۆ ئەوەی ئەو ئەرمەنانە پارێزراوبن کە لەسەرەڕێگەی جوڵانی ئەوهێزانەدا نیشتەجێبوون .[36]

## بەدەستهێنانی پشتگیریی ئەوروپیی

شێخ تێڕوانینێکی دووربینانەی سەبارەت بە سروشتی سیاسەت و دیپلۆماسیی هێزەکان هەبوو . لای ئەو زۆر گرنگ بوو ئامانجە ڕەواکانی خۆی بە نوێنەرانی زلهێزەکان و رای گشتیی ئەورووپا بناسێنێت . ویلسن سەبارەت بەشێخ دەڵێت :" حەزی بە دۆستایەتیی بیانییەکان دەکرد ، تێدەکۆشا تا رای گشتیی جیهانیی بۆلای خۆی کێش بکات ."[37] لە نامەکەیدا بۆ دکتۆر کۆچران ، شێخ هیوای خۆی دەردەبڕێت بەوەی حکومەتە ئەورووپییەکان کاربکەن تا لە راستی هەلومەرجەکەی کوردستان تێبگەن .[38] ئەو لەهەمان کاتدا درکی بە بایەخی مەزنی دۆستایەتیی بەریتانیای مەزن دەکرد ، چونکە ئەو لەو چاکسازییانە بەرپرسیار بوو کە پەیماننامەی بەرلین پێی لەسەر داگرتبوو . ئەو هەوڵانەش کە لەپێناو نزیکایەتیی و دۆستایەتیی لەگەڵ مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان دەیدا ، هەروەها راگەیاندنی ئاشکرای بۆ دۆستایەتیی کردن لەگەڵ کریستیانییەکانی کوردستان تەنیا بەشێك بوون لەو هەوڵانەی لەو پێناوەدا کاری بۆ دەکرد .

هەوڵەکانی عوبەیدوڵڵا بۆ دۆستایەتیی لەگەڵ مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان دووربینی و دانایی خۆی هەبوو ، ئەو هەوڵەی وێڕای ئەوەی پێگە و ناوبانگی پتر بەرز دەکردەوە بووە هۆی ئەوەی لەو رێگەیەشەوە بتوانێت لەگەڵ نوێنەرە دیپلۆماتە

---

[35] Enclo. 2. No.56,Abbott to Tomson,Tabriz ,Nov. 7,1880, in ibid.,40.

[36] Wilson S.G , Persian Life and Customs,113.

[37] Ibid.

[38] Enclo.3 In No.61, Sheikh Obeidullah to Dr.Cochran, Oct. 5, 1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881).48.

بەریتانییەکان پیوەندیی بگرێت .[39] دکتۆر کۆچرانی مسیۆنێری ئەمەریکیی ، سەلماندی نەك هەر کابرایەکی بەنرخە بۆ پەیوەندیی بەستن بە کارمەندانی کۆنسوڵخانەی بەریتانیی ، بەڵکو قسەکەرێکی هاوسۆز و جێی متمانە و باوەڕی شێخیش بوو . لێکچوونی زۆر لەنێوان ئەو ڕاپۆرتەی کە دکتۆر کۆچران لەمەڕ شێخ و جوڵانەوەکەی بۆ ئەنجومەنی کارگێڕی نێردراوە مسیۆنێرییەکانی پرۆسبارتیی[40] ناردووە ، لەگەڵ ئەو ڕاپۆرتەی کە ناو و مۆری پێوەنییە و ئاراستەی ئابۆتی کۆنسوڵی گشتیی بەریتانیی لە تەبریز نێردراوە ، ئەوە دەگەیەنێت کە هەردوو ڕاپۆرتەکە بێگومان لەلایەن کۆچرانەوە نووسراون .[41]

ناتوانین بڵێین کە شێخ کابرایەکی هەلپەرستی خۆبەرەپێش بووە و ویستوویەتی پەیوەندیی و دۆستایەتیی لەگەڵ ئەمەریکییەکاندا بۆ هەڵخەڵەتاندنی دەسەڵاتدارانی بەریتانیی بەکاربێنێت . بە پێچەوانەوە ، بەڵگەی تەواو هەن کە ئەو سەبارەت بە هەر بەڵێنێکی خۆی وەفادار بووە و جێبەجێی کردوون . ئەوەشی لە پاراستنی کریستیانییەکانی دانیشتووی دەشتی ورمێ دا سەلماند بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە لە بەشی کوردستانی ئێران لە جەنگدا بوو ، بەڵگەیەکی دیکەش بۆ نیازپاکیی و ڕاستگۆیی شێخ ، وەك دواتر دەبینین ، بریتیبوو لە دواخستنی فەرمانی هێرشکردنە سەر ورمێ لەسەر داوای دکتۆر کۆچران .

---

[39] پێدەچێت بیرۆکەی پەیوەندییگرتنی شێخ لەگەڵ مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە ئەوان بە ئینگلیزی دەدوان و لەسایەی پاراستنی بەریتانیاشدا بوون ؛ کورد و ئاسورییەکان ، ئەمریکییەکانیان بە ئینگلیز ناودەبرد ، بۆ نموونە لە لەوالەی زەوییەکی فرۆشراودا لەناوچەی ئاسورییەکان دکتۆر گرانت ی کڕیار و دەستەکەی لە مسیۆنێری ئەمەریکیی بە: " حەکیم گرانت.. و هاوبەشە ئینگلیزەکانی لە ئەمریکا" ناوبراون یاخود ئەو بەراوردەی کە کوردێك لەنێوان د.گرانت و مسیۆنێرە ئینگلیزەکانی کڵێسای ئینگلیکانی کردوویەتی و دەڵێت :"تۆ لە پیاوە ئینگلیزەکانی دیکە جیاوازتری ، تۆ حەز دەکەیت پەیوەندیی دۆستانەو ئاشتییانەت لەگەڵ هەمووانیدا هەبێت "بڕوانە: Laurie ,Thomase.Dr.Grant and the Mountain Nestorians,266,285.

[40] Report by Dr.Cochran,June 1,1880, to Board of Missions,quoted by Speer,75.

[41] Enclo. 4. In No.8,extract from Letter to Consul-General Abbott,Urmiya ,July 8,1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),9.

## ئامانج و سیاسەتەکانی شێخ لە زمانی خەلیفەکەیەوە

لەوانەیە باشترین زانیاریی سەبارەت بە ئامانج و سیاسەتەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا لەلایەن شێخ محەمەد سەعید ، خەلیفە و زاوای عوبەیدوڵڵاوە ئاشکرا کرابێت کاتێک ناوبراو لە کۆبوونەوەیەکیدا لە دەرەوەی شاری ورمێ لەکاتێکی گەمارۆدانی ئەو شارەوە لەلایەن کوردانەوە ، ئامادەبوو . ئامانجی سەرەکیی ئەم کۆبوونەوەیە بریتیبوو لە ئامانجەکانی شێخ بۆ ئابۆتی کۆنسوڵی گشتیی بەریتانیی . لەم کۆبوونەوەیەدا ، مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان ، سەرۆکە ئەستورییەکانی ئەوێیا ، هەروەها ژمارەیەک لە مورید و شوێنکەوتەکانی شێخ ئامادەبوون ، لەوانەیە سیمۆن ئاغای پیاوماقووڵی ئەرمەنیش لەو کۆبوونەوەیەدا بووبێت .

شێخ محەمەد سەعید ئاشکرای کرد کە گەر عوبەیدوڵڵا سەرکەوێت ئەوا تێدەکۆشێت بۆ نەهێشتنی جەردەیی ، گێڕانەوەی نەزم و ئاسایش لە چوارچێوەی سنووری تورکیا و ئێران ، چەسپاندنی یەکسانیی نێوان موسوڵمان و کریستانییەکان ، هاندانی خوێندن و خوێندەواریی ، ڕێگەدان بە بنیاتنانی کڵێسا و خوێندنگە . بەگوێرەی ئابۆت ، خەلیفە درێژەی پێدا و گوتی :

" هەموو ئەوەی شێخ دەیەوێت تەنیا پشتگیرییەکی مەعنەویی هێزە ئەورووپییەکانە ، بەتایبەتیی ئینگلتەرا ، کە ڕێز و دۆستایەتییەکی مەزنی لە لای شێخ هەیە ، شێخ داوای ئەوە دەکات بیخەنە ژێر تاقیکردنەوەیەکەوە . ئەگەر لە ڕێکخستنی کوردستاندا شکستی هێنا و نەیتوانی فەرمانڕەوایەتییەکی گونجاو دابمەزرێنێت ، ئەوا ئامادەیە وەک تاوانبارێک بچێتە بەردەم دادگایەکی ئەورووپیی و هەموو ئەو سزایانەش لە ئەستۆ بگرێت کە بە سەریدا دەدەن ."[42]

[42] Enclo. 2. No.56, Abbott to Tomson, Tabriz, Nov. 7, 1880, in ibid., 39.

## هاوپەیمانیی کوردیی

هەرزوو پاش ئەوەی برگەی چاکسازییەکەی[٤٣] پەیماننامەکەی بەرلین بۆ کورد ئاشکراکرا ، شەپۆلێکی پڕوپاگەندە لە کوردستاندا سەبارەت بەو ئایندە ناڵەبارەی چاوەڕێی کورد دەکات بڵاوبووەوە . ئەم خەڵکەی کە تا ئەو کاتە سەروکارێکیان لەگەڵ سیاسەتدا نەبوو ، ئەمێستا بەیەکجار و بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لەحاست ئەو مەسەلەیەی بە هەڕەشەی دەزانن لەسەر ئایندە و بوونی نەتەوەییان وروژاون . زۆری نەخایاند جوڵانەوەیەك لەسەراسەری هەرێمەکانی باکووری رۆژهەلات لەپێناو رێکخستنی کورد و یەکخستنی هەوڵەکانیان بۆ دژایەتییکردنی جێبەجێکردنی ئەو چاکسازییەی بە مەترسییان دەزانی لەسەر خۆیان سەریهەڵدا .زۆری نەخایاند ئەم چالاکییە سیاسییە چاوەڕوان نەکراوە لە دەوری شێخ عوبەیدوڵلا کۆبووەوە و بە هاوپەیمانیی کوردیی ناسرا

لەسەرەتادا ، هەوڵێکی بەو چەشنە بۆ وەستان بەڕووی خواستی زلهێزەکان و هەڵوەشاندنەوەی بڕیارنامەکانی کۆنگرەی بەرلین شتێکی بێهوودە دەهاتە پێش چاو زیاتر لەوەی سەرەڕۆیانە بێت . چونکە چاوەڕوان نەدەکرا ئەوەی بە دەوڵەتێکی وەك تورکیا نەکرابێت لەلایەن رەشەخەڵکانێکی زۆروبۆری سەرکەش و دوژمن بەیەکەوە بەدی بێت . سەرکەوتنی جوڵانەوەیەکی بەم شێوەیە بۆ چەندین هۆکار دەگەڕێتەوە کە لانی کەم ئاسانکاریی تورکیا بۆی یەکێکیانە . تورکیا گومانی ئەوەی لێدەکرا کە هاندەر و پشتگیرییکەری هەوڵەکانی شێخ عوبەیدوڵلایە بۆ یەکخستنی کوردان . راپۆرتە بەراییەکان سەبارەت بە هاوکاریی تورکیی–کوردیی تا رادەیەك لێڵە و بەشێوەیەکی روون ئەو رووداوانەی لە کوردستاندا روویانداوە وێنا ناکات . تەنانەت سەرچاوە باش ئاگادارە بەریتانییەکانیش سەبارەت بە سروشت و رادەی پشتگیریی عوسمانیی بۆ چالاکیی رامیاریی کوردیی کۆك نین .

ئابۆتی کۆنوسڵی گشتیی بەریتانیی لە تەبرێز ، لە راپۆرتێکیدا کە بۆ وەزارەتی

---

[٤٣] برگەی شەست و یەکی پەیماننامەی بەرلین دەڵێت :" دەروازەی باڵا بەڵێن دەدات بێ دواکەوتن دەستبکات بە گەشەپێدان و ئەو چاکسازییانەی کە داوای لێکراوە لە ناوچانەی ئەرمەنی تێدایە،هەروەها ئاسایشیان دژی چەرکەس و کورد بۆ مسۆگەر بکات هەروەها ماوە ماوە ئەو دەوڵەتانە لە هەنگاوەکانی ئاگاداربکاتەوە کە چاودێریی جێبەجێکردنی چاکسازییەکان.Hertslet.Edward.The Map of Europe by Treaty.4:2796.

ئەرمەوەی ناردووە ، رەخنە لە دەسەڵاتدارانی عوسمانیی دەگرێت کە نەرمییان لەحاست شێخ عوبەیدوڵڵادا نواندووە ، ئەوەی کەمتر لە ساڵێك بەسەر چەك بەرزکردنەوەی بە رووی حکومەتدا تێنەپەڕیوە :" حکومەتی تورکیی ، لەجیاتی ئەوەی ئەو سزایە بەسەر شێخدا بسەپێنێت کە شایەنی هەر یاخییەکە ، پاداشتی دەکا و رێزی لێدەگرێت ، هەربۆیە ئەویش بێباکانە و بەو پەڕی راشکاوییەوە لەپێناو پرۆژە نومێدبەخشەکەیدا تێدەکۆشێت ."[٤٤] ئابۆت ئەم سیاسەتە نەرمەی بۆ ئەو راستییە گێڕایەوە کە " شێخ خواست و ویستی تاقمە کۆنەپەرستەکەی تورکیا جێبەجێ دەکات "[٤٥] ئابۆتی کۆنسوڵی گشتیی ئەنجامگیریی نامەکەی بە جەختکردنەوە لە چاودێرییکردنی وردی شێخ عوبەیدوڵڵا کۆتایی پێدێنێت .

کارمەندێکی دیکەی بەریتانیی کە مەیجەر ترۆتەرە ، کۆنسوڵی گشتیی لە کوردستانی تورکیا بە دیدێکی جیاوازەوە هەلومەرجەکە دەبینێت . ئەو گومانێکی زۆری سەبارەت بە ئەگەری پشتگیرییەکی فەرمیی تورکیی لە چالاکییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا پیشاندا ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە مەسەلەیەکی وا لەگەڵ بەرژەوەندیی و ئاسایشی تورکیا خۆیدا نایەتەوە . بەگوێرەی ئەو ، بیرۆکەی هەماهەنگیی تورکیی–کوردیی تەنیا خۆشخەیاڵییەکە و سەرچاوەکەی چەند بڵاوکراوەیەکی دیارییکراوی ئەستەمبوڵن . ترۆتەر لە نێردراوێکدا بۆ (مستەر گۆچن) ی وەزیری بەریتانیی لە ئەستەمبوڵ نووسیویەتیی " بڕوا ناکەم حکومەتی تورکیی ئەوەندە گێل بێت هاوپەیمانییەکی بەو چەشنە پێکبهێنێت . هاوپەیمانییەکی وا گەر دابمەزرێت یەکسەر بەدژی حکومەت خۆی ئاراستە دەکرێت ."[٤٦] ئەو ئاماژەی بەوەداوە کە سیاسەتی حکومەتی عوسمانیی هەمیشە بەو شێوەیە بووە خێڵی کوردی دژی ئەوی تر هانداوە ، ئەو زیاتر درێژەی پێدا و نموونەی ئەو راپەڕینە کوردییەی هێنایەوە کە بەو دواییە روویدا و لەلایەن تورکەوە بە هاوکاریی سەرۆکە کوردە تورکخواکان سەرکوتکرا .

بێگومان ، گومانەکانی مەیجەر ترۆتەر سەبارەت بە رۆڵی تورکیا لە پێکهێنانی

---

[44] Enclo.in No.2, Consul-General Abbott to Earl Granville, Tabriz Julay 13.1880, Great Britain . Turkey No. 5 (1881).8.

[45] Ibid.,9.

[46] Enclo. In No.22, Trotter to Mr.Goschen , Therapia .Oct. 20, 1880.in ibid .,16.

هاوپەیمانیی کوردیی لە سەر چەند سەرنجێکی ماقووڵ بنیاتنرابوو ، ئەو سەرنجانەی کە هەمیشە ناچێتە هزری گەلانەوە . تورکیا زۆر نەبوو لە جەنگێکی کارەساتبار هاتبووە دەرەوە کە زیانێکی زۆری گیانیی و ماڵیی لێدابوو ، یەکسەر رووبەڕووی پەیماننامەیەکیان کردەوە کە یەك لە بڕگەکانی کە چاکسازییە هەڕەشەی لەدەستدانی خاکێکی بەرفراوانی لە تورکیا دەکرد . لەم کونەڕۆژنەیەوە ، پشتگیریی تورك لە هاوپەیمانیی کوردیی بەمەبەستی پووچەڵکردنەوەی چاکسازییەکان ، مەسەلەیەکە تێگەیشتنی ئەستەم نیە . وێڕای ئەوەی بڕوای بە بوونی پشتگیریی تورك بۆ هاوپەیمانیی کوردیی نیە ، بەڵام سەبارەت بە " بڕێك هەژانی دیارییکراوی کوردیی لەحاست ئەو قسە و باسانەی لەمەڕ ئۆتۆنۆمییەکی ئەرمەنیی هەبوو " [47] وێناکردنێتی بۆ ئەو هەلومەرجە هەژاوەی کوردستان لەو دەمەدا تا رادەیەکی زۆر ورد و دروستە :" ئەگەر چەند جیاوگێکی تایبەت بە ئەرمەنەکان بدرێت و هەمان کات تورك و کوردی لێ بێبەش بکرێت ، ئەوە وا لە کوردان دەکات دژی کریستیانییەکان یەکبگرن و دژی حکومەتیش بوەستن کە ئەم جیاوگانەی پەسەند و پێشکەش کردووە ."[48]

وێڕای ناکۆکیی ئەو دوو کارمەندە بەریتانییە سەبارەت بە مەسەلەی پشتگیریی تورك لە جولانەوەی کوردیی ، بەڵام ترۆتەر لەوخاڵەدا لەگەڵ نابۆت کۆکە کە چالاکییەکانی شێخ عوبەیدوڵلایان پێ کارێکی مەترسییدارە . ترۆتەر بەم شێوەیە خوارەوە کۆتایی بەو نامەیە دەهێنێت کە بۆ کۆچینی ناردبوو :" گەر دەروازەی باڵا بڕێك هۆشیار بێت و بەرژەوەندییەکانی خۆی لەبەر چاوبێت ئەم دەرفەتە بۆ تێکشکاندنی شێخ دەقۆزێتەوە ، چونکە تا ئەو لەو ناوچەیەدا بمێنێت وەك چقڵێك لە پێی حکومەتدا دەمێنێتەوە ."[49]

لەراستییدا گوتەکانی مەیجەر ترۆتەر لەسەر بنەمای بۆچوونێکی وا بنیاتنراوە کە تورکیا لەمەڕ سەرجەم چالاکییەکانی شێخ بێئاگا بووە و بەدڵنیاییەوە بەشێکیش نیە لێی . ئەو دیدەی کە رووداوەکانی دوایی و زانیارییە هەمەلایەنەکان سەلماندیان کە تەواو لەگەڵ راستیی هەلومەرجەکەدا نایەتەوە .چونکە وەك دەبینین ، تورکیا زۆر زێدەتر لەوەی ترۆتەر لەو دەمەدا درکی پێدەکرد ، لە جولانەوە کوردییەکەدا تێوەگلابوو .

---

[47] Ibid.,17.

[48] Ibid.

[49] Ibid.

ئەو راپۆرتەی (کریمیان) ی کەشیشی نەستوریی بۆ پاتریارکی ئەرمەنیی نووسیویەتیی هێندێك تیشك دەخاتە سەر دامەزراندنی هاوپەیمانیی کوردیی و ئامانجەکانی . لەم راپۆرتەدا بە هێندێك دەستەواژەی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ بەرپرسیارێتیی تورکی لەحاست دامەزراندنی هاوپەیمانیی کوردیی و هاندەرەکانی بۆ گرتنەبەری سیاسەتێکی لەوچەشنە کراوە :" وا خەریکە بە دەستپێشکەریی حکومەتی ناوەندیی هاوپەیمانییەکی کوردیی دادەمەزرێت ، ئەو حکومەتەی کە دەیەوێت بەهێنانەکایەی کێشەیەکی نوێ کە کێشەی کوردە ، کێشەی ئەرمەن لەبیربەرێتەوە ."[50] راپۆرتەکە درێژەی پێدەدات و ئاماژە بەو شێوازە دەکات کە حکومەت دەیەوێت مەبەستەکەی پێ بێنێتە دی :" حکومەتی عوسمانیی بۆ ئەوەی سەرنجی ئەوروپا بەلای کێشەی کورددا رابکێشێت ، هەوڵێکی بێوچان دەدات لەپێناو هێنانە کایەی یاخیبوونێکی چەکداریی هاوکات لە تورکیا و ئێراندا ، ئەمێستا ئەندامانی هاوپەیمانییەکە خوازیارە ناوەندێکی دووەم بۆ ئۆپەراسیۆن و داگیرکاریی لەنێوان ئەسما و سەلماس دابمەزرێنن ."[51]

بەگوێرەی راپۆرتی کریمیان " گیانی ئەم هاوپەیمانیەتییە سیاسەتی عوسمانییە ، شێخ عوبەیدوڵڵا ناوەندە فەرمییەکەیەتی و بەحریی بەگیش نوێنەری هەمیشەیەتی ."[52] هەرچەندە ئەم راپۆرتە نەیتوانیوە وێنەیەکی دروست لەمەڕ هەلومەرجەکە پێشانبدات ، چونکە وەك دەبینین شێخ تەنیا ئامرازێك نەبوو بۆ سیاسەتی عوسمانیی ، وەك بە ساکاریی لەم نامەیەدا دەردەکەوێت . بە بێ لەبەرچاوگرتنی رۆڵی حکومەتی تورکیی لە دامەزراندنی ئەو هاوپەیمانییە کوردییەدا ، رۆڵی شێخ وەك سەرۆکێکی ئەو هاوپەیمانییە جێگەی بایەخێکی سەرەکییە . لەوانەیە ئەو زانیارییانەی لەو راپۆرتەدا هاتوون هەوڵێکی مەبەستدارانە بێت بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی تەواو بخاتە ئەستۆی حکومەتی عوسمانیی ، یان لە ئاکامی بێئاگایی نووسەرەکەیەوە بێت سەبارەت بە سروشتی رۆڵ و چالاکییەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا .

---

[50] Enclo. In No.6, letter from Monseigneur Krimian to the Armenian Patriarch, Van June. 20, 1880, in ibid., 6.

[51] Ibid.7.

[52] Ibid.6.

ئەو رۆڵەی راپۆرتەکە بە بەحریی بەگی داوە وەك نوێنەرێکی حکومەتی عوسمانیی بایەخێکی تایبەتیی هەیە ، چونکە پشتگیریی و دیدی کەشیش کریمیان سەبارەت بە رۆڵی عوسمانییەکان لە پێکەیاندنی هاوپەیمانیی کوردییەکە دەکات . دەگوترێت بەحریی بەگیش کە کوڕەگەورەی بەدرخان بوو ، لەگەڵ سەرۆك و پیاوەناودارە جۆراوجۆرەکانی کورددا لە پەیوەندییەکی بەردەوامدا بووە " بەڵێن ، تکا و هەروەها هەڕەشەش" ی بۆ یەککخستنیان لە سایەی شێخ عوبەیدوڵلا بەکارهێناوە . بەگوێرەی راپۆرتەکەی کەشیش ، بەحریی بەگ لەلایەن حکومەتی عوسمانییەوە نێردراوە بۆ هەکاریی و بەفەرمیش هەڵگری ئەو نیشانەی رێزلێنانە بووە کە بە باڵای شێخدا براوە . هەرچەندە مەبەستی راستەقینەی نوێنەرایەتییەکەی تەواو روون نیە . ئەو هێندێك کات وەك نوێنەری حکومەت و وەك خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان قسان دەکات ، کەچی هێندێك جاری دیکەش وەك مورید و پیاوێکی شێخ هەڵدەسوڕێت .[53] دەگوترێت کە لە بۆنەیەکدا گوتوویەتی :" نامەیەك بۆ شێخ دەنووسم بەرەو ئەستەمبوڵ بچێت ، هەر ئامادە نەبوو ، ئەوا پاش گەڕانەوەم ، بەخۆم و سەربازانی ئیمپراتۆرییەکەوە دەچمە سەری ."[54] وێڕای ئەوەی بە گوێرەی هەمان سەرچاوە ، هەر زوو پاش ئەوەی بەحریی بەگ گەیشتە شێخ ، کەوتە ئەوەی نەك سەرۆکە کوردەکانی ئەرمینیای بەباشیی بۆ کۆبکاتەوە ، بەڵکو ئەوانەی ئێرانیش ، وەك راپۆرتەکە دەڵێت ، بەشێکی زۆر لەوانە هاوپەیمانیەتییان لەگەڵ شێخدا بەست ، هەرچەندە هێندێکیان حەزیشیان بەوە نەدەکرد " وێڕای ئەو هەوڵە زۆرەی لەلایەن بەحریی بەگەوە لەگەڵیاندا درا " . هەرچەندە ئەو سەرۆکە کوردانە لە کۆتاییدا جگە لە پەیوەست بوون بە شێخەوە ، رێگەیەکی دیکەیان لەبەر دەمدا نەمایەوە .

وادەردەکەوێت ئەو ئەرکەی بە بەحری بەگ سپێردرابوو کە هەڵگرتنی نیشانەی رێزلێنانە تا رادەیەك لەگەڵ ئەو تێوەگلان و هەوڵانەی ئەگونجێت کە بۆ راژەکردنی

---

[53] سەفرستیان باس لە ناردنی بەحری بەگ بەشێوەیەکی فەرمیی ناکات . بەڵام پێمان دەڵێت کە ئەو زۆر چالاکانە لەنێو خێڵەکاندا بانگەشەی بۆ جوڵانەوەکەی شێخ دەکرد . بڕوانەوەی سەرچاوەی ئەو زانیارییەمان بداتێ

Safrastian,81.

[54] Enclo. In No.6, letter from Monseigneur Krimian to the Armenian Patriarch, Van .June. 20. 1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),6.

جولانەوە کوردییەکە تەرخانی کردووە ، ئەگەر ئەو قسانەی کە راپۆرتەکەی کەشیش لەبارەیەوە کردوویەتی راست بێت ئەوە دەبووایە حکومەتی عوسمانیی ئەرکێکی لەوە گرنگتری پێسپاردایە کە تەنیا هەڵگری نیشانەیەک بێت . لەراستییدا ئەو تەنیا ئەگەرەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە بەحری بەگ ئەو هەولانەی لەپشت حکومەتەوە دابێت و بەفەرمیی رانەسپێردرابێت . بەراستیی شتێکی سەیر دێتە پێش چاو کە حکومەت نوێنەرێک لای شێخ دابنێت کە کوڕی میری مەزن بەدرخان پاشای بۆتان بێت کە لە رووی ناوبانگ و پێگەوە لە کوردستان کەس لەو ناسراوتر نەبوو .

## راپەڕینی شێخ لە تورکیا

شێخ عوبەیدوڵڵا لە ساڵی ١٨٧٩دا چەکی دژی تورکیا هەڵگرت . راپەڕینێک کە بەنهێنیی هەموو ئامادەکارییەکی سەرکەوتنی بۆ کرابوو .ئەم راپەڕینە ، وەک دەبینین ، نموونەیەک بوو کە دواتر ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکەی دژی ئێران لەسەر بنیاتنرا بوو .

بەگوێرەی قایمقامی گەوەڕ ، ئامانجی عوبەیدوڵڵا دامەزراندنی " میرنشینێکی سەربەخۆیە لەو ناوچانەی کوردیان تێدا نیشتەجێیە کە باجێکی هێندە بدەن یەکسان بێت بەوەی ئەمێستا حکومەتی تورکیی لێیان کۆدەکاتەوە ."[55] قایمقام لەو باوەڕەدایە کە شێخ ئەو کاتە تایبەتەی هەڵبژاردووە کە فشار بۆ سەربەخۆیی بکات بەهۆی لاوازیی کارگێڕیی تورکیی لەکوردستان وەک ئاکامێکی جەنگەکەی ١٨٧٧-١٨٧٨ .

وادەردەکەوێت کە بۆ ماوەیەک گومانی خۆئامادەکردن بۆ هەڵگیرساندنی راپەڕینێک لە شێخ عوبەیدوڵڵا کرابێت . بەگوێرەی کلایتنی جێگری کۆنسوڵ ، شێخ بۆ ماوەی دوو ساڵ دەبوو خۆی بۆ راپەڕینێک کۆدەکردەوە .[56] لە کاتی راپەڕینەکەدا ئەو دەنگۆیە کەوتەوە کە والی وان ساڵێک لەوەپێش لە دیاربەکرەوە سەبارەت بە مەبەستەکەی شێخ ئاگادارکراوەتەوە ، بەڵام ئەو زۆر گوێی پێنەداوە .[57] دەگونجێت بێزاریی شێخ لەو

---

[55] Enclo.2 In No.49, Clyton to Trotter.Van .Aug. 19, 1879. Great Britain .Foreign Office. Turkey No. 4 (1880).78.

[56] Enclo. In No.41, Clyton to Trotter.Van .Sept. 6. 1879.in ibid.,68.

[57] Ibid.

راستییەدا رەنگ بداتەوە کە لە نامەکەیدا بۆ والی وان " داوای نیشانەی ئازایەتیی و ئەو پاداشتانە دەکات کە پێویستە لە سۆنگەی بەشداریکردنەکەی لە جەنگی رووسی–تورکیی پێ ببەخشرێت ."[58]

چەندین بەڵگەی دیکەش سەبارەت بە توندوتیژبوونی هەلومەرجەکەی کوردستان لەبەردەستدا بوو . هەروەها خۆئامادەکرن بۆ کارێکی سەربازیی لەو دەڤەرەدا ئاشکرابوو . هەواڵی ئەوە هەبوو کە تەواوی هەرێمی هەکاریی کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی شێخەوە[59] و ناوبراو لەگەڵ مارشەموونی پەتریارکی نەستورییەکان و هەروەها لەگەڵ چەندین پیاوانی موسوڵمانی خاوەن دەسەڵاتی شاری وان لە پەیوەندییدایە .[60] بەگوێرەی (رینۆڵدز) ی مسیۆنێری ئەمەریکی ، نەستورییەکان کە تا ئەو کاتە پەیوەندییان لەگەڵ مسیۆنێرەکاندا دۆستانەبوو ، لەناکاو پشتیان تێکردن و دوژمنایەتیان پێشاندا .[61] پەرەسەندنێکی سەرنجراکێشی دیکە ئەوە بوو کە کوردان لە شاری وان بڕێکی زۆری گەنمیان کڕیوە .[62]

هەواڵی ئەوەش هەبوو کە شێخ عوبەیدوڵلا بڕێکی تفەنگی باشیشی بۆ چووە ، بڕوا وابوو کە ئەو تفەنگێکی زۆری لە شاری خۆی و لە رێگەی راسپێردراوێکی خۆیەوە لە ورمێ بۆکڕراوە .[63] هەروەها دەگوترێت هێزەکانی شێخ ئەو چەکانەیان بەدەستەوە بووە کە دەروازەی بالا لە کاتی جەنگی تورکیی–رووسیی دا بەسەر خێڵە کوردەکاندا دابەشی کردبوو . ئابۆتی کۆنسوڵی گشتیی ئاماژەی بەوەداوە کە ژمارەیەکی کەم لەو بیست هەزار تفەنگەی لەو کاتەدا بە کورد درابوو، وێڕای پێداگری حکومەت بۆ گەڕاندنەوەیان ، گەڕێنراونەتەوە :" لەوانەیە شێخ عوبەیدوڵلا و پیاوەکانی ئەمێستا بڕێکی زۆر لەو چەکانە دژی حکومەتی تورکیی بەکاربێنن کە کاتی خۆی بۆ بەرگرییکردن لەو حکومەتە بەسەریاندا دابەشکراوە ."[64] والی وان نووسیەیتی کە شێخ چوار هەزار چەکداری

---

[58] No.41.Trotter to Marquis of Salisbury,Erzerum,Sept. 19, 1879. in ibid.,67.

[59] Ibid.

[60] Enclo. In No.41, Clyton to Trotter.Van .Sept. 6, 1879,in ibid.,68.

[61] Ibid.

[62] Ibid.69.

[63] Enclo. No.71.Abbott to Tomson.Tabriz ,Sept. 25,1879, in ibid.,101.

[64] Ibid.

لەبندەستدایە و چەکدارانی کوردیش بە بەردەوامیی لە سنووری ئێرانەوە دێنە ناوەوە .[٦٥]

یەکەمین پریشکی راپەڕینەکە بەئاشکرا دەرکەوت کاتێك لەلایەن قایمقامی گەڤەڕەوە دەستەیەك لە کوردانی هەرکیی بە تاوانی تاڵانکردنی گوندێك سزادران .کاتێك هەواڵی ئەمە گەیشتە شێخ عوبەیدوڵڵا ، نامەی بۆ سەرۆکەکانی کورد نارد و داوای لێکردن "هانیان بدەن راپەڕن ، پێیان بڵێن چیدی شتێك نیە ناوی حکومەتی تورك بێت ، هەروەها مەبەستێتی لەماوەی هەشت رۆژدا هێرش بکاتە سەر ئامێدیی."[٦٦] یەك لەوانەی پەیوەندییان پێوەکرابوو شێخ محەممەدی بەریدچان بوو ، ئەوەی هیچ کاتێکی بەفیڕۆ نەدا تا مەبەستەکەی شێخ بە والی موسڵ بگەیەنێت .

پاش پێنج رۆژ یەکەیەك لە هێزە سەربازییەکانی حکومەت نێردرانە موسڵ و گەیشتە دەوروبەری ئامێدی . هێزێکی نۆسەد جەنگاوەری کورد لەلایەن شێخ عوبەیدوڵڵاوە کۆکرایەوە و سەرکردایەتییەکەی درا بە شێخ عەبدولقادری کوڕی کە هێرشی کردە سەر هێزەکانی عوسمانیی و تێکشکێنرا و گەڕایەوە .[٦٧] واپێدەچێت ئەم شەڕە یەکالاکەرەوە بووبێت و پێکدادان و پێکهەڵپرژان لە چەند شوێنێکی جیاوازەوە و لەکاتی جیاجیادا روویدابێت . کاتێك کوردان زانیان کە بەزیون و گەیشتنە ئەو باوەڕەی کەحکومەت سوورە لەسەر سەرکوتکردنی راپەڕینەکە و توانای ئەوەشی هەیە ، راپەڕینەکە بەزوویی کۆتاییهات .

لەکاتێکدا کوڕەکەی شێخ و پیاوەکانی لە مەیدانی جەنگدا بوون ، نوێنەر و راسپاردەکانی بە نهێنی سەردانی سەرۆکە کوردەکانیان دەکرد و هانیان دەدان راپەڕن . شێخ عوبەیدوڵڵا بە داناییەوە لە پشتەوە راوەستابوو ، نێوانی خۆی لەگەڵ حکومەتدا هێشتبووە و دوورەپەرێزیی هەڵبژاردبوو .[٦٨] نامەیەکی بۆ والی وان ناردبوو تێیدا بێئاگایی و بێتاوانی خۆی پیشاندا و دڵتەنگیی خۆی لەو کارە راگەیاندبوو ، لەهەمان کاتدا وەفاداریی خۆی بۆ دەوڵەت راگەیاندبوو و نووسیبووی " من لە هەر کاتێکی دیکە

---

[65] No.49.Trotter to Marquis of Salisbury.Erzerum.Sept. 27, 1879. in ibid.,77.

[66] Enclo. In No.41, Clyton to Trotter,Van .Sept. 6. 1879.in ibid.,68.

[67] Ibid.

[68] Enclo.1 In No.49, Clyton to Trotter,Van .Sept. 10, 1879.in ibid.,78.

دڵسۆزتر و وەفادارترم ."[69] هەروەها هەواڵی ئەوە هەبوو کە شێخ " عەبدولقادری کوڕی بانگ کردبووەوە بۆ لای خۆی بۆ ئەوەی ملکەچیی خۆی پیشانی حکومەت بدات ."[70]

هەڵوێستی حکومەت لەحاست شێخ عوبەیدوڵلا جێگەی سەرسوڕمان بوو . وێڕای ئەوەی فەرمان لە ئەستەمبوڵەوە سەبارەت بە ڕووبەڕووبوونەوەی توندی یاخیبووان دەرچووبوو ، هەروەها کارمەندانی دەوڵەتیی وەک والی وان و موسڵ ئاگاداریی نیازەکانی شێخ بوون و لێی دەسڵمینەوە ،[71] دەبینین حکومەتی ناوەندیی هەڵوێستێکی نەرم و دان بەخۆداگریی لەهەمبەر شێخدا دەنوێنێت . والی وان چ لە کاتی ڕاپەڕینەکە و چ دواتریش ، بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ شێخدا دەکرد . تەنانەت سەدری ئەعزەمیش لە تەلەگرافێکی دۆستانەیدا بۆ شێخ داوای لێدەکات لەگەڵ دەسەڵاتدارانی خۆجێدا پێکبێت . ئەو تەلەگرافەی کە بە نوێنەرایەتی حکومەت لەلایەن موفتی وانەوە گەیەندرایە دەستی شێخ .[72] قایمقامی گەوەڕ کە بەسزادانی تالانچییە هەرکییەکان شێخی زویر کردبوو ، لە شوێنەکەی خۆی لابرا .[73] دواتر پاش تێپەڕینی ماوەیەک بەسەر شکستی ڕاپەڕینەکە ، شێخ لە شاری وان پێشوازییەکی مەزنی لێکرا . وادەردەکەوێت کە یەک لەو داوایانەی شێخ بۆ پێکهاتنەوە لەگەڵ حکومەت بریتیبوو لە دابینکردنی مانگانەیەکی بیست هەزار قرۆشی . بەگوێرەی ترۆتەر ، والی وان پێشنیازی پێویستی پێدانانی ئەو مانگانەیەی کردووە .[74]

---

[69] Enclo.3 In No.49,Sheikh Obeidullah to the Wali of Van, dated twenty-second day of Ramadan,in ibid.,79-80.

[70] No.49,Trotter to Marquis of Salisbury,Erzerum,Sept. 27, 1879, in ibid.,77.

[71] Ibid.

[72] Ibid.

[73] Enclo.1 In No.49, Clyton to Trotter,Van .Sept. 10, 1879,in ibid.,78.

[74] No.73,Trotter to Marquis of Salisbury,Erzerum,Oct. 10, 1879, in ibid.,102.

گوتەیەک هەیە دەدرێتە پاڵ کونسوڵی ئێرانیی لە وان و لەو ڕووەوە سەرنجڕاکێشە ، ئەو وا دەبینێت کە سەرهەڵدانی شێخ دژی دەوڵەت بۆ خاوەخاوی حکومەت دەگەڕێتەوە سەبارەت بەو هاوکارییە مادییەی بەڵێنی پێدابوو . ئەم کونسوڵە دەڵێت گوایە شێخ لە بنەڕەتدا ڕەعییەتی وڵاتەکەی ئەوە هاوکاریی لە حکومەتی ئێرانەوە وەردەگرێت . ئەو حکومەتە بۆئەوەی بێلایەنیی تەواوی خۆی لە جەنگی ڕووسیی-تورکیی ڕابگەیەنێت ، ئەو هاوکارییەی لەشێخ بڕی

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ، ئەم ڕاپەڕینە شکستخواردووە سەرەتایەک بوو بۆ پتر ناوبانگدەرکردنی شێخ عوبەیدوڵلا نەک کۆتاییهاتنی کاری ڕامیاریی . هەر زوو پاش ئەو ڕووداوانە ، شێخ بوو بە سەرکردەیەکی دانپیانراوی جوڵانەوەی بەرفراوانی نەتەوەیی کوردیی کە ئامانجی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردییە . موورید و لایەنگرەکانی لەسەراسەری کوردستاندا خەریک بن پشتگیریی بۆ پرسەکەی شێخ بەدەستبێنن .

حکومەتی عوسمانیی کە بەدڵنیاییەوە ئاگاداری خولیا و تەواوی چالاکییەکانی شێخ بوو ، هەڵوێستێکی دۆستانەی بەرامبەر شێخ پێشاندا و زیاتر هاوکاریی کرد وەک ئەوەی ڕێگە لە هەوڵەکانی بگرێت . حکومەت بە ئاشکرا یان ئەوەندە بوێر نەبوو کە سزای پیاوێکی دەسەڵاتدار و پیرۆزی وەک ئەو بدات یان وەک هاوپەیمانێک لێی دەڕوانی کە لە ئایندەدا ڕاژەی بایەخداری بۆ ئەنجام بدات ، تەنانەت گەر خولیاکانیشی بە پەلاماردانی ئێران کۆتایی بێت . حکومەتی عوسمانیی لە بەرگرییکردن لە شێخ و ڕاگەیاندنی بێتاوانی بەردەوام بوو . ئەو ڕاستییەی بێگومان پشتگیریی گوتەکانی ئێرانییەکانیان دەکرد سەبارەت بەوەی کە تورکان لەپشت جوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵلاوەن .

### داگیرکردنی ئێران لەلایەن کورد

### هۆکارەکانی داگیرکردنەکە

دەگونجێت بەشێکی بنەمای داگیرکردنی ئێران لەلایەن کوردانەوە بۆ جەنگی تورکیی-ڕووسیی ١٨٧٧-١٨٧٨ بگەڕێتەوە . وەک پێشتر ئاماژەی پێدرا ، تورکان لەکاتی ئەم جەنگەدا هەنگاوێکی بایەخداریان نا بەوەی هەزارەها پیاوی خێڵەکیی کوردیان بە چەکی هاوچەرخ چەکدار کرد . شێخ عوبەیدوڵلا سەرکردەی مەزنترین بەشی ئەو هێزانە بوو و لەبەرامبەر ڕووسیادا جیهادی دەکرد .[٧٥] هەرچەندە ئەم هێزانە بۆ

---

کاتێک ناوبراو چووە پاڵ تورکەکان لە جەنگەکەدا، حکومەتی عوسمانییش کە بەڵێنی هاوکاریی مادیی دابووییە ، بەڵێنەکەی خۆی بەجێ نەگەیاند ، ئەوەی شێخی تووڕە کرد و وورووژاندی

Enclo. In No.56, Clyton to Trotter.Van ,Sept. 19, 1879,in ibid.,87.

[٧٦] بەگوێرەی نیکیتین شێخ لەسەرەتای جەنگی ١٨٧٧دا سەرکردایەتیی حەفتاهەزار جەنگاوەری دەکرد کە لە هەرێمە سنوورییەکانی تورکیا-ئێرانەوە هاتبوون

Nikitine Basile,"Les Afsars d Urmieh",99.

ماوەیەکی درێژ گرفتیان بۆ رووس پێکنەهێنا ، چونکە هەر زوو توانی تێکیان بشکێنێت و پەرتەوازەیان کات .

چەکدارکردنی کورد ، کە ئاسەوارێکی مەزنی لەسەر تورکیا هەبوو ، ئاسەوارێکی گەورەتری لە سەر ئێران بەجێهێشت . چەکەکان لەدەست کورداندا مانەوە ، لەوەش گرنگتر بڵاوبوونەوەی گیانی جیهاد بوو . داگیرکردنی ئێران لەلایەن کوردەوە ئەوە دەریدەخات کە زۆر ئاسان بوو گیانی جیهادیی ئەو خێڵەکییانە کە پێشتر ئاراستەی ئۆرسۆدۆکسە کریستیانییە رووسەکان کرابوو ، وەربگێڕدرێت و ئاراستەی موسوڵمانە شیعە ئێرانییەکان بکرێت . لەراستییدا لەماوەی راپەرینەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا لە تورکیا ، پیاوەکانی تەنانەت لە شەرکردن لەگەڵ سوپاکەی سوڵتان –خەلیفەدا سستیان نەنواند ، ئەو خەلیفەیەی پێشەوای ئایینیی هەموو موسوڵمانانی سوننە بوو .

برگەی چاکسازییەکەی پەیماننامەی بەرلین کە زادەی جەنگەکەی ۱۸۷۷-۱۸۷۸ بوو ، دەتوانرێت بە یەکێکی دیکە لە هۆکارە ناڕاستەوخۆکانی داگیرکردنەکە بژمێردرێت . ئەو پرۆپاگەندەیەی سەبارەت بە خولیاکانی ئەرمەن لە هەرێمەکانی باکووری رۆژهەڵاتدا بڵاببووەوە ، گیانی یەکبوونی لەنێو کورداندا پەرەپێدا ، ئەو گەلەی کە ناوبانگی بە دووبەرەکیی و ناتەبایی بڵاوبۆتەوە . پێویستە ئەوە بەبیربهێنرێتەوە کە چۆن هاوپەیمانیی کوردیی وەك جوڵانەوەیەکی چەکداریی نەتەوەیی هاتەکایەوە . لەبەر چەند هۆکارێك کە پێشتر باسی لێکراوە ، واپێدەچوو ئەم هاوپەیمانییە نەتەوەییە سۆزی حکومەتی عوسمانیی بۆخۆی راکێشابێت ، ئەوە گەر پشتگیرییەکی چالاکیی نەکردبێت . شێخ هیچ کاتێکی بەفیڕۆ نەدا تا سوود لەم هاوپەیمانییە وەربگرێت بۆ بڵاوکرنەوەی دەسەڵاتی خۆی و بەهێزکردنی لە سەراسەری کوردستاندا . لەوکاتەدا کە پرۆسەی چاکسازییەکان بەرەو دواوە پاشاکشەی دەکرد ، شێخ عوبەیدوڵڵا وەك سەرۆکێکی بێ رکابەری کورد لە کوردستاندا بەرجەستە بوو . بەم پێگەیەوە و بەو خولیا و ورە بەرزەوە ئەو باوەڕەی لادروست ببوو کە دەمی ئەوە هاتۆتە پێشەوە تا ئەو ئامانجە بێنێتەدی کە بەدرێژایی تەمەنی خەونی پێوە دەبینی ، ئەویش دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردییە .

---

گومانی تێدا نیە کە لاوازیی ئێران یەك لەو هۆکارە سەرەکییانە بوو کە ئەو دەوڵەتەی کردە نیشانەیەکی سەرنجڕاکێش . گوتەی یەك لە چاودێرە نزیکەکانی شانۆی رووداوەکان لەوبارەیەوە سەرنجڕاکێشە :" دەگونجێت جوڵانەوەکەی ئەم دواییەی شێخ لە ئێران زادەی ئەو بیروڕایە بێت کە حکومەتی ئێرانیی لەوەکەی تورك گەندەڵتر و نالەبارترە ، هەربۆیە دامەزراندنی دەسەڵاتێکی سەربەخۆ لەوێ ئاسانتر و لەبارتر وەك لە تورکیا دێتە پێش چاو ، هەرئەوەندەی لێرە ئامانجەکەی هێنایەدی ، ئەوسا ئەو هێزە مەزنەی خۆی ئاراستەی کارمەندانی عوسمانیی دەکات ."[٧٦]

گومانێکی کەم لەوە دەکرێت کە ئەوەی لە کۆتاییدا هاندەری شێخ بووە بۆ ئەنجامدانی ئەو هەنگاوە سەرەڕۆ و مەترسییدارە بریتیبوو لە لاوازیی ئێران ، شانبەشانی ئەو کینە و گیانی ناحەزییەی کە موریدانی شێخ بە گشتیی و خۆی بەتایبەتیی لەهەمبەر ئێرانییەکان لە سۆنگەی بڵاوی شیعەگەرایی لەو وڵاتەدا هەیانبووە .

شێخ عوبەیدوڵڵا لە نامەکەیدا بۆ دکتۆر کۆچران لە ٢٥ی سێپتەمبەری ١٨٨٠دا باسی لەو هۆکارە راستەوخۆیە کردووە کە وای لێکردووە پەلاماری ئێران بدات .[٧٧] لەم نامەیەدا باسی لە ئەهامەتییەکانی خۆی و کورد کرابوو کە بەهۆی ئێرانییەکانەوە پێوەی گرفتاربوون ، وەك ئەو شکایەتانەی لەمەڕ کوشتنی دڕندانەی ژمارەیەك کورد و سووکایەتییکردن بەوانی دی ، سەپاندنی باجی پشتشکێن بەسەر چەند سەرۆکێکی کورد و فڕاندنی ژنانی کورد لەلایەن چەند کارمەندێکی حکومەتی ئێرانیی ، بڵاوبوونەوەی توندوتیژیی و جەردەیی کە بەدناوی بەسەر شانی کورددا هێناوە . شێخ ئەم بەدکارییانەی وەك پاساوێك بۆ پەلامارەکەی دژی ئێران لەقەڵەم دەدا .

---

[76] Enclo. In No.22, Trotter to Goschen , Therapia .Oct. 20, 1880 , in Great Britain , Turkey No. 5 (1881),17.

[77] Enclo.2 In No.61, Sheikh Obeidullah to Dr.Cochran,in ibid.,47.

ماوەی جەنگ چەندە کەمیش بخایەنێت ، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ناکامەکان ، هێشتا ئەو ماوەیە بەسە بۆئەوەی کاریگەرییەکی مەزن لە یەکێتی ریزەکانی هێزە خێڵەکییەکان بکات . گەربێتوو بە دەستێکی پۆڵاین جڵەوی ئەو هێزانە نەگیرێت . شکست ناکۆکیی و دووبەرەکیی و پاشتر بەزینی سەرتاسەریی بەدواداد‌ێت . لەکاتێکدا سەرکەوتن زۆر جار دەبێتە بۆنەیەك بۆ تالانیی و راورووت و ئەنجامدانی کاری توندوتیژیی کەموێنە . جەنگاوەرە خێڵەکییەکان کە پاش ئەوەی باری تالانی وشرەخۆریی سستیان دەکات و جوڵەیان پەك دەخات ئیدی یەکەمین خەونی ئەوان بلاوەلێکردن و بۆماڵەوە گەرانەوەیە . ژمارەی هێزە خێڵەکییەکان بەگشتیی لەم جۆرە جەنگانەدا لە هەڵکشان و داکشاندان ، تەنانەت لەکاتی سەرکەوتنیشدا . ژمارەی ئەوانەی کە مەیدانەکە جێدەهێڵن یەکسانە بەوانەی کە بەودوایییە دێنە مەیدانەوە و بەپەلە لەپێناو تالانیی و خۆدەوڵەمەندکردندا بەمەڵەداوان بە هێزە شەرکەرەکانەوە پەیوەست دەبن . ئەم راستییانە وێرای نەبوونی کەسایەتیی فەرماندەیی گونجاو ، وادەکات فرە ئەستەم بێت ژمارەیەکی دروست و تەواوی هێزە کوردییەکانی بەشدار بوو لە هەڵمەتەکەی شێخدا دیاریی بکرێت .

بەلەبەرچاوگرتنی ئەو لاوازییەی هێزە ئێرانییەکان لەو دەمەدا لە هەرێمی ئازەربایجان ، هێزەکانی شێخ بەشێوەیەکی رێژەیی لە رووی چەندایەتیی و چۆنایەتییەوە باش چەکدار و ئامادەکرابوون . وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا ، زۆربەی ئەو چەکانەی لەدەستی کوردەکاندا بوون بەهۆی جەنگەکەی ١٨٧٧-١٨٧٨ەوە دەستیان کەوتبوو ، ئەو کاتەی شێخ وەك فەرماندەی هێزگەلێکی خێڵەکیی مەزن دانرابوو . جۆرێك لەو چەکانەی کوردان پاش تێکشکان و پەرتەوازەبوونیان لەسەردەستی رووسەکان لای خۆیان گلیان دابووەوە بریتیبوو لە برێکی زۆر تفەنگی (مارتینی) بە فیشەکەکانیەوە .[٧٨]

بەگوێرەی سەرچاوەیەکی ئەرمەنیی ، هاوپەیمانییە کوردییەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا لە سەروبەندی داگیرکارییەکەی بۆ ئێران خاوەنی" ٤٠٠٠ تفەنگی مارتینی

---

[78] Nikitine."Les Afsars."99.

بوو ، که ۲۰۰یان له سەرچاوەی ئێرانی و ئەوانی دیکەشی تورکیی بوون."[79] بەگوێرەی نیکیتین ، لەو دوازدەهەزار چەکدارەی پەلاماری ورمێیان دا ، هەزاریان بە تفەنگی جۆری نوێ چەکداکرابوون .[80] واپێدەچێت بۆ شێخ دابینکردنی بەشێکی پێویستییە جەنگییەکان گران نەبووبێت ، باڵیوزی ئێران لە ئەستەمبوڵ باسی شێخی کردووە کە " خاوەنی کارگەی بایەخداری فیشەك دروستکردن بووە ."[81] ئەو راستییەی کە شێخ بە باشی چەك و تەقەمەنی بۆ فراهەم کردبوو و هەروەها لە وەرگرتن و دەستکەوتنی پێویستییە سەربازییەکان بەردەوام بوو ، ئەوەی لەو هەواڵەدا دەردەکەوێت کە باس لەوە دەکات کە تەیمورپاشای خانی برادۆست لە نۆڤەمبەری ۱۸۸۰دا دەستی بەسەر ۱٦۰ باری حوشتر تفەنگ و فیشەکدا گرتووە .[82]

## هەڵمەتە سەربازییەکان

تەنیا ئاماژەی فەرمیی شێخ سەبارەت بە بڕیاردانی پەلامارەکەی بۆسەر ئێران هێماپێدانێکی ناروونە لەمەڕ "ناردنی کوڕەکەی بۆ سابلاغ" کە لە بڕگەیەکی لێڵدا لە یەك لەو دوو نامەیەدا هاتووە کە لەکاتی ئەنجامدانی داگیرکارییەکەی بۆ د.کۆچرانی ناردووە .نامەکە بەوە دەستپێدەکات :" مەلا ئیسماعیلم ناردووە تا ئەوەتان پێ ڕابگەیەنێت کە بەنهێنیی سەبارەت بە هەلومەرجەکەی ئێرە بۆم باسکردووە ، تکام وایە حکومەتی ئینگلیز لە راستییەکانی هەلومەرجەکە ئاگادار بکەنەوە ، هەواڵی ڕۆیشتنی کوڕەکەشیان

---

[79] Enclo. In No.6, letter from Monseigneur Krimian to the Armenian Patriarch, Van ,June. 20. 1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),6.

[80] واپێدەچێت ئاماژەیت بۆ ئەو چەکە نوێیانەی کە مەخزەنی فیشەکیان پێوەیە هەروەها کۆنسوڵ-ژەنراڵ ئابۆت وەسفی شێخی کردووە بەوەی " بە تفەنگی مارتینی باش چەکدارە "

Nikitine,"Les Afsars,"102-103. Enclo. 2. No.8,Abbott to Earl Granville,Tabriz,July15, 1880,in Great Britain , Turkey No. 5 (1881),9.

[81] Encol.1 in No.74, memorandum from Persian ambassador in Constantinople to British charge'd affairs,in Great Britain , Turkey No. 5 (1881),60.

[82] Enclo. 2. No.70,Abbott to Tomson,Tabriz ,Nov. 25,1880, in ibid.,57.

بۆ سابلاغ پێ رابگەیەنە ."[83] هەروەك رووداوەكانی دوایی سەلماندیان نوێنەرەكەی شێخ بە نهێنی ئەوەی بە دكتۆر كۆچران گەیاندووە كە كوڕەكەی شێخ " دەڕوات بۆ سابلاغ " بەڵام بە سەركردایەتیی لەشكرێك !.

لەسەرەتای ئۆكتۆبەری ١٨٨٠ ، جەنگاوەرە كوردەكانی عوبەیدوڵلا لە سنووری ئێران پەڕینەوە . بەگوێرەی راپۆرتەكان هاوچەرخەكان ، هێزەكان لە سێ یەكە پێكهاتبوون ، یەكەمیان بە رابەری كوڕە گەنجەكەی (عەبدولقادر)بوو كە بە ئاراستەیەكی بەرفراوانی كەنارەكانی باشووری دەریاچەی ورمێ بەرەو سابلاغ دەڕۆیشت .[84] هێزی دووەمیان بە فەرماندەیی كوڕە گەورەكەی بوو كە لە مەرگەوەڕ بنەی خستبوو ، " واپێدەچوو بۆ پاراستنی هێڵی پاشەكشەی عەبدولقادر بێت "[85] یەكەی سێیەمیان بە فەرماندەیی شێخ (محەمەد سەدیق) ژنبرا و خەلیفەی شێخ عوبەیدوڵلا بوو كە وەك دەگوترێت لە پێنج هەزار جەنگاوەر پێك دەهات .[86]

لەكاتی كشانی هێزەكانی عەبدولقادر بەرەو سابلاغ . ژمارەیەك لە هێزەكانی كورد ناوچەی شنۆ و سوڵدزی پێوە پەیوەست بوون . پاشتر بە زوویی هێزەكانی كوردی

---

[83] Enclo.4 In No.61, Sheikh Obeidullah to Dr.Cochran, in ibid.,47.

[84] Wilson S.G , Persian Life and Customs,111.

ئامارەكان سەبارەت بە قەبارەی ئەم هێزە یەكجار بەرچاون كلایتۆنی جێگری كۆنسوڵ هەواڵی ئەوە دەدات كە ژمارەی ئەم هێزە بیست هەزار كەسە ، بەڵام هۆشیاری ئەوەشی داوە كە بەتەواوەتیی پشت بە بەم ژمارەیە ببەسترێت نیكیتین لە سەرچاوەی نووسراوی رۆژنامەی ئێرانیی بڵاونەكراوەوە ، تواناى ئەو هێزەی سابلاغی بە چل بۆ پەنجاهەزار بەدەستەوەدەدات . كۆنسوڵ-ژێنەڕاڵ ئابۆت هێزەكانی لە بنەڕەتدا بە دە بۆ سی هەزار داناوە ، كە لەكاتی هێرشەكەیدا چونكە بەشێكیان بۆ ماڵەوە گەڕاونەتەوە ، ژمارەیان دابەزیوە

Enclo.2 In No.54, Clyton to Trotter,Van ,Oct. 25, 1880, Great Britain . Turkey No. 5 (1881),32; Nikitine,"Les Afsars,"95; Enclo. 2. No.56,Abbott to Tomson,Tabriz ,Nov. 5,1881,32.

[85] Enclo.2 In No.54, Clyton to Trotter,Van ,Oct. 25, 1880, Great Britain . Turkey No. 5 (1881),32.

[86] No.61,Thomson to Granville,Teheran,Oct. 31, 1880,in ibid.,45.

ناوچەی مەنگوڕ بە سەرکردایەتیی هەمزەئاغا و سەرۆکەکانی دی بە عەبدولقادرەوە پەیوەست بوون ، ئەوانەی سوێندیان بە قورئان خواردبوو تا مردن بجەنگن . ئەوان بێ بەرگریی چوونە سابلاغەوە ، پاش ئەوەی ڕێگە بە هێزە ئێرانییەکەی ناوشار و فەرمانداری ئێرانی درا شارەکە جێبهێڵن بێ ئەوەی زیانێکیان پێبگات . پاش ئەوەی سابلاغ کەوتە دەست کوردان ، ڕێبەرانی ئایینیی سوننەی ئەو شارە فەتوایەکیان[87] سەبارەت بە جیهادکردن دژی شیعە بڵاوکردەوە .[88]

دووەمین ئامانجی شێخ عەبدولقادر ، میاندوئاو بوو . وادیارە چێت شێخ ژمارەیەک نوێنەری ناردبێت تا داوای ئازوقە بکەن و بۆچوونی خەڵکی شارۆکەکە بزانن ، نوێنەرەکانی لەلایەن خەڵکەوە گیران و کوژران . ئەوەی شێخی بە تەواوەتیی توڕەکرد و دەستبەجێ بڕیاریدا پەلاماری میاندوئاو بدات .[89] نیوەی دانیشتووانی شارۆکەکە لە ترسی تۆڵەسەندنەوە کەلوپەل و شمە بەنرخەکانیان شاردەوە و لەمیاندوئاو هەڵاتن ، نیوەکەی تریشی کە سێهەزار کەسێک دەبوون و لە پیاو ،ژن و منداڵ پێکدەهاتن ، لەلایەن هێزەکانی عەبدولقادرەوە پاش تاڵانکردنی شارۆکەکە قەڵتوبڕکران .[90] ناوچەکانی دەوروبەریش وەک بناب و مەراغەش کەوتنەبەر پەلامار و وێران کران .

وێرانکردنی میاندوئاو سەرکەوتنێکی پوچ بوو ، باری زۆربەی جەنگاوەرە خێڵەکییەکان بەهۆی تاڵانیی و ڕاورووتەوە گران بوو ، هەربۆیە بڵاوەیان لێکرد و بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە . هەروەها ئەوەی ڕوویدا هانی ئێرانییەکانی دا ئامادەیی بەرەنگارییان پتربێت و زیانێکی زۆری بە ناوبانگی شێخ و تەواوی پرسەکەی گەیاند . بەگوێرەی ویلسن" ئەم پەرتەوازەبوونە سەلماندی کە کورد توانی ئەنجامدانی کاری جەنگی

---

[87] See D.B. Macdonald,"Fatwa," Encyclopaedia of Islam,1 st ed.,3:92-93.

[88] Wilson S.G , Persian Life and Customs,111.

[89] Enclo. 1. No.61,Abbott to Tomson,Urmiya ,Oct. 7,1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),46.

[90] Wilson S.G , Persian Life and Customs,111.

ئابۆت ژمارەی کوژراوەکانی عەجەم لە میاندوئاو بە دووهەزار مەزەندە دەکات . خانمی کۆچەرلنیش لەنامەکەی خۆیدا کە بەرواری ١١ی ئۆکتۆبەری لەسەرە ، ژمارەی کوژراوەکانی میاندوئاو و دەوروبەری بە چوارهەزار داناوە .لۆرد کێرزۆن وەک ویلسن ژمارەکەی بە سێهەزار داناوە . Speer,84;Curzon,1:553.

سەربازیی نەزمدار و بەدیسپلینی نیە ، کۆمەڵکوژییەکە تەنیا تاوانێك نیە ، بەڵکو هەڵەیەکە ، چونکە بووە هۆی ئەوەی ئێرانییەکان بەرمنگارییەکی ناچاریی و شەڕی مانونەمان بکەن . هەروەها هەر سۆزێکی بۆ کوردەکانیش سڕییەوە ، ئەویش گەر لە بنەڕەتدا سۆزێك هەبێت ."[91]

پاش ئەوە شێخ عەبدولقادر رووی هێزەکانی خۆی بەرەو مەراغە وەرگێڕا ، دوای ئەوەی دەستی بەسەردا گرت . بەرەو پێش رۆیشت و هەواڵ هەیە کە نزیکی تەبریز بۆتەوە ،[92] ئەوەش دواخاڵی گەیشتنی هێزەکانێتی .

لەهەمان کاتدا هەواڵی ئەوە هەیە کە شێخ سەدیق بە خۆی و هەزار چەکدارەوە هەڕەشەی خستۆتە سەر شاری ورمێ ،[93] هێزێکی دیکەی پێوە پەیوەست بوو کە لە لایەن شێخ عوبەیدوڵڵای باوکییەوە سەرکردایەتیی دەکرا . ژمارەی تەواوی ئەو هێزانە کە گەمارۆی ورمێیاندا بریتیبوو لە هەشت هەزار جەنگاوەر .[94] پاش چەند رۆژێك شەڕی لابەلا ، دانیشتووانی شارە گەمارۆدراوەکە چیرۆکی چارەنووسی خەڵکی میاندوئاویان بەرگوێ کەوتبوو ، بڕیارباندا داوای ئاشتیی بکەن . لە سۆنگەی ئەوەوە ، ژمارەیەك لە پیاوماقوڵ و رێبەرە ئایینییەکانی ورمێ پەیوەندییان بە شێخ عوبەیدوڵڵاوە کرد و پێشنیازیی ئەوەیان کرد شارەکە بەدەستەوە بدەن بەمەرجێك زیان بە خەڵکەکە نەگات . شێخ ئەوەی پەسەندکرد و بەروارێکیش بۆ بەدەستەوانی شارەکە تەرخانکرا .[95] کاتێك بەروارەکە گەیشت ، دەسەڵاتدارانی خۆجێی ئێرانیی شارەکە داوای دواخستنی ئەو کارەیان کرد . سەرەتا شێخ ئەو دواخستنەی رەتکردەوە ، بەڵام پاشتر لەسەر داوای دکتۆر کۆچران وەك بینیمان کە پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ شێخدا هەبوو ، دواخستنەکە پەسەندکرا .[96]

دەسەڵاتدارانی ئێران سوودیان لەو دواخستنە بۆ بەهێزکردن و قایمکردنی

---

[91] Wilson S.G , Persian Life and Customs,112.

[92] No.68, Clyton to Trotter,Van ,Nov. 2, 1880,in Great Britain , Turkey No. 5 (1881),54.

[93] No.61,Thomson to Earl Granville,Teheran,Oct. 31, 1880,in ibid.,46.

[94] Enclo. 2. No.56,Abbott to Tomson,Tabriz ,Nov. 7,1880,in ibid.,32.

[95] Nikitine,"Les Afsars,"101-2.

[96] Wilson S.G , Persian Life and Customs,114;Speer,86;Curzon,1:553.

شارەکە و توانای بەرگریی بینی . نەیانزانی کە هێزێکی ئێرانیی بەڕێوەیە بۆ فریاکەوتنی شارەکە ، ئیقبال ئەلدەولە فەرمانداری ورمێ بڕیاریدا بەرەنگاریی شێخ بکات .[٩٧] کاتێك کوردان دواتر پەلاماری خۆیان دەستپێکرد تووشی زیانێکی زۆر بوون . پێدەچێت ئەو شکستە توندە ورەی هێزەکانی عوبەیدوڵڵای دابەزاندبێت ، چونکە زۆری نەبرد ئەو هێزانە بەشێوەیەکی تەواو ڕەمەکیی و نارێك بەرەو ناوچە چیاییەکانیان کشانەوە .[٩٨]

بەم چەشنە خەڵکی ورمێ دە ڕۆژیان بەگەمارۆدراوی لە سایەی نیگەرانیی و ترسێکی مەزندا بەسەربرد . شکستی شێخ لە ورمێ سەرەتای کۆتایی داگیرکارییە کوردییەکە بۆ ئێران بوو . داگیرکەران هەر زوو لەبەردەم پێشڕەویی ئێرانییەکاندا کەوتنە پاشەکشە . یەکە سوپاییەکانی تورك لەسەر سنووری تورکیی–ئێرانیی مۆڵیان خوارد و هاکاریی هێزە ئێرانییەکانیان دەکرد بەوەی ڕێگەیان لە پاشەکشەی هێزە کوردییەکان دەگرت .[٩٩]

شێخ عوبەیدوڵڵا کەتوانی ڕێگەی خۆی بەرەو ئەوچیا بکاتەوە ، لەکۆتاییدا لە ژوونی ١٨٨٠دا ، بەرەو ئەستەمبوڵ گواسترایەوە وەك ناکامێکی ئەو فشارە سەختەی کە لەلایەن زلهێزەکانەوە کرابووە سەر دەروازەی باڵا . جێگەی سەرنجە لە درێژەی ڕێگەکەیدا بەرەو پایتەخت ، لە هەموولایەکەوە وەك قارەمانێك پێشوازیی لێدەکرا .[١٠٠] دوای مانەوەی چەند مانگێکی لە ئەستەمبوڵ ، هەڵات و خۆی گەیاندەوە ماڵە چیاییەکەی خۆی لە نەهریی .تورکان بەلەبەرچاوگرتنی رای گشتیی ئەورووپیی ، هێزێکیان ناردە سەر شێخ و داوایان لێکرد خۆبەدەستەوە بدات . عوبەیدوڵڵا درکی بە بێهیوایی خۆی لەمەڕ هەلومەرجەکە دەکرد هەربۆیە خۆی بەدەستەوەدا و ئەمجارەیان بۆ حیجاز دوورخرایەوە ، لەوێ لەساڵی ١٨٨٣دا گیانی سپارد .[١٠١]

---

[97] ئیقبال ئەلدەولە بۆ ڕێکخستنی بەرگریی لە شارەکەدا هاوکارییەکی مەزنی لەلایەن (کلۆزێل) ی مەزنە کەشیشی مسیۆنێری فەرەنسیی وەرگرتووە ، بە هەوڵی ناوبراو پارەیەکی زۆر لە زانرگانانی شار کۆکرایەوە و خەرجیی کڕینی کەلوپەلی پێویستی بۆ بەرگریی لە شارەکە پێ دابینکرا .Nikitine,"Les Afsars,"103.

[98] Wilson S.G . Persian Life and Customs,114;Speer,90.

[99] See Wilson S.G . Persian Life and Customs,117.

[100] Curzon,1:554;cf. Wilson S.G . Persian Life and Customs, 119.

[101] سەبارەت بە شوێنی مردنی شێخ گوتەی جیاواز هەیە ، هێندێك دەڵێن لە مەککە . زەکی دەڵێت لە تائیف ،

## رووداوەکانی پاش هەڵمەتەکە

ئەو کوشتار و توندوتیژییەی لەلایەن ئێرانییەکانەوە بۆ سەرکوتکردنی جوڵانەوەکەی شێخ ئەنجامدرا زۆر لەوە زیاتر بوو کە کوردان لەکاتی پەلامارەکەیاندا کردیان . کوردان و سوننەی ناوچەکە لەلایەن سەربازانی ئێرانییەوە راودەنران و دەگیران و سەردەبڕان هەروەك چۆن شیعەکان پێشتر لەلایەن کوردە خێڵەکییەکانەوە دەکوژران . سروشتی رەشەکوژیی تۆڵەخوازیی ئێرانییەکان لەو راستییەدا دەردەکەوێت کە وێڕای ئەوەی ژمارەیەکی کەم لە نەستوورییەکانی دەشتی ورمێ بەهۆی پێشێلکاریی تالانچییەکانی کورد گیانیان لەدەستدا ، بەلام هێزە ئێرانییەکان ژمارەیەکی زۆر نەستوورییان کوشت .[١٠٢]

داگیرکاریی کوردان و ئەو هەنگاوانەی بۆ سەرکوتکردنیان نرا وێرانکارییەکی گەورەی لەناوچەکەدا لێکەوتەوە . وێڕای ئەو زیانە گیانییە قورسەی لێیکەوتەوە ، ناوچەیەکی دەوڵەمەندی بەرفراوانی خاکی ئێران بەتەواویی بوو بە کەلاوە . دەشتی ورمێ کە بە " بەهەشتی ئێران " ناودەبرا ، وێران بوو . ئەو کارەساتە هێندە مەزن بوو کە تەواوی ئێران بۆ ماوەی چەندین ساڵی دواتر لەژێر ئاسەوارەکانی دەیناڵاند . (ستاك) لە ساڵی ١٨٨٢دا لە نووسینێکیدا ئاماژەی بەوە کردووە ، لە کاتی گەشتەکەیدا بە هەرێمەکانی فارس لە باشووری ئێران ، بیستوویەتی کە " بەهۆی داگیرکارییەکەی کورد بۆ ئازەربایجان ، خەڵکی فارس لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە ناچارکراون باجی فریاکەوتن بدەن ."[١٠٣] ئاسەواری ئەو داگیرکارییە تا ئەو رادەیە بووە وەك لە نووسینەکانی (مسس ماری شید) ی مسیۆنێری ئەمەریکییدا دەردەکەوێت کە دەڵێت :"تاکو جەنگی جیهانییش، هەموو رووداوەکان لە ورمێ لەمێژووی پەلامارەکەی شێخەوە بەرواری بۆ

شێرکۆش دەڵێت لە مەدینە زکی ، خلاصة تاریخ الكرد ، ١٢٠ .

Elphinston, " Kurds and the Kurds Question ,"94; Chirguh, La question kurde,18.

[102] Wilson S.G , Persian Life and Customs,115-16.

[103] Edward stack,Six Months in Persia ,250-51.

دانمنرا ."[104]

دوای تێکشکاندنی کوردان ، بارودوخی مسیۆنێره ئەمەریکییەکان لە ورمێدا تێکچوو ، هەروەها گەیشتە دوا رادەی مەترسییداری خۆی بەوەی بێ بەڵگە سەبارەت بە بەشدارییان لە هێرشەکەی کورددا تاوانبار کرابوون . بەهۆی ئەو پەیوەندییە دۆستانەیەی مسیۆنێرەکان لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵلادا هەیانبوو بەوە تۆمەتبار دەکران کە هانیانداوە و هاوکارییان کردووە . ئەوە تەنیا دەستێوەردان و کاری دیپلۆماتی بەریتانییەکان بوو کە بوو هۆی ئەوەی ئەو مسیۆنێرە ئەمەریکییانە لە چارەنووسێکی نادیار رزگاریان بێت .

## بواری نێودەوڵەتیی داگیرکارییەکەی کورد بۆ ئێران

دامەزراندنی پەیوەندیی دپلۆماسیی لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێراندا

یەك لە ئاکامەکانی کارە داگیرکارییەکەی کوردان بۆ ئێران بریتیبوو لە دامەزراندنی پەیوەندیی دپلۆماسیی لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێراندا . سەرنجی حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ ئێران لە ئاکامی ئەو مەترسییانە بوو کە مسیۆنێرە ئەمەریکییەکان لەسەروبەندی هەڵمەتەکەی شێخ عوبەیدوڵلادا لە ئێران تووشی هاتبوون . ئەوەی سەرەتا بایەخێکی تایبەتی بەو مەسەلەیەدا بریتیبوو لە (روفوس روبنسن داوس) ی ئەندامی کۆنگرسی ئەمەریکیی نوێنەری ماریت-ئۆهایۆ ، ئەوەی برای خاتوو سارا شیدی ئەندامی مسیۆنێری ئەمەریکیی لە ورمێ بوو . ئەو لە ٢٠ی نۆڤەمبەری ١٨٨٠دا بەنامەیەك "ئیڤارتس" ی وەزیری دەرەوەی سەبارەت بەو مەترسییە مەزنە ئاگادار کردەوە کە لە ئاکامی رووداوەکانی ئەو دواییەی ئێراندا رووبەرووی دەستەی میسیۆنێری ئەمەریکیی بووەتەوە . داوس پێشنیازی ئەوەی کرد کە وڵاتە یەکگرتووەکان پێویستە قسە لەگەڵ حکومەتی ئێرانییدا بکات بۆئەوەی ئەو هاووڵاتییە ئەمەریکییانە بپارێزێت . لەکۆتایی نامەکەیدا ئاماژەی بەوەدابوو کە خوشکی و خێزانەکەی بەشێك لەو مسیۆنێرییە پێکدەهێنن .[105]

---

[104] Shedd, Mary Lewis,The Meassure of a Man,45.

[105] Dawes,Rufus R.,comp, A History of Deplomatic Relation With Persia, 5.

ناوەڕۆکی ئەو نامەیە ڕەوانەی (جیمس ڕەسڵ لۆوێل) ی وەزیر لە لەندەن کرا، ئەویش هەستا بە ناردنی نامەکە بۆ (لۆرد گرانڤیل/جۆرج لیڤیسۆن گاور)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیی ، تکای لێکرد بە نوێنەرەکەی خۆیان لە تاران ڕابگەیەنێت دەسەڵات و هەوڵی دۆستانەی خۆیان لەپێناو پاراستنی هاوڵاتیانی ئەمەریکیی لە ئێران بەگەڕبخەن . پاش ئەوە ، داوسی ئەندام کۆنگرس هەوڵیدا لە "ڕێگەی کۆنگرسەوە بڕیارێك بەدەستبێنێت بۆئەوەی بە شێوەیەکی باشتر ئەو هاوڵاتیە ئەمەریکییانە لە ئێران بپارێزێت."[١٠٦] داوس بە پێویستی زانی کە هەوڵی پتر بدات و پەیوەندییەکانی خۆی لە پێناو ئەو مەبەستەدا تەرخان بکات ، چونکە جەماوەری ئەمەریکیی لەو مەسەلەیە بەئاگا نەبوو و ڕای گشتییش پشتگیریی هەوڵێکی ئەوتۆی نەدەدا . هەمان کات ، مسیۆنێرەکان خۆیان بەردەوام هانی داوسیان دەدا کە بۆ دامەزراندنی پەیوەندییەکی دپلۆماسیی لەنێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران تێبکۆشێت .[١٠٧]

یەکەمین هەنگاو کە لەلایەن داوسی ئەندام کۆگرسەوە نرا ئەو بڕیارە بوو کە لە ٦ی فێبرایەری ١٨٨٢ درا کە داوای دامەزراندنی نوێنەرایەتییەکی دپلۆماسیی وڵاتە یەکگرتووەکانی لە ئێران دەکرد . هەروەها بەدرێژیی سەبارەت بە قازانجی بازرگانیی نوێنەرایەتییەکی بەو شێوەیەی دەکرد و جەختی لە بایەخی ئەو وڵاتە وەك بازاڕێکی ئایندەیی بۆ کاڵا ئەمەریکییەکان دەکردەوە . پاش هەفتەیەك لە پێشکەشکردنی بڕیارەکە و لە ١٣ی فێبرایەری ١٨٨٢دا بە تێکڕای دەنگ لە ئەنجومەنی نوێنەراندا پەسەند کرا .[١٠٨] لەکۆتاییدا ، لە ٣ی ئووتی ١٨٨٢دا ، پێنج ڕۆژ پێش کۆتایی پێهێنانی دانیشتنەکانی کۆنگرس ، کۆنگرس بە هەردوو ئەنجومەنەکەیەوە کۆبووەوە و یاسای ژمارە (H.B.6743) ئامادەکرا کە ڕێگە دەدا پەیوەندیی دپلۆماسیی دابمەزرێنن .یاساکە لە ٥ی ئوتیی ١٨٨٢دا لەلایەن هەردوو ئەنجومەنەکەوە پەسەندکرا پاش ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی پیرانەوە هێندێك ڕاستکردنەوەی تێداکرا .(مستەر ئێس.جی.دەبلیو.بنیامین) وەك یەکەمین نوێنەری دپلۆماسیی ئەمەریکیی لە ئێران دەستنیشانکرا ، ناونیشانی

---

[106] Ibid.,27.

[107] Ibid.,25-26.See also letter from Joseph P.Cochran and W.L.Whipple to Hon .R.R.Dawes, Urmiya , July 6 1882.

[108] Dawes,27-33.

کۆنسوڵی گشتیی و هەڵسوڕێنەری کاروباری پێدرا .[١٠٩] پاشتر ناونیشانەکەی بۆ وەزیر گۆڕرا .

## هەڵوێستی دەوڵەتانی ئەوروپا

جوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا دەنگ و سەدایەکی گەورەی لە نێوەندە نێودەوڵەتیی لێکەوتەوە . سروشتی سەرەکیی جوڵانەوەکە کە ئامانجی پەلاماردانی ئێران بوو ، گرفتێکی نێودەوڵەتیی پێکدەهێنا . ئەوەش شتێک بوو دەبوایە روویبدایە چونکە ئەو داگیرکارییە تورکیای دەگلاندە کێشەکەوە بەوەی داگیرکارییەکە لە خاکی ئەوەوە دەستپێکردووە و جێبەجێکەرانیشی رەعییەتی ئەون . رووسیا کە فرە بایەخی بە کاروباری ناوخۆی ئێران و تورکیا دەدا ، وای دەبینی کە جوڵانەوەکەی شێخ هەوڵێکە بۆ ئاڵۆزکردنی هەلومەرجی ناوچەیەک کە بۆ رووسیا بایەخێکی ژیانیی هەیە . بە پێچەوانەوە ، بەریتانیا بەرژەوەندیی قووڵی خۆی لە پاراستنی یەکێتی ئیمپراتۆریی عوسمانییدا دەبینی و بەنیگەرانییەوە دەیڕوانیە پەرەسەندنی رووداوەکان و دەترسا لایەنگریی رووسیا لە ئێران ببێتە هۆی تێوەگلانی تورکیا ، ئەوەش کێشەکێشێکی نابەرابەری لێبکەوێتەوە . تەنانەت دەوڵەتی نەمساش کە لە شانۆی رووداوەکانەوە دوور بوو ، تێکەڵ بە ململانێ دپلۆماسییەکان بوو .

## بەڵێنی هاوکاریکردنی ئێران لەلایەن رووسیاوە

داگیرکارییەکەی عوبەیدوڵڵا بۆ ئێران بەچەند هۆکارێک بووە هۆی نزیکبوونەوەی ئێران و رووسیا . ئابڕوچوونی ئێران بەوەی سنوورەکەی بەزێنراوە ، دەسەڵاتەکەی لێدراوە و خەڵکەکەی قەڵتوبڕکراوە بەشێوەیەکی هێندە قووڵ کاری تێکرد کە ئامادەبوو پەنا بۆ هەموو شتێک بەرێت تۆڵەی بۆ بکاتەوە و حەقی بسێنێت . رق و بێزارییەکی قووڵ لای فارسەکان لە ناکامی نەتوانینی بنەڕەتییان بۆ پێشگیریی لەو داگیرکارییە دروست ببوو ، سەرباری ئەوەش قەڵتوبڕی خەڵکە شیعەکەی ئێران ئاگری دەمارگیریی مەزهەبیی

---

[١٠٩] Ibid.,42-55.

داگیرساندبوو ، ئەوەی پتر ئەو ئاگرەشی جۆش دەدا ئەو راستییە بوو کە بەرنامە و رێکخستنی کاری داگیرکارییەکە لە خاکی تورکیاوە ئامادەکرابوو ، لەلایەن رەعییەتی تورکیاشەوە ئەنجامدەدرا .ئەوەش گومانی ئێرانی لەمەڕ بەشداربوونی کارمەندانی تورك لەو جوڵانەوەکەی شێخدا هێنایەئارا.لۆرد کیرزن بە جوانیی ئەو بارە دەروونییەی ئێرانی بەرجەستەکردووە :" شا تکای یارمەتیی لە رووسیاکرد ، داوای راوێژی لە بەریتانیا کرد ، لەتورکیاش دوای قەرەبووی کرد ."[110]

رووسیا نزیك دەستە و لەو ئامادەیە یارمەتیی خێرا بگەیەنێتە ئێرانییەکان و ئەوانیش دڵنیان ئەو یارمەتییان پێدەگات نەك تەنیا بەهۆی دوژمنایەتیی سونەتیی تورکیی–رووسیی ، بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە جوڵانەوەکەی شێخ رێگەی لەبەردەم چنینەوەی بەشێك لەو بەرهەمەی سەرکەوتنەکەی رووسیا لە جەنگەکەی ١٨٧٧–١٨٧٨ گرتبوو .لەبەر ئەم هۆیە رووسیش هەمان بۆچوونی فارسیان هەبوو سەبارەت بەوەی تورکان لە پشت راپەڕینەوە کوردییەکەوەن ، هەروەها ترسی ئەوەیان لێنیشتبوو کە ئەم ئاڵۆزییە ببێتەهۆی پتربوونی دەسەڵاتی بەریتانیی لە هەرێمەکانی رۆژهەڵاتدا ، کە بە پێی پەیماننامەی بەرلین ، بەریتانیا بەرپرس و چاودێری جێبەجێکردنی چاکسازییەکان بوو . هۆکارێکی دیکەی دژایەتیی رووسەکان بۆ جوڵانەوە کوردییەکە بریتیبوو لەوەی دەسەڵاتی خۆی لە ئێراندا پارێزراوبێت و بە بەردەوامیی رۆڵی هاوپەیمان و پارێزەرێکی ئێران بگێڕێت .

لەکۆتاییدا ، ئەوان لە کاریگەریی ئەرێنیی جوڵانەوەکە لەسەر دانیشتووانی کوردی قارس و ئەردەهان دەترسان . بێگومان ، ئەوان ئامادەنەبوون زەمینەی بڵاوبوونەوەی هزری موریدێتیی لە ناوچەیەکی نزیکی بەوشێوەیە لە قەفقاسی ئاڵۆزدا خۆش بکەن . شێخ عوبەیدوڵڵا کە تەنیا چەند ساڵێك لەوەپێش سەرکردایەتیی هێزە خۆبەخشەکانی کوردی دژی هێزەکانی رووسیا لە جەنگەکەی ١٨٧٧–١٨٧٨ دا کرد ، هەر وەك شامیل ی یاخیی بەناوبانگی قەفقاسیی ، رێبەرێکی نەقشبەندیی بوو .

هەرچەندە رووسەکان سووربوون لەسەر کۆتایی پێهێنانی ئەو راپەڕینە کوردییە لە کاتێکدا فارسەکان ئەو کارەیان پێنەکرایە ، بەڵام ئەوان لەهەرکارێك خۆیان دەپاراست

---

[110] Curzon,1:557.

که ببێته هۆی وورووژاندن و تووڕەبوونی بەریتانییەکان . ئەوان هەمیشە چاودێریی ڕەوتی ڕووداوەکانیان لەو ناوچە ئاڵۆزەدا دەکرد و هەموو ناڕەحەتیشییەکی خۆیان کرد . بەڵام لەو ڕووەشەوە وریابوون کە هیچ کارێکی سەرەڕۆیانەی وا ئەنجام نەدەن کە ببێتە هۆی پێکدادان و ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ تورکیادا . ئەوان پەیوەندی دۆستانەی خۆیان لە گەڵ بەریتانیادا پاراستبوو لە کاتێکدا بە هێمنیی خەریکی بڵاوکردنەوەی هێزەکانیان بە درێژایی سنووری قەفقاس بوون .

دواو لە (پلۆنکێت) ی نوێنەری دپلۆماسیی بەریتانیا لە سانپترۆسبێرگ کرا هەوڵبدات هەڵوێستی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیی بزانێت . ئەو لە ٣ی نۆڤەمبەری ١٨٨٠ سەرەوەی خۆی لەوە ئاگادار کردەوە کە (بارۆن ئەی.جی.جۆمینی) [١١١] ئەو هەرایەی کوردی بە درێژایی سنوورەکانی تورکیی–ئێرانیی بۆ پیلانگێڕیی تورك گەڕاندۆتەوە و نیگەرانیی خۆشی لەوە دەربڕی کە لەوانەیە ببێتە هۆی کەوتنەوەی ئاڵۆزییەکی توند لە ناوچەکەدا . ئەو بە تەواویی ڕوونی کردەوە کە حکومەتی ڕووسیی دەگونجێت لە بارێکی وادا خۆی ببینێتەوە " لە داهاتوودا بایەخی پتر بەو بابەتە بدات وەك لەوەی ئێستا هەیە " [١١٢]

پاش سێ ڕۆژ ، ڕۆژنامەی (Bereg/بیرگ) ی ڕووسیی بەشێوەیەکی پاراوتر ئەمەی دەربڕی ، کە بێگومان دەربڕینی هەڵوێستی فەرمیی ڕووسیا بوو ، کاتێك گوتی:

"کوردان هێرشیان کردۆتە سەر ئێران ، ئایا ناگونجێت تورکەکان دەستێکیان لەم گەمەیەدا نەبێت ؟ ئایا ناگونجێت دەروازەی باڵا هیوای بەهێنانەکایەی هەلومەرجێکی وابێت کە خۆی لە جێبەجێکردنی بڕیارەکانی پەیماننامەی بەرلین لەمەڕ کێشەی ئەرمەن بدزێتەوە؟ لەوانەیە سیاسەتکارانی ئەستەمبوڵ بیانەوێت چۆن ئەلبانییەکانیان لە دەستێوەردانی کاروباری مۆنتنیگرۆدا بەکارهێنا بەهەمان شێوەش کوردەکان بەکاربهێنن . هەرحاڵ ئەم پرسیارانە زۆر نابات وەڵامیان دەرێتەوە ."[١١٣]

---

[111] Baron A.G.Jomini held the position of senior counselor in the Russian Foreign Office from 1856 to 1888.

[112] No.29,Plunkett to Earl Granville.St.Petersburg .Nov. 3, 1880, Great Britain , Turkey No. 5 (1881),20.

[113] Encol.in No.28, Extract from Bereg .St.Petersburg .Nov. 7. 1880.in ibid..19.

ئینجا ڕۆژنامەکە کەوتۆتە باسکردنی هەموو ئەو بەرژەوەندییە بازرگانیی و رامیارییانەی بەریتانیی و رووسەکان لە ئێران هەیانە . ئاماژەی بە ڕێکەوتنی رووسیی ـبەریتانیی کردووە کە لەپێش جەنگی قەرم دا لەنێوانیاندا هەبووە و دوای کردووە کە بەو شێوەیەی پێشوو پەیوەندیی لەنێوان هەردوو وڵات دەست پێبکرێتەوە . هەروەها ئاماژەی بەوەداوە " لەراستییدا هیچ هۆکارێك نیە پێویست بەوە بکات رووسیا و ئنگلتەرا لە ئاسیای ناوەڕاستدا کێشەیان لەگەڵ یەکدا هەبێت ."[114] ڕۆژنامەکە ئاماژەی بەو پەیوەندییە باشە داوە کە لەنێوان رووسیا و ئێراندا هەیە و هێمای بۆ ئەوداوایەی ئێران لە رووسیا کردووە تا دژی کوردان یارمەتیی سەربازیی بدات . ئەوەی روونکردۆتەوە کە گەر بێتو ململانێیەکە رووبەکی مەترسییدارتر بەخۆوە ببینێت و بۆ سنوورەکانی رووسیا درێژبێتەوە ، سوپای رووسیی " ڕێگەی دەدرێتی لەسەر سنووری ئێران چالاکی خۆی بنوێنێت و سەرکەوتنی تالآنچییە یاخیبووەکان بکات ."

## کاردانەوەی بەریتانیی لە حاست هەڵوێستی رووسیی

لەوەدەچێت بەریتانیای مەزن بەو هەواڵانە فرە نیگەران بووبێت کە باسیان لەو پێشنیازەی رووسیا دەکرد کە بۆ هاوکاریی سەربازیی پێشکەشیی ئێرانییەکانی کردووە . میستەر پلونکێت لە تەلەگرافێکدا کە لەلایەن گرانڤیل ی وەزیری دەرەوەی بەریتانییەوە نێردراوە ، فەرمانی پێکراوە لەبارەی ئەو دەنگۆیانەوە سۆراغ بکات . پلونکێت وەزیری دەرەوەی لەوە ئاگادار کردۆتەوە کە جارێکی تر بانگ کراوەتە وەزارەتی دەرەوەی رووسیی و بابەتەکەی لەگەڵ بارۆن جۆمینی باسکردۆتەوە . بەگوێرەی پلۆنکێت ، جۆمینی ئەوەی پێراگەیاندووە کە شای ئێران خواستی خۆی بۆ وەزیری رووسیی لە تاران سەبارەت بە بەدەستهێنانی هاوکاریی سەربازیی رووسیی بۆ گێڕانەوەی ئەزم و ئارامیی لەنێو عەشیرەتە کوردەکان دەربڕیوە . پلونکێت لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت سیزاری رووس :" کاتێك ئەو داوایەی گوێ لێبوو ، هەر زوو پەسەندی کرد و جەختی لەوە کردەوە کە لە هیچ حاڵەتێکدا سوپای رووسی بۆ نێو خاکی عوسمانیی بەدوای کورداند نەکشێن

---

[114] Ibid.

." هەروەها بارۆن جۆمینی ئاماژەی بەوەدا کە هەواڵەکانی بەودواییەی کوردستان ئاماژە بە باشییەکی زۆری بارودۆخەکە دەکەن بەچەشنێك لە زۆربەی بارەکاندا پێویست بە یارمەتیی رووسیا نەکات . ئەو گوتی ، وێڕای ئەو راستییەش ، هەنگاو نراوە بۆ کۆکردنەوەی هێزێکی پێویست لەسەر سنوور گەر بێتو دواتر پێویست بکات . بەڵام بارۆن ژمارە و بڕی ئەو هێزە سەربازییانەی ئاشکرا نەکرد .[116]

میر (ئەندرێ لۆبانۆڤ ڕۆستۆڤسکی) باڵیۆزی رووسیی لە لەندەن ، لەمیانەی چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ وەزیری دەرەوەی بەریتانیی سەبارەت بە بابەتی هاوکاریی سەربازیی رووسیی بۆ ئێران وتووێژیان کرد . میر گوتی کە شا داوای هاوکاریی سەربازیی لە سیزاری رووس کردووە و جەختی لەوە کردووە کە هێزەکانی رووسیا لەژێر فەرماندەیی حکومەتی ئێراندا بن . بەگوێرەی لۆبانۆڤ ڕۆستۆڤسکی ، " سیزار ئەوەی پەسەند نەکردووە بەڵام ئەوەی پەسەند کردووە رێگەی بە هێندێك لە هێزە رووسییەکان بدرێت لەسەر سنوور خڕببنەوە ."[117]

رووسیا لەسەر سیاسەتی ئاشتەوایی خۆی لەهەمبەر ئینگلتەرادا بەردەوام بوو . بە گوێرەی گرانڤیل ، فەرمان بە باڵیۆزی رووسیی دراوە دڵنیاکردنەوەی خۆی رابگەیەنێت سەبارەت بەوەی هەرچەندە سیزار فەرمانی بە سەربازەکانی داوە لە سنوور نزیك ببنەوە بەڵام سوورە لەسەر ئەوەی چەندە بتوانێت رێگەیان لێبگرێت سنوور ببەزێنن ، چونکە " سیزاری شکۆمەند لەترسی نەکەوتنەوەی گرفتی نێونەتەوەیی بەشێوەیەکی راستەوخۆ بۆ سەرکەوتنی ئێرانییەکان دەست لە مەسەلەکە وەرنادات ." هەروەها میر لۆبانۆڤ جەختی لە ویستی رووسیا بۆ مانەوەی لە نێو سنووری خۆیدا کردەوە هەروەها " بەرەو خاکی هیچ کام لە تورکیا یان ئێران پێشڕەویی ناکات ."[118] وەزیری دەرەوەی بەریتانیی سەبارەت بەم دڵنیاکردنەوەیە وەڵامێکی کورت و پڕمانای دایەوە . بەگوێرەی گێڕاوەنەوەی خۆی " وەڵامداوە کە ئەوە بێگومان بایەخدارترین کۆتاییە بتوانرێت

---

[115] No.32,Plunkett to Earl Granville,St.Petersburg ,Nov. 8, 1880,in ibid.,20.

[116] Ibid.

[117] No.35, Earl Granville to Plunkett,London .Nov. 9, 1880,in ibid.,21.

[118] No.41, Earl Granville to Plunkett,London .Nov. 16, 1880,in ibid.,24.

بێتەدی ."[119]

هەر زوو پاش ئەوەی دەنگۆی ناردنی بەو نزیکانەی سوپای رووسیی بۆ ئێران بڵاوبووەوە هەواڵەکان باسیان لە جوڵانەوەی سوپای رووسیی دەکرد . کارمەندی کۆنسوڵخانەکانی بەریتانیی بەپەلە سەرچاوەکانی هەوڵیان ئاگادارکردەوە کە هەرچی زانیارییان سەبارەت توانا ، پێکهاتە و ئاراستەی هێزەکانی رووسیی لە قەفقاس لایە ، چەندە بچووکیش بێت بۆیان بنێرن .[120] زیاترین رێژەی ئەو هێزە رووسییانەی سەر سنوور کە لەو راپۆرتانەدا هاتووەشەش هەزارە .[121]

رووسەکان لەلایەن خۆیانەوە هەوڵیاندا بایەخ و ژمارەی ئەو هێزانە کەم پیشاندەن . هەستیاری رووسەکان سەبارەت بەم بابەتە ، تەنانەت دوای سەرکوتکردنی راپەرینە کوردییەکەش لە لایەن ئێرانییەکانەوە ، لەو راپۆرتەکەی پلونکێت دا بە روونی دەردەکەوێت کە لەسەر چاوپێکەوتنی لەگەڵ (ئێم.جی.گێرس)ی وەزیری دەرەوەی رووسیی ئەنجامیداوە . پلونکێت پێشنیازی کرد کە لە سۆنگەی باشبوونی هەلومەرجەکەی کوردستان ، مۆڵدانی پتری دیکەی هێزەکانی رووسیی پێویست ناکات . لەوەلامدا ، " ئێم .دی گرێس گوتی ئەو دوو یەکەیە سەربازییەی رووسیا نیازی بوو بەرەو ئەخجەوان بیانجوڵێنێت لای رووسیا بایەخێکی زۆریان هەیە.[122]

## هۆکاری چاکسازییەکان لەهەڵوێستی تورکیا لەحاست شێخ

لەراستییدا جێگەی سەرسوڕمان و باوەڕنەکردن نیە کە گومان لە پشتگیرییەکی فەرمیی تورکیی بۆ جوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا بکرێت . هەرچەندە ئامانجەکانی شێخ و حکومەتی عوسمانیی بەتەواوی لەگەڵ یەکدا ناکۆکن ، بەڵام هەردوولا لە یەك خاڵدا کۆك بوون و یەکیاندەگرتەوە . هەردوولا دژی ئەنجامدانی ئەو چاکسازییانە بوون کە بڕگەی ٦١ی پەیماننامەی بەرلین و رێکەوتننامەی هاوپەیمانی بەرگریی رایانسپاردبوو ، ئەوەی

---

[119] Ibid.

[120] Ibid.,Passim

[121] Enclo. 4. No.76,Abbott to Tomson,Tabriz, in ibid.,70.

[122] No.71, Plunkett to Earl Granville,St.Petersburg .Dec. 14, 1880,in ibid.,58.

ئەمێستا لەبارەیەوە دەدوێین .

لەوانەیە لەبەرچاوگرتنێکی کەمی ئەو هاندەرانەی تورکیان ناچارکرد رووبەڕووی ئەو چاکسازییانە بێتەوە تێگەیشتنێکی روونترمان لەمەڕ هەڵوێستی تورک سەبارەت بە جوڵانەوەکەی شێخ دەخاتە بەردەست . تورکان کە لەڕادەبەدەر بێزیان لە هەر پرۆژەیەکی راسپاردەکراوی بیانیی و لەوانەش چاکسازیی دەکردەوە، ئەو بابەتەیان تەنیا وەك ئامرازێك بۆ مەبەستێك و سەرەتایەك بۆ دەستێوەردانێکی چالاکی بیانیی دیکە لەقەڵەم دەدا . دەستێوەردانە بیانییەکان بە شێوە هەمەجۆرەکانی هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە تورکیان لە زنجیرەیەك جەنگ و کێشەوە گلاندبوو کە ئەهامەتیی و وەیشوومەی گەورەی لێکەوتەوە و بەهۆیەوە بەشێکی مەزنی قەڵەمڕەوەکەیان لە بەلقان لەدەستدا . دوا کارەساتیشیان هێشتا لەبیرمابووە ، ئەویش جەنگەکەی ١٨٧٧-١٨٧٨ ە کە بە کۆنگرەکەی قوستەنتینییە کۆتاییهات .لەو کۆنگرەیەدا کە بیرۆکەی چاکسازییەکان گەڵاڵە بوو لێهاتوویی دپلۆماسییو وریایی ژێنراڵ (ئیگناتیێف) ی باڵیۆزی رووسیی دەرکەوت کاتێك توانی بە پشتیوانی تەواویی زلهێزەکان تورکیا بخاتە نێوان دوو بەرداشەوە ،ئەویش ئەوەتا یان مل بۆ خواستی چاکسازییەکی بەرفراوان کەچ دەکات یان لەجەنگێکدا لەگەڵ رووسیا بێ هاوکاریی هیچ لایەنێك رووبەڕوو دەبێتە .[١٢٣]

بەرهەڵستی توندی تورکیا بۆ ئەو چاکسازییانە تەنیا زادەی ئەو خواستە نەبوو بۆ ئەوەی هەرێمەکانی رۆژهەڵات بەهەمان دەردی ناوچەی بەلقان نەچن . لەراستییدا هەڵوێستی تورکیا لەمەڕ ئەو دوو ناوچەیە تارادەیەکی زۆر جیاوازە . واپێدەچێت تورکیا دەستی لە هەرێمەکانی بەلقان بەردابێت کاتێك لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە پرۆسەی جیابوونەوەی ئەوهەرێمانە بە خێرایی لەئەنجامی پەرەگرتنی بانگەشە نەتەوایەتییەکانەوە و بە پشتبەستن بە هێزی مەزنی سەربازیی رووسیا دەستپێکرد . زۆرینەی گەلانی جەنگاوەری کریستیانیی بەلقان بە رووسیاوە بەسترابوونەوە ئەویش یان لە رێگەی ئاینزای ئۆرسۆدۆکسەوە وەك یۆنان و رۆمانیا ، یاخود لە رێگەی ئۆرۆدۆکسییێتیی و هاوڕەگەزیی سلاڤیی وەك لای مۆنتینگرۆ ، بولگاریا و سربیا . ئەو

---

[123] Elliot,Sir Henry, and Gertrude Elliot. Some Revolution and Other Diplomatic,274-75.

گەلانەی هاوشێوەیان لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا نەبوو . لەوێ ڕەگەزە ناموسوڵمانەکان تەنیا ئەرمەن و گورجییەکان بوون ، ئەوانەی نە سلاڤیی و نە جەنگاوەریش بوون . ئەوانەی هەرێمەکانیان لە سۆنگەی باڵادەستیی داب‌ونەریتی ئیسلامیی لەوناوچانەدا لەلایەن عوسمانییەکانەوە بە بەشێك لە وڵاتی موسوڵمانان لەقەڵەم دەدرا و خۆشیان بە پارێزەر و دەمڕاستیان دادەنا . خاڵێکی فرە بایەخداری دیکە ئەوەیە کە تورکیا ڕووی لە دەوڵەتی ئێرانە ، ئەو دەوڵەتەی لە تورکیا لاوازتر و بێتواناترە ، ئەوەش بێگومان هیوای تورکیای بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو خاکەی لە ئەورووپا لەدەستیداوە، دەژیاندەوە . عوسمانییەکان کە لەلایەن زلهێزەکانی ئەورووپاوە زۆرجار تێکشکێنراون و ناچار بە پاشەکشێ کراون لەوەدەچێت هەرگیز لەوە بێئومێد نەبووبن کە ئازەربایجانی تورك زمان و کوردستانی سوننەنشین لە چنگی ئێران دەربهێنن .[١٢٤]

لەتێکرای زلهێزەکان ، تەنیا بەریتانیا بایەخێکی زۆری بە جێبەجێکردنی برگەی ٦١ی پەیماننامەی بەرلین دەدا . نە ئەڵمانیا و نە نەمسا، هیچیان بایەخێکی ئەوتۆیان بە چارەنووسی ڕەعییەتە ئاسیاییەکانی سوڵتان نەداوە ، لەکاتێکدا فەرەنسا و ئیتالیا بابەتەکەیان بەشێوەیەك دەبینی کە تەنیا قازانجی بەریتانیای تێدایە . ڕووسیا ناحەزانە ڕوانیە پڕۆژەی چاکسازیی نەك لەبەر ئەوەی کە حەزی نەدەکرد تورکیا بژێتەوە بەڵکو لەوەدەترسا جێبەجێکردنی ئەو پرۆسەیە کە لە لایەن بەریتانییەکانەوە پشتگیریی دەکرا ببێتە هۆی پتەوبوونی مەترسیداری نفوزی ئەوان لەو ناوچە هەستیارەی لەگەڵ هەرێمەکانی قەفقاسییدا هاوسنووربوون . بەپێچەوانەوە ، بەریتانییەکان بەقووڵی

---

[124] سوپای عوسمانیی بەدرێژایی شەڕەکانی لەماوەی چوار سەدە لەگەڵ سەفەوییەکاندا دەستی بەسەر بەشی زۆری ئەم هەرێمانەدا گرتبوو . هەروەها دواتر لە شەڕەکانیدا لەگەڵ نادرشادا بەڵام عوسمانییەکان هەمیشە دەستیان لێ هەڵدەگرت . ڕێکەوتننامەی (ئەرزڕۆم) کە لە ساڵی ١٨٤٧بەسترابوو و سنووری نێوان هەردوولای دیاریی کردبوو . هیچ لایەکیان ڕێزی لێ نەدەگرت و بە درێژایی سەدەی نۆزدە بابەتێك شایەنی دەستکاریی و بێنەوبەرە بوو لەساڵی ١٩٠٥دا تورکان شکستی ڕووسیان بەرامبەر بە یابان بە دەرفەت زانی بەشێکیان لەو ناوچانە گرت تا ناچار بوون لە جەنگی بەلقاندا لە ١٩١٢و سنووردارکردنی هێزەکانی سەربازیی و ڕامیاریی جێبهێڵن هەروەها لە ساڵی ١٩١٧دا جارێکی دی سوپای عوسمانیی لە ناکامی هەڵوەشاندنی سوپای ڕووسیی پاش شۆڕشەکە هاتنەوە ناوچەکە Kazemzadeh, Firuz. The Struggle for Transcaucasia.

بەرژەوەندییان لەجێبەجێکردنی چاکسازییەکاندا هەبوو و وەك تاکە شێوازێکیان دەبینی بۆ رزگارکردنی ئیمپراتۆریی عوسمانیی و کردنی بە لەمپەرێك لەبەردەم کشانی بەرەوژێری رووسیا . دارمانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی هەرەشەی لەسەر تەنگەکان ، سوێس ، عەدەن ، ئۆقیانووسی هیندیی ، هەروەها کەنداوی فارسیی و ئەو رێگانەی کە بەرەو ئیمپراتۆری هیند دەرۆیشتن و بازرگانیی جیهانیی پێدا تێدەپەڕی ، پێکدەهێنا . واپێدەچوو کە لەنێو هەموو واژۆکەرانی پەیماننامەی بەرلیندا تەنیا ئینگلتەرا بە پەرۆشێکی مەزنەوە هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو بڕگەیەدا دەدا و بە بابەتێکی تەواو بایەخداری دەزانی .

لەراستییدا ، ئینگلتەرا بایەخێکی زۆری بە بابەتی چاکسازییەکان دەدا بەوەی ئەوەندە وریا بوو کە لەو رێکەوتنەی هاوپەیمانی بەرگریی کە بەنهێنیی لە ٤ی ژوونی ١٨٧٨دا [١٢٥] لەگەڵ تورکیا مانگێك پێش واژۆکردنی پەیماننامەکەی بەرلین بەسترا ، بڕگەیەکی لەبارەیەوە تێخزاندبوو . ئەم رێکەوتنە کلیلێکی بایەخدارمان سەبارەت بە هەڵوێستی تورکیا لەمەڕ چاکسازییەکان دەخاتەبەرچاو . سوڵتان ئامادەبوو هەنگاو بەرەو چاکسازییەکان بنێت و دەست لە دوورگەی قوبرسیش بۆ بەریتانییەکان هەڵگرێت بەمەرجێك بەریتانیا پەیمان بدات بە زەبری چەك رێگریی لە هەر هەوڵێکی رووسیی بۆ گێڕانەوەی هەرێمەکانی باتوم ، ئەردەهان و قارس بکات ، گەر رووسیا هەر هەوڵێك بۆ زەوتکردنی خاکی دیکەی قەڵەمڕەوی سوڵتان بدات .

یەك لە راستییە سەیرەکانی مێژوو ئەوەیە وێڕای ئەوەی بەریتانیا بە توندیی لە کۆنفرانسی بەرلیندا رووسیای ناچارکرد دەست لە ئەرزڕۆم ، بایەزید ، دۆڵی ئاڵەشیرد و هەروەها ناوچەکانی باشووری باتوم هەڵبگرێت ، بەڵام نەیتوانی وا لە رووسیا بکات

---

[125] بڕگەی یەکەمی پەیماننامەی بەرگریی دەڵێت :" ئەگەر رووسیا (باتوم و قارس و ئەردەهان) یان هەر یەکێکیان لەدەست خۆیدا بهێڵێتەوە ، یاخود لە ئایندەدا لەلایەن ئەو دەوڵەتەوە هەر هەوڵێك بۆ دەست بەسەرداگرتنی هەربەشێکی دیکەی ئاسیا کە لە قەڵەمڕەوی سوڵتانی خاوەن شکۆدابێت و بەو شێوەیەی کە لە پەیماننامەی ئاشتییدا دیارییکراوە و چەسپاوە ، ئەوا ئینگلتەرا پەیمان دەدات بچێتە پاڵ سوڵتانی شکۆدار بۆئەوەی بەهێزی چەك بەرگریی لێبکات بەرامبەر بەوە ئیمپراتۆری سوڵتانی شکۆمەند پەیمان بە ئینگلتەرا دەدات کە ئەو چاکسازییانە ئەنجام بدات کە دواتر هەردوولا لەسەری رێدەکەون هەروەها ئیمپراتۆری سوڵتانی شکۆمەند ئەوە پەسەند دەکات کە ئینگلتەرا دوورگەی قوبرس بگرێت و بەڕێوەی بەرێت ."بڕوانە : Hertslet,4:2722-23.

دەست لە باتوم ، ئەردەهان و قارس هەڵبگرێت . پێویست ناکات بگوترێت ، کە سوڵتان چەندە بەم کارە بێهیوا بوو . لەراستییدا شکستی بەریتانیا لە ناچارکردنی رووسیا بۆ دەستهەڵگرتن لەو سێ ناوچە ناوبراوە ، بڕوا و متمانەی سوڵتانی بە توانای مەزنی بەریتانیا لەقاند یاخود بەوخواستەی کە بەریتانییەکان خستبوویانە ئەستۆی خۆیان .

لەوانەیە بەهۆی ئەوەی کە بەریتانیا بەڵێنەکەی خۆی تایبەت بە رێکەوتنەکە جێبەجێنەکرد سوڵتانیش هەستی بەوە کردبێت کە ئەویش هیچ بەشێکی تایبەت بە بەریتانیای لەو رێکەوتنەدا لە ئەستۆ نەماوە . دەزانین کە سێر هێنری ئۆستن لایاردی باڵیۆزی بەریتانی لە دەروازەی باڵا فەرمانی لە وەزارەتەکەی دەرەوەی وڵاتەکەیەوە پێدرابوو کە توانای زۆری خۆی بەکاربهێنێت بۆئەوەی وا لە سوڵتان بکات گوێ بە لەدەستچوونی باتوم نەدات .[126] هەروەها دەزانین کە سوڵتان لەناکاو ئەو فەرمانەی راگرت کە رێگە بە داگیرکردنی قوبرس دەدات لەلایەن بەریتانییەکانەوە . سوڵتان پێش ئەوەی هەر رازیبوونێکی خۆی پێشان بدات ، هەوڵی دا لەکاتی مۆرکردنی رێکەوتننامەکەدا مەرجێکی تێخزێنێت کە بریتیبوو لەوەی سەبارەت بە ئەنجامدانی هەر چاکسازییەک لە قەڵەمڕەوی ئاسیایی ئیمپراتۆرییەکەیدا مافی سوڵتانی خۆی پارێزراوبێت .[127] لایارد تا ماوەیەکی زۆر تێنەپەڕی نەیتوانی ئەو بەڵگەنامانەی رێکەوتننامەکە بێ زێدەکردنی ئەو مەرجە زێدەکراوە بە مۆرکردن بگەیەنێت .

کەمبوونەوەی توانا و دەسەڵاتی بەریتانیا لەتورکیا بەدەوام بوو ، لەکۆتایی ١٨٧٩دا هێشتا ساڵێکی بەسەر جەنگەکەی رووسیی-تورکیی دا تێنەپەڕاندبوو ، سوڵتان وازی لە هەموو شێوەکانی راوێژکردن بە بەریتانییەکان هێنا .[128] ئەو گۆڕانەش هۆکاری خۆی هەبوو . جەنگی رووسی -تورکیی هەستێکی قووڵی رقوکینەی دژ بە بیانییەکان و زلهێزەکان بەتایبەتیی بەریتانیا هێنایەئارا . چونکە ئەو دەوڵەتە سیاسەتی خۆی لەماوەی ئەو دووساڵەی دواییدا بە شێوەیەک دەبردەپێش کە جگە لە گومان و بێهیوایی تورک نەبێت رووبەکی دیکەی نەبوو . دەروازەی باڵا بەهۆی نادیاری مەبەست و پاڵنەری

---

[126] دەسەڵات و توانای لایارد ئەوەندە فرە بوو کە (رووین)ی باڵیۆزی نەمسانی لەکاتی خۆیدا بە جێگری سوڵتان ناوی بردووە . Medlicott, William Newton, The Congress of Berlin and After, 114.

[127] Ibid.

[128] Ibid.,295.

بەریتانیاوە متمانەی بەو دەوڵەتە نەمابوو . بەریتانیا نەیتوانی بەرگریی لە بەرژەوەندییەکانی تورك بکات وەك ئەوەی کە لە پەیمانی بەرگریبدا بەڵێنی پێدابوو ، ئەوەش بووەهۆی ورووژاندنی هێندێك بازنەی تورکیی دەسەڵاتدار ، ئەوانەی بەریتانیایان بەوە تاوانبار دەکرد کە تەنیا بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی قوبرس ئەو پەیمانەی مۆر کردووە .

سەرباری ئەوەش ، فرەپەرۆشی بەریتانیا بۆ جەختکردنەوە لەسەر یەکپارچەیی و بەردەوامیی ئیمپراتۆری عوسمانیی و هەوڵی بەردەوامی بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بووەهۆی ورووژاندنی گومان و بێزاریی سوڵتان و پیاوەکانی . ئەم گومانە بێ بنەما نەبوو ، لەکاتێکدا بەریتانییەکان بۆ یەکپارچەیی دەوڵەتی عوسمانیی تێدەکۆشان ، کەچی لە هەوڵی ئەوەدابوون ئەو دەوڵەتە بخەنە سایەی پاراستنی خۆیانەوە .[129] (لۆرد سالسبوری) کە پلانێکی بەرفراوانی لەپێناو ئاسایش و بوژانەوەی تورکیا لەبەردەستدابوو ،[130] ویستی رەزامەندیی سوڵتان بەدەستبێنێت " لەکاتێکدا ترس لە رووسیا هێشتا بەسەریدا (لای سوڵتان)زاڵ بوو."[131] ئەو دەیزانی کە کات فاکتەرێکی گرنگە لەو پرسەدا، لەو بڕوایەوە کە سوڵتان بۆخۆی کەسێکی بەگومانە و تارادەیەکی زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی دەوروبەرە گەندەڵ و بەرتیلخۆرەکەیەوە ، هەربۆیە دەگونجێت ئەوکاتەی توانای هەبێت ئامادەنەبێت رەزامەندی خۆی دەربڕێت . لە نامەیەکدا کە سالسبوری بۆ سێر هێنری لایاردی نووسیوە :" هەر توانایەکمان بۆ پێداگریی لەسەری ،

---

[129] See McCoan ,James Carlile,Our New Protectorate.

[130] پلانەکەی سالسبوری لەسەر سێ بنەما پێکهاتبوو : بەرەیەکی سەربازیی پتەو لە ئەوروپا ، مسۆگەریی سەربازیی ئینگلیزیی-نەمسایی بۆ قەڵەمڕەوی سوڵتان ئەنجامدانی چاکسازیی نێوخۆیی بە ئامانجی پترکردنی چالاکیی و بوژانەوەی ئیمپراتۆرییەکە . لەسۆنگەی ئەوەشەوە فەرمان بەلایارد درا هەوڵی ئەوە بدات پەیمانی فەرمیی لە سوڵتانەوە بەدەستبێنێت سەبارەت بە أ- دروستکردنی هێزێکی پۆلیس لە ولایەتە ئاسیاییەکاندا ،ب- دامەزراندنی دادگایەکی ناوەندیی لە ژمارەیەك شارە بایەخدارە ئاسیاییەکان کە دەسەڵاتی بۆ دادگای خوارووتر بکشێت بە شێوەیەك کە لە هەریەکێکیاندا لانی کەم پیاوێکی یاسایی ئەوروپیی هەبێت ، لە رووی زانستییشەوە بەتوانا و دروستکار بێت ، لە هەر ج- ئیالەتێك باجگرەکان دابمەزرێنێت و ئەرکی باجکۆکردنەوەیان بخاتە ئەستۆ ، هەروەها باجی دەیەك لەسەر بەروبوومی کشتوکاڵیی لابرێت .بڕوانە : Medlicott.293

[131] Ibid.,292.

به تێپەڕینی هەر مانگێك كەم دەكاتەوە ."[132]

بەریتانییەكان دركیان بەوەكرد كە دەسەڵاتی ڕەهای سوڵتان كە لەلایەن تاقمێكی دەوروبەرییەوە یاریی پێدەكرێت دەبێتە ڕێگری هەر هەوڵێك بۆ چاكسازیی ، لە هەوڵێكیشیاندا بۆ لابردنی ئەو لەمپەرە گومانی سوڵتان و ئەو تاقمەیان لەخۆیان ورووژاند . لە وتارێكدا كە لەرۆژنامەی (Phare du Bosphor) بڵاوكرایەوە حكومەتی بەریتانیی بە هەوڵی لێسەندنەوەی مافی سەروەریی سوڵتان بەسەر ئاسیای بچووكدا تاوانباركرابوو . شایەنی سەرنجە هەر لەو كاتەدا ئەو گوتارە لە چەندین رۆژنامەی توركییدا بڵاوكرایەوە .[133]

ترس و دڵەڕاوكێی سوڵتان لەمەڕ چارەنووسی هەرێمەكانی رۆژهەڵات بێبنەما نەبوو . ئەو پەرەسەندنانەی بەوتواییە كە لە بۆسنیا ، رۆمێللی و هەروەها میسردا ڕوویاندابوو ، كە زلهێزەكان تێیدا كارگێڕیان گرتبووە ئەستۆ و بەناو دانیان بە سەروەریی سوڵتاندا نابوو ، ئەوەش بێتوانایی ئەوی لە چەسپاندنی دەسەڵاتێكی كاریگەر بەسەر ئەو ناوچانەدا پێشاندەدا .[134] هۆكارێكی دیكەی پەرەگرتنی بێزاریی توركان دژی ئینگلتەرا ، ئەوە بوو كە ئەوەی دوایی ئامادە نەبوو هاوكاریی دارایی بداتە توركیا . توركیا لەلایەكەوە وادەهاتە پێش چاو كە خوازیارێت بە هەر نرخێك بێت ئەو قەرزەی دەستكەوێت . بەڵام داوای چەندبارەی سوڵتان بۆ قەرز لەلایەن بەریتانیاوە وەڵام نەدرایەوە ، ئەو راستییەی بە توندیی حكومەتی عوسمانیی تووڕە كرد .دەگوترێت سوڵتان بۆخۆی گوتوویەتی:" با حكومەتی خاوەنشكۆی بەریتانیی یارمەتییمان بدات و پارەمان بۆ پەیدا بكات ، ئەوسا من بەڵێن دەدەم كە ئەو چاكسازییانەی داواكراون و هی دیكەش جێبەجێ دەكرێت ."[135] لەوەش تێپەڕاند و گوتی كە لە بارێكی وادا كەسایەتییەكی ئینگلیز دەكات بە وەزیری دارایی .[136] ئەم ڕەتكردنەوە بەردەوامە كە سوڵتانی داخدار كرد، ئەوەش وا دەكات تێگەیشتنی ئاكاری دەروازەی باڵا كارێكی ئەستەم نەبێت .

---

[132] Ibid.

[133] Ibid.,293.

[134] Ibid.,295.

[135] Ibid.,302.

[136] Ibid.,306.

پێدەچێت رەتکردنەوەی بەردەوامی بەریتانیا بۆ قەرزدان وێڕای چەندبارەکردنەوەی خواستی پێکهاتن لەلایەن تورکیاوە هۆکاری ئەو حاڵەتی تەنگەژە و قەیرانەبێت کە بەسەر باری دارایی تورکیادا هاتبوو و هەروەها ترسی بەریتانیا لە داڕمانی یەکپارچەیی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بوو ، وێڕای بێمتمانەیی بەریتانیا بە راستگۆیی تورکیا سەبارەت بە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی .

بەم چەشنە ، تورکیا کە هەر لەسەرەتاوە دژی چاکسازییەکانی پەیماننامەکەی بەرلین بوو ، بە تێکچوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئینگلتەرادا پتر ناحەزیی خۆی لەهەمبەر پێشاندا.[١٢٧] ناحەزیی پەرسەندووی حکومەتی عوسمانیی سەبارەت بە چاکسازییەکان لەو هەڵوێستەی نەرمەی تورک سەبارەت بە جوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا بەرپرسیارە . چالاکییەکانی شێخ هەروەك کریمیان ئاماژەی پێداوە ، راژەی بە پاشەکشەی چاکسازییەکان کرد و سەرنجی گشتی لە کێشەی ئەرمەنەوە بەرەو کێشەی کورد راکێشا . لەوەش زیاتر ، لە دیدی تورکانەوە ، داگیرکارییەکەی شێخ بۆ ئێران نەك هەر تەنیا ئەو چالاکییە سەرکەوتووە دژە چاکسازییانەی خۆی بوژاندەوە ، بەڵکو ئەگەری راکێشانی ناوچە کوردنشینەکانی ئێرانیشی بۆ ژێر سایەی خۆی برەوپێدا .

---

[117] Ibid.,291.

# بەشی پێنجەم : کاریگەریی شۆڕشی تورکە لاوەکان لەسەر نەتەوایەتیی کوردیی

## کۆمەڵەی (ئیتحاد و تەرەقیی/یەکێتی و پێشکەوتن) و شۆڕشی تورکە لاوەکان

هیچ گفتوگۆیەکی لەبار سەبارەت بە مێژووی سیاسیی کورد یاخود هەر بابەتێکی مێژووی سیاسیی رەگەزەکانی دیکەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی گونجاو نیە . گەر بێتو ئاماژەیەك بە شۆڕشی تورکە لاوەکانی ساڵی ١٩٠٨ نەکرێت . ئەو شۆڕشەی کاریگەریی قووڵی کردە سەر چارەنووسی ئەو گەل و وڵاتانەی ئیمپراتۆریی عوسمانییان پێکدەهێنا .

شۆڕشەکە ، بەرهەمی خەباتی چەندین ساڵ چالاکیی نهێنیی بوو کە لەلایەن کۆمیتەی یەکێتی و پێشکەوتنەوە (ك.ی.پ) لەناوەوە و دەرەوەی تورکیادا بەڕێوە دەچوو .[1] لایەنگرانی (ك.ی.پ) پیاوانێك بوون لە رووی رەگەزیی نەتەوەییەوە جیاواز و زۆر جاریش خولیا و ئومێدێکی دژ بەیەکیان هەبوو .[2] ئەوانەی وێڕای جیاوازییان ، بەڵام لە بواری سەرسامییان بە دەستووری رۆژئاوایی و هەروەها ناحەزیی توندیان لە ئاست سوڵتان–خەلیفە عەبدولحەمیدی دووەمدا ، یەکگرتوو بوون . رابەرانی ئەم

---

[1] (ك.ی پ) لە ساڵی ١٨٨٩دا لە ئەستەمبوول لەلایەن ئیبراهیم تەمۆ ، عەبدوڵلا جەودەت ، ئیسحاق سکوتی هەروەها محەمەد رەشید دامەزرێنرا . یەکەمین گێڕانەوەی بایەخدار سەبارەت بە مێژووی بەرایی تورکەلاوەکان لەلایەن (پاول فیسچ)ەوە پێشکەش کراوە ، ئەوەی وادەردەکەوێت کە متمانەی تەواویانی بەدەستهێناوە . شایەنی سەرنجە ، پاول لە کاتی وتووێژکردن لەمەڕ دامەزراندنی (ك ی پ) ، ئاماژەی بە تەمۆ و جەودەت داوە ، کە ئەودەمە لە ئەورووپا بوون. هەروەها ئاماژەشی بە سکوتی داوە کە ئەوکات مردبوو ، بەڵام ناوی رەشیدی نەهێناوە کە ئەودەمە لە نێوخۆی تورکیا دەژیا

Yusuf Hikmet Bayur , Turk Inkilabi Tarihi, Turk Tarikh Kurumu Yayinlarindan, Istanbul, 1940 , 1:66; Fesch,Paul. Constantinople aux derniers jours d Abdul-Hamid , Paris , 1907, 369.

[2] ئەو ناکۆکییانەی لە ساڵی ١٩٠٢ کۆنگرەی تورکە لیبراڵەکانی لە پاریس تێکدا چەند بیرۆکەیەکی سەبارەت بەو ناکۆکییانەی کە لەنێوان رەگەزە جیاوازەکاندا هەبوون خستە بەردەست Ramsaur,66ff

ڕێکخراوە کە بەهۆی ستەم و ڕاوەدونانی حەمیدییەوە هەڵاتبوونە ئەورووپا ، لەوێ کەوتبوونە بەر کاریگەریی هەزری رامیاریی و کۆمەڵایەتیی رۆژئاوایی . بەتایبەت کاریگەریی هەزری دادپەروەریی و سەربەستیی شۆڕشی فەرەنسا ، بنەماکانی نەتەوایەتیی و ریالیزمیان بەسەرەوە بوو .[٣] (ك.ی.پ) ، وەك ڕێکخراوێکی پیلانگێڕ ، کاریگەریی چەند دەستە و تاقمێکی نهێنی ئەورووپیی بەسەرەوە بوو ، لەوانە : کاربۆنارییەکان ، ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی نێونەتەوەیی مەکەدۆنیی ، هەروەها فەرەماسۆنەکان .[٤]

کوردان ، یان کەسانێك کە لە بنەچەوە کوردبوون هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەکەوە رۆڵێکی بەرچاویان تێیدا هەبوو . دوو کەس لە چوار ئەندامە دامەزرێنەرەکەی (ك.ی.پ) کە ئیسحاق سکوتی[٥] و عەبدوڵلا جەودەتن[٦] ، کورد بوون ، لێرە بەدواوە ، ژمارەیەکی دیکەی ناسراوانی کورد بە جوڵانەوەکەوە پەیوەست بوون و بە گەرمیی تێکەڵاوی چالاکییەکان بوون . لەساڵی ١٨٩٥ دا ، ژمارەیەك لە تورکە لاوەکان گیران و دوورخرانەوە . یەك لەوانە سکوتی بوو ، کە رەوانەی رۆدس کرا . هەروەها جەودەتیش بۆ تەرابلوس دوورخرایەوە .[٧] کوردێکی دیکە ، کە شێخ عەبدولقادری نەهریی کوڕی شێخ عوبەیدوڵلا بوو ، ئامرازی پیلانێکی شکستخواردووی (ك.ی.پ) بوو کە لە ساڵی ١٨٩٦ دا بۆ ڕووخاندنی تەختی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لەئارادا بوو

---

[٣] ئەم رەگەزانە لە بیرکردنەوەی تورکە لاوەکاندا لەلایەن (رامسۆر)ەوە وتووێژی لێکراوە

[٤] بۆ وتووێژ لەمەڕ کاریگەریی کاربوناری ، IMRO ،هەروەها فەرماسۆنەکان بڕوانە هەمان سەرچاوە

[٥] ئیسحاق سکوتی(١٨٦٨-١٩٠٣) پزیشك و سەرکردەی رامیاریی بوو ، ئەو کاتێك خوێندکاری کۆلێجی پزیشکی سەربازیی بوو پەیوەندیی بە (ك.ی.پ)ەوە کرد .

Ibrahim Alaettin Govasa ,Turk Mashurlari Ansiklopedisi . Istanbul:Yedigun Nesriya,192.

[٦] عەبدوڵلا جەودەت ، پزیشك ، شاعیر ، نامەنووس و چالاکی رامیاریی . یەکێکە لە نووسەرە پرشنگدار و بەرهەمدارەکانی تورکیای هاوچەرخ ، لە ساڵی ١٨٩٦ لە عەرەبگیر لە بنەماڵەیەکی کورد لەدایك بووە . بۆ کۆڵینەوەیەکی بەڵگەنامەیی دەوڵەمەند لەمەڕ جەودەت بڕوانە:

K . Sussheim, " Abd Allah Djewdet," Encyclopaedia of Islam,vol .9: Supplement,55-60.

[7] Ramsaur,26.

، ناوبراو بۆ مەککە دوورخرایەوە .[8]

هەمان کات ، چەندین کوردی دیکە سەبارەت بە بەشدارییکردنیان لە (ك.ی.پ) دا بەردەوام بوون ، عەبدولرەحمان بەدرخان و حیکمەت بابان کە ئەندامی دوو بنەماڵەی ناوداری کوردبوون ،[9] هەردووکیان لەو کۆنگرەیەدا بەشداربوون کە تورکە لاوە ئازادیخوازەکان لە ساڵی ١٩٠٢ دا لە پاریس بەستیان . پاش شۆڕش ، ژمارەیەك لە ئەندامانی کوردی (ك.ی.پ) توانیان پۆستی زۆر گرنگ بەدەستبێنن.لەنێو ئەوانەدا ئیسماعیل حەقی بابان[10] هەبوو کە کرایە وەزیری فێرکردنی گشتیی ، هەروەها سولەیمان نەزیف[11] کە بووە والی بەغدا . ئەوەی پێشتریان بەتایبەت ، هەواڵی ئەوەی لێدەگێڕنەوە کە لەنێو ئەنجومەنی تورکەلاوەکاندا باڵادەستیی و کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبووە .

ئەوەی شۆڕشی تورکەلاوەکانی خێراترکرد ، ڕێکەوتننامەی ئەنگلۆ-رووسیی بوو کە لە ژوونی ١٩٠٨ و لە شاری ریڤاڵ(تالین) ی بەلْتیکی و لە نێوان شا ئێدواردی حەوتەم و نیکۆلای دووەمی سزاری رووسیادا بەسترا . هەردوو فەرمانڕەوا ، وەك دەگوترێت ، گەیشتبوونە تێگەیشتنێکی هەمەلایەنە لەمەڕ تورکیا و هەروەها بەرنامەی بەرفراوانیان لەمەڕ بارگرانیی چاکسازیی و ڕێڕای پارچەکردن و لێکهەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی هەبوو .[12] ئەم هەواڵە ئەندامانی (ك.ی.پ)ی تووشی

---

[8] Fesch ,334;also Ramsaur,33.

بەگوێرەی رامسەر شێخ عەبدولقادر لەگەڵ بیست ئەندامی بنەماڵەکەیدا دوور خرابوونەوە .

[9] بۆ بینینی لیست ناوی ئەوانەی لە کۆنگرەی تورکە لاوەکاندا ئامادەبوون : Fesch ,365fn.1

[10] ئیسماعیل حەقی بابان ئەندامی مەجلیسی مەبعوسانی بەغدا پەیوەندیی نزیکی بە ئەنینی زمانحاڵی (ك.ی.پ)وە هەبوو . Mandelstam ,Andre. Les sort de l Empire Ottoman, 1917,24,37.

[11] سلێمان نەزیف ، سیاسەتکار ، کارگێڕ و رۆژنامەنووسێکی ناسراو بوو هەرچەندە خوێنی کورد لە شادەمارەکانیدا دەجوڵا بەڵام ئامرازێکی دڵگەرمی تورکاندن بوو ، ئەو وەك والی موسڵ ڕاژەی کرد و پاشتریش بووە والی بەغداد دملوجی ، امارة بهدینان ، ٩٨ ، .. جیاوك ، ماساة بارزان المظلومة ، ٥٦ .

Longrigg, Iraq (1900-1950),50;Mandelstam,277.

[12] Marriott . J.A.R, " The Eastern Question ," 431; Miller , William . The Ottoman Empire and its Successors, 1934, 474.

سەرسوڕمان کرد ، هەربۆیە بڕیارياندا خێرا بکەونەخۆ . لە هەوڵێکی بێهوودە بۆ ڕێگرتن لە جێبەجێکردنی ئەم ڕێکەوتننامەیە ، لە ڕێگای کودەتایەکی لەناکاوی ئەفسەرانی سەربازیی تورکەلاوەکان سوڵتان ناچارکرا دەستووری ساڵی ١٨٧٦ وەك هێمایەك بۆ دەستکردن بە چاکسازییەکی بەرفراوان و هەمەلایەنە بگەڕێنێتەوە .ئەوان لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا دەیانویست ئارەزوو و توانای تورك سەبارەت بە ڕێکخستنەوەی نێوماڵی خۆی لە ڕێگای دەستپێکردنی چاکسازییەکی خۆویستەوە لە پێش چاوی جیهان دابنێن و دەستێوەردانی دەرەکیی وەك کارێکی ناپێویست پێشانبدەن .[13]

لە سەراسەری ئیمپراتۆرییەکەدا بە شادمانیی و گەشبینییەوە پێشوازیی لە شۆڕشەکە کرا ، لەسایەی (ك.ی.پ) دا ، تورك ، ئەلبانیی ، عەرەب ، ئەرمەنیی ، هەروەها کورد ، پەیمانیان بە خۆدا ناکۆکییەکانی پێشوویان لەبیربکەن و بۆ چاکەی گشتیی و سەرفرازیی نیشتمانەکەیان کە دەوڵەتی عوسمانییە تێبکۆشن . لە کۆتاییدا وادەهاتە پێش چاو کە تورکیا لەسەرەلێواری قۆناغێکی نوێی برایەتیی و هاوبەستەگییدایە .بەلام ئەم خەونە نەهاتەدی ، هەر زوو پاش ئەوەی ئەمومژی بەرایی شۆڕشەکە ڕەوییەوە ، کە هێزەکانی دژ بە تورکەلاوەکان ، چ لە نێوخۆی وڵات و چ لە دەرەوە لەکاردابوون . لە ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٨ دا ، بە هاندانی رووسەکان ، بولگاریا سەربەخۆی خۆی ڕاگەیاند ، دوو ڕۆژ پاشتر ، ئیمپراتۆری نەمسا–مەجەڕ بە فەرمیی بۆسنە و هەرسکی خستە سەرخۆی .[14] هەڵوێستی ئینگلتەرا و ئەڵمانیا فرە روون نەبوو ، بەلام ئینگلتەرا هاوپەیمانی رووسیا و ئەڵمانیاش هاوپەیمانی نەمسا بوو .

لەنێوخۆی وڵاتیشدا ، لەگەڵ خورتبوونی گیانی بەرهەڵستکاریی ، ناڕەزایەتیی و زرموهوڕ باڵی شوومی بەسەر ڕووداوەکاندا کێشا . دەستەی کۆنەخوازان ، کە زۆربەیان لە ڕەگەزە سەرسەختەکانی وەفاداری سوڵتان پێکدەهاتن ، کەوتبوونە خۆئامادەکردن و بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەلات چاوەڕێی دەرفەتی گونجاو بوون. ئازادیخوازان سەبارەت بە ڕژێمی تورکەلاوەکان بێهیوا بوون و بە بێزارییەوە لە ناکاریی خۆسەپێنەرانەی نوێیان دەڕوانی .ڕەگەزە نەتەوایەتییە جۆراوجۆرەکان بەگەرمیی داوای

[13] Ibid., 62-63; Marriott . J.A.R, The Eastern Question.431;Danismendm355-65.

[14] بۆ زیاتر لەمەڕ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لەلایەن بولگاریاوە لە ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٠٨ و لکاندنی بۆسنە و هێرسك بە نەمسا–مەجەڕەوە بڕوانە: .Miller,478

ئازادیی و سەربەخۆییەکی نێوخۆیی زێدەتریان دەکرد .

توندوتیـژبوونی چـالاکییە نەتەوایەتییـەکان لـەماوەی ئـەو مانگـە پڕکێشانەی ڕاسـتەوخۆ پـاش شۆڕشـەکە هـاتن ، کێـشە و ڕووبەڕوونەوەیـەکی مەترسـیداری خـستەبەردەم دەسـەڵاتدارانی (ک.ی.پ) و هەڕەشـەیەکی مەزنیـشی بـۆ یـەکگرتوویی ئیمپراتۆرییەکـە لێکەوتـەوە . ئـەو گیانـە جیاخوازییـە ڕیـشەی لـە زۆربـەی جوڵانـەوە نەتەوەییەکاندا هەبوو ، سەرچاوەی دڵەڕاوکێیەکی مەزنی تورکەلاوەکان بوو .ئەوان لەوە دەترسـان کـە ئـەم جوڵانەوانـە ، ئەگـەر ڕێگـەی لێنـەگیرێت ، زوو یـا درەنـگ دەبێتـەهۆی ئـەوەی داوای سـەربەخۆیی خـۆجێش بکـەن ، ئـەوەش دەسـتێوەردانی بیـانیی و لەدەستچوونی ئەو هەرێمانـەی بە شێوەیەکی ئاسایی بەدوادادێت ، جا چ بە شێوەی جیابوونـەوەبێت یـاخود لـە ڕێگـەی بەسـتنەوە و گرێـدانیان بێـت بـەخاکی دەوڵـەتانی دەوروبەرەوە . ئەزموونی تاڵی ڕابردوو نموونەیەکی ئاشکرابوو ، لەدەستچوونی بولگاریا و هەرسك زۆری بەسەردا تێنەپەڕیبوو لەبیربچێتەوە .

دژەشۆڕشـەکەی ئـەپرێلی ۱۹۰۹ شتەکانی هێنایە پێشەوە ، لایەنگرانی سـوڵتان کە خوازیاری قۆزتنەوەی دەرفەتێك بوون تێیدا دەسەڵات بگرنەوەدەست ، لـە ئەستەمبوڵ ڕاپـەڕین و توانیـان ئەنـدامێکی زۆری (ک.ی.پ) لەشـارەکەدا لەناوبـەرن .کاتێـك سـوڵتان نەیتوانی تاوانبارن سزابدات ، یەکەیـەکی سوپای تورك کـە لـە مەکـەدۆنیا جێگیربـوو ، بەسـەرکردایەتیی مـەحموود شـەوکەت پاشا بـەرەو ئەسـتەمبوڵ کشا و یاخیبوونەکـەی تێکشکاند ، هەروەها سوڵتانی لەسەرتەخت هێنایەخوار .[١٥]

دوای خامۆشکردنی بزووتنەوە دژەشۆڕشەکە ، تورکەلاوەکان بڕیاریاندا تێکڕای بەرهەڵـستکاران سـەرکوتبکەن . لێرەبـەدوا ، هـەموو ئەوانـەی لەگەڵیانـدا نـاکۆکبوون بێـدەنگکران یـا لـەنێوبران . کۆنـەخوازەکان ، لیبراڵـەکان ، هـەروەها بـە تایبـەتیش نەتەوەخوازەکان ، هەموویان هەستیان بە دەستی قورسی (ک.ی.پ) کرد . تورکـەلاوەکان شانبەشانی تێکشکاندنی ڕەگەزە بەرهەڵستکارەکان ، بەرنامەکەی خۆیان کە بریتیبوو لـە بـەزۆر تورکانـدن و هـەروەها سیـستەمێکی کـارگێڕیی ناوەندگـەرایی تونـد و کـارا

---

[١٥] Ibid., 480-81.

دەستپێکرد .

بەوەش مانگی هەنگوینی کورتخایەنی تورکەلاوەکان لەگەڵ نەتەوەخوازە ناتورکەکانی دەوڵەتی عوسمانییدا کۆتاییهات . هەموو ئەو یانە و ڕێکخراوانەی بەو دواییە دامەزرابوون ،داخران . ڕۆژنامەکان قەدەغەکران ، هەروەها چالاکییە نەتەوایەتییەکان بەگشتیی لەسایەی سزای توندوتیژەوە ڕێگەیان لێگیرا . ئەم کار و هەنگاوە سەرکوتکەرانەیە تەنیا توانی هێمنییەکی رووکەش بێنێتەدی . جوڵانەوە نەتەوایەتییە جۆراوجۆرەکان کەوتنە تێکۆشانی ژێرزەمینیی ، بەڵام وادەرکەوت ، سەرکوتکردن تەنیا بووبێتە هۆی بەهێزکردنی خواست و ویستی ئەو جوڵانەوانە تا دژی هەژموونی تورك بەرگریی بکەن .

## دەرکەوتنی ڕێکخراوە رامیارییە کوردییەکان

شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ هەژانێکی رامیاریی قووڵی لەنێو گەلانی عوسمانییدا پێکهێنا . نەتەوایەتییە جۆربەجۆرەکان ، ئەوانەی دەمێك بوو دامرکابوونەوە یان بێدەنگبوون ، بەشێوەیەکی کتوپڕ ڕابوون و بوونە شتێکی بەرچاو . هەر لەو ساڵەدا بوو کە یەکەمین یانە یا ڕێکخراوی رامیاری کورد بە ناوی (کردستان تعالی و ترقی جمعیت/کۆمەڵەی گەشەو پێشکەوتنی کوردستان) کە بە کۆمەڵەی نیشتمانیی کوردیش دەناسرا ، لە ئەستەمبوڵ دامەزرێنرا ، دامەزرێنەرانی بریتیبوون لە : میر ئەمین عالی بەدرخان ، ژێنەراڵ محەمەد شەریف پاشا ، شێخ عەبدولقادری نەهریی (کوڕی شێخ عوبەدوڵلا) ، هەروەها داماد مارشاڵ زولکفل پاشا .[16]

کۆمەڵەی نیشتمانیی کورد ، هەروەك (نیکیتین) دەڵێت ، پشتگیریی لە

---

[16] Chirguh. La question kurde.19: Basile Nikitine ."Kurdes.";

شیرکوە . القضیة الکردیة . ٥١. زکي . خلاصة تاریخ الکرد ، ٢٤٩-٥٠ هەرچەندە هەموو سەرچاوە بیانییەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە کۆمەڵەی تەعالی کورد یەکەمین ڕێکخراوی رامیاریی کوردیی بێت . بەڵام محەمەد علی عونی لە پەراوێزی ژمارە ٢٤٠ی وەرگێڕانی کتێبەکەی محەمەد ئەمین زەکیدا بۆ عەرەبیی دەڵێت کە (جەمعیەتی عەزمی قەوی کورد) دەگونجێت یەکەم دانە بێت .

(ک.ی.پ) دەکرد لەبەرامبەر زامنکردنی کارکردنیدا .[17] تورکەلاوەکان لە سۆنگەی ئەوەوە کە بێ جیاوازیی کەوتبوونە سەرکوتکردنی جولانەوە نەتەوایەتییە جۆراوجۆرەکان ، پێشانیاندا کە پشتیان لە بەڵێنەکانی پێشوویان کردووە .ئەمین عالی بەدرخان و ژێنڕاڵ شەریف پاشا ، سزای مەرگیان بەسەردا درا و ناچاربوون لە ولات هەلبێن .[18] سورەییا بەگ بەدرخانی کوڕەگەورەی ئەمین عالی ، کە دوای شۆڕش گەڕابووەوە بۆ ئەستەمبوڵ و خەریکی سەرلەنوێ بلاوکردنەوەی رۆژنامە نەتەوایەتییەکەی کورد (کوردستان) بوو ، ناچار بوو بەهەمان شێوە لە دەرەوە ببێتە پەنابەر .[19]

هەمان کات ، رێکخراوێکی کەلتووریی بە ناوی (کرد نشر معارف جمعیت/کۆمەڵەی بلاوکردنەوەی زانیاریی کوردان) دامەزرابوو ، هەروەها خوێندنگایەکی سەرەتایی بۆ فێرکردنی منداڵانی کوردی دانیشتووی ئەستەمبوڵ ، لە گەڕەکی (چەنبەرلی تاش)ی شارەکە کرابووەوە . خوێندنگاکە لە ژێر سەرپەرشتیی عەبدولرەحمان بەدرخاندا بوو . تورکەلاوەکان ، وەختایەکی بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکەیان کە تورکاندنی کوردان بوو ،کەوتنەکار ، ئەم رێکخراوە و خوێندنگاکە و هەروەها کۆمەڵەی نیشتمانی کوردیان لە ساڵی ۱۹۰۹ دا داخست .[20]

لەساڵی ۱۹۱۰ دا ، خوێنکارە کوردەکانی ئەستەمبوڵ (هێڤیا کرد جمعیت/کۆمەڵەی هیوای کورد) یان پێکهێنا . رێکخەرەکانی بریتیبوون لە : خەیاڵیی لە مۆتکیی ، عومەر و قادر لە بنەماڵەی جەمیل پاشازادەی دیاربەکر ، فوئاد تەمۆ بەگ لە وان ، هەروەها زەکی بەگ لە دیاربەکر ، رێکخراوەکە تا هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی ، لە چالاکییەکانی خۆی بەردەوام بوو ، دوای ئەوە ناچار کرا دەست لە کار وتێکۆشانی خۆی هەڵبگرێت و چالاکییەکانیان هەڵپەسێرن . هەرچەندە ، پاش جەنگ سەرلەنوێ دەرکەوتەوە و دەستی بە چالاکیی کردەوە تاوەکو گرتنی ئەستەمبوڵ لەلایەن

---

[17] W.G. Elphinston, " Kurds and the Kurds Question ,"94.

[18] Ibid.

[19] واپێدەچێت تەلعەت پاشا هەوڵی ئەوەی دابێت هانی سورەییا بەگ بدات پەیوەندیی بە (ک ی.پ) ەوە بکات بێئەوەی سەرکەوتوو بێت بڕوانە : Driver ,"Kurdistan and The Kurds,113.

[20] Chirguh,La question kurde.19;

شێرکوە . القضية الكردية ، ٥١. زكي . خلاصة تاريخ الكرد ، ٣٥٠

کەمالیستەکانەوە . کۆمەڵەی هێڤی بڵاوکەرەوەیەکی بە ناوی (ڕۆژی کورد) بڵاوکردەوە .[21] دوای ئاگربەست سورەییابەگ بەدرخان کۆمیتەی سەربەخۆیی کوردی لە قاهیرە دامەزراند .[22] بەهەمان شێوە ، پاش ئاگربەستی مۆدرۆس ، ژمارەیەك لە سەرکردەکانی کورد جەمعیەتی تەعالی کوردستانیان لە ئەستەمبوڵ دامەزراند کە بە کۆمەڵەی نیشتمانیی کورد ناسرابوو . ئەم کۆمەڵەیە کە لەلایەن شێخ عەبدولقادری نەهرییەوە سەرۆکایەتیی دەکرا ، ژمارەیەك سەرکردەی ناوداری دیکەی کوردی لە خۆگرتبوو وەك: ئەمین عالی ، موراد ، خەلیل رامی ، هەروەها کامەران بەدرخان ، حیکمەت ، حوسەین شوکری ، فوئاد ، مەحموود ، هەروەها عەلی بابان ، ئەکرەم بەگ جەمیل پاشازادەی دیاربەکر ، ئەمین زەکی بەگ و مستەفا پاشای خەڵکی سلێمانی ، و هەروەها ژمارەیەك پیاوانی بەناوبانگی خەڵکی دەرسیم ، خەرپوت و مەلاتیا .[23]

ڕێکخراوێکی نوێ بەناوی (کرد تشکیلات اجتماعی جمعیت/کۆمەڵەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی کوردان) لە لایەن ئەمین عالی ،جەلادەت ، کامەران بەدرخان ، کەمال فەوزی ، ئەکرەم بەگ جەمیل پاشازادە ، د.شوکری محەمەد و هەروەها مەمدوح سەلیمەوە دامەزرێنرا .[24] کۆمەڵەیەکی دیکە کە لەو کاتەدا هەواڵی بوونی تۆمارکراوە بریتیە لە (کردملت فیرقەسی/پارتی نەتەوایەتیی کورد) .[25]

---

[21] Chirguh,La question kurde19-20; Nikitine ,Les Kurdes ,195;

شیرکوه ، القضية الكردية ، ٥٢. زكي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٥٠

[22] Nikitine ,Les Kurdes ,196.

[23] شیرکوه ، القضية الكردية ، ٥٢-٥٣. زكي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٥٠; Chirguh,La question kurde,20

[24] بەگوێرەی زەکی، بەدرخان و ژمارەیەك لە لایەنگرانی لە جەمعیەتی تەعالی کوردستان جیابوونەتەوە بۆ ئەوەی ڕێکخراوێکی نوێ دابمەزرێنن خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٥٠

[25] Chirguh,La question kurde,20; Nikitine ,Les Kurdes ,196.

شیرکوه ، القضية الكردية ، ٥٢-٥٣. زكي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٥٠

چالاکییە نەتەوایەتیەکانی کورد لە سەراسەری کوردستاندا بەشێوەیەکی خێرا دەرکەوت . ئەو هزرو بڕوایانەی بەشێوەیەکی نهێنیی لە بڵاوکراوە نەتەوایەتیەکاندا دەنووسرا ، لە قسەی سەرزارەکیی خەڵکدا باسی لێوەدەکرا . هەواڵ و دەنگۆکان کە سروشت و بنەمایەکی رامیاریی و نەتەوایەتییان هەبوو بابەتی بایەخداری گفتوگۆی کۆڕ و دانیشتنەکانی کورد بوون .

ئەرکی بڵاوکردنەوەی هزر و بیروڕایەکی قەدەغەکراو و ناناشنا لەنێو رەشەخەڵکانێکی نەخوێندەواردا کە هاوسۆزیی و پەیوەستەگیی نەتەوایەتییان ناڕوون و لێڵ بوو ، کارێکی هێند ئاسان نەبوو . گرفت و ئاستەنگەکان کاتێک لەناکاو دەردەکەوتن کە ئەو کارانە رووبەڕووی سەرەڕۆییەکی بەرچاو دەبوونەوە . هێندێک لەوانەی بڵاوکراوە نەتەوایەتییە قەدەغەکراوەکانیان پێدەگەیشت بێوەستان دەچوون دەیانخستە بەردەمی دەسەڵاتداران تا وەفاداریی و دڵسۆزیی خۆیان بۆ حکومەتی عوسمانیی رابگەیەنن .[٢٦] پێویستە ئەو ناکارە وا لێکنەدەینەوە کە بەشێوەیەکی بەربڵاو بووە یاخود لە تێکڕای حاڵەتەکاندا بۆ بەرژەوەندیخوازیی یا لەئاکامی لاوازیی هەستی نیشتمانپەروەریی بووە . بێگومان ، هێندێک لەنێو ئەو کەسانەی بەو کارە تاوانبارکرابوون دەگونجێت بە ئاسانیی وایان لەقەڵەمدابێت کە چالاکییەکانی کورد خیانەتێکی هاندراوە و راستەوخۆ دژی دەسەڵاتی شەرعی سوڵتان-خەلیفەیە و هەروەها دەوڵەتە ئیسلامییەکەیە .

هزری نەتەوایەتیی دواجار رێگەی خۆی بەرەو تەکێکان تەیکرد و لەوێ پشتگیرییەکی بەهێزی شێخەکانی کوردی بۆخۆی بەدەستهێنا . ئەم پەرەسەندنانە بایەخێکی مەزنە لە لە مێژووی نەتەوایەتیی کوردییدا . لەبەر چەند هۆیەك ، بایەخی تەکێکان وەك ناوەندێك بۆ بڵاوکردنەوەی هزری نەتەوایەتیی دەتوانرێت بەئەستەم زیادەڕەویی تێدابکرێت . هزرگەلێك کە لەم ناوەندە چرەوە دەرپەڕێت لەنێو کورددا مایەی پەسەندیی و پشتگیریی بەرفراوان دەبێت ، چونکە مۆری دەسەڵاتێکی ئایینیی فێرکار و متمانەپێکراوی پێوەیە کە شێخە . هەروەها کەسایەتیی و پلەوپایەی ئایینیی

---

[26] دملوجي ، امارة بهدينان ، ٩٤-٩٥

شێخ تایبەتمەندیی پارێزراوییەکی رێژەیی لە دەستێوەردان و بێزارکردنی دەسەڵاتداران بە تەکی دەبەخشێت .

شێخەکان کەوەك چینێك بەشێکی گرنگیی دەستەبژێری کۆمەڵگای کوردییان پێکدەهێنا ، بە پێچەوانەی بەشی مەزنی دەستەبژێری کوردی تورکێنراوی شارنشینەوە ،کەسانێکی نەتەوایەتیی دڵگەرم بوون. ئەوان لە نزیکەوە بە جەماوەری کوردەوە پەیوەستبوون و خۆیان بە بەشێك لەوان لەقەڵەمدەدا و لێیان جیانەدەبوونەوە . لەوەش زیاتر ، ئەوان لە رووی ئاکار و بیروبڕواوە خۆیان لە ریزی دەوڵەتە ئیسلامییە سونەتییەکەدا دەبینییەوە و دژی ئەو دەوڵەتە سێکیولارە هاوچەرخە بوون کە تورکەلاوەکان بۆیان وێنا دەکردن . بەوەش ئەوان فەرمانڕەوا نوێیەکانی ئەستەمبوڵیان سڵەماندەوە . ئەوانەی بیروبڕوا و سیاسەتیان لەلایەن شێخەکانەوە وەك ئامرازێکی نوێی پێکەیشتووی شێوە نائیسلامیی سوڵتان مەحموود لەقەڵەم دەدا ، ئەوەی لە لایەن تەریقەتە ئاینییەکانەوە جێگای بەپیرەوەچوون و خۆشحاڵیی نەبوو[٢٧] .لێخستنی عەبدولحەمید (١٨٧٦-١٩٠٩) لەلایەن تورکەلاوەکانەوە ، سەرچاوەیەکی دیکەی نارەزایەتیی شێخەکان بوو . لە چاوی ئەوانەوە ، سیاسەتەکانی ئیسلامگەرایی و کوردراکێشیی سوڵتان عەبدولحەمید ، ئەو سوڵتانەی وەك خەلیفەیەکی نموونەیی لە یادەوەرییاندا وێناکرابوو . لەبەرئەوەش ، هەر لە سەرەتاوە، شێخەکان لەرووی رامیاریی و ئاینییەوە وەك نەیارێکی رژێمە نوێیەکە رۆڵیان بینی .

---

[27] ریفۆرمەکانی سوڵتان مەحموود بووەهۆی سەرکوتکردنی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکانی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا هەڵوەشاندنەوەی یەکەکانی ئینکشاریی و تەریقەتی بەکتاشیی لە ١٨٢٦دا بەشێك بوون لە بەرنامەی چاکسازییەکانی کە خەڵك بەدڵیان نەبوو ئەوەی ناوی سوڵتانی کردە نەفرەتێك بەسەر تەریقەتەکانەوە دەگوترێت پاش مردنی سوڵتان . بەکتاشییەکان کردبوویان بە خوو هەر جارێك لە ئەستەمبووڵ بەلای قەبرەکەیدا بڕۆشتنایە تفێکیان تێدەکرد و دەیانگوت نەفرەتی خوای لێ بێت .چیرۆکێك دەگێڕنەوە کە رۆژێکیان لە ساڵی ١٨٣٧دا دەروێشێك چاوی لە سوڵتان بوو لە پردی گالەتا دەپەڕییەوە بەرەو رووی رایکردە و دایە بەر جنێو و پێیگوت (گاورپاشا) و بەوە تاوانباری کرد کە ئیسلامی تێکداوە

Birge.John Kingsely. The Bektashi Order of Dervishes . London:Luzac,1937.79; Brown.John P. The Dervishes: Or Oriental Spiritualism. London:H.Milford.1927.345-46.

وێڕای ئەوەی زۆرینەی شێخەکان هاوسۆزی پرسی نەتەوایەتیی کورد بوون ، بەڵام هەموویان نەیاندەوێرا بە ئاشکرا هەستی خۆیان پیشانبدەن . ئەوانەی کە هەستیان دەکرد کە هێندە بەهێزن بۆ کارێکی وا ، پشتگیریی خۆیان بۆ نەتەوەخوازەکان ئاشکرا کرد و ڕاشکاوانە بەشداریی چالاکییە نەتەوایەتییەکانیان کرد . ئەوانەی توانا و هێزێکی کەمتریان هەبوو ، لەوە دوودڵ بوون کە بەکردار و گوفتار شتێکی وایان لێبوەشێتەوە هاوسۆزییان پیشانبدات ، ئەوانیش هەر لە ناخەوە بەنهێنی هیوای سەرکەوتنی نەتەوەخوازەکانیان دەخوازی.

دەگونجێت کاریگەریی هێزی نەتەوایەتیی لەسەر شێخەکان زۆر بەباشیی لە یاداشتنامەیەکدا ڕەنگیدابێتەوە کە لەلایەن ژمارەیەک لە خانەدانان و شێخە کوردەکانی هەرێمی بادینان وەک تەلەگراف، پێشکەشی دەروازەی باڵا و پارلەمانی عوسمانییان لە ئەستەمبوڵ کردووە .[28] ئەم یاداشتنامەیە کە خواستی پێویستیی ئەنجامدانی چاکسازیی لە کوردستان تێدا هاتووە ، بەشێوەیەکی بنەڕەتیی لەلایەن شێخ عەبدولسەلامی بارزانیی و شێخ نورمحەمەدی دهۆکەوە گەڵاڵە کراوە و لەماڵی ئەوانیشدا ئامادەکراوە و نووسراوە . یاداشتنامەکە ئەم چاکسازییانەی خوارەوەی خواستووە :

١- زمانی کوردیی لە پێنج قەزای کوردییدا بکرێتە زمانی فەرمیی .

٢-زمانی کوردیی لە تەواویی ناوچە کوردییەکاندا ببێتە زمانی فێرکردن .

٣- دامەزراندنی قایمقامەکان ، بەڕێوەبەری ناحیەکان و تێکڕای کارمەندانی دیکەی میریی لە کوردستان لەوانە بێت کە بتوانن بە کوردیی قسەبکەن.

٤- بەڕێوەبردنی بوارە یاسایی و دادپەروەرییەکان لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلام بێت لە سۆنگەی ئەو ڕاستییەوە کە ئیسلام ئایینی فەرمیی دەوڵەتە .

٥- شوێنی قازیی و موفتیی بە پەیڕەوانی یاسایی مەزهەبی شافیعیی پڕبکرێتەوە .

٦- پێویستە سەندن و کۆکۆدنەوەی باج بەپێی بنەماکانی شەریعەت بێت و هەموو ئەو

[28] کۆپی ئەو تەلەگرافە درابوو بە شێخ عەبدولقادری نەهریی کوڕی شێخ عوبەیدوڵلا ، ئەمین عالی بەدرخان ، هەروەها ژێنراڵ شەریف پاشا کە هەرسێکیان ڕێبەری جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردن بەگوێرەی دەملوجی ئەم هەنگاوە دژی خواستی ئەوانە درابوو کە یاداشتنامەکەیان مۆر کردبوو کە بە تەواویی دەیانویست تەلەگرافەکە بکەنە شتێکی فەرمیی ، ئەوە دەزانین کە پێدانی کۆپییەکە خواستی عەبدولسەلام بووە دەملوجی ،امارة بهدینان ، ٩٦

باج و سەرانانە لابرێت کە لەگەڵ بنەماکانی شەریعەت نایەتەوە .

٧- بەشێك لەو باجانەی لەهەرشوێنێك کۆدەکرێتەوە بۆ راژەکردن لە رێگای چاکردن و پاراستنی شەقام و رێگاکانی ئەو پێنج قەزا کوردییە خەرجبکرێت .[٢٩]

ئەم چاکسازییە پێشنیازکراوانە بە راشکاویی هەڵقوڵاوی خواست و ویستێکی نەتەوایەتیی روونە و سێبەری تایبەتمەندیی ئایینیی ئەو کەسایەتییە سەرەکییانەی بەسەرەوەیە کە یاداشتنامەکەیان نووسیوە .خاڵی یەکەم ، دووەم ، سێیەم و هەروەها حەوتەم ، بەرجەستەی نەتەوایەتیی کوردیی دەکات ، لە کاتێکدا چوارەم ، پێنجەم و شەشەم ، هەستی ئایینیی تێدا رەنگیداوەتەوە . خاڵی پێنجەم گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە ، لێرەدا رەگەزەکانی نەتەوایەتیی و ئایینیی دەگەنەیەك و ئاوێتە دەبن . ئەو خاڵەی باس لە دانانی قازیی و موفتییەکان دەکات کە پەیڕەوی مەزهەبی شافیعیی بن ، ئەو مەزهەبەی کە زۆرینەی کورد پەیڕەوی لێدەکەن . واتای داواکارییە بە دانپیانانی باڵادەستیی ئەو مەزهەبە لە ناوچەی کوردستاندا . ئەوەش بێگومان ، مانای بنیاتنانی ئایینزایەکی نەتەوایەتیی کوردیی دەگەیەنێت .

بەشێوەیەکی بنەرەتیی ، شتێکی نوێ سەبارەت بەم ئامانجانە نیە ، ئەوەی پێشووی کورد بەشێوەیەکی بایەخدار بیری بۆ چاکسازیی ، خودموختاریی نێوخۆیی و تەنانەت سەربەخۆییش چووە . یادەوەریی شێخ عوبەیدوڵڵا دوا رابەری مەزنی نەتەوایەتیی کوردیی کە لە زۆر کاتی جیاوازدا بیری لە پێشکەشکردنی ئەم ئامانجانە کردۆتەوە ، هێشتا لە یادی خەڵکی کورددا نوێ و تۆزی لەسەر نەنیشتبوو . دەگونجێت شتێکی چاوەڕوانکراو بێت کە لاوازیی دەوڵەتی عوسمانیی و ئایندەی نادیارو لێڵی ، هانی رێبەرانی کوردیی دابێت ، لە نێو ئەوانەی دیکەدا ، بە هۆشیارییەوە لەمەڕ ئایندەی نیشتمان و نەتەوەکەی خۆیان تێبڕوانن .

تورکە لاوەکان بە هەمان ئەندازەی شێخ کە حەزی پێیان نەبوو ، ئەوانیش رکیان لێیدەبووەوە . ئەم ناحەزییەی هەردوولا ، دوژمنایەتیی و بێزاندنی هەردوولای لێکەوتەوە .کات پێشانی دەدات کە تاچەند ئەو دوولایەنە بە چاوی سوکەوە دەیانڕوانیە یەکدی و تا چەندیش ئارامیی و گیانی لێکتێگەیشتنی زیاتر دەیتوانی هەردوولا شاد و

[29] هەمان سەرچاوە

نەهامەتیش لەکۆڵ خەڵك و لایەنگرانیان بکاتەوە . بەکەمگرتن و ململانێکردن لەگەڵ نەتەوایەتیی تورك لەلایەن شێخەکانی کوردەوە ، بە زووریی نەهامەتیی و کارەساتی بەسەر هێندێکیاندا هێنا . دڵرەقیی و توندوتیژیی تورك بە زووریی سروشتی ناحەزیی و دوژمنایەتیی سەرسەختی ئەوانی لەهەمبەر کورد پیشاندا .

## پەرەگرتنی کێشە و ململانێی نێوان کورد وتورك

### هۆکارەکانی کێشەکە :

تێکچوونی پەیوەندییەکانی کورد وتورك لەپاش شۆڕشی تورکەلاوەکان تا هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی ، دەتوانرێت بە باشیی لەو کێشە و پێکدادانەدا ببینرێت کە لە نێوان کورد وحکومەتی عوسمانییدا لەو ماوەیەدا قەوماون پێش ئەوەی بچینە نێو ئەو رووداوانەوە ، سوودبەخشە بە کورتیی ئەو هۆکارە بنەڕەتییانە پێشانبدەین کە سەرچاوەی دوورکەوتنەوە و تەوەلابوونی هەر دوو گەل بوو :

١- هەڵوێستی تورکە لاوەکان لەمەڕ خەلافەت وهەروەها سەبارەت بە ئایین بەگشتیی ، ئەو خولیا نەفسانەییەی لە نەستی کورددا کاڵکردەوە و بەهێزترین ئاڵقەی پساند کە کوردی بە دەوڵەتی عوسمانیی بەستبووەوە . سەرباری ئەوەش ، کوردان بە کەوتنی عەبدولحەمید ، بایەخی گرنگ و جیاوك و پلەوپایەی خۆیان لەدەستدا ، عەبدولحەمید تەواوی توانا و پایەی بەهێزی خۆی بۆ بەخشینی شانازیی و پایەبەرزیی بەسەر شێخەکان و سەرخێڵەکانی کورددا تەرخانکردبوو ، ئەوانەی دەستوپێوەندەکانیان تیپەکانی حەمیدییەیان پێکدەهێنا .

٢- سیاسەتی ناوەندگەرایی کارگێڕیی و بەزۆر تورکاندن کە تورکە لاوەکان گرتبوویانە بەر ، ناکۆکیی و دووبەرەکیی لێکەوتەوە . ناوەندگەرایی کارگێڕیی مانای کشانی دەسەلاتی عوسمانییە بۆ ناوچەیەك کە بە دەستێوەردانی دەزانێت و مەسەلەیەکی واش بە توندیی دەبێزێنرێت . بەهەمان شێوەش ، کوردان بەشێوەیەکی سروشتیی بەرنگاری سیاسەتی بەزۆر تورکاندن بوونەوە ، چونکە ئەو سیاسەتە لەگەڵ ئەو بنەمایە سەرەکییانەدا ناکۆك بوو کە کۆمەڵگەکەیانی لەسەر بنیاتنرابوو .

٣- ئەو شکست و بەزینە دیپلۆماسیی و سەربازییەی تووشی رژێمی تورکە لاوەکان ببوو ، پایەکانی دەسەڵاتدارێتیی عوسمانیی کلۆر کرد . ئەوەش گیانی یاخیبوونی وروژاند و کوردی هاندا ئارەزووی بوونێکی جیاوازی سەربەخۆیان هەبێت .

٤- شۆڕشی تورکە لاوەکان کە کاریگەریی لە رابوونی ئومێدی نەتەوەیی گەلانی جۆراوجۆری عوسمانی نەتورک هەبوو ، نەیتوانی بەڵێنە بەراییەکانی خۆی بێنێتەدی .گەندەڵیی و بەدفەرمانڕەوایی ، شانبەشانی سیاسەتێك کە لە نێوان خۆسەپێنیی و لاوازییدا سەروخوار دەکات ، تەنیا رازەی بە گیانی نارەزایەتیی و تورەبوونی کوردان کرد و بە ئاراستەی راپەڕین هانیدان .

٥- هەموو ئەم فاکتەرە گرنگانەی کێشە و ململانێکە بە توندوتیژبوونی نەتەوایەتیی کوردیی ، بەشێوەیەکی مەزن ئاڵۆزتر بوون ، وێڕای تەقەلای رووسەکان بۆ راکێشانی نەتەوەخوازەکان و سەرخێڵەکانی کورد بەلای خۆیدا .

## راپەڕین و کوشتنی شێخ سەعید بەرزنجیی

یەکەمین نیشانەکانی بەرەنگاریی و کێشمەکێشی نێوان کورد و تورکە لاوەکان بەشێوەیەکی هەر زوو پاش سەرکەوتنی شۆڕشی تورکە لاوەکان دەرکەوت . لە ساڵی ١٩٠٨ دا ، شێخ سەعید بەرزنجیی لە سلێمانی هانی یاخیبوونی خێڵی هەمەوەندی دا وەك بە رووداراوەستانێکی تورکە لاوەکان و بۆ پشتگیریی سوڵتان .[٣٠] بەگوێرەی گوتەی مێجۆری بەریتانیی ( ئی.بی.سۆن) :"ئامانج لەمە بە ئاشکرا یاخیبوون بوو دژی مەجلیس نوێ ، شێخی بەرزنجیی بە شێوەیەکی سروشتیی بە سوڵتان وەفاداربوو و لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە دەلاوێنرایەوە ، گەر لەم جوڵانەوەیەیدا هاوکارییەکی چالاکی سەربازیی نەکرابێت ."[٣١]

---

[30] شێخ سەعید پێگەیەکی مەزنی لای سوڵتان هەبوو دوای ئەوەی توانیبووی لەرێگەی نوشتەوە یەك لە کورە خۆشەویستەکانی سوڵتان کە نەخۆش بوو چاك بکاتەوە .

Bell, Gertrude Lowthian . Amurath to Amurath. 2d ed .London: Macmillan, 1924.249; Soane ,Report on Sulaimania District ,98.

[31] Ibid.

ئەم یاخیبوونە ، هاوکات بوو لەگەڵ بێزاریی دەربڕینی بازرگانەکانی شاری سلێمانی ، ئەوانەی بەدەست سەرکوتی شێخ سەعیدەوە دەیاننالاند . ئەوەش دەسەلاتدارانی ئەستەمبوڵی هاندا بکەونەکار . شێخ هاندرا لەگەڵ ژمارەیەك لە خزمەکانی بڕۆنە موسڵ و لەوێش بەدەستبەسەریی هێڵرانەوە . لە مایۆی ١٩٠٩ دا و لە میانەی ئاژاوەیەکی دژ بە کورددا ، شێخی پیر لەبەردەرکی ماڵەکەی خۆیدا کوژرا .[32] ئەم کارە کە ئەنجامدەرانی ئاشکرانەکران ، ناوچەی سلێمانی راکێشایە نێو بارێکی هەژان و هەراوهوریاوە . بنەماڵە داخدارەکەی ، بە تایبەتیی شێخ مەحموودی کوڕی کە شوێنی شێخایەتیی باوکی گرتەوە ، تۆڵەی خۆی بە سەپاندنی حوکمی ترس و تۆقاندن لە شاری سلێمانی دەستپێکرد خێڵی هەمەوەندی بەردایە گیانی خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەر ، لەئاکامدا ژیانی ئابووریی ناوچەکە تووشی ئیفلیجییەکی تەواو بوو .[33]

هەمەوەندەکان تاکو ژوئیەی ١٩١٠ لە حاڵەتی یاخیبووندا بوون . کاتێك نازم پاشای والی دواتری بەغدا ، لەگەڵیاندا گەیشتە رێکەوتننامەیەك و ئەوەی پەسەند کرد کە بە رووکەش سەردانەواندنی خۆیان پێشانبدەن . وادەردەکەوێت کە سیاسەتە ئاشتەوایییەکەی نازم پاشا لە ئاکامی بانگکردنەوەی ناوبراوەوە بۆ ئەستەمبوڵ وازی لێهێنرا . بەوەش هەمەوەندەکان گەڕانەوەی دۆخی یاساشکێنی پێشوویان . لە ساڵی ١٩١١ دا ، تۆمارکردنی بەشێك لە پیاوە خێڵەکییەکانی هەمەوەند لە تیپە سنوورییەکاندا لەسەر شێوەی سوارەی حەمیدییەی پێشوو سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا . لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی هێشتا هەواڵی ئەوە هەبوو کە هەمەوەندەکان لە حاڵەتی یاخیبووندان .[34]

---

[32] سەبارەت بە درێژەی گێڕانەوەی رووداوی کوشتنی شێخ سەعید بڕوانە :

Bell, Amurath to Amurath, 249-50 Soane ,To Mesopotamia and Kurdistan,192;Soane ,Report on Sulaimania District, 99-100.

[33] Soane ,To Mesopotamia and Kurdistan,192ff;see also Soane ,Report on Sulaimania District, 100-101.

[34] E.J.R., Precis of Affairs in Southern Kurdistan during the Great war ,( Baghdad Government Press, 1919) ,1: Gertrude Lowthian Bell, Review of the Civil Administration

## راپەڕین و مردنی ئیبراهیم پاشای میللیی

لەوانەیە سەرنجڕاکێشترین کار لەلایەن سەرکردەیەکی کوردەوە بۆ پشتگیریکردنی سوڵتانە لێخراوەکە لە لایەن ئیبراهیم پاشای سەرۆکی هاوپەیمانێتیی خێڵی میللیی و میرئالای تیپێکی حەمیدییە ئەنجامدرابێت . کاتێك ئیبراهیم پاشا لە ئەپرلی ١٩٠٩ دا هەواڵی لێخستنی عەبدولحەمیدی بەرگوێ کەوت ، بە خۆی و پازدەهەزار کوردەوە بەرەو دیمەشق کشا و بەناوی سوڵتانەوەی شارەکەی داگیرکرد .هەرچەندە بە زووی ناچارکرا ئەو شارە جێبهێڵێت. لەکاتێکدا بۆ بارەگا سەختەکەی لە وێرانشەهر گەڕایەوە ،پاش ئەوەی لەگەڵ پیاوە خێڵەکییەکانی شەمەردا پێکیاندادا ،لە ناوچەی چیایی عەبدولعەزیز کوژرا .خێڵەکییەکانی شەمەر لە لایەن تورکە لاوەکانەوە نێردرابوون تا لەلەمپەر لەبەردەم پاشەکشەی ئیبراهیم پاشادا دروستبکەن .[٣٥]

## ڕووداوی تێوەگلانی سەرکردە کوردەکانی دیکە

هەموو ئەو هەنگاوانەی لە لایەن حکومەتی عوسمانییەوە بە ڕووی بێزاریی و سەرسەختیی پەرەگرتووی کورداندا نرا ، تەنیا ڕاژەی بە خرۆشان و توڕەیی زێدەتری کوردان نەکرد . بۆ نموونە ، لە کۆتایی ساڵی ١٩١٠ دا ، میریی هەوڵیدا باج لە جافەکان کۆبکاتەوە ، کە بەهێزترین خێڵی باشووری کوردستان بوون و لەو کاتەوەی تورکەلاوەکان هاتبوونە سەرد دەسەڵات ، باجیان نەدابوو . مەحموودپاشا ، کە سەرۆکێکی بەناوبانگی ئەو خێڵە بوو ، بانگکرایە موسڵ ، لەوێ بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێك گلیاندایەوە ، ئەو لە کۆتاییدا ئازادکرا ، بەڵام مەسەلەکە بە شێوەیەکی هێمنانە چارەسەر نەکرا .[٣٦] لەساڵی ١٩١٢ دا ، مستەفاپاشای سەرۆکی خێڵی باجەلانی ناوچەی

---

of Mesopotamia 1914-1920(London: H.M.Stationary Office 1920), 43.

[35] Elphinston, " Kurds and the Kurds Question ,"94.

[36] E.J.R.,I; Bell, Review of the Civil Administration , 43.

خانەقین ، بەهۆی ئەو گومانەی سەبارەت بە لایەنگری بەریتانییەکان لێیدەکرا ، قۆڵبەستکرا و بۆ ماوەیەک لە بەغدا وەک گومانلێکراوێکی رامیاریی زیندانیی کرا .[٣٧] لەهەمان ساڵدا ، سلێمان بەدرخان لە میانەی ئاژاوەیەکدا لە بۆتان بەدەستی جەندرمەی تورک کوژرا ، ئەوە بووە هۆی هەوڵدانێك بۆ هێنانەدی کایەی ئاشتەوایی لە نێوان تورکە لاوەکان و نەتەوەخوازە کوردەکاندا .[٣٨]

## سەرسەختیی کورد و جەنگی بەلقان

رووداوە مەزنەکانی جەنگی یەکەم و دووەمی بەلقان ، سەرچاوەی چەندین شکستی ئابڕووبەرانە بوو کە بە باڵای هێزەکانی عوسمانییدا بڕا . ئەوەش بارگرانییەکی بێوێنەی خستەسەر ئەو پابەندیی و پەیوەندییە لاوازەی کوردی بە دەوڵەتەوە دەبەستەوە . بەپێی راپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی ، کاتێك سوپای بولگاریا لە ٢٦ی مارتی ١٩١٣ دا ، پاش تۆپبارانێکی سەخت قەڵای ئەدرنەی گرت شاری ئەستەمبوڵ خۆشی کەوتە بەر مەترسیی هەمان چارەنووس ، ژمارەیەك لە خێڵە کوردەکان پێکەوە بڕیاریانداوە کۆتایی بە پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانییدا بهێنن ، وەك: خێڵەکانی میللیی ، کارەکێچیلیی ، کتکان و هەروەها بەرازیی ، ئەوانەی کە دەکرێت رێکەوتبن لەسەر دامەزراندنی هاوپەیمانیەتییەك لە نێوانیاندا بۆ ئەوەی لەکاتی کەوتنی ئەستەمبوڵ بەدەستی بولگارییەکان ، ئەمان سەربەخۆیی خۆیان رابگەیەنن .[٣٩] ئەم بەرنامەیە نەهاتەدی ، چونکە سوپای بولگاریی نەیتوانی لەپەلاماری خۆی بەردەوام بێت

---

بەگوێرەی لۆنگریك لەو دەمەدا نازم پاشا والی بەغدا بووە ، مەحموودپاشا بانگهێشت کراوە سەردانی بەغدا بکات و بەرێز و شکۆیەکی مەزنەوە پێشوازیی لێکراوە Longrigg, Iraq (1900-1950),57.

[37] مستەفا پاشا تەنانەت پێش شۆڕشی تورکە لاوەکانیش لەگەڵ حکومەتی عوسمانیی کێشەی هەبوو ، هەربۆیە ناچار بوو چەند ساڵێك وەك دوورخراوە لە ئەستەمبووڵ بەسەر بەرێت . تۆمەتی ئینگلیزخوازی ئەو کاتە لەسەر ساغ بووەوە کاتێك بەریتانییەکان بەغدایان داگیرکرد پشتگیریانی کرد

E.J.R.,1; Bell, Review of the Civil Administration.43;Soane Note on the Tribes,2.

[38] Elphinston, " Kurds and the Kurds Question ,"94-95.

[39] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,30.

و جەنگەکە بە داوەریی زلهێزەکان کۆتاییهات .جێگای سەرنجە ، راپۆرتێك بەهەڵە باس لەوە دەکات کە کەوتنی پایتەخت هانی عەبدولقادری کوڕی دێرەی سەرخێڵی کارەکچیلی داوە بکەوێتە کار و خۆیو دەستوپێوەندەکەی هێرشیان کردۆتە سەرشاری بیریجیك و تالآنیان کردووە ، پاشان لە رووباری فورات پەڕیونەتەوە بۆ ئەوەی پەلامارەکانی خۆیان درێژە پێبدەن ، بەڵام پاش ئەوەی هاوپەیمانەکانیان نەیانتوانیوە پشتگیرییان بکەن ، ناچاربوون بکشێنەوە .[40]

## وەڵامی کورد بە پێشنیازی رووسەکان

رووسیا ، دراوسێ و هەروەها دوژمنی تورکیا، وا چاوەڕوانی لێدەکرا چاودێریی بێزاریی و زیندبوونی دوورەپەرێزی کوردان بکات . پاش تێپەڕینی سەدەی رابردوو ، رووسەکان بە وردیی و بایەخێکی زۆرەوە چاودێریی ناڕەزایەتیی و بێزاریی کوردی دەستوپێوەندی سوڵتانیان دەکرد و بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە هەوڵی ئەوەدابوون بەلای خۆیدا رایانکێشێت ، لەمەشدا بە پلەی جیاواز سەرکەوتنی بەدیهێنابوو .[41] هەڵوێستی زۆربەی کورد لە هەمبەر ئەو خۆبردنە پێشەوەی رووسیا لەم تێبینییەی (گێرتوارد بێڵ) دا دەردەکەوێت ، کە لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانییدا لەگەڵ ئۆفیسی بەریتانیی کۆمسیۆنی مەدەنییدا بووە:

"پێش جەنگ ، هەڵوێستی خێڵە کوردەکان لە هەمبەر رووسیا بەدرێژایی سنوورەکانی رۆژهەڵات روون و ئاشکرا نەبوو . بەڵام بە گشتیی دەتوانرێت بگوترێت لە

---

[40] کاتێك عەبدولقادر داوای لێکرا هەڵوێستی خۆی لە حەلەب بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانیی روونبکاتەوە ، ئەو جەختی لەوە کردەوە کە سەرکردەیی دەستەیەکی خۆبەخشی کردووە بۆ ئەوەی یارمەتی تورکان بدات . حکومەت روونکردنەوەکەیان پەسەند کرد و فەرمانیان دایە بەخۆی هێزەکەیەوە هاوکاریی بکات بۆ بەرگریی کردن لە پایتەخت ئەوان سەلماندیان کە لەبەرەی پێشەوە سوودێکی کەمیان هەیە هەربۆیە رەوانەی ماڵەوە کرانەوە کاتێك گەڕانەوە تالآنییەکی زۆریان لە تراقیاوە هێنابوو Ibid.

[41] بەگوێرەی لۆنگریك ، پیاوماقوڵانی کورد بانگهێشتی رووسیا کراون و بەگەرمیی پێشوازییان لێکراوە هەروەها یەڵمان دەڵێت کە رووسیا پێش هەڵگیرساندنی جەنگ بە گەرمیی لەکوردستاندا چالاکییەکانی خۆی پەرەپێداوە

Longrigg, Iraq (1900-1950),58; Yalman Ahmad Amin , Turkey in the World War,209.

کاتێکدا ئەوان گومانێکی بنەڕەتییان لە رووسیا هەبوو ، لە ئاکامی ناچارییاندا ئاوڕیان لە ئارەزووکانی رووسیا دایەوە ، بەدفەرمانڕەوایی عوسمانییەکان کوردی ناچارکرد دوور لە ئارەزووی خۆیان بکەونە باوەشی رووسیاوە. سەرکردەکانی ناوچەی موسڵ ،وەك شێخی بارزان ،پاش ئەوەی بۆ ماوەی چەندین ساڵ پشتی کردبووە بانگەشەکانی رووسیا ، لەکۆتاییدا ناچار بوو لەنێو خاکی رووسیادا ببێتە پەنابەر ، هەروەها لە بەهاری ساڵی ١٩١٤ دا دەنگۆی ئەوەی هەبوو کە خێڵەکانی هەمەوەند ، جاف و دزەیی لە ئاکامی بێهیوابوون لە ئەنجامدانی ئەو چاکسازییانەی لە دەوڵەتی عوسمانیی خواستبوویان ، خۆیان بۆ ئەوە ئامادەکرد داوای هاوکاریی رووسەکان بکەن ."[42]

رووسەکان ، هەروەك دەبینین ، بە شێوەیەکی بەرچاو لە هەردوو راپەڕینەکەی شێخ عەبدولسەلامی دووەم لە بارزان و هەروەها لە یاخیبوونەکەی بدلیسدا دەردەکەون .

## کێشەی نێوان کوردە بارزانییەکان و تورکەکان

### شێخ عەبدولسەلامی دووەمی بارزانیی

لەوانەیە مەزنترین سەرکردەی کورد کە دەبوایە حکومەتی عوسمانیی لە قۆناغەدا رووبەڕووی بێتەوە بریتیبێت لە شێخ عەبدولسەلامی دووەمی بارزانیی . کێشەی شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ تورکەلاوەکاندا ئاکامی ئەو ململانێیە بوو کە لە نێوان شێخی بارزان و دەسەڵاتدارانی عوسمانییدا لە ئارادابوو .حکومەت سوور بوو لەسەر ئەوەی بەسەختیی رێگریی لە خواستی شێلگیرانەی شێخی بارزان بکات کە دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەسەر ناوچەی بارزان-زێبار دا بسەپێنێت . لە کاتێکدا تورکان بە شێوەیەکی بەرفراوان لەسەرکوتکردنی میرنشینە بەهێزەکانی کورددا سەرکەوتنیان بەدەستهێنابوو .

شێخی بارزان توانیبووی بەو مریدە شڕۆڵانەوە هەیبوو بەسەر دوژمنەکانیدا

---

[42] Bell. Review of the Civil Administration,44.

سەربکەوێت . جۆشی پەرستندوی ئایینیی مریدان و گوێڕایەڵی کوێرانەیان بۆ فەرمانەکانی شێخ وایلێکردبوون نازناوی دێوانەیان بڕێت بەسەردا .[43] بیروبڕوای سەیروسەمەرەی ئایینیی کە جاروبار لەنێو بارزانییەکاندا دەهاتە گۆڕێ دەبووە هۆی سەرهەڵدانی دەمارگیریی ئایینیی لە کات‌وساتی جیاوازدا ، ئەوەش زەمینەی بۆ پێکدادانی توندوتیژی بارزانییەکان لەگەڵ هاوسێکانیان و هەروەها لەگەڵ حکومەتیشدا خۆشدەکرد . یەکەمین پێکدادانی لەو جۆرە[44] لەسەردەمی شێخ عەبدولسەلامی یەکەم قەوما ، ئەوەی لەلایەن مریدەکانییەوە وەك مەهدی[45] راگەیەنرا ، دوای ئەو هەرا و پێکدادانی زۆر مەترسیدار لە سەردەمی محەمەدی کوڕیدا قەوما کە وەك شێخی بارزان هەمان رێچکەی باوکی گرتەبەر .[46]

ئەم جوڵانەوە لادەر و پەرگیرە ئایینییانە نێوەرۆکێکی مەترسیداری بۆ حکومەت لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو ،کە نەدەتوانرا لەلایەن حکومەتەوە بە نیگەرانییەکی مەزنەوە لێی نەڕوانێت .سەرباری ئەوەش ئەو جوڵانەوانە زەمینەیان بۆ ئاژاوە و هەرای مەترسیدار پێکدەهێنا و بەرەنگاری دەسەڵاتی دەوڵەتیان دەکرد و بە روویدا رادەوستان ، ئەوانە لادانێکی مەترسیدار بوون لە بیروباوەڕی راستەقینەی ئیسلام لە سیستەمی رامیاریی– ئایینیی دەوڵەتێکی ئیسلامییدا وەك ئەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بانگەشەی بۆ دەکرد . لادان و پەرتبوونی ئایینی لەگەڵ خیانەت و ناپاکییدا هاوجووت بوو.هەر بۆیە ئەرکی سوڵتانی عوسمانیی بوو کە خۆی بە خەلیفەی موسوڵمانان دەزانی ، ئەو هەڕەشە و مەترسییانە دابمرکێنێتەوە سزای گوناهباران و بەدکارانیش بدات .

---

[43] Hay,Major W.R.Two Years in Kurdistan , 180.Cf. Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"

[44] بۆ زیاتر لەمەڕ هەڵگیرساندنی جەنگ بڕوانە:دملوجي ، امارة بهدينان ، ٩٠-٩١.

Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"

[45] مەهدی کەسێکە چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێت لە ئاخرزەمان و پێش کۆتایی جیهان بە شمشێرێکەوە پەیدابێت بۆ لەناوبردنی شەڕ و بەدکاریی و ستەم و دامەزراندنی دادپەروەریی و چاکەکاریی و بوژاندنەوەی بیروباوەڕی ئایینیی بەپێی بڕوایەك ئەو لە بنەماڵەی پەیامبەر پەیدادەبێت و ناوی محەمەدیش هەڵدەگرێت ، بەپێی بڕوایەکی دی پەیوەستە بە عیسای چاوەڕوانکراوەوە بۆ زیاتر لەمەڕ بزاڤەکانی مەهدییگەرایی :

Margoliouth, D. S. "Mahdi."in Encyclopaedia of Religion and Ethics, 1917-30.

[46] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"150-151

کۆڵەران ، سەبارەت بە کێشەی نێوان شێخ عەبدولسەلام و حکومەتی عوسمانیی هۆکاری جۆراوجۆریان پێشانداوین . دملوجی کێشەکە بۆ هاندانی ئاغاکانی زێبار دەگێڕێتەوە ، ئەوانەی دوژمنایەتیی شێخانی بارزانیان بە میرات بۆ مابووەوە . پاش ئەوەی ئەو ئاغایانە لەسەر دەستی زێبارییەکان تووشی شکست و بەزین دەبوون و زیانی توندیان لێدەکەوت ، دەکەوتنە خۆ تا حکومەت بورووژێنن و هانیبدەن بچێت بەگژ دوژمنە سەرسەختەکەیاندا .[47] وەك دملوجی دەڵێت ، ئەوان بە هاوکاری کارمەندە خۆجێیەکانی حکومەت لەو هەوڵەیاندا سەرکەوتنیان بەدەستدەهێنا کە حکومەت بەرپەنە گیانی شێخەکانی بارزان . هەروەها ئەو ئاماژەی بەدوو هۆکاری دیکە داوە کە زەمینەیان بۆ دەرکەوتنی کێشەکە خۆشتر کردووە ، ئەویش هێرشی دزێو و ناقۆڵایە بۆ سەر بیروباوەڕی پەیڕەوی ئایینیی بارزانییەکان و هەروەها ئەوی دیکە پەرەگرتنی نەتەوایەتیی کوردییە . ئەوەی دواییان بێگومان هەڵوێستی شێخ عەبدولسەلامی لەحاست تورکەلاوەکاندا رەقتر کرد ، هەروەها هانی تورکەلاوەکانیشیدا هەنگاوی توندوتیژانە دژی شێخ بهاوێژن .

ساڵی ١٩٢٢ لە کتێبێکدا (دەبلیو . ئەی . ویگرام و سێر ئەدگار .تی .ئەی . ویگرام) کێشەکە بۆ پیلانی خانەدانێکی موسڵ دەگێڕێتەوە کە ناوی سابونچی پاشا بووە ، ئەوەی بە هاوکاریی چەند کارمەندێکی گەندەڵ و بێنابرو، لەبیری ئەوەدا بووە دەست بەسەر گوندەکانی شێخ عەبدولسەلامدا بگرێت . شێخ پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەست لەماڵ و موڵکی خۆی هەڵنەگرێت . بەگوێرەی ویگرام ، ئەم پیلانگێڕانە رووداوی مەترسییداری بەدوادا هات ، هەرزوو تۆمەتی پیلانگێڕانیان لەدژی حکومەت خستە ئەستۆی شێخ و هێزێکی تەمیکەرانە بەرەو ناوچەکانی شێخ رەوانەکرا .[48]

جیاوك کێشەی عەبدولسەلام و حکومەت بۆ ئەو هۆکارە دەگێڕێتەوە کە حکومەت هەوڵیداوە دەستبکات بە سەرژمێرییەکی گشتیی گەل و مێگەل لە ناوچەی

---

[47] دملوجي ، امارة بهدينان ،٩٢،١٣١-٣٣

[48] Wigram and Wigram , 139ff.

جێگەی سەرنجە لە دەمەتەقێیەکدا شێخ عەبدولسەلام بە دملوجی گوتووە :" گوندمان نیە تا بیدەین بە دەستبژێشتووانی موسڵاویی وەك دوژمنەکانمان دەیکەن ، ئێمە تاکە بەرگرییکاری بەرژەوەندییەکانمانین "

دملوجي ، امارة بهدينان ،٩٢

بارزاندا ، شێخ و گەلی بارزان بە توندیی دژی ئەم کارە وەستان و لە کۆتاییدا پێکدادانی چەکداریی لەگەڵ حکومەتدا لێکەوتەوە .[49]

بێگومـان دەگونجێـت هەریـەك یـان تێکـڕای ئـەم هۆکارانـە لـە پـەرەگرتنی دوژمنایەتیی نێوان حکومەت و شێخ عەبدولسەلامدا بەشدارییان هەبێت . دوژمنایەتیی درێژخایەنی نێوان ئاغاکانی زێبار و شێخانی بارزان راستییەکی مێژووییە ، تا ئەو رۆژەش بەلا و وەیشومەیەك بوو بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو بنەماڵەکەدا .[50] بە هەمان شێوە ، تەقەلای خانەدانەکەی موسڵ بۆ دەستبەسەرداگرتنی گوندەکانی شێخ بەیارمەتی چەند کارمەندێکی میریی وەك هۆکارێك رێی تێدەچێت . بابەتی لەو جۆرە لەدەورانی عوسمانییدا تەواو باو بووە .[51] سەرباری ئەوەش ، هەواڵی نارەزایەتیی بارزانییەکان لەهەمبەر ئەنجامدانی ئامارێکی گشتییدا ، لەگەڵ هەڵوێستی زۆرینەی خێڵەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا دێتەوە . خێڵەکانیش هەمیشە بەرگرییان دەنواند یان بەناچاری ملیان بۆ ئەنجامدانی ئامار دەدا ، لەترسی ئەوەی مەبەست لێی سەربازگیریی یا سەپاندنی باجی زێدەتر بێت . ئەو ترسەی لە سۆنگەی ئاشکراکردنی سیاسەتی ناوەندگەرایی تورکە لاوەکانەوە وەك راستییەك خۆی پێشاندەدا .

ئەم کێشەیە هۆکارەکانی هەرچییەك بن ، ئاکامەکانی باڵی کێشا بەسەر سەرجەم ئەو رووداوانەی پاشتر لە وڵاتی بارزاندا قەومان ، پاش ئەوەی تورکان بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان لەو ناوچەیە راستبوونەوە . لەراستییدا ، هەروەك دملوجیش هێمای بۆ کردووە ، زیادەرەویی ناکەین گەر بڵێین ، هەموو راپەڕینەکانی دواتری بارزانیی ، بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ئەنجامی ئەم رووداوە نەخوازراوانەوە پەرەی گرتووە.[52]

---

[49] جیاوك ، ٥٥-٥٦.

[50] Bell, Review of the Civil Administration,73;M.Sykes, 323-25;

دملوجي ، امارة بهدينان ،٩٢-٩٣، ١٣١-٣٢. محمد البريفكاني ، حقيقة الطريقة النقشبندية البارزانية ، ٧

[51] بۆ زیاتر لەسەر چالاکیی بەو شێوەیە لە ناوچەی بادینان لە کوردستان ، دملوجي ، امارة بهدينان ،٨٠-٨١

[52] هەمان سەرچاوە، ٩٩-١٠٠.لە سێدارەدانی شێخ عەبدولسەلام کە بیروباوەری بارزانیانی بەزاند رق و کینەیەکی قووڵی بارزانیانی دژی دەسەڵاتی حکومەت لێکەوتەوە

## هەوڵی تورکان بۆ سەرکوتکردنی شێخ عەبدولسەلام

هەر زوو پاش کەوتنی عەبدولحەمید و بەدەسەڵاتگەیشتنی تورکەلاوەکان ، ژێنراڵ محەمەد فازیل پاشای داغستانیی ، سەرکردەی هێزەکانی عوسمانیی لە موسڵ و جێگری والی ، فەرمانیدا بە شێخ عەبدولسەلام کە سەردانی موسڵ بکات و لەبەردەمیدا ئامادەبێت تا وەڵامی ئەو تۆمەتانە بداتەوە کە سەبارەت بە پیلانگێڕان دژی حکومەت خراونەتە پاڵی . شێخ بە هاندانی موریدەکانی فەرمانەکەی جێبەجێنەکرد ، ئەوان ترسی ئەوەیان هەبوو کە داوێك بێت و بۆ شێخ نرابێتەوە ، شێخ وەڵامێکی بۆ خۆدزینەوە لەو داوایە ئاراستەی پاشا کرد ، بیانووی ئەوەی هێنایەوە کە لەبەر چەند کاروبارێکی تایبەت بە خۆی ناتوانێت لەم کاتەدا سەردانی موسڵ بکات .[53] والی بە ناردنی هێزێکی شەش هەزار سەربازیی ، کە بەشێك لە چەکدارە خێڵەکییەکانی خێڵەکوردەکانی دەوروبەری لەگەڵدابوو .هەروەها بە پەلاماردانی شێخ عەبدولسەلام وەڵامی خۆی دایەوە . شەڕێکی توندوتیژ قەوما کە تێیدا مورێدەکانی شێخ گورزێکی توندیان لە هێزەکانی عوسمانیی وەشاند و زیانێکی گیانیی فرەیان لێدان. هەرچەندە هێزە تایبەت و باڵاکانی حکومەت توانیان لە کۆتاییدا دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بگرن . گوندی بارزان کاولکرا ، بارەگا و تەکیەکەی شێخ روخێنرا ، سەرکردەی هێزەکانی کە فەقێ عەبدولرەحمان بوو کوژرا ، خێزانەکەش ی بەدیلگیرا ،[54] لەکاتێکدا بۆخۆی پەنای بردە بەر ناوچە چیاییەکانی خێڵی تیاری .[55]

پاش ئەوەی نازم پاشا کرا بە والی بەغدا ، ناوبراو لە سۆنگەی سیاسەتی ئاشتەوایی و تێگەیشتنییەوە ، شێخی وەك کەسێکی بێتاوان راگەیاند ، شوێن و پلەوپایەکەی شێخی گەڕاندەوە، قەرەبووی ئەو زیانانەی بۆ کردەوە کە لەئەنجامی

---

[53] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"152.Cf. Wigram and Wigram , 139.

[54] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"152.and Wigram and Wigram , 139.

دملوجي ، امارة بهدينان ،٩٧.

[55] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"152.and Wigram and Wigram , 139.

پەلاماردانی هێزە تەمێکەرەکەدا لێکەوتبوو .[٥٦] واپێدەچێت عەقید سەفوەت بەگ ئەو ئەفسەرە تورکەی لایەنگر و پاڵپشتی شێخ بوو ، رۆڵێکی بەرچاوی لە هێنانەکایەی ئەم ئاشتەواییەدا بووبێت .[٥٧]

ئەم هێمنیی و ئارامییە تەنیا ماوەیەکی کەمی خایاند ، هەر کەمێك پاش ئەوەی شێخ عەبدولسەلام لە چیاکانی هەکارییەوە دابەزیە خوارێ و لە گوندی باب سیڤانی ناوچەی مزوریی ژووریی دامەزرا ، نازم پاشا بانگکرایەوە بۆ ئەستەمبوڵ ، کۆنە دوژمنەکەی شێخ واتە ژەنەراڵ فازیل پاشای داغستانیی فەرمانیدا بە شێخ کە بچێتەوە گوندی بارزان . کاتێك شێخ ئاماژەی بەوەدا کە کاولکردنی ماڵەکەی لە گوندی بارزان وادەکات ئەستەم بێت بچێتەوە ئەوێ ، ژەنەراڵ هێرشی کردە سەری ، لەشەڕێکی چاوەڕوانکراودا ، کە لە گەرووی بابا سیڤاندا قەوما ، مریدەکانی شێخ هێزەکانی عوسمانییان بە سەختی تێکشکاند و دەستیان بەسەر دوو تیپی سەربازییدا گرت .[٥٨]

پاش ئەو سەرکەوتنە ، شێخ یاداشتنامەیەکی ئاراستەی حکومەت کرد و ملکەچیی خۆی پێشاندا و بێتاوانی خۆی راگەیاند و داوای لابردنی داغستانیی کرد .

---

[56] Longrigg, Iraq (1900-1950),58;   دملوجي، امارة بهدينان ، ٩٧- ٩٨ .

[57] نیکیتین کە بەشێوەیەکی سەیر ئاماژەی بە نازم پاشا نەکردووە ، ئەوەی داوەتە پاڵ کۆلۆنێل سەفوەت بەگ کە لێخۆشبوونی بۆ شێخ بەدەستهێناوە پاش ئەوەی سەرکەوتووانە لەلای دەسەڵاتدارانی ئەستەمبووڵ بۆی پاڕاوەتەوە.بە گوێرەی بریفکانیی ، سەفوەت بەگ لەجیاتی نازم پاشا کە لە موسڵ دانرا بۆ ئەوەی ئاشتیی و هێمنیی بۆ ناوچەکە بگێڕێتەوە . بەریتانییەکان واپێدەچێت بە هاندانی نەرمیی نواندن لەهەمبەر شێخ و تێکەوتن بۆ ئەندامانی گیراوی بنەماڵەکەی رۆڵێکیان بینیبێت بۆ هێنانە ئارای ئاشتیی و هێمنیی بۆ ئەم گرفتە . بەگوێرەی ویگرام و ویگرام ، شێخ بەخۆشییەوە ئەم کارەی بۆ هەوڵی دۆستانەی بەریتانییەکان گێڕایەوە ، بەڵام نووسەران ئەوە ئاشکرا دەکەن کە هەوڵی نازم پاشا بنەڕەتیی بوو واپێدەچێت شێخ هاوسۆزییەکی دیکەی بۆ خۆی بەدەستهێنابێت ئەویش ئەسعەد پاشای ئەلدروزییە کە فەرماندەی دوازدە تیپی جەنگاوەربوو ، کە ماوەیەکی کەم وەك والی موسڵ راژەی کرد و دیدێکی ئاشتییخوازانەی لەهەمبەر شێخ هەبوو . وادەردەکەوێت ئەسعەدپاشا پێشنیازی ئەوەی کردبێت بە شێوەی مەجیدیی پاداشتی شێخ بدرێتەوە. البريفكاني ، ٨ ـ دملوجي ، ٩٨ .

Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"152-54; Wigram and Wigram , 140.

[58] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"152-54. Wigram and Wigram , 140-41.

کاریگەریی مەزنی ئەو سەرکەوتنەی شێخ ، شانبەشانی هەوڵ و تێکۆشانی سەفوەت بەگ کە لەلای خۆیەوە حکومەتی هاندەدا وەڵامێکی ئەرێی بە داواکانی شێخ بداتەوە ،بەرهەمی خۆی هەبوو . ئەمجارەش شێخ بە بێتاوان راگەیەندار ، ژێنراڵ محەمەد فازیل پاشا وەك فەرماندەی تیپێکی سەربازیی بۆ بەغدا گواسترایەوە . دوای ئەم رووداوانە ، شێخ بەرەو گوندی بارزان کەوتە رێ ، خانووەکەی نۆژەن کردەوە ، خوێندنگایەکی بۆ منداڵان کردەوە ، حکومەت بە خێرایی سەبارەت بە داواکردنی مامۆستا وەڵامی دایەوە و کەسێکی لێهاتووی لە موسڵەوە بۆ رەوانە کرد ، هەروەها قایمقامێکی دامەزراند تا ناوچەی بارزان بە رێوەببات.[59]

بۆ ماوەی دوو ساڵی داهاتوو ، وادەردەکەوێت پەیوەندییەکانی شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ حکومەت و هاوسێیەکانیشیدا دۆستانە و هێمنانە بێت . وێڕای ئەوەی شێخ پەیوەندییەکی فرە باش و تایبەتیی لەگەڵ شێخ سەید تەهای دووەمی شەمدیناندا هەبوو ، ئەوەی کە چالاکییەکانی جێی نیگەرانیی حکومەتی عوسمانیی بوون . هەواڵی ئەوە هەیە کە کە سەید تەها ، پاش سەردانی رووسیا ، بارەگای خۆی لە گوندێکی کوردستانی ئێراندا دامەزراندبوو کە ناوی (راجان) و ناوچەکەش لە بندەستی داگیرکاریی رووسەکاندا بوو ، سەید تەهاش لەسایەی پاراستنی رووسەکاندا بوو . هەربۆیە جێگای سەرسوڕمان نیە کە دەسەڵاتدارانی عوسمانیی بەگومان و وریاییەوە تەماشای دۆستایەتیی نێوان ئەم دوو سەرکردە بەهێزەیان دەکرد و لە نزیکەوە چاودێریی چالاکییەکانیان دەکردن . ئەو نامانەی لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا ئاڵوگۆڕ دەکرا بە ئاشکرا بۆنی خیانەتی لێدەهات . لەیەك لەو نامانەدا شێخ عەبدولسەلام گوتویەتی:" ئەو رۆژە هاتووە کە کورد پێویستی بە پشتگیریی لایەنێکی بەهێز و بەتوانا بێت ، ئەو پشتگیرییەش بە دڵنیاییەوە لە رووسیاوە دێت ."[60]

سەفوەت بەگ ، لایەنگری سەرسەختی شێخ ، ئەو کەسەی شێخی لە فێڵ و غەدری عوسمانییەکان وریاکردەوە و ئامۆژگاریی کرد بەرەو موسڵ نەچێت ، لەوەشی تێپەڕاند و پێشنیازی ئەوەی کرد شێخ چاو لە سەیدتەها و عەبدولرەزاق بەدرخان بکات

[59] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"154.

[60] Ibid.

و بەرەو رووسیا بڕوات .[٦١] ئەم پەیوەندیی و چالاکییانە تا سەر لە حکومەت شاراوە نەبوو ، فازیل پاشای داغستانیی کە هەرگیز لە وریاکردنەوەی حکومەت دژی شێخ و سەفوەت بەگ رانەدەوەستا ، هیچ کاتێکی لەکیس نەدا تا ئەو دووانە بە پسێنەری جڵەوی وەفاداریی و هەوڵی یاخیبوون دژ بە دەوڵەت تۆمەتبار بکات.[٦٢]

وا پێدەچوو سلێمان نەزیفی والی نوێی موسڵ کە تورکە لاوێکی بەجۆشبوو ، خۆی گرێکردبێتەوە تا هەموو ئەوانە سەرکوتبکات کە دژی بیروبڕوا و سیاسەتی رژێمی نوێن .[٦٣] بێگومان ئەو کەسایەتییەکی وەك شێخی بە نابەجێییەکی مێژوویی دەزانی کە لە دەورانی نوێدا کەڵکێکی نەدەگرت و شوێنێکی لە هاوکێشەکاندا پڕنەدەکردەوە . یەك لە کارە بەراییەکانی ئەوە بوو بانگی شێخی کرد بێتە موسڵ و لەبەردەمیدا ئامادەبێت .کاتێك نامەکەی وەڵامێکی نەبوو ، شێخی وەك یاخییەك ناساند و هێزێکی سەربازیی و چەند دەستەیەك چەکداریی خێڵەکی ناردەسەر . پاش مانگێك شەڕ و کوشتاری سەخت کە ژمارەیەك سەرباز و موریدی تێدا کوژران . شێخ تێکشکێنرا و سنووری بەزاند و بەرەو ورمێ هەڵات ، لەوێ پەیوەندی بە رووسەکانەوە کرد.[٦٤]

## گرتن و هەڵواسینی شێخ عەبدولسەلامی دووەم

لەسەرەتای ساڵی ١٩١٤ دا ، کاتێك شێخ عەبدولسەلام لەسەر سنووری تورکیا-ئێران خەریکی سەردانی سمکۆ ئاغای سەرۆکی بەناوبانگی خێڵی شکاك بوو ، شێخ عەبدولسەلام لەلایەن دەستەیەکی خێڵەکیی شکاکەوە پەلاماردرا و گیرا ، ئەوانە بە ئومێدی وەرگرتنی ئەو پاداشتەی کە دەسەڵاتدارانی عوسمانیی لەبەرامبەر سەری شێخ دایانابوو ، شێخیان دایە دەست والی وان .[٦٥] شێخ لە ژێر چاودێریی هێزێکی پاسەوانی

---

[61] هەواڵی ئەوە هەیە کە سەفوەت بەگ خۆی سنووری بڕیبێت و ماوەیەکی کەم پاش ئەوە پەیوەندیی بە رووسەکانەوە کردبێت .Ibid.

[62] Ibid.

[63] بۆ زیاتر لەمەڕ ئەو سیاسەتانەی سلێمان نەزیفەوە وەك والی موسڵ گرتبوویەبەر بڕوانە :دەملوجي ، ٩٨-١٠٥

[64] Nikitine ,"Les Kurdes racontes,"154.

[65] Ibid.

توندوتۆڵدا رەوانەی موسڵ کرا ، لەوێ پاش ئەوەی ماوەیەک لە زینداندا راگیرا ، لەگەڵ سێکەس لە دەستوپێوەندەکانی هەڵواسران .[٦٦] بەپێی دملوجی ، سلێمان نەزیف فەرمانی هەڵواسینی شێخی دا پێش ئەوەی لە ئەستەمبوڵەوە مۆڵەتی پێویست بۆ ئەو کارە وەربگرێت .[٦٧]

لەهەمان کاتدا ، والی دژی شێخەکانی دیکەی ناوچەی موسڵ کەوتەخۆ ، شێخ نور محەممەدی دهۆک ، وێڕای پیریی و ئەو تەمەنە زۆرەی هەیبوو ، چونکە لەگەڵ شێخ عەبدولسەلامدا بەشداریی نووسینی ئەو یاداشتنامەیەیان کردبوو کە پێشتر بۆ

---

[66] گێرانەوەیەکی وردی رووداوی هەڵواسینی شێخ عەبدولسەلام و هاورێیانی لەلایەن دملوجییەوە پێشکەشکراوە ئەوەی ئەو دیمەنە سەرنجراکێشەی بۆ راگواستووین دملوجی کە رقی والی هەڵسانەوە بۆیە ئەو کاتە لەو زینداندا بووە کە شێخ عەبدولسەلامی تێدا گیراوە بەگوێرەی ئەو ، کاتێک چوار سێدارەیان دامەزراند ، زیندانییەکان بەرەو مەیدانی زیندانەکە دەربەرین ، لەوێ پیاوێکی رێزداری ئاینیی لێبوو کە ئەمینەفتدیی فەرماخیی بوو بۆ ئەوەی ئەرکی خۆی لە خوێندنەوەی (تەلقینی شەهادەت) جێبەجێبکات کە شێخیان هێنایە بەر سێدارە ، دەگوترێت گوتوویەتی " دەمەوێت قسەیەک لەگەڵ والی بکەم " کاتێک پێیان گوت دەتەوێت چی پێ بڵێیت ، وەڵامی دایەوە :" مردن و ژیان بۆ من وەک یەکە ، بەڵام مردنم بەم شێوەیە لە بەرژەوەندیی حکومەتدا نیە ئەگەر ژیانم بپارێزرێت ، ئەوا هاوکارییەکی سوپا دەخەمە سەرشانم -باری هەزار هێستر ." ئەوەی کە گوتمان لەکاتێکدا بوو تورکیا خەریک بوو تێکەڵ بە جەنگ بێت . لە جیاتی والی شێخیان ئاگادار کردەوە کە "مردن چارەنووسێتی " پاشتر سەرە هاتە سەر سێ هاورێکەی کە دوو خزمەتکارەکەی ، مەحموود و موسا بوون ، هەروەها مەحموود ئاغای هەیاشتیی سەرەکخێڵی رێکانی . محەممەد گەنجێکی بیست ساڵانە بوو ، ئازایانە چووە بەر پەتی سێدارە و دەیقیژاند " بژی خودانی بارزان ! ئەز قوربانی ویمە " مەحموود کە پیاوێکی شەست ساڵانە بوو گوتی :" خۆڵ بەسەری حکومەت ! بە مردنی من بارزانیی خەلاس نابن. " مەحموود ئاغای هەیاشتیی کە تەمەنی حەفتا ساڵ بوو گوتی :" من زێبارییی نیم ، من مەحموود هەیاشتییم ، مەمخنکێنن ، من هیچم نەکردووە."کاتێک پەتەکەیان کردە مل لەبەر خۆیەوە گوتی :بسم الله الرحمن الرحيم"بڕوانە:دملوجی،١٠٢-١٠٤..155."Les Kurdes racontes," Nikitine

[67] دملوجی جەخت لەوە دەکاتەوە کە والی بۆ پاساودان بە کارەکەی پێشانیدا کە "راپەڕینێک" بەدەستی شێخ بەرپاکراوە و شوێنکەوتەکانی ویستوویانە بەهێز لە زیندانی دەربێنن پاش سەرکوتکردنی ئەو راپەڕینەی ئیدعای کردووە ، شێخ لەلایەن دادگای سەربازییەوە تاوانبارکراوە و سزای مەرگی بەسەردا دراوە ، ئەوەش وایکردووە بتوانێت هەر هەوڵێک لەلایەن کارمەندانی باڵای ئەستەمبووڵەوە بۆ رزگارکردنی پوچەڵ بکاتەوە . بە گوێرەی دملوجی ، سلێمان نەزیف تەرمەکەی شێخ عەبدولسەلام و هاوەڵانی لە شوێنێکی نادیاردا شاردۆتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە مەزارگەی بارزانیان و رووی تێنەکەن دملوجی ، ١٠٤-٥.

ئەستەمبوڵیان ناردبوو و ئاماژەی بە چاکسازیی تێدابوو ، پەلکێشی موسڵ کرا و خرایە زیندانەوە ، پاشتر هەر لەوێدا گیانی سپارد . واپێدەچێت سلێمان نەزیف ویستبێتی هەمان چارەنووسیش بکاتە بەشی شێخ بەهانەدینی بامەڕنی ، بەڵام پاش ئەمسەر و ئەوسەرێکی زۆر رازیکرد وازی لێبهێنێت .[٦٨]

## راپەڕینی بەدلیس

لەساڵی ١٩١٣ دا ، راپەڕینێکی بایەخداری کورد کە لە لایەن چەند سەرکردەیەکی ئایینییەوە رێبەرایەتیی دەکرا ، لە ناوچەی بەدلیس قەوما.[٦٩] پازدەساڵ پاش ئەوە ، نووسەرێکی بەناوبانگی تورک ، رووسیای وەک هاندەرێکی ئەو راپەڕینە تاوانبار کردووە ، ئەو هێمای بەوە داوە گوایە ئەم راپەڕینە دەستومردانێکی رووسیا بووە لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانیی . بەگوێرەی ئەم نووسەرە :" یاخیبوونەکەی بەدلیس ، لەلایەن کۆنسوڵی هەرێمی رووسیاوە ئامادەکرابوو ، کە دەبوایە کۆمەڵکوژیی ئەرمەنیی بەدوادا بهاتایە ، بۆ ئەوەی بیانوو بۆ دەستێومردانی چالاکی رووسەکان دابتاشێت .ئەوەش بەتەنیا دەرفەتێك بوو دەبوایە خۆپارێزیی لەهەمبەردا کرابا ."[٧٠]

راپەڕیوە کوردەکان کەوا دەردەکەوت سەرکەوتنێکی سەرەتاییان بەدەستهێنابێت ، دەگوترێت کە گەیشتبێتنە شاری بەدلیس .[٧١] هاتنی هێزی پشتگیریی

---

[68] هەمان سەرچاوە ،٩٩ ، ١٦٥-٦٧

[69] وێرای ئەو راستییەی کە چەند نووسەرێك ئاماژەیان بەم راستییە داوە ، بەڵام ئەو بڕە کەمە زانیارییەی دراوە زۆرجار بە شێوەیەکی سەیر لەگەڵ ناو و پێگەی سەرکردەی راپەڕینەکە نایەتەوە  ناوەکان بە شێوەی جیاواز دەردەکەون وەك : مەلا سەلیم ، شەهابەددین ، هەروەها عەلی ، خەلیفە سەلیم ، عەلی ئاغا . ئەوانەی لای سەفرستیان وەك پارتیزانی شێخ عەبدولقادری ئەفەریی دانراون ، هەرچەندە جەختی لەوە کردۆتەوە کە راپەڕینەکە لەلایەن شێخ سەعید عەلی خیزانەوە کە نزیك بدلیسە هاندراون و رێبەرایەتیی کراون زکي.خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٧٢

Nikitine .Les Kurdes , 195;Safrastian .72-74.

[70] Yalman , 209.

[71] Chirguh, La question kurde,19.Cf. Safrastian .74

ئەمانە دەڵێن کە شێخ سەعید عەلی شارۆکەی بدلیسی بۆ ماوەی حەوتوویەك گرتووە

وای لە حکومەت کرد راپەڕیوەکان لە شارەکە دووربخاتەوە و دواتریش راپەڕینەکە تێکبشکێنێت .[٧٢] شێخ سەلیمی سەرکردەی راپەڕینەکە ، ناچار بوو پەنا بۆ کۆنسولخانەی رووسیا بەرێت و لەوێ مایەوە تا تورکیا چووە نێو جەنگی یەکەمی جیهانییەوە . پاش هەڵگیرساندنی جەنگ و شەڕ و پێکدادانەکان ، تورکان چوونە نێو کۆنسوڵخانەکەوە و شێخ سەلیمیان گرت و بە بەرچاوی خەڵکەوە هەڵیانواسی .[٧٣]

---

[72] بەگوێرەی نیکیتین و نۆئێل ، راپەڕینەکە بە توندیی سەرکوتکرابوو

Nikitine ,Les Kurdes , 195: E.W. Noel , Note on the Kurds Situation,( Baghdad Government Press, 1919) ,3.

[73] بۆ رووداوەکانی ئەم راپەڕینە و گرتن و هەڵواسینی شێخ بڕوانە :زكي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٧٢.

Chirguh, La question kurde,19.

بەگوێرەی سەفەرستیان شێخ ئەو کاتە گیرا کە دەیویست بە هاوەڵی چوار کەس بەرەو چیاکانی دەروبەر هەڵبێت . پاش گرتنیان هەموویان هەڵواسران .

# بەشی شەشەم: سیاسەتی رووسیا لە حاست کورد

هەر لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە بەئاشکرا دەرکەوت کە داگیرکردنی قەفقاس لەلایەن رووسیاوە زوو یا درەنگ وادەکات ئەو وڵاتە مامەڵە لەگەڵ چەندین گەلی جیاوازدا بکات کە لە ناوچەی سنووری نێوان تورکیا و ئێراندا دەژین . یەك لە گرنگترین و بەژمارە زۆرترینی ئەو گەلانە کورد بوو. یەکەمین پەیوەندی بایەخداری رووسیا لەگەڵ کورد ، لەماوەی یەکەمین دەیەی ئەو سەدەیەدا ، وەك ئاکامێکی کێشەی ١٨٠٤-١٨١٢ ی نێوان رووسیا و ئێران روویدا . ئەو بەزین و تێکشکاندنەی لە شەڕەکانی ئەرپاچ (١٨٠٧) و ئەسلاندوز (١٨١٢) بەسەر ئێرانییەکاندا هات ، کە بە رێکەوتننامە ئابڕووبەرەکەی گولستان لە ١٨١٣ دا کۆتاییهات ، بەشێوەیەکی مەزن پلەوپایەی رووسیای لەنێو کورداندا بەهێز و بڵند کرد .[1]

لەساڵی ١٨٢٨دا ، جەنگی رووسیا-ئێران بەرەو کۆتایی چوو ، بەوەش بۆ ماوەی دەیە و نیوێك ئاشتیی باڵی بەسەر پەیوەندییەکانی رووسیا-ئێراندا کێشا . وێڕای ئەوەی تێکشکاندنی خێرای هێزە ئێرانییەکان بە زوویی ئەو وڵاتەی ناچار کرد داوای ئاشتیی بکات کە بە رێکەوتننامەی تورکمانچای لە ١٨٢٢دا ئەو ئاشتییە چەسپا . ئەم رێکەوتننامەیە گۆڕانێکی بەهێز بوو بەر ئێران کەوت ، چونکە نەك تەنیا بووەهۆی ئەوەی کە کۆتایی بە بوون و دەسەڵاتی ئەو وڵاتە لە کاروباری قەفقاسدا بهێنێت ، بەڵکو وەك سەرەتایەکیش بوو بۆ خۆبەدەستەوەدانی ئێران .[2] هەروەك چاوەڕوان دەکرا ، ئەم

---

[1] بەگوێرەی ئەم رێکەوتننامەیە ، ئێران بە تەواویی دەستی لە داواکارییەکانی لە ناوچەی قەفقاس هەڵگرت ، خاناتی قەرەباغ ، شێکی ، شیروان ، دەربەندی ، کوبا ، باکۆ و تالیشی بۆ رووسیا جێهێشت . هەروەها رێکەوتنەکە جەختی لە داگیرکاریی پێشووی رووسیا بۆ گەنجە (ئێلیزاڤێتپۆل) کردەوە . سەرباری ئەوەش ، ئێران بڕیاریدا کە کەشتیگەلە سەربازییەکانی لە دەریای قەزویندا ئەسوڕێنێتەوە

A. Dirr,"Gulistan," in Encyclopaedia of Islam ,1 st ed.,3:182.

[2] لەئاکامی ئەو رێکەوتننامەیەدا ، ئێران دەستی لە ئەریڤان و نەخجەوان هەڵگرت ، رازیی بوو ٢٠ملیۆن رۆبل (پێنج ملیۆن تمەن) قەرەبووی جەنگیی بدات کە دواتر کەمکرایەوە . لە هەمووی گرنگتر لەو رێکەوتننامەیەدا هاتووە ،

سەرکەوتنانەی رووسیا کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر کورد هەبوو . (سێر جێمس فرێزەر) کە پاش چەند ساڵێك لەو رووداوانە شەوێکی وەك میوان لەنێو ژمارەیەك کورددا لە باکووری رۆژئاوای ئێران بەسەر بردبوو ، چەند رووداوێکمان بۆ دەگێڕێتەوە تێیدا بێزاریی کوردان لەو سوکایەتیی و ریسواییە ئاشکرا دەکات کە لەلایەن سەردارە فارسەکانیانەوە دەرحەقیان دەکرێت .[3]

## سیاسەتەکانی میر پەسکویچ

دەشێت بگوترێت کە (میر ئیڤان پەسکویچ) بناغەدانەری سیاسەتی رووسیایە لەحاست کوردان . واپێدەچێت ئەو یەکەمین کارمەندی رووسیی بێت بایەخی ستراتیژیی مەزنی زەوییە کوردییەکانی درك پێکردبێت ، کە وەك رێڕەوێکی کراوەیە بەرەو ئیمپراتۆریی عوسمانیی و بەشەکانی دیکەی باشووری رۆژئاوای ئاسیا. ئەو بەهایەکی مەزنی بە جەختکردن لە بنیاتنانی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ جەنگاوەرە کوردەکاندا دەدا . ئەم رێڕەوە لە پلانەکانی میر سەبارەت بە داگیرکردنی ئەنەدۆڵ رەنگیدابووەوە . یەك لەو مەرجانەی کە ئەم پلانانەی لەسەر دارێژرابوو بریتیبوو لەوەی کە لەگەڵ سەرخێڵە کوردەکانی بەرزاییەکانی ئەرمینیا و دۆڵی فوراتی ژێرییدا پێکبێن و

---

رێکخستنی کاروباری رەعییەتەکانی رووسیایە . ئەم رێکەوتننامەیە بۆتە بنەمایەکی مێژوویی بۆ خۆبەدەستەوەدانی ئێران ، چونکە تەواوی رێکەوتننامەکەی دواتری نێوان ئێران و هێزە ئەورووپییەکانی دی لەسەر شێوازی ئەو رێکەوتننامەیە بوو .

V. Minorsky ,"Turkman-Cai," in Encyclopaedia of Islam ,1 st ed.,8:896.

[3] واپێدەچێت یەك لە بابەتە سەرنجڕاکێشە سەرەکییەکانی ئەو شەوە بریتیبوو لە گوێگرتن لەو گۆرانییانەی کوردان بە کۆمەڵ سەبارەت بەو جەنگەی ئەو دوایییەی نێوان رووسیا و ئێران دەیانگوت ، گۆرانییەکان گاڵتەجاریی بوون بە ئازایەتیی فارس و باسی لە دۆڕانی دەرباری ئێرانیی دەکرد ، ئەو گۆرانیانەی بە خۆشیی و لەنێو پێکەنین و کۆبوونەوەی کورداندا پێشوازییان لێدەکرا

Fraser,James Baille. A Winter s Journey (Tater) from Costantimopole to Teheran, with Travels Through Various Parts of Persia. London , 1838 , 1:308.

تێگەیشتنیان لە نێواندا هەبێت .[4]

لەگەڵ هەڵگیرساندنی جەنگی رووسیی-عوسمانییدا ١٨٢٨-١٨٢٩ ، میر پەسکویچ کە وا پێدەچوو بە بایەخێکی فرە و بە شێوەیەکی بەرچاو بیری لەو مەسەلەیە کردبێتەوە ، کەوتە ئەوەی بەرنامەی تۆکمە جێبەجێبکات . ئەو بە خێرایی کەوتە هەڵپە بۆ قۆزتنەوە و دەستبەسەرداگرتنی ئەو بێزارییەی لە نێو رەگەزە فیوداڵ و کۆنەپارێزەکان وەك ئاکامێکی سیاسەتە ریفۆرمیستەکانی سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩) دەرکەوتبوو .زۆربەی سەرۆکە کوردەکان ، بە تایبەت ئەوانەی لە ناوچە دووردەستە سنوورییەکاندا نیشتەجێبوون و تەواو سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو ، ئەمانە بە قووڵی لەو سیاسەتەی سوڵتان بێزاربوون و بە داهێنانێکی شووم و بەزاندنێکی ناشایستەی مافە میراتگرییەکانی خۆیان لەقەڵەمدەدا .[5]

میر پەسکویچ لە رێگەی سوود وەرگرتنێکی ژیرانە لە موسوڵمانەکان ، توانی ژمارەیەك لە سەرخێڵە کوردەکان بەلای خۆیدا رابکێشێت .[6] بۆ نموونە: حوسێن ئاغا ، خان یاخود سەرخێڵی بەناوبەنگی کوردانی یەریڤان ، لەکاتی دەستپێکردنی هێرش و پەلامارەکاندا ، پەیوەندیی بەرووسەکانەوە کرد و بە درێژایی ئەو هەڵمەتە راژەیەکی چاکی کردن. راژەی حوسێن ئاغا هەر هێندە نەبوو سێ‌هەزار سوارەی خۆی بە قازانجی رووسەکان بخاتە مەیدانی جەنگەوە ، بەڵکو سوود لە توانا و پلەوپایەی بەهێزی کرا بۆ

---

[4] دوو پێویستییە بنەرەتییەکەی تر بریتیبوو لە : جەمانی بەهێز و پتەوترکردنی بەرەی ئەنەدۆڵ و بەدەستهێنانی مسۆگەریی رەهای ئاشتیی لەگەڵ ئێران

Allen .W.E.D; and Paul Muratoff . Caucasian Battlefields: A History of the Wars on the Turco-Caucasian Border , 1828-1921. Cambridge: Cambridge Univ.Press,1953 , 32.

[5] هەرێوو ئەو نارەزایەتیی و تورەییەی کورد خۆی لەچەند راپەڕینێکدا لە سۆران ، بادینان ، بۆتان هەروەها باباندا بەرجەستە کرد هەمان سەرچاوە ، ٣١.

[6] بۆزیاتر لەمەڕ سەرکەوتنی رووسیا لە بەدەستهێنانی یارمەتیی سەرکردە خێڵەکییە کوردەکان لە جەنگی رووسیی-تورکیی ساڵی ١٨٢٨-١٨٢٩ بڕوانە:

Ushakoff, Aleksander Kleonakovich , Geschicht der feldzuge in der Asiatischen Turkei Wahrend der Jahre 1828 and 1829 ;Monteith ,William . Kars and Erzeroum with the Campaign of Prince Paskiewitch in 1828 and 1829.

شوێندانان لەسەر خێڵە کوردەکانی دیکە و لەو بوارەشدا هەوڵەکانی حوسێن ئاغا بایەخ و گرنگیی بنەڕەتیی خۆی هەبوو . بۆ نموونە ، کاتێک پاشای موسڵ فەرمانی لە دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە پێگەیشتبوو کە هێزێکی مەزنی سوارە لە دوازدەهەزار کەس ئامادە بکات ، حوسێن ئاغا ، پاشای هێنایە سەر ئەو باوەڕەی ئەو کارە نەکات و بێلایەن بووەستێت .[7]

(ویلیەم مۆنتیس) لەساڵی ١٨٥٦دا ، سەبارەت بە چالاکییەکانی حوسێن ئاغا دەڵێت:" ئەو لە ئاکامدا سەلماندی کە هاوپەیمانێکی کاریگەریی رووسەکانە دژی گەلەکەی خۆی ، هەروەها بەشێوەیەکی بنەڕەتیی لەسۆنگەی توانا و دەسەڵاتی ئەوەوە بوو کە پاشای موسڵ هاندرا لەگەڵ رووسەکاندا پەیمانی بێلایەنیی ببەستێت ، ئەو پەیمانەی ئەو بە تەواویی پشتگیریی لێکرد، هەرچەندە پاشا رێگەی بە پیاوەکانی نەدا کە لەگەڵ پیاوەکانی حوسێن ئاغادا بەرەو تورکیا پێشڕەویی بکەن ."[8]

پێدەچێت پەسکەڤیچ زۆر ژیرانە دوژمنایەتیی ئایینیی و رەگەزیی قۆزتبێتەوە ، چونکە ئەو سوودی لە ئەرمەنیی و ئێزیدییەکانیش دەبینی . حەسەن ئاغای سەرکردەیەکی خێڵەکیی ئێزیدیی ، یەکێک لەو سەرخێڵە کوردانە بوو بەوپەڕی بڕواوە راژەی رووسەکانی دەکرد .[9]

لە ژوونی ١٨٢٩دا ، پاش ئەوەی پەسکەڤیچ گەیشتە کۆپروکۆی ، ئەو شوێنەی زۆربەی هێزەکانی رووسیای تێدا کۆببووەوە ، لەوێ چاوی بە ژمارەیەک لە سەرخێڵە کوردەکان کەوت کە لە ناوچەکانی ئاگریداغ و پێنگۆڵەوە هاتبوون .[10] واهەردەکەوێت رووی لە هەرشوێنێک بکردایە پێشوازیی لێدەکرا ، بەگوێرەی (مۆنیس) :" لە هەموو لایەکەوە پێشوازیی گەرمی لێکرا ، بەگەکانی کورد دەچوونە لای و لە قووڵایی دڵیانەوە پێیاندەگوت : ئەرزڕۆم بگرە ئەوسا بەوپەڕی ویست و ئارەزووەوە خۆمان و خێڵەکانمان دەبینە بەشێک لە ئێوە ."[11]

---

[7] Monteith,220-21,267.

[8] Ibid.,264.

[9] Ushakoff,2:18,also 1:318.

[10] Allen and Muratoff,39.

[11] Monteith,263-64.

سەرکەوتنی پەسکەفیچ لە بواری بەستنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ کورداندا جۆرە دابەشبوونێکی پێکهێنابوو .مۆنیس ئاماژەی بەوەداوە کە ئەو کوردانەی راژەی سوپای رووسیان دەکرد فرە زێدەتر بوون لەوانەی راژەی سوپای تورکیان دەکرد .[12] وێرای ئەو پشتگیرییە سەربازییەی لەلایەن ژمارەیەك لە خێڵەکوردەکانەوە پێشکەش دەکرا ، هێندێك لە خێڵەکانی دی یارمەتیی هێزەکانی رووسیان دەدا و کاتێك بە ناوچە کوردییەکاندا تێدەپەڕین ، خواردن و پێویستییەکانی دیکەیان بۆ دابین دەکردن .[13]

هەرچەندە ، هیوای پەسکەڤیچ بە بەدەستهێنانی هاوسۆزیی کوردەکان لەبەرامبەر هیوای دەسەڵاتدارانی عوسمانییدا لاوازتر بوو ، هەواڵی ئەوەش هەیە کە کوردان لە نێوان هەردوو لایەنە شەڕکەرەکەدا لە بارێکی دوودڵیی وناجێگیرییدا بوون . بە پێی یەك لە سەرچاوەکان :" کوردان وەك هۆکارێکی گومانـاویی مابوونەوە ، پەسکەڤیچ سەبارەت بەو سیاسەتە ژیرانەیەی لەهەمبەر کورداندا گرتبوویە بەر ، شایەنی شانازیی بوو .دوورخستنەوە و بێلایەنکردنی ئەوان هەموو سوودێکی بە پەسکەڤیچ گەیاند، (ناپیر) پاش چل ساڵ دواتر لە ئەبسینیا سوودی لێوەرگرت ، بەوەی خەڵکێکی ناکارا بەڵام دەگونجێت مەترسیدار ، بە شێوەیەکی رێژەیی رێگەیان بەهێزێکی بچووکدا پێشڕەویی بکات ."[14]

## کورد و جەنگی رووس-تورك

جەنگی ١٨٢٨-١٨٢٩ ، خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی پەیوەندییەکانی رووس و کورد پێکدەهێنێت . ئەو سیاسەتە دانا و ژیرانەیەی لەلایەن پەسکەڤیچەوە لەماوەی ئەو کێشەیەدا لەحاست کوردان پەیڕەویی دەکرد ببووە نموونەیەك و بە بایەخێکی زۆرەوە لە تەواوی جەنگەکانی رووس -تورکەوە پەیڕەویی لێدەکرا

[12] Ibid.,264.

[13] Allen and Muratoff,39.

[14] Ibid.,44.

[15]. هەڵگیرساندنی جەنگی کریمەن ئەو دەلاقەیەی ئاشکرا کرد کە رووسیا لە گیانی وەفاداریی و هاوسۆزیی کوردە رەعییەتەکانی تورکدا کردبووی . لەماوەی ئەم جەنگەدا ، دوو تیپی کوردیی لەپاڵ هێزەکانی رووسیادا دژی سوپای عوسمانیی جەنگان ، [16] هەروەها راپەڕینێکی مەترسییدار لە ناوچەی بۆتان بەسەرکردایەتیی میر عیزەدین شێر تەقییەوە . [17] بەهەمان شێوە ، لەماوەی جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ دا ، چەند لکێکی کوردیی بەشداریی هەڵمەتە سەربازییەکەی سوپای رووسیان لە بەرەی قەفقاسدا کرد [18]. کاتێك جەنگەکە خەریك بوو کۆتایی دەهات ، حوسێن پاشا و عوسمان پاشا ، کوڕانی میر بەدرخانی مەزن ، راپەڕینێکیان دژی دەسەڵاتدارانی عوسمانیی تەقاندەوە دەستیان بەسەر زۆربەی ناوچەی بۆتاندا گرت و بۆ ماوەی نۆمانگ سەرکەوتووانە لە بندەستی خۆیاندا هێشتیانەوە . راپەڕینەکەیان تەنیا وەختێك کۆتاییهات کە دووبەرەکیی و ناکۆکیی تێدا دەرکەوت ، هەرچەندە هێزی سوپا نەیتوانی شکستی پێبهێنێت . [19]

ئەو سەرکەوتنانەی سوپای رووسەکان لەماوەی جەنگەکانی رووس-تورکدا بەدەستیهێنا ، کاریگەریی زۆری لەسەر کوردەکان جێهێڵا . کوردە عەلەوییەکانی چیاکانی دەرسیم کە پابەندی ئایینزای شیعەگەرایەتین ، لە هەوڵێستێکیاندا بۆ لێکدانەوەی توانای هێزە نەبەزیوەکانی رووسیا و سەرکەوتنی بەردەوام و هەمیشەییان ، لەو بڕوایەدا بوون کە رووسەکان بە شمشێرەکەی عەلی دەجەنگن ، ئەو شمشێرەی کە عەلی بە متمانەوە بە رووسەکانی داوە . [20]

---

[15] گرنگترین کار دەمەر رۆڵی کورد لە جەنگەکانی رووسیی- تورکییدا لە ( Kurdi v Voinakh Russi ) ئەلریانۆڤدا بەرجەستەیە . ئەم کارەی کە لە ساڵی ١٩٠٠ لە تفلیسی چاپ و بڵاوکرایەوە ، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا نیە

[16] Minorsky . "Kurds."

[17] Ibid; Nikitine ,Les Kurdes,194 ; زكي،خلاصة تاريخ الكرد .٢٥٥-٥٦

[18] Greene,F.V.The Russian Army and Its Compaigns in Turkey in 1877-1878,384-85.

[19] Chirguh, La question kurde,17-18; Minorsky . "Kurds."

[20] Nikitine ,Les Kurdes,242.

پێدەچێت ئەمە ئاماژەکردنبێت بۆ شمشێری (زولفەقار)ە کەی ئیمامی عەلی . دەگوترێت ئەمە شمشێری پەیامبەر

هەرچەندە هەڵەیکی مەزنە گەر وا بێنینە پێش چاو کە رووسەکان تەواوی گەلی کوردیان بەلای خۆیاندا راکێشابوو ، زۆرینەی کورد و سەرکردەکانیان وەک وەفاداری سوڵتان مابوونەوە و لەپاڵ تورکدا دەجەنگان . چ وەک سەرباز لەنێو سوپادا یاخود وەک هێزە خێڵەکییە غەیرەنیزامییەکان . لە جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ ، زۆر لە کوردان وەک دەستوپێوەندەکانی دیکەی عوسمانیی ، بەریستی خۆیان لە سوپای عوسمانییدا ، هەروەها وەک هێزێکی مەزنی خێڵەکیی بەرابەری شێخە کوردەکانی وەک : شێخ عوبەیدوڵڵا و شێخ ناسری تیلۆ ، جەنگان .

لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانییدا ، کوردان بێ دوودڵی بوونە هاوپەیمانی تورکان ، وێڕای تێکڕای ئەو هەوڵانەی رووسەکان بە ئاراستەی پێچەوانە دەیاندا ، کوردان لەم هەڵبژاردنەیاندا بەشێوەیەکی مەزن کەوتبوونە ژێر کاریگەریی پڕۆپاگەندەی ئیسلامچێتیی و راگەیاندنی جیهاد لەلایەن خەلیفەی عوسمانییەوە ، شانبەشانی چالاکیی ژیرانەی کارمەندە نهێنییەکانی ئەڵمان و پایەبەرزی سوپای ئەڵمانیی .

## سیاسەتی رووسیای سزاریی لە حاست ئەرمەنەکان

رووسیای سزاریی بە هەمان ئەندازەی بایەخدان بە ئەرمەنەکان سیاسەتێکی ئەوتۆی لەحاست کورداندا نەبوو ، ئەوەش پەیوەندیی بە هاوسۆزیی و لایەنگریی رووسەکان بۆ ئەرمەن لەلایەک و ناکۆکیی و دژبەیەکیی بەرژەوەندییەکانی ئەرمەن و کورد لە لایەکی دیکەوە هەیە و ئەگەرێکی بەو جۆرەی مەحاڵ دەکرد . لە سۆنگەی ئەوەشەوە ، رووسەکان بۆ ماوەی چەندین ساڵ سیاسەتێکی کوردانەی درێژخایەن نەبوو کە ئامانجەکەی بە باشیی دیاریکراوبێت . ئەو سیاسەتە تەنیا کاتی جەنگەکان خۆی دەردەخست ، ئەویش ناچارییەک بوو بە ئامانجی راکێشانی کورد بەلای رووسیا یاخود لانی کەم لە بێلایەنییان دڵنیابن و لەو بوارەدا زۆرجار سەرکەوتنیان بەدەستدەهێنا . مامەڵەکردنی رووسیای سزاریی لەگەڵ کورد بەگشتیی بۆ بەدیهێنانی پێکهاتنێکی

---

بووە کە لەشەڕی بەدر وەک پاتاڵ دەستی کەوتووە و دواتر بە عەلی بەخشیوە . بۆ زیاتر :

E. Mittwoch . Dhul-Fakar." in Encyclopaedia of Islam .I st ed ..1:283-85.

کاتیی بوو لەگەڵ سەرخێڵە کوردەکان و ئامانجێکی دیارییکراو و سنووردارى هەبوو . هەرچەندە ململانێی بەردەوام لەگەڵ تورکاندا ، لە کۆتاییدا هانی رووسەکانیدا بەدوای پێکهاتن و لێکتێگەیشتنێکی بەرفراوان و گشتیی لەگەڵ خێڵە جەنگاوەرە کوردەکاندا بگەڕێن ، ئەوانەی بەشێوەیەکی فرە چڕ لەکەنار ئەو سەرەڕێیانەدا نیشتەجێبوون کە بەرەو خاکی عوسمانیی تێدەپەڕی .

سیاسەتی رووسیا لەحاست کورد تا دوا چارەکی سەدەی نۆزدەیەم قاڵبێکی دیارییکراو و ئاشکرای بەخۆوە نەگرت ، تەنیا ئەو کاتە خەریکبوو دەبووە سیاسەتێکی بناغەبۆدارێژراو و ئامانجداری تۆکمە ، کاتێك دوو رووداوی پەرەسەندووی راتەکێنەر کە هەڵقوڵاوی جەنگی یەکەمی جیهانیی بوون رووسیایان هەژاند ، ئەویش راگەیاندنی جیهاد لەلایەن تورکیاوە دژی رووسیا و هەروەها شۆڕشی رووسیا بوو . بۆ ئەوەی هێندێك سەرنجمان سەبارەت بە هەڵوێستی رووسیا لە هەمبەر کورد و دەرکەوتنی پلەبەپلەی سیاسەتی کوردانەی ئەو دەوڵەتەمان دەستکەوێت ، لەوانەیە کورتە گفتوگۆیەك سەبارەت بە سیاسەتی رووسیا لەحاست ئەرمەن ، پێویستییەك بێت .

## پشتگیریی رووسیا لە کێشەی ئەرمەن

کێشەی ئەرمەن ، کە لە ماوەی زۆربەی سەدەی نۆزدەیەم و بەشی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بۆ پەیوەندییەکانی رووس –تورك وەیشوومەیەك بوو ، بەشێوەیەکی ژیرانە بۆ ئامرازێکی بایەخداری سیاسەتی دەرەوەی رووسیا پەرەیسەند . بەگوێرەی (لابانۆڤ رۆستۆڤسکی) سیاسەتی ئەرمەنی رووسیا مینەی دووئامانجی بنەڕەتیی دەکرد ، یەکەمیان بریتیبوو لە پاراستنی ئەرمەنەکان ، کە هاندەری لەبەرچاوگرتنی مرۆیی لەپشت بوو شانبەشانی لەبەرچاوگرتنی سیاسەتی ناوخۆ .[21] دووەمیش بریتیبوو لە

---

[21] لابانۆف-رۆستۆفسکی لە ١٩٣٣دا ئاماژەیان بەوەداوە کە رووسەکان لەپێناوی هێورکردنەوەی ئەرمەنییەکانی خۆیان ئەو سیاسەتەیان گرتۆتەبەر . ئەوانەی " بێزارانە کاردانەوەیان لەحاست ئەو ئەهامەتییانە پێشاندا کە براکانیان بەدرێژایی سنوور بە دەستییەوە دەیان ناڵاند "

Andrei Lobanov-Rostovisky . Russia and Asia ( New York: Macmillan. 1933). 201.

ئەهێشتنی هیچ ئەگەرێکی دەستێوەردانی هێزە رکابەرەکان بەناوی ئەرمەنە چەوساوەکانەوە ، دەستێوەردانێکی وا کە دەبێتە جەمانێکی مەترسیدار بۆ ئەو ناوچانەی نزیکن لە هەرێمەکانی قەفقاسی رووسیی .[22] ئەم دوو ئامانجە پێویستە سێیەمیشی بخرێتە سەر کە بریتیە لە لاوازیی تورکیا و جیابوونەوەی کۆتایی هەرێمە ئەرمەنییەکان لە رۆژهەڵاتی تورکیا ، پاش ئەوەی نموونەیەکی وەها لە بەلقان هاتبووەدی .

گرتنەخۆی کێشەی ئەرمەن لەلایەن رووسیاوە بە شێوەیەکی لێزانانە بووەهۆی سەپاندنی ویستێکی زێدەتری رووسیا بە سەر چارەنووسی تورکیا و هەروەها بیانوویەکی گونجاوی دایە دەست تا لەو رێگەیەوە فشاری بەردەوامی خۆی بکاتە سەر دەروازەی باڵا . رووسیا بۆ ئەوەی لە مامەڵەکردنی تورکیادا دەستی کراوەتر بێت ، ژیرانە سوودی لە پشتگیریکرنی خۆی بۆ ئەرمەنە چەوسێنراوەکان وەرگرت . بۆ ئەوەی رای گشتیی ئەورووپا بە قازانجی خۆی رابکێشێت .

هەروەها گرتنەخۆی پرسی ئەرمەن دەبووە هۆی راکێشانی سۆز و پشتگیریی تێکڕای ئەرمەن لە هەر شوێنێك بن . بە پلەی یەکەم ، رووسیای لە وەفاداریی و لایەنگریی ئەرمەنە دەستوپێوەندەکانی خۆی دڵنیاکردەوە ، ئەوانەی بەزۆر لە ناوچە هاوسنوورییەکانی تورکیا نیشتەجێبوون . دووەم ، ئەمە ئەرمەنەکانی تورکیای والێدەکرد بەچاوی رزگارکەر سەیری رووسیا بکەن و هانی ژمارەیەك لە سەرکردەکانی دان کە لەگەڵ رووسیا پرسێکی هاوبەشیان هەبێت .سێیەم ، پشتگیریی کۆمەڵەی رەوندە ئەرمەنییە توانا و دەسترۆیشتووەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، ئینگلتەرا ، فەرەنسا ، ئیتالیا و هەروەها ژمارەیەك وڵاتانی دیکەی بەدەستهێنا .

دیارە مایەی سەرلێتێکچوونە گەر پێمانوابێت تەنیا هۆکارە خۆخواز و نادیارەکان رووسیایان هانداوە تا پرسی ئەرمەن بگرێتەخۆ . راستییەکەی ئەوەیە کە جەماوەری رووسیا و تەنانەت حکومەتی سزارییش لە سایەی هۆکاری بنەڕەتیی

---

[22] Ibid.

بەقسەی لابانۆڤ-رۆستۆڤسکی:" پشتگیریکردن و بەدەستهێنانی کێشەکەیان لەلایەن بەریتانییەکانەوە دەبووە هۆی فراوانبوونی تێخزانی دەسەڵاتی بەریتانییەکان لە ناوچەیەکی زۆر بایەخداری سنووری قەفقاس لە وەختێکدا کە رکابەریی و ململانێی نێوان هەردوولا لەو پەڕی توندییدا بوو . Lobanov-Rostovisky.201.

مرۆڤدۆستانە و باوەڕی کریستییانەی هاندرابوون . هەروەها ئیسپانیا کە وڵاتێکی ئایینگەرای ئەورووپایە ، رووسیاش هیچ کات ئەو گیانە کریستیانییەی لەدەستنەدابوو کە لە ئاکامی چەند سەدەیەک هەژموونی داگیرکەرانێک کە خاوەن رەگەز و ئایینی ناوازە بوون ، پەیدا ببوو . واچاکە ئەوە بەبیربهێنینەوە کە بە پلەی یەکەم لەو هەستە ئایینییە توندوتیژەی جەماوەری رووسیاوە سەرچاوەی گرتبوو کە دۆقی مەزنی مۆسکۆ لە یاجگری خانەوە ببووە پاڵەوانی ئارسۆدۆکسی رووسیی . لەبەرچاونەگرتنی ئەم راستییە ، وا لە مرۆ دەکات سەبارەت بە هێزە پەرگرەکان لە مێژووی رووسیادا بەدحاڵبێت .

## هۆکارەکانی گۆڕینی سیاسەتی رووسیا لەهەمبەر ئەرمەنییەکان

سیاسەتی رووسیا لەهەمبەر ئەرمەنەکان هەر زوو پاش جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ گۆڕانێکی بایەخداری بەخۆوە بینی . ئەم گۆڕانە لە ئاکامی ئەو پەرەسەندنە گرنگانەوە بوو کە بەدوای جەنگەکەدا هاتن ، ئەوەی کە لەو دەمەدا کاریگەریی لەسەر سیاسەتی رووسیا لەهەمبەر ئیمپراتۆریی عوسمانیی و کەمینە نەتەوەییە جۆراجۆرەکانییەوە هەبوو . پەیوەندییەکانی رووسیا لەگەڵ زلهێزەکاندا ، هەڕەشەی ئاژاوەگێڕی چەپگەراکان لەنێوخۆی وڵات ، دەرکەوتنی گیروگرفت و ئاڵۆزیی لە چۆنێتی مامەڵەکردن رەعییەتە بولگاریی و ئەرمەنییەکاندا ، ئەمانە بە پلەی جیاواز لەم گۆڕانە دا بەشدارێتی هەبووە . کورتە وتووێژێکی ئەم پرسانە پێدەچێت لە باشتر تێگەیشتنی هەڵوێستی رووسیا لەهەمبەر ئەرمەن و کێشەکەیان ، یارمەتیمان بدات .

لە پێناو پاراستنی ئاشتییدا ، کە لە ئاکامی ئەو گرفتە جۆراوجۆرانەی وەک دەرئەنجامێکی سەرکەوتنەکەی رووسیا لە جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ بەسەر ئیمپراتۆریی عوسمانیی ، تووشی هەڕەشە و مەترسییەکی توند هاتبوو ، ئۆتۆڤۆن بسمارک پێشنیازی بەستنی کۆنگرەیەکی بۆ زلهێزەکان لەبەرلین کرد . لەو کۆنگرەیەدا زلهێزەکان کە بسمارک سەرۆکایەتیی دەکردن ، توانیان رووسیا لە چنینەوەی بەری سەرکەوتنەکەی بێبەشکەن . سەبارەت بە هەڵوێستی ئینگلیزەکان جگە لە جەختکردنەوە لەسەر دیپلۆماسییەتە

کۆنەکە کە پێی لەسەر یەکێتی و سەروەریی ئیمپراتۆریی عوسمانیی لەبەرامبەر چاوتێبڕینی رووسیا دەکردەوە ، چ شتێکی نوێ لەگۆڕێدا نەبوو . بەڵام هەڵوێستی نەمسا-مەجەڕ و هەروەها ئاکار و هەڵسوکەوتی بسمارکیش لە کاتی کۆنگرەکە و دواتریش ، فرە لە دڵنیاییەوە دوور بوو . رووسیا کەوتبووە پەراوێزەوە ، نەك لەبەر ئەوەی تەنیا ئینگلتەرا بە روویدا وەستابوو ، بەڵکو هەروەها دوو دۆستەکەی کە پێشتر لە (دێریکیا سێرپۆند) پشتگیرییان کردبوو ، واتە ئەڵمانیا و نەمسا-مەجەڕ ، دەرکیان بەوە کرد ئەو پشتگیرییە چیدی راژەی ئامانجەکانیان ناکات .[23] ئەو شێوازەی کە بەهۆیەوە بەری سەرکەوتنە سەخت و خوێناوییەکەی رووسیایان لێ پووچەڵ کردەوە ، لە سەراسەری ئیمپراتۆرییەکەدا مایەی بێزاریی و بێهیوایی بوو .[24]

گرفت و ئاڵۆزیی نێوخۆش بووە سەرباری ئەو شکستە تاڵە دپلۆماسییە . ئەو شەپۆلە ئاژاوەگێڕییە چەپگەراییەی لە ماوەی جەنگدا لاواز و رێگەی لێگیرابوو ، سەلەنوێ بە توندوتیژییەکی زێدەترەوە سەریهەڵدایەوە و بە کوشتنی ئەلێکساندەری دووەم لە ١٨٨١دا گەیشتە لوتکە . ئەم رووداوە ئاسەوارێکی قووڵ و بەردەوامی لەسەر کوڕەکەی و جێگرەکەی هەبوو کە ئەلێکساندەری سێیەم بوو ، هەروەها کاردانەوەیەکی توندی لەنێو سلاڤ و رەگەزە کۆنەخوازەکاندا لێکەوتەوە . ئەوانەی بە جۆشێکی نەتەوەییەوە لەپاشای نوێ گردبوونەوە . دیموکراسیی رۆژئاوا کەوتەبەر پەلامار ، سەربەستیپگەرایی و لیبرالیسم وەك کاڵایەکی بێگانە و چرووك و زیانبەخش راگەیەندرا . مەسەلەی گەڕانەوە بۆ دابونەرگا خۆماڵییە رەسەنە بێگەردەکان بە توندیی لەلایەن کەسانی وەك (قوستەنتین پۆبیدۆ نۆستیسێڤ) ەوە لایەنگری لێدەکرا ، کە پێشتر مامۆستا و پەروەردەکاری تایبەت و ئەمێستاش ئامۆژگاری سیاسیی دڵسۆزی ئەلیکساندەری دووەم بوو.[25]

هەموو ئەو ئاڵوگۆڕەی رووسیا ئەمێستا بۆ ئەورووپا دەگرێتەوە . غەدر و ناپاکیی لە دەرەوە ، شانبەشانی تۆقاندن و پاشاکوژیی لەنێوخۆی وڵات ، هەمووی باج و سزای پەیوەستبوون بە شارستانییەتی ئەورووپاوە بوو . بە گوتەی (بێرنارد پارێس)،"

---

[23] بۆ زیاتر لەمەڕ هەڵوێستی بسمارك لەحاست رووسیا بڕوانە: Marriott,The Eastern Question,390-92.

[24] Bernard Pares,The History of Russia,4th ed .rev (New York : Alferd A.Knopf,1946), 383.

[25] Ibid., 391,393.

رووسیا لە سایەی ئەلێکساندەرە مۆنی سێیەم ، هەروەها ئەوە دەبێت بگوترێت ، کە لەناکاو رووی خۆی لە ئەورووپا وەرگێرا ، لێرە بەدوا ، تاکڕەویی و ئایینگەرایی راستەقینە بە شێوە رووسییەکەی ئەو دوو پایە بنەڕەتییە بوون سیستەمی سزاریان راگرتبوو ، لەناکامدا ، رزگارکردنی ئیمپراتۆرییەکە پێویستی بەلەناوبردنی هەموو ئەو شتانە هەیە کە نە رووسین و نە بۆ ئایینێکی راستەقینە دەگەڕێنەوە .بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ، سیاسەتی بەزۆر رووساندن بەسەر دەستە و گرووپە نەتەوەیی و ئایینییەکاندا سەپێنرا . ئەم سیاسەتە کە لە سەردەمی ئەلیکساندەری سێیەمەوە دەستپێکردبوو ، لە سەردەمی نیکۆلای دووەمیشەوە بەتەواویی دەستبەرداری نەبوون ."[٢٦]

ئەو هەڵوێستە بێبایەخە سەرسەختانەیەی کە بەشێك لە نەتەوەخوازەکان پێشانیاندا و پێیانوابوو دەبێت رووسیا نەبەزانە دژی تورکیا بجەنگێت ، هۆکارێکی گرنگی نیگەرانیی بوو . ئەو وەڵامە توندەی کە لە ساڵی ١٨٨٥دا و لە لایەن بولگارییەکانەوە کسپەی لە دڵی رووسیا هەستاند و زیانێکی فرەی بە پلەوپایەو بەرژەوەندییەکانی رووسیا گەیاند ، لە ئەنجامی نەتەوەخوازیی توند و زیانبەخش بوو کە ریاکارانە وەك کارکتەرێکی پەرەگرتوو خۆیدەنواند.[٢٧] بەهەمان شێوە ، بەرگریی و بەرەنگاریی ئەرمەنەکان دژ بە سیاسەتی رووساندن دەرکەوتەیەکی ئاشکرا بوو بۆ جەختکردنەوە لە بوونی نەتەوەییان .[٢٨]

پێویست بە گوتن ناکات ، کە ئاکار و کرداری بولگاریی و ئەرمەنەکان سەرچاوەی نائومێدییەکی قووڵی رووسەکان بوو ، کە نەدەتوانرا جگە لە سپڵەیی و بێنەمەکیی ، لێکدانەیەکی دیکەی بۆ بکرێت .بولگاریا لەجیاتی ئەوەی وەك پردێکی رووسیا بەرەو ئەستەمبوڵ راڕەی کردبا ، بووە لەمپەرێك لەبەردەمیدا ، ئەمێستا بولگاریا خاوەن بوونی خۆیەتی ، هەروەها پێداگریی رووسیا لەجیاتی ئەو تەنیا یادەوەرییەکە و هیچی دی . ئەرمەنەکان هێشتا رزگاریان نەببوو و لەو پێناوەدا تێدەکۆشان ، ئەوان لەو رووەوە زۆر بەختەوەر نەبوون . ئەمجارەیان رووسیا بڕیاریدابوو رێگە نەدات دەوڵەتی نەتەوەیی ئەرمەن ببێتە لەمپەر لەبەردەم خۆی و زەوییەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی لە

---

[26] Ibid., 409-14. and 393-94; see also Lobanov-Rostovisky,202.

[27] سەبارەت بە هەڵوێستی بولگاریا لەحاست رووسیا بڕوانە: Marriott,The Eastern Question,349f,362

[28] Ibid.,398-99.

باشوور ،بێزاریی رووسیا لەو رووداوانە کە لە بولگاریا و ئەرمینیا قەومابوون بە راشکاویی لە قسەکانی راوێژکاری رووسیی (میلابانۆڤ) دا دەردەکەوێت کە گوتوویەتی :" بولگاریایەکی ئەرمەنییمان ناگەرەکە"[٢٩] ، پەرەسەندنی تۆقاندن و چالاکییە رۆشنبیرییەکان لەنێو ئەرمەنەکانی تورکیا ، هاوکات لەو دەمەدا رووسیا خۆی بەدەست هەمان چەشنە چالاکییەوە شپرزە بوو ، زیاتر هانی دەسەڵاتی سزارییدا دژی ئەرمەن و پرسەکەیان هەڵوێست وەرگرن .

سیاسەتی رووساندنی ئەرمەنەکان لە رووداوەکانی ساڵی ١٩٠٣دا گەیشتە بارێك کە تێیدا ماڵ و سامانی کەنیسەی نەتەوەیی ئەرمەنیی دەستی بەسەردا گیرا و هەروەها خوێندنگە ئەرمەنییەکانیش داخران . ئەو کار و هەنگاوانە بەتەواویی ئەرمەنەکانی رەنجاند ، ئەو رەشەکوژیی و رەشەکوژییە پێچەوانەیەی ئەرمەن و تەتارەکانی باکۆ لەماوەی دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تێوەی گلابوون خراپ لەسەر پەیوەندییەکانی رووسیا و ئەرمەنە دەستوپێوەندەکانی کاریگەریی هەبوو .[٣٠] هەرچەندە ئەم قۆناغە ناشادەی پەیوەندییەکانی رووسیا و ئەرمەنیی زۆری نەخایاند ، پەرەسەندنە نێونەتەوایەتییەکان واپێدەچوو هەردوولای هێنابێتە سەر ئەو باوەڕەی کە بەرژەوەندییەکانیان وادەخوازێت هەمان پەیوەندییە دۆستانەکەی پێشوویان بگێڕنەوە .

## هەنگاوەکانی رووسیا بۆ چاکسازیی ئەرمەنییەکان

لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ١٩١٢دا ، نوێنەری قەفقاس (کۆنت ئیلاریان ئیڤانۆڤیچ ڤۆرۆنستۆڤ-راشکۆڤ) هانی سزاریدا سیاسەتێکی ئەرمەنیی چالاکانە پەیڕەو بکات ، ئەو لە راپۆرتێکدا کە پێشکەشی حکومەتەکەی کردبوو ،دەڵێت:" لەم کاتەی ئێستادا ، دەستتێوەردانێکی ئاشکرا بە ئامانجی پاراستنی ئەرمەنەکانی تورکیا پێویستییەکی بنەڕەتییە ...بۆئەوەی هاوسۆزییەکی جەماوەریی پێشوەختمان لەو ناوچانەدا هەبێت کە

---

[29] Ibid.

[30] بۆ گفتوگۆ لەسەر پەیوەندیی رووسیی-ئەرمەنیی :

Atamian, Sarkis . The Armenian Community: The Historical Development of a Social and Ideological Conflict. NewYork : Philosophical Library, 1955,114-17.

بمانەوێت یان نا دەکەونە چوارچێوەی هەڵمەت و کارە سەربازییەکانمان ."[٣١]

کەمتر لە ساڵێك پێش هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی ، رووسیا لەگەڵ هێزە ئەورووپییەکاندا بۆ سەرلەنوێکردنەوەی باسی کێشەی چاکسازیی لە ناوچەکانی ئەرمینیای تورکیادا هەنگاوینا. فەرەنسا و بەریتانیا هاوسۆزییان بۆ هەڵوێستی رووسیا نواند ، بەڵام وادەردەکەوێت ئەڵمانیا پاش بگرەوبەردەیەکی زۆر لایدابێتەپاڵ هێزەکانی دیکە . لەمیانەی وتووێژەکانی ئەم مەسەلەیەدا . هەواڵی ئەوەهەیە کە ئەڵمانەکان سەرسەختانە بەرگرییان لە دیدوبۆچوونی تورکەکان کردووە و جەختیان لەوە کردۆتەوە کە ئەو دەوڵەتە زلهێزانە "پێویستە بەرژەوندییەکانی کورد پشتگوێ نەخەن " [٣٢] پاش لێکۆڵینەوە و باسێکی درێژخایەن ، لە کۆتاییدا لەساڵی ١٩١٤دا ، پەیمانی ئەرمەنیی مۆرکرا کە لەسەر بنەما و بەلەبەرچاوگرتنی راسپاردەکانی رووسیا هاتبووە ئارا .[٣٣]

## دەرکەوتنی سیاسەتێکی سەرەرۆیانەی زێدەتری رووسیا لەحاست کورد

لەگەڵ هەڵگەران بە قەدپاڵی سەدەی نوێدا ، وادەردەکەوت رووسەکان سیاسەتی کوردیی خۆیان تۆختر کردبێت و هەوڵی دووبەرابەر بدەن لە پێناو راکێشانی کورد و

[31] Krasny Archiv 26 (1928), 118-19, cited in : Kolarz .Walter. Russia and Her Colonies,215.

[32] سازانۆڤی وەزیری دەرەوەی رووسیا ، جەختی لەوە کردۆتەوە کە وێڕای ئەوەی ئەڵمانیا دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ تورکیا راگەیاندووە و لەکاتی دانوساندنەکاندا بە توندیی پشتگیریی ئەو وڵاتەی کردووە ، بەڵام هێندێك مەسەلەی دیکە شوێنی لەسەر هەڵوێستی دادەنا . بەگوێرەی ئەو ، " بە پێی رای باڵیۆزەکەمان ، مەبەستی (هێر ڤۆن جۆوس)بۆ ئەو راستییە دەگەڕێتەوە کە حکومەتی ئەڵمانیا خۆی هیوای بەوە بوو پرسی ریفۆرمی ئەرمەنەکان هەڵسێنێت ، هەرچەندە ناتوانێت بەوە دڵخۆش بێت لەو رووەوە نائومێد بێت .

Sazanov Sergiei Dmitrievich . The Fateful Years. 141-146

[33] سەبارەت بە درێژەی گێڕانەوەی ئەو هۆکارەی کارمەندانی رووسیی هاندا دەستکاریی پەیماننامەی ئەرمەنیی و مۆرکردنی بکەن بڕوانە :

Russia. Ministry of Foreign Affairs, Sbornik deplomaticheskikh dokumentov : Reformy v Armenii: 26 Noiabria 1912 g-10 1914 g (Petrograd: government Press,1915).

بەگژداکردنیان بە رووی فەرمانڕەوا تورك و ئێرانییەکاندا . پارە ، چەك ، بەڵێن ، تێکڕای ئەمانە بۆ خستنەوەی ئاناراميی و تەقاندنەوەی راپەڕین بەکارهێنران . بەوەش هێرشی تالآنکەرانەی سمکۆ ئاغا بۆسەر خاکی عوسمانیی [٣٤] و هەروەها راپەڕینەکەی بەدلیس [٣٥] ، دەگوترێت کە بە هاندانی رووسیا بووە .

سەرهەڵدانی ئەتەوایەتیی کوردیی دەرفەتێکی بێوێنەی خستەپێش چالاکیی سیاسیی رووسیی لەنێو کوردەکاندا ، کە بەپەرۆشەوە دەستی بەسەردا گرتبوو و ژیرانەش بەقازانجی خۆی سوودی لێوەردەگرت . رووسیا فرە هانی جوڵانەوەی کوردیی دەدا . [٣٦] بێزاریی لەو سەرکردە کوردانە دەردەبڕیی کە لە خواستنی هاوکاریی بەدەستهێنانی پەناگە لە رووسیا سستیی دەنوێنن . [٣٧] ئەتەوایەتیی کوردیی ئەخشێکی گونجاوی بۆ زۆربەی سەرکردە کوردەکانی لایەنگری چالاکییەکانی رووسیا هێنایە ئارا ، هەمان ئەو چالاکیيانەی کە دەیەیەکی کەم بەر لەو کاتە بە کەمتر لە ناپاکیی و خۆفرۆشییەك لەقەڵەمدەدرا ، ئەمێستا لە چاوی زۆربەی کورد دا پێویستی بە پاڵەوانی مەیدان و کەسایەتیی لێهاتوو هەیە شانبداتە بەری .

پاش داگیرکردنی ئازەربایجانی ئێران لەلایەن رووسیاوە، جمانی شێنەیی بۆ کوردستان لە چونە ناوەندێکی ژێرسایەی رووسەکاندا وەك ورمێ [٣٨] و ناوچەکانی ماکۆ و خۆی دەستپێکرد . [٣٩] چالاکی رووسەکان لە ساڵی ١٩١٠ بەرەوسەر بەهێزو فراوان بوو، ژمارەیەکی فرە لە سەرۆکەکانی کوردی ناوچە سنوورییەکان و ئەودیوی چاوەڕوانی پشتگیریی رووسیا بوون . [٤٠] وەك لۆنگریك ئاماژەی پێداوە :" سەیدەکانی نەهریی ، شێخ عەبدولسەلام ، سەرۆکەکانی جاف ، هەروەها مەلیك و مەزنە قەشەکانی ئاسووریی لە

---

[34] Price.M Phillips , " Russia and the Kurds,15

[35] Yalman , 209.

[36] E.W. Noel , Note on the Kurds Situation,11.

[37] نموونەی ئاشکرا بریتیبوو لە : عەبدولڕەزاق بەگ ، کامیل بەگ بەدرخان ، سەید تەهای نەهریی ، هەروەها ئەوانی دیکە کە چالاکییەکانیان بەگشتی باسی لێکراوە

[38] Longrigg. Iraq (1900-1950),67.

[39] Price , " Russia and the Kurds."15.

[40] Longrigg. Iraq (1900-1950),67.

هەوڵی پەیوەندییگرتن بە رووسەکانەوە تەنیا نەبوون ."[41]

ئامانجە کۆتاییەکانی ئەم سیاسەتە بەتەواویی ئاشکرا نەبوو . هەواڵی ئەوە هەیە کە عەبدولڕەزاق لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٩دا بە پرۆژەیەکەوە سەبارەت بە کوردستانێکی سەربەخۆ سەردانی (سنت پیترۆسبێرگ)ی کردووە .[42] بەداخەوە هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بە وەڵامی رووسەکان بەم پرۆژەیە لەبەردەستدا نیە . (باسیلی نیکیتین) ، کۆنسوڵی پێشووی رووسیی لە ورمێ و شارەزا و نووسەری پێشڕەو سەبارەت بە کوردان ، لە نامەیەکیدا بۆ (مانچستەر گاردیان) لە ساڵی ١٩٥٠ ، بە شێوەیەکی بەرچاو و سەرسەختانە نکوڵی لەوە دەکات کە حکومەتەکەی هیچ کات خواستی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆی هەبووبێت .لە نامەکەیدا ، نیکیتین جەخت لەوە دەکاتەوە کە رووسیای سزاریی بە ئەستەم دەبێت بگوترێت کە شتێکی هەبووە بە سیاسەتی کوردیی لەقەڵەم بدرێت . ئەو بۆ پشتگیرییکردنی ئەم بۆچوونە رەتکەرەوەیە ، ئەوەی روونکردەوە کە لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانییدا هێزەکانی رووسیی لە قەفقاس " نەخشەیەکی دروستی کوردستانیان نەبوو ، شارەزایی و زانیارییەك لەمەڕ زمانی کوردیی نەبوو ،وە هەروەها ."[43] لەوەش زیاتر ، ئاماژەی بەوەدا کە ئەو وەك کۆنسوڵێکی رووسیی لە ورمێ هیچ کاتێك فەرمان و بڕیارێکی ئەوتۆی نەگەیشتووەتە دەست سەبارەت بەوەی چۆن لەگەڵ کورداندا مامەڵە بکرێت . ئەو دەرئەنجامی گفتوگۆکەی بەم شێوەیە دەربڕیوە :" زیاتر باوەڕم وایە ، بەپێچەوانەی پرسی ئەرمەنەکان ، هەروەها هەلومەرجی شێوەی ئەستوورییەکان ، وەزارەتی دەرەوەمان ، هەروەها جێگری سەرپەرشتیاری دەربار لە تفلیس ، هیچ سیاسەتێکی کوردیی دیارییکراویان نەبوو ."[44]

سێ‌ساڵ پێشتر ، لەلایەن (مێجۆر ئی.دەبڵیو.سی. نۆئێل) ەوە ، کە ئەفسەرێکی هەواڵگریی بەریتانیا و چاودێر و بایەخدارێکی بەجۆشی چالاکییەکانی رووسیا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو ، هەروەها یەکێکە لە شارەزا و کوردناسە ناسراوە

[41] Ibid.

[42] Basile Nikitine , Letter to the Editor , Manchester Guardian , Sept.21 ,1950.

[43] Ibid.

[44] Ibid.

بەریتانییەکان ، لە راپۆرتێکدا کە لە ژوئیەی ١٩١٩دا نووسراوە ، مێجۆر نۆئێل دەڵێت گوایە لە ماوەی جەنگدا بەرێکەوت چاوی بە بەڵگەنامەی فەرمیی رووسیی تایبەت کردووە کە تیشکێکی سەرنجراکێشی خستۆتە سەر بواری سیاسەتی رووسیی لە کوردستان :" لەو بەڵگەنامانەدا لە ستاف گشتیی رووسیی لە تەفلیسی لەساڵی ١٩١٧دا ، لە نزیکەوە چاوم پێیان کەوت ، سەرنجی ئەوەم لادروست بوو کە ویستێك هەبێت بۆ بەکارهێنانی کورد وەك پارسەنگی ئەرمەنەکان ، هەروەها هیچ ویستێك نەبوو قسەی زۆر بدرێتە ئەرمەنەکان سەبارەت بەو بابەتانەی پەیوەندییان بەو ناوچەیەوە هەبوو کە ئەرمەنەکان داوایان دەکرد ، بەڵام بە شێوەیەکی بەرفراوان کوردەکانی تێدا باڵادەست بوون ."[45]

لەو کاتەی هێشتا رووسیا لە سایەی ئاڵۆزیی ئاسەوارەکانی جەنگدا و هەروەها شۆڕشەکەدا دەیناڵاند ، نۆئێل لە نووسراوێکدا جەخت لە هاتنەوەسەرخۆ و چاکبوونەوەی رووسیا و هەروەها ژیاندنەوەی بەرژەوەندییەکانی لە کوردستاندا دەکات . ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە رووسیا پێشتر بە شێوەیەکی مەزن هانی جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردیی داوە . ئەو پێیوایە رووسیا هەر کاتێك لە هەلومەرجێکی لەباردا بێت کار بۆ بەدەستهێنانەوەگرتنی سەرەداوەکانی کۆنە سیاسەتەکانی دەکات و هەمان رێچکە دەگرێتەوەبەر . بە گوێرەی ئەو ، پەیوەستبوونی رووسیا بە بەرژەوەندییەکانییەوە لەو داوایەوە دەردەکەوێت کە نوێنەری رووس(ئەدمیراڵ کۆڵچاك) لە پاریس سەبارەت بە ماندێتی رووسیا بەسەر ئەرمینیادا داوایکردبوو .

چونکە نۆئێل سوور بوو لەسەر مەسەلەی حەتمیەتی بوژاندنەوەی بەرژەوەندییەکانی رووسیا لە کوردستان ، لەبەر ئەوە هانی حکومەتەکەیدا هیچ کاتێك بۆ چەسپاندنی پێگەی بەریتانیا لە ناوچەکە بەفیڕۆ نەدات ." لەو دیدەوە کە پەیوەستێکی نزیك لە نێوان میسۆپۆتامیا و کوردستان و هەروەها زۆر لەو کوردانەی کە کارگێڕییەکەی ئێمە دەیانگرێتەوە ، وادەردەکەوێت کە گرنگییەکی مەزن لەپێویستیی ئەوەدایە هەوڵەکانی رووسیا لە کوردستان پووچەڵ بکەینەوە و پێشیانکەوین ، ئەویش لە رێگەی بەشدارییکردن لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی کە لەوێ بواری کارکردنی

---

[45] E.W. Noel , Note on the Kurds Situation , 11.

بەرتەسکدەکاتەوە."[46]

## کاریگەریی پەیوەندییەکانی شورەویی-تورکیی لەسەر سیاسەتی کوردیی یەکێتی شورەویی

هەڵوێستی یەکێتی شورەویی لەحاست کورد لەو ماوەیەدا کە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیی دێت ، کاریگەریی چەندین مەسەلەی نێودەوڵەتیی لەسەر بوو . ترس لە هاوپەیمانەکان ، بەتایبەت بەریتانیای مەزن ، هەروەها گومان لەمەبەست و ویستی ئەو دەوڵەتە لە رووسیا فرە بەهێز بوو. کەمالیستە تورکەکانیش گرفتاری هەمان ترس و دڵەراوکێ و گومان ببوون . ئەو هەڕەشە و مەترسییەی رووبەڕووی هەردوو دەوڵەتەکە ببووەوە ، خستنیە پاڵی یەك و لە یەکتری نزیك کردنەوە بووە سەرەتای قۆناغێکی نیازپاکیی و هاوکاریی قازانجبەخشی هاوبەش لەنێوان ئەو دوو وڵاتەدا . یەکێتی شورەویی هاوکارییەکی مەزنی ماددیی و پشتگیرییەکی مەعنەوەی پێشکەش بە کەمالیستەکانی تورکیا کرد .[47] هەروەها دۆستایەتیی تورکان لەگەڵ رووسەکان ، لە کاتێکدا ئەوەکەی دواییان دۆستێکی کەمی هەبوو ، بەشێوەیەکی مەزن پلەوپایەی رووسیای لەنێو جیهانی ئیسلامدا پتەوتر کرد .[48] سەرباری ئەوانەش ، دۆستایەتیی لەگەڵ تورکیایەکی بەهێزی نەتەوەیی ، خاکی رووسیای لای باشوورەوە دەپاراست .

هەرچەندە ، ئەم دۆستایەتییە لەسەرەوە و بەڕواڵەت بەهێز و پتەو دەهاتە پێش چاو ، بەڵام بێ ناڵۆزیی و نیگەرانیی قووڵیش نەبوو . کۆنگرەی لۆزان کە تێیدا تورکیا زۆر لێهاتووانە سوودی لە پشتگیریی رووسیا وەرگرت ، ئەو ناکۆکییە بنەڕەتییانەی دەرخست کە سەبارەت بە ئامانج و مەبەستی هەردوو دەوڵەت هەبوون .نیگەرانیی و ناڕەزایەتیی رووسەکان لەوەدا بوو کە تورکان بە جیا و بێ گەڕانەوە بۆ ئەوان لەسەر مەسەلەی تەنگەکان دانوساندنیان کردووە . ئەو خواستەی رووسیا سەبارەت بە سەرلەنوێ گفتوگۆکردن و دانوساندنەوە لە رێگەی کۆمسیۆنێکی تایبەتەوە بەتەواویی

[46] Ibid.

[47] Fischer, Louis ,The Soviets in World Affairs, 1:391-92.

[48] Ibid., 394,412.

فەرامۆشکرا و تورکان ئاماژەی شورەوییان بۆ ڕێکەوتننامەی شورەویی –تورکیی ١٦ی مارتی ١٩٢١ پشتگوێخست . لەسەرەتای فێبرایەری ١٩٢٣دا ، عیسمەت ئینۆنۆ ، سەرۆکی نوێنەرایەتیی تورك ، لە کۆنگرەکەدا گوتەیەکی پێشکەشکرد و ڕەزامەندیی تورکیای بۆ داماڵینی چەك لە تەنگەکان و کردنەوەی بەرووی کەشتییەکانی تێکڕای وڵاتاندا ڕاگەیاند .[49] کاردانەوەی شورەویی سەبارەت بەم ڕاگەیاندنە درەنگ نەکەوت ، ئەنتەرناسیونالیزمی سێیەم هێرشێکی توندی کردە سەر حکومەتی تورکیا و بە شکەنجەو ئازاردانی کۆمۆنیستەکان لە تورکیا تاوانباریکرد.[50]

ئەمە ، وێڕای ئەوە ، ناسەنگێکی کاتیی بوو . پەرەسەندنی ڕووداوەکانی دیکە بەزوویی هەردوو دەوڵەتەکەی خستە پاڵ یەك ، پێدانی ویلایەتی موسڵ بەعێراق لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە لە ١٥ی دیسەمبەری ١٩٢٥ دا ، دوو ڕۆژ بە دوای ڕێکەوتننامەی ڕووسیی –تورکیی دا هات .[51] ڕووداوێکی دیکە کە زەمینەی بۆ سەرلەنوێ نزیکبوونەوە و بەهێزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو وڵات خۆشکرد ، بریتیبوو لە ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعید لەسەرەتای بەهاری ١٩٢٥ دا . کێشەی کورد بۆ تورکیا گرنگییەکی مەزنی هەبوو ، تورکان گومانی ئەوەیان دەکرد کە بەریتانیای مەزن هانی ڕاپەڕینەکەی داوە ، لەمەشدا دەردەکەوێت کە هەردوو ڕووسیا و تورکیا بەیەك ئاراستە بیریان دەکردەوە . (فیشەر) سەرنجی شورەوییەکانی سەبارەت بە چۆنێتی بەکارهێنانی کوردان وەك ئامرازێکی سیاسەتی بەریتانی لەلایەن بەریتانیای مەزنەوە بەم شێوەیە کورتکردۆتەوە :

"مۆسکۆ لەو باوەڕەدایە کە سیاسەتی بەریتانیای مەزن لەم ساتە وەختەدا بە ئاراستەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ یا نیمچە سەربەخۆیە ، یاخود ئینگلیزەکان بەهەر حاڵ ، کوردان بەکاردەهێنن بۆ دەستکەوتێکی زیاتر لە ڕۆژهەڵاتی نزیك ، هەروەها بۆنەوەی دووبەرەکیی لەنێوان تورکیا و ئێراندا بنێنەوە . (ئەزڤێشتیا) ی مۆسکۆ لە ٦ ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٧ دا ، بەراشکاویی زنجیرەی بەریتانیی سەبارەت بە پەلامارەکانی کوردی لە تورکیاوە بەرەو ئێران و لە ئێرانیشەوە بەرەو تورکیا بە بەرپرس

---

[49] Turlington Edgar. The Settlement of Lausanne."702.Cf.Arnold Toynbee and P. Kirkwood .Turkey.111-25.

[50] Izvestia , Feb.14,1923.

[51] Fischer. 2:612.

زانـی . ئەنقـەرەش هـەمان بۆچـوونی هـەبوو ، هـەروەها راگەیانـدنی ئەنـەدۆڵیش ئـەم بابەتـەیان پەخـشکرد ." بەگشتیی ، مۆسـکۆ باوەڕی وایـە کـە سیخوڕە بەریتانییـەکان خێڵە یاخییبووەکانی تێکڕای ئەم وڵاتانەی رۆژهەڵات بەکاردەهێنن بۆ فشارخستنە سەر حکومەتـە دامـەزراوەکان ، ئەمـەش نێـوەرۆکی راسـتەقینەی سیاسـەتی لەنـدەن یـاخود دلهییە"[52]

فیشەر لەسـەری دەڕوات و دەڵێت کە رووسـەکان هەوڵیانداوە ئەم خاڵە بخەنە بەرچاوی سیاسـەتکارانی تورك و ئێرانیی ، هەروەها راگەیاندنی شورەویی هۆشیاریی سەبارەت بە مەترسیی دوژمنایـەتیی تورکیا و ئێران بەهۆی رووداوە کوردییـەکانی سەر سنوور داوە ، ئەو رووداوانەی کە دەستی بەریتانییەکانی لەپشتەوەیە .[53]

بێگومـان ، یـەکێتی شـورەویی سـوودی لـە ترسـی تورکـەکان سـەبارەت بـە پشتگیریی کردنـی نەتەوایـەتیی کـوردیی لەلایـەن بەریتانییەکانـەوە بینی . ئەوەندەی کێشەی کورد جێگەی دڵەڕاوکێ و پەرۆشیی بوو ، یەکێتی شورەویی هیچ دەرفەتێکی لەدەست نـەدا تـا ئەوپـەڕی بایـەخی خـۆی لـەپێناو بەرژەوەنـدیی تورکانـدا پێشاندا ، هـەروەك لە بەشی داهـاتوودا باسـی لێوەکراوە . رووسـەکان هـەوڵی چاکەخوازی خۆیـان ئاشکراکرد بۆ داوەریـیکـردن لـەنێوان تـورك و ئێرانییەکانـدا سـەبارەت بـەو گرفتانـەی لـە شۆڕشـی ئاگریداغـەوە سـاڵی ١٩٣٠ سەرچـاوەی گرتبـوو. وێـڕای بـەردەوامبوونی دۆستایەتیی روالـەتیی ، سیاسـەتی جیـاواز و دوورلەیـەکی هـەردوو وڵات بـووە هـۆی ئـەوەی هەریەکـەیان بەلایەکدا بڕۆن . ئـەو تـرس و دڵەڕاوکێیـە هـەر لـە کۆتـای جـەنگی یەکەمی جیهانییەوە مێشکی تورکانی داگیرکردبوو ، ئەمێستا بـەهۆی متمانەبەخۆبوون و دڵنیـابوون لـە نیازپـاکیی وڵاتـانی رۆژئـاوا دەرەوییـەوە . ئـەم هەڵوێست گۆڕینـە لەگـەڵ سیاسەتی رۆژئاواگەراییدا هاوجووت بوو کە هەر لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری تورکیـادا لەلایەن تورکانەوە پەیڕەویی لێدەکرا .

پەیماننامـەی مۆنتریۆ لەساڵی ١٩٣٦ ، کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی رووسیادا یەکیان نەدەگرتـەوە ، بەڵگەیـەکی دیکەیە کە تورکیا و رووسیا لەسەر تـەواوی پرسـی

---

[52] Ibid., 2:732.

[53] Ibid.,2:732-33.

تەنگەکان رێکەوتنیان نەبوو . تورکیا تا دەهات لەو دەوڵەتانەی وەك عێراق و ئێران کە کوردیان تێدا نیشتەجێ بوو ، نزیك دەبووەوە . ئەو خولیایەی بە بەستنی پەیمانی سەعدئاباد لەساڵی ١٩٣٧ دا چووە ئاستێکی پێگەیشتوو . رووسیا بە سەختی ئەم هەنگاوەی ریسواکرد . پێکهێنانی بلۆکێکی موسوڵمانی دامەزراو نزیك بە سنوورە ئاسیاییەکانی رووسیا و هەرێمە بەرفراوانە موسوڵماننشینەکان مەسەلەیەك نەبوو نەتوانێت گومان و دڵەراوکێی شورەویی نەورووژێنێت . رووسەکان پەیمانی سەعدئابادیان ، وێڕای ئەوەی لەنێو شتەکانی دیکەدا ئامانجی پێشگیرییکردن لە راپەڕینەکانی کورد بوو ، بە هاوپەیمانییەتییەك دژی یەکێتی شورەویی لەقەڵەمدەدا کە لە باوەشی بەریتانییەکانەوە ئاراستە دەکرا . هاوکات یەکێتی شورەویی دەستیکرد بە پێشاندانی ئەوەی بەرژەوەندییەکی پەرەگرتووی لەگەڵ کوردەکاندا هەیە . توێژەرانی شورەویی ئەلف بای هاوچەرخی لاتینییان بۆ زمانی کوردیی داهێنا (کەدواتر بە ئەلف بای سیریلیك گۆڕدرا) ، هەروەها چالاکانە هەنگاو بەرەو هێنانە کایەی جوڵانەوەیەکی فەرهەنگیی و کەلتووریی لە نێوان کوردانی یەکێتی شورەوییدا نرا . لە ژوئیەی ١٩٣٤ دا ، کۆنگرەیەکی کوردۆلۆجیی لە ئەریڤان بەسترا .[٥٤]

کورد کە تا ئەو کاتە لەلایەن دەسەڵاتدارانی شورەوییەوە لە ئازەربایجان و ئەرمینیا پشتگوێ خرابوون ، بوونە جێگەی بایەخێکی نوێ . بەپێی سەرچاوەیەکی شورەویی ، هەردوو کۆمارە قەفقاسییەکە نەك تەنیا نەیانتوانیوە خۆشگوزەرانیی و بەختەوەریی و پێشکەوتنی کەلتووریی بۆ کورد بێننەدی ، بەڵکو دەبێت درك بە بایەخی کوردان لە چوارچێوەی ئەو دووربینییەی سیاسەتی شورەویی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بکەن ."[٥٥] لەساڵی ١٩٣٦ دا ، کۆمۆنیستە ئەرمەنییەکان بەهۆی پشتگوێ خستنی کوردانەوە لە کۆماری ئەرمینیای شورەویی سۆشیالیستییدا بە توندیی لە لایەن حکومەتەوە رەخنەیان لێگیرا و بەکاری رەگەزپەرستانە و شۆڤێنستانە دژی کورد تۆمەتبارکران .[٥٦]

هەرچەندە تاکو هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانیی و داگیرکردنی

---

[54] Randot.Pierrer. "L alphabet Kurde en caracteres Latins Armenie Aovietique,"411-17.

[55] Revolyutsiya i Natisonalnosti . no.80,Oct.1936:55-60 ;cited by Kolarz,251.

[56] Ibid.

باکووری ئێران ، رووسیا چ دەستێوەردانێکی لە کاروباری کوردیی پیشان نەدا . دوای جەنگ ، پەیوەندییگرتن لەگەڵ کوردانی ناڕازیی ، هەروەها ئەو وزە و توانا و ئەحەواوانە لەگەڵ ئەو ئومێد و چاوتێبڕینەی لە دەرئەنجامی بوژانەوەی توانای رووسیا کە پاش شکستی دەوڵەتانی ناوەند هاتەکایەوە ، ئەوانە هانی رووسیایاندا هەمان سیاسەتە کۆنەکەی لەحاست کورد بگرێتەوەبەر .

بێگومان ئەو ئاڵۆزیی و تێکچوونەی لەدوا قۆناغی جەنگی دووەمی جیهانیدا بەسەر پەیوەندییەکانی رووسیا–تورکیا دا هات و دوای جەنگیش بەردەوام بوو ، بایەخی کوردی لای رووسیا برەو پێدا . لەبەهاری ١٩٤٥ دا ، یەکێتی شورەویی رێکەوتننامەی شورەویی–تورکیی بۆ دۆستایەتیی و بێلایەنی راگەیاند . هەر زوو پاش ئەوە ، شورەویی داوایەکی نافەرمیی سەبارەت بەماڤ خۆی لە چەند هەرێمێکی دیاریکراوی رۆژهەلاتی تورکیا و هەروەها چاوخشاندنەوە بە پەیماننامەی مۆنتریۆ پێشکەش کرد . ئەم پەرەسەندنانە ، وێڕای ئەوەی پشتگیریی ئاشکرای شورەویی لە نەتەوایەتیی کوردیی ، بێگومان ، وای لە تورکیا کرد ببێتە پێشقەرەوڵی دامەزراندنی پەیمانی بەغدا لەگەڵ عێراق و ئێراندا . بەوەش پەیوەندییەکانی نێوان رووسیا و تورکیا بەتەواوەتیی دەلاقەی تێکەوت .یەکێتی شومرەویی کە زۆر دەمێك بوو لەمەڕ گرنگیی کورد ئاگادار بوو ، ئەمێستا خوازیاری ئەوەبوو وەك رەگەزێکی پەرتکەر و ئاژاوەگێڕ بەدژی وڵاتانی رۆژئاواگەرای وەك تورکیا ، عێراق و ئێران سوود لە کورد وەربگرێت . نائومێدی کوردان لە رۆژئاوا بەگشتیی و لە بەریتانیا بەتایبەتیی ، وێڕای بێزاریی و رقلێبوونەوەی کوردان لەو سێ دەوڵەتەی پەیمانی بەغدایان پێکدەهێنا و زۆرینەی کوردیان تێدا دەژیا ، تێکڕای ئەمانە دەستی شورەویی کراوەتر دەکرد . هەڵوێستی رووسیا لەمەڕ راپەرینەکەی بارزانیی لە عێراق (بەشی سیازدەیەم) . هەروەها دامەزراندنی کۆماری مەهاباد لە ئێران (بەشی پازدەیەم) ، گومانێك سەبارەت بە ئامانجی رووسیا لەم ناوچەیە جێناهێڵن .

# بەشی حەوتەم: کوردو جەنگی یەکەمی جیهانیی

جەنگی یەکەمی جیهانیی ئازار و نەهامەتییەکی فرە و زیانێکی سەختی لەگەڵ خۆی بۆ کورد هێنا . لە سۆنگەی ئەوەوە وڵاتی کوردان بە درێژایی سنوورەکانی عوسمانیی و ئیمپراتۆریی رووسیا شوێنی گرتووە و لە ئەنجامدا دەبووە دەروازە و سەرەڕێگەی لەشکرکێشی و تێکهەڵچوونی هەردوو سوپا ململانێکەرەکە ، بەوەش بەشێکی مەزنی ئەم زەوییانە هەر لەسەرەتای مانگەکانی یەکەمی دەستپێکردنی جەنگدا ، بوونە مەیدانی شەڕ و پێکدادان . ئەمەش نەك هەر سەبارەت بە بەشە کوردستانەکەی تورك یاخود ئەو بەشەی خاکی کورد کە لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی رووسیادا دروست بوو ، بەڵکو هەمان دۆخیش لە کوردستانی ئێراندا لەئارادا بوو .[1] شانۆی پەلامار و هەڵمەتە سەربازییەکان هەر لە ساری قامیشەوە لە باکوور تا خانەقین لە باشوور درێژ دەبووەوە ، هەروەها لە وڵاتی موکرییەوە لە رۆژهەڵات بۆ ئەرزیرۆم و ئەرزنجان لە رۆژئاوا ، زۆر هەرێمی ئەم ناوچەیە چەند جارێك ئەم دەست و ئەو دەستیان دەکرد و تەنیا کارەسات و بەشمەینەتیش بۆ خەڵکەکەی بەجێدەما . هەردوولا بە کاری پێشێلکردن گوناهبار بوون .ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نیە ، بەهۆی ئەو جۆشە رووژاو و توندوتیژەی هێزە شەڕکەرەکانەوە . ئەو خرۆشانەی بانگی جیهاد لەنێو هێزەکانی تورکدا هێنایە جۆش و هاوجووت بوو لەگەڵ ئەو سۆزە هەژاوەی یەکە یەدەکەکانی ئەرمەنیی و ئاسووریی ، کە لە پاڵ سوپای رووسدا دەجەنگان .

جەنگەکە کاریگەرییەکی سەخت و زیانێکی مەزنی بە توانای مرۆیی کورد

---

[1] سەبارەت بە هەڵگیرساندنی شەڕەکان لە ئێران و تێوەگلانی کورد و ئێرانییەکان لە جەنگدا بڕوانە:

Sir Percy Sykes , A History of Persia, 2 vols.(London: Macmillan ,1915).43ff.; Gustave Semorgny. La question persane et la guerre. la rivalite anglo-russe en perse (Paris:L.Tenin. 1916).284ff.

گەیاند . دیاریکردنی ژمارەی ئەو کوردانەی لە جەنگەکەوە گلابوون کارێکی هەروا ئاسان نیە . هەرچەندە ، لەلایەن نووسەری کوردەوە (م.ا.زەکی ) کە بۆخۆی پایەیەکی بڵندی لە سوپای تورکیدا بووە ، پێشکەشکراوە .[2] بەگوێرەی ئەو ، سوپای یازدە لەگەڵ سەرۆکایەتیی مەعمورەتولعەزیز ، هەروەها سوپای دوازدە لەگەڵ سەرۆکایەتییەکەی موسڵ ، بەتەواویی لە کورد پێکدەهاتن . وێڕای ئەوەی ، زۆربەی ئەفسەر و سەربازەکانی سوپای نۆیەم ، کە بارەگاکەی لە ئەرزڕۆم بوو ، هەروەها سوپای دەیەم ، کە بارەگاکەی لە سێواس بوو ، کورد بوون . هەروەها کورد ١٣٥ فەوجی یەدەکی سوارە و چەند یەکەیەکی سنوور و دەستە و تاقمی تەواو پەیوەست بە هێزەکانی ئەمنییەتی و جەندرمەیان پێکدەهێنا .[3] زۆر لە خۆبەخشە خێڵەکییە کوردەکان بەدەم بانگەوازی جیهادەوە چوون ، لە نێوانیاندا ئەوانە بوون کە لەگەڵ شێخ مەحموود و سەرکردە کوردەکانی دیکەدا لە شەڕی شوعەیبە لە باشووری مسیۆپۆتامیادا جەنگان .[4] هێزی خێڵەکیی گەورە ، چ لە تورکیا و چ لە باکووری رۆژئاوای ئێراندا ، دژی رووسەکان جەنگان . زەکی تەواوی قوربانییەکانی کورد لە شەڕەکاندا بە سێ‌سەدهەزار کەس دەقەبڵێنێت .[5]

ژمارەی ئەو کوردانەی لە مەیدانی جەنگدا یاخود بەهۆی کۆمەڵکوژییەوە تێداچوون یەکسانە ، ئەگەر زێدەتر نەبێت ، بەوانەی کە بەهۆی سەرما ، برسێتیی ، نەخۆشی رشانەوە گیانیان سپارد .سوپای هەڵسوڕاوی تورک لە کوردستان بە هۆی کەمیی پێویستییە خۆراکییەکان و رێگەی گواستنەوە بوونە بار بە سەرشانی خەڵکی ناوچەکەوە . دەسەڵاتدارانی سەربازیی خەڵکیان ناچار دەکرد خۆراك و پێویستییەکانی دیکەیان بە نرخێکی هەرزان پێبفرۆشن و زۆربەی جاریش پارە کاغەزێکی بێبەهایان دەدانێ و کاتی واش هەبوو دەستبەجێ و بەزۆر لە بندەستیان دەردەهێنان .[6] لە ناکامی

---

[2] سەبارەت بە رێناکردنەکەی زەکی بڕوانە : محمد امین زکی ، خلاصة تاریخ الكرد ، ٢٦٩-٧٢

[3] هەمان سەرچاوە ، ٢٧٤

[4] هەمان سەرچاوە.ئەم هێزە خێڵەکییانە بە هەزاران کەس ئەژمارکراون.

Bell, Review of the Civil Administration,4

[5] زكي ، خلاصة تاريخ الكرد ، ٢٧٤-٧٥

[6] هەمان سەرچاوە.٢٧٧-٧٨ .

ئـەم جـۆرە کارانـەدا ، بەشـێکی زۆری وەرزێـڕ و شـوانکارەکانی کـورد بـە بەرهـەم و مێگەلەکانیانـەوە بـەرەو بەنـدەن و شـوێنە سـەخت و دوور دەسـتەکان هـەڵاتن .بەمـەش ناردنی پێویستییە خۆراکییـەکان لـە شـار و گونـدەکان بـڕا و بـووە هـۆی کەوتنـەوەی قاتوقڕیی و برسێتیی لەنێو خەڵك و هـەروەها هێزە چەکدارەکاندا . هێزەکانی سوپای دووەم ، سێیەم هەروەها شەشەمی عوسمانیی بە شێوەیەکی مەزن لە سایەی برسێتیی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی دەیاننالاند سوپای سێیەم بەتایبەتیی لە ئاکامی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی لـەرزوتاو تیفـۆوە قڕیـان تێکـەوت .[7] دانیشتووانی شـارەکان لـە ئاسـتێکی بەربڵاوتردا بەدەست ئاسـەواری جەنگـەوە گیرۆدە بوون ، ناوچەی سلێمانی لە ساڵی ١٩١٧ دا تووشـی قاتوقڕییـەکی سـەخت بـوو ، لـە ئاکامـدا حـەفتا لـە سـەدی دانیشتووانەکەی و سەربازانی ناوچەکە تێداچوون .[8]

بەڕێوەبردنی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان لە هەردوو بەشی کوردستانی تورکیا و ئێراندا بە دڵڕەقییەکی لەڕادەبەدەرەوە ئەنجامدەدرا و جەنگاوەرەکان چ بایەخێکیان بە سەروماڵی دانیشتووانی ناوچەکە نەدەدا . بەربڵاویی وێرانکاریی و نەهامەتیی خەڵکەکە بە گۆڕینی دەرفەتی جەنگەکە توندوتیژتر دەبوو . پێشڕەویی و پاشەکشەی ناوبەناوی هـەردوو سـوپا لەشـەڕداگلاوەکە بەشـێوەیەکی بـەردەوام کوشـتن ، دەسـتدرێژیی بۆ سـەر ئافرەتان ، هەروەها کاولکاریی بەدوای خۆیدا دەهێنا . زۆربەی ناوچەکان لـە سەراسـەری کوردستاندا وێرانبوون و خەڵکەکەشی لەنێوچوون .

چەند نموونەیەکی کەم ، وێنەیەکمان لەمەڕ ئەو زیان و کاولکارییە پێشاندەدات کە تووشـی کـورد هـاتبوو . کاتێك رووسـەکان لـە دیسـەمبەری ١٩١٩دا جمانـە ناوچـەی بایەزید –ئەلیشکر لە باکووری کوردستان ، دەگوترێت تـەنیا دەیـەکی دانیشتووانەکەی لەدەسـت توندوتیـژیی دڕندانـەی یەکـە ئەرمەنییـەکانی بـەرووس پەیوەسـتەوە گیانیـان

---

[7] هەمان سەرچاوە، ٢٧٧

[8] هەمان سەرچاوە، ٢٧٩. بەگوێرەی (سۆن)، دانیشتووانی سلێمانی کە لە نۆڤەمبەری ١٩١٤دا بە بیستوپێنج هەزار کەس ئەژمارکراون . لە نۆڤەمبەری ١٩١٨دا کاتێك بەریتانییەکان شارەکەیان گرت بۆ دووهەزار و پێنج سەد کەس دابەزیبوون . نەخۆشیی و برسێتی رۆژانە زیندووەکانی قڕدەکرد بڕوانە:

Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919(Baghdad Government Press, 1920) :339.

دەربردبوو .[9] پاش هەڵگیرساندنی شۆڕشی رووسیی و هەرەسهێنانی سوپای رووسیا لەساڵی ١٩١٧ دا ، باندە سەربازییەکانی ئەرمەن ، ئەو لغاوەیان پساندبوو کە لەدەستی ئەفسەرە سەربازییەکانی رووسیادا بوو . ئەوانە رەشەکوژییەکی مەزنیان لە کوردی ناچەی ئەرزیرۆم-ئەرزنجان کرد .[10] ناوچەکانی دیکەی وان ، بدلیس و مووش تووشی هەمان چارەنووس بوونەوە .

هەرێمێکی دیکە کە لەماوەی جەنگدا تووشی وەیشوومەی گەلێك مەزن بووەوە بریتیبوو لە ناوچەی شەمدینان-رەواندز لە کوردستانی ناوەند . لەسەد گوندی خێڵی باڵەك ، جگە لە سێ‌چوارێکیان نەبێت ، ئەوانەی تر سوتێنران و لەگەڵ زەوی تەختکران . هەروەها لە سی گوندی رەواندۆك کە بەشێکن لە برادۆستییەکان ، نە پیاوێك یا ژنێك یا منداڵێکی تێدا نەمابووەوە .[11] سەبارەت بە برادۆستییەکان بەگشتیی ، لەو هەشتاویەك گوندەی کە پێش جەنگ هەیانبوو ، پەنجاودووی لەلایەن رووسەکان یان عوسمانییەکانەوە کاولکران و ١٠٨٠ خێزانی خێڵەکە بۆ ١٥٧ خێزان دابەزیبوو .[12] خێڵی خواروك کە دەگوترێت لەپێش جەنگدا ژمارەی خێزانەکانی ١٥٠ دەبوو ، لە ساڵی ١٩١٩دا تەنیا حەوت خێزانی مابووەوە .[13] هەروەها هەواڵی ئەوە هەیە کە لەو ٢٥٠ خانووەی لە ئەهریی هەبوو ، تەنیا ١٠ دانەیان بەپێوە مابوو ، لە کاتێکدا لە ٢٠٠٠ خانووەکەی رەواندز ، تەنیا ٦٠ دانەیان لە کۆتایی جەنگدا مابووەوە .[14] لەناوچوونی

---

[9] Yalman,218-19.

[10] جەمال پاشا ، یەك لە سێ سەرکردە بەهێزەکەی تورك لە دەورانی جەنگدا ، بەدرێژیی ، بەڵام لایەنگرانە و تەنگەتیلانە باسی لەو رووداوانە کردووە . ئەو باس لەوە دەکات کە ئەرمەنییەکان ملیۆن ونیوێك تورك و کوردیان کوشتووە . (یەلمان) هەرچەندە ئەم ژمارەیە بە زێدەڕۆیی دادەنێت ، بەڵام دەڵێت کوژراوەکان لە زۆرترین حاڵەتدا هەر چل هەزارێکە

Djemal (Ahmad) Pasha, Memories of a Turkish Statesman, 1913-1919(Londen:Hutchison,1922), 280ff;Yalman,221-22.

[11] E.W. Noel , Note on the Kurds Situation.5.

[12] Mason ,Kenneth ." Central Kurdistan ."339.

[13] Ibid.,329.

[14] Ibid.,330.

خەڵکەکە زیاتر بەهۆی قاتوقڕیی ، تیفۆ و بڵاوبوونەوەی ئەو ئەنفلوزا کوشندەیەی ساڵی ١٩١٩ بوو زیاتر لەوەی بەهۆی پەلامار و چالاکی سەربازییەوە بووبێت .[١٥]

دانیشتووانی ناوچەی خانەقین و دەوروبەری کەلەپاڵ تورکەکاندا ساڵی ١٩١٦ دژی پێشڕەویی رووسەکان وەستان ، لە کاتێکدا ناوچەکەیان لە ئەپڕیل بۆ ژوونی ١٩١٧ کەوتە بەر داگیرکاریی رووسەکان ، تووشی مەینەتییەکی زۆر سەخت بوون .[١٦] دانەوێڵە و خۆراک و مەڕومالاتیان دەستی بەسەرداگیرا . کشتوکاڵ و ناودێرییان تێکچوو . دەستدرێژی دەکرایە سەر خەڵکەکە و موڵک و ماڵیان تالان دەکرا . لەگەڵ کەمبوونەوەی خواردەمەنیی ، برسێتیی و جەردەییش پەرەیسەند ، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکەکە بەرەو[١٧] ئەو ناوچانە هەڵاتن کە لەبندەستی تورکەکاندا بوون . سەرچاوە هاوچەرخە بەریتانییەکان بەدکاریی سوپای رووسیان لە ناوچەی خانەقین بۆ ئەو لەگرێژنە دەرچوونە گێڕاوەتەوە کە لە ناکامی شۆڕشەکەی رووسیا بەسەر نەزم و ڕەفتاری سەربازانی رووسدا خۆی سەپاندووە .[١٨]

لە کۆتایی ژوونییەی ١٩١٧دا ، رووسیا ناوچەی خانەقینی جێهێشت و دەستبەجێ لەلایەن تورکانەوە داگیر کرایەوە ، تورکان بەوە ناسرابوون شێوازیی

---

ماسۆن جەخت لەوە دەکاتەوە ئەو یەکە ئەرمەنییانەی بە هێزەکانی رووسەوە پەیوەست بوون و لەژێر فەرماندەیی ژەنەراڵ جیرنۆزبۆفدا پێنج هەزار کەسیان پیاو ،ژن و منداڵیان کوشت لە رەواندزدا ، هەرچەندە ئەم جەختکردنەوەیە لەلایەن باسیل نیکیتینەوە رەتکراوەتەوە سەبارەت بە ناوچەی ئەهری-رەواندز و ئەو رێگەیەی لەلایەن سوپای قەفقاسیی رووسییەوە بەرەو کوردستانی ناوەند گرتیانەبەر بڕوانە:

Nikitine, " La systeme route du Kurdistan," La Geographie 63,nos.5-6(May-June 1935): 363-85.

[15] Ason,330-31.

[16] Bell, Review of the Civil Administration,44-46.

بۆ زیاتر لەمەڕ تێرژانی هێزەکانی رووس بۆ نێو خانەقین بڕوانە:

E.J.R.,2; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,107.

[17] بۆ درێژەی باسی تالانی خانەقین لەلایەن هێزەکانی رووسەوە بڕوانە:

E.J.R .,3; Bell, Review of the Civil Administration,44-45.

[18] Bell, Review of the Civil Administration,45,and E.J.R,4.

توندوتیژیی و زۆریان بۆ چنگخستنی خۆراك و پێویستییەكانی دیكە بەكاردەهێنا ، هەربۆیە كاولكردن و وێرانكردنی ئەم هەرێمەیان بە تەواویی بە ئەنجام گەیاند .[19]
بەزینی هێزە سەرەكییەكانی تورك لە باكووری بەغدا ، بووەهۆی پاشەكشەی گشتی هێزەكانی تورك ، بەوەش هێزەكانی بەریتانیی لە دیسەمبەری ١٩١٧دا چوونە خانەقینەوە . لەوێ ئەوان خەڵكیان لە داماویی و ئەهامەتییەكی مەزندا بینی . بەگوێرەی یەك لە سەرچاوە فەرمییەكانی بەریتانیی:" لەهیچ بەشێكی میسۆپۆتامیادا رووبەرووی ئەهامەتییەكی وەك ئەوەی خانەقین نەبووینەوە . رووسەكان وڵاتەكەیان درووێنە كردبوو ، پاشتریش توركان گسكیان لێدابوو ، دوای ئەوە پاشەكشەیان كردبوو ، ناوچەكەیان لە هەردوو حاڵەتیی برسێتیی و نەخۆشییدا جێهێشتبوو ."[20]
وێڕای بێلایەنیی ئێران ، هەرێمی كوردستانی ئێرانیش هەر زوو پاش هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕ لە نێوان رووسیا و توركیادا بووە مەیدانی جەنگ و ململانێ . لە ئاكامی ئەو شێوازە توندوتیژەی لەلایەن هەردوو سوپاكەوە گیرابووەبەر ، تەواوی هەرێمەكە كاول ببوو ، دانیشتووانەكەی داماو و ریسوا ببوون . زۆربەی ئەوانەی لەمیانەی پەلامار و هێرشەكاندا نەكوژرابوون ، بەدەست بێخۆراكیی و بێپەناگەییەوە دەیانناڵاند و هەزارەها لەبرسێتیی و نەخۆشیی داوێنی مەرگیان گرت . ئەم باسكردنەی خوارەوە سەرنجێكمان سەبارەت بەو ئەهامەتییە دەخاتە بەرچاو كە لەكاتی جەنگدا لە كوردستانی ئێران باڵادەست بوو:
" گوندەكان بەهۆی جرتوفرتی سوپاكانی رووس و توركەوە كاولبوون ، كۆڵەكەی خانوو و كاریتەی بانەكان دەردەهێنران و پاش پارچەپارچە كردنیان وەك

---

[19] توركان ،بەدوای گەڕانەوەیان بۆ ناوچەی خانەقین- قزڵرِبات كەوتنە تیرەبارانكردنی ژمارەیەك لە پیاوماقوڵانی ناوچەكە ، لەوانە ئەندامانی هێندێك بنەماڵەی سلێمانی . سەبارەت بە ناردنی یەكەكانیان بەرە ژوروو بۆ سەر زێی بچووك بڕوانە: Bell, Review of the Civil Administration,46.

[20] سەبارەت بەو ئەهامەتیی دانیشتووانەكە و دابەزینی ژمارەیان بەهۆی نەخۆشیی و برسێتییەوە بۆ سێ یەكی ژمارەی پێشووی بڕوانە :

Iraq (British Administration), Report of Administration for 1918 of Divisions and Districts of the Occupied Territories in Mesopotamia :I.Khanqin District (Madres: Vasanta Press, 1919) ,32-34.

سووتەمەنیی بۆ خۆگەرمکردنەوە بەکاردەهێنران .دواتر باران و بەفری زستان ئەرکی وێرانکردنی خانووەکان و تلیساندنەوەی دیوارە قوڕەکانیان تەواوکرد . مەڕاکان بە نەکێڵراوی جێهێڵرابوون ، تەنانەت گەر جووتکارێکیش مابووبێتەوە ئەوە نەک تەنیا هەر لەبەر ئەوە بووە کە برسێتی بڕستی لێبڕیوە و توانای بەسەر راکردندا نەشکاوە . بەڵکو چونکە پەناگەیەکی ئەوتۆشی نەبووە بۆ هەڵاتن کە بەدڵنیاییەوە رووی تێبکات ، نەک هەر لە کوردستانی ئێراندا ، بەڵکو سەراسەری ئێرانیش بەدەست برسێتییەوە زووقەی دەهات."[21]

لە کۆتایی جەنگدا ، پاش چوار ساڵ توندوتیژیی و وێرانکاریی ، تەواوی ناوچەکە لە بارێکی وێرانەییدا بوو . هەزارەها کوردی نەخۆش و برسیی رژانە ورمێوە بەدوای نان و پەناگەیەکدا ویڵبوون . ئەو پەنابەرانەی لە بارێکی هێندە ریسوایی و داماوییدا بوون تەنانەت دوژمنە سەرسەختەکەی پێشوویان کە ئاسوورییەکان بوون ، کەوتنە ئەوەی چەندە دەتوانن هاوکارییان بکەن و کێشەکەیان بخەنە بەردەم کۆمسیۆنی فریاکەوتنی ئەمەریکیی و بۆیان تێکەون . بەگوێرەی شایەتحاڵێکی ئەمەریکیی :" ئاسوورییەکان کوردە برسیی و پەشیمانبووەکانیان لە ماڵ و ئەو بەشە کەمەی دانەوێڵەیەی هەیانبوو بەشدار کرد . هەروەها تەواوی کەشیش و مەزنە کەشیش و رێبەرە ئایینییەکانی کڵێسای ئاسووریی یاداشتنامەیەکیان دا بە ئەمەریکییەکان داوایان لێکردن هاوکاریی بەپەلە بۆ کوردانی مەینەتبار رەوانە بکرێت ، دۆستەکان و دوژمنەکان وەك یەك ."[22]

لەساڵانی جەنگدا ریشەکێشکردنی بەرچاوی دانیشتووانی کورد ئەنجامدرا .

---

[21] Bell, Review of the Civil Administration,47.

[22] Ellis,William T.The Yankee Cadi,19

هەروەها باسیل نیکیتینی کۆنسوڵی رووسیی لە ورمێ داوای لە کۆمیتەی فریاکەوتنی ئەمەریکیی کرد چەندەی بۆیان دەکرێت بەدەم نەهامەتیی و ئازارەکانی کوردەوە بچن . کۆمیتەکە چەندی لەتوانادا بوو خواردنی خستەبەردەم کوردەکان . بەڵام وەك (شێد) دەڵێت :" هەرچەندە هەوڵماندا یارمەتییان بکەین بەڵام ئەوانە وەك مێش دەمردن ، تەواوی هەوڵەکانمان بەئەستەم دەیتوانی لە رادەی نەهامەتییەکەیان کەم بکاتەوە "

Nikitine ,Les Kurdes,297-98; Shedd,236-37.

وێڕای ئەو کوردانەی کە لە کوردستانی تورکیا و لەبەردەم پێشڕەویی سوپای ڕووسیی خۆیان بۆ ڕانەگیرا و هەڵاتن ، دەردەکەوێت کە کۆچاندنی دانیشتووانی کورد بەشێوەیەکی بەرفراوان لەلایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە بەرنامەی بۆ دانرابوو . لەو ڕووەوە فەرمانێکی ئیمپراتۆریی لەلایەن سوڵتان محەمەدی پێنجەمەوە بۆ داڕشتنی بەرنامەی کۆچاندن و نیشتەجێکردنی کورد بەڕێوەچوو . بەگوێرەی ئەم بەرنامەیە کوردان دەکرانە دەستە و تاقمی بچووک بچووک لە ناوچە و ویلایەتە تورکزمانەکانی ئەنەدۆڵی ڕۆژئاوادا نیشتەجێ دەکران بەمەرجێك ڕێژەیان لەو ناوچانە دەبووایە لە سەدا پێنجی تێکڕای دانیشتووانەکە تێپەڕ نەکردایە . دەبووایە سەرۆك و خانەدانەکانی کورد لە شار و شارۆکەکاندا نیشتەجێ بکرانایە و هەموو پەیوەندییەکیشیان لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیاندا بە توندیی قەدەغە بکرایە .[23] بەگوێرەی بلەچ شێرکۆ ، تۆماری بەڕێوەبەرایەتیی پەنابەریی تورکیی بەڵگەی ئەوە دەداتە دەست کە حەوت سەد هەزار کورد ناچار کراون ماڵەکانیان جێبهێڵن . سەرچاوە کوردییەکان ئەو هەواڵە ئاشکرا دەکەن کە زۆربەی ئەو خەڵکانە پێش ئەوەی بگەنە شوێنی نوێی جۆربەجۆری نیشتەجێبوونەکەیان ، بەهۆی برسێتیی ، سەرما و نەخۆشیی گیانیان لەدەستداوە .[24]

### چالاکیی نەتەوەخوازانی کورد لەماوەی جەنگدا

هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی سەلماندی کە زێدەتر لە سەرکوتکردنی تورکە لاوەکان ناستەنگی لەبەردەم نەتەوایەتیی کوردییدا پێکهێناوە . جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا پوکایەوە و هەڵپەسێردرا ، لە کاتێکدا ئەو ململانێیە و کێشمەکێشەدا مەزنە ، کە کورد بۆ خۆی تێوەگلا ، قورسایی و بارگرانییەکی مەزنی لە ڕووی توانای ماددیی و مرۆییەوە خستەسەرشان . تێوەگلانی قووڵی کورد لە چارەنووسی نالەبار و خەمنەنگێزی ئەرمەنییەکان ج ڕێگەیەکی نەهێشتەوە جگە لەوەی پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان لەگەڵ تورکاندا هەبێت بۆ ئەوەی

---

[23] Chirguh, La question kurde, 23; Beder Khan, Sureya . The Case of Kurdistan against Turkey . Philadelphia : Kurdish Independence League ,1927,32-33.Also E.W. Noel . Note on the Kurds Situation.5

[24] Chirguh, La question kurde, 23; Beder Khan Sureya, 32-33.

بەرەنگاریی مەترسیی هاوبەشی جەنگ ببنەوە . هەرچەند دەستەیەکی بچووک لە نەتەوەخوازانی کورد لە تاراوگە بوون و لە تێکۆشانیان بۆ سەربەخۆیی بەردەوام بوون . هێندێك لەوانە روویان لە ئینگلتەرا کرد و هێندێکیشیان بەرەو رووسیا رۆیشتن . ئەو دوو زلهێزەی کە لەگەڵ ئیمپراتۆریی عوسمانیی لەجەنگدا بوون .

لە دیسەمبەری ١٩١٤دا ، ژێنراڵ محەمەد شەریف پاشا داوای کرد تا راژە بە هێزە سەربازییەکانی بەریتانیی لە میسۆپۆتامیادا بکات ، ئاشکرایە بە مەبەستی بەدەستهێنانی دڵنیاییەك سەبارەت بە ئایندە و چارەنووسی کوردستان . داواکەی لەو کاتەدا پشتگوێخرا ، چونکە بەریتانییەکان چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد کە کاری سەربازیی بگاتە ئەو ناوچە دووردەستە .[25] ژێنراڵ شەریف پاشا هەروەك دەبینین لە کۆتایی جەنگدا سەرلەنوێ داواکەی خۆی بۆ پەیوەستبوون بە بەریتانییەکانەوە دووبارە دەکاتەوە .

ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخان ، بەتایبەت ، عەبدولڕەزاق و کامیل بەگ بەدرخان ، جەختیان لە پەیوەندییەکی نزیك و هەماهەنگ لەگەڵ رووسەکاندا کردەوە . پاش ماوەیەکی کەم لە شۆڕشی تورکەلاوەکان ، عەبدولڕەزاق بەدرخان ، کە وا رێکەوتبوو لە پاریس بێت ، هەواڵی ئەوە هەبوو کە چۆتە لای رووسەکان بۆ ئەوەی مەبەستیان سەبارەت بە کوردستان بزانێت .[26] وادەردەکەوێت کە لە ساڵی ١٩١٦دا ، کامیل بەگ بەدرخان چالاکانە لە پێناو دەرخستنی پرسی نەتەوەیی کورددا لە تفلیسی تێبکۆشێت و ئەو پرسەی لەبەردەم دۆقی مەزن (نیکۆلاس) جێگری تزار لە قەفقاس و جێگری فەرماندەی بەرەی قەفقاس دانابێت .[27]

لەو ماوەیەدا رووسەکان رۆژهەڵاتی تورکیایان لە ١٩١٧دا داگیرکرد . کامیل و

---

[25] E.J.R.,2; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,77; Bell, Review of the Civil Administration,60; A.T.Wilson,Loyalties: Mesopotamia, vol.2:1917-1920, 1936, 130.

[26] Nikitine ,Les Kurdes,195.

بەگوێرەی نیکیتین ، عەبدولڕەزاق بەدرخان لەساڵی ١٩٠٩دا لە سانت پترۆسبێرگ بووە وەك ئێلفینیستون دەڵێت لەکاتێکدا عەبدولڕەزاق پەیوەندیی لەگەڵ رووسەکاندا پتەو بووە .لە سانتپترۆسبێرگ پەیوەندیی بە سەفارەتی تورکییەوە هەبووە Elphinston, "Azizan,"25.

[27] Nikitine ,Les Kurdes,195.

عەبدولڕەزاق بەدرخان لەلایەن ڕووسەکانەوە بە والی ئەرزڕۆم و بدلیس دامەزرێنرابوون .[28] هەواڵی ئەوە هەیە عەبدولڕەزاق ، کە پاش جەنگ وەك کەسێکی کارا و بەرچاو لەنێو کاروباری نەتەوەیی کورددا دەرکەوتەوە ، لەلایەن تورکانەوە لە موسڵ لە ساڵی ١٩١٨دا ژارخواردوو کرابێت .[29] لەکاتێکدا هەواڵەکان باس لەوە دەکەن کە کامیل تا سێپتەمبەری ١٩١٩ لە تفلیس مابووەوە .[30] ئەندامێکی دیکەی ئەم بنەماڵەیە کە سورەییا بەگی کوڕی ئەمین عالی بەدرخانە ، تێکەڵ بە چالاکییە نەتەوەییەکانی کورد لە قاهیرە بووە و لەوێ ڕۆژنامەی کوردستان ی بڵاوکردۆتەوە ، بێگومان بە پشتگیری و هاوکاریی بەریتانییەکان .[31]

ماوەیەك پێش جەنگ ، شێخ سەید تەهای دووەم ، پێدەچوو کە لەگەڵ ڕووسەکاندا پەیوەندییەکی فەرمیی دامەزراندبێت . هەواڵی ئەوە هەیە کە ناوبراو بەنێو ڕووسیادا گەڕابێت و زمانی ئەو وڵاتەشی بە پاراویی زانیبێت .[32] پاش ئەوەی ماوەیەکی لە تۆفلیك ڕووسیك بەسەربرد ، شێخ بە ئاشکرا وەك ڕەعییەتێکی ڕووس گەڕایەوە و لە گوندی ڕاجان ی سەر سنووری تورکیا-ئێران لێیداکوتا .[33] بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی ، شێخ سەید تەها تەنیا هەر پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ کارمەندە ڕووسەکانی کۆنسوڵگەرییدا نیە ، بەڵکو" لەهەمان کاتدا بۆچوونێکی وا هەیە کە لەوانەیە بکرێتە سەرۆکێکی ڕواڵەتیی بۆ کوردستانێکی بەناو سەربەخۆ کە لەژێر سەرپەرشتیی ڕووسیا بێت ."[34] بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی دیکە کە باس لە چالاکییەکانی سەیدتەها بە قازانجی ڕووسەکان لە پێش جەنگدا دەکات ،" تەنانەت

---

[28] E.M. Noel, Diary,54-55.

[29] Ibid.,63.

[30] Ibid.,55

[31] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,113.

[32] Hay. W.R.Two Years in Kurdistan, 353.

[33] بەگوێرەی نیکیتین ، پەنابردنی کاتیی سەیدتەها بۆ ڕووسیا لەئاکامی ئەو تۆمەتبارکردنانەوە بوو کە لەلایەن شێخ عەبدولقادری مامی و توندترین مێملێیەوە دژی ئەو خرایە بەردەست دەسەڵاتدارانی ئەستەمبوڵەوە

Nikitine ,Les Kurdes,194.

[34] Bell, Review of the Civil Administration,65.

بەوەی ئەو بۆ سەربەخۆیی کوردستان لە سایەی پاراستنی رووسەکاندا تێدەکۆشا ، بەوەی رووسەکان زیاتر لە ئێرانییەکان دەتوانن هێمنیی و ئارامیی بپارێزن و دەسەلاتیان بچەسپێنن ."[٣٥] لەماوەی جەنگدا ، لەسۆنگەی ئەوەوە سەیدتەها خوازیار بوو قازانج لە هەردوولاوە بەدەستبهێنێت . لەچەند کاتێکی جیاوازدا کەوتە زیندانی هەریەك لە تورك و رووسەکانەوە .[٣٦] لەبەر ئەوەی دەیویست پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ ئەڵمانەکاندا هەبێت ، رووسەکان گومانیان لە وەفاداریی و لایەنگرییان کرد و لە تۆڵەی ئەوەدا کاتێك لە ساڵی ١٩١٦دا هێزەکانیان سنووری تورکیا – رووسەکانی تێپەڕاند و گەیشتنە نەهریی ، ماڵەکەی سەیدتەهایان وێرانکرد .[٣٧]

نیکیتین ئەو زانیارییەی پێداوین کە لە کۆتایی ساڵی ١٩١٧دا نامەیەکی لە (ئیستخلاسی کوردستان) ەوە بەدەستگەیشتووە کە لەلایەن سەیدتەهاوە نێردراوە . لەم نامەیەدا داوا لە نیکیتین کراوە دیدەنییەك لە نێوان سەیدتەها و فەرماندەی سەربازیی رووس رێکبخات بۆ ئەوەی پلانێك سەبارەت بە کاری هاوبەش دژی تورك بەلەبەرچاوگرتنی رزگارکردنی کوردستان دابنرێت .[٣٨] ئەو سەرچاوەیە لەسەری دەڕوات و دەڵێت ، هەردوو شێخەکە " هەر لەسەرەتای رۆژانی کێشمەکێشمەکەوە ئەوەی لەتوانایاندا بووە کردوویانە تا پلانە ستراتیژییەکەی ( فۆن دەرگۆڵتز) لەسەر سنووری ئێران هەڵبوەشێننەوە ."[٣٩]

## سەرنجی شەریف پاشا لەمەڕ ئایندەی کوردستان

جێی بیرهێنانەوەیە کە لە دیسەمبەری ١٩١٤دا هەوڵەکەی ژێنراڵ محەمەد شەریف پاشا بۆ لێکگەیشتن لەگەڵ سەرکردایەتیی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیی لە میسۆپۆتامیا سەرکەوتوو نەبوو . وێڕای ئەم وەڵام نەدانەوەیە ، ئەو دەستبەرداریی ئەو هیوایەی سەبارەت هاوکاریی کورد و بەریتانییەکان نەبوو ، لە ژوونی ١٩١٨دا ،

[35] Driver ,"Kurdistan and The Kurds.106.

[36] Ibid.

[37] Bell. Review of the Civil Administration.69.

[38] Nikitine .Les Kurdes.195.

[39] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,195.

لەکاتێکدا هێشتا بە روونی ئاشکرا نەبوو ، شەریف پاشا پەیوەندی بە (سێر پێرسی کۆکس) [40]ی ئەفسەری گشتیی سیاسیی هێزەکانی بەریتانیی لە میسۆپۆتامیاوە کرد و رایسپارد کە پێویستە بەریتانیا سیاسەتێکی ئازایانە و دووربینانە لەهەمبەر کورد بگرنەبەر . ئەم راسپاردەیە ئەگەر وەرگیرابایە کاری پێبکرایە ، ئەوە بنەما و بنچینەکی بۆ پەیوەندییەکی کەموێنە و پشتبەیەکبەستن لە نێوان بەریتانییەکان و کورد پێکدەهێنا . لە راستییدا ، لەساڵی ۱۹۳٦ (سێر ئارنۆڵد ویلسن) ئەم راسپاردەیەی شەریف پاشای وەك پێشبینییەکی زیرەکانە بۆ سیستەمی ماندێتی ناساند . [41]

شەریف پاشا سەبارەت بە وتووێژکردن لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵ کۆکسدا ، بەتوندیی هانیدا کە پێویستە بەریتانییەکان هەنگاوی خێرا و دەستبەجێ بۆ راکێشانی کوردبنێن لە رێگەی راگەیاندنی سیاسەتێك کە خولیا و ئومێدەکانی کورد لەبەر چاوبگرێت . ئەو ئامارەی بەوەدا کە بۆ گەیشتنە ئەو ئامانجە پێویستە بەریتانیا راگەیاندنێکی فەرمیی سەبارەت بە مەبەستی خۆی لەمەڕ ئایندەی کورد بڵاوبکاتەوە ، ئەو کارەی کە تا دواپلە گرنگیی خۆی هەیە . [42] ئەو پێشنیازی ئەوەی کرد کە پێویستە بەریتانییەکان بەڵێنی مسۆگەرکردنی ئۆتۆنۆمیی بە باشووری کوردستان بدەن ، هەروەها پێویستە کارمەندی بەریتانیی بنێردرێت بۆ یارمەتییدانی بواری کارگێڕیی ئەو وڵاتە و رێکخستن و پێڕاگەیشتنی کاروبارە داراییەکەی . [43] شەریف پاشا دژی گرێدان و

---

[40] بەگوێرەی بێل ، دیدەنییەکەی نێوان شەریف پاشا و سێر پێرسی کۆکس لە مارسیلییا ئەنجامدراوە ، بەڵام بەگوێرەی ویلسن ، لە لەندەن روویداوە

Bell, Review of the Civil Administration,60; A.T.Wilson,Loyalties,2:130.

[41] Ibid.

[42] E.J.R.,7; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,101-2; A.T.Wilson,Loyalties,2:130.

[43] E.J.R.,7; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,102; A.T.Wilson,Loyalties,2:130.

بەگوێرەی ئەم سەرچاوانە ، پەرۆشی شەریف پاسا سەبارەت بە باشووری کوردستان بۆ ئەوە دەگێڕنەوە کە شەریف پاشا خۆی لەدایك بووی ئەو بەشەی کوردستانە ، بەڵام من لەگەڵ ئەو پەیوەندییەی کە دەگونجێت هێشتا شەریف پاشای بەو بەشەوە بەستبێتەوە ، بەرەو زۆرر بوونەوەی هێزەکانی بەریتانیی بە ئاراستەی موسڵ بە هۆکارێکی دیکە دەزانم .

بەستنەوە ئامۆژگارییدا ، ئەو بۆچوونەی کە لەماوەی جەنگدا لە راگەیاندنەکانی بەریتانیادا چەندبارە دەبووەوە ، ئەو لایەنگریی لە دامەزراندنی دەوڵەتە ئۆتۆنۆمەکان کرد کە لەلایەن بەریتانییەکانەوە بپارێزرێت ، چ لە کوردستان یا میسۆپۆتۆمیا ، یاخود هەر شوێنێکی دیکە .

سەرکردە کوردەکە جەختی لە گرنگیی دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتییەکی کارکردن لە ناوچە داگیرکراوەکانی میسۆپۆتامیا و کوردستاندا کردەوە بەشێوەیەك کە لە کۆنگرەی ئاشتیی داهاتوودا کە بەو نزیکانە دەبەسترێت وەك کارێکی باشی بەدیهاتوو بخرێتە بەرچاو . بە بۆچوونی ئەو ، کەنارخستنی مەسەلەکان تا ئەوکاتەی کۆنگرەی ئاشتیی دەبەسترێت ، مانای سیاسەتێکی تەواو گێلانە دەگەیەنێت ، چونکە دەبێتە هۆی پاشاگەردانیی و ناجێگیریی لە سەراسەری ناوچە داگیرکراوەکاندا . شەریف پاشا هانی بەریتانییەکانی دا کە چ پێشنیازێکیان بۆ عەرەبی میسۆپۆتامیا هەیە ، پێویستە هەمان شتیش بۆ کورد بکەن .

لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٨دا ، شەریف پاشا نووسراوێکی ئاراستەی دەسەڵاتدارانی بەریتانیی کرد و ئاماژەی بەوەدا کە هەلومەرجی سیاسیی بەرەو خراپیی دەڕوات لەئەنجامی ئەو سەرکەوتنەی تورکیا لە بواری وروژاندنی قینەبەرایەتیی لەنێوان کورد و ئەرمەندا بەدەستیهێناوە . ئەرکی سەرەکیی ، بە بڕوای ئەو ، هێنانە کایەی ئاشتەوایییەکە لەنێوان هەردوو گەلدا کە لەسەر بنەمای دانپێدانانی هەردوولا بە خواستە رەواکانی هەردوو نەتەوایەتییەکەدا دامەزرابێت . بۆ ئەم مەبەستە ، ئەوپێشنیازی دامەزراندنی دەستبەجێی کۆمسیۆنێکی لە شاری لەندەن کرد کە لە نوێنەرایەتیی هەردوو گەلی کورد و ئەرمەن پێکبهێنرێت .[44] هەرچەندە کۆمسیۆنێکی بەو چەشنە هەرگیز دانەمەزرا ، بەڵام شەریف پاشا توانی لە کۆنگرەی ئاشتییدا ، لەگەڵ سەرکردە ئەرمەنەکاندا پێکبێت و لەو بوارەدا سەرکەوێت .

## چالاکییەکانی کورد لە کۆنگرەی ئاشتیی و هەروەها لە ئەستەمبوڵ

رێکخراوە نەتەوایەتییەکانی کورد شەریف پاشایان بۆ کۆنگرەی ئاشتیی بە

---

[44] E.J.R.,8; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,102.

نوێنەر هەڵبژارد . ئەم ئەرکە گرانییەکی تایبەتیی هەبوو ، چونکە بەر لەوەی هەر پێشکەوتنێك بەدیبهێنرێت ، پێویست بوو بەسەر ئەو هەستە ناحەزییەدا زاڵبێت کە نوێنەرانی هاوپەیمانە سەرکەوتووەکان لەهەمبەر کورد هەیانبوو ، هەستێك کە میراتیی رووداوی رەشەکوژیی ئەرمەنەکان بوو . وا پێدەچوو شەریف پاشا زۆر بە باشیی خۆی ئامادەکردبێت بۆ ئەوەی پرسی گەلەکەی بە روونی لە کۆنگرەکەدا بخاتە بەرچاو ، ئەو بە لێهاتوویی و شانازییەکی فرەوە توانی سۆزی دەوڵەتانی رۆژئاوا و دۆستایەتیی ئەرمەن بەدەستبێنێت . زۆری نەخایاند ، رێکەوتننامەیەکی کوردیی–ئەرمەنیی لەنێوان شەریف پاشا لەجیاتی کوردان و بۆغۆس نۆبار پاشا و ئاڤێتس ئەهارۆنیان لەجیاتی ئەرمەنەکان ، مۆرکرا .[45]

پەرسەندنی رووداوەکان تورکیان بەئاگاهێنایەوە ، ئەوانەی بۆ پێکهاتن لەگەڵ کوردەکانـدا هیچ کاتێکیان بەفیڕۆ نەدا . ئەوان بڕیاریاندا کە راستەوخۆ لەگەڵ سەرچاوەی گرفتەکەدا کە (کورد تەعالی جەمعیەتی) بوو ، مامەڵە بکەن . بەگوێرەی سەرچاوەیەکی کوردیی ، تورکەکان داوایان لەو کۆمەڵە نیشتمانییەی کورد کردبوو سێ نوێنەری خۆیان بنێرن تاکو بەشداریی لە لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە کێشەی کورد و هاوکاریی گەلاڵەکردنی بڕیارێك لەو بارەیەوە بکەن .[46] لیژنەیەکی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە پێکهات ، کە لە ئیبراهیم ئەفەندیی حەیدەریی (وەزیری بێ‌وەزارەت و شێخولئیسلامی پێشوو) ، عەبوك پاشا (وەزیری گشتیی کار و وەزیری پێشووی جەنگ) ، هەروەها عەونی پاشا (وەزیری هێزی دەریایی) نوێنەری حکومەتی عوسمانیی لیژنەیەکیان پێکهێنا .شێخ عەبدولقادری ئەهریی و ئەمین عالی بەدرخانیش وەك نوێنەر جەمعیەتی تەعالی کورد بەشدار بوون ، پاش وتووێژێکی کەم ، لیژنەکە بڕیاری لەم خاڵانەی خوارەوە دا:

---

[45] Chirguh, La question kurde, 24.

بەگوێرەی سەفرستیان ، ئەم رێکەوتنە لەنێوان شەریف پاشا و بۆغۆز نۆبار پاشا ئەنجامدراوە و ناوی ئاهۆرانیان ئاماژەی بۆ نەکراوە Safrastian,77.

[46] لەلای شێرکۆ وێنەیەك و وەرگێڕای فەرەنسیی نامەیەك هەیە کە بۆ ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانیی کورد نووسراوە نامەکە لەلایەن ئیبراهیم حەیدەریی شێخولئیسلامی پێشوو نێردراوە کە ئەندامی بنەماڵەیەکی ئایینیی بەناوبانگی شاری هەولێرن Chirguh, La question kurde. 25.

١-دانپێدانانی ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان لە کوردستاندا.
٢-راگەیاندنی دەستبەجێی ئەو یاسایانەی پێویستە وەك دەرئەنجامی ئەو بڕیارەی پێشوو دەربکرێن .
٣-جێبەجێکردنی هەموو ئەو کارو پابەندییانەی لە ئاکامی ئەو یاسایانەوە دێنەئارا بە شێوەیەکی رێكوپێك و خاوەخاوەنەکردن تیایاندا .
٤-کوردان پابەند دەبن وەك بەشێك لە ئیمپراتۆری عوسمانی بمێننەوە و لە دانپێدانان بە سەروەریی سوڵتان-خەلیفەدا بەردەوام بن .[٤٧]

بڵاوکراوەیەکی فەرمیی بەریتانیی سەرنجێکی جیاواز سەبارەت بەم رووداوانە پێشکەش دەکات ، ئەو دەڵێت تورکان هیچ داوایەکیان لە کۆمەڵەی تەعالی نەکردووە نوێنەری خۆی بۆ وتووێژکردن سەبارەت بەکێشەی کورد بنێرێت ، بەڵکە زیاتر بانگکردنێك بووە بۆ ئەوەی روونیبکەنەوە کە لەسەر بنەمای چ دەسەڵاتێك لەگەڵ بەریتانییەکاندا لە ئەستەمبوڵ دانوساندنیان سەبارەت بە چەند بابەتێکی تایبەت بە کورد کردووە . بە گوێرەی ئەم راپۆرتە ، کارمەندانی عوسمانیی ئاماژەیان بەوە داوە کە بابەتگەلێکی لەم شێوەیە پێشبڕکێیەکە لەگەڵ دەروازەی باڵادا ، ئەوەی وەك ئەوان جەختیان لەسەر دەکردەوە لە ئاستێکی وادایە کە ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان بۆ کوردان دەستبەر بکات .

دەگوترێت رەفعەت بەگ ، قسەکەری شێخ عەبدولقادر ، کە بۆخۆی لە گفتوگۆ و دیدەنییەکەدا نەبووە ، وەڵامی ئەوە بووە کە کورد بە پێی بنەماکانی (ویدرۆ ویلسن) کاری کردووە ، ئەو بنەمایانەی مافی داوە بە هەموو نەتەوەکان لە پێناو رزگارکردنی خۆیاندا تێبکۆشن . ئەو گوتی ، کوردان لەو باوەڕەدان کە تەنیا بەریتانیا دەتوانێت ئازادیی و ئاسایش بۆ کوردستان مسۆگەر بکات ، بۆ ئەو مەبەستەشە ئەوان دەستیان بە گفتوگۆ و دانوساندن لەگەڵ بەریتانییەکاندا کردووە ، رەفعەت بەگ گومانی خۆی لەوە دەربڕی کە تورکان بتوانن ئۆتۆنۆمیی بە کورد بدەن لەو دیدەوە کە ئایندەی خۆیان بەتەواویی روون نییە . سەبارەت بەم خاڵە دەگوترێت کە عەبۆك پاش بە توڕەییەوە لە قسەکەرەکەی کوردان هەستاوەتە سەرپێ و پێیگوتووە کە حکومەتی عوسمانیی لە

[47] Ibid.,24-25.

هەموو کاتێکی دیکە بەهێزترە و بڕیاریداوە دەست لە بستە زەمینێك لە خاکی خۆی بۆ کەس هەڵنەگرێت ، هەروەها فەرمانیداوە بە سوپای قەفقاسی تورکیی کە دژی هەموو سوپایەکی بێگانە راوەستێت هەروەها رێگەنەدرێت پەنابەرە ئەرمەنییەکان بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان لە دەوڵەتی عوسمانیدا ، لەم کاتەدا دەگوترێت عەونی پاش توڕەبوون و هەڵچوونەکەی عەبوك پاشای هێورکردۆتەوە .[48]

## رێکەوتننامەی سیڤەر

لەهەمان کاتدا ، واپێدەچوو هەوڵەکانی شەریف پاشا لە کۆنگرەی ئاشتییدا بەرهەمێکی بووبێت . خولیا و ئومێدی نەتەوایەتیی کوردیی ، هەرچەندە کەوتە بەر بارودۆخێکی بێهیوایی ، بەڵام لە کۆتاییدا دانپێدانانێکی فەرمیی و پشتگیریی لە رێکەوتننامەی کورت تەمەنی سیڤەردا کە لە ئووتی ١٩٢٠دا مۆرکرا ، بەدەستهێنا . ئەم رێکەوتننامەیە کەباسی لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی کوردیی کردووە بە بەردی بناغەی رووداوێکی مەزنی مێژووی کورد دادەنرێت .

بەشی سێیەم (بەندی ٦٢-٦٤) ی رێکەوتننامەی سیڤەر لەمەڕ کوردستان دەدوێت .[49] لە بەندی ٦٢دا هاتووە :" کۆمسیۆنێك کە لە ئەستەمبوڵ بارەگا دەخات ...پێویستە تاوەکو شەش مانگ لە رۆژی جێبەجێکردنی ئەم رێکەوتننامەیەوە نەخشەیەك بۆ دیارییکردنی هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیی دابنێت بۆ ئەو ناوچانەی کوردیان تێدا زاڵە و دەکەونە رۆژهەڵاتی رووباری فورات و باشووری سەرزەکانی ئەرمینییا وەك لە دواتردا دیاریی دەکرێت ، هەروەها باکووری سەرزی تورکیا لەگەڵ سوریا و میسۆپۆتامیا ."[50] هەروەها ئەم بەندە باس لە پاراستنی ئاسوریی-کلدانەکان و کەمینەی رەگەزیی و ئایینیی دیکەش کردووە . ئەم بەندە داوایکردووە بۆ ئەوەی ئەو پاراستنە جەختی

---

[48] Driver ,"Kurdistan and The Kurds, 99.

[49] The Treaties of Peace .(New York: Carnegie Endowment for International Peace ,1924), 2:807-8.

بۆ زیاتر لەبارەی کورد لە نێو رێکەوتننامەی سیڤەردا بڕوانە :

Chirguh, La question kurde,25-26;Safrastian ,77-78;K.Bedir Khan,233-34; Nikitine ,Les Kurdes,196-97; Minorsky ," Kurdes,". زكي ،خلاصة تاريخ الكرد،٢٨٢-٨٣

[50] The Treaties of Peace ,2:807.

لەسەر بکرێتەوە ، پێویستە کۆمسیۆنێك لە نوێنەرانی بەریتانیی ، فەرەنسیی ، ئیتالییەکان ، ئێرانییەکان و کورد پێکبهێنرێت بۆ " بڕیاردان لە دەستکاریی کردنی سنووری تورکیا گەر پێویستی کرد ، بەوشێوەیەی لەگەڵ بڕیارەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە بگونجێت ، ئەو سنوورەی کە هاوجووت نەبێت لەگەڵ ئەوەکەی ئێراندا ."[51] بەندی ٦٣ باس لە پەسەندکردن و جێبەجێکردنی نێوەرۆکی بەندی ٦٢ دەکات لە لایەن حکومەتی تورکییەوە .[52]

بەندی ٦٤ ی ڕێکەوتننامەی سیڤەر باس لەوە دەکات چۆن و کەی کوردان پەنا بۆ کۆمەڵەی گەلان دەبەن تا خواستی خۆیان سەبارەت بە وەرگرتنی سەربەخۆیی لە تورکیا بخەنە بەرچاو :"ئەگەر کوردەکانی ئەو هەرێمەی بڕگەی ٦٢ ی ئەم ڕێکەوتننامەیە دەیانگرێتەوە لەماوەی یەك ساڵدا لە ڕۆژی دەرچوونی ڕێکەوتننامەکەوە بتوانن بەڵگە پێشانی ئەنجومەنی کۆمەڵانی گەلان بدەن کە زۆرینەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە ئارەزووی سەربەخۆیی لە تورکیا دەکەن ، ئەگەر ئەنجومەنیش پێیوابوو کە ئەم گەلە شایەنی سەربەخۆیین و ڕاسپاردەی ئەوەبکەن سەربەخۆییان بدرێتێ ، تورکیا دەبێت ئەو ڕاسپاردەیە جێبەجێ بکات دەست لە هەموو ماف و پایەیەکی هەڵبگرێت کە لە ناوچەکە هەیەتی."[53]

لەکۆتاییدا ، بڕگەی ٦٤ دەڵێت پاش ئەوەی تورکان دەستبەرداری هەموو ماف و پایەیەکیان لەو ناوچەیەدا دەبن ، ئەوا هێزە هاوپەیمانەکان و دەوڵەتە سەرەکییەکان نارەزایەتیی پێشان نادەن بە ڕووی " سووربوونی خۆبەخشانە بۆ بوونە بەشێك لە دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆکە لە لایەن دانیشتووانی کوردی ئەو پارچەیەی کوردستان کە تائێستا لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵدان "[54]

ڕێکەوتننامەی سیڤەر ، وەك دەبینین ، لە لانکدا خنکێنرا و لەلایەن کەمالیستە تورکە بەخۆدا ڕاپەڕموومەکانەوە پێشێلکرا و لە ساڵی ١٩٢٣ بە ڕێکەوتننامەی لۆزان شوێنی گیرایەوە

---

[51] Ibid.

[52] Ibid.

[53] Ibid.,2:807-8.

[54] Ibid.,2:808.

# بەشی هەشتەم : هەلومەرجی کورد لە تورکیا ، ئێران و سوریا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی

## هەلومەرجی تورکیا

مۆرکردنی رێکەوتننامەی مۆدرۆس لەساڵی ١٩١٨دا ، نیشانەی بوژانەوەیەکی کتوپڕی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بوو لە تورکیا .ئەم پەرەسەندنە تەنیا لە ئاکامی تێکۆشانی نەتەوەخوازە کوردەکانی ئاراوگە ، یاخود دانیشتووەکانی نێو تورکیا نەبوو ، بەڵکو لەلایەن پشتگیرییکەرە چالاکەکانی تورکیشەوە بوو .

دەستپێکردنەوەی چالاکییە نەتەوەییەکانی کورد لە تورکیا و کوردستانی بندەستی تورک ، کاریگەریی دەستبەجێ و دوورمەودای هەبوو . بەشێوەیەکی مەزن توانای هێزە نەتەوەییەکانی کوردی لە هەموو لایەکەوە زیندەتر کرد ، مانایەکی نوێی بە چالاکییەکانی رۆشنبیرانی کورد بەخشی ، شانبەشانی ئەو تێکۆشانەی لەلایەن مەزنەپیاوانی کوردەوە لە پێناو پەیداکردن و دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆیان لە چەند بەشێکی دیارییکراوی کوردستاندا لە ئارادابوو.

رەگەزگەلێکی جۆراوجۆر ، تائەو کاتە بەمەبەستی جیاواز و هاوسۆزیی ناکۆك و بەرژەوەندیی ناتەبا ، پێکەوە کۆبوونەوە و خوازیاری دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ ، یان لانی کەم کوردستانێکی ئۆتۆنۆم بوون . هاندەر و ئامانجی لایەنگرە جۆربەجۆرەکانی ئەم جوڵانەوەیە بە ئەندازەی فرەیی ئەو تاك و کۆڕ و کۆمەڵە جیاوازانە ، جیاواز و جۆربەجۆر بوون . نەتەوەخوازیی ماندوونەناس ، مەزنە پیاوی خاوەن ئومێد و دەسەڵاتخوا ، کەسانێك کە بەهۆی کۆمەڵکوژیی ئەرمەن لە سزادان دەترسان ، کۆنە ئەندامە داخ لەدڵەکانی (ك.ی.پ) ، ئەفسەرانی سوپا ، تەنانەت نەتەوەخوازە عەرەبەکان کە خوازیاری ئەوە بوون کورد بخەنە نێو ئەو دەوڵەتە عەرەبییەی بەرنامەی بۆ دادەرێژرا ، هەریەك لەمانە هۆی تایبەت بە خۆی هەبوو بۆ ئەوەی پشتگیریی ئەم جوڵانەوەیە بکات

**سەرچاوەی پشتگیرییەکان بۆ جوڵانەوەی کوردیی**

جوڵانەوەی کوردیی هێز و توانای خۆی لە دوو سەرچاوەی جیاوازەوە وەردەگرت . یەکێکیان دەستەیەکی تورکخوا و ئیسلامخوا بوون کە سۆزی ئایینیی دەیهەژاندن و لەلایەن رەگەزە ئیسلامگەراکانەوە پشتیوانیی دەکران . سەرچاوەکەی دیکەیان نە تورکخوا بوون و نە پاڵنەرە ئایینییەکان هاندەریان بوو ، ئەوانە خولیای سەربەخۆیی تەواوی کورد بوون و لەلایەن نەتەوەخوازە کوردەکانەوە پشتگیریی دەکران . وێڕای ئەو جیاوازییە بنەڕەتییانەی لەمەڕ دوا ئامانجەوە لە نێوان ئەم دوو دەستەیەدا هەبوو ، ئەوان جیاوازییەکانیان پشتگوێخست و خۆیان لەشکاندنی ئاشکرای یەکتری بەدوورگرت .

دەستەی ئیسلامخواکان بە شێوەیەکی بنەڕەتیی دژی بیرۆکەی دەوڵەتێکی ئەرمەنیی بوون . ئەندامانی پێیانوابوو دامەزراندنی دەوڵەتێکی وەها دەبێتە هۆی لەدەستچوونی هەتاهەتایی خاکی تورك و هاتنەکایەی هاوسێیەکی ناحەزی سەرسەخت . ئەم دەستەیە بەهیوابوو لە رێگەی رێکخستنی ئارەزایەتیی گشتیی جەماوەرەوە ئەم پرۆژەیە شکست پێبهێنێت و لەم پێناوەشدا هەموو رێگەیەکی گرتەبەر . کاتێك ئامانجە سەرەکییەکەیان کە رێگرتن بوو لە لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنیی بەرەو ئەوە دەچوو مایەپووچ بێت ، ئەندامانی ئەم دەستەیە لە پشتگیریی کردنی تەواوی بیرۆکەی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ هیچ سستییەکیان نەنواند ، بەوەی لەو دوو پرۆژە شوومە ، ترسی ئاسەواری خراپی ئەمیان لا کەمتر بوو . دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ ، نەك تەنیا پارەمەتیدەرێکی بەنرخ نابێت بۆ بوژانەوەی ئەرمینیا ، بەڵکو دەگونجێت تەنانەت دامەزراندنی هەردووکیان لەبارببەرێت . لەوەش تێپەڕێت ، کوردستانێکی سەربەخۆ جگە لە خۆ رێکخستنەوە و هەماهەنگییەکی کاتیی گونجاو شتێکی دیکەی پێویست نیە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لە ئایندەیەکی نزیکدا لەگەڵ تورکیادا یەکبگرێتەوە .

نەتەوەخوازە کوردپەروەرەکان وەك ئیسلامخواکان دژیی سەربەخۆیی ئەرمەنەکان نەبوون . لەنێویاندا کەسانێکی فرە هەبوون خوازیاری دانپێدانانی خولیا و ئومێدی ئەرمەنەکان بوون و پێیانوابوو ئەمە بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی دانپێدانان بە خولیا و ئومێدی کوردیشدا . لەراستییدا ، هێندێك لەسەرکردە نەتەوەخوازە کوردپەروەرەکان ، وەك دەبینین ، دەیانویست لەگەڵ ئەرمەنەکاندا بەرەیەکی هاوبەش

پێکبهێنن .

## چالاکییەکانی عەلی ئیحسان پاشا

لە باکووری کوردستاندا ، هەر زوو پاش مۆرکردنی ئاگربەستەکە ، جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد لە شێوەی هەژانێکی بەربڵاودا دەرکەوت . دەگوترێت کە جوڵانەوەکە لەلایەن کارمەندانی باڵای تورك و ئەندامانی (ك.ی.پ)ەوە ئاراستە دەکرا . بڕوا وایە کە عەلی ئیحسان پاشای فەرماندەی پێشووی سوپای شەشەمی تورك ، ڕێکخەری سەرەکیی ئەو جوڵانەوەیە بێت و لەو ناوچانەی دەکەونە باکووری ئەو هەرێمەی بەریتانییەکان داگیریان کردبوو . ئاکامی ئەم چالاکییانە هەر زوو دەرکەوت ، لە یەنایەری ١٩١٩دا ، هەواڵی ئەوە هەیە کە ئەندامانی(ك.ی.پ) چوونەتە خەرپوت و هانی کوردیان داوە لە کۆنگرەی ئاشتییدا داوای سەربەخۆیی بکەن . لە هەمان کاتدا ، واپێدەچێت عەلی ئیحسان پاشا چالاکانە کەوتبێتە سەرکوتکردنی ڕەگەزە دژ بە تورکەکان لە دیاربەکر و شوێنەکانی دیکەدا .[1] دەگوترێت کە ئەو هانی خێڵی بەرازیی داوە پەلاماری خێڵی کیتان بدەن بەهۆی هەڵوێستی هاوسۆزییان لەگەڵ بەریتانییەکاندا . هەروەها سەرۆکی خێڵی کارەکاچەلی خستۆتە زیندانەوە .[2] ئەو توانی سەرخێڵەکانی ناوچەکە لە ڕێگەی بەخشینی پارە ، چەك ، کەلوپەل و دیارییەوە بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و هەرکاتێکیش بەریتانیا هەوڵی فراوانکردنی ناوچە داگیرکراوەکەی خۆیدا ، ئەوا دژی بەریتانیا بەکاریانبهێنێت .[3] واپێدەچێت عەلی ئیحسان پاشا زۆر سەرکەوتووبێت ، چونکە لەهەر شوێنێك کاری بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆی کردبێت ، هەڵوێستی دژمێکانە لەو ناوچەیە پەرەیگرتووە .[4]

هەواڵی ئەوە هەیە ، جەزیرەی ئیبن عومەر ، کە عەلی ئیحسان پاشای لێ بوو ، لە فێبرایەیری ١٩١٩دا چالاکیی تێکەوتبێت و ناوەندێکی دیکەی ئانارامیی پێکهێنابێت

---

[1] Driver ,"Kurdistan and The Kurds.81-82; Bell. Review of the Civil Administration,66; Driver ,"The Kurdish Question ." 109.

[2] Driver ,"Kurdistan and The Kurds. 82.

[3] Ibid.; Bell, Review of the Civil Administration,66.

[4] Bell, Review of the Civil Administration,66.

. ئەو لەوێ ، وەك شوێنەكانی دیكە ، جوڵانەوەی پێكهێنابوو بۆ بەرنگاریی دەسەڵاتی بەریتانیا و رێگرتن لە داگیركاریی بەریتانیی . ژمارەیەك لە پیاوە ناسراوەكانی عەرەب و ئەرمەن دەستبەسەركران ، رێگەی هاتوچۆ بە دیجلەدا هەر لە جەزیرەی ئبن عومەرەوە تا خاڵی هێڵی ئاگربەستەكە لە باشوور تێكچوو ، هەروەها چەك بە كوردان درا و وەك ركابەرایەتییەكی ئاشكرا دژ بە بەندەكانی ئاگربەستەكە جوڵێندران . كوردان ئەو فەرمانەی ئەستەمبوڵیان رەتكردەوە كە داوای پابەندبوونی بە بەندەكانی ئاگربەستەكەوە لێدەكردن . ئەوەش بەهۆی پشتگیریی كاتیی دەسەڵاتدارنی خۆجێی تورك ، گەر بە فرمان و داواكاریی ئەوان نەبێت .[٥]

هەلومەرجەكە لە هەموو لایەكی ئەو ناوچانەی كەوتبووە باكوری هێڵی ئاگربەستەكەوە لەدەست دەرچووبوو ، بەچەشنێك حكومەتی توركی ناچاركرد بكەوێتەكار . لە ١ی فێبرایەری ١٩١٩دا ، عەلی ئیحسان پاشا لە ئاكامی كەوتنەوەی هەرایەكدا لابرا ، هەرایەك نەك تەنیا واپێدەچوو كە ئەو " نەیتوانیبێت یا نەیخواستبێت دایبمركێنێتەوە " بەڵكو لە راستییدا گومانی خەملاندنیشی لێدەكرا . وێرای ئەوەی ژمارەیەك لە دۆستان و شوێنكەوتەكانی بەوپەڕی بڕوا و كاریگەرییەوە لەسەر هەمان كاری ئەو بەردەوام بوون .[٦]

عەلی ئیحسان پاشا كەسێكی نارازیی ئاسایی نەبوو ، ئەو توركێكی نیشتمانپەروەر و سەربازێك بوو . ئەو بەئاشكرا و بەشێوەیەكی دروست حیسابی بۆ گرفت و تەنگوچەڵەمەكانی هاوپەیمانان دەكرد و بۆ قازانجی وڵاتەكەی سوودی لێوەردەگرتن و دەیقۆزتنەوە . بە ئەندازەی ئەوەی بێزار بوو لەو ستەمەی كە ئاگربەستەكەی تێدا مۆركرد و لەلایەن (سێر جۆن مارشاڵ)ەوە بە سەریدا سەپێنرا ،جێگای سەرسوڕمان نیە ، ببینین سەرسەختانە دژی چاوتێبڕینی هاوپەیمانان لە بەشێكی خاكی وڵاتەكەی وەستاوەتەوە ، پاش ئەوەی ناچاركرابوو بەهۆی پێداگریی و توندوتیژیی سەركەوتووەكانەوە دەست لە بەرگریی هەڵگرێت . هاندەری شاراوەی عەلی ئیحسان لە خولقاندنی گۆڵەمز و ئاژاوە لەوانەی زۆر بەباشیی لەو چەند وشەیەی

---

[٥] Ibid.,67; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,86; Driver ,"The Kurdish Question ," 107.

[٦] Bell,Review of the Civil Administration,67:cf.Driver,"Kurdistan and The Kurds,81-82.

راپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی هاوچەرخدا دەردەکەوێت :" هەرچەندە لە راستییدا ، ئەو بە قازانجی کوردستانێکی سەربەخۆ تێدەکۆشێت ، بەڵام وادەردەکەوێت ئەو تەنیا بەو چەشنە هەڵدەسوڕێت تا ئێمەی هاوپەیمانان بشڵەژێنێت . لەراستییدا ئەوەی ئەو خوازیارێتی ئەوەیە مەسەلەی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی کوردستان لەلایەن کوردانەوە لاواز بکات و دوا توانا و هەوڵی خۆی بۆ گێڕانەوەی کوردستان بۆ ژێر دەسەڵاتی تورک بخاتە گەڕ ."[7]

## هەوڵەکانی پێکهێنانی جوڵانەوەیەکی دژبە بەریتانییەکان لەنێو کورد دا

لەوکاتەدا ، جوڵانەوەی کوردیی لە دیاربەکر لە لایەن ئەو عەلی بەگەوە رێبەرایەتیی دەکرا ، ئەوەی پارتێکی بۆ (سەربەخۆیی تورک و کورد) پێکهێنا . ئامانجی ئەم پارتە رێگرتن بوو لەوەی کوردان بکەونە ژێر سایەی هیچ هێزێکی بیانییەوە لەو حاڵەتەدا کە نەبنە بەشێك لە دەوڵەتە نوێیەکەی تورك . هەواڵی ئەوە هەیە کە عەلی بەگ هەوڵیداوە رێپێدانی حکومەت بۆ بڵاوکردنەوەی رۆژنامەیەك وەربگرێت کە ئامانجەکەی گرتنەخۆ و بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە بیروبۆچوونە بوو.[8]

لەسەرەتای مارتی ١٩١٩دا ، چەند سەرکردەیەك لە پیاوماقوڵانی سیڤرێك ، هەوڵیاندا دیدەنی دەسەڵاتدارانی تورك و سەرکردەکانی لقی ناوچەیی (ك.ی.پ) لە دیاربەکر بکەن بە ئامانجی کارکردنی هاوبەش و هەنگاونان دژی داگیرکاریی بێگانە . لە ئاکامدا لەسەر پلانێك رێکەوتن ، بەگوێرەی ئەو پلانە سەربازانی تورك و خێڵە کوردەکانی دەوروبەر دەبێت بۆ بەرگرییکردن لە ناوچەکانی سیڤرێك ، دیاربەکر و ئۆرفە پێکەوە هاوکاریی بکەن . هەر لە سۆنگەی ئەم ئامانجەوە ، تورکان هەستان بە ئازادکردنی مەحموودی کوڕی ئیبراهیم پاشای سەرۆکی ناسراوی میللیی ، هەروەها عەبدولقادر کوڕی دێرەی سەرۆکی کارەکاچلی ، ئەوەی بە تۆمەتی ملدانەنەواندن بۆ حکومەت خرابووە زیندانەوە . تورکان ئەوەیان خستە بەردەم مەحموود کە بیگێڕنەوە شوێنەکەی خۆی وەك سەرۆکی گشتیی کۆنفدراسیۆنی میللیی بیکەنە بەهێزترین

[7] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,82.

[8] Ibid.,82-83.Cf. Driver ,"The Kurdish Question ," 110.

سەرۆکی کورد لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی ڕووباری فورات گەر ئامادەبێت ڕێبەرایەتیی هێزەکانی خۆی و خێڵەکانی دەوروبەر بکات بۆ ئەوەی سەربازگەی بەریتانیی لە ئۆرفە و بەدرێژایی فورات دەربەرێننە دەرەوە .

مەحموود ئەو داوایەی پەسەندکرد و نامەی بۆ سەرخێڵە جۆربەجۆرەکان لەوانە کوردەکانی بەدالی و دوکورلی هەروەها عەرەبەکانی جوهایش نارد ، داوای لێکردن کۆببنەوە و لەو هەڵمەتەدا بەشداربن . پاش نواندی سستییەك ، دوو خێڵە کوردییەکە بڕیاریاندا بەشداریی بکەن .[9] وێڕای ئەوەی سەرخێڵەکانی دیکە گومان و نیگەرانییەکی بەرچاویان هەبوو . لە ١٢ی مارتی ١٩١٩دا ، سەرۆکی کوردانی کیتان و ژمارەیەکی دیکە لەو کوردانەی لەسایەی دەسەڵاتی ئەودابوون چاویان بە دەسەڵاتدارانی سەربازیی بەریتانیی لە بانەکانی ناوچە عەرەبییەکان کەوت ، لەوێ سەبارەت بە هەلومەرجەکە وتووێژیان کرد و بڕیاریاندا کۆمەڵەیەکی دژ بە تورکان پێکبهێنن .[10]

لە هەوڵێکدا بۆ قورسکردنی دەستی مەحموود ، دەگوترێت سەربازانی تورك بە کوردانی میللییەوە پەیوەست بوون ، هەروەها دەگوترێت دەسەڵاتدارانی سەربازیی تورك چەند تۆپێکی بزێز و هەروەها بڕێکی نادیار چەکی سووکیان بە مەحموود داوە . هەموو ئەم هەنگاوانە نەیانتوانی جوڵانەوەکەی مەحموود لە شکست ڕزگاربکەن . گرنگترین هاوپەیمانەکانی کە کارەکاچلی بوون ، هەر هەموویان سەبارەت بە هاوپەیمانیەتییەکەیان خاوەن یەك بڕوا نەبوون . مستەفا کارەکاچلی لەگەڵ کوڕە مامەکەیدا عەبدولقادری کوڕی دێرە ناکۆکییان لێ پەیدابوو ، لەسەر ئەوەی چۆن کارەکاچلی وێڕای ئەو ناکۆکییە مێژینەی نێوانیان بە میللییەوە پەیوەست بێت . هەوڵێکی دەسەڵاتدارانی سیڤرێك بۆ داوەریی و پێکهێنانەوەی ئەو دووانە بێهوودە بوو . ئیدی هەر زوو دەرکەوت کە لە ئاکامی ناکۆکیی و ناتەبایی ، جوڵانەوەکەی مەحموود بەرەو پوکانەوە و ناکامیی ڕۆیشت . ئەو هاوپەیمانیەتییەی کە ماندووبوون و هەوڵێکی زۆری ویست تا هاتەدی و بەئاسانیی پارچەپارچە بوو .[11]

هەوڵێك بۆ پتەوکردنی جوڵانەوەی بەهەڵستکاریی لە ماردین نەیتوانی

---

[9] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,84Cf. Bell, Review of the Civil Administration,66.

[10] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,84

[11] Ibid.,85.

مەبەستەکەی بێنێتەدی . شێخ عەبدولقادری نەهری ، سەرۆکی کۆمەڵەی سەربەخۆیی کورد لە ئەستەمبوڵ ، بە هاوکاریی شەوکەت بەگ ، ئەندامی ئەنجومەنی کارگێڕیی ماردین ، نوێنەری خۆیان ناردبووە نێو خێڵەکان و هانیاندابوون دژایەتیی دەستێوەردانی بیانیی بکەن . تەنیا ژمارەیەکی کەم سەرخێڵەکان نەبێت کە لایەنگرییان لەو داوایە کردبوو ، وێڕای ئەوە ، زۆربەیان بێبایەخییان پێشاندابوو . ئەم چالاکییانە بە توندیی لەلایەن کەنعان بەگی فەرماندەی تیپی پێنجەمی تورکەوە لە ماردین پشتگیریی دەکرا .[12]

هەر لەم ماوەیەدا ، هەواڵی ئەوە هەیە کە عەلی باتی سەرخێڵی هەڤێرکان ، لەگەڵ عەبدولڕەحمانی سەرخێڵی شێرناخلی ، هەروەها ڕەمەزانی سەرخێڵی سەلاهان ، هەرسێکیان گەیشتبوونە ڕێکەوتنێک سەبارەت بە دژایەتییکردنی هەر پێشڕەوییەکی نایندەیی بەریتانییەکان . هەواڵی ئەوە هەیە کە سەرخێڵی دیکەش بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندییان کردبێت .[13]

لە نۆرفە و دەوروبەری ، هەلومەرجەکە واپێدەچوو تا رادەیەك ئاڵۆز بێت ، لەماوەی هەفتەی دووەمی مارتی ١٩١٩دا ، محەمەد بەگ کە یەکێك بوو لە کوردەکانی نۆرفە و تورکخوایەکی توخ بوو ، دەستی بە هەڵمەتێك کردبوو دژی دەستێوەردانی کریستیانییەکانی وەك بەریتانییەکان لە کاروباری وڵاتانی موسوڵماندا . لەهەمان کاتدا ، دەگوترێت دوو ئەندامی (ك.ی.پ) کە عەلی ئەفەندی سیڤریکلی و سەعید بەگی بەغدانلی بوون لە وروژاندنی خێڵەکانی دەوروبەری شارەکە تێوەگلابوون هێزێکیان بۆ شەڕکردن دژی بەریتانییەکان ڕێکخستبوو . هەواڵ هەیە سەرخێڵی خێڵەکانی دەوروبەر چوونەتە نۆرفە تا هاوسۆزیی خۆیان بۆ پرسی کورد رابگەیەنن .[14]

## ئامانج و چالاکییەکانی یانەی کوردیی

نزیك بەو کاتەی کە یانەی کوردیی دامەزرا و لە هەردوو شاری دیاربەکر و

---

[12] Ibid.,84.

[13] Ibid.

[14] Ibid.,84-85.

ماردین تێکۆشانی خۆی دەستپێکرد .[15] واپێدەچوو پیاوە ناسراوەکانی شارەکە کە یانەکەیان دامەزراندبوو و چالاکییەکانیان ئاراستە دەکرد ، تاقمێکی گەندەڵ بن و بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بگەڕێن ، وەک مێجۆری بەریتانیی (ئی.دەبلیو.سی.نۆئێل) ئاماژەی پێداوە . ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە زۆربەی ئەوانە ئەندامانی چالاکی (ك.ی.پ) بوون و پاش بەزینی تورك لەسەر داوای تورکەکان پەیوەندییان بە کۆمەڵەی نیشتمانیی کوردەوە کردووە ، ئەوەی کە ئەگەری سەرنجراکێشی دامەزراندنی ئۆتۆنۆمییەکی کوردیی لە سایەی پاراستن و سەروەریی تورکدا هێناوەتەئارا .[16]

لە دیاربەکر ، وەك هەر شوێنێکی دیکە ، یانەی کوردیی چالاکییەکانی خۆی لە پێناو دوو ئامانجدا ئاراستە دەکرد . یەکەمیان کارکردن بوو بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی بەریتانیی و دژایەتیی دەستێوەردانی بەریتانیی بوو ، بۆ ئەم مەبەستەش هێزێك لە تورك و کوردەکان پێکهێنرا و ئامادەبوو بچێتە مەیدانی کارەوە . دووەمیان ، دەبوایەست ڕووبەڕووی چالاکییەکانی ئەرمەن بێتەوە و نومێد و ئارەزووی ئەرمەنەکان پووچەڵ بکاتەوە . لەو ڕووەوە ، هانی موفتی سیڤرێکیاندا کە فەتوایەك دەرکات و تێیدا کوشتنی ئەو ئەرمەنانە حەڵاڵ بکات کە لەبەردەم دەسەڵاتی هاوپەیمانەکاندا لە حەڵەب ، موسوڵمانەکانیان بە بەشداریی لە کۆمەڵکوژیی ئەرمەنەکاندا لەساڵی ١٩١٥دا تۆمەتبارکردووە . هەروەها ئەرمەنەکان کەوتنە بەر شەپۆلی نوێی ڕقی جەماوەر و چەندین کاری بێزارکەریان دەرحەق ئەنجامدەدرا .[17]

حکومەتی تورکیی کە بەشێوەیەکی فەرمیی دژی ئەم چالاکییانە وەستا ، فەرمانی دەستگیرکردنی ژمارەیەك لەسەرکردە گرنگەکانی یانەی کوردیی دەرکرد . ئەم سەرکردانە لە نێو خێڵەکانی دەوروبەردا خۆیان شاردەوە و لەنێویاندا بیری سەربەخۆیی کوردیان بڵاودەکردەوە . وێڕای ئەو دەستگیرکردنانە ، هەڵوێستی دژە بەریتانیی و دژە ئەرمەن لە لایەن ژمارەیەك ئەندامانی ئەو یانەیەوە بە جۆش و خرۆشێکی زێدەترەوە

[15] هەوڵەکان بۆ دامەزراندنی یانەی کوردیی لە ئورفە لە ئاکامی سستیی پیاوماقوڵانی شارەکەوە تا کۆتایی ژوونیەی ١٩١٩ بێبەر بوو

[16] Bell, Review of the Civil Administration,66; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,95.

[17] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,,85.

بەردەوام بوو . لەراستییدا ئەوان زۆر لەوە زیندەتریان تێپەڕاند و داوایان لە " سەرجەم نیشتمانپەروەرانی کورد کرد پەیوەندیی بە یانەی کوردییەوە بکەن ." لە ٢١ی مارتی ١٩١٩دا ، ئەندامانی یانەی کوردیی داوای کۆبوونەوەیان کرد کە لەلایەن نوێنەرانی سەرۆکە کوردە ناودارەکان و پیاوماقوڵانی دیکەوە ئامادەی بوون لەوانە : سەرۆکی سێرکویجی ، سەرۆکی هارۆ ، موفتی سیڤریك ، دوو پیاوماقوڵی دێرك . لەم کۆبوونەوەیەدا بڕیاردرا بە هەموو شێوەیەك لەدژی دەستێوەردانی بەریتانییەکان ، بەرگریی لە ماردین و دیاربەکر بکرێت .[18]

چالاکییەکانی یانەی کوردیی لە ماردین لەلایەن حەوت پیاوماقوڵەوە ئاراستە دەکرا . ئەوەندەی ئامانجی سەرۆکەکانیان ڕێگرتن بوو لە داگیرکردنی ماردین لەلایەن بەریتانییەکانەوە ، لەو ڕووەوە پلانەکانی خۆیان لە کریستیانییە خۆماڵییەکان دەشاردەوە . ئەوەندەی توانیبوویان خەڵکیان هاندابوو یاداشتنامەیەك مۆربکەن و ئەوەی تێیدا ئاشکراکەن کە هەموو دانیشتووانی شارەکە بە کورد و عەرەب و کریستیانەوە خوازیاری کوردستانێکی ئۆتۆنۆمن . هێندێك کەسایەتیی ، لەوانە مارئیلیاسی پەتریارکی یاقوبییەکان مۆرکردنی یاداشتنامەکەیان ڕەتکردەوە . لە ڕاستییدا بۆ ئەوەی لە ئایندەدا لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە تووشی بەڵایەك نەبێت ناچار بوو پاش ئەوەی وشەکانی یاداشتنامەکەیان گۆڕیی بەوەی مۆرکەرانی لە سۆنگەی ئەوەوە ڕەعییەتی عوسمانیین ، خوازیارنین بەریتانیا دەستوەرداتە کاروباریانەوە ، یاداشتنامەکە مۆر بکات ، پاش ئەوە پەتریارك ماردینی بەرەو ئەستەمبوڵ جێهێشت .[19]

## نەهێشتنی یانە کوردییەکە

پەرەسەندنە نێودەوڵەتییەکان ، بەتایبەتی بڵاوبوونەوەی بنەماکانی سەرۆك ویلسن سەبارەت بە مافی دیارییکردنی چارەنووس ، هانی ئەندامانی یانەی کوردییدا هەڵوێستێکی زیندەتر سەربەخۆخوازانەیان لەهەمبەر تورکاندا بگرنەبەر . مێجۆر نۆئێل بە گاڵتەجاڕیی و بێزێکی ئاشکراوە ئاماژەی بە کاریگەریی بنەماکانی ویلسن لەسەر کورد

---

[18] Ibid.

[19] Ibid.85-86.

کردووە:"بەزمی جێبەجێکردنی بنەماکانی سەرۆک ویلسن بەوەی هەرکەس چۆنی دەوێت ئاوا بکات ، بە هێواشیی و بەهەموو ئەگەرە دڵخۆشکەرەکانییەوە لە ئاسۆ دەرکەوت ، کوردە تورکەکانی پێشوو ئەمێستا هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی گەر زۆر بە بەرزیی بشبرێنن ، ئەوا سەرۆک ویلسن گوێی لێیان دەبێت و ڕێگەیان پێدەدا دیاریەکر بەشێوەیەکی خراپ لە لایەن خۆیانەوە بەڕێوەبەرن ، هەروەها خۆیان لەسەر حیسابی ماڵ و موڵکی دزراوی کریستیانییەکان کە لەماوەی ڕەشەکوژییەکەدا دەستیانبەسەردا گرتووە ، دەوڵەمەند و قەڵەو بکەن ، بێنەوەی تەنانەت لەگەڵ تورکاندا تالآنییەکەشیان دابەشبکەن ."[20]

زێدەبوونی هەڵوێستی ململانێکەری سەرکردە کوردەکان ، دەسەلآتدارانی تورکی وریا کردەوە ، ئەوان بە بێزارییەکەی زۆرەوە لە چالاکییەکانی یانەکەیان دەڕوانیی و بڕیاری نەهێشتنیاندا . داگیرکردنی ئەزمیر (سمیرنا) لە لایەن یۆنانییەکانەوە کەرەسەیەکی وروورژاندنی زۆری لەبەردەست دانان و بە تەواویی سوودیان لێوەرگرت . تۆباڵی بەدکاریی یۆنانییەکان لەو شارەدا خرایە ئەستۆی بەریتانییەکان ، هەروەها داوا لە کوردان کرا هاوولآتییە ئەزمیرییەکان لەشارەکەی خۆیان دامەزرێنن ، لەوێ گەیشتنی بەریتانییەکان هاتنی سوپای ئەرمەنیی بەدوادهات.

حاڵەتیی وروورژانێکی توندی ئایینیی ، وێڕای بەئاگاهێنانەوەیەکی تەقلیدیی لەنێو خەڵکەکە سەریهەڵدابوو . ئەندامانی یانە کوردییەکە کە زۆربەیان لە ڕەشەکوژییەکەی ساڵی ١٩١٥ی ئەرمەنەکاندا بەشداربوون و لە سزادان دەترسان ، خواخوای قەومانی ڕەشەکوژییەکی دیکە بوون تا دواین شایەتەکانی بەدکارییەکانی رابردوویان لە کۆڵ بکاتەوە . کریستیانییەکان تەواو لە پەرەسەندنی ئەو ڕووداوە تۆقیبوون ، نوێنەرێکیان ناردە لای مێجەر نۆئێل لە ماردین بۆیان بپارێتەوە تا بەریتانییەکان بێنە نێو مەسەلەکەوە .

تورکان کە زانیان پرۆپاگەندەکەیان ئامانجی تێپەڕاندووە ، هەنگاوی خێرایان هاویشت تا هەلومەرجەکە هێور بکەنەوە . مەبەستی ئەوان ئاراستەکردنی ڕای گشتیی

---

[20] Noel cited in Bell, Review of the Civil Administration,66; Driver ,"Kurdistan and The Kurds.95.

بــوو دژی بەریتانییــەکان نــەك دژی کریــستیانییەکان . هــەروەها ئــەوان کاردانــەوەی ڕەشەکوژییەکی نوێیان بەباشیی درك پێدەکرد . دەسـەڵاتدارانی تـورك هـیچ کاتێکیـان بۆ سوود وەرگرتن لـەو ڕووداوانە بە قازانجی خۆیـان لەکیس نەدا . یانە کوردییەکە کرایە قوربـانیی . بـەم شـێوەیە ڕێکخراوێکـی نـەخوازراو و ناپەسـەند کـە خـەریکبوو خـۆی پێشاندەدا و بـە ڕووی سـەروەریی تورکـدا ڕادەوەسـتا ، سـەرکوتکرا . یانـە کوردییەکـە بەشێوەیەکی سـەرنجڕاکێش کۆتـایی پێهێنـرا . چـەکەکان لەسـەر قەڵاکـە دامـەزرێنران ، داوای هاتنی سوپای تورك کرا ، سەرکردەکانی یانەکە قۆڵبەستکران ، دواتریش دەرگـای یانەکە لە ٤ی ژوونی ١٩١٩ داخرا .[21]

## هەلومەرجەکە لە ئێران

### کاریگەریی سیاسەتەکانی ئیسلامگەرایی و کوردگەراییەکانی سوڵتان

دوای ئاگربەســت ، جوڵانــەوەی نەتــەوەیی کــورد بــەرەو کوردســتانی ئێـران بڵاوبووەوە و لەوێ لایەنگران و هاوسۆزێکی بەجۆشی بۆ خۆی دیتەوە .بەگوێرەی نۆئێل ، زۆر لە کوردانی سلێمانی هەر زوو پاش وەستاندنی ئاگری جەنگ ئەو شارەیان بەرەو ئێران جێهێشت تا بانگەشە بۆ بیری کوردستانی یەکگرتوو بکەن .[22]

ئەمـەش پێگەیـشتنی زنجیرەیـەك ڕووداو بـوو کـە لـە بنەڕەتـەوە ئاراستەکراو و ئاکامی سیاسەتە ئیسلامگەرا و کوردگەراییەکەی سوڵتان عەبدولحەمید بوو . سیاسەتی ئیسلامگەرایی کە لەسەر پایەی بیرۆکەی تایبەتمەندیی جیهانیی دەسەڵاتی سوڵتان و خەلیفـەی عوسمـانیی دامـەزرابوو ، زۆربەی جار بە شێوەیەکی نایاب لەلایـەن سـوڵتان عەبدولحەمیـدەوە وەك ئـامرازێکی سیاســەتی دەرەوە بــە ئامــانجی شـوێندانان لەسـەر بڕیارەکـانی زلهێزەکـان بـەکاردەهێنرا . سیاسـەتی کوردگـەراییش لـە پێنـاو ڕاکێشان و گرتنەخۆی جەنگاوەرانی کورد داهێنرابوو ، ئەو کوردانەی کە عەبدولحەمید خوازیاربوو

---

[21] Bell.Review of the Civil Administration.67-88;Driver."Kurdistan and The Kurds,95-96.

[22] E.W. Noel , Note on the Kurds Situation. 18.

وەك لەمپەرێك بەرامبەر هەر ئەگەرێكی دوژمنكارانەی رووس و هەروەها هەر ناسەنگێكیش دژی خواست و خولیاكانی ئەرمەن بەكاریان بهێنێت .

ئەم سیاسەتانە لەسەر خاكێكی بەپیت و تینوو لە كوردستانی ئێراندا كەوتەوە ، ئەو ناوچەیەی توركان چاویان تێبڕیبوو . كوردانی ئێران بە پەرۆشەوە وەلامی راسپاردەكانی فەرمانڕەوایانی عوسمانییان دایەوە . وەك سوننییەك ، ئەوان ، لەو باوەڕەدا بوون كە ئەركی سەرشانیانە بەیعەتی خۆیان بە سوڵتان و خەلیفە بدەن و پێی وەفادارین ، لەكاتێكدا وەك كوردیش پشتگیریی و بایەخی كەسێكی خاوەن شكۆی وەك ئەو جێگای شانازیی و سەرفرازییان بوو . ئەم سیاسەتە ژیرانە و سەركەوتووە تەنانەت دوای رووخاندنی تەختی عەبدولحەمیدیش لەلایەن حكومەتی عوسمانییەوە بەردەوام بووە و رۆڵێكی بنەڕەتیی و بەرچاوی لە پێكەوە گرێدانی كوردانی ئێران و ئیمپراتۆریی عوسمانییدا بینیوە .

لەئاكامی ئەم سیاسەتانە ، كوردانی ئێران بە شێوەیەكی بەربلاو دووجار كەوتنە ژێر دەسەلاتی عوسمانییەوە ، ئەویش لەماوەی داگیركارییەكەی تورك لە ١٩٠٦–١٩١١،[٢٣] هەروەها لە جەنگی یەكەمی جیهانییدا . لە هەردوو جارەكەدا ، ناوچەكانیان بەشێوەیەكی كرداریی لەگەڵ خزمە زۆر نزیكەكانیاندا تێكەڵ دەبوو كە لەنێو ئیمپراتۆریی عوسمانییدا ژیانیان بەسەر دەبرد . بەوەش ، سوپاس بۆ تێكۆشانی توركان كە بەهۆیەوە كوردانی ئێرانیان بەرەو چالاكییە سەرەكییەكانی ژیانی تێكڕای كورد راكێشا .

## پەرەسەندنی خواستی كوردستانێكی سەربەخۆ

پرسی كوردستانێكی سەربەخۆ خەریكبوو مێشكی سەركردە بەرپرسەكانی كوردستانی ئێرانی پڕدەكرد . تەنانەت لە كاتێكدا پێش ئەوەی جەنگی یەكەمی جیهانیش كۆتایی بێت . لە ژوونیەی ١٩١٨دا ، هەواڵ هەیە كە یەكێك لە سەرخێلە مەزنەكانی خێڵی موكریی لە ناوچەی ساوجبولاق(مەهاباد) لەگەڵ سەرلك (كینان) ی كۆنسڵی بەریتانیی لە كرماشان ، وتووێژیان سەبارەت بە مەسەلەی دەوڵەتێكی كوردیی

[23] Minorsky, "Kurds."

سەربەخۆ لە سایەی بەریتانیادا کردووە . ئەوەش کاتێك روویداوە کە ئەوەی دوواییان لە گەشتێکدا نزیك سەقز بۆتەوە .[٢٤] دەگوترێت سەرۆکەکەی موکریی ئامارەی بەوە داوە ئیدی کوردان ئازادن تا بۆ خۆیان تێبکۆشن و لە رێگای دادوەریی خێرخوازانەی بەریتانیاشەوە بتوانن لەگەڵ ئەرمەنەکاندا بگەنە پێکهاتنێکی ئاشتییانە .[٢٥] لەراستییدا ، وایپێدەچێت ئەوەی روونکردبێتەوە کە ئەرمینیایەکی ئازاد لە هەرێمەکانی باکووری تورکیادا بۆ کورد مەسەلەیەکی پەسەندکراوە و ئەو دەرفەتەش دەبەخشێتە کورد کە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان لە باشووری دەوڵەتە ئەرمەنییەکە و لە باکووری دەوڵەتی عەرەبییەوە پێکبهێنن .[٢٦]

پاش کەمتر لە ساڵێك ، دوو سەرکردەی گرنگی کورد لە کوردستانی ئێراندا هەبوون ، ئەوانیش ئیسماعیل ئاغا(سمکۆ) ی شکاك و شێخ سەید تەهای نەهریی بوون ، پێکەوە کاریان بۆ پلانێك لەپێناو بەستنەوەی کوردستانی ئێران بە دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆوە دەکرد .

لە مارتی ١٩١٩دا ، سەیدتەها هاتە بەغدا تا پشتگیریی دەسەڵاتدارانی بەریتانیی بۆ پلانێکی لەو چەشنە بەدەستبهێنێت ، بەڵام نەیتوانی مەبەستەکەی بێنێتەدی . (گێرترۆد بێل) ی کارگێڕی مەدەنیی بەریتانیی بەشێوەیەکی سەرنجراکێش باسی لەو کاردانەوەیە کردووە کە سەید تەها بەهۆی بەدینەهاتنی مەبەستی سەردانەکەی هەیبووە :" کاتێك بۆی روونکرایەوە کە ناتوانێت بۆ بەردەوام بوون لەم پرۆژەیەدا چاوەڕوانی یارمەتیی لە ئێمەوە بکات ، نائومێدییەکی مەزنی پێشاندا و تێبینی ئەوەی دا کە جیابوونەوەی کوردستانی ئێران لە ئێران مەسەلەیەکە هەر دەبێت ، تەنانەت ئەگەر ئێمەش رێگریی مەسەلەیەکی والبین و پەسەندی نەکەین ."[٢٧] وێڕای نائومێدیی سەیدتەها ، هەواڵ هەیە کە ئارەزووی خۆی پێشاندابێت تا بەهەر شێوازێکی گونجاو بۆ دامەزراندنی رژێمێکی کوردیی سەربەخۆ یارمەتیی بەریتانییەکان

---

[24] E.J.R.,7; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,75; A.T.Wilson,Loyalties,2:130.

[25] E.J.R.,7; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,75

[26] A.T.Wilson,Loyalties,2:130.

[27] Bell, Review of the Civil Administration,69.Cf. E.W. Noel , Note on the Kurds Situation, 18.

بدات .[28]

لە هەمان کاتدا ، سمکۆئاغاش خەریکی تێکۆشان بوو ، لەسەرەتای مایۆی ١٩١٩ ، نامەیەکی دۆستانەی بۆ (سێر ئارنۆڵد ویلسن) ی جێگری کۆمیسەری مەدەنیی لە میسۆپۆتامیا نووسی کە لەپێش جەنگەوە یەکتریان دەناسی . وێڕای ئامانجە سەرەکییەکانی نامەکەی ، ئەو بەدرێژیی لەبارەی ژیانی تایبەتیی خۆیەوە دواوە . وایدەچێت ئەو هەوڵەی بەم دواییە بۆ کوشتنی درابوو زۆر شپرزەی کردبێت ، ئەو هەوڵەی کە لەلایەن ئەوەوە ئۆباڵەکەی خرابووە ئەستۆی کارمەندانی ئێرانیی . لەبەر ئەو هۆیەش بوو کە زۆر خۆی دەرنەدەخست و لەحاڵەتی پەناگیرییدا مابووەوە .[29] چالاکییەکانی داهاتووی سمکۆ لەو بەشەی دادیٚ باسکراوە .

## هۆکارەکانی نائارامیی لە کوردستانی ئێران دا

هەواڵی ئەوە هەیە کە کوردستانی ئێران لەکاتی جەنگدا لە هەلومەرجێکی هەژان و ئاڵۆزییەکی سەرتاسەرییدا بووە ، بەچەشنێك ئاڵۆزییەکە هێندە سەخت بوو ، تەنانەت سەرچاوە فەرمییە بەریتانییەکانیش بەلایانەوە ئەستەم بووە کە بزانن چی لەو دەڤەرەدا روویدەدات . پێویست بەگوتن ناکات ، کە دەسەلاتدارانی بەریتانیی لە میسۆپۆتامیا بە نیگەرانییەکی فرەوە لە هەلومەرجەکەیان دەڕوانی ، دەترسان ئەو نائارامییەی ئەوێ بۆ ناوچەکانی دەوروبەری ژێر دەسەلاتی ئەوان پەرەبسێنێت .[30]

کارمەندە بەرپرسە بەریتانییەکان ئەو نائارامییەیان بۆ دوو هۆکاری سەرەکیی دەگەڕاندەوە . یەکەم ، بە هۆی نارەزایەتیی توندی کوردان دژی گەڕانەوەی پەنابەرە

[28] Bell, Review of the Civil Administration,69.

[29] Ibid.,70.

بێل ، ئەندامێکی دەسەلاتداریی ستاڤ کۆمسیۆنی مەدەنیی ئەم تێبینییە سەرنجڕاکێشەی نووسیوە " ئەهامەتییەکی شەخسیی ، کە لە دیدی ئێمەوە بابەتێکی لاوەکییە ، بە تەواویی سەرقاڵی کردووە یەك لەو بەدبینییانەی ئەو کە زۆری هەن ئەوەیە کە یەك لە کارمەندە فەرمییەکان ئەوەی پەسەند کردبێت کە بۆمبی لە پاکەتی پێچراودا بۆ بنێرن باسکردنی تووڕەی ئەو لەمەڕ ئەو رووداوە ناتوانرێت باشتر لە گوتەکەی خۆی تۆماربکرێت کە گوتوویەتی " کاتێك تەقییەوە بە زەحمەت ئەوەندەم کات هەبوو بەسەروچاوی براکەمدا فڕێبدەم "

[30] E.J.R.,14; Bell, Review of the Civil Administration,62.

ئاسووری و ئەرمەنییەکان بۆ شوێنی خۆیان ، کەبڕوا وابوو لەلایەن جوڵانەوەیەکی ئیسلامگەراییەوە کە ناوەندەکەی لە تەبرێزە هاندەدرێن و تارادەیەکیش کارمەندانی ئێرانیی پشتگیرییان لێدەکەن ، دووەم بەهۆی بێزاریی توندی کوردان لە "فەرمانڕەوایەتیی دەستەوسانی فارس" کە هێندە لاوازە یاسا و هێمنی بۆ دابین ناکرێت.[31]

لە فێبرایەری ۱۹۱۹دا ، مەسەلەی ڕاپەڕین دژی فەرمانڕەوایانی ئێرانیی لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا کە ژمارەیەکی فرە لە سەرۆکە کوردەکانی ئێران تێیدا ئامادەبوون ، وتووێژی لەسەرکرا . باس لەوە دەکرێت کە ئەو سەرکردانە بڕیاریان داوە ڕاپەڕینێکی بەو شێوەیەی پێویست دەکات ئەنجامبدرێت ، بەڵام پێش دەستبەکاربوون ، پێویستە هەڵوێستی زلهێزەکان لەحاست کوردی ئێران و گەڕانەوەی پەنابەرەکان بە وردیی ساغبکرێتەوە .[32]

وادەردەکەوت هەژان و نائارامیی لە کوردستانی ئێراندا لەوپەڕی کەفوکوڵ و بەردەوامیدا بێت . لە ۲۳ی مایۆی ۱۹۱۹ ، هەواڵی گرتنی فەرمانڕەوای سەلماس و گەمارۆدانی خۆی لەلایەن کوردانەوە ڕاگەیەندرا . ئەم ڕاپەڕینە بۆ ئەو دەنگۆیە دەگەڕایەوە گوایە بەریتانییەکان و ئێرانییەکان لەسەر مەسەلەی گێڕانەوەی پەنابەرە کریستیانییەکان ڕێکەوتوون . بەگوێرەی هەواڵەکان ، کوردان داوای یارمەتییان لە جەوادبەگی فەرمانەدەی تیپی یازدەیەمی قەفقاسی سوپای تورک و هەروەها حەیدەر بەگی والی وان و ئەندامی پێشووی (ك.ی.پ) کردووە ، ئەوەی بە ئاکاری دژە کریستیانیی و دژە بەریتانیی ناسرابوو .[33]

لەو کاتەدا هەواڵی دژبەیەك لەسەر چالاکییەکانی سمکۆئاغا هەیە ، بەگوێرەی سەرچاوەیەك ، ئەو هێزێکی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی ڕێگە لە گەڕانەوەی پەنابەرە کریستیانییەکان بگرن .[34] هەرچەندە ، سەیر لەوەدایە ، جێگری کۆنسوڵی ئیسپانیی لە

---

[31] E.J.R.,14 Bell. Review of the Civil Administration,62; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,83,89,93.

[32] E.J.R.,14; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,89.

[33] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,93.

[34] Ibid.

سەلماس ، کە لە دایکەوە ئەرمەنییە ، دەڵێت گوایە سمکۆ نەبۆتە بەشێك لەو جوڵانەوەیەی ئامانجی رێگرتنە لە گەڕانەوەی پەنابەرە کریستیانییەکان و لە راستییدا ئەو هەڵوێستێکی دۆستانەی لەحاست پێشانداون .[35]

توندوتیژی لەم ناوچەیەدا بەهۆی دابەشکردنی چەك بەسەر پیاوەخێڵەکییەکانی هەرکییەوە لەلایەن والی وانەوە پەرەیسەند ، هەروەها بەهۆی هەڵوێستی لایەنگرانەی فەرمانڕەوای ئێرانیی هەرێمەکە کە لە جوڵانەوەی دژە گەڕانەوەی پەنابەرەکاندا بوو ، بەتایبەتییش ، هەڵوێستی (وەلی عەهد) ی ئێرانی ،[36] ئەوەی بە هاوسۆزیی و لایەنگریی ئەڵمانیا و تورکەکان ناسرابوو .[37]

## چالاکییەکانی سمکۆئاغا

دەرکەوتنی سمکۆ : ئیسماعیل ئاغا کە زیاتر بە سمکۆ دەناسرێت ،[38] سەرۆکی بالای خێڵی ئەسرەوتووی شکاکە کە لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران و تورکیا ، لە نزیك قتور نیشتەجێن . ئەو یەکێکە لە بەرچاوترین کەسایەتیی کە لە ماوەی جەنگدا لە کوردستان دەرکەوتبێت .[39] ئەو بەدوای جافەرئاغای برایدا هات ، ئەوەی کە بەفەرمانی وەلی عەهد لە تەبریز بەغەدر کوژرا .[40] ئومێد ، فێڵبازیی ، هەروەها دڵڕەقیی هۆکاری

---

[35] Ibid..94.

[36] پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە لە قۆناغی دەسەڵاتدارێتی بنەماڵەی قاجاردا ، ولایەتی ئازەربایجان جێگەی دانیشتن و فەرمانڕەوایی شازادە و وەلی عەهدی قاجار بوو .

[37] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,93-94.

[38] هێندێك جار بە سیمکۆ یان سمیتقۆ ش دەگووت

[39] واپێدەچێت سمکۆ پیاوێکی قنجوقیت و قۆز بووبێت لەمەڕ وەسفکردنی رووخساری سمکۆ بڕوانە:

Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,305.

[40] (ئەی سی وارتسلۆ) کونسوڵی بەریتانیی ئەو کاتە لە تەبریز ، بەدرێژیی باسی کوشتنەکەی جافەرئاغای کردووە و وێنەکەشی پێشانداوە کە سەروخوار هەڵیانواسیوە . بۆ زیاتر لەمەڕ کوشتنەکەی جافەرئاغا :

Albert Charles Wartislaw, A Consul in the East(London: Blackwood,1924),207-9; Ghilan,G."Les Kurdes persans et l invasion Ottomane."Revue du monde Musulman 5,no.5(May 1908),3-6;Nikitine,Les Kurdse,79.263-64.

دەسەڵاتی سەپێنراوی بێرکابەری سمکۆ بوون بەسەر بەشێکی گەورەی کوردستانی ئێراندا . هەر لە قتورەوە بۆ بانە ، بە بەستنەوەی نەتەوایەتییەوە بە چەتەگەرییەوە ، ئەو نەک هەر تەنیا بووە پاڵەوانێک لەنێو گەلەکەیدا ، بەڵکو بووە دڕکێکیش لە قوڕگی ئێرانییەکان و هێزێکی دیارییش کە دەبوایە لە لایەن تورکیا و کارگێڕیی بەریتانیی لە میسۆپۆتامیا حیسابی بۆ بکرایە .

سمکۆ ، لەکاتی جیاوازی جەنگ و پاش جەنگیشدا ، هاوپەیمانییەتیی و هەروەها دوژمنایەتیی و شەڕی لەگەڵ رووسەکان ، تورک ، ئەرمەنەکان ، ئاسورییەکان و هەروەها ئێرانییەکان کردووە .[41] ئەو یەکەمجار ئاتۆرەیەکی خراپی بەدەستهێنا بەهۆی بەغەدرکوشتنی مارشەموونی پەترپارکی ئاسورییەکان پاش ئەوەی زۆر ئەبوو هاوپەیمانیەتیی لەگەڵیان پێکهێنابوو .[42] دەگوترێت ئەم کارە بەهاندانی کارمەندێکی ئێرانیی بووە .[43]

لەوانەیە لەئاکامی ئەم پەرەسەندنە هەمەجۆرانەوە بێت ، کە سمکۆ ، بەهێزترین کەس لە کوردستانی ئێران ، خۆی کردبێتە سەرقافڵەی ئەو جوڵانەوەی داوای ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردانی ئێران کردووە . ئەو لە ئۆکتۆبەری ١٩٢١ دا ، بارەگاکەی خۆی بۆ پایتەختی کۆنی موکریی واتە ساوجبولاق(مەهاباد) گواستەوە ، لەوێ هەواڵی ئەوە هەیە

---

[41] Bell, Review of the Civil Administration,69;Minorsky,"Kurds."

[42] سەرکەوتنی ئەڵمانیا لەبەرەی ئەورووپا بە کەوتنی رووسیا گەیشتە لوتکە ، ئەوەش هانی سمکۆی دا کە چاو بە هاوپەیمانیەتییەکانی بخشێنێتەوە . ئەو داوای لە مارشەموون کرد چاویان بە یەکتر بکەوێت و لە کۆبوونەوەیەکدا باس لەو رووداوانە بکەن . مارشەموون لەکاتی خۆیدا گەیشت و لەگەڵ ژمارەیەک لە شوێنکەوتەکانی گەیشتنە شوێنی تایبەت لە گوندی کۆنەشاری نزیک سەلماس . پاش ئەوەی لە کۆبوونەوەکە دەرچوون وەک دەگوترێت کە لە کەمینێکی دۆستانەدا ئەنجامیان دابوو ، لە هەر چوار لاوە بەر گوللەدران . بۆزیاتر سەبارەت بەو هەلومەرجە و گێڕانەوەی رووداوی کوشتنەکەی مارشەموون :

Wigram and Wigram ,378-81;cf.Shded,273-39; Coan,Frederick G. "Yesterdays in Persia and Kurdistan"..1939,266-67. Longrigg, Iraq (1900-1950),97.

[43] بەگوێرەی( ویگرام و ویگرام) شوێنکەوتە ئاسورییەکانی مارشەموون بە کوشتنی رێبەرەکەیان ئارامەی شێتیی کەللەیی بوون و پەلاماری قەڵاکەی سمکۆیاندا و گرتیان ، لەوێ نامەیەکیان دۆزیوەتەوە کە لەلایەن موختی شەمسی فەرمانداری ئێرانییەوە بۆ سمکۆ نێردراوە تا مارشەموون لەناوبەرێت Wigram and Wigram ,379

کە دەستیکردووە بە بڵاوکردنەوەی (کوردستانی سەربەخۆ) ، ئەو رۆژنامەیەی کە مەبەستی بوو بیکاتە زمانحاڵی خواست و ئارەزووی کورد .[44]

هەر لەم کاتەدا بوو ، باس لەوە دەکرێت کە حکومەتی شورەویی بە قازانجی سمکۆ کەوتۆتە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ئێرانییدا .[45] لەوکاتەدا شورەوییەکان پەیوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ ئێراندا هەبوو و ساڵێك پێشتر رێکەوتنە بەناوبانگەکەی فێبرایەری ۱۹۲۱ یان لەگەڵ مۆرکردبوو .

حکومەتی ئێران ، چ بەهۆی ئەو گفتوگۆ و رێکەوتنەی شورەوییەکانەوە بێت ، یاخود بەهۆی بایەخدانییەوە بێت بە ئەرکی هێورکردنەوەی رەگەزە ناڕازییەکانی بەشە جۆراوجۆرەکانی وڵات ،[46] لە نیوەی یەکەمی ساڵی ۱۹۲۱ دا ، سوور بوو لەسەر ئاگربەست لەگەڵ سمکۆدا . تەنانەت هەوڵیشیدا لەگەڵی رێکبکەوێت بەوەی ئەگەری بەخشینی جۆرێك لە ئۆتۆنۆمیی بە کوردی ئێران هێنایە بەرباس .[47] سمکۆ ، هەرچەندە ، وادەردەکەوێت کەسێکی پەرۆش بێت ، کەوتە سوود وەرگرتن لە دەرفەتی ناجێگیریی هێشتای هەلومەرجی وڵاتەکە ، سەرکردە کوردەکە بڕیاریدا گورزێکی کاریگەر لە پێناو هێنانەدی خەونەکەیدا بوەشێنێت .

## راپەڕینەکەی سمکۆئاغا

سمکۆ لە هاوینی ۱۹۲۲دا بە ئاشکرا راپەڕینەکەی خۆی دژی حکومەت راگەیاند و پەلاماری مەراغەی دا . داگیرکردنی ئەو شارە هاوکات بوو لەگەڵ ئەو راپەڕینەی لەنێو لوڕە هاوڕەگەزەکانی ، کەوا دەردەکەوت لە گەڵیاندا رێکەوتنێکی نهێنی بووبێت .[48] سوپای ئێرانی کە لەلایەن رەزاخانەوە سەرکردایەتیی دەکرا ، کە لە ئایندەدا بووە شای ئێران ، یەکەمجار پەلاماری خێڵە راپەڕیوەکانی لوڕستانیدا و یاخیبوونەکەی تێکشکاند

---

[44] Orient Moderno,I,no.9 (Feb.15, 1922), 548;cf . Arnold J.Toynbee. Survey of International Affairs ,1925,vol. 1 : The Islamic World Since The Peace Settlement (London:Oxford Univ .Press ,1953),538-39.

[45] Orient Moderno,1,no.9 (Feb.15, 1922),548;cf.Toynbee,1:539.

[46] بۆ زیاتر لەمەڕ هەلومەرجەکەی ئێران لەوکاتەدا بڕوانە: Toynbee,1:539ff.

[47] Ibid.,1-539.

[48] Orient Moderno,2,no.2 (Julay.15, 1922),115 cites in Toynbee,1:539.

، پاشتر بایدایەوە سەر سمکۆ و توانی هێزەکانی ببەزێنێت و پەرتەوازەیان بکات . سمکۆ لە سنوور پەڕییەوە و خۆی گەیاندە ناوچە کوردییەکانی عێراق .[49] لەهەڵمەت و پەلامارەکانی دژ بە سمکۆ ، تورکیا پشتگیرییەکی پڕبایەخی پێشکەشی ئەرتەشی ئێران کرد بەوەی یەکە سەربازییە بەهێزەکانی خۆی رەوانەی سنووری تورکیا–ئێران کرد .[50] ئەم کارەی تورکیا خاڵی کۆتاییهاتنی هاوکارییەکانی نێوان سمکۆ و تورك پێكدەهێنێت.

وادەردەکەوێت سمکۆ بەتەواویی شکستیخواردبێت ، وەك لەو گەیشتنە لەپڕ و نادیارەدا بۆ دێرەی نزیك هەولێر لە کۆتایی ئۆکتۆبەری ١٩٢٢دا دەردەکەوێت کە تەنیا چەند دەستوپێوەندێکی کەمی لەگەڵدا بوو .[51] (سی.جەی .ئیدمۆندن) کە چەند رۆژێك پاشتر لە گوندی بەحرکە لەگەڵی وتووێژی کردبوو ، دەڵێت سمکۆ لە ئێرانییەکان کەمتر داخدار بوو بە بەراورد لەگەڵ تورکاندا ، ئەوانەی وا خۆیان پێشاندابوو کە پشتگیریی دەکەن کەچی پشتیان تێکرد و دژی وەستان .[52]

ئەو سەرکردە کوردە نائومێدیی خۆی لە هەڵوێستی بەریتانیی دەربڕیبوو کە ئەوە رەتدەکاتەوە دژی حکومەتی ئێرانیی پشتگیریی بکەن . ئەو ئامارەی بەوەدا ، کە ئێرانییەکان لەگەڵ تورکاندا هاوکاریی یەکتر دەکەن ، ئەو تورکانەی بە ئاشکرا لە چالاکیی چەکدارانەدان دژی بەریتانییەکان تێوەگلاون . وەك ئیدمۆندز دەڵێت ، سمکۆ گوتی :" ئەو بەو هیوایە هاتووە ئێمە ببینێت کە ئامادەین پرسی ئازادیی کورد بگرینەخۆ دژی ئەو دوو حکومەتەی دوژمنایەتیمان دەکەن ، ئەگەر هەڵەیە ئەو ئاخوازێت داوای پەنابەریی بکات ، بەڵکو ملی رێگە بەرەو خێڵەکەی دەگرێتەوە بەر بەتەنیا چی لەدەست دێت دەیکات "[53]

سمکۆ لەوانەیە چاوەڕێی پشتگیریی بەریتانییەکان بووبێت لەبەرامبەر ئەو

---

[49] Ibid.

[50] Oriente Moderno,1,no.10 (Mar.15,1922) .

[51] بەگوێرەی ئیدمۆندز ، سمکۆ کەلوپەل و ساکەکەی لەدەستداوە ، ژنەکەی کوژراوە ، کوڕە شەش ساڵانەکەی "گلێنەی چاوی" ون کردووە . Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs.305.

[52] Ibid.

[53] Ibid.

رازانەی کە سێ مانگ پێشتر لە ژوئێنی ١٩٢٢دا و لەماوەی راپەڕینی دژە بەریتانییەکەی کەریمی فەتاح بەگ لە سلێمانی ، بە قازانجی بەریتانییەکان ئەنجامیدابوو . لەوکاتەدا ، سمکۆ بە هاوکاریی سەیدتەها ، هەوڵێکی زۆریاندا خێڵەکانی ئێران والێبکەن بەشداریی لەو راپەڕینەدا نەکەن ، هەروەها پاشتر پارەتییەکی مەزنیان بۆ کەمکردنەوەی ئەوفشارەکرد کە خرابووە سەر بابەکر ئاغا ی سەرۆکی خێڵی پشدەر و دۆستی نزیکی بەریتانییەکان ، لەکاتێکدا ناچاربوو لەژێرفشاری ئەندامە ناحەزەکانی خێڵەکەی بەرەو خاکی ئێران هەڵبێت .[٥٤]

دوای هەڵاتنی سمکۆ بۆ عێراق ، وادەردەکەوێت مێجۆر نۆئێل هەوڵێکی سەرنەکەوتووانەی دابێت تا سمکۆ ، سەیدتەها و شێخ مەحموود پێکەوە لە بەرەیەکدا کۆبکاتەوە کە ئامانجیان پێکهێنانی هاوپەیمانییەتییەک بێت بۆ پووچەڵکردنەوەی پیلانەکانی تورك .[٥٥] لە ٨ی یەنایەری ١٩٢٣دا ، سمکۆ سەردانی شێخ مەحموودی کرد و لەوێ لەلایەن دەستەی سەربازییەوە پێشوازیی لێکرا و حەوت تۆپی بۆ تەقێندرا ، هەروەها رۆژی گەیشتنەکەشی کرایە پشووی فەرمیی . رۆژنامە خۆماڵییەکەی "رۆژی کوردستان" سمکۆی بە " قارەمانی ئازای کوردستان حەزرەتی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ " ناوهێناوە . هەرچەندە لە نێوان ئەو دوو سەرکردەیەدا هیچ رێکەوتنێك ئەنجام نەدرا.[٥٦]

## شکست و کوشتنی سمکۆ

لە دیسەمبەری ١٩٢٣دا ، پاش دەربڕینی وەفاداریی بۆ حکومەتی ئێرانیی ، لێبوردنێکی بێمەرج بۆ سمکۆ دەرکرا .[٥٧] لە ساڵی ١٩٢٦دا ، جارێکی دی راپەڕییەوە و بەتوندیی لە نزیك دیلمانەوە تێکشکێنرا و بەخۆی و نزیکەی سەد کەس لە

[54] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April 1922 to March, 1923 (London:H.M. Stationary Office.1924).34;

[55] Edmonds .Kurds, Turks and Arabs.310 and 311.

[56] C.J. Edmonds, "A Kurdish Newspaper :"Rozh-I Kurdistan," Journal of the Royal Central Asian Society 12,Part 1 (Jan. 1925).89.

[57] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April 1922 to March, 1923.37.

پیاوەکانییەوە هەڵاتنە عێراق و لەوێ پەناگەی دیتەوە . حکومەتی عێراق ئەو داوایەی ئێرانییەکانی رەتکردەوە کە سمکۆ رادەستی ئەوان بکاتەوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە رادەستکردنەوەی تاوانبارانی سیاسیی بە پێی یاسای رادەستکردنەوەی عێراقیی کارێکی رێپێنەدراوە . هەرچەندە عێراق ناردنی کارمەندێکی ئێرانیی بۆ ئەنجامدانی دانوساندن لەگەڵ سمکۆدا پەسەند کرد .[٥٨] لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٧دا ، هەرچەندە حکومەتی ئێرانیی کارێکی ئەوتۆی لەدەست نەهاتبوو ، سمکۆش لە رەواندز دانیشتبوو و لەوێ وەك " هەڕەشە لەسەر ئارامیی هەردوو دیوی سنوور " باسی لێوە دەکرا .[٥٩]

لە مایۆی ١٩٢٨دا ، سمکۆ بە ویستی خۆی عێراقی بەرەو تورکیا بەجێهێشت .[٦٠] پاش کەمتر لە ساڵێك ، لە ژوونیەی ١٩٢٩دا ، سەرلەنوێ گەڕایەوە عێراق و لەگەڵ پەنجاکەس لە دەستوپێوەندەکەی لە ناوچەیەکی سنووری ئێران–تورکیا دامەزران . کاتێك پێی راگەیەندرا کە نیشتەجێبوونی بەردەوامی لە عێراق وەختایەك گونجاودەبێت کە مانەوەی لە شوێنێکدا بێت لە لایەن حکومەتی عێراقەوە بۆی دەستنیشان بکرێت ، ئەو جارێکی دیکە بەرەو تورکیا کشایەوە . لەوێ لە ناوچەیەکی چیایی کە دەکەوێتە رۆژئاوای رووباری حاجی بەگەوە تا کۆتایی ساڵەکە مایەوە .[٦١]

وا دەردەکەوێت هاتوچۆی سمکۆ بەرەو کۆتایی چووبێت کاتێك نامەیەکی

---

[58] Great Britain ,Colonial Office , Report by H.B.M. s Government to the Council of thr League of Nation on the Administration of Iraq for the Year 1926 (London:H.M. Stationary Office,1927),26.

[59] Great Britain ,Colonial Office , Report by H.B.M. s Government to the Council of thr League of Nation on the Administration of Iraq for the Year 1927 (London:H.M. Stationary Office,1928),61-62.

[60] Great Britain ,Colonial Office , Report by H.B.M. s Government to the Council of thr League of Nation on the Administration of Iraq for the Year 1928 (London:H.M. Stationary Office,1929),4.

[61] Great Britain ,Colonial Office , Report by H.B.M. s Government to the Council of thr League of Nation on the Administration of Iraq for the Year 1929 (London:H.M. Stationary Office,1930),44.

فەرمیی لە تەبریزەوە پێگەیشت و تێیدا بەخشینی تەواو و پۆستی فەرمانداری شنۆی پێدرابوو . سمکۆ بەرەو شنۆ بەڕێکەوت ، لەوێ کرایە فەرماندار و بۆ ماوەی سێ رۆژ لەلایەن خێڵە کوردەکانی دەوروبەرەوە سەردانی کراو بەڵێنی دڵسۆزیی و پشتگیریی پێدرا . دواتر ئاگادار کرایەوە کە بەرپرسێکی باڵای ئێرانیی دێت بۆ سەردانی . سمکۆ بە هاوەڵی ژمارەیەک لە سەرۆکەکانی کورد و شوێنکەوتەکانی بۆ دیدەنی ئەو کارمەندە لە شنۆ دەرکەوت ، پاش چاوەڕوانییەکی زۆر لە شوێنێکی دیاریکراودا ، سوارێک هات و لەوە ئاگاداری کردنەوە کە ئەو بەرپرسە بەهۆی شکاندنی ئۆتۆمبێلەکەیەوە ناتوانێت لەو رۆژەدا بگاتە شنۆ . سمکۆ و هاوەڵانی بەرەو شنۆ گەڕانەوە ، کاتێک لە ماڵەکەی خۆی نزیک بووەوە ، چەند سەربازێکی سوپای ئێرانیی ، کە لە سەربانەکانی دەوروبەر دامەزرابوون ، لە هەموو لایەکەوە رێژنەی گوللەیان بەسەردا باراندن . سمکۆ و دوازدە سەرۆکی کوردی دیکە ، پێکەوە لەگەڵ پیاوەکانیان کوژران . راپۆرتێکی بەریتانیی ئاماژەی بەوە داوە کە سمکۆ لەلایەن هێندێک لە پیاوەکانیەوە لەو غەدرە ورپاکراوەتەوە ، بەڵام ئەو ئامادە نەبووە گوێ بۆ ورپاکردنەوەکەیان رادێرێت .[٦٢]

### هەلومەرجەکەی سوریا

هەلومەرجی کوردانی سوریا لەپاش جەنگی یەکەمی جیهانیی بەشێوەیەکی مەزن لەژێر کاریگەریی پەرەسەندنی رووداوەکانی تورکیا بوو . چالاکییە نەتەوایەتییەکان لەنێو خەڵکە خوێندەوارە شارنشینەکانی دیمەشق ، حەلەب و شارەکانی سوریادا لە سایەی کاریگەریی و فراوانبوونی چالاکییە نەتەوایەتییە کوردییەکانی نێو تورکیا بوو .

ئەمە هەروەها بۆ خێڵەکوردەکانی نێو سوریاش دروستە ، ئەو هێڵە سنوورییە تازە کێشراوە لەو کاتەدا بۆ کوردە خێڵەکییەکانی ناوچە سنوورییەکانی ئەو وڵاتە مانایەکی وای نەدەگەیاند .هەرچەندە ئەو سنوورە نوێیە لە زۆربەی حاڵەتدا ئەندامانی هەمان خێڵی بەسەر دوو کارگێڕیی جیاوازدا دابەشدەکرد کە فەرەنسیی و تورکەکانە ،[٦٣]

---

[62] Hamilton , 162-164.

[63] لەو رووەوە ، ئێلفینستۆن ئاماژەی بەوەداوە کە کوردانی جەزیرە کە زۆربەی ئەو ٢٥٠٠٠ی کوردی سوریا

کوردە سورییەکانی ئەم ناوچانە بەردەوام پەیوەندییان لەگەڵ خزم و کەسەکانیان لە تورکیادا هەبووە (زۆربەی جار ئەندامی هەمان خێڵن) و لە سایەی هەمان هەلومەرجدا هەڵسوڕاون .

بەوەش ، کوردەخێڵەکییەکانی باکووری سوریا زیاتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی خزم و کەسەکانیان لە تورکیا و هەروەها مەڵبەندەکانی چالاکیە نەتەوایەتییەکانی وەك ئۆرفە ، سیڤرێك ، ماردین و هەروەها جەزیرەی ئیبن عومەر . کوردانی سوریا ، هەروەك کوردانی عێراق و ئێران و هەستیان بەو کاریگەرییە هەژێنەرەی نەتەوایەتیی کوردیی کردووە کە لە تورکیاوە سەرچاوەی گرتووە ، بگرە لە راستییدا بەشداریشیان تێدا کردووە .

لە ١٩ی مایۆی ١٩١٩دا ، یوسف حەیدەر و خەیرەدین زەرگولی ، خاوەنی رۆژنامەی (المفید) ی دیمەشقی ، گوتارێکی درێژیان سەبارەت بە سەربەخۆیی کورد بە ناونیشانی " نامەیەکی ئاوەڵا بۆ کوردان لە باکوور و باشووری کوردستان" چاپ و بڵاوکردەوە . سروشتی پڕۆپاگەندەیی ئەم گوتارە بەو راستییەوە ئاشکرابوو کە چەندین کۆپی ئەم رۆژنامەیە لە شەقامەکانی حەڵەبدا بە خۆڕایی دەبەشرانەوە . گوتارەکە بە تاوتوێکردنی بێبایەخیی سیاسییەکانی کورد دەستپێدەکات و قسەکەی سەرۆك ویلسنی لەمەڕ " لابردنی یۆگی دیلیی رۆژانی رابردوو لە گەردنی گەلاندا " ی وەبیری خوێنەران هێنابووەوە . دوای ئامارژەدان بە راپەڕینی عەرەب و تێکۆشانی عەرەب بۆ سەربەخۆیی ، داوای لە کوردان کردبوو بکەونەخۆ و داوای بەشی خۆیان ، کوردستانی ئازاد ، بکەن کە ئەرزیڕۆم ، وان ، بدلیس ، خەرپوت ، دیاربەکر ، موسڵ و زۆرجێی دیکە کە پێکەوە٥ ٣ ملیۆن کوردی تێدا دەژی .چەند کەسێکی نەناسراویش ئامیلکەیەکیان لە شارەکانی : حەڵەب ، میدیات ، ئەزیخ ، گۆیان ، ناوچەی باکووری زاخۆ ، نسیبین ، جەزیرەی ئیبن عومەر ، شێرناخ ، موسڵ ، ناوچەی زاب و زۆر شوێنی دیکە بڵاوکردبووەوە کە ئەم گوتارەی لەخۆگرتبوو .[٦٤]

وێڕای ئەوەش ، پێویستە ئامارژە بەوە بکرێت کە بەشداریی کوردانی سوریا لە

---

پێکدەهێنن لەو خێڵە دابڕاوانەی کوردی سنووری باشووری تورکیان

Elphinston, Kurds and The Kurdish Question,"46-47.

[64] Driver ,"Kurdistan and The Kurds,86.

جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کوردییدا لە تەنیا روویەکی گرنگەوە لەوەکەی کوردانی تورکیا ، عێراق و ئێران جیاوازە . سوریا نەك ئەو کۆمەڵگە کوردییە ژمارە زۆر لەخۆگرتووەی ئەو وڵاتانەی هەیە ،نە ئەو ناوەندە چڕەی ژیانی خێڵە کوردەکان و بنکە سەرەکییەکانی وەك : بدلیس ، دیاربەکر ، جەزیرە لە تورکیا و سلێمانی ، رەواندز و ئامێدیی لە عێراق و سنە ، سابلاغ و ورمێی لە ئێران هەیە. دەگونجێت لەبەر ئەم هۆیە بێت کە کوردستانی سوریا نەیتوانیوە کەسایەتییەکی نەتەوەیی کوردیی بە ئاستی کەسانی وەك شێخ مەحموود لە عێراق ، سمكۆ ئاغا لە ئێران ، شێخ سەعید لە تورکیا بەرهەم بهێنێت .ناسراوترین سەرکردەکانی کوردانی سوریا ، برایانی بەدرخانن ، کە لە بنەڕەتەوە کوردی جەزیرەن و وێڕای ئەوەی باوباپیرانیان میری میراتگریوون ، بەڵام خۆیان روونـاکبیر بوون زیاتر لەوەی هاوشێوەی سەرکردە کوردەکانی پێشوون کە پشتگیرییەکی بەرفراوانی خێڵەکانیان هەبوو .

بارودۆخی کوردستانی سوریا وەك کوردستانی عێراق یا ئێران سەرنجڕاکێش نەبوو . هەروەها نەبووە هۆی هەڵایسانی ئاڵۆزیی مەترسییدار وەك ئەوانەی لەو دوو هەرێمەی دیکە قەومان . تەنانەت لە ساڵانی دواتریشدا وەك دەبینین ، کوردانی سوریا زیاتر لە کوردانی هاوڕەگەزەکانیان لە تورکیا و عێراق و هەروەها ئێراندا بێدەنگتر مابوونەوە . هەرچەندە ناوچەکە بێ بەشدارییەکی کەم لە هەرا و ئاڵۆزییەکاندا نەمایەوە .

## کورد و داگیرکاریی فەرەنسییەکان لە سوریا

وا پێدەچێت فەرەنسییەکان هەر زوو پاش داگیرکارییەکەیان بۆ سوریا هەوڵی راکێشان و بەدەستهێنانی متمانەی کوردیان دابێت . لە فێبرایەری ١٩٢١دا ، کاتێك ناکۆکیی نێوان فەرەنسیی و کەمالیستەکان گەیشتە رادەی پێکدادانی چەکداریی ، کوردانی هاوپەیمانییەتیی میللیی هاوکاری فەرەنسییەکانیان کرد بۆ پاشەکشەپێکردنی ئەو هێزە غەیرە نیزامییە تورکییەی دەیویست دێرنەلزۆر لەدەستی فەرەنسییەکان دەربێنێت ، ئەو شوێنەی دەکەوێتە ناوچەی ژووروی ناوەڕاستی رووباری فوراتەوە .[٦٥]

---

[٦٥] Iraq (British Administration).Office of Civil Commissioner. Administration Report of

لەم کاتەدا ، والەریەکەویت فەرەنسییەکان لەگەڵ بیرۆکەی دامەزراندنی میرنشینێکی کوردیی کە ئۆرفە ، رەئس ئەلعەین ، ماردین ، نەسیبین و جەزیرەی ئیبن عومەر بگرێتەخۆ و لەسایەی کورەکەی ئیبراهیم پاشای میللییدا بێت ، کەوتبوونە گەمە .[66] ئەوان وازیان لەو بیرۆکەیە هێنا ، وێڕای ئەوەی پێش تێپەڕبوونی ساڵەکە ، توانییان لەگەڵ تورکاندا بگەنە لێکتێگەیشتنێکی سەرتاسەریی سەبارەت بە زۆربەی کێشە چارەسەرنەکراوەکانی نێوانیان ، ئەو لێکگەیشتنەی کە لە رێکەوتننامەی ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٢١ی فرانکلین-بۆیللن دا بەرجەستە بوو . بەپێی ئەم رێکەوتننامەیە فەرەنسییەکان پاشەکشەی خۆیان لە کلیکیا و ناوچەکانی دیکەی کە تورکان داوایان دەکرد ، پەسەند کرد و ئامادەبوون رژێمێکی کارگێڕیی تایبەت ببەخشنە سنجەقی ئەسکەندەرونە ، هەرچەندە ئەم رێکەوتنە کاریگەریی لەسەر هێورکردنەوەی هەلومەرجەکە بە درێژایی سنووری تورکیا-سوریا نەبوو ، بەتایبەتیی لە هەرێمی جەزیرە ، ئەو هەرێمەی کە مەزنترین ناوەندی کوردانە لە سوریا .کۆمسیۆنی هاوبەشی ساڵی ١٩٢٥ و رێکەوتننامەی تورکیی- فەرەنسیی فێبرایەری ١٩٢٥ نەیتوانی تێکڕای خاڵەکانی ناکۆکیی نێوان تورکیا و فەرەنسا چارەسەر بکات . تاکو ساڵی ١٩٣٠ بەشی رۆژهەلاتی سنووری سوریا بەتەواویی دەستنیشان نەکرابوو .[67] ئەو رێکەوتنەی دوایی بە شێوەیەکی فەرمیی هەرێمی جەزیرەی دابە سوریا ، ئەوەی کە فەرەنسییەکان هەر لە سەرەتای داگیرکارییەکەیانەوە بۆ وڵاتەکە لەو هەرێمەدا بوون و بەڕێوەیان دەبرد .

هەر زوو پاش ئەوەی فەرەنسییەکان رژێمە عەرەبییەکەی فەیسەڵیان ریشەکێشکرد ، لەپێناو جێگیرکردن و گەشەپێدانی ئەو هەرێمە دەوڵەمەندە هەنگاویان نا .[68] بەزۆر رێگەی جۆراوجۆر کەوتنە هاندانی عەرەب ، کورد ، چەرکەس ، ئەرمەن ،

---

the Mosul Division for the Year 1921,2.

[66] Ibid.

[67] A.H. Hourani .Syria and Lebanon: A Political Eaasy (London : Oxford Univ .Press ,1946), 56-57.

[68] Eliahu Epstein , "Al Jazireh" . Journal of the Royal Central Asian Society 27, parts 1 (Jan. 1940): 68-82.

یاقوبیی ، کاسۆلیکە سورییەکان و دواتریش ئاسورییە نیشتەجێکان تا بە تەواویی جێگیربن و کاری کشتوکاڵی لە هەرێمەکەدا بکەن .هەندێک شارۆکەی وەك حەسەکە ، قامیشلو ، هەروەها عامودا قەرەباڵغ بوون و بوونە ناوەندێکی گەشاوە و پەرەسەندوو . فەرەنسییەکان هەر زۆر لە سەرەتاوە لە هەوڵی ئەوەدا بوون بایەخ بە کوردەکانی جەزیرە بدەن و دۆستایەتیی و رەزامەندییان بەدەستبێنن ، بێگومان وەك پارسەنگێك بۆ عەرەبیەکانی ناوچەکە . خێڵەکانی کورد و عەرەب ، سەدەها ساڵ بوو بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئەو ناوچەیە لە رکابەرییدا بوون . ئەو ململانێیەی کە بە ناوابوونی سەدەی رابردوو بەرەو کێشمەکێشێکی تاڵ لە نێوان کۆنفدراسیۆنی کوردە میللییەکان بە سەرکردایەتیی ئیبراهیم پاشا و عەشیرەتی مەزنی شەممەری عەرەب ، پەرەی سەند .

## خۆیبوون و چالاکییەکانی دیکەی پەنابەرانی کورد لە سوریا

پەنابەرانی کورد لە سوریا ، لەسایەی پاراستنی فەرەنسییەکاندا ، رێگەیان پێدرا لە چالاکی توندی نەتەوایەتییەوە بگلێن و چەند ناوەندێکی سیاسیی و کەلتووریش لە دیمەشق و بێروت دابمەزرێنن .[٦٩] ئەم پەنابەرانە لەو کوردانە بوون کە لە زۆر بەشی جیاوازی تورکیاوە هاتبوون و لە سوریا ببوونە پەنابەر و لە دژایەتیی تورکیا بەردەوام بوون ، ئەوان ئەرکی دامەزراندنی رێکخراوەکان و سەرکردایەتیی کوردانی سوریایان گرتە ئەستۆ . پەرەسەندنی رووداوەکان پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی لە تورکیا بەشێوەیەکی مەزن یارمەتیی ئەم سەرکردە پەنابەرانەی دا تا ئامانجەکانیان بێننەدی . هەرچی هەستێکی تورکخوازانەش پاش داگیرکاریی فەرەنسییەکان لەجەزیرەدا مابوو پاش راپەڕینە کوردییەکەی ساڵی ١٩٢٥ و هەروەها راپەڕینەکانی دواتری نێو تورکیا ، کاڵبووەوە و لەناوچوو .

گرنگترین چالاکیی پەنابەرە کوردەکان لە سوریا بریتیبوو لە دامەزراندنی

---

[٦٩] دیمەشق بەشێوەیەکی سوننەتی ناوەندی ئەو کوردانە بووە لە هەموو لایەکی کوردستانەوە کۆچیان بۆ کردووە، گومانی تێدانیە کە زۆربەی ئەوانەی راکێشاوە ئەوە بووە کە شوێنی مەزنترین کەسایەتیی کوردانە کە ئەویش سەلاحەدینە ، کە گۆڕەکەی لە شارەکەدایە هەروەها ئەم مەیلە لەلایەن ئەو راستییەشەوە هاندراوە کە مەولانا خالیدی دامەزرێنەری تەریقەتی نەقشبەندیی لە کوردستان لەو شارە کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە.

خۆیبوون لە ساڵی ١٩٢٧دا ، ئەو ڕێکخراوەی ئامانجی بنەڕەتیی زەقکردنەوەی کێشەی نەتەوایەتیی کورد و ئاراستەکردنی چالاکییەکانی کورد دژی تورکیا بوو . ئەم ڕێکخراوە چالاکانە بەشداریی ڕێکخستنی راپەڕینی ئاگریداغی لە تورکیا لە ساڵی ١٩٣٠دا کرد . خۆیبوون ناوەندی بۆ چالاکییە نەتەوایەتییە کوردییەکان لە ژمارەیەک شاری دەرەوەی سوریا دامەزران ، وەک : قاهیرە ، پاریس ، دیترۆیت ،و ڤلادلیڤیا .[70] بە تایبەتیی ئەو لە پاریس زۆر چالاک بوو .

دامەزراندنی خۆیبوون بنەمایەکی بۆ پەیوەندیی توندوتۆڵ لە نێوان کورد و فەرەنسییەکان لە سوریا پێکهێنا . ئەو راستییەی کە فەرەنسییەکان ڕێیاندا خۆیبوون (بەرجەستەترین ڕێکخراوی نەتەوایەتیی کورد لەماوەی چەندین ساڵدا) سوریا وەک بنکەیەک بۆ کارو چالاکییەکانی بەکاربێنێت ، ڕێبەرانی نەتەوەخوازی کوردی هاندا ئەوپەڕی توانای خۆیان بۆ بنیاتنانی هەڵوێستێکی فەرەنسیخوا لەنێو کوردەکانی سوریا پێکبهێنن . ئەم پەیوەندییە سەلماندی کە بۆ کورد و فەرەنسییەکان هەردووکیان بەسوود بوو بێئەوەی هیچ ناکۆکییەکی وا هەبێت ئەو پەیوەندییە بشێوێنێت . لەکاتی شۆڕشی ئاگریداغ لە ساڵی ١٩٣٠ ، لەوانەیە وەک وەڵامدانەوەیەکیش بە نوێنەرانی تورک ، فەرەنسییەکان داوایان لە میر سورەییا بەدرخان کرد سوریا بەرەو فەرنسا جێبهێڵێت . ئەو لەوێ تا مردنیشی لەساڵی ١٩٣٨ نیشتەجێ و خەریکی چالاکی نەتەوایەتیی بوو .[71] لەماوەی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانیی ، وەک دەبینین ، دەسەڵاتدارانی فەرەنسیی داوایان لە خۆیبوون کرد خۆ لە چالاکیی دژە تورک بپارێزێت ، خۆیبوون ئەو داوایەی پەسەند کرد .

[70] هێندێك بەچکە کورد لە ئەمەریکا چالاکییەکانی خۆیبوونیان رادەپەراند

یوسف مالك ، کوردستان او بلاد الاکراد،بیروت، ١٩٤٥، ٢٥ Chirguh, La question kurde, 37;

[71] Nikitine .Les Kurdes,200; Basile Nikitine . "Badrkhani," in Encyclopaedia of Islam, New Edition , 1:871.

## ئاژاوەی کوردیی لە جەزیرە لەساڵی ١٩٣٧دا

هەر زوو پاش رێکەوتننامەی فەرەنسیی-سووریی لەساڵی ١٩٣٦ ، توندوتیژیی لە هەرێمی جزیرە بەرپابوو ، کاتێک بە پێی نێوەرۆکی رێکەوتننامەکە ، کارمەندی سووریی شوێنی کارمەندە فەرەنسییەکان دەگرنەوە . بەشێکی بەرچاوی خەڵکەکە ، بەهاندانی کارمەندی ناوچەیی فەرەنسیی ، ئەو هەنگاوەیان ریسواکرد و داوایانکرد لانیکەم کارمەندانی ناوچەیی لە خەڵکی ناوچەکە دامەزرێنن . کوردانی حەسەکە لەساڵی ١٩٣٧دا و لەئەنجامی دامەزراندنی کارمەندێکی سووریی لە دەرەوەی هەرێمەکە هەرایەکی توندوتیژیان لەدەرەوەی جەزیرە نایەوە . ئەم تەقینەوانە بە هاوکاریی هێزە سەربازییەکانی فەرەنسیی خامۆشکران . ماوەیەکی کەم پاش ئەوە ، کریستانییەکانی قامشلو و ناوەندەکانی دیکە لە جەزیرە سەرلەنوێ ئاژاوەیان نایەوە ، هاوکات لەگەڵ نواندنی توندوتیژییدا داوای رژێمێکی کارگێریی تایبەتیان دەکرد کە بە بێ لەبەرچاوگرتنی رەگەز و ئاینێکی تایبەت مافی یەکسان بۆ هەمووان مسۆگەر بکات.[٧٢]

ئەم تەقینەوانە کە لە ئوتی ١٩٣٧دا گەیشتە ترۆپک ، بەرەو پێکدادانی چەکداریی پەرەی گرت . چەند کریستانییەکی عامودا لەلایەن سەرخێڵە کوردەکانی پیاوی حکومەتەوە کوژران . هێزە سەربازییەکانی فەرەنسیی بۆ کۆتاییپێهێنانی ئەو ئاژاوانە بانگهێشت کران و نەزم و ئارامیی گەرایەوە . هاندان بۆ رژێمی جیا لە جەزیرە بەردەوام بوو ، وێرای ئەوەی چەند رووداوێک قەومان و لە دیسەمبەری ١٩٣٧ دا زۆر پەرەیان گرت ، کاتێک فەرمانداری جەزیرە لەلایەن دەستەیەکی جیاخوازی خەڵکی حەسەکەوە فرێندرا . هەمان کات ، کاردینال تۆپیونی ، رابەری کڵێسای کاسۆلیکی سووریی ، چالاکانە لە پتەوکردنی پرسی جیاخوازەکان ، لە پاریس و رۆما تێکەڵ بە رووداوەکان بوو .[٧٣] ئەمە ، هەرچەندە ، قۆناغێکی تێپەڕین بوو ، زۆری نەخایاند شتەکان ئاسایی بوونەوە .

---

[72] Hourani ,Syria and Lebanon.215.

[73] Ibid.216.

# بەشی نۆیەم: ئاڵۆزییەکانی لیوای موسڵ و هەولێر لە کوردستانی عێراق پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی

بەهاتنی بەهاری ١٩١٩ ، پڕۆپاگەندەی توندی دژە بەریتانیی و دژە کریستیانیی لە لایەن تورکانەوە لەوەدا بوو لە کوردستانی عێراقدا بەری خۆی بدات . بەتایبەت لەو بەشانەی ویلایەتی موسڵ کە لە ناوەندە هەژاوە کانی شیرناخ و جەزیرەی ئیبن عومەرەوە نزیکترە . بەریتانییەکان بەو کافرانە ناسێندران کە دەیانەوێت دەسەڵاتێکی ستەمکاریی بیانیی نادادپەروەرانە بەسەر کورددا بسەپێنن و لەپێناو بەرژەوەندییە تەسکەکانی خۆیان و بەقازانجی کریستیانییەکانی ناوچەکە تەوقی دیلیەتییان لەگەردن بکەن ، هاوئایینیی ، ئایین ، نیشتمانپەروەریی ، هەروەها داب‌ونەریتی نێوچەیی لەدژی داگیرکەران دەیهەژاندن .

وادەردەکەوێت بارودۆخی توندی ناوچە سنوورییەکان گەیشتبێتە حاڵەتێکی ئاڵۆزیی ئەوتۆ کە وەك هەواڵەکان دەڵێن ، کۆمەڵگە کریستیانییەکانی نێوان جەزیرە و زاخۆ لە حاڵەتێکی مەترسیداری مەزن دانرابێتن . لەراستییدا ، وەك دەگوترێت ، ئاڵۆزییە دژە کریستیانییەکان لە زۆر جێگە سەریانهەڵدا بوو .[1] بە تەواویی ئاشکرایە کە کارگێڕیی بەریتانیی لە ناوچە سەختە سنوورییەکانی باکووری ویلایەتی موسڵدا لە هەلومەرجێکی زۆر لەباردا دانەمەزرا . تەنانەت گەر هەلومەرجەکەش باشتر بووایە ، گومانی تێدا نیە کە کورد ، ئەوانەی بۆ ماوەی چەندین سەدە لەسەر شێوازیی ژیانی عوسمانیی راهاتبوون ، هەروا بەساکاریی بتوانن بەو شێوازە ناناشنایەی بەریتانییە تازە هاتووەکان بەڕێوەبچن .

### تەقینەوەی ناوچەی زاخۆ

واپێدەچێت بەریتانییەکان بەڵگەی تەواویان لەمەڕ چالاکیی تێکدەرانەی تورکان لەبەردەستدا بووبێت ، بەڵام نەیانویستبێت یا نەیانتوانیبێت رێگەی لێبگرن . لە ١٩ی مارتی ١٩١٩دا ، نامەکانی عەبدولڕەحمان ئاغای شیرناخ ، کە سەرۆکێکی دەسەڵاتدار و

[1] Bell, Review of the Civil Administration,62.

خۆی بە لێپرسراوی هاوپەیمانیەتییەکی خێڵەکیی بەرفراوان دەزانی ، لەلایەن بەریتانیەکانەوە دەستی بەسەرداگیرا . عەبدولڕەحمان ئاغا لە نامەکانیدا هانی ئەو سەرخێڵە کوردانەی داوە کە دەکەونە ناوچەی بەریتانییاوە ، کە بێگانە لە ناوچەکەیاندا دەرپەڕێنن .ئەو جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە کە جوڵانەوەیەك ئەو لایەنگرێتی ، بەشێوەیەکی فەرمیی لەلایەن حکومەتی تورکییەوە دانپێدانراوە و پشتگیریی لێدەکرێت . هەروەها بۆ خۆشی لە پشتگیریی و هاوکاریی کەسایەتیی و کۆمەڵە جۆراوجۆرەکانی ئەستەمبوڵ ، قاهیرە و پاریس بەهرەمەندە ، ئەوانەی کار بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی دەکەن .[2] هەمانکات هەواڵی ئەوتۆ هەیە کە ئەفسەرانی تورك بۆ هاندانی سەرکردە نێوچەییەکان و پەیوەستبوونیان بەو جوڵانەوەیە ، سەردانی ناوچەی شەمدینانیان کردووە ، بەڵام بەساردییەوە پێشوازییان لێکردوون . بڕواش وابوو تەنانەت ئەفسەرێکی تورکیش بە هەمان مەبەست بۆ ویلایەتی موسڵ دزەی کردبێت .[3]

گۆیان کە خێڵێکی سەربەگۆبەندە و لەناوچەیەکی چیایی سەختی باکووری زاخۆ دەژیان ، یەکەمجار ئەوان دەستیانپێکرد . ئەوان کە بەگشتیی بە یاساشکێنیی بەدکاریی دژی کریستیانییەکانی گوندەکانی دەوروبەر تاوانبار بوون ، دواجار چاوەنترسیی و سەرەڕۆییان گەیشتە ئاستێك رکابەریی هێزە داگیرکەرەکە خۆی بکەن .

کاپتن (ئەی.سی.پیرسن) جێگری ئەفسەری رامیاریی لە زاخۆ ، ئەوەی کە دەگوترا هەوڵێکی بایەخداری لەپێناو کۆتاییپێهێنانی تاڵانکارییەکانی گۆیان داوە ، دواجار قسەی سەرخێڵەکانی پێگەیشتبوو کە خوازیارە لەگەڵ بەریتانیەکان رێکەوێت . هەر بۆیە بەو خەیاڵەوە رۆیشتبوو تا سەرخێڵی گۆیان ببینێت کە لەلایەن چەکدارانی گۆیانەوە پاسەوانیی لێدەکرا . پیرسن لە ٤ی ئابریلی ١٩١٩دا ، کاتێك بەرێوە بوو بۆ جێگای کۆبوونەوەکە خرایە بۆسەوە و کوژرا . بەگوێرەی سەرچاوە فەرمییە بەریتانیەکان ، هەلومەرجی کوشتنەکەی پیرسن هیچ گومانێك بۆ ئەوە ناهێڵێتەوە کە دەستی ئەنقەستی تێدا بووە و پاسەوانەکانی گۆیانیش دەستیان تێدا هەبووە .[4]

---

[2] Ibid.Cf. Driver ,"Kurdistan and The Kurds,89.

[3] Bell, Review of the Civil Administration.62.

[4] Ibid.; Driver ,"Kurdistan and The Kurds,89; A.T.Wilson,Loyalties,2:147; Driver ,"The Kurdish Question ." 111.

بەریتانییەکان لە ئاسەوارە مەزنەکانی ئەم پەرەگرتنە بەئاگابوون . بێگومان ئەوان لەوە دەترسان ئەم رووداوە ببێتە هۆی هەڵایسانی شەپۆلێکی توندوتیژیی دژی کارمەندی بەریتانیی لە سەراسەری ناوچەکەدا ، ترسێکی وا کە بە تەواویی لە شوێنی خۆیدا بوو و هاتەدی . لە راپۆرتێکی فەرمییدا ئەم نیگەرانییە و دڵەراوکێیەی بەریتانییەکان رەنگیداوەتەوە . لەکاتێکدا بەدوای رێگە چارەیەکدا دەگەڕێن رووبەڕووی ئەو هەلومەرجەی ببنەوە . ئەوان بە ناچاریی بیریان لەو شێوازە دەکردەوە کە پێش هاتنی ئەوان ، تورکان لەهەمبەر قەومانی رووداوێکی وا لە ناوچەکە دەیانگرتەبەر .بەگوێرەی راپۆرتەکە :

" لەماوەی دواچارەکی فەرمانڕەوایەتیی تورکاندا ، تورکان کاتێك یەك لە کارمەندەکانیان دەکوژرا ، لە ئەنجامدانی توندوتیژترین کار و هەنگاو ئەدەپرینگانەوە و شکستیان نەدەخوارد . لە سایەی فەرمانڕەوایەتیی ئێمەدا ، ئەوە یەکەمجارە حاڵەتی وا روویدات ، هەروەها ئاساییە خێڵەکان وەك تاقیکردنەوەیەکی هێز و توانای حکومەتەکەمان تێیبڕوانن ، هەروەها وەك پێودانگێك بۆ ئەو ئەو ئاستەی ، چەندە دەتوانن رکابەرییمان بکەن و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچن ."[5]

راپۆرتەکە لەو ئەگەرە جۆربەجۆرانە دەدوێت کە بەریتانییەکان لەمەڕ رووداوەکە دەیگرتەبەر . ناردنی ستوونێکی سەربازیی تەمێکارانە دژی گۆیان ، هاوکات داگیرکردنی ناوچەی جەزیرەی ئیبن عومەر ، ئەو پلانە بوو کە رێگای پێدرابوو ، ئەو پلانەی قازانجی ئاشکرای خۆی هەبوو ، بەڵام وێڕای ئەوە زیانی خۆشی هەبوو ، راستە بەوە گۆیان بەسزای خۆیان دەگەن و داگیرکردنی سەربازیی جەزیرەش دەبێتە هۆی ریشەکێشکردنی پیلانگێڕیی لە یەك لە گرنگترین ناوەندەکانی و بە تەواوەتیی هەلومەرجەکە بەدژی خێڵە ئاژاوەگێڕەکان هەڵدەگێڕێتەوە خامۆشیان دەکات . بەڵام گۆیان لە بەشێکی زۆر دەرەوەی ناوچەی داگیرکراوی بەریتانییدا دەژیان و ناردنی ستوونێکی سەربازیی بەو چەشنە

---

کاتێك ئاماژە بەم رووداوە دەکرێت ، ناوی عەبدولرەحمان ئاغا زۆر دووپات دەکرێتەوە ، بەڵام کوشتنی کاپتن پێرسن لە ئەستۆی حەسەدینۆی سەرۆکی گۆیانە .

Iraq (British Administration).Office of Civil Commissioner. Administration Report of the Mosul Division for the Year 1921,7-8.

[5] Bell, Review of the Civil Administration,62.

داگیرکردنی خاکی تورکیا پێکدەهێنێت ، ئەم راستییە هاوجووت بوو لەگەڵ سەختی ناوچەکە و کەمی هێز و کەلوپەلی سەربازیی ، ئەوەی دەریخست کە پووچەڵکردنەوەی هەر قازانجێکە کە لە جێبەجێکردنی ئەو پلانەدا بێتەدی .[6]

ئەوە ئەگەر لەبەرچاوگیرا کە دەگونجا بۆ سزادانی گوناهباران لە لایەن تورکانەوە بگیرایەتەبەر ، بەڵام وەك ئەگەرێکی نەشیاو لەوکاتەدا رەتکرایەوە . دەزانرا کە ئاژاوەکە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە ئاکامی پیلانگێڕیی تورکانە ، لە سۆنگەی ئەوەشەوە چاوەڕێی هاریکاریی راستگۆیانە و چالاکانە تورك ناکرێت . سەرباری ئەوەش ، داواکردنی یارمەتیی تورکان بۆ سەرکوتکردنی گۆیان ئەو هەستە دێنێتەئارا کە وەك نیشانەیەك بۆ لاوازیی بەریتانییەکان لەناوچەکەدا لەقەڵەمبدرێت ، ئەو تێڕوانینەی کە دەیانویست بەهەر نرخێك بێت خۆیانی لێ بەدووربگرن .[7]

دوای لەبەرچاوگرتن و رەتکردنەوەی ئەو ئەگەرەی پێشوو ، دواجار دەسەڵاتدرانی بەریتانیی بڕیاریاندا پەنا بۆ بۆمباران وەك گونجاوترین شێواز بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ گۆیاندا بەرن . هەرچەندە یەکەمین هەوڵ ئەنجامی خوازراوی لێنەکەوتەوە ، بەڵام بۆمبارانکردنەکانی داهاتوو سەرکەوتنی سەبارەت بە سەرپێدانەواندنی خێڵەکییە سەرکەشەکان پێشاندا .[8]

## تەقینەوەکەی ئامێدیی

تەقینەوەی داهاتوو دژی بەریتانییەکان لە ئامێدیی روویدا . لێرەش ، هەروەك زاخۆ و هەروەها لە راستییدا لەسەراسەری ئەو ناوچەیەی بەریتانیا داگیری کردبوو ، پڕۆپاگەندەی تورك هەمان شێوازی بۆ هاندانی هەڕان و ناثارامیی گرتبۆبەر . بەگوێرەی بێڵ ، بەریتانییەکان لە یەنایەری ١٩١٩ کارگێڕیی خۆیان گەیاندە ناوچەی ئامێدیی ، کات

[6] Ibid.

[7] Ibid.,62-63

[8] Ibid.,63.

لکێکی سەربازییان نارد تا ٤ مایل لە دووری شارەکەوە جێگیربێت .[9] لە مارتدا ، جێگرێکی ئەفسەری رامیارییان دامەزراند تا لەنێو شارەکەوە ناوچەی ئامێدیی بەڕێوەبەرێت . لە ژوونی ١٩١٩ ، بەریتانییەکان بڕیاریاندا هێزەکانی خۆیان بکێشنەوە دەربەندی سوارەتوکە کە هەژدە مایل لە رۆژئاوای شارەکەوەیە . بەوەش (کاپتن دی.ویلی) جێگری ئەفسەری رامیاریی ، لەگەڵ ئەفسەری یەك ئەستێرە (ئێچ.ماکدۆڵاند) ، هەروەها ئەفسەری چاودێریی (سی.ئار.ترۆپ) ، کە لە هێزی لیڤی نێوچەیی بەرپرسیاربوون ، هەروەها دوو نووسەری تەلەگرافی هیندیی ، لەنێوشارەکەدا بە تەواویی دابڕان .[10]

پاشەکشەی بەریتانییەکان ، هەروەك دەبینین ، کۆتاییەکی خەمناکیی بۆ کارمەندانی بەریتانیی لە ئامێدیی بەدواوە بووە ، هەروەها پێگەی بەریتانییەکانی لەبەشی باکووری مووسڵدا خستە مەترسییەوە . هەرچەندە ئەوەش هەڵەیە کە بایەخی ئەم رووداوە لە رادەی خۆی زیاتر سەیر بکرێت . وێڕای ئەوەی کە هاندان و خێراکردنی ئەو ئاڵۆزییانەی کە دواتر لە ئامێدیی و دەوروبەرییدا تەقینەوە بۆ سروشتی یاخیبووی خەڵکەکە ناگەڕێتەوە . ئەو هەلومەرجە ناسکەی بۆ ماوەیەك بوو لە ئارادا بوو ، هەروەها رەگەزەکانی تەقینەوە کە هەر لەسەرەتای گەیشتنی بەریتانییەکانەوە کاری خۆی دەکرد ، کە دەتوانرێت هۆکاری جۆراوجۆر هەلومەرجێکی ئەوتۆیان هێنایە ئارا .

## هەڵوێستی کوردانی ئامێدیی لەحاست بەریتانییەکان

کوردان کە بۆ ماوەی چەندین سەدە خۆیان بەبەشێك لە دەوڵەتی عوسمانیی دادەنا و بەهەمان داب و ئاکاری ژیانی عوسمانیی دەگوزەران ، ئەمێستا بێگومان سەبارەت بە هاتنی بەریتانییەکان وەك داگیرکەرێك و خاوەن ئایین و کەلتوورێکی جیاواز بۆ وڵاتەکەیان بێزارن . زۆربەی سەرۆکە کوردەکان ، ئەوانەی لەسەر شێوازی تورکیی

---

[9] بەگوێرەی بێڵ ، بەریتانییەکان خوازیاربوون کارگێڕییەکەیان بگەیەێننە ئامێدیی تا ئاسانکاریی بۆ گەڕانەوەی ئاسورییەکان بکەن چونکە نزیکترین و گونجاوترین رێگە لەو ناوچەیەوەیە ویلسن دەڵێت لەو رووەوە راوێژ بەو نەکراوە ، ئەوەی ئەو بە کارێکی بێهوودەی زانیوە ، ئەو جەختی لەوە کردۆتەوە کە تەنیا بەهۆی ئاکامە نەخوازراوەکانی پاشەکشەوە بووە کە ئەوەی پەسەند کردووە . A.T.Wilson,Loyalties,2:148.

[10] Bell, Review of the Civil Administration,72.

راهاتبوون ، سیاسەتی کارگێڕی بەریتانییەکان و جێبەجێکردنیان بە شتێکی نەگونجاو ، بێزارکەر و زۆربەی جاریش قێزەون هاتە بەرچاو . هەرچەندە کارگێڕیی بەریتانیی ئارام ، ئاغر ، هەروەها پەرۆشبوو رەزامەندیی خەڵکەکە بەدەستبێنێت . بەلام ئەوان جەختیان لەسەر کۆکردنەوەی باج و سەپاندنی دەسەلات و هەیبەتی خۆیان دەکردەوە ، هەروەها کارگێڕییەکەیان وادەردەکەوت دروستکاربێت و گەندەڵ نەبێت ، بەلام خۆهەڵقورتێنەر بوو.

چاکە و لێهاتوویی دەسەلاتە نوێیەکە هەرچییەك بێت ، بەڵێنی ئەو سوود و قازانجەشی بەخەڵکی دابوو هەر چییەك بێت ، هێشتا زۆرێك هەبوون کە بەرژەوەندییەکانیان لە سایەی داب و ئاکارەکانی رژێمە کۆنەکەوە بەشێوەیەکی باشتر بەرێوەدەچوو ، بەتایبەت ئەو سەرۆك و سەرخێڵە دەسەلاتدارانەی لە ماوەی رابردوودا لە حاڵەتێکی نیمچەسەربەخۆدا بوون . لەسەردەمی عوسمانییدا ، کوردانی ئەم ناوچەیە رادەستی خواست و ئارەزووی خۆیان کرابوون ، تەنیا لەو بۆنەو کاتانەدا نەبێت کە ئارەزوو و ئومێدەکانی سوڵتان و کارمەندە زێدەبەجۆشەکانی دەوڵەت ئەوەیان خواستبێت جەخت لەسەر دەسەلاتی دەوڵەت بکەنەوە و مەزنایەتیی خۆیان بنوێنن .بەلام ئەم دەرپەڕاندنەی تەوژمی عوسمانیی ، وێڕای ئەوەی زۆرجار روویان دەدا ، وەك باوە نەشیاو ئاراستە دەکرا و خراپیش جێبەجێدەکرا ، زۆر کەمی بەدیدەهێنا ، شانبەشانی وێرانکارییەکی بەرفراوان ، لەزۆربەی جارەکاندا ، ئەو هەنگاوانەی دەبوونە نیمچە هەنگاوی ئاکارا ، هەلومەرجەکەش بەردەوام وەك ئەو کاتەی پێش دەستپێکردنی هەڵمەتە سەربازییەکانی لێدێتەوە – تەنیا حاڵەتی جیا و بایەخدار ئەو هەڵمەتانە بوو کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا بۆ رووخاندنی میرنشینە کوردییەکان ئەنجامدرا– دەسەلاتێکی بەوشێوەیەی حکومەت کە دژەی دەکردە نێو دۆڵە کوردییە دووردەستەکان هێندە دەستەپاچە بوو زۆری نەخایاند کە سەرخێڵەکان بێ گرفتێکی ئەوتۆ بارەکەیان بەقازانجی خۆیان وەردەگێڕایەوە .

## کاریگەریی هەنگاوەکانی کارگێڕیی بەریتانیی

لەوانەیە سەرچاوەی سەرەکیی ناڕەزایەتیی لەنێو کوردانی ئامێدییدا بریتیبێت

لەو هەنگاوە کارگێڕییە ناوازە و جددییەی لەلایەن هێزی نوێی داگیرکەرەوە پێشکەشکرا . ئەو هەنگاوانە بریتیبوون لە دامەزراندنی پۆلیسی نێوخۆ ، کۆکردنەوەی باج ، پێشکەشکردنی پارە و تۆو بەشێوەیەکی راستەخۆ بە جووتکاران لەجیاتی ئەوەی لەرێی سەرخێڵەکانەوە بێت ، هەروەها گێڕانەوەی پەنابەرە ئاسورییەکان ."[11] واپێدەچێت ئەم هەنگاوانە گومان و هەستی ناحەزیی خانەدان و ئەشرافە دەسەڵاتدارەکانی شار و سەرخێڵەکانی دەوروبەری وروروژاندبێت . ئەوانەی نەك هەر ئەم هەنگاوەیان بە دەستێوەردانێکی ناشایستە و بێپاساو لە کاروبارە نێوخۆییەکانیان لەقەڵەمدەدا ، بەڵکو وەك هەڕەشەیەك بۆسەر ئەو پایە و بنەمایانە دەبینی کە توانا و هێز و جیاوگەکانی خۆیانی لەسەر وەستاوە .

بێگومان ، ئەم هەنگاوانە بەشدارییەکی مەزنیان لە پەرەگرتنی هەستی بێزاریی دژ بە بەریتانییەکان کرد و لەوانەیە ، لە راستییدا ، راستەوخۆ لە هەڵگیرساندنی ئاڵۆزییەکانی ئامێدیی بەرپرسیاربێت . تێگەیشتنی کاریگەرییەکانی ئەم هەنگاوانە لەسەر کورد ، سروشتی داد و بێدادی کوردان دژی بەریتانییەکان روووندەکاتەوە .

## دەزگای پۆلیس

وادەردەکەوێت سەرۆکە کوردەکان بنیاتنان و دانانی بنکەی پۆلیس لەناوچەکانیاندا چارسی کردبن . ئەوان وا هەستیانکرد کە پێکهێنانی هێزێکی لەو شێوەیە پێشێلکردنێکی قووڵی وابەستەگیی خێڵایەتییە ، بە پەیوەستبوون بەم هێزەی میرییەوە ، چەکدارە خێڵەکییەکان پەیوەستەگیی و وەفاداریی خۆیان لە خێڵەکەیانەوە دەگۆڕن و بە میرییەوە دەبەسترێنەوە . بەوەش نەك خێڵەکان هەر توانای پیاوە جەنگاوەرەکانی لەدەستدەدات ، بەڵکو ئەو توانایەی دەکەوێتە دەست لایەنێك کە دەگونجێت وەك دوژمن دەرکەوێت ، کە ئەویش میرییە ، ئەوەی بەرژەوەندییەکانی مەرج نیە هەمیشە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خێڵدا بێت . سەرباری ئەوەش سەرخێڵەکان پێویستە ئەو راستییەیان زانیبێت کە ئەو هێزە چەکدارەی دروستدەکرێت لەپێناو

---

[11] A.T.Wilson,Loyalties,2:148; Bell, Review of the Civil Administration,71.

چەسپاندن و پتەوکردنی دەسەڵاتدارێتی کارگێڕییە نوێکەدا بێت . ئەم دەرەبەگە جەردانە هەستیان بەوەکرد کە ئامادەبوونی هێزێکی بەو چەشنە لەنێو ئەواندا ناستەنگێکی سەخت لەبەردەم ئازادیی هەڵسوڕانی ئەواندا پێکدەهێنێت . ئەوان درکیان بەوەکرد هێندەی ئەو هێزانە لەو ناوچانەدا بمێننەوە ، ئەمان ناتوانن لە کاری توندوتیژییەوە بگلێن و سوودی لێببینن . هەڵکوتانە سەر و پەلاماردان ، دوژمنایەتیی و تۆڵەسێنی ، لەگەڵ چاوسوورکردنەوە و لێخواردن ، ئەمانە زۆر نابا دەبێتە کارێکی سەرەڕۆ و ئەستەم.

## باج :

کوردیش وەك زۆربەی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە دانی باج جاڕس و بێزار بوون .[12] ئەم هەڵوێستە بەشێوەیەکی بەرفراوان لە سۆنگەی ئەو راستییەوەیە کە باج هەمیشە بێ لەبەرچاوگرتنی ئاستی گوزەرانی باجدەر سەپێنراوە و بەشێوەیەکی توندوتیژانە و بێویژدانانەش کۆکراوەتەوە .[13] کۆمەڵگەی خێڵەکیی لەسەراسەری ناوچەکەدا ، دەگونجێت بەهۆی تواناییانەوە بۆ بەرهەنگارییکردنی میریی ، ناوبانگێکی خراپ و نەشیاویان لە دژایەتییکردنی باجدان بەدەستهێنابێت . سووربوونی دەسەڵاتدارانی بەریتانیی لەسەر قەبڵاندنی باج و کۆکردنەوەی بەشێك لەو هەستی ناڕەزایەتییەی کوردانی ئامێدیی دژی شێوەی کاری رژێمی نوێ پێکدەهێنا .

---

[12] ئەم هەڵوێستە لایەنگریی توند لە نێو ترادسیۆنە ئایینییەکاندا بۆخۆی دەبینێتەوە . لەم بارەیەوە ژمارەیەك فەرموودە دەدرێتە پاڵ محەمەدی پەیامبەر کە بێزی خۆی لەحاست باجگر پیشان دەدات . بەپێی فەرموودەیەك " باجگر لە ئاگری دۆزەخدایە " ، بە پێی یەکێکی دیکە " باجگر ناچێتە بەهەشت" . هەربۆیە لە مێژەوە خەڵکانی موسوڵمان بەهەمان رەوالی پەیامبەرەکەیان بێزیان لە باجگر کردۆتەوە . لە ئینجیلیش بێز لە جوولەکان کراوەتەوە بەهۆی ئەوەی باجگریانەوە . هەروەها ئەوە لە کەلتووریی رۆحانییەکانی جووشدا هەیە

[13] دەملوجی ئاماژە بەوە دەکات کە لە دەمی راژەی فەرمییدا لە ساڵی ١٩٠٥دا چەند نموونەیەکی کرداریی لەمەڕ شێوەی ئامرۆڤانەی باج کۆکردنەوە لە نێرۆ و ناوچەی رێکان تووشی هاتووە " بە گوێرەی ئەو ، ئەوپیاوەی نەیدەتوانی باجەکەی بدات لەلایەن حکومەتەوە کیژەکەیان دەبرد و دەیاندا بەو کارمەندە دەوڵەتییەی کە حکومەت پارەی نەبوو مانگانەکەی بداتێ دەملوجی ، امارة بهدینان ، ٥٠-٥١.

### دانی پارە و تۆو:

دانی پارە و تۆو بە خێڵەکییەکان سەرچاوەیەکی نارەزایەتیی لەهەمبەر بەریتانییەکان پێکدەهێنا . ئەوان بە پێشکەشکردنی راستەوخۆی پارە و تۆو بەو جووتکارانەی پێویستیانە و بێ ئەوەی لە رێگەی سەرخێڵەکانەوە بێت ، خۆیان تووشی بێزاریی سەرخێڵەکان کردەوە . بۆ سەرکردە خێڵەکییەکان ، ئەم شێوازە نوێ و مەترسییدارە هەڕەشەی سنووردارکردنی دەسەڵات و هەروەها نەهێشتنی باڵادەستیی چینایەتییانی لە کاروباری ناوچەکە دەکرد .

لەکاتێکدا لەسەردەمی عوسمانییدا رەشەخەڵکی خێڵەکان وا راهاتبوون کە بۆ هەر سوود و یارمەتیی خواستێك پەنا بۆ سەرخێڵەکان بەرن . ئەمێستا هاندراوە راستەوخۆ روو لە میریی بکات . ئەم سیاسەتەی بەریتانییەکان دەبووە هۆی ئەوەی سەرخێڵەکان رۆڵی داوەریی و نێوەندگیرییان لەنێوان میریی و رەشەخەڵکەکەدا لەدەستبدەن ، بەوەش پلەوپایە و توانایان بەشێوەیەکی بەرفراوان کز دەبوو .

### گێرانەوەی پەنابەرە ئاسورییەکان

گێرانەوەی پەنابەرە ئاسورییەکان ترس و دڵەراوکێی کوردانی ئامێدیی وروورژاند ، کوردی ئەم ناوچەیە دوژمنایەتییەکی قووڵ و مێژینەیان لەگەڵ ئاسورییەکاندا هەبوو .[٤١] ئەمێستا ئەوان درك بەوە دەکەن کە بەریتانییەکان وا هاوکاریی پەنابەرەکان دەکەن بۆ ناوچەکانی خۆیان بگەڕێنەوە ، دواجار ئاسورییەکان بەهێز دەکەن و وایان

---

[41] بە درێژایی سەدەی نۆزدەیەم ، جۆرە حاڵەتێکی شەڕ و ناکۆکیی لەنێوان ئاسوریی و هاوسێ کوردەکانیاندا هەبوو . بەگوێرەی ریچ میری ئامێدیی ناچاربوو چەند پاسەوانێکی تایبەت بۆ خۆی دابنێت تا لە هەر پەلامارێکی لەناکاوی ئاسورییەکان خۆی بپارێزێت  بە هەمان شێوە ، دوژمنایەتیی درێژخایەنی نێوان تیارییە ئاسوریی و کوردە بەرواریی‌یەکان زیانی زۆری گیانیی بۆ هەردوولا لێکەوتەوە  لە ماوەی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانییدا ، ئاسورییەکان لە چەند لایەکەوە پەلاماردران و لە ئاکامی هێرشێکی گشتییەوە کە لە باشوورەوە کرایەسەریان لە ناوچەکەی خۆیان لە هەکاریی دەرپەڕێندران ، ئەو هێزە لەلایەن والی موسڵەوە ئامادەکرابوو . بە گشتیی لە کوردانی بادینیی پێکدەهاتن

Rich.1:15;Wigram and Wigram ,314ff.   دەلوجی.١١٦

لێمەکەن لە ناوچەکەدا باڵادەست بن و تۆڵەی خۆیان لە کورد بستێنن . پڕۆپاگەندەی تورکانیش لەو کاتەدا سەبارەت بە بەرژەفڕیی ئاسووریی و ئەرمەنەکان بازاڕی گەرم بوو ، ئەوان بە شێوەیەکی بەرفراوان لە بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگۆ و بڕوایە بەرپرسیار بوون کە دەیگوت باڵادەستیی و سەپاندنی دەسەڵاتی ئەرمەنەکان بەسەر کورددا زۆر نزیکە .

## راپەڕینی ئامێدیی و هەنگاوی تەمیکارانەی بەریتانییەکان

ئەو ترس و نیگەرانییەی لە ئاکامی ئەو پرسانەوە سەریانهەڵدا بەهۆی پیلانگێڕان و هاندانی تورکانەوە هەژانێکی بێزاریی قووڵیان پێکهێنا . ئەو گرفتانەی لەم ناوچە وورووژاوەدا هاتە پێش لە رووداوێکەوە بەرجەستە بوو کە لەسەرەتای کارگێڕییە نوێیەکەوە قەوما . پاش ئەوەی ئامێدیی کەوتە ژێر داگیرکاریی بەریتانییەکان ، کاپتن ویلی ، جێگری ئەفسەری رامیاریی ، لەگەڵ هێندێك لە سەرکردە کوردەکانی نێو شارەکەدا کەوتە کێشە . بوونی ناکۆکیی و دوژمنایەتیی نێوان دوو پیاو ماقوڵی سەرکردە ، کە شارەکەی بەسەر دوو بەرەی جەنگخوازدا دابەشکردبوو ، بەشێوەیەکی بەرفراوانی ئەوتۆ هەڕەشەی لە چەسپاندنی یاسا و ئارامیی دەکرد کە کاپتن ویلی هەستی بەوەکرد ناچارە دەستوەرداتە کێشەکەوە . دەگوترێت ویلی ئەو دوو دەستەیەی چەك کردبوون بە لێسەندنی پارە سزای داون و بەڵێننامەی پێ پڕکردوونەتەوە کە لە ئایندەدا رەفتاریان باش بکەن . ئاسەواری توندی ئەو کارە هەردوو بەرەکەی شێلگیرکرد و بەوەش بە هێزە دژە بەریتانییەکانەوە پەیوەست بوون .[١٥] پاش مانگێك لە هەڕەشەی تورکان ، هاندانیان ، دەمچەورکردنیان ، کوردی ئامێدیی بڕیاری بەرپاکردنی راپەڕینێکیاندا تا بە زەبری چەك بەریتانییەکان دەربپەڕێنن . بەگوێرەی (سێر.ئارنۆڵد.ویلسن) ی کۆمیساری مەدەنیی:" ئاغاکان ، کۆبوونەوەیەکی نهێنییان بەست و بەچەشنێك کوێراییان داهاتبوو جگە لە توندوتیژیی هیچ رێگەیەکی دیکەی کراوەیان لەبەردەم خۆیاندا نەدەبینیی ."[١٦] پیلانگێڕەکان لە سەرۆکەکانی ئامێدیی و سەرخێڵەکانی دەوروبەریان پێکدەهاتن . ئەو

[15] A.T.Wilson,Loyalties,2:148; Bell, Review of the Civil Administration,71.

[16] A.T.Wilson,Loyalties,2:149.

سەرکردانەی دوو بەرە دژبەیەکەکەی شارەکەش سەری ڕمیان بوون . لەشەوی ١٤ی ژوونیەی ١٩١٩دا ، چەند پیاوێك بەسەر دیواری ئەوماڵەدا هەڵگەڕان کە کاپتن ویلی جێگری ئەفسەری رامیاریی و هاوەڵانی تێدا خەوتبوون و ویلی ، ماکدۆناڵد و ترۆپیان کوشت ، ئەو لیڤیانەی ویستبوویان ڕێگریی لە پەلاماراکە بکەن ، ئەوانیش کوژران .[17]

بەریتانییەکان خێرا و چالاك کەوتنە کار . لەشکری هەژدە کە لە موسڵ جێگیر بوو دەستبەجێ فەرمانی پێدرا بکەوێتەکار و لەمەرکوێ پێویستی کرد هەنگاوی تەمێکارانە بگرێتەبەر . تیپێکی لەشکری هەژدە بە فەرماندەیی (ژێنڕاڵ نایتینگال) لە سوارەتوکە کۆبوونەوە . ئەو دوا خاڵەی کە بەریتانییەکان پێش سێ‌مانگ هێزەکانی خۆیان بۆ کشانەوە ، هەروەها تیپی دووەم بە فەرماندەیی (ژێنڕاڵ ولریج) ڕەوانەی زاخۆ کرا . (ژێنڕاڵ کاسلێ) کە لەدوای قۆناغەکانی هەڵمەتەکانی میسۆپۆتامیا خۆی نیشاندابوو ، متمانەی سەرپەرشتییکردنی هەڵمەتە سەربازییەکانی خرایە ئەستۆ . جێگری فەرماندەی گشتیی بەریتانیی فەرمانی پێدا بۆ سزادانی یاخییبووان پەلاماری ناوچەکەی دەوروبەر بدات و هەوڵی چەسپاندنی دەسەڵاتی بەریتانییەکان بدات کە لەو ناوچانەدا تەواو شلۆقە .[18]

هەوڵێکی سەرەتایی بەریتانییەکان بۆ گەیشتنە ئامێدیی ڕووبەڕووی بەرەنگارییەکی سەختی کوردان بووەوە کە بەڵگەی تێوەگلانی چەند خێڵێك بوو . بەوەش چ جووڵەیەکی بایەخدار ئەنجام نەدرا تا ئەو کاتەی هێزی تەمێکەر ئامادەباشیی خۆی کرد و ئامادەکارییە پێویستەکانی سوپا پێکهات ، کە نزیکەی دوو هەفتەی خایاند . لەکۆتایی ژوونیەی ١٩١٩دا ، هێزەکە ئامادەبوو دەست بە جێبەجێکردنی ئەرکەکەی خۆی بکات . لە ١ی نووتی ١٩١٩ ، گوندێکی گەورە لە ناوچەی ئامێدیی دەستی بەسەردا گیرا و هێندێك لە سەرخێڵە سەرکردەکانی یاخییبوونەکە و ژمارەیەکی بەرچاویش تفەنگ کە لە بنەڕەتدا هی تورکان بوو ، کەوتە دەست بەریتانییەکان . هەڵمەتی تەمێکارانە بەرەو دۆڵەکانی دەوروبەری ئامێدیی بەردەوام بوو ، هەروەها دەگوترێت کوردانیش قوربانییەکی زۆریان داوە ، چەندێك لەو سەرخێڵانەی کە واناسرابوون ڕاستەخۆ لە

[17] Ibid.

[18] Ibid.

کوشتنی ئەفسەرە بەریتانییەکان بەرپرسیاربوون دادگایی کران و لە سێدارە دران . دەشتەکانی سەری ئامێدیی گوندەکان و هەروەها تەمێکاریی خێڵەکانی بەواریشی گرتەوە ، ئەوانەی لە راپەڕینەکەی ئامێدیی دا بەشداربوون .[19] لە ٨ی نووتدا ئامێدیی گیرا و ژمارەیەك ئەشراف شار کە بە (خەتاباری بچووك ) نێویان هاتووە ، قۆڵبەستکران .[20]

پێویستە وا نەهێنرێتە بەرچاو کە ئەو سەرکەوتنانە هەروا ئاسان و بێ ئسکۆ بەدەستهاتبن . کوردان ئازایانە و سەرسەختانە جەنگان . چەند جارێك پەلاماری چاونەترسانە و سەرچڵانەیان دەبرد و وایان لێ تێبینی دەکرا . بۆ نموونە ، لەکاتێکدا بەریتانییەکان بە هێورکردنەوەی ناوچەی ئامێدییەوە سەرقاڵبوون ، هێزێکی خێڵەکیی کە لە چەکدارەکانی گولی و رەگەزەکانی دیکەی رۆژئاوای ناوچەی خاپور پێکدەهات ، پەلامارێکی لەناکاوی پێگەی بەریتانییەکانیان لە سوارەتوکە دا . هەرچەندە لە ئاکامدا ناچارکران بکشێنەوە ، بەڵام بەرگرییکەرانیان توند راچڵەکاند و وانەیەکی سەختیان دادان و قوربانییەکی بەرچاویان لێدان .[21]

بەرەو کۆتایی نووت ، لەو کاتەدا هەڵمەتە سەربازییەکانی ناوچەی ئامێدیی گەیاندرایە سەرکەوتنی یەکجارەکیی . بەریتانییەکان بڕیاریاندا ئاوڕ لە خێڵە تاوانکارەکانی رۆژئاوای خاپور بدەنەوە . هەربۆیە ژێنراڵ ولریچ نێردرایە سەر خێڵی گولی ، ئەوانەی رێبەرایەتیی پەلامارەکەی سوارەتوکەیان کردبوو . لەناوەراستی سێپتەمبەری ١٩١٩دا ، کاتێك هەڵمەتی سەربازیی لەم بەرەیە هێشتا لەبەرەو پێشەوەچووندا بوو ، زۆربەی رەگەزە دوژمنکارەکانی ناوچەی ئامێدیی ملکەچیی خۆیان پێشاندا .

هەر لەم کاتەدا بوو کە گۆیان ، ئەوانەی بە کوشتنی کاپتن پێرسن لە ئەبریلدا تاوانبار بوون ، پەلامارێکی توندیان کردە سەر ناوچەی دەورووبەری خێڵی گولی ، لە کاتێکدا ژێنراڵ ولریچ هێشتا سەرقاڵی دامرکاندنەوەی گولییەکان بوو . لە بەرامبەر ئەمەدا ، بەریتانییەکان بڕیاریاندا هەڵمەتێکی تەمێکارانە بکەنە سەر وڵاتی گۆیان . تیپەکەی ژێنراڵ نایتینگال فەرمانی کەوتنەکاری لەم بەرەیەدا پێسپێردرا و ئەرکی

---

[19] Ibid.

[20] Bell, Review of the Civil Administration,72.

[21] A.T.Wilson,Loyalties,2:149.

سزادانی ئەو خێڵە سەربەگۆبەندەی خرایە ئەستۆ . ستوونەکە بەرەو ناوجەرگەی وڵاتی گۆیان کشا کە گوندی کارۆرە ، ئەو گوندە گیرا و لەتۆڵەی خوێنی پێرسندا سووتێنرا . ئەم هەنگاوە تەمێکارانەی دواییان ، ئۆپەراسیۆنە سێمانگییەکەی گەیاندە کۆتایی .[22]

## تەقینەوەی ناوچەی زێبار-بارزان

سێیەمین تەقینەوە دژی بەریتانییەکان لە ناوچەی زێبار-بارزان قەوما و ئاکرێشی گرتەوە کە مەزنترین شارۆکەی هەرێمەکەیە . دەبێت وەبیر بێنرێتەوە ، کە ئەم ناوچەیە لە سەردەمی عوسمانییدا شانۆی ململانێ و خوێنڕێژییەکەی زۆر بووە . جەنگە وەرزییەکانی نێوان شێخانی بارزان و ئاغاکانی زێبار ، کە حکومەتی عوسمانیشی تێوەدەگلا و زۆربەی جار لایەنگریی ئاغاکانی زێبارییان دەگرت ، ناوچەکەی لەسایەی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا بۆ ئاڵۆزترین ناوچە گۆڕیبوو. تەنیا پێنج ساڵ لەوەپێش سلێمان نەزیفی والی عوسمانیی قۆناغێکی ئاڵۆز و پڕ ململانێی درێژخایەنی لەگەڵ شێخانی بارزاندا بە هەڵواسینی شێخ عەبدولسەلامی سەرگەورەی ئەو بنەماڵەیە کۆتایی پێهێنا .

کاتێک بەریتانییەکان بەرەو ئەو ناوچەیە جوڵان ، خۆیان لە هەلومەرجێکی وادا بینییەوە کە رووبەڕووی هەمان کێشە و بەزم بوونەتەوە کە پێشتر تورکان بەدەستییەوە دەیاننالاند . ئەوان بە هیوای ئەوەی بە هەر نرخێک بێت ئەو ئارامییە کاتییەی لە ناوچە پڕ ئاژاوە سنوورییەکاندا هەیە بپارێزن ، هەروەها لە ئاکامە نەخوازراوەکانی پشتگیرییکردنی لایەنێک دژی ئەوەکەی دی بەئاگابوون ، هەر بۆیە واپێدەچوو بەریتانییەکان بڕیاری بێلایەنیی تەواویان لە نێوان ئەو دوو دوژمنە قستەسەرە دابێت . هیوایەکی بەو چەشنە کە رووداوەکان هەر زوو سەلماندیان چ دارێکی بێبەرە .

کاتێک بەریتانییەکان دەستیان بەسەر ولایەتی موسڵدا گرت و دەستیانکرد بە فراوانکردنی کارگێڕییەکەیان بەرەو هەرێم و ناوچە جۆربەجۆرەکانی دی ، وڵاتی بارزانیان بە ئاکرێ وە بەستەوە . ئەو کارەی وا دەردەکەوێت فرە شێخ ئەحمەدی بارزانیی ، براو جێنشینی شێخ عەبدولسەلامی ، بێزار کردبێت ، ئەوەی ئاکرێی بە قەڵای

---

[22] Ibid.,2:150-151.Cf.Bell, Review of the Civil Administration,7.

زێبارییەکان نەدایە قەڵەم . لەهەمان کاتدا ، شێخ ئەحمەد خواستی خۆی بۆ جوڵان بەرەو ناوچەی رەواندز پێشاندا ، ئەو خواستەی لە لایەن بەریتانییەکانەوە هان نەدرا . هەروەها بۆ ئەوەی رووداوێکی شووم لە نێوان زێباریی و بارزانییەکاندا روونەدات ، بەریتانییەکان رێیان نەدا بە فارس ئاغای زێباریی کە لە زێوە بەرەو ناوچەی بارزان بپەڕێتەوە .

تێکۆشان بۆ راگرتنی هاوسەنگیی لە نێوان ئەو دوو دوژمنە بووە هۆی بێزاریی و پەیدابوونی گیانی ناحەزیی هەر دوو لایەنەکە . تورکانیش لە قۆزتنەوەی ئەو دەرفەت و پەرسەندنە خاوەخاویان نەنواند . ئەوان بۆ کۆتاییهێنانی ناکۆکییەکانی فارس ئاغا و شێخ ئەحمەد کەوتنە نێوانیانەوە ، بەوەش ئەو دوو پیاوە بە شێوەیەکی کاتیی ئاشتبوونەوە و تورکان توانیان هەردوولا بە قازانجی پرسەکەیان بەلای خۆیاندا کەمەندکێش بکەن .[23]

هەمان کات ، تورکان لە هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان بەردەوام بوون تاکو بەهەر شێوەیەك بێت بتوانن بەریتانییەکان لە ویلایەتی موسڵ دەربپەڕێنن ، لە زستانی ١٩١٨-١٩١٩ دا ، راپۆرتەکان هەواڵی ئەوەیان رادەگەیاند کە داگیرکردنی ناوچەکە لە لایەن تورکانەوە بەرێوەیە . هەواڵی ئەوە هەبوو کە ئەنوەرپاشا بە هێزێکی گەورەوە کە لە تورك و رووسە هەڵاتووەکان پێکدێت گەیشتووەتە وان و وا پێشاندەدات کە لەگەڵ سیتۆئاغای نۆرەمار ،[24] سەرۆکەکانی بەرواریی ، هەروەها لەگەڵ هەموو رەگەزە ناحەزەکانی بەریتانییەکان پەیوەندیی هەیە .[25]

هەروەها لەم کاتەدا زانیاریی هەیە کە نوێنەرە شەریفییەکان لە سوریا هاتوونەتە نێو خێڵە کوردییەکانی ناوچەکە و چالاکبوون . هەرچەندە پێدەچێت کە بەقازانجی کێشەی ئاغاکەیان شتێکیان دەستنەکەوتبێت ، بەڵام گومانی تێدا نیە کە دەرکەوتنیان ئاڵۆزیی و نائارامیی لە ناوچەکەدا دروستکرد . ئەوەی پێشکەشیانکرد هاندەر و هەژێنەر بوو . ئەگەری سەرلەنوێ بوونەوە بە بەشێك لە دەوڵەتێکی ئیسلامیی خترکەی سۆزی ئایینیی کوردانی دەدا ، هەروەها بیرۆکەی دەسەڵاتێکی سست و لاواز کە لە پایتەختێکی دووردەستی وەك سوریاوە ئاراستە بکرێت لە هەلومەرجێکی بێزارنەکەردا دەیانهێنایەوە

---

[23] Bell, Review of the Civil Administration,72; A.T.Wilson,Loyalties,2:151-52

[24] ناوی سەرۆکی نۆرەمار بە سیتۆ یان سوتۆ هاتووە

[25] Bell, Review of the Civil Administration,72.

و وایان لێدەکات جیاوگە سونەتییەکانیشیان بمێنێتەوە .[٢٦] وێناکردنی ئەو شێوازەی کە لە دەوڵەتێکی شەریفییدا دەهاتەدی ، هەروەك نوێنەرە شەریفییەك دەیخستەبەرچاو ، یادەوەرییەکی سۆزهەژێن بوو لەو پەیوەندییەی پێشتر بە دەوڵەتی عوسمانییەوە هەبوو ، ئەوەش تەنیا رازەی یەك لایەنی دەکرد کە بریتیبوو لەوەی کوردان بە جۆشێکی زێدەترەوە سەبارەت بەو لەدەستچوونەیان بەئاگابن .لەدژی ئەم هەلومەرجە بوو کە میستەر(جەی.ئێچ.بیل) شوێنی کۆلۆنێل(جی.ئی.لیچمان) ی وەك ئەفسەری رامیاریی لیوای موسڵ لە ئۆکتۆبەری ١٩١٩دا گرتەوە . هەر زوو پاش ئەوەی بیل ئەرکە نوێیەکەی گرتە ئەستۆ ، دەستی بە گەشتێك کرد بۆ پشکنینی هەرێمی زێبار و بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بە گیروگرفتە جۆربەجۆرەکانی ناوچەکە ئاشنا بێت . لە میانەی گەشتەکەیدا سزای پارەسەندنی بەسەر هەردوو فارس ئاغا و بابەکرئاغادا سەپاند ، ئەو دوو سەرۆکە زێبارییەی کە پیاوەکانیان بەوە تاوانبار بوون کە تەقەیان لە پیاوانی پۆلیس کردووە . وادەردەکەوێت ئەو دوو سەرۆکە بەو سزادانە یەکجار تورە بووبن ، هەربۆیە تکایان لە شێخ ئەحمەدی بارزان کرد یارمەتییان بدات . لەوەلأمی ئەم تکایەدا شێخ ئەحمەد ، مەلامستەفای برای لەگەڵ نزیکەی بیست پیاوێکدا نارد . دەستەی بارزانییەکان ، لەگەڵ فارس ئاغا ، بابەکر ئاغا و پیاوەکانیان کە تێکڕا نزیکەی سەد پیاوێکیان پێکدەهێنا ، لە نزیك پیرەکەپرەی گوندی بابەکرئاغاوە ، دەستەی میستەر بیل یان خستە بۆسەوە و بیل و کاپتن کەی.ئار.سکۆت ، هەروەها دوو لە چوار پۆلیسی پاسەوانیان کوشت . دوو پۆلیسەکەی دیکە کە زێباریی بوون ، چوونە نێو پەلامارەدەرەکان و رزگاریان بوو .[٢٧]

خێڵەکییە بارزانیی و زێبارییەکان کە لە حاڵەتی خرۆشاندا بوون ، هێرشیان کردە سەر ئاکرێ و تالأنیانکرد . لەماوەی دوو رۆژی داهاتوودا ، خێڵەکییەکان لەسەر تالأنیی بەزم و هەرایان لێپەیدا بوو و بارزانییەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان . بەگوێرەی سەرچاوە بەریتانییەکان ، چەندین سەر خێڵی نێوچەیی لایەنگریی خۆیان بۆ میریی پێشانداوە و ئامادەیی خۆشیان بۆ ناردنی یارمەتیی دەربڕیوە . خەڵکی شارەکە فرە حەوانەوە کاتێك لە ٩ی نۆڤەمبەری ١٩١٩دا هێزێك کە لە لیڤییە کوردەکان پێکدەهات و

---

[26] Bell, Review of the Civil Administration,72; A.T.Wilson,Loyalties,2:152.

[27] Bell, Review of the Civil Administration,73; A.T.Wilson,Loyalties,2:153.

لەلایەن (کاپتن ئێف.سی.کێرك)ی جێگری ئەفسەری رامیاریی باتاسەوە سەرکردایەتیی دەکرا ، گەیشتە ئاکرێ . هەروەها زانیاریی وا هەیە کە هیچ نیشانەی دژایەتییەکی ستونە تەمێکەرەکە بەرچاو ناکەوێت ، کە هەر زوو پاش ئەو رووداوە بەناو دۆڵی ئاوی زێدا خۆیان دەرخست . ئەو گوندانەی لەسەر رێی ستونەکەدا بوون . دەگوترێت کە ئاڵای سپییان وەك پێشاندانی خواستی ئاشتییخوازانەیان هەڵکردبوو و ترسیان لە ئاغاکانی خۆیان هەبوو و بە بینینی هێزەکانی میرییش خۆشحاڵبوون .[28]

ستونە تەمێکەرەکە ماڵی ئاغاکانی زێبارییان لە تۆڵەی کوشتنی ئەفسەرە بەریتانییەکان و پاسەوانەکانیان سووتاند و لە زێ پەڕینەوە و هەمان سزای بارزانییەکانیشیان دا . گوندییەکانی ئەم ناوچەیەش ، هەروەك ناوچەی ئامێدیی ، دەگوترێت کە ج کێشەیەکیان پێکنەهێنا . وادەردەکەوێت سەرخێڵە کوردەکان نەیانتوانیبێت خێڵەکانی دەوروبەر راپەڕێنن ، ئەوەش بە گشتیی بەهۆی ئەوەی سەر بە مەزنە پیاوێکی ناوچەی ئاکرێ بوون کە ناوی عەبدولقادر ئاغای شوش بوو.[29]

هەر چوار یاخییەکە ، فارس ئاغا و بابەکر ئاغای زێباریی ، لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزان و مەلامستەفای برایدا هەڵاتنە ناوچە چیاییەکان و لەدەرەوەی یاسادا دەژیان . جێگای سەرنجە کە ئەم راپەڕینە نەیتوانی هیچ دەنگدانەوەیەکی دەستبەجێی لە ناوچەکانی دەوروبەردا هەبێت . بەگوێرەی (گێرترۆد بێل و ئارنۆڵد ویلسن) ی کارگێڕی مەدەنیی بەریتانیی " هیچ هەرایەکی هاوسۆزیی لە ناوچەی ئامێدیی نەقەوما ، هەروەها سەید تەهای شەمدینان ئامادە نەبوو گوێ لە پێشنیازی قایمقامی نەهریی بگرێت ، کە تورکان لەوێ هێزێکی بچووکی سەربازییان دانابوو ، ئەوەی دەبووایە سەیدتەها و سیتۆی ئۆرەمار لەجیاتی زێبارییەکان هاوکارییان پێکەوە بکردایە . ئەو هەڵوێستەی سەید تەها وایکرد قایمقام نەتوانێت بە ئاسانی ژیانی خۆی بپارێزێت ، هەر بۆیە نەهریی بەرەو باشقەلا بەجێهێشت ."[30]

تورکان راستەوخۆ لەو تەقینە بەرپرسیارین یا نا ، جارێکی دیکەش نەتوانرا راپەڕینێکی گشتیی لە سەراسەری ویلایەتی موسڵدا پێکبهێنرێت . سەبارەت بەو هەرایە ،

---

[28] Bell, Review of the Civil Administration,73: A.T.Wilson,Loyalties,2:153.

[29] Bell, Review of the Civil Administration,73; A.T.Wilson,Loyalties,2:153.

[30] Bell, Review of the Civil Administration,73,and A.T.Wilson,Loyalties,2:153.

ویلسن گوتوویەتی :" هەموو بەڵگەکان ئەوە پیشاندەدەن کە کوشتنی ئەو دوو ئەفسەرە بەریتانییە ئەنجامی پلانێك نەبوو کە پێشتر دارێژرابێت ، بەڵکو بەدوای توڕەبوونێکی لەناکاودا هات ، ئەو توڕەبوونەی کە تایبەتمەندییەکی سروشتی کوردانە ، بەڵام ئەو کارەی کرا نیشانەی راپەڕینێك بوو ."[31]

سیتۆ ئاغا ، ئەو سەرخێڵە غایەن و دڵڕەقەی دەشتوکێوەکانی ناوچەی هەکاریی–نۆرەمار ، کارێکی دزێوی بۆ ئەم رووداوانە زیندەکرد . ئەو سەرخێڵە فێڵبازە ، کە واپێدەچوو قایمقامی ئەمریی هێنابێتە سەر ئەو باوەڕەی کە لایەنگری پرسی تورکانە ،[32] ئاڵۆزییەکانی ناوچەی زێبار–بارزانی بەقازانجی خۆی و بەلاداخستنی هێندێك کێشەی کۆن قۆستەوە . بە پێی راپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی " سیتۆ نۆرەماریی ، کە دوژمنایەتییەکی کۆنی لەگەڵ عەبدولوەهاب رێکانییدا هەبوو ، سوودی لە هەراکەی ئاکرێ وەرگرت و گرتی ، لەژێر پەردەی دۆستایەتییدا ، سەریبڕی."[33]

---

[31] A.T.Wilson.Loyalties,2:153.

[32] لە نۆڤەمبەری ١٩١٩دا ، لەکاتی راپەڕینەکەی زێباردا ، وەك پێشتر ئاماژەی بۆ کرا ، تورکان سیتۆئاغایان وەك ئامرازێکی گونجاو بۆ سیاسەتەکەیان لەقەڵەم دەدا ، هەرچەندە پاش کەمتر لە ساڵێك ، لە ١٩٢٠دا زانیاری ئەوە هەیە کە نامەی بۆ دەسەڵاتدارانی بەریتانیی لە موسڵ نووسیوە و دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ تورکاندا ریسوا کردووە .

Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1920( Baghdad Government Press, 1921),12.

[33] Iraq , Civil Commissioner ,Civil Administration Mesopotamia : Administration Report(1919)Part I, "Mousl" ( Baghdad: Government Press, 192o),16.

واپێدەچێت ئەم کاری تۆڵەسەندنەوەیە تەنیا رووداوێك بێت لە بازنەی رووداوەکانی دوژمنایەتیی نێوان سیتۆئاغا و ئاغای رێکان ." چیرۆکی سیتۆ و تاتۆ " دوژمنایەتیی توندو دڵرەقیی ئەو پیاوەمان بۆ دەگێڕێتەوە . ئەوەی کە تەنانەت لەماوەی ژیانیشیدا ببووە کەسایەتییەکی ئەفسانەیی ، ئەو چیرۆکە دەگێڕێتەوە چۆن لە بۆنەیەکی زوودا سیتۆ ئاغا تۆڵەی خێڵەکیی خۆی لە دوژمنەکانی کردۆتەوە .

# راپەڕین لە لیوای هەولێر و لە قەزای ئاکرێی سەربە لیوای موسڵ

**هەلومەرجەکەی لیوای هەولێر :**

لیوای هەولێر دوا لیوای کوردیی بوو رادەستی ئەو شەپۆلە ئاڵۆزییە بێت ، کە هەر زوو پاش مۆرکردنی ئاگربەست لەگەڵ تورکاندا ، کوردانی ویلایەتی موسڵی گرتبوومەوە . لەکاتێکدا راپەڕینی کوردان بە خێرایی بۆ دژایەتییکردنی دەسەڵاتی رژێمی نوێ بە شێوەیەکی یەك بەدوای یەك لە ناوچەی زاخۆ لە ئەپرڵی ۱۹۱۹ ، ناوچەی سلێمانی لە مایۆی ۱۹۱۹ ،[14] ناوچەی ئامێدیی لە ژوونیەی ۱۹۱۹ ، هەروەها لە ناوچەی زێبار-بارزان لە نۆڤەمبەری ۱۹۱۹ دا روویاندا ، تاکو ئوتی ۱۹۱۹ سەرەی راپەڕینی کوردانی هەولێر نەهات .

دیارە ئەم دواکەوتنە هۆکاری رامیاریی ، جوگرافیی ، هەروەها ئابووریی تایبەت بەخۆی هەیە ، بەهۆی تارادەیەك دوورەدەستیی و گۆشەگیریی لیوای هەولێرەوە ، شتێکی ئاسایی بوو کە تورکان زۆربەی هەوڵی تێکدەرانەی خۆیان بۆ لیوای موسڵ تەرخان بکەن ،کە نزیکتر و بایەخدارتر بوو . زاخۆ ، ئامێدیی ، ناوچەکانی زێبار-بارزان ، بەهۆی ئەوەوە بوو تارادەیەك کە لەناوچە رووژێنەرە تورکییەکانی وەك جەزیرەی ئیبن عومەر ، شیرناخ هەروەها ئەمرییەوە نزیك بوون و دەستپێکەیشتن و هەروەها هەژاندنیان ئاسان بوو . وا دیارە راپەڕینی لیوای سلێمانی ، بێگومان بۆ هەستی نەتەوایەتیی کوردیی دەگەڕێتەوە ، هەرچەندە لێڵ و لاوازیش بێت ، هەروەها بۆ ئومێد و خولیای شێخ مەحموود و ئەو رێبەرایەتییە بەهێزەی هەیبوو . لیوای هەولێر لە دوو لایەنەوە تا رادەیەکی زۆر کۆڵ بوو . هەروەها کوردانی هەولێر کە لەکاتی جەنگدا بەئاستێکی زێدەتر و فرەتر لە کوردانی باکوور و باشوور تووشی زیان و نەهامەتیی بوونەوە ، ماوەیەکیان دەویست تێیدا بێنەوە سەرخۆ .

هەرچەندە کوردانی هەولێر هێمن و بێدەنگ مانەوە ، بەڵام بێبایەخانەش نەیاندەڕوانیە ئەو رووداوە گرنگ و مەترسییدارانەی لە دەوروبەریان روویان دەدا . کاپتن ( دەبلیو.ئار.هەی) ئەفسەری رامیاریی بەریتانیی و بەرپرسی لیوای هەولێر ، ئەوەی

---

[14] راپەڕینی ساڵی ۱۹۱۹ی سلێمانی لە بەشی دەیەمدە باسی لێکراوە .

بەهۆی ئازایەتیی و لێهاتووییەوە توانی خۆڕابگرێت و دواجار بەری شەپۆلی راپەڕین لە لیواکەدا بگرێت ، باسی لە کاریگەریی راپەڕینە جۆربەجۆرەکان لەسەر کوردانی هەولێر کردووە . بەگوێرەی ئەو، " راپەڕینەکەی شێخ مەحموود لە مایۆی ١٩١٩ دا سەرەتای کاردانەوەکان بوو لە باکووری میسۆپۆتامیادا ، هەروەها وێڕای شکستخواردنی ، ئەوەی پێشاندا کە دەتوانرێت رکابەریی حکومەتی نوێ بکرێت ، ئەوەش شەپۆلێکی ناارامیی لە سەراسەری وڵاتەکەدا هێنایە ئارا."[٣٥]

وادەردەکەوێت کاریگەریی راپەڕینەکەی شێخ مەحموود بە شێوەیەکی کرداریی لە ناوچەی کۆیە و لە نێو خێڵەکانی خۆشناودا بەهێز بووبێت .[٣٦] هەی ، کاتێك لەساڵی ١٩٢١ دا رووداوەکان دەگێڕێتەوە ، جەخت لەو کاریگەرییە خراپە دەکات کە مەسەلەی کوشتنی ئەفسەرانی بەریتانیی لە پیرەکەپرە ، لە لیوای هەولێر پێکیهێنابوو . بە گوێرەی ئەو ، جەردەیی و رێگریی پاش ئەو رووداوە بەشێوەیەکی گشتیی زیادبوون .[٣٧] بەهەمان شێوە ، راپەڕینەکەی تەلەعفەر تا رادەیەکی زۆر هەولێری هەژاند ، هەروەها بێزاریی و ناڕەزایەتیی بە ئاشکرا هانی راپەڕینێکی ئاشکرای دەدا .[٣٨]

## مەترسیی پەلاماردانی هەولێر

لەسەرەتای هاوینی ١٩٢٠دا ، هەلومەرجە رامیارییەکە لە سەراسەری میسۆپۆتامیادا کە داگیرکراوی بەریتانییەکان بوو ، بە شێوەیەك خەمڵیی کە خەریك بوو دەچووە چوارچێوەیەکی وریاکەرەوەوە . لە ناوەڕاستی ئووتدا ، هەرا و ئاڵۆزییەکان ، کە لە ژووندا لە باشوورەوە دەستیانپێکردبوو ، بەرەو دیالە ، کەرکوك ، هەروەها هەولێر پەڕییەوە . لە ١٢ی ئووتی ١٩٢٠ ، کاپتن هەی لە گەرووی رەواندز پەلامار درا و بە زەحمەت رزگاری بوو .[٣٩] لە ٣ی سێپتەمبەری ١٩٢٠دا ، کاپتن (ئێف.سی.کیرك) ناچارکرا

---

[35] Hay.Two Years in Kurdistan.159.

[36] Ibid.,184.

[37] Ibid.,195.

[38] Ibid.,267-68.

[39] A.T.Wilson.Loyalties.2:285.

**کۆیسنجەق جێبهێڵێت . ئەو لیڤییانەی لە ژێر سەرکردایەتیی کاپتن (لیتڵدیل) دابوون لە ڕەواندز و باتاسەوە کشانەوە بۆ هەولێر . لە ٨ی سێپتەمبەر دا ، سێر ئارنۆڵد ویلسنی جێگری کۆمیساری مەدەنیی ، بە فڕۆکە گەیشتە هەولێر . سەردانەکەی بە ئامانجی بەرزڕاگرتنی ورەی کارمەندە نێوچەییەکان و پیاوماقووڵانی شارەکە و چاوترساندنی ئەو هێزە خێڵەکییانە بوو کە مەترسیی پەلاماردانیان لێدەکرا .**

**سەردانەکەی ویلسن ئەو خواستەی هێنایەدی و وایکرد شارەکە تاکو گەیشتنی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیی لەچەند ڕۆژێکی دواتردا خۆڕابگرێت . هەرچەندە ڕزگاربوونی هەولێر لە بنەڕەتدا بەهۆی سێ‌کەسەوە بوو : خورشید ئاغا، سەرۆکی ناوداری عەشیرەتی دزەیی ، ئەوەی بەڵێنی دابوو بەرگریی لە شارەکە بکات و پیاوەکانی عەشیرەتەکەی دەنگدابوو و هەڕەشە و شەڕ و بەرەنگاریی پەلاماردەرانی دابوو گەر ئەو کارە بکەن . هەروەها ئەحمەد ئەفەندیی ، متەسەریفی هەولێر ، ئەوەی بەهۆی تێکۆشان و هەوڵی بەردەوامی ، یاسا و ئارامیی لە شارەکەدا پاراست و هەلومەرجەکەی هێمن ڕاگرت ، هەروەها دواکەس ، کاپتن هەی ئەفسەری ڕامیاریی بوو ، ئەوەی بەهۆی ورەبەرزیی و هۆشیارییەوە توانی بڕوا و متمانە بڵاوبکاتەوە و وا لە ڕەگەزە لایەنگرەکانی کارگێڕییەکەی بکات لەسەر ئەو بڕیارەیان یەککگرتوو بمێننەوە کە سەبارەت بە پێداچەقین بەڕووی ئەو گەردەلوولەدا دابوویان .[40]**

**لەوبەشەی پێشەوەدا ، هەوڵمداوە سەبارەت بە هۆکارە جۆربەجۆرەکانی ئەو هەلومەرجە ئاڵۆزە و بڵاوبوونەوەی خێرای گیانی یاخیبوون و ڕاپەڕینی چەکداریی لەنێو کورداندا گفتوگۆبکەم . جێگای سەرنجە لەم ڕووەوە ئاماژە بە تێبینیەکی ویلسن بکرێت کە بەشێکی ئەم هەرا و ئاژاوە و ئاڵۆزییانەی گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی کە بە " ئاژاوەگێڕی گەڕۆك" ناوی بردووە . بەگوێرەی ئەو " زۆر جوڵە و جرتوفرت لەم قۆناغەدا هەبوو ، بەشێکیان نوێنەرانی نهێنی بۆلشەڤیك بوون . ئەوانەی مەسەلەی ناحەزایەتیی توندی بێگانەیان تێکەڵ بە خۆلیای مافی مرۆڤ بە گشتیی و بەمەبەستی پشتگیریی یاسا شکێنان بەتایبەتیی کردووە . ئەوانەی دیکە لایەنگری شێخ مەحموود بوون ، ئەو**

[40] A.T.Wilson,Loyalties,2:286-89;Hay,Two Years in Kurdistan,281-384.

هێوایەیان لە مێشکدا بوو کە شێخ مەحموود دەسەڵات بگرێتەوە دەست ."[41]

## ڕاپەڕینی سورچییەکان لە لیوای موسڵ و هەولێر

### سورچییەکانی لیوای موسڵ

سورچییەکانی موسڵ بەوە تاوانبارببوون کە لە کاتی گرتنی ئاکرێ دا لە لایەن هێزەکانی زێباریی-بارزانیی لە کۆتایی ۱۹۱۹دا ، بەشداریيان لە تاڵانکردنی ئاکرێدا کردبوو . چاوەڕێدەکرا هەنگاوی تەمێکارانە لەو کاتەدا دژیان ئەنجامبدرێت ، بەڵام ئەو ستونەی نێردرابووە سەر زێبارییەکان ، فەرمانی پێدرابوو واز لە سورچییەکان بهێنێت و تا ئەوان بە هێمنی بمێننەوە هیچیان دەرحەق نەکەن  هەرچەندە هەڵوێستی ئاشتیخوازانەیان خۆڵکردنە چاو بوو ، چونکە لە ئەپریلی ۱۹۲۰دا ، بە هاندانی زێبارییەکان چەکیان هەڵگرت . ڕاپەڕینەکە لە ناکاو بوو ، بەڵام چاوەڕوان نەکراونەبوو .هەر زوو لەسەرەتای یەنایەرەوە زانرابوو کە گیروگرفت و ئاڵۆزیی بەڕێوەیە ، کاتێك فارس ئاغای زێباریی ، بە هاوەڵی چەندین چەکدار ، هاتبووە بەجیل بۆ هاندانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەقشبەندیی کە بەشداریی لە پەلاماردانی ئاکرێدا بکات . ئەو کاتە ، ئاڵۆزییەکە دواخرا لە ئەنجامی ئەو پەلامارە ئاسمانییەی کرایە سەر بەجیل ، ئەوەی زێبارییەکانی ناچار کرد هەڵبێن پێش ئەوەی دەرفەتێکی ئەوتۆیان لەبەردەمدابێت مەبەستەکەی خۆیان جێبەجێبکەن .[42]

دەگوترێت کە سورچییەکان خوازیار بوون سەر بۆ میریی دانەوێنن ، بەڵام پیلانگێڕیی زێبارییەکان و بێمتمانەیی سورچییەکان خۆیان لەبەردەم مەسەلەیەکی وادا ڕێگر بوو . هەرچەندە ئەوان لەماوەی نێوان فێبرایەر و مارتدا بێدەنگ مابوونەوە ، پشکۆی ناحەزییان کە بە فووی پڕۆپاگەندەی تورکان بوژایەوە ، نەدەتوانرا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ڕێگەی داگیرسانی لێبگیرێت . لە ئەپرلی ۱۹۲۰دا ، بۆسەیان بۆ هێزێکی

---

[41] A.T.Wilson.Loyalties,2:290.

[42] Iraq (British Administration).Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1920,10.

سەربازیی دانایەوە کە بەرەو ئاکرێ دەچوو و تێکیانشکاند . ئەم کارە رکابەرییەکی ئاشکرا بوو ، پاش چەند رۆژێك پەلاماری شارۆکەی ئاکرێ خۆی بەدوادا هات . پۆلیسی ئاکرێ کە لە لایەن ئەفسەرێکی بەریتانییەوە فەرمانده‌یی دەکرا ، توانی تا گەیشتنی هێزی فریاکەوتن لە بیست و چوار ساتی داهاتوودا لەبەرامبەر پەلاماردەرەکاندا خۆی رابگرێت.[43]

دوای ئەم رووداوانە ، نەدەتوانرا هیچ گومانێك لەمەڕ هەڵوێستی ناحەزانەی سورچییەکان بکرێت . هەربۆیە ستونێکی تەمێکارانە نێردرایە سەریان بێ ئەوەی بەرەنگارییەك بکەن . بەجیل ، کێلانی ، هەروەها سۆسناوا کە سێ ناوەندی سەرەکی سورچییەکانن بەتەواویی کاولکرا . بەڵام لەگەڵ هیچ سەرۆکێکیاندا رووبەڕوو نەبوونەوە و هیچیان دەستگیر نەکران ، ئەوانەی واپێدەچوو لەکاتی نزیکبوونەوەی ستونە تەمێکەرەکەدا بۆ ناوچە سەختە دووردەستەکان هەڵاتبن . لەماوەی چەند مانگی داهاتوودا بارودۆخەکە هێمن بووەوە . جگەلە چەند پێکدادانێکی بچووك نەبێت کە دژی چەند دەستەیەکی پەلاماردەری زێباریی و سورچیی لە دەوروبەری ئاکرێ روویدا . پێکەشکردنی ئەو سیستەمە سەربازییە گەڕۆك و ئێشکگرە توانی ئەو چالاکییە دوژمنکارانەیەی سورچییەکان کۆتایی پێبهێنێت . ئەوان تا راپەڕینی خزم و کەسەکانیان کە سورچییەکانی لیوای هەولێرە ، لە ئووتی ۱۹۲۰ ، ئاڵۆزیی و هەرایەکیان لێنەقەوما .[44]

## سورچییەکانی لیوای هەولێر

هەلومەرجەکەی هەولێر بەشێوەیەکی فراوان بەرەو خراپیی رۆیی لەکاتێکدا کۆمەڵێك رووداوی سەیر پێکەوە کۆبوونەوە و بێزارییەکی گشتییان لەنێو خێڵەکاندا پێکهێنا . ژمارەیەك پیاوی سەرەڕۆ لە دژی نوێنەری میریی لە رەواندز وەستابوونەوە و کێشەی خوێنیان لەگەڵیدا هەبوو ، هەروەها لەگەڵ تاقمێکی لەیاسادەرچوودا ، بوونە

---

[43] Ibid.

[44] Ibid.

**هێزێکی گەورەی مەترسیدار دژی میری . نارەزایەتییە خێڵەکییەکە زیاتر لەنێو سورچییەکانی لیوای هەولێردا بوو کە دەکەونە دەشتی هەریرەوە ، ئەوانەی لەو کێشەی خوێنەوە گلابوون بریتیبوون لە براکانی یوسف بەگ ، ئەوەی لە هەلومەرجێکی نادیاردا خنکێنرابوو ،[45] هەروەها نوری کوری باوێل ئاغا کە براکەی تەقەی لێکرابوو . دەگوترا کە بە فەرمانی ئیسماعیل بەگ بووە ، ئەوەی کە لە لایەن بەریتانییەکانەوە بە فەرمانداری رەواندز دانرابوو .[46] دەستەی جەردەکانیش پیاوانێکی چیایی بوون کە حەمادەشین رێبەریی دەکردن و لە دەوروبەری دەربەندی سەفین دا بوون .[47]**

**دوای ئەوەی نوری باوێڵ ئاغا لە ئوتی ١٩٢٠دا لە گەرووی رەواندز پەلاماری کاپتن هەی دا ، لە زێ پەرییەوە و پەنای بردە بەر سورچییەکانی لیوای موسڵ . ئەو لەوێوە دەیتوانی راپەرینێك بێنێتە کایەوە کە بەریتانییەکانی لە قەزای رەواندز و باتاسی سەر بە لیوای هەولێر دەرپەراند و زۆری نەمابوو لەشاری هەولێر خۆی و باقی دیکەی**

---

[45] یوسف بەگ ، وەك ناساندمان ، سەرەکخێڵکی دەرەبەگی دەستڕۆیشتوو بوو لە دەوروبەری رەواندزدا   پاش ئەوەی وەك رکابەریی و ململانێیەکی کاپتن هەی ئەفسەری رامیاریی بەریتانیی ، هەڵدەسێت بە پەلاماردانی سەرەکخێڵێکی لەخۆی خوارتر ، گیرا و هێنرایە بەردەم ئەو کارمەندە .لەمیانەی دەمەقاڵەیاندا ئەو داوای لە پیاوەکانی کرد بێن و کاپتن هەی بکوژن ، ئەویش لە بەرامبەردا گرتی و خستیە زیندانەوە  و ئامادەکاریی ئەوەی کرد سبەی زوو بەرەو کەرکوك بیبەن .کاتێك پۆلیس هاتن یوسف بەگ بەرن بەڵام ئەو خۆی ئەدا بەدەستەوە و کەوتە بەرگریی ، دواتر چوارپەلیان بەست و فڕێیان دایە سەر هێسترێك و لێخوڕە بەرەو خوار . ئەوەمان پێگەیشتووە کە پاسەوانەکانی پاش چەند ساتێك لە رێگە بۆیان دەردەکەوێت کە یوسف بەگ لێبۆتەوە   کاپتن هەی کە یوسف بەگی بە " مەترسیدارترین پیاوی هەرێمەکەی" ناوبردووە ، پاشتر دەڵێت :" لەوباوەڕەدام کە مردنەکەی بەهۆی کاری ئەنقەستی پاسەوانەکان نەبوو ، هەرچەندە رووداوێکی مژدەبەخش و بەختیارانەش بوو"  بۆ زیاتر سەبارەت بە گرتن و مردنی یوسف بەگ بڕوانە:

W.R.Hay and P.O. Arbil, Note On Rowanduz ( Baghdad: Government Press, 192o),1-2;also  Hay,Two Years in Kurdistan,204-24.

[46] راپێنەچێت نوری باوێڵ ئاغا خاوەنی کەسایەتیی و پێگەیەکی باش بووبێت . وێڕای ئەو راستییەی کە ئەو بوو ویستی لە گەرووی رەواندز (کاپتن هەی) بکوژێت . بەڵام ئەوەی دوایی سەبارەت بە توانا و لێهاتوویی سەرکردەیی باوێل ئاغا بە گەرمیی دواوە

Hay,Two Years in Kurdistan,275-76.

[47] بۆ زیاتر لەمەڕ حەمادەشین و باندە دزوجەردەکەی بڕوانە:هەمان سەرچاوە، ٢٣٢ هەروەها Hamilton,93-103

لیواکەش وەدەریان نێت . زۆرینەی شێخە سورچییەکانی ئاکرێش بە راپەڕینی خزمەکانیانەوە لەدەشتی هەریر پەیوەست بوون . هەلومەرجەکە ئەو دەمە مەترسیی پەیداکرد کە خۆشناوەکانی دەوروبەری هەولێر ، کە تا ئەو کاتە پەیوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ بەریتانییەکانەوە هەبوو ، پاش چاوەڕوانییەکی کەم خۆیان هاویشتە ریزی یاخییبوانەوە . وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا ، پەرەسەندنی مەترسییداری زێدەتر بەهۆی دڵسۆزیی چەند کەسایەتییەکی ناو هەولێر رێی لێگیرا . ئەوانەی توانیان لەمپەر بخەنە بەردەم خێڵە هەژارەکانی ناوچەکە و خۆڕاگرن تا ئەو کاتەی هێزی فریاکەوتن لە موسڵ و کەرکوکەوە گەیشت .[48]

پاش ئەوەی هەوڵەکەیان بۆ گرتنی هەولێر شکستیخوارد ، زیاترین بەشی هێزەکانی سورچیی لە گردەمامکەوە لەزێ پەڕینەوە بۆ ناوچەی ئاکرێ . لەوێ هیچ کاتێکیان بەفیڕۆ نەدا و پەلاماری خێوەتگەی ئاسورییەکانیان لە جەرجور دا . ئەم هەڵە مەترسییدارە لەسەر ژیان و پێگەی سورچییەکان گران کەوت . سورچییەکان کە بەشێکی عەشایری سەبعەشیان چووبووە پاڵ لەسەرلەنێوارەدا پەلاماری خێوەتگەی ئاسورییەکانیان دا . پەلامارەکە تووشی زیانێکی سەختی کردن . هەروەها ئاسورییەکان کەوتنە شوێن پەلاماردەرەکانیان و بەرەو رووباری زێ راویاننان ، لەوێ ژمارەیەکی زۆریان لێکوژرا یاخود لە ئاوەکەدا خنکان .[49]

ئەم رووداوە ، وێڕای ئەوەی گورزێکی گەورەی لە پێگە و پایەی سورچییەکان وەشاند ، لەدیدی بەریتانییەکانەوە کاریگەرییەکی باشیشی بەسەر خێڵەکانی دەوروبەرەوە هەبوو . لە راستییدا ، ویلسن گوتوویەتی کە ئەم رووداوە لەو ئاشتیی و هێمنییە بەرپرسیارە کە لە لیوای موسڵدا بەرقەرار بوو لە کاتێکدا دەسەڵاتی بەریتانییەکان لە تەواوی ناوچە داگیرکراوەکەی میسۆپۆتامیادا ململانێ و رکابەریی

[48] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1920,10. see Hay,Two Years in Kurdistan,311-47.

[49] بەگوێرەی (هاڵدان) ، سورچییەکان ٦٠ کوژراو و ١٢٠ خنکاویان زیان پێکەوت

Haldane,247.Cf. A.T.Wilson,Loyalties,2:291; Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1920,10.

دەكرا .[50]

لە نۆڤەمبەری ١٩٢٠دا ، دەگوترێت جوڵانەوەی گێڕانەوەی پەنابەرە ئاسورییەكان هێزی خێڵەكانی ناوچەی زێبار-بارزانی تێكشكاندووە بەوەی كە ناوچەكانیان ڕێڕەوی پەڕینەوەی ئاسورییەكان بوو .[51] لە كۆتایی ١٩٢٠ دا ، زانیاری هەیە كە شێخە سورچییەكانی : قەیون ، شیكاك و مازۆ ، ڕازیبوون كە ملكەچی خۆیان پیشانی دەسەڵاتداران لە موسڵ بدەن . شێخ عوبەیدوڵلای بەجیل كە بە مەبەستی بەدیهاتنی ئاشتیی سەردانی موسڵی كرد ، هەواڵی ئەوە هەیە كە لەگەڵ میرییدا پێكنەهاتوون ، ئەوان لەجیاتی ئەوەی داواكەی جێبەجێبكەن و وەك خۆی داوایكردبوو بیكەنە فەرمانڕەوای قەزاكە خۆی ، داوای ئەوەیان لێكردبوو كە وەك سزایەك پارە بە میریی بدات . شێخ ڕەقیبی سەرەڕیا ، ئەوەی فرە هەوڵیدا خۆی بكاتە شێخ لەدەشتی حەریردا ، هیچ لەوە دوو دڵ نەبوو پێشنیازی خۆی پێشكەشی بەریتانییەكان بكات .[52] لە پەنایەری ١٩٢١ دا ، وەجیهی كوڕی شێخ عوبەیدوڵلا ملكەچیی خۆی پێشاندا و بووە نموونەیەك بۆ باوكی كە ئەویش لە سێپتەمبەری هەمان ساڵدا وەدووی كوڕەكەی كەوت[53]

[50] A.T.Wilson,Loyalties,2:291.

[51] وابینەچێت زێبارییەكان بەڕێبەریی فارس ئاغا و بارزانییەكانیش بەڕێبەری شێخ ئەحمەد پێكەوە لە پێناو دژایەتییكردنی تێپەڕینی ئاسورییە پەنابەرەكان بەناوچەكانی ئەواندا بەرەو ماڵو شوێنی خۆیان لە هەكاریی ، كۆبووبێتنەوە . هەرچەندە نەیانتوانی ئامانجەكەیان بەدەستبێنن بارزان داگیركرا و لەلایەن هێزە ئاسورییەكانەوە كاولكرا ، ئەو ئاسورییانەی وەك باسیان لێوە دەكرێت بە دووی فارس ئاغادا بەرەو باشوور هەڵگەڕان ، ئەو فارس ئاغایەی بەرەو نۆرەمار هەڵات .

Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1920,10-11,and 13.

[52] Ibid.,11.

[53] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for the Year 1921,9.

# بەشی دەیەم : شێخ مەحموود و سەرهەڵدان و لەناوچوونی هاوپەیمانییەتیی باشووری کوردیی لە کوردستانی عێراق پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی

## پێشڕەویی بەریتانیا بۆ باشووری کوردستان

لە مارتی ١٩١٧ دا ، بەریتانیا بەغدای داگیرکرد ، ئەو کارەی هێزە سەربازییەکانی بەریتانیای لە میسۆپۆتامیادا لە خێڵەکانی باشووری کوردستان نزیکخستەوە . لەسەرەتادا پێویستیی و لەبەرچاوگیریی رامیاریی وایکردبوو کە هەڵوێست دژی فراوانبوونی کاریگەریی بەریتانیا لەم ناوچەیەدا وەربگیرێت [1] . بەم پێیە لە ماوەی داگیرکردنی ناوچەی خانەقین لە لایەن ڕووسیاوە، کە لە ئەپریلەوە بۆ ژوونی ١٩١٧ی خایاند، بەریتانییەکان پێیان لەسەر پەیوەندییەکی لاواز لەگەڵ رەگەزە خێڵەکییە کوردەکاندا دادەگرت ، بە تایبەتی لەگەڵ مستەفا پاشای سەرۆک هۆزی باجەڵاندا.[2] پاش کشانەوەی ڕووس لە خانەقین جارێکی تر تورك داگیری کردەوەو تێیدا مایەوە تا ئەو کاتەی لەلایەن بەریتانییەکانەوە لە دیسەمبەری ١٩١٧ دا داگیریکرایەوە ، [3] تەنیا پاش

---

[1] ئینگلیزەکان بە ئاشکرا حەزیان نەدەکرد بچنە ناوچەی خانەقین لەبەر دوو هۆ: یەکەم دەسەڵاتە سەربازییەکانی بەریتانیا لە بەغدا نەیاندەویست هیچ جۆرە هەستیارییەك بورووژێنن لەگەڵ هاوپەیمانە ڕووسەکانیاندا کە پێیەچوو نەخوازن بەریتانییەکان نوێنەرایەتییان هەبێت لەو ناوچەیەی ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا. دووەم ترسی ئەوە هەبوو کە ئەگەر ڕووسەکان دواجار ناچارکران لە خانەقین بکشێنەوە، ئەوە بوونی نوێنەرایەتییەکی بەریتانی لەگەڵیان زیان بە پێگەی بەریتانیا بگەیەنێت : E.J.R.,Bell ,Review of the Civil Administration, 44-45.

[2] لە بارەی چالاکییەکانی مستەفا پاشای سەرۆك هۆزی باجەڵان بڕوانە :

E.J.R.,Bell .Review of the Civil Administration, 42-45.,Iraq (British Administration).Reoprt of Administration for 1918 : Khaniqin District , 34.,Driver ,"The Kurdish Quedtion ," 107.

[3] Bell , Review of the Civil Administration .46.

داگیرکردنی بەریتانی بۆ خانەقین پەیوەندیی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ کورددا گرت.

## پەیوەندیی بەریتانیا لەگەڵ خێڵە کوردەکاندا:

پاش ئەوەی بەریتانییەکان چوونە خانەقین و پێی خۆیان لەو شارەدا چەسپاند ، خێرا پەیوەندیی توندوتۆڵیان لەگەڵ باجەلاندا دامەزراند و هێدی هێدی چونە ناو خێڵەکانی دەوروبەرەوە . لە کۆتایی سێپتەمبەری ۱۹۱۷دا ، بەریتانییەکان پەیوەندییان لەگەڵ شێخ حەمیدی تاڵەبانیدا بەست و زانییان کە هێزەکەی ئەم و خێڵەکانی تری ناوچەکە سەرکەوتووانە بەرەنگاری خواستەکانی تورك بۆ هاوکاریی بوونەتەوە . سەرۆك عەشیرەتی تاڵەبانیی ، کە هێزەکانی خۆی لە ناوچەی (گل)دا لە ڕۆژهەلاتی تاووغ کۆکردبووەوە ، هێزی سوارەی خێڵەکانی تریشی چووبوونە پاڵ. شێخ حەمید تەنیا پشتی بە هێزی خێڵەکەی خۆی نەبەستبوو ، بەڵکو هێزی خێڵی داودەی هاوپەیمانیشی لەگەڵ بوو .[4]

یەکەمجار ، بەریتانییەکان وا خۆیان دەرخست کە تەنیا دەیانەوێت پەیوەندیی دۆستانەیان لەگەڵ ئەم هۆزانەدا هەبێت و هانیان بدەن نەهێڵن دانەوێڵەو کەلوپەلی پێویست بە تورکان بگەیەنن. ئەمان لەم کارەیاندا سەرکەوتوو بوون بەڵام خۆیان لەوە دەپاراست و هانیانبدەن بۆ ئەوەی هەڵکوتنە سەر تورکان ، واپێدەچێت بەوهۆیەوە بێت کە بارەکەیان بەشێوەیە نەبێت دەرفەتی ئەوەیان بداتێ هیچ یارمەتییەکیان بدەن .

لە بەهاری ساڵی ۱۹۱۸ دا هێزەکانی بەریتانیا بە توندی پێشڕەویان کرد و لە ماوەیەکی کەمدا کفری و توزخورماتوو و کەرکووکیان گرت . ئەم پێشڕەوییەیان زەمینەی بۆ خۆشکردن پەیوەندیی نزیکتر لەگەڵ شێخ حەمیدی تاڵەبانیدا ببەستن .[5] ئەمێستا بۆ یەکەمجار هێزەکانی کورد دژ بە تورك بەکارهێنران هێزێکی کورد کە لە نزیکەی دووسەد پیاوی باجەلان ،دەلۆ و سورەمیریی پێکهاتبوو، لە ئەپرڵی ۱۹۱۸دا ، لەسەر سیروان پەلاماری تورکیان دا .[6]

---

[4] Ibid.

[5] کفری لە ۲۸ی ئەپرڵ، تووزخورماتوو لە ۲۹ی ئەپریل و کەرکووك لە ۷ی مایۆی ۱۹۱۸دا داگیرکران .بڕوانە :

A.T.Wilson , Loyalties, 2:8-9

[6] ئەم هێزە کە لەلایەن مێجەر سۆنەوە سەرکردایەتیی دەکراو لە لایەن کاپتن گیرنەوە ڕێکخرابوو وەك بەشێك لەو

دواتر بەریتانییەکان چاویان بڕیە ناوچەکانی ئەودیوی سنوور لە ڕۆژهەڵاتی خانەقیندا کە بۆ ماوەیەك لانکی پیلانگێڕیی بوو لە دژیان . ئەم ناوچەیە لە ڕووی ستراتیجەوە ناوچەیەکی بایەخدار بوو ، ڕێگەی گرنگی نێوان کرمانشا- بەغدای پێدا تێپەڕ دەبوو و کۆنترۆڵی هێڵەکانی پەیوەندیی نێوان میسۆپۆتامیا و ئێرانی دەکرد، کە بە دەست شەڕو شۆڕی بەردەوام و جەردەیی بەردەوامەوە پەرێشان بوو. بەکرێگیراوانی ئەڵمان و تورك ، دیموکراتەکانی ئێران و تیرەو هۆزی ناوچەکە لە جموجووڵی بەردەوامدا بوون بۆ ئەوەی هەلومەرجەکە لەم ناوچەیەدا لە بەریتانییەکان ئاڵۆز بکەن. ئەمانە گەلێ کردەوەی هەراسانکەریان ئەنجام دەدا وەك تێکشکاندن و وێرانکردنی دەزگاکانی سەربازیی بەریتانیی‌و پەلاماردانی شوێنە چەپەك و دوورە دەستەکان وبچڕاندنی هێڵەکانی پەیوەندیی، بەڵام بەریتانییەکان ، بە یارمەتیی خێڵە دۆستە خۆجێییەکانیان ، زۆر چاك بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەم هەوڵانە هەڵسوڕان .

لەم سەروبەندەدا بوو کە دەستە ناحەزەکانی بەریتانیا لە خێڵەکانی باجەڵان و گۆران کەرەسە و نامێری کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ- ئێرانییان لە چیا سورخی نزیك خانەقین تێکشکاندبوو ، لە هەمان کاتیشدا دەستەیەك لە خێڵی ناحەزی کەلهوڕ لە بۆسەیەکدا پەلاماری تیمێکی ڕووپێویی بەریتانییان دابوو. هەروەها سەرەك خێڵی سنجابیی عەلی ئەکبەر خان ، کە سەرۆکی سەنجابیی و گۆرانی هاوپەیمان بوو ، چالاکانە ڕێی بە کاروانی کەلوپەل و پێداویستیی خانەقین دەگرت . لە ئەپرڵی ١٩١٨ دا ، هەردوو هۆزی قەڵخانیی و کەلهوڕ، بە پاڵپشتی ڕەتلێکی هێزەکانی بەریتانیا توانییان هێزەکانی عەلی ئەکبەر خان ببەزێنن و پەرتەوازەیان بکەن ، کە هاوکاریی لەگەڵ سلێمان میرزای دیموکراتی ئێراندا کردبوو و لەگەڵ بەکرێ گیراوانی ئەڵمان و تورکیشدا پیلانگێڕیی دەکرد .[٧] پاش گرتنی سلێمان میرزا ، عەلی ئەکبەر خان هەر بەردەوام بوو لەسەر

---

ستونە شەڕی دەکرد کە کۆلۆنێل ئەندەرهێل سەرکردایەتیی دەکرد بە پێی ڕاپۆرتەکان لەم شەڕانەیان لەگەڵ تورکەکاندا ئەنجامی باشیان بەدەستهێناوە. بڕوانە : Frederick James Moberly ,The Campagin in Medsopotamia (London: H.M.Stationary Office 1927), 4:152 note.Cited in A.T.Wilson , Loyalties, 2:84

[٧] Iraq (British Administration), Reoprt of Administration for 1918 : Khaniqin District,32-33 ., Also A.T.Wilson , Loyalties, 2:84-85

پەیوەندیی نزیکی لەگەڵ بەکرێگیراوە ئەڵمان و تورکەکاندا. دواجار وەك باس دەکرێت لەگەڵ (ڤۆن دروفل) ی سیخوڕی ئەڵمانییدا رێککەوتووە کە سنجابی و خێڵە هاوپەیمانەکانی چەکدار بکرێن لە دژی بەریتانیا و پاشان لە شەڕێکی دژ بە بەریتانیادا بریندار بووە و هەڵاتووە پاشان واپێدەچێت کەنارگیر بووبێت.[8]

## یەکەم پێشنیازی شێخ مەحموود بۆ بەریتانییەکان:

لە پاش ئەو پەلامارە سەرکەوتووە سەربازییەی بەریتانیا کە گرتنی سلێمان میرزای لێکەوتەوە، میجەر گۆڵد سمیسی ئەفسەری رامیاریی لێپرسراوی خانەقین کەوتە ئەنجامدانی گەشتێکی پشکنین لە ناوچەکان دەوروبەردا . لەم کاتەدا شێخ مەحموود ، کە دواتر رۆڵێکی بایەخداری لە مێژووی کوردستانی باشووردا گێڕا ، یەکەمجار بوو ناوی بکەوێتە ناو ناوانەوە. بە گوێرەی راپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی کە "لەم گەشتەدا بوو کە شێخ مەحموود لە سلێمانییەوە نوێنەری خۆی نارد بۆ چاوپێکەوتنی ئەفسەری رامیاریی و داوای کرد تا ئێمە دەگەین وەك نوێنەری حکومەتی بەریتانیا لە سلێمانی دەستبەکار بێت."[9]

سەرکەوتنەکانی بەریتانیا بە ئاشکرا کاری لە کوردەکان کردبوو، ئەوانەی بڕیاریان دابوو بدەنە پاڵ لایەنی سەرکەوتوو. بەریتانیا نامەیان لە هەمەوەندەوە پێگەیشتبوو، کە یەك لە جەنگاوەرترین عەشیرەتەکانی کوردستانی باشوور دەهاتنە پێش چاو، ئەوانەی جاڕی ئامادەییان دابوو بۆ هەر هاوکارییەك لێیان داوابکرێت. لە کۆبوونەوەیەکی سەرۆك و پیاو ماقووڵانی کورددا کە لە سلێمانی بەسترا بڕیاریان دا حکومەتێکی کاتی دامەزرێنن بە سەرۆکایەتی شێخ مەحموود و هەڵوێستێکی دۆستانە لە حاست بەریتانیادا بنوێنن.[10] بە پێی راپۆرتێکی سێر ئارنۆڵد و یلسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنی:

---

[8] Iraq (British Administration). Reoprt of Administration for 1918 : Khaniqin District,32-33.

[9] Ibid .

[10] A.T.Wilson , Loyalties, 2:86,. E.J.R. 5-6,.Bell ,Review of the Civil Administration, 48,. Driver ,"The Kurdish Quedtion ," 107

"شێخ مەحموود خۆی نووسیەتی (لە جیاتی هەموو گەلی کورد لە هەردوو بەری سنوور) ئامادەیی دەربڕیوە حکومەتمان تەسلیم بکات یان وەك نوێنەری ئێمە کاربکات لە ژێر سێبەری ئاڵای شکۆداری بەریتانیادا. ئەو دەڵێ کە میللەتی کوردستان خۆشحاڵن بە سەرکەوتنمان و بەهۆی هێزە قارەمانەکانمانەوە لە دەسەڵاتی ملهوڕیی تورك ڕزگاریان بووە و چاوەڕوانن لە ژێر فەرمانڕەوایی ئێمەدا وەك لە عێراقدا بووە ئەوانیش بیوژێنەوە. پاشان بەوە کۆتایی پێدێنێت کە داوای زەمانەتێك دەکات کە ئێمە لە هیچ حاڵەتێکدا ڕێگە بە گەڕانەوەی دەسەڵاتدارانی تورك بۆ کوردستان نەدەین ."[١١]

**پاشەکشەی بەریتانیا لە کەرکووك:**

بە گوێرەی ویلسن ، لەکاتێکدا بەریتانیا بڕیاری داوە لە مایۆی ١٩١٨ دا کەرکووك چۆڵ بکات، ئەو ناچار بووە کوردەکان ئاگادار بکاتەوە کە بەریتانیا لەبەر کەش‌وهەوای گەرم شارەکە چۆڵ دەکات و بە نیازن زوو بگەڕێنەوە. هەروەها دەڵێ: "من پێشنیازیی شێخ مەحموودم پەسەند بوو کە پێویستە وەك نوێنەرمان هەڵسوڕێت ئەگەر بتوانێ ئەوە بکات و بە فیعلی ڕاگەیاندنێکی گشتیشمان لەو بارەیەوە دەربکرێت."[١٢]

بەڵام ئەم ڕاگەیاندنە هەرگیز دەرنەکراو هەر کە کەرکووك چۆڵ کرا لە لایەن بەریتانییەکانەوە لە ٢٤ ی مایۆدا دەستبەجێ لە لایەن تورکەکانەوە داگیرکرایەوە. لە هەمان کاتیشدا هێزێکی تورك چوو بۆ سلێمانی و جارێکیتر گرتیەوەو یاسای سەربازیی تێدا

---

[11] A.T.Wilson , Loyalties, 2:86,. E.J.R. 5-6,.Bell ,Review of the Civil Administration, 48.

[12] A.T.Wilson . Loyalties. 2:86-٨٧ . ڕاپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی کە باسی لە دامەزراندنی شێخ مەحموود دەکات و ئەو هەنگاوانەی ئینگلیزەکان نیازیان بووە بینێن بۆ پاڵپشتی کردنی. ڕاپۆرتەکە بەمجۆرە باسی دەکات: "لە سەرەتای ژووئندا لە کۆمیسیۆنی مەدەنییەوە نامەیەك نێردرا بۆ شێخ مەحموود و ئەریان وەك نوێنەری بەریتانیا لە سلێمانی و دەوروبەری دناوە لە هەمان کاتیشدا پلان دانراوە بۆ ناونووس کردنی لیڤیی کورد لە ناوچەی خانەقیندا تاوەکو ئەفسەرە بەریتانیەکان هێزێکی غەیرە نیزامی لەسەر سنووری باکووری ناوچەکە دامەزرێنن و دەست بکەن بە ناونووسینی لیڤیی لە سنووری هەڵەبجەدا کە لێیانەوە نزیکە. ئامانج لەمەش چەسپاندنی پێگەی شێخ مەحموود بوو. کاتێ کەرکوکیش گیرا دەرکەوت کە ئەم پلانە سەرکەوتوو بوو".

Iraq (British Administration), Reoprt of Administration for 1918 : Khaniqin District,33.

ڕگەیەندرا .[13] شێخ مەحموود گیراو ڕەوانەی کەرکووک کراو لەوێ خرایە گرتووخانەوە. ئەو پیاوماقووڵانەش سەر بە شێخ بوون گیران یان غەرامەکران و سووکایەتییەکی زۆر بەو کەسانە کرا کە بە جوڵانەوەکەوە پەیوەست بوون .[14]

بێگومان هەندێ کەس زەبرو سزای قورسی تورکیان بەرکەوت ،[15] بەڵام بە گشتیی پێدەچوو تورکان بە ڕادەیەکی تا سروشتیی نەرمییان پیشان دابێت و ئاقڵانە خۆیان پاراست لە ئیجرائاتی توندو تیژ. ئەوان لەبەرئەوەی نەیانەویست خۆ بخەنە گێژاوی هەژان و هەڵچوونی خێڵەکان چونکە لە بارودۆخێکدا نەبوون چاریان بکەن لەو سۆنگەیەوە ئازاری شێخ مەحمودیان نەدا و پاش بەسەر بردنی ماوەیەك لە گرتووخانەی کەرکووکدا ئازادیان کرد و ڕێگەشیان دا بۆماڵی خۆی بگەڕێتەوە .[16] هەروەها هیچ کارێکی تاڵانیی و دەستبەسەرداگرتنی ماڵ و موڵکی خەڵك و عەشیرەتەکان ئەنجام نەدرا. سوپا هەر پێداویستییەکی هەبوایە بە کاش پارەکەی دەدا و هێزە خێڵەکیەکان لە کاتی خۆیدا مووچەی خۆیان وەردەگرت. ئەم هەڵوێستی ڕازیکردنە لە لایەن دەسەڵاتدارانی تورکەوە کاریگەریی باشی هەبوو بۆ ڕاکێشانی خێلەکان بە لای خۆیاندا و بەو پێیە زۆرێك لە خەڵك بە شێوەیەکی خۆبەخشانە دایانە پاڵ تورك، هەرچەندە زانیاریی ئەوەمان هەیە کە هێندێك کەس لەلایەن تورکانەوە ناچار کراون ڕاژەیان بکەن .[17]

وا پێدەچێت پاشەکشەی بەریتانیا لە کەرکوك بە هۆی تێکچوونی باری سەربازییەوە لە هەرێمی قەفقاس بووبێت ، ئەوەش گریمانەی ئەرك و بەرپرسیارێتی قورسی بووبێت لە ئێراندا لە لایەن فەرماندەیی لەشکری بەریتانیا وە لە میسۆپۆتامیا. ئەم بارودۆخە بوو بە هۆی تێکچوونی شیرازەی هەموو هۆکارێکی گواستنەوەی ڕێگاکانی

---

[13] A.T.Wilson , Loyalties, 2:9.

[14] Ibid., Cf. Bell ,Review of the Civil Administration, 48,. Driver ,"The Kurdish Quedtion ." 108,.E.J.R.,6.

[15] بە گوێرەی درایڤەر "تورك جگە لە شێخ مەحموود سزای هەموو ئەوانەیان دابوو کە پشتیوانییان لە هاوپەیمانان کردبوو Driver ,"The Kurdish Quedtion ." 108,.E.J.R.,6.

[16] A.T.Wilson , Loyalties, 2:87,.Bell ,Review of the Civil Administration, 48.

[17] E.J.R.,6,. Driver ,"The Kurdish Quedtion ," 108.

ئێران .[18]

پاشەکشە لە کەرکووک گورزێکی توند بوو بۆ شکۆ و ناوبانگی بەریتانیا لە کوردستاندا و ڕاستییەکەی لە سەرانسەری میسۆپۆتامیاشدا و بەریتانیا بەردەوام بە دەست کاریگەریی ئەم مەسەلەیەوە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە دوای بردنەوەی جەنگی یەکەمی جیهانیی دەینالاند . کوردەکان کە هەڵوێستی خۆیان لە مەڕ بەریتانیا ئاشکرا کردبوو وا ئێستا دوو دڵی و گومان تەنگی پێهەڵچنیون و باوەڕیان بە هێزو بەڵێنەکانی بەریتانیا بەخراپی لەق بووە. ویلسن کاردانەوەی سەرکردە کوردەکان سەبارەت بە کشانەوەی بەریتانیا لە کەرکووک باس دەکات کە ئەفسەرە رامیارییەکان سەبارەت بە پشتگیری و هاوکاریی بەکوردانیان دەدا :

"ئەوان بە تەواویی ئەوەیان لا ئاشکرا بوو کە ئەو زەمانەتی پشتگیرییە لە خۆڕا لە لایەن ئەفسەرە رامیارییە نابەرپرسەکانەوە پێیان دراوە و لەو پێشنیازانەدا دەردەکەوت کە لە کەرکووک لە لایەن بوڵارد و لە کفری لە لایەن لۆنگریگەوە باس دەکران جێی متمانە نەبوون و لای ئەوان وا کەوتووەتەوە کە ئێمە هەمان گەمەکەی ڕووسیا دەکەین لە بەکارهێنانی دزێوی خێڵەکاندا وەک پشیلە سپلە. سەرۆکەکانی ئەوان، کەمەندێکیان سەرۆکی ئەم ڕاستی هەمەوەندن بەڕێوە بوون بۆ کەرکووک لە کاتی کشانەوەکەدا، بەڵام بەو پەڕی ڕق و تووڕەییەوە گەڕانە ماڵی خۆیان. ئەوان وا هەست دەکەن کە ئێمە ناپاکیمان لەگەڵ کردوون ، چونکە وا هەست دەکەن کە ئێمە هانمان داون خۆیان بۆ تورکی دوژمن دەربخەن و پاشان فریومان دان . سەرۆکەکانی هەمەوەند بە تایبەتی قەت لێمان خۆش نابن و بۆ چەندین ساڵی تر وەک ناحەز لە گەڵمان هەڵسوکەوت دەکەن."[19]

تورکەکان وەک چاوەڕوان دەکرا ، چەند توانیان پاشەکشەی بەریتانیایان لە کەرکووک تا ئەوپەڕی بۆ سوودی خۆیان بەکارهێناو ئەمەیان بۆ باری ناسک و شڵەژاوی هاوپەیمانان لە بەرەی ڕۆژئاوادا گێڕایەوە و بەوەیان دانا ڕێخۆشکەرێک بێت بۆ کشانەوە لە میسۆپۆتامیا. بە پێی گوتەی ویلسن پڕوپاگەندەی تورکان باس لە کاریگەریی مەسەلەی "ئینگلیزی فێڵباز" دەکرد، کاتێک کە میللەتانی تر بەکاردەهێنێت بۆ شەڕی خۆی . کتێبەکەی چەند نموونەیەکی

[18] Bell ,Review of the Civil Administration, 48,. A.T.Wilson , Loyalties, 2:6.

[19] A.T.Wilson , Loyalties, 2:88.

پڕوپاگەندەی تورکیی گواستووەتەوە کە ژمارەیەك کارەساتی تێدایە بە هۆی ئەو کەسانەوە کە فریویان خواردووە و بوونەتە شوێنکەوتەی بەریتانییەکان و هەڕەشەی ئەنجامی خراپی ئەوانە دەکات کە بەرەی تورکیان بەجێهێشتووە و لە هەمان کاتیشدا بەڵێنی خەڵات و بەراتی گەورە دەداتە ئەوانەی هەڵوێستیان نەگۆڕیوەو بە دڵسۆزی تورکیا ماونەتەوە .[20]

ویلسن باس لەوە دەکات کە ئەو هیچ ئاگایەکی لە بڕیاری چۆڵکردنی کەرکووك نەبووە ، ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە نە خۆی و نە ئەفسەری رامیاریی شوێنەکە واتە مەیجەر ریدەر دەبلیو بۆلارد (دواتر بوو بە سێر ریدەر بۆلارد) هیچ زانیارییەکیان نەدراوەتێ کە داگیرکردنەکە جێگیر و بەردەوام نابێت. ڕاستییەکەی ئەو بە چەند ڕۆژێکی کەم دوای گرتنی کەرکووك لە لایەن بەریتانیاوە بە فڕۆکە چوو بۆ کەرکووك بۆ گفتوگۆ کردن لە بارەی ژمارەیەك کێشەی بە پەلەوە و بۆ ئاونووس کردنی پشتیوانیی خێڵەکان و ڕەچاوکردنی هێڵەکانی پەیوەندیی بەریتانیا و زەمانەت کردنی دابینکردنی ئازووقە و پێداویستیی، بە تایبەتیش گۆشت بۆ هێزەکان.[21] کاریگەریی قووڵی ئەم ئوشوستییەی بەریتانیا لەسەر کوردەکان هەر زوو دەرکەوت، چونکە بەریتانییەکان هەموو هەوڵێکیان خستە کار بۆ پێکهێنانی هێزێکی لێڤیی کورد لەو هاوینەدا بەڵام ئوشوستی هێنا و بە پێچەوانەی تورکەکان توانییان هێزێکی سوارەی گەورە پێکبێنن و دژ بە هێڵەکانیان لە ئێراندا .[22]

## سیستمی خێڵەکیی لە باشووری کوردستاندا:

لە پایزی ١٩١٨ دا موتەسەڕیفی عوسمانیی و حامیەی سەربازیی لە سلێمانی خۆیان دا بە دەست شێخ مەحموودەوە و بە شێوەیەکی فەرمیی بوو بە هۆی کۆتاییهاتنی کارگێڕیی عوسمانیی لە دەڤەرەکەدا. کشانەوەی هێزەکانی تورك و کاربەدەستان بوو بەهۆی ئەوەی شێخ مەحموودی سەرداری کورد بە تەنیا دەستی بەسەر سلێمانی و ناوچە دێهاتییەکانی دەوروبەری بکات. لێرەبەدوا شێخ مەحموود نامەی بۆ دەسەڵاتدارانی بەریتانیا لە بەغدا ڕەوانە کرد و داوای دەکرد کوردستان لە لیستی گەلانی ڕزگارکراو

---

[20] Ibid.,2:87.

[21] Ibid.,2:86.

[22] ئەو هێزە لێڤییە کوردییەی بەریتانییەکان هەوڵیاندەدا ئاونووسی بکەن بە لە پێناو گرتنی هەڵەبجە و پاشان بێزارکردنی تورکەکان لە سلێمانی و دەوروبەریدا بوو . E.J.R.,6

دەرنەکرێت.[23] ڕاستییەکەی شێخ مەحموود لە ڕووی ڕامیارییەوە گەورەترین کەسایەتیی بوو لە ناوچەکەدا و ئەمەش هاوتا بوو لەگەڵ خواستیدا بۆ هاوکارییکردن لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەری بەریتانیادا و هانیدان مامەڵەی لەگەڵ بکرێت. جێگرەوەی ئەمەش ئەو لەشکر و سوپایە بوو کە شێخ لە سەربازگەی سلێمانی و ناوچە شاخاوییەکانی دەوروبەریدا کۆیکردبووەوە و بەریتانییەکان بێجگە لە پەسەندکردنی پێشنیازی شێخ بۆ یارمەتییدان و هاوکارییکردنی هیچ چارەیەکی دیکەیان شك نەدەبرد.

مەیجەر ئی. دەبلیو. سی نۆئێل، کە ئەفسەرێك بوو ئەزموونێکی باشی پەیدا کردبوو لەگەڵ هۆزی بەختیاری و تیرە و خێڵەکانی تری ئێراندا، ئەرکی گەڵاڵە کردن و دامەزراندنی کارگێڕیی پێسپێردرا بوو لە کوردستانی باشووردا.[24] ئەو ڕاسپاردەیەی بە نۆئێل درابوو لە پێش چوونی بۆ سلێمانی هەندێك بەڵگە و نیاز و مەبەستی بەریتانیای تێدایە :

" تۆ بە ئەفسەری ڕامیاریی دامەزراوی لە کەرتی کەرکووکدا و لە یەکی نۆڤەمبەر دا دەست بەکار دەبیت. کەرتی کەرکووك لە زێی خواروو تا دیالەو باشووری ڕۆژهەڵاتی سنووری تورکیا– ئێران دەگرێتەوە و بەشێکی ویلایەتی مووسڵ دەگرێتەوە، کە دوا کاروبار ڕێکخستنە لە ژێر چاودێریی حکومەتی خاوەن شکۆدا. لە حاڵی حازردا دەبێ داگیرکردنی سەربازیی و بەڕێوەبردنی هێزەکە ڕەچاو بکرێت و دەبێ تۆ لەسەر ئەم گریمانەیە کار بکەیت لە مامەڵە کردنتدا لەگەڵ سەرۆکەکان و ئەوەت لە بەرچاوبێت کە ئەگەر ئەوە نیە دەسەڵاتدارانی سەربازیی خۆیان تاوتوێی ناردنی هێزی جێگیر دەکەن بۆ سلێمانی یان شوێنەکانی تر لە ڕۆژهەڵاتی هێڵی ئێستامانەوە. هەروەها ئەرکی تۆ دەبێت کە هەماهەنگیی لەگەڵ سەرۆکە خۆجێیەکاندا بکەیت بۆ بەرقەرارکردنی ئارامیی لە ناوچەکانی دەرەوەی سنووری داگیرکردنی سەربازیماندا، بۆ دەرپەڕاندن و گرتنی بەکرێگیراوانی دوژمن و دابینکردنی پێداویستیی هێزەکانمان. بە هەمان شێوە تۆ دەسەڵاتپێدراوی سەرفکردنی ئەو بوارەدا و لە حاڵەتی بڕی زۆر و قەبەدا و بە پێی لێك حاڵیبوون دەبێ سەرۆکەکان لایان ڕوون بێت کە هەر ڕێکخستنێکی کارو بارکە تۆ ئەنجامی دەدەیت بە زەروورەت کاتی دەبێت و دەکرێ لە هەر کاتێکدا چاوی پێدا

[23] Bell ,Review of the Civil Administration, 59 .

[24] Ibid., Cf.E.J.R.,9,. A.T. Wilson , Loyalties, 2:127-128 .

بخشێنرێتەوە. تۆ دەسەڵاتپێدراوی بە دامەزراندنی شێخ مەحمود وەك نوێنەری خۆمان لە سلێمانی و ئەگەر بە گونجاویشت زانی بە هەمان شێوە کەسانی هەڵبژێردەو جێنشینانەی خۆت لە چەمچەماڵ و هەڵەبجە و شوێنانی تر دابنێ. دەبێ ئەوەش ڕوونبکرێتەوە بۆ سەرۆك خێڵەکانی پەیوەندییان لەگەڵ گرێ دەدەن کە نیازی سەپاندنی هیچ جۆرە ئیدارەیەك لە ئارادا نیە ناموٚ بێت لەگەڵ دابونەریت و ئارەزووی ئەواندا. لەم حاڵەتەدا سەرۆك خێڵەکان خولیای پێکهێنانی هاوپەیمانێتیان دەکەوێتە سەر بۆ ڕاییکردنی کاروباریان بە سەرپەرشتی ئەفسەرە سیاسییەکانی بەریتانیا و بە شێوەیەکی یاسایی باجیان لێوەر دەگیرێت بە پێی یاسای تورکی، بەڵام بە پێی پێویست دەسکاری و گۆڕانکاری تێدا دەکرێت، بۆ ئەنجامدانی ڕێکخستنی کاروبار بەڕێوەبردن و پەرەپێدانی وڵاتەکەیان."[٢٥]

لە ناوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەری ١٩١٨ میجەر نوئێل گەیشتە سلێمانی و بە گەرمیی پێشوازیی لێکرا. ئەمیش دەستبەجێ دەستیکرد بە کار کردن بۆ دامەزراندنی سیستمێکی نوێی بەڕێوەبەرایەتیی، کە ئومێدی ئەوەی لێدەکرا لای خەڵك پەسەند بێت. شێخ مەحمود بە حوکمداری ناوچەکە و سەرۆکی باشووری سەربەخۆی کوردیی دانرا. کاربەدەستانی دیکەی کورد لە ژێر سەرپەرشتیی ئەفسەرە ڕامیارییەکانی بەریتانیادا کاریان دەکرد و کاروباری جۆراو جۆری کارگێڕییەکەیان پێ سپێردرا. سەرۆك خێڵەکانیش لەلایەن حکومەتەوە کاروباری خێڵەکانیان خرابووە ئەستۆ و لە ڕێگای شێخ مەحموودەوە بەرپرسیار بوون بەرانبەر بە دەسەڵاتداری بەریتانیا. ئەوان وەك کاربەدەستی فەرمیی حکومەت دەناسران و مووچەیان دەدرایە.[٢٦]

گومانێکی ئەوتۆی تێدا نیە کە سیستمی تازە دامەزراوی حکومەت لە باشووری کوردستاندا بەزۆری دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی کۆلۆنیاڵیی بەریتانیا لە هیندستان و شوێنانی تردا. سروشتی ئەو ئەرك و کارانەی نێوان حکومەتی بەریتانیاو کۆنفدراسیۆنی باشووری کوردیدا لەو پەیوەندی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی باڵایە دەچوو کە لە نێوان تاجی بەریتانیا و ویلایەتەکانی هندستاندا هەبوو.[٢٧] سیستمی نوێی بەڕێوەبردن لە

---

[25] Bell,Review of the Civil Administration,59-60,.A.T.Wilson,Loyalties,2:128,.E.J.R..,9.

[26] E.J.R..,9-10,.Bell,Review of the Civil Administration,60,.A.T.Wilson,Loyalties,2:128.

[27] بۆ کورتەیەك لە نەخشەی مۆڵەتپێدراو لە بارەی پێگەی ویلایەتە هندییەکان لەناو ئیمپراتۆریی هندیی بەریتانییدا و پەیوەندییان بە حکومەتی بەریتانیەوە،بڕوانە :

باشووری کوردستاندا بە ئاشکرا پشتی بە بنەمای حوکمی ناڕاستەوخۆ[28] دەبەست و لە فرە ڕووەوە ئاسەواری سیستمی ساندیمانی تێدا بوو، بە تایبەتی سیستمی بروسی و مەلیکی، کە لە مەوە دا کەوتبوون.

## سیستمی ساندیمان:

ئەم سیستەمە بە ناوی سێر ڕۆبەرت ساندیمانەوە[29] ناونراوە و شێوازێکی بەڕێوەبردن بوو لە بلوچستاندا بە مەبەستی پێکهێنانی ئەم دەڤەرە کێوی و شاخاوییە لەگەڵ سیستمی ئیمپراتۆریەتی هندی بەریتانییدا. ئەم سیستەمە بریتیە لە ڕژێمێکی خێڵەکیی لاوەکیی و لە لایەن فەرمانڕەوایەکی باڵا دەستی خۆماڵییەوە سەرۆکایەتیی دەکرا، کە خانی کەلات بوو، کە وەك بڵێی سیاسەتێکی پێشکەوتووی سەرکەوتووانە بوو[30].

---

M.K.Panikkar,Indian State ,Oxford Pamphlets on Indian Affairs no.4 (Misore City, India: Oxford Univ Press,1942).

[28] بەریتانییەکان سیستمی حوکمی ناڕاستەوخۆیان لە ماوەی چەندین ساڵدا پەرەپێدا بە هەر حاڵ ئەو دەمەوە کە سێر لوگارد "دواتر بوو بە لۆرد لوگارد" لە نایجیریا سیستمی حوکمی ناڕاستەوخۆی چەسپاند ئیتر بە ناوی ئەمەوە وابەستە بوو. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم سیستەمە بڕوانە:

Frederick John Dealtry Lugard , Tha Dual Mandate in British Tropical Africa (London : William Blackwood and Sons, 1923).

[29] بۆ پتر لەسەر ژیانی ساندیمان و سیاسەتی خێڵەکیی :

Thomas Henry Thornton , Colonel Sir Robert Dandeman : His Life and Work on Our Indian Frontir (London :J Murray, 1859) ,. Davies,C.Collin."The Problem of The North-West Frontier, 1890-1908, With a Survey of Policy Since 1849. Cambridge: Cambridge Univ.Press,1932.

[30] "سیاسەتی پێشکەوتوو" لە بەرانبەر "سیاسەتی سنووری داخراودا" زۆرترینی ئەو مەسەلانە بوون کە مشتومڕیان لەسەربوو لەناو کارگێڕییە بەریتانییەکاندا لە هنددا بە درێژایی سەدەی نۆزدە مشتومڕیان لەسەربوو بڕوانە : Davies,"The Problem of The North-West Frontier, 71-98, and Bruce, The

مەبەستی ئەم سیاسەتە پاراستنی دانیشتوانی سنوری سند لە تالآن و برۆی یاخیبووانی ئەو هەردە و چیایانە، کە ولآتی سەخت و شاخاوییان بووبوو بە دالّدە و حەشارگەیان و لە سەرێکی تریشەوە مەبەست بەهێز کردنی بەرگریی هندستان بوو لە دژی داگیرکردنی بێگانە.

سیستەمی ساندیمان کەوتبووە بەر ڕەخنە لەبەرئەوەی زۆر پشتی دەبەست بە دەسەلآتی شەخسیی تاکە کەسی و هەروەها لەسەر بنەمای ئەو پارمەتییە مادییانەی کە دەدرا شێوازێکی پارە کێشانەوە و گەندەڵیشی دروست کردبوو. بە هەر حالّ مێژوونووسی بەریتانی سی. کۆڵن دەیڤیس C.Collin Davies سەرنجی ئەوە دەدا کە ئەم پارمەتییە داراییە بە ئابڕوو چوون و گەندەڵی وەسف ناکرێت، چونکە ئەوان لە بەرانبەر خزمەتی زۆر و تاقەت پڕووکێندا ئەم پارمەتیانەیان وەردەگرت، وەك پاسکردنی ڕێگەوبانی بازرگانی و دەربەندی نێوچیاکان و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی جیرگە "ئەنجومەنی خێڵەکان."[٣١]

سیستەمی بروس یان مەلیکی:

ئەمە ئەو ناوەیە کە دراوەتە سیستەمەکەی ساندیمان و لەناو مەحسوودەکانی سنووری باکووری ڕۆژئاوای هندستاندا پەیڕەوی دەکرا لەلایەن دێرەجات ئار.ئای.بروس Derajat, R. I. Bruce ی کۆمیسیۆنەوە .[٣٢] ئەم سیستەمە دواتر و لەبەر چەندین هۆکار نوشوستیی هێنا. یەکەم لەبەرئەوەی لەنێو مەحسوودە دیموکراتەکاندا کاری پێکرا چونکە مەلیکەکانیان "سەرۆکەکانیان" ئەو دەسەلآتەیان نەبوو کە سەرۆکەکانی بروهوی Bruhui و بلوچ لە بلوچستاندا هەیانبوو. بەم پێیە مەبەستی بروس لەوەی کە سەرۆکەکانی مەحسوود سەرکەوتوو دەبن لە کۆنترۆڵ کردنی خێڵەکانیاندا، لە بەرانبەر پارە و پارمەتییدا، نوشوستیی هێنا. دووەم ئەو سیستەمەکەی بێدەسەلآت بەسەردا شکانی سەربازیی ولآتی مەحسوود دەستپێکرد بە پێچەوانەی ئەوەی کە

---

Forward Policy and Its Results .

[31] Davies,"The Problem of The North-West Frontier,33,.Davies," The North-West Frontier, 1834-1918."In The Cambridge History of the British Empire.vol.5 The Indian Empire , 1858-1918,( New York:J.Macmillan,1929),448.

[32] بروس بۆ چەندین ساڵ کەسێکی زۆر نزیك و متمانە پێکراوی ساندیمان بوو لە بلوچستان

ساندیمان له بلووچستان کردی. بێجگه لەوەش، مەحسوودەکان بە پێچەوانەی بلووچەکانەوە هەمیشە دەسەڵاتی سەرکردە ئاینییەکان بەسەریاندا زاڵبووە و لەژێر کاریگەریی ئەماندا چەکیان لە دژی بەریتانیا هەڵگرتووە بە هاوسۆزیی یا بەدەمەوەچوونی بانگەوازی خزمە موسڵمانەکانیان لە ئەفغانستان .[٣٢]

بەو پێیە سیستمی نوێی بەڕێوەبردنی بەریتانییەکان لە باشووری کوردستاندا لە گەڵ ڕووەوە لە سیستمی بروس یان مەلیکی دەچوو لەنێو مەحسوودەکاندا. تێکچوونی خێرا و دواتر شکستهێنانی تەواوی ئەم سیستەمە لە باشووری کوردستاندا گومانی نەهێشتەوە کە بێسوودبوو بۆ ئەو هەرێمە وەك چۆن کەڵکی نەبوو بۆ مەحسوودەکانی سنووری ڕۆژئاوای هندستان. ڕەنگە ئەم بەراوردە لەوەدا بایەخی خۆی هەبێت کە کورد و مەحسوود چونیەکن لە ژمارەیەك ڕووەوە . چونکە کوردەکانیش وەك مەحسوودەکان هەمیشە پەرۆشی ڕزگاربوون و بەردەوام بەگژ ئەوانەدا دەچوونەوە کە لە هەوڵی کۆنترۆڵ کردنیاندا بوون. بە هەمان شێوەی مەحسوود کوردیش لە ڕۆژگاری شێخ عوبێدوڵلاوە لەلایەن سەرۆکە ئاینیەکانیانەوە کۆنترۆڵ کراون ، کە شێخەکان بوون بێجگە لە ئاغا کە سەرۆکی دنیایی بوون. لە کوردستانی ژێر دەستی بەریتانیادا پڕوپاگەندەی تورکی‌پان–ئیسلامی زیرەکانە سەرکەوتوو بوو لە هەڵگێڕانەوەی زۆرێك لە کوردەکان لە دژی بەریتانیا. بەم ڕەنگە، کورد وەکو مەحسوود، لە لایەن وڵاتێکی ئیسلامییەوە هاندران لە دژی بەریتانیا ڕاپەڕن و وەك ئەوانیشیان کرد لە ژێر سەرکردایەتی خاوەن پلە و پایە ئاینییەکاندا. شتێکی سەیرە سەرنجی ئەوە بدەیت کە بروس، لە نووسینەکانیدا نزیکەی بیست ساڵ پێش ئەوەی بەریتانیا پەیوەندی ڕاستەوخۆ بە کوردەوە پەیدا بکات، بێت و بە مەحسوودیان بەراورد بکات. لە داکۆکی کردنیدا لە مەحسوود بڕگەیەکی دوور و درێژی لە کتێبەکەی (لۆرد کێرزن) ، "ئێران و مەسەلەی ئێران" گواستووەتەوە کە کێرزن داکۆکی لە کورد دەکات دژ بە ستەم و یاخیگەری و متمانە پێنەکردن. پاشان

---

[٣٢] سەبارەت بە شکستهێنانی سیستەمی مەلیکی یان بروسی لە نێو مەحسوودەکاندا بڕوانە :

Davies,"The Problem of The North-West Frontier,34,124-26,.Davies," The North-West Frontier,455-56,. Cf . William Barton, India s North- West Frontier(London:J.Murray,1939), 214-15 .

بروس دەگاتە ئەم ئەنجامە "ئەگەر ئێمە ناوی کوردەکان بگۆڕینە مەحسوودە وەزیرییەکان ئەوە ئەم باسە پڕ بە پێستی بارودۆخی ئەوانیشە."[34]

بەڵام ڕەنگە مەسەلەکە مشتومڕی ئەوە هەڵبگرێت کە سیستەمی کارگێڕیی تازە لە کوردستاندا ڕەنگە کاری خۆی کردبێت چونکە بەریتانیا هێزی تەواوی هێنابوو بۆ سەپاندنی. یان شێخ مەحموودی بۆ ئەو کارە بەدەستەوە بووە ، کە هۆکارێکی هەڵبژاردە بوو بۆ جێبەجێ کردنی سیستەمەکە و بەردەوام بوو لە هاوکاریی و هەماهەنگیی کردنیان. بە تەواوی ڕوون و بەڵگەنەویستە کە ئەم دوو گریمانەیە سروشتی بنەڕەتیی حاڵەتەکەی فەرامۆش کردووە. تا ئەم ڕادەی گرنگیی پێدانی بەریتانییەکان، دابینکردنی هێزی تەواو بۆ سەپاندنی سیستەمی کارگێڕیی نوێ دەبوو لە خۆیدا شکستخواردوو بێت. چونکە ئەوان بۆ ئەوەی پەنایان بردە ئەو سیستەمە ڕێك بۆ خۆلادان لە بەکارهێنانی هێزی مەزن لە ناوچەکەدا. بەریتانییەکان بەنیاز بوون، لەڕێگەی دامەزراندنی سیستەمێکی حکومیی پەسەند لە لایەن خەڵکەوە، ئەرکێکی گرانیان نەکەوێتە سەر کە زۆری تێبچێت. دەبێ ئەوەمان لە یاد بێت کە بەریتانیای مەزن لەو دەمەدا سەرگەرمی ئەوەبوو کە هێزەکانی لە میسۆپۆتامیادا زۆر ئەمسەر و ئەوسەر پێنەکات و بەو پێیەش نە هێزی مرۆیی و نە ماددیی لەو کاتەدا لەبەردەستدا نەبوو. مشتومڕ لەسەر ئەوەی سیستەمەکە دەبوو کاری خۆی بکات چونکە شێخ مەحموود هاوکار بوو بەڵام کارەکە لەوەدا بوو کە سەرکەوتن یان شکستهێنانی سیستەمێکی حکومەت کە پشت بە هەڵوێستی تاقە کەسێك ببەستێ ئەوە مانای وایە ئەو سیستەمە ڕاست نیە.

## دامەزراندنی شێخ مەحموود وەك حوکمدار:

بۆ ئەوەی زانیاری ئەو بارو دۆخەی لە کوردستانی باشووردا بە دەست بێنین و بەرچاو ڕوونییەکمان لە بارەی دۆخی بەریتانییەکان دەست بکەوێ لەو ناوچەیەدا، سێر ئارنۆڵد ویلسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنییی بە فڕۆکە چوو بۆ سلێمانی لە ١ی دیسەمبەری ١٩١٨ دا. لەم ماوەیەدا کۆبوونەوەیەك ساز کرا لەگەڵ نزیکەی شەست سەرۆك هۆزدا. سەرۆکەکان بە زۆری لە کوردستانی باشوورەوە هاتبوون بەڵام

---

[34] Bruce, 170-71.

ژمارەیەکیان لە ناوچەکانی سنە، سەقز و هەورامانی ئێرانەوە هاتبوون. گفتوگۆیەکی دووروودرێژ بە دوای کۆبوونەوەکەدا هات لە نێوان شێخ مەحموود و پیاوانی تردا و گەلێ تەوەرەی باری رامیاریی وتووێژی لەسەر کرا. ویلسن راپۆرتێکی لەسەر ناوەرۆکی ئەم گفتوگۆیانە نووسیوە. بە گوێرەی گوتەکانی ئەو کوردەکان بە بڕیاری بەرهەڵستیی گەڕانەوەی تورکەکانیان داوە کە دەستبدەنە چەک لە دژیان. هەرچەندە سەرۆکە کوردەکان دانیان بەوەدا ناوە کە بە شێوەیەك لە شێوەکان پارێزگاریی بەریتانیان پێویستە بەڵام وا پێدەچوو بە کۆی دەنگ نەگەنە رێکەوتن کە چۆن ئەو کارە بکرێت. هەندێك سەرۆك هۆز خۆیان وا دەردەخست کە کارگێڕیی بەریتانیان پێ پەسەندە لە کوردستاندا، بەڵام بەشێکیان دژ بەم پرۆژەیە بوون هەندێك پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە دەبێ کوردستان لە لەندەنەوە بەڕێوەببرێت نەك لە بەغداوە و لە دیدی ئەوانەوە لەندەن شوێنی ئەستەمبوڵی گرتووەتەوە . بە پێی گوتەی ویلسن بێت چەند کەسێکی کەم لەو سەرۆکە کوردانەی لەوێ کۆبوونەوە بە نهێنی بەمیان وتووە کە هەرگیز سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود قبوڵ ناکەن بەڵام بە گرنگییەوە ئەوەش دەڵێت کە ئەمانە نەیانتوانیوە لەجێی ئەو پێشنیازیی کەسێکی دیکە بکەن .[35]

لە پاش گفتوگۆیەکی زۆر شێخ مەحموود بەڵگەنامەیەکی داوەتە دەست ویلسن کە لە لایەن نزیکەی چل سەرۆکەوە مۆرکراوە و ناوەرۆکی بەڵگەنامەکە بەم شێوەی خوارەوەیە:

"حکومەتی خاوەن شکۆ جاڕی نیازی خۆی داوە بۆ ڕزگار کردنی میللەتانی ڕۆژهەڵات لە دەست ستەم و زۆری تورك و هاوکارییان بکات لە دامەزراندنی سەربەخۆیی خۆیاندا. بۆیە سەرۆکەکان وەك نوێنەری گەلی کوردستان تکا لە حکومەت دەکەن بیانخاتە ژێر پارێزگاری بەریتانیاو بیانبەستێ بە عێراقەوە و بێبەشیان نەکات لە سوود و خێراتی ئەو پێکهاتەیە. ئەوان داوایان لە کۆمیسیۆنی مەدەنیی میسۆپۆتامیا کرد نوێنەرێك بنێرێتە لایان لەگەڵ هاوکاریی و یارمەتیی پێویستدا تاوەکو گەلی کورد لە ژێر چاودێری

[35] A.T.Wilson,Loyalties,2:129,. Bell,Review of the Civil Administration,60-61,. E.J.R...10.

باسەکە تا رادەیەك لە هەرسێ سەرچاوەکەدا وەك یەکە هەروەها زانیارییەکانی تێکستەکە بە پلەی یەکەم پشت بە گێڕانەوەکەی ویلسن دەبەستێ و من هەندێ وردەکاریم لە دوو سەرچاوەکەی ترەوە وەرگرتووە کە لەوەی ویلسندا نەهاتووە

بەریتانیادا بتوانێ بە ئاشتیی گەشە بکات و پێشبکەوێت و ژیانی مەدەنیی خۆی بەرقەرار بکات. ئەگەر حکومەت هاوکاریی و پارێزگاریی خۆی بۆ ئەوان درێژە پێداوە و بەڵێن ئەدەن لە فەرمان و ئامۆژگارییەکانی دەرنەچن."[36]

لە وەڵامدانەوەی ئەم داواکارییەدا، ویلسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنیی نامەیەکی دایە دەست شێخ مەحموود کە جەخت و پشتیوانی دەکات لەسەر ئەو خاڵانەی لە دوکیومێنتەکەی ئەواندا هاتووە. لە هەمان کاتیشدا نامەکە دوا مۆری فەرمیی مەیجەر نۆئێلی چەسپاند لەمەڕ پێشتر دامەزراندنی شێخ مەحموود بە حکومداری باشووری کوردستان. من ئەمتوانی تێکستی تەواوی ئەم دۆکیومێنتەم دەستکەوێت کە بە ئاشکرا بنەمای یاسایی دامەزراندنی دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە باشووری کوردستاندا رادەگەیەنێت. هەر حاڵ دەکرێ ناوەرۆکی ئەم نامەیە لە ژمارەیەک خاڵدا کورت بکەینەوە:

"لە بەرانبەر دا شێخ مەحموود نامەیەکی دراوەتێ و ئەوەی تێدا هاتووە کە هەموو هۆزە کوردەکان لە زێی گەورەوە تا رووباری دیاله"سیروان" "ئەوانەی لێبەدەر کە لە خاکی ئێراندان"، بە تەواویی ئازادیی و خواستی خۆیان سەرۆکایەتیی شێخ مەحموودیان قبوڵە و ئەم نامەیەش پشتگیریی مەعنەویی ئێمە دەگەیەنێت بە دەستبەسەرداگرتنی ئەو ناوچانەی سەرەوە، لە جێی حکومەتی بەریتانیا، کە دەبێ فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێت."[37]

هەردوو بەڵگەنامەکە- ئەو بەیانەی کە لە لایەن سەرۆکەکانەوە مۆر کرابوو و ئەو نامەیەی ویلسنیش- هەریەک بە جیا یان پێکەوە وەریانبگرین بە رێکەوتننامەیەکی فەرمیی ناژمێردرێن لە نێوان دوو لایەنی وەک یەک و سەربەخۆدا. شێخ مەحموود یان سەرۆکە کوردەکانی تر هەرچۆنێک بیریان کردبێتەوە لەم رێکەوتننامە تازەیە، هیچ گومانی تێدا نیە کە بەریتانییەکان تەنیا بە رێکەوتنێکی سەرپێی لە قەڵەم داوە بۆ بە هەلومەرجێکی کاتیی. لەگەڵ جەمسەرێکە دەسەڵات بە دەستی خۆماڵییدا کە چەند ئامانجێکی کورتخایەن بێنێتەدی. لە هیچ شوێنێکی هەردوو بەڵگەنامەکەدا هیچ باسێکی روون و ئاشکرای سروشتی دەسەڵاتەکانی شێخ مەحموود نەکراوە.

---

[36] A.T.Wilson,Loyalties,2:129,.Bell, Review of the Civil Administration,61,. E.J.R.,.10.

[37] A.T.Wilson,Loyalties,2:129,.Bell, Review of the Civil Administration,61,. E.J.R.,.10.

له یەکەم بەڵگەنامەدا لە لایەن نزیکەی چل سەرۆک خێڵەکەوە مۆر کراوە و بە "نوێنەرانی گەلی کوردستان" خۆیان ناو دەبەن. کێشەکە لەوەدایە کە شێخ مەحموود و سەرۆکەکانی تری کۆبوونەوەکە بە ناوی گەلی کوردستانەوە قسەیان دەکرد. ڕاستییەکەی شێخ خۆی هەمیشە ئەوەی دەردەبڕی کە هێز و دەسەڵاتی ئەو هەڵقوڵاوی خەڵکی کوردە و ئەو دەمڕاستی هەموو کوردی ویلایەتی مووسڵە .

بەڵام وا دەردەکەوێت بەریتانییەکان ئەم سووربوونەیان بە ئیدیعایەکی بێ بنەما لە قەڵەم دابێت و ڕووی خۆیان لەم مەسەلەیە وەردەگێڕا. جێگری کۆمسیۆنی مەدەنیی نەک ئەمەی تەنیا پشتگوێ دەخست بەڵکو ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە دەسەڵاتی شێخ لە حکومەتی بەریتانیاوە. ڕاستییەکەی نامەکەی ویلسن بە ئاشکراییەکی ئازار بەخش ئەوە دەردەبڕێ کە تەنیا تا ئەو کاتە دەتوانێ پشتگیری بەریتانیا مسۆگەر بکات کە ملکەچی ئەوان بێت و بۆ ڕازەکردنی ئەوان هەڵسوڕێت .

لە سەردانەکەی ویلسندا بۆ سلێمانی گفتوگۆ لەسەر چەند مەسەلەیەکی تر کرا، وا باس دەکرێ کە شێخ مەحموود داوای کردبێت ئەفسەرە بەریتانییەکان بکرێنە بەرپرسی هەموو دام و دەزگاکانی حکومەت و ئەو هێزەی لیڤییەی کە نیازبوو دروستی بکەن، بەڵام ئەو مەرجەی داناوە کە بە پێی توانا کاربەدەستی لەوان خوارتر کورد بن نەک عەرەب .[38] خەڵکی شارەکان و عەشایەری کەرکووک و کفری ڕازی نەبوون بدەنە پاڵ حکومەتێکی پێشنیارکراوی وا بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود و لەبری ئەوە داوای ئیدارە دانی ڕاستەوخۆی بەریتانیایان کرد و شێخ مەحموودیش پێی لەسەر هاتنە پاڵی ئەوان دانەگرت .[39]

نوێنەرانی تیرە و هۆزە کوردەکانی ئێران کە داوایان کردبوو بخرێنە سەر حکومەتە سەربەخۆکەی شێخ مەحموود ئاگادار کرانەوە کە ئەوە کارێکی مەحاڵە و تێیانگەیاندن کە پابەندیی نێودەوڵەتی بەریتانیا ڕێگە بە حکومەتی ئەو وڵاتە نادات پشتگیریی پرۆژەیەکی لەو چەشنە بکات، بەڵکو داوایان لێکرا لەسەر ئێران بمێننەوە و پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ باشووری کوردستانی سەربەخۆدا بهێڵنەوە. ئەوانیش

---

[38] E.J.R...10,.A.T.Wilson,Loyalties.2:129,.Bell, Review of the Civil Administration,61..

[39] E.J.R...10,. A.T.Wilson,Loyalties.2:130,. Bell, Review of the Civil Administration,60-61..

قەناعەتیان بەو ڕوونکردنەوەیە کردو وایان دەربڕی کە ئەو بارودۆخەیان قبووڵە .[40]

مەیجەر نوئێل، کە بۆ هەولێر و ڕەواندز نێردرا بوو بە مەبەستی هاندانی تیرەو خێڵەکانی ئەو ناوە بۆ ئەوەی بچنە پاڵ حکومەتی کوردستانی باشوور بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود، لەم ئەرکەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. کوردەکانی ئەو ناوچانە وەك باسی دەکرا بە پەرۆش بوون هاوبەشی ئاشتیی و جیاوگی حکومەتەکەی شێخ مەحموود بکەن، کە بە خەیاڵدا دەهات لە ڕووی پارێزگاریی و مادییەوە بەریتانیای لە پشت بێت .[41]

پاشتر زۆری نەخایاند ئەفسەرانی ڕامیاریی بۆ کۆیەو ڕانیە دانران و سیستمی بەڕێوەبردنی سلێمانی پەلی کوتا بۆ ئەوێ و ناوچەی ڕەواندزیش. کاری سەرەکیی لە ڕەواندزدا بەرەنگاری بوونەوەی وێرانەی جەنگ بوو. ڕەواندز و ناوچە دێهاتییەکانی دەورو پشتی لە بارێکی زۆر خراپدا دەژیان لە ئەنجامی شەڕی یەك لەدوایەکی تورك و ڕووس و بەدوایدا گرانیی و برسێتیی و ڕشانەوە ڕووی لەو ناوچەیە کرد. هەنگاوی بە پەلە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخەکەدا نرا و لە هەولێرەوە پارە دانەوێڵەیان بۆ ڕەوانە کراو دەستکرا بە فریاکەوتنی برسێتی و هانی کشتوکاڵ کردن دراو کەمێك لە ئەزم و ئارامیی هاتە ئاراوە. ئەرکەکە لە ناوچە شاخاوی و دوورە دەستەکانی باکووری ڕەواندزدا فرە ئەستەم بوو .[42]

## شێخ دەسەڵاتی خۆی دەچەسپێنێت

شێخ مەحموود هەر لە سەرەتاوە بڕیاری دابوو هەموو ئەو ناوچانە بەهێز بکات کە وەك حوکمدار کەوتبوونە ژێر دەستی . بەم دید و بۆچوونەوە هەردەم لە پەلەقاژەی ئەوەدا بوو تەواوی دەسەڵات لە دەستی خۆیدا کۆ بکاتەوە. ئەو دەیویست دڵسۆزیی زۆرێك لە سەرۆك خێڵەکان مسۆگەر بکات لە ڕێگەی دابەشکردنی پارە و جیاوگەوە، هەریەکە بە پێی خۆی. بەکارهێنانی یارمەتی دارایی زۆر و زەبەند کە لە لایەن حکومەتی بەریتانیاوە بۆی ڕەخسێنرابوو و ئەو شێوازی دەسەڵات قۆرخکردنەی وەك حوکمدار بۆ چەسپاندن و

---

[40]E.J.R...10,. A.T.Wilson,Loyalties,2:129..Bell. Review of the Civil Administration.60-61.

[41] Bell, Review of the Civil Administration,60-61.

[42] Ibid.,61

بەهێز کردنی پێگەی خۆی لەنێو تیرەو خێڵەکاندا بە چاکی درکی پێدەکرێ لە لایەن بەریتانییەکانەوە. ڕاپۆرتێك کە لە ساڵی ١٩١٩ دا نووسراوە سەرنجی ئەوە ئەدا کە:

"هەروەها دڵسۆزیی بۆ شێخ مەحموود وەك حکومداری وڵاتەکە هەلومەرجێکی ڕەخساندووە کە بەهۆی پارەو ماڵی حکومەتی خاوەن شکۆوە لە یەك کاتدا ببێ بە کەسایەتییەکی بەناوبانگ و خاوەن ماڵ و دەسەڵاتێکی شاهانە. لەپاش ملکەچی و دڵسۆزیی خەلات و بەرات بە کاشی ئامادەیە ، کە لەو ڕۆژگارەدا دەگمەن بوو، بەپێی ئەو سیستەمە سەرەك خێڵ پارەی باشی دەست دەکەوێت و ئەوەی خێڵەکەشی بۆ خۆی لرف دەکات بێ ئەوەی چاری کار بەدەستێکی حکومەتی بەسەرەوە بێت ."[43]

شێخ، لە گەڕانیدا بۆ بەستنەوەی خێڵەکان بەخۆیەوە لە پاکژکردن و دەستبەسەرداگرتنی بەڕێوەبەرێتییە تازەکەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو پۆستی جۆراوجۆری بە خزم و ئاسیاوەکانی پڕکردەوەو بە زیرەکی هەموو ئەوانەی دوورخستەوە کە بە دڵسۆز و پشتیوانی لە قەڵەم نەدەدان .[44] ئەوانەی ملکەچ و سەر بەخۆی بوون هەموو پۆستە گرنگەکانیان لە حکومەتە نوێکەدا قۆرخ کردبوو. بەم ڕەنگە سەرۆکی پۆلیسی سلێمانی و قازیی دادگای سلێمانی و ئەوانیتریش لەلایەن شێخ خۆیەوە دانرابوون .[45] تەنانەت لێڤیی کورد کە هێزێکی کاریگەر بوو لە سەروبەندی پێکهێنانی حکومەتی کوردستانی باشووردا دامەزرابوو دەبوو سوێندی دڵسۆزییان بۆ شێخ مەحموود خۆی بخواردایە .[46] شێخ سوودی لە کەش و هەوای دەرکەوتنی تاك دەبینی. بەریتانییەکان پێویستیان بە پشتگیریی ئەم بوو وەك چۆن ئەمیش

---

[43] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919,2,9-10.

[44] Ibid. Cf. Bell, Review of the Civil Administration,64.

[45] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919,2,9-10.

[46] نەك تەنیا لێڤییەکان بەڵکو کاربەدەستە فەرمییەکانی کارگێڕیی نوێ دەڵێن گوایە سوێندی پشتگیرییان بۆ شێخ مەحموود خواردووە بە گوێرەی قسەی بێل "لێڤییە کوردەکان لە لایەن ئەفسەری کوردەوە سەرکردایەتیی دەکران و ئامادەی پشتگیریی شێخ مەحموود بوون و خۆیان بە قەرزاری ئەو دەزانی لە دامەزراندنیاندا.": بڕوانە:

Less, "Tow Years in Southern Kurdistan ,"254,.Bell, Review of the Civil Administration,64.Cf. A.T.Wilson,Loyalties,2:135.

پێویستی بەوان بوو. بێل دەگێڕێتەوە کە:

"بە بێ ئەو هاوکاریی و یارمەتییەی ئەو دەبوو پێگەیەکی سەربازیی بەهێز دامەزرێنین، کە لەو دەمەدا لە تواناداا نەبوو ئەو کارە بکەین. لە دید و بۆچوونی رامیارییەوە بایەخێکی گەورەی هەبوو ئێمە بتوانین یاسا و ئیزلم لەو ناوچەیەدا بپارێزین و لە هەمان کاتیشدا خۆ لادەین لە بەکارهێنانی هێز بۆ ئەو مەبەستە."[47]

هەڵبەت شێخ مەحموود بە ئاگا بوو لە ڕۆڵ و بایەخی خۆی بۆ بەریتانییەکان. ئێمە نازانین تا چەند بڕوای هەبوو بەوەی کە پشتی دەگرن، بەڵام ئەو هیچ کاتێ بێ دوودڵیی گوزارشی لەوە دەکرد کە "ئەوان ئامادەبوون بۆ دامەزراندنی حوکمدارێتییەکەی و ئەگەر پێویستی بکردایە هێزیان بەکار دەهێنا."[48]

بەپێی پێویستیی ئەو کات وساتە کەسانی کاریگەریی تایبەت لەو بەڕێوەبەرێتییە تازەیەدا دەیانتوانی هەر بەرهەنگارییەک ڕابماڵن ئەگەر ڕێی لە فراوانخوازیی دەسەڵاتی شێخ مەحموود بگرتایە. کورد کە زۆری بە دەست شەڕو شۆڕەوە چەشتبوو تامەزرۆی حەوانەوە و پشوودان بوو، هەروەها بەریتانییەکانیش کە هێز و دەسەڵاتێکی نوێ بوون لەو خاکەدا، واپێدەچوو بڕیاریان دابێت سوود و قازانجی بەڕێوەبەرێتییەکەیان پەرەپێبدەن لە ژێر سایەی سەرکردایەتی شێخدا. بەم ڕەنگە بەرهەنگاریی خەفەکرابوو و ڕژێمی تازە لە سەرتاپای هەرێمەکەدا قبووڵ کرابوو تا ڕادەیەک بێ بەرهەڵستی مێجەر سۆن باسی کاردانەوەی کوردەکان دەکات لە ئاست دامەزراندنی حکومەتی نوێی شێخ مەحموودا:

"هیچ کاتێک کوردەکان هێندە بۆ ئاشتیی پەرۆش نەبوون ، چونکە ئەوەندەیان نەبوونیی و نەداریی چەشتبوو کە ئامادە بوون بۆ مۆر کردنی هەر دوکیومێنتێک یان پەسەندکردنی هەر ڕاگەیاندنێک بۆ ڕەخساندنی ئارامیی و خۆراک. بەم جۆرە هۆز لە دوای هۆز کە تا ئەمڕۆ شێخ مەحموودیان نەناسیبوو یان لە باشترین حاڵەتدا وەک ئەوەی پیاوچاکان ناسیبوویان، کەچی دوعایان دەکرد بخرێنە ژێر دەسەڵاتی حکومەتە تازەکە "بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود"،ئەو بڕگەیەی واتێدەگەیشتن کە حکومەتی بەریتانی بۆ مەبەستی خۆی

[47] Bell, Review of the Civil Administration,63.Cf. A.T.Wilson,Loyalties,2:135.

[48] A.T.Wilson,Loyalties,2:135.

دایتاشیوە."[49]

## ڕەخنە لەو سیستمە خێڵەکییەی کە لە کوردستانی باشووردا پەیڕەو کرا

مەیجەر سۆن، لە ڕاپۆرتێکی فەرمییدا بە توندیی ڕەخنە لەو سیستەمە نوێیەی کارگێڕییە دەگرێت. لە بڕگەیەکدا لەژێر سەردێڕی "سەرنج لەسەر سیستمی خێڵەکیی بەڕێوەبردن" دەستنیشانی لایەنە خراپ و زیانبەخشەکانی سیستەمە تازەکە دەکات و خاڵ بە خاڵ خراپییەکانی باس دەکات. لە بڕگەی یەکەمدا باسی مەبەست و چاوەڕوانیی سەرکردە دەکات و هیچ بوارێکی گومانی نەهێشتەوە کە بەریتانیا پێشنیازیی سیستەمەکەی کردووە و پشتی گرتووە و شێخ مەحموود وەك ئامێرێك دانراوە بۆ جێبەجێ کردنی و هەردووکیان بە پێچەوانەی یەکتر هەڵدەسوڕێن.

"سیستمێکی بەڕێوەبردن کە دەکرێ ناوی لێبنێی سیستمێکی خێڵەکیی پەیڕەو کراوە. ئەمە لە لایەن ئەفسەری سیاسیی بەرپرسەوە وا دانراوە ئاسوودەییەکی نەتەوەیی بێت و کەسایەتیی وخاسیەتی کوردستان بپارێزێت ئەمە ئارەزووی شێخ مەحموود بوو بۆ دامەزراندنی سیستمی خێڵەکیی، واتە لەم ڕێگەیەوە بە ئاسانی دەیتوانی بەرتیل بداتە سەرۆك خێڵەکان یان هەڕەشەیان لێبکات و زیاتر کۆنترۆڵ لە دەستی خۆیدا کۆبکاتەوە و خێرا پێگە و دەسەڵاتی ڕەها بە دەستبێنێ کە مەبەستی بوو پێی بگات. سیستمی حوکمکردنی ڕاستەوخۆ لەلایەن کاربەدەستانەوە کە بەشێوەیەکی سروشتی بەلای تێکشکاندنی تیرە و خێڵدا دادیدەشکێنێ و دەخوازێ کۆمەڵگایەکی دیموکرات و تەبا لە ڕەنجدان و کارکردندا دامەزرێنێ و ئەمەیان ئەو نەیدەخواست. ئەو وەك ڕاوێژکاری سەرەکیی ئەفسەری ڕامیاریی هانی بووژانەوەی سیستمی خێڵەکیی دەدا– کە لە سلێمانیدا – لە سەرەمەرگدا بوو."[50]

هەرچەندە زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە سۆن زۆر ڕقی لە شێخ مەحموود بوو و خۆیی بۆ مەلاسدابوو لە داهاتوودا پێی بڕێژێت بەلام هێشتا هەر سیستەمەکە و ئەوانەشی

---

[49] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner. Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919.2,emphasis in original.

[50] Ibid.,3.

که لایان پەسەند بوو بێ دەسکاری مابوونەوە . لەوەدوا لە هەموو پەیوەندییە فەرمییەکانی تریشدا سۆن هەرگیز قسەی نەدەخواردەوە و نە پێداویستی فەرمیی نەریتی ڕەفتارکردن و نە ترس لەوەی دیسپلینی کاروبار دەشێوێنێ، هیچیان نەیانتوانی زمانی ئەم کابرایە نەرم بکات یان هەڵوێستی چاك بکات .[51]

سەبارەت بە هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا و سەرۆکە کوردەکە ، سۆن دێتە سەر باسی پرۆسەکە و خراپیی ئەم سیستەمە نوێیە کە بەدیدی ئەو پەرپووت ، دواکەوتوو و بێکەڵکە :

"بووژاندنەوەی سیستمی خێڵەکیی بزووتنەوەیەکی پێچەوانەو پاشگەزبوونەوەیە. ئێستا کوردستان بە شێوەیەکی فراوان لە خێڵگەرێتی دەرچووە و ئاستێکی بووژانەوەی تێدا هاتووەتە ئاراوە و لە فرە ڕووەوە چووەتەوە دۆخی پێش جەنگ. ئێستا ئەفسەری رامیاریی دیدو بۆچوونی شێخ مەحموودی قبووڵ کردووە کە تەواو وزەو توانای تەرخان کردووە بۆ دووبارە گێڕانەوەی خێڵگەرایی. هەر پیاوێك نازناوی هۆز یا خێڵی پێوەبێت خراوەتە ژێر ڕکێفی سەرەك خێڵێکەوە. بیرۆکەکەبوو کە باشووری کوردستان دابەش بکرێت بەسەر ناوچەکانی خێڵدا و بخرێتە ژێر ڕکێفی سەرۆك خێڵەکانەوە. پیاوانی دێهاتنشینی بێکەڵك و گەمژەیان دۆزیوەتەوە و بە سەرۆکی ئەو خێڵانەیان داناون کە دەمێکە پووکاونەتەوە و لەناوچوون. بە دەستەو تاقمی خانوونشینی ناوچە گەرمیانی لای کفرییان وتووە کە یەکگرنەوە و وەبیری خۆیانی بخەنەوە کە ڕۆژگارێك خەڵکی خێڵەکیی بوون و سەرەك خێڵیان بۆ دۆزراوەتەوە. باج و خەراجی داهات دەبوو بە پێی خەمڵاندنی ئەم سەرەك خێڵە بدرێت. دەبوو ئەم سەرەك خێڵە کارگێڕیی یاسا بدات ، کە تەنیا دەبوو دانی بەوەدا بنایا کە شێخ مەحموود حکومداری "ستەمکاری چاککراو " ی کوردستانە ، لە بەرامبەر دا خەڵات و یارمەتیی وەربگرێت. ژیانی خۆش بۆ پیاوی عەشایەر بەڵام مردن و فەوتان بۆ بازرگانیی

---

[51] بۆ ویناکردنیی کەسایەتیی سۆن و قسەی ڕەقی هەمیشەیی لە نووسینی ڕاپۆرتدا "زۆر جار بە زمانی زبر و بێڕێزیی دەینووسی بڕوانە :

A.T.Wilson.Loyalties,2:82-83..also Sir Arnold Wilson ."E.B.Sone-A Memoir ," in To Mesopotamia and Kurdistan , by E.B Sone ix-xvii(London: Jhon Murray 1926).

وشارستانییەت و ئارامیی. ئەمە هەر وابوو و تۆماری جێگری ئەفسەری رامیاریی لە سلێمانی شەڕیکی سەخت و درێژخایەن دەخاتە ڕوو دژ بە ئەنجامە سروشتیەکانی سیستەمەکە. تاوانبارێکی خێڵەکیی خۆی فڕێبداتە بەر پێی سەرۆکەکەی، گوناهکارێکی گەورە کوڕنۆش بۆ شێخ مەحموود ببات دەبەخشرێ و تەنانەت بەر سۆز و خۆشەویستیش دەکەوێت. هەر جۆرە بەدکاریی و تاوانێك دەکرێ ببەخشرێت ئەگەر بەرزبکرێتەوە بۆ شێخ مەحموود کە دەستبەجێ کارەکە لەگەڵ ئەو بە ناو سەرۆك عەشیرەتەی گوناهکارەدا چارەسەر دەکات. خەڵکی وڵاتەکە بە جارێ نائومێدبوون، دەست و قاچیان دەبەسترێت و دەخرێنە بەر دەستی ئەو سەرەك خێڵانەی بوون بە خاوەن دەسەڵات بۆ ئەوەی ستەمیان لێبکەن و لە خوێندا بیان گەوزێنن ."[52]

ئەنجامی چوونە ناو ئەم سیستەمەوە سەپاندنی ڕژێمێکی گەندەڵی ستەمکار بوو بەسەر خەڵکەوە. سۆن بە چاکی ڕەوتی بەدکاریی و بێدادیی ئەم ڕژێمە باس دەکات:

"سیستەمی خێڵەکیی سیستەمێکی ئایدیالیستە و وەك گەڵێ پرۆژەی لەو چەشنە هەڵدەوەشێتەوە کاتێ پەیوەندیی لەگەڵ بێرێزکردنی مرۆڤدا دەگرێت. کاریگەریی ئەو لە بەرەڵایی و بێیاساییدایە . خەڵکی دەرفەتی ئەوتۆیان نیە بۆ سەرفراز بوون و ڕزگاربوون لە ستەمکاری ئاست نزم و بە کورتی ئەم سیستەمە بوو بە چاودێر و باوکی خەڵکی خراپ و زیانبەخش و سەرکوتکەری کەسانی دیموکرات ."[53]

سۆن باس لەوە دەکات کە ئەفسەرە سیاسییەکانی بەریتانیا ناتەواویی و کۆسپی ئەم سیستەمەیان دۆزیوەتەوە، هەروەها ڕاپۆرتێکی گواستووەتەوە کە لە لایەن کاپتن لۆنگریگ "دواتر بووە بە بریگادێر" یاریدەدەری ئەفسەری رامیاریی لە کەرکووك بەرزکراوەتەوە، لە ڕۆژی ٢٩ ی نۆڤەمبەری ١٩١٨ دا. کورتەی ڕاپۆرتەکەی لۆنگریگ ئەوەیە کە سەرەڕای قبوڵ کردنی ئەم سیستەمە لەلایەن ژمارەیەکی زۆری کوردەوە، بەڵام تەنیا بۆ ئەو گونجاوە ببێتە مایەی نیگەرانی ئەو کەسانەی کە بە بێکەڵکی دەزانن. هەروەها سەرنجی ئەوەش دەدا کە ڕەنگە هەندێك تا ئەوساتە لێی نارەحەتبن کە حەز بکەن ئەفەندییە کۆنەکان دواتر کاربەدەستانی تورك بگەڕێنەوە. لەوەش زیاتر، لۆنگریگ ترسی ئەوە دەردەبڕێ کە کورد لەژێر سایەی ئەم سیستەمە

---

[52] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner. Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919,3.

[53] Ibid.

نوێیەدا ڕەنگە بیسەلمێنن کە وەک ستەمکارێک یەکسان بن لەگەڵ تورکدا.[54] تەنانەت پرکێشیی ئەو ڕایەش دەکات کە ئەم ڕژێمە نوێیە ڕەنگە لەلایەن جووتیارانەوە بدرێتە دواوە. دواجار دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە "ئەمە بە ئاشکرا دیموکراسی دەکاتە قوربانی نەتەوەیی، جا باشتر بێت یان خراپتر. کارێکی ئاسانە، با خۆشیشی نەبێت کەم بێت لە ئاست هاواری ڕاستەقینەدا دژ بە کاری هەڵبژاردەی خۆمان.[55]

لەڕاپۆرتێکی تردا کە مانگێک پاشتر لە "دیسەمبەر-یەنایەری ١٩١٨-١٩١٩"دا لۆنگریگ بەرزیکردووەتەوە، دیسان مشتومڕ لەسەر سیستەمی خێڵەکیی دەکات و وەک ئەزموونێك بۆیدەگێڕێتەوە. پاش ئەوەی تێبینی ئەو مەترسییانە دەکات کە پەیوەندیدارە بەوەی خەڵکی خێڵەکیی بخرێنە بەر ڕەحمەتی سەرۆك خێڵەکانیان و باس لە سوود و قازانجێك کە لەم سیستەمە بەدەستدێت. بە پێی بۆچوونی ئەو سیستەمەکە چاودێری هەستی نەتەوەیی دەکات لای کورد و کەسی خێڵەکیی لە گەندەڵی و کاریگەریی خراپی کاربەدەستان دووردەخاتەوە و ژمارەی گوناهکارانی دژ بە دادپەروەری و ئازادیی کەمدەکاتەوە.[56]

کارێکی باشە ڕای ئەفسەرێکی بەریتانیی تر ڕەچاو بکەین سەبارەت بە سیستەمی نوێی کارپێکراوی خێڵەکیی. ئار.ئێس.جاردین R.S Jardine کە لەو دەمەدا یاریدەدەری ئەفسەری رامیاریی بوو لە کفری لە ڕاپۆرتێکیدا دەڵێ:

"سیستەمی خێڵەکیی قەزا لە بارێکی هەڵوەشاندنەوە و لەناوچووندایە و ئەمە پرۆسەیەکە لەلایەن سیاسەتی تورکەوە چاودێریی دەکرێت لەدەمی حوورییەتەوە.[57] لە هەندێ حاڵەتدا کوێخای گوند کەس بە سەرووی خۆی نازانێ ئەفسەری سیاسیی لێبەدەر. ئەمە وا دێتە بەرچاو کە ئاسانکردنی کاری کۆکردنەوەی داهات بێت، بەڵام وا لە ئیدارە دەکات کە لە ڕووی دادپەروەری و یاساو ئیزامەوە قورسایی زیادی بکەوێتە سەر وەک لەو شوێنانەی سیستەمی خێڵەکیی لە شێوازی سەرەتاییدا خۆی دەنوێنێ. لە چەندین شوێنی ئەم ناوچەیەدا

---

[54] Longrigg cited in ibid., 304.

[55] Ibid .,4.

[56] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Kirkuk Division for the Year 1918,( Baghdad Government Press, 1919) ,432.

[57] حوورییە عەرەبییەو واتای ئازادیی یان سەربەستیی دەگەیەنێت. ئەمە چەمکێکە دەگەڕێتەوە بۆ سەروبەندی ریفۆرمی دەستووریی لە دوای ڕووخاندنی سوڵتان عبدالحمید لەسەر دەستی تورکە لاوەکان.

من توانیومە وا لە سیستەمی خێڵەکیی بکەم بەر پرس بێت لە قانوون و نیزلم، بەڵام هەموو هەوڵەکان بۆ بەکارهێنانی ئەو سیستەمە لە داهات کۆکردنەوەدا تەنیا بووە بە مایەی دولخستنی بنپاساوی کۆکردنەوە یان مامەڵەی نا عەدالەت و نا بەجێ لەگەڵ فەلاحدا "واتە جووتیار". بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی خێڵەکیی بە تاقیکردنەوەیەکی باشی دا دەنێم."[58]

لەم راپۆرتەوە تێبینی ئەوە دەکرێت کە تەنانەت ئەو ئەفسەرە رامیاریانەش کە وەك سۆن بەو توندییە بەرهەڵستیی سیستەمی خێڵەکییان نەکردووە بەڵام ئەمانیش بەگومانیی خۆیانیان لە ئاست دادپەروەری و حیکمەتی کارپێکردنی. بێگومان بەریتانییەکان وەك هۆکارێکی کاتی پەنایان بردووەتە بەر سیستەمی خێڵەکیی دەربڕیوە. بە نەبوون و دەست نەکەوتنی ژمارەی گونجاوی کارمەندی ئەزموونداری بەڕێوەبردن و هێزێکی گەورەی کارامە کە بتوانێ مامەڵە لەگەڵ ئەرکی پارێزگاریی یاسا و نیزامدا بکات لە ناوچە تازە داگیر کراوەکاندا، بۆیە ناچار دەبن سیستەمێکی حوکمەت دابهێنن کە بتوانن لە ڕێگەی بەکەر خستنی ژمارەیەکی کەمی ئەفسەرانی خۆیانەوە و بە سەرپەرشتیی کارگێڕیی ئەوان کارەکان هەڵسوڕێنن.

بەریتانییەکان پێویستیان، یان وای لێکردەدەنەوە کە پێویستیان بە پشتگیریی سەرکردە خۆماڵییەکان هەیە، بەشێوەیەکی هێندەخراپ کە بێ دوو دڵی تاپەڕی ئەو پەڕ دەڕۆن بۆ ڕازیکردنیان. لەپێناوی مسۆگەر کردنی هەماهەنگیی و هاوکارییاندا، کاربەدەستە بەریتانییەکان زۆر دوور دەڕۆن تا ئاستی ملکەچکردن و مامەڵەی نارەوا لەسەر حیسابی خەڵکەکە بەگشتی. زۆرێك لە سەرکردە خێڵەکییە دەسەڵاتدارەکان و خاوەن موڵکەموڵەسەندەکان هەلیان بۆ ڕەخساوە زەویوزار بکەنە موڵکیان و هیچ ناونیشانێکی ڕوونیشیان نییە. ڕاستیێکەی لەزۆر حاڵەتدا ئەوان هیچ مافێکیان لەو زەوی و زارەدا نییە کە لەژێر دەستیاندایە بەدەر لەوەی کە بە زۆر داگیریان کردووە. بیلێ، ئەم کێشەیە لەچەند دێرێکدا ڕوون دەکاتەوە:

" لە یەکەم جارەوە دڵەڕاوکێیەکی تایبەتی لەناو ئاغاکاندا پەیدابوو لە ترسی ئەوەی کە داگیرکردنی بەریتانییەکان دەبێ ئەو پرسیارەی بەدوادا بێت چەشنی خاوەندارێتی زەوی کە لە زۆربەی حاڵەتدا هیچ مافێکیان بەسەرەوە نییە بە زۆر داگیرکردنی نەبێت. هەر چەندە تولناو

---

[58] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Kirkuk Division for the Year 1918,1,417.

دەسەڵاتی ئاغاو سەید لەگەڵ بەرژەوەندیی ڕەشمەخەڵکدا یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام لەو دەمەدا مەحاڵ بوو بەریەستیان بۆ دابنێی. بۆ هێورکردنەوەو ڕەواندنەوەی مەترسییەکانی چینی فەرمانڕەوا تۆماری تاپۆ نەنێردرا بۆ بەغدا، کە دەبوو وردبینی تێدا بکرایەو لەبری ئەوە ڕێگەدرا کە بەشێوەیەکی کاتی لە سلێمانی بمێنێتەوە."[59]

لەبەر تیشکی پەرەسەندنەکانی دواتر، دەرکەوت ئەم جیاوگاتانە بە تەواوی بێسوودن، لەبەرئەوەی گەلێك لەوانەی ئەم خەڵات و بەراتەیان درایە دواترو پاش چەند مانگێك لە دژی بەریتانیا هەستان.

## تێکچوونی پەیوەندیی نێوان شێخ مەحموودو بەریتانییەکان

### بێزاریی شێخ لە کۆت و پێوەندەکانی بەریتانیا:

ئەمێستا شێخ مەحموود ئەو پێگەیەی بەدەستهێناوە کە بەپەرۆشەوە هەوڵی بۆ داوەو ئەو ڕاستییەی نەدەشاردەوە کە هەموو جیاوگێکی ویستووە بەڵام ملی بە هیچکام لەو پابەندییانە نەدا کە هاوشانی جیاوگەکان بوون . لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیی دامەزراندنی وەك حوکمدار هەندێ بارودۆخی تایبەتی هێنایە پێشەوەو واپێدەچوو حیسابی دەسەڵاتە بێسنوورەکەی خۆی بۆ دەکردن. ئەو ناوچەیەی بۆی هەبوو ئیدارەی بدات سنوورەکەی لە نێوان زێی گەورەو ڕووباری سیرواندا بوو وە دەسەڵاتی ئەویش وەك فەرمانڕەوایەك بەتەواوی کورتکرابووەوە بەوەی سەر بە بەریتانیایە. شێخ نەیدەویست ئەوە پەسەند بکات کە بە کۆیلەکردنێکی ئەنقەستی لەقەڵەم دەدا بۆ تەگەرەدان لە دەسەڵات و کاریگەریی ئەو و دەستوەردان لە ئازادیی کارکردنیدا.

ئیدمۆندز لە نووسینێکدا چەندین ساڵ دوای ئەم ڕووداوانە باس لە کاردانەوەی شێخ مەحموود دەکات بەرانبەر بەو کۆت و سنووردانانەی خستبوویانە سەردەسەڵاتەکەی ، سەرنج ڕادەکێشێ بۆ سەرجەمی بارودۆخەکە کە بۆ سروشت و نەقڵییەتی کەسێکی وەك شێخ مەحموود نەگونجاو و پەسەند نەکراو بووە . "ئەو زۆر بە سنووردارکردنی دەسەڵاتەکەی بۆ ئەو ناوچانەی دیاریکرابوون بێزاربوو. تەنانەت لە

---

[59] Bell. Review of the Civil Administration,63.

سەردەمی تورکیشدا ئەو وەك هاولاتییەکی کاربەدەست لە ڕێگەی دەستوپێوەندەکەیەوە ترسی خستبووە دڵی شارەوە، کەچی ئێستا بە فەرمیی حوکمدارە تێناگات لەو گرفت و کۆسپانەی خراونەتە بەردەمی ، تەنانەت لەلایەن دەستەی ڕاوێژکاریی نۆنێلی لە سەرخۆو میانڕەویشەوە ."[60]

بێل، گومان ناهێلێتەوە لە هەڵوێستی شێخ مەحموود سەبارەت بەم مەسەلەیەو جەخت لەوە دەکات کە ئەم هەڵوێستەی شێخ لەژێر کاریگەریی توندی پیاوەکانی دەوروپشتیدا بوو. بە پێی قسەی بێل، ئەم پیاوانە لە جێی ئەوەی هانی بدەن بۆ گفتوگۆیەکی هێمنانە و لە سەرخۆ. دنەی ئەوەیان دەدا هەڵوێستێکی ڕەق و ڕکابەرانە وەربگرێت.

" شێخ مەحموود ئامادە نەبوو کەمتر لە تورکمان لێ پەسەند بکات و هیچ سنوورێك بۆ دەسەلاتی دابنێن. کۆمەڵێك کەسانی خۆپەرست و خۆبەرەپێش دەوریان دابوو و مێشکیان پڕکردبوو لە ئایدیای پەڕگرو نادروست و خستبوویانە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی کە فەرمانڕەوای تەواوی کوردستانە . ئەو بەردەوام دەستی دەخستە کاروباری کارگێڕیی و دەزگاکانی بەڕێوەبردنی پڕکردبوو لەخزمی خۆی و کەسانی مفتەخۆر ."[61]

وێڕای ئەوەی شێخ مەحموود دڵی بە پشتگیریی و یارمەتییدانی بەریتانیا خۆش بوو، بەلام بە ئاشکرا بڕیاری دابوو مل بۆ هیچ ڕێگرییەك کەچ نەکات. سەرەتا بە ئاگادارییەوە خۆی پیشان دەدا پێداویستیەکانی سیاسەتی بەریتانیا جێبەجێ دەکات، بەلام پێنەچوو بڕیاری خۆی دابێت کە بەڕێگەی تایبەتی خۆی شوێن ئامانجەکانی بکەوێت. بەم ڕەنگە هەموو توانای خستەگەڕ بۆ بەهێزکردنی دەسەلاتی و فراوانکردنی کاریگەریی لە سەرانسەری کوردستاندا، بێگوێدانە ئەوەی بەریتانییەکان چۆن بیردەکەنەوە و چیدەکەن . لە ماوەیەکی ڕێژەیی کەمدا توانی سەرکەوتن بەدەستبێنێت لە پترکردنی هێزو دەسەلاتیدا و فراونکردنی کاریگەریی بۆ ئاستێك کە بەریتانییەکان هەستیان کرد ناچارن هەندێك کاری بە پەلە بکەن بۆ ئەوەی ڕایبگرن پێش ئەوەی بارۆدۆخەکەیان لە دەست دەربچێت.

---

[60] Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,30.

[61] Bell, Review of the Civil Administration,63.Cf. E.J.R.,13.

هێشتا مانگێك بەسەر دامەزراندنی شێخ مەحموودا وەك حوكمدار لەلایەن جێگری كۆمیسیێونی مەدەنییەوە تێپەری نەكردبوو كاتێ بەریتانییەكان بەخۆیان زانی كەناچار بە پێداچوونەوەیەكی كاریگەر بە تەواوی كاروبار یان لە باشووری كوردستاندا بوونەتەوە . دوو تێكستی وەك یەكی دوو راپۆرتی فەرمیی ئەوە دەچەسپێنن كە " لەكۆتایی مانگی دیسەمبەردا نیگەرانیی و گومان سەریان هەڵدا كە ئایا نەقڵ پەسەندی دەكات رێگە بە زیادبوونی دەسەلاتی شێخ مەحموود بدرێت بەم رادەیە گەورە بێت و پەرەبستێنێت ."[62]

رەنگە مەسەلەكە جێی سەرسوڕمان نەبێت و تەنانەت دژواریش بێت كە بەریتانییەكان هێند بێزاربن لە گەشەكردنی هێزو دەسەلاتی پیاوێك خۆیان پشتیان گرتبێت و یارمەتیان دابێت ودەسگرۆییان كردبێت كە بكرێتە فەرمانڕەوای حكومەتێكی كوردیی نیمچە سەربەخۆ. تا ئەو ئاستەی ئەم مشتومڕە پەیوەندیی بەو مەسەلەیەوە هەبێت، مەسەلەیەكی بنەڕەتی نییە بڕیاری ئەوە بدەیت ئاخۆ شێخ مەحموود لەم پێگەیەیدا قەرزاری بەریتانییەكانە و ئەگەر وابوو تا چ رادەیەك . ئەوەی بایەخدارە ئەوەیە كە شێخ چۆن بیر لەم بارە دەكاتەوە. راستییەك هەیە كە شێخ مەحموود بەریتانییەكانی بە خاوەن چاكەو پیاوەتی بەسەرخۆیەوە نەدەزانی و بەم پێیەش هەستی نەدەكرد چاولەبەریانە و دەبێ هەتا هەتایە دڵسۆزیان بێت و لەمامەڵەكردنیاندا وا دەردەكەوت سیاسەتێكی هەلپەرستانەی گرتبێتەبەر. ئەو سوودی لەو یارمەتییە مادی و مەعنارییانە دەبینی كە دەیاندایەو ئەم پەیوەندیی و مامەڵەیەی بە قازانج بوو.

شێخ مەحموود بە هەڵپە بۆ زێدەكردنی تواناو دەسەلات و فراوانكردنی كاریگەریی خۆی هەوڵی دەدا ، نەك تەنیا لە سنووری كوردستانی باشووردا، بەڵكو لە هەر شوێنێك بۆی بلوایە دەیكرد. ئەگەرچی لەڕاستیدا ئەو بەدوای تێكدانی پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیادا نەدەگەڕا بەڵام لەمەودوا كەمتر گوێی بەرازییكردنی رووكەش دەدا و بە ئاشكرا سەرگەرمی بەهێزكردنی پێگەی خۆی بوو ، لە هەمان كاتیشدا گاڵتەی بە رێككەوتننامەكانی دەمەات لەگەڵ بەریتانیادا و راسپاردەی ئەفسەرە رامیارییەكانی پشتگوێ دەخست . وا پێدەچێت گەیشتبێتە ئەو ئەنجامەی كە شتێكی ئەوتۆ نەماوە بە

[62] E.J.R.,12; Also Bell, Review of the Civil Administration,63.

دەستبێت لەڕێگای هاوکاریی زیاترەوە لەگەڵیاندا. سەرباری ئەوەش وای بۆ دەچوو کە هێند بەهێزبووە بەریتانەییەکان ئەوێرن بەرەنگاری ببنەوە و بەگژیدا بچن و بەوپێیە چی بخوازێ دەیکات و کەسیش چاری ناکات . سەیر لەوەدایە کە شێخ مەحموود، وا بە پەلە و پاش قۆرخکردنی دەسەڵات، کۆمەڵێك کار و کردەوە بکات لە ناکۆکیی و ململانێ لەگەڵ بەریتانییەکاندا تێوەگلێت . لەبەر هەر هۆیەك بووبێت کە ڕەنگە ویستبێتی خۆی لە وابەستەیی بەریتانییەکان دەرباز بکات . گومانی تێدا نییە کە لە کارەکەیدا پەلەی کردووە و تەکتیکی نەبووە و لە خۆپارێزیی لە ململانێیەکی نابەرابەر فرە بیری نەکردووەتەوە . کاربەدەستە بەریتانییەکانی حکومەتە ئۆتۆنۆمەکەی باشووری کوردیی لە هەڵسوکەوتی شێخ پەشۆکاو و نائومێد و تووڕە بوون . ئەمانە هەرگیز لێی نابوورن چونکە زۆر بەرەقیی ئومێد و چاوەڕوانییانی بەبادا و هەرکاتێك ناوی بێنن لێی پڕن و دانی خێری پێدانانێن و لە باشترین حاڵەتدا ئەگەر زمانیان سەبارەت بەو بەخێر بگەڕێ دەڵێن پیاوێکی شێت یان منداڵانە بوو.

ساڵی ۱۹۲۸ و لە هەوڵێکدا بۆ دۆزینەوەی ڕوونکردنەوەیەك لەبارەی ئاکارو هەڵسوکەوتی شێخ مەحموودەوە (جی. ئێم. لیس) حوکمێکی سەخت بەسەر کەسایەتیی شێخدا دەدات:

"ناوبانگی خراپی شێخ مەحموود لەسەر مەسەلەی پارەو فڕوفێڵ زۆر باش زراوە، بەڵام بەرژەوەندییەکانی لەگەڵ ئێمەدا هاوجووت بوو بۆیە دەرفەتی نەبوو چیتر درۆمان لەگەڵ بکات . بەداخەوە زۆر بەرەهایی متمانەی پێکراو فرە ڕێگەی پێدرا کۆنترۆڵی پارەو پوولی پارەتییە قەبەکەی بکات. ئەو هەر زوو قۆرخکردنی دەسەڵات و پارە لەخشتەی بردو کەڵکەڵەو خولیای لەو سنووڕە تێپەڕی کە بۆی دیاریکرا بوو و لە دواییدا خۆی بەشای کوردستانێکی یەکگرتوو و سەربەخۆ دەزانی."[63]

ویلسن، لەبارەی شێخ مەحموودەوە دەڵێ: "لەنەزانییدا، نەك لە پاکیی و بێتاوانییدا، لە منداڵێك دەچوو، بەخولیایەکی گەورە و سروشتێکی فێڵبازانەی زۆرەوە. ئەو خاوەنی سۆزێکی بەلێشاو و لەهەمان کاتیشدا دڵڕەقییەکی بێپایان بوو و وەك سۆن

[63] Less. " Two Years in Southern Kurdistan ", 253-54.

بۆی دەچێت کە زۆرجار لە هەڵسووکەوتەکانی بەرپرسیار نەبووە .[٦٤]

## شوێندانانی ئایدیاو ڕووداوەکان لەسەر شێخ مەحموود

نووسەرانی تری بەریتانیی ڕاوبۆچوونی هاوشێوەیان لەبارەی شێخ مەحموودەوە دەربڕیوە. ئەم تۆمەتانە تاچەند ڕاستن یان نا مەسەلەیەك نین و هەندێ شتی تر دەبێ کاریگەرییان بەسەر هەڵوێست و کردەوەکانی شێخ مەحموودەوە هەبووبێت. بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی شیاومان لەمەڕ بیرکردنەوەی شێخ مەحموود هەبێت و بگەینە هەڵسەنگاندنێکی ڕەوا بۆ ئاکار و ڕەفتارەکانی، دەبێ هەموو فاکتەرەکان ڕەچاو بکەین.

بیرکردنەوەی شێخ مەحموود ئەو ئایدیایە دڵگیری کردبوو کە کوردەکان بە تایبەتی ئەوانەی باشووری کوردستان –ماڧ ئەوەیان هەیە دەوڵەتێکی سەربەخۆی خۆیان هەبێت و ئەویش هەقی بەخۆی دەدا سەرۆکی دەوڵەتێکی وابێت. ئایدیای دەوڵەتێکی کوردیی لە گەلێ بڵاوکراوە و جاڕنامەی جۆراوجۆری هاوپەیمانانیدا لە سەردەمی جەنگ و دواتریش بانگەشەی بۆ کراوە ، هەلومەرجی گشتیی ئەم بیروبۆچوونە و پاشان زاڵبوون و تەشەنەکردنی لەناو سەرکردە کوردەکاندا لە هەموو شوێنێك و ئایدیای سەرۆکایەتی ئەو لە کەسایەتیی خۆی وەدەرکەوتن و دەسەڵاتی بنەماڵەی بەرزنجیی لە باشووری کوردستان سەری هەڵداوە.

شێخ مەحموود ، لەم پلەو پایەیدا بە زۆری قەرزاری شکۆ و ناوبانگی بنەماڵەکەیەتی ، پیرۆزیی و شکۆی سێ‌کەس لە باوباپیرانی خەرمانەیەکی پیرۆزیی گەورەیان بۆ ئەم بەجێهێشتووە. باپیرەگەورەی کە شێخ مارف نۆدێیە زانایەکی ئایینیی گەورەبووە لە مشتومڕی موعجیزە ئامێزدا بەسەر مەولانا خالیدی نەقشبەندییدا سەرکەوتووە.[٦٥] حاجی کاك ئەحمەدی باپیری لە باشووری کوردستاندا شێخێکی گەورەی تەریقەت بووە .[٦٦] ئەوجا شێخ

---

[64] A.T.Wilson.Loyalties.2:134;also Longrigg. Iraq (1900-1950).104.

[65] بۆ ژیاننامەیەکی کورت و کارەکانی شێخ مارف بڕوانە : محمد امین زکی ،تاریخ السلیمانیة و انحائها ، ترجمة: محمد ملا جمیل احمد الروژبیانی ، بغداد ، ١٩٥١ ، ٢١٩-٢٤ ; Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,71;

[66] Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,74.

بەوردی زانیاریی لەسەر ئەو موعجیزانە دەدات کەوا کاك ئەحمەد نواندوونی لە محمد امین زکی ،تاریخ

سەعیدی باوکی هێزو شکۆیەکی گەورەی بووە و هاورێی سوڵتان عەبدولحەمید بووە و بە شەهیدیی کۆچی دوایی کردووەو لە ئاژاوەگێڕییەکی شاری مووسڵدا کوژراوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بوو بە سیمبوڵی غەدر و ناپاکیی دەرحەق بە بنەماڵەی بەرزنجیی و شوێنکەوتووانی دژ بە حکوومەتی عوسمانیی .[67]

ئەم بنەماڵەیە، کە لە شوێنی تری ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ناوی هاتووە، هەمیشە بەهێزترین خولیای لەناوچەکەدا هەر لە سەردەمی کەوتنی بابانەکانەوە دەسەڵات بووە . شێخ مەحموود، ئەگەرچی بە تەمەنترین کەسی بنەماڵەی دەسەڵاتداری ساداتی بەرزنجە نەبوو، بەڵام وەك سەرۆکی تەواوی ڕیشسپیانی بنەماڵە پیرۆزەکە ناسرا و بەیعەتی پێدرابوو . هەر بۆیە شێخ وەك سەرۆکی بنەماڵەی بەرزنجە و وەك سەرکردەیەکی کاریزمی و جەماوەرکێش ، هەستی ئەوەی لا دروست بوو بەهێزترین داوای بۆ سەرکردایەتیی کوردستانی باشوور هەبێت .

لەبەر ئەم هۆیە ، شێخ مەحموود هەمیشە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەو نوێنەر و دەمڕاستی کوردی ویلایەتی مووسڵ و تەنانەت بەشێکی سەرەکیی کوردەکانی ئێرانیشە . ئەگەر ئەو بەڕاستی بڕوای بەم ڕاستییە هەبێت ، کە وەك دەردەکەوێ هەشیەتی، ئەو سنووردانانەی کە بەریتانییەکان کاریان بۆ دەکرد و دەیانویست لە ناوچەیەکی کەم و دیاریکراوی ئەو هەرێمە بەرفراوانەی شێخ داوای دەکرد بیچەقێنن ، وەك کارێکی ناڕەوا و بێدادییەك بۆ سەر مافەکانی لەقەڵەم دەدا . بەڵگەی بۆ ئەمە ڕوون و ئاشکرایە و شێخ قەناعەتی تەواوی هەبوو بە ڕەوایی داواکانی و مافی شوێنکەوتنیان. سێر ئارنۆڵد ویلسن، کاتێ سەردانی شێخ مەحموودی کرد بە بۆنەی بریندارپوونی قورسیەوە لەشەڕی دەربەندی بازیاندا، وێنەیەکی یادەوەریمان بۆ دەگێڕێتەوە لەبارەی ئەم سەرۆکە کوردەوە. ویلسن، کە نزیکەی دە ساڵ دوای ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ شێخ مەحموود بەم شێوەیە دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

"من لە ئۆفیسی سلێمانی لە سێ بۆنەدا چاوم پێکەوت، لە خەستەخانە سەردانم کرد و بەشێوەیەکی ماناداد مافی دادگای سەربازیی بۆ دادگاییکردنی ڕەتکردەوە ، بەندی دوانزەیەمی سەرۆك ویلسنی بۆ خوێندنەوە ، هەروەها جاڕنامەی ئەنگلۆ-فەرنسیی کە لە ٨ی نۆڤەمبەری ١٩١٨دا دەرچووبوو ، کە وەرگێڕدراوە کوردییەکەیان لەسەر پارچە پەڕەیەکی قورئان بۆ

---

السليمانية، ٣٢٤

[67] باسی چالاکی شێخ سەعید لە بەشی دوانزەدا بەوردیی باسکراوە

نووسرابوو، وەك دوعا بە قوڵیدا هەڵیواسیبوو."[٦٨]

لە ڕاستییدا ئەمە وێنەیەکی کارای سەرۆکێکی شۆڕشگێڕی کورد بوو بە گیان و سروشتێکی ئەو دەمەی کوردستاندا. ئەو دۆکیومێنتانەی شێخ بە شەخسی هەڵیگرتبوون و بەوانە داواکاری و داکۆکی خۆی پێشکەش دەکرد، بێگومان هەڵبژارەیەکی باش بوو، بە هەرحاڵ ئەمە دوان لەو فاکتەرە زۆرانە دەنوێنێ کە نەك هەر کاریگەرییان لەسەر شێخ هەبوو بەڵکو لەسەر ژمارەیەکی بێپایانی نەوەی ئەو هەبوو. ئێمە دەبێ بۆ ئەم هێزانە بگەڕێینەوە ئەگەر بمانەوێ لە پیاوێك تێبگەین کە بەم ڕاشکاوییە دەدوا لەگەڵ یەکێك لە نوێنەرە سەرەکییەکانی ئیمپراتۆریەتێك کە بەگژیدا چووەوەو بەرەنگاری بووە با سەرکەوتنیشی بەدەست نەهێنابێت.

هەڵسوکەوتی شێخ مەحموود بوو بەجێی باس و لێکدانەوە تەنیا لەو کاتەدا کە دژ بە کاروباری شێواوی حکوومەت دەخرایە ڕوو لە میسۆپۆتامیای داگیرکراودا لەلایەن بەریتانیاوە. تێکەڵوپێکەڵی ئایدیای نوێ و نامۆ. داواکاریی دژ بەیەکی گرووپە ناحەزەکان و کێبەرکێی ئایدیۆلۆژییەکان، فرۆفێڵ و ناپاکیی تەوژمە سیاسییەکان، دەنگۆ و دوودڵیی و گومانی مێشك و دڵی زۆرێك لە پیاوان. بەیان و جاڕنامەی جۆراوجۆری هاوپەیمانان و جەنگ، چەشنی بەیاننامەی ئەنگلۆ-فەرەنسی ٨ی نۆفەمبەری ١٩١٨ و چواردە بەندەکەی سەرۆك ویلسن، بەتایبەتی بەندی دوانزە لەمەڕ چارەی خۆنووسینی گەلانی غەیرە تورکی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریتی عوسمانیی.[٦٩] ئاژاوەگێڕیی تورك بە تۆنی پان ئیسلامی مەیلدار بەلای کورددا،[٧٠] پڕۆپاگەندەی شەریفی مەککە، بە

---

[68] ئەم ڕووداوە کە لەلایەن ویلسنەوە باسکراوە و نووسەری شوورەویی (ك سارێژین)یش ئاماژەی پێداوە:

A.T.Wilson,Loyalties,2:134; K.Sarezhin " Iraq Today" Geographical Skech, "New Times , no6(Mar.15,1945),22.

[69] کاریگەریی جاڕنامەی ئەنگلۆ- فەرەنسیی و ١٤ بەندەکەی سەرۆك ویلسن. لەسەر میللەتانی میسۆپۆتامیایی داگیرکراوی بەریتانیا بە گشتیی بڕوانە :

A.T.Wilson,Loyalties,2:134;Bell. Review of the Civil Administration,63.

[70] هەروەها پیاوانی شەریفیش لە کوردستانی باکووردا کاریان دەکرد بە ختووکەدانی هەستی موسڵمانان بە مەبەستی وروژاندنیان بۆ ئەوەی لایەنگر بۆ سەردارەکەیان پەیدا بکەن

E.J.R.,17;Driver ,"The Kurdish Question,"98::Also Bell, Review of the Civil

شێوەیەکی سەرەکی پان عەرەبی و ناوچە عەرەبی زمانەکان، چالاکییەکانی نەتەوەخوازانی کورد لە سەرچاوەی جیاوازو بە بەرگی جۆراوجۆرەوە .[71] هەڵچوونی شۆڕشی کۆمۆنیستی و تەشەنەکردنی لە ناوچەکەدا لەپاش شۆڕشی ڕووسیا. هەموو ئەمانە تەنیا جەختکردن بوو لەسەر هیواو ئاوات و مەترسیی ئەو ساتەوەختەو زیادبوونی پەشۆکاوی و شپرزەیی نیاز و مەبەستی نەزانراویان گومانی لێنالاّ بوو .[72]

پاشان دەنگۆ و پرۆپاگەندە و ڕاپۆرتی دژ بەیەك دەهاتن و دەچوون. لە هەموو لا قسەو باسی بالأدەستیی ئەرمەن ،[73] زاڵبوونی عەرەب ،[74] بووژاندنەوەی هێزی سەربازیی تورك،[75] فەرەنسا ویلایەتی موسڵ بۆ خۆی دەبات،[76] بەریتانیا لەوەدایە میسۆپۆتامیا چۆڵ بکات و هەر هەموو ئەمانەش بنەمایەکی خۆی هەبوو.

لە باکووردا، پاشەڕۆژی ویلایەتی مووسڵ هێشتا هەر لە گوماندا بوو، تورك

---

Administration,59.

[71] چالاکیی نەتەوایەتیی کورد لەپاش جەنگی یەکەمی جیهانیی لە ئەستەمبوول، قاهیرە، پاریس، دیمەشق و گەلێ شوێنی تر لە کوردستانی تورکیا و عێراق و ئێران سەریهەڵدا.

[72] بە گوێرەی ڕاپۆرتێکی بەریتانیی "شۆڕشی ڕووسیا لە پشتی تورکانە و بەلشەفیزم ئامادەیە بۆ یارمەتیدانی هەموو ئەوانەی سکالأیان لە دژی ئیزامی جیهانیی ئێستا هەیە و جاری ئەوە دەدەن کە سیستەمی جیهانی ئەمڕۆ نەگونجاوە بۆ ڕێکخستنی کاروباری مرۆڤ" Bell, Review of the Civil Administration,63 ڕاپۆرتێکی تری فەرمیی دەڵێت:"تێبینیی ئەوە دەکرێت کە باسکردنی بەلشەفیکەکان لە مووسڵدا لەمساڵدا ڕوو لە زیادبوونە هاوپەیمانیی مستەفا کەمال لەگەڵیان پارەی باشی پێوەردەگیرێت و خەڵك وای باسدەکەن کە بڕێکی باش ئاڵتوونی لێوەرگرتوون"

Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Mosul Division for 1920,5.

[73] E.J.R.,11;Driver ,"The Kurdish Question,"81;;Also Bell, Review of the Civil Administration,58-59.

[74] Driver ,"The Kurdish Question, 80; A.T.Wilson,Loyalties,2:134.

[75] A.T.Wilson,Loyalties,2:152-53.

[76] لە بارەی پڕوپاگەندەی فەرەنسییەوە بڕوانە:

Driver ,"The Kurdish Question, 80; E.J.R.,11; A.T.Wilson,Loyalties,2:132.

کردبووی بە هەراوهوریاو هەڕەشەکردنی گێڕانەوەی بۆ خۆیان. زۆر لە ناوچە شاخاوی و دوورەدەستەکانی ویلایەتەکە یان دەسەڵاتێکی کزی بەریتانییەکانی بەسەرەوەبوو یان کەس دەستی پێنەدەگەیشت و تورك بۆی دەچوو. لە ناوچە عەرەبنشینەکان لە باشووری دۆخەکە تاڕادەیەك هەر گرژ بوو .[٧٧] سیاسەتی بەریتانیا ئەزموونگەری و کاتی بوو .[٧٨]

بۆ کەسانی وەك شێخ مەحموود کە زۆری لەپێشەوە مابوو، ئەوەی کە سکاڵاو گومان بوو ئێستا وەك ئەگەرێکی جیاکار دەرکەوتووە. ئا لەم کاتەدا بوو کە شێخ بڕیاریدا پەیوەندی لەگەڵ تورك دامەزرێنێ و هەر زوو نووسراوی نارد بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ سەنتەری هەراو ئاژاوەی تورك لە شرناخ و ناو هۆزی گۆیانی یاخی .[٧٩] لێرەدا پێویستە ئیشارەت بەوە بکرێ کە کەسێك لە پێگەی شێخ مەحموودا بێت پێویستە دوورتر بڕوانێت لە هاوکارە بەریتانییەکان.

لە بەرەی شێخدا هەندێ شتی جیدی حیسابی بۆ نەکرابوو و شیرازەی تێکچوو بەهۆی خولیاو پەلکوتانی لە سنوور بەدەر و پەدانی گەوجانەی ڕاوێژکارانیەوە بەڕێوە دەچوو. ئەو ئامۆژگاریی ڕاوێژکارە بەریتانییەکانی پشتگوێ خست و گاڵتەی بە خواست و خواستەکانیان دەکرد و بەگشتی هەڵوێستێکی توندی وەرگرت. پیاوێکی سەرچڵی توندڕەو لەرووی رامیارییەوە قاڵ نەبوو، بەئاشکرا حیسابی بۆ دەرەنجامی ململانێ و پێکدادان نەدەکرد لەگەڵ هێزێکی گەورەدا. تەواوی ئەوانەی بەدەوریەوە بوون لە جێی ئەوەی هەڵچوون و تووڕەیی خاوبکەنەوە، تەنیا هانیان دەدا بۆ پەرگریی لە

---

[77] A.T.Wilson,Loyalties,2:285-86; Longrigg, Iraq (1900-1950),81-81; Less, " Two Years in Southern Kurdistan ", 255.

[78] بەپێی ویلسن، "هەموو مانگێك هێزەکان بە ژمارەی قەبەوە لە وڵاتەکە دەڕۆن، بەڵام باس لە کەمبوونەوەی ئەرکی سەربازی نیە. بازرگانان و خەڵکی تر کە لە بەسرەو بەغداوە دەگەڕێنەوە بۆ سلێمانی باس لەوە دەکەن کە ڕۆژانە سەرباز بە کەشتی و شەمەندەفەر دەڕۆن و تەنانەت زۆر کەس پێیان وایە ئێمە جارێکی تر کوردستان چۆڵ دەکەین و خەڵکەکەی بە دەردی خۆیانەوە بەجێدێڵین بۆ ئەوەی گرفتاری دەستی ململانێی پیلانگێڕیی هێزە ناکۆکەکان بن"

A.T.Wilson,Loyalties,2:130; Less, " Two Years in Southern Kurdistan ". 260-61; Longrigg, Iraq (1900-1950),118-21 .

[79] E.J.R...,15; Bell,Review of the Civil Administration,64.

بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا.

کارێکی مەحاڵ نەبوو کە شێخ دەیتوانی سەرکەوتن بەدەستبێنێ لە ئەنجامدانی زۆرێك لە نیازو مەبەستەکانی ئەگەر نەرمی و زمان خۆشی بەکاربهێنایە. بەریتانییەکان زۆر بێزار و خەمناك بوون لەسەر کێشەو سەرئێشانەو زۆر لەوە ژیرتر بوون کە دۆستێکی بەنرخیان لەدەست بچێت.ئەوان تووشی کێشەو گرفتی زۆر بوون لە میسۆپۆتامیادا و لە سەرانسەری جیهاندا کە هەرگیز ئارەزووی ئەوەیان نەبووە بە دوای هیچ شتێکدا بگەڕێن لە چارەسەری ئاشتیانە بەولاوە هەر کاتێ گونجابێت.

## کەمکردنەوەی دەسەڵاتی شێخ لەلایەن بەریتانیاوە:

ئەمێستا بەریتانییەکان هاتبوونە سەر ئەو باوەڕەی کە چیتر ناتوانن متمانە بە شێخ مەحموود بکەن و تا کارو هەنگاوی شێلگیرانە نەنێن بۆ تەگەرە خستنە ڕێی دەسەڵاتەکەی ئەوە تەواوی پێگە و شوێنیان لە کوردستاندا بەردەوام هەرەشەی سەختی لەسەرە. ویلسن، ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەڵێ: "ئێستا وا ڕوون بوومەتەوە کە ناتوانین بە ناقڵانە و بە ڕێکی و چالاکانە پشتی شێخ مەحموود بگرین بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەسەرخێڵەکاندا بشکێ، چونکە بەشێوەیەکی گشتیی لەسەر ئەوە ڕێککەوتووین کە پێویستە بەجۆرێك سیاسەتمان لە باشووری کوردستاندا بگونجێنین کە شێوازێکی بەڕێوەبردنی وا بخەمڵێنین هاوشێوە بێت لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی عێراقدا ."[80]

لە سەرەتای مارتی ١٩١٩دا ویلسنی جێگری کۆمیسیۆنی مەدەنیی کۆنفرانسێکی لە بەغدا بە مەبەستی گفتوگۆکردن لەسەر دوا پەرەسەندن و پێشهاتەکانی کوردستانی باشوور بەست. ژمارەیەك خەڵکی شارەزا چوونە کۆنفرانسەکە، لەوانە سۆن، نۆئێل، لیچمان و ئەی.ئێڵ. گۆردن وۆکەر. لەپاش مشتومڕێکی زۆر لەسەر شێخ مەحموود و تەواوی دۆخەکە لە کوردستانی باشووردا هەموو کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە "دەبێ دەسەڵاتی شێخ مەحموود ورده ورده کەم بکرێتەوە، بەڵام ئەگەر بکرێ بەشێوەیەك بێت کە لە بەرپابوونی ناکۆکیی گەورە خۆبپارێزین ."[81] لێرەدا گەیشتنە دوو بڕیاری بایەخدار:

---

[80] A.T.Wilson,Loyalties,2:134.

[81] Less, " Two Years in Southern Kurdistan ", 255; A.T.Wilson,Loyalties,2:134.

یەکەم، دەبێ سۆن وەك ئەفسەری سیاسیی لە سلێمانی جێگەی نوێنێل بگرێتەوە ، دووەم ژمارەیەك لەو خێڵ و ناوچانەی تا ئێستا لەژێر ڕکێفی شێخدان دەبێ ڕێگەیان بدرێت جیابنەوەو لێی بکشێنەوە.[٨٢] دامەزراندنی سۆن بەڵگەیەکی ڕوون بوو کە بەریتانییەکان نیازیانە بە توندی مامەڵە لەگەڵ شێخدا بکەن و بەش بەحاڵی سۆن ناسرابوو بەوەی کە توندو ناحەزە لەگەڵ بنەماڵەی بەرزنجییدا بەگشتیی و شێخ مەحموودیش بەتایبەتیی. ئەمەش ئەو هەستە دەگەیەنێت کە هەرگیز ناتوانێت ئەم کارە بشارێتەوە، وەك پێشتر باسی لێوەکرا .[٨٣]

هەنگاوی بە پەلە نرا بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی لە کۆنفراسەکەدا وەرگیرابوون. سۆن سەفەری کرد بۆ سلێمانی و لە ڕێگەیدا بەرەو ئەو شارە لە کفری و کەرکووك لایدا، بەنیازی کارکردن لەو پرۆسەیەدا کە بە زووترین کات جێبەجێی دەکات و ئەویش داماڵینی ناوچەو خێڵە جۆراوجۆرەکانە لە دەسەڵاتی شێخ .[٨٤]

خێڵی جاف، کە هەوارگەی زستانەیان لە ناوچەی کفری بوو، دەگوترا کۆکن لەسەر ئەوەی لە شێخ مەحموود جیاببنەوەو ڕاستەوخۆ بخرێنە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاوە .[٨٥] کاپتن (جی.ئێم.لیس) کە کرابوو بە یاریدەدەری ئەفسەری ڕامیاریی بەرپرس لە کاروباری جاف لە هەڵەبجەدا، لە ناوەڕاستی مارتدا گەیشتە ناوچەی کفری و بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك خۆی خەریك کرد. لەو ماوەیەدا یارمەتیی مانگانەی بەسەرۆك تیرەکانی جاف، لەوانەی کە نەیانویستبوو لە شێخ مەحموودی وەربگرن و ئەم برە پارەیەشی لە

---

[82] A.T.Wilson,Loyalties,2:134-35; Less, " Two Years in Southern Kurdistan ",255-56;, Longrigg, Iraq (1900-1950),104.

[83] ڕق وکینەی سۆن لە شێخەکانی بەرزنجە دەگەڕێتەوە بۆ دوانزە ساڵی لەوەپێش کاتێ بە نەناسراوی نیشتەجێی کوردستانی باشوور بووە. بێگومان لەمەیاندا کاریگەریی بەگزادەکانی هەڵەبجەی لەسەربووە، بە تایبەتی عادیلە خانم، کە زۆر دۆستی بووە. سۆن زۆر بەتوندیی ڕەخنە لە شێخ مەحموودو بنەماڵەکەی دەگرێت لە کتێبەکەیدا "بە نەناسیی لە میزۆپۆتامیاو کوردستاندا" و لە ژمارەیەك ڕاپۆرتی فەرمیش، وەك ڕاپۆرتەکەی لەسەر ناوچەی سلێمانیی لە کوردستان"ساڵی ١٩١٨"نووسیویەتی.

[84] Bell,Review of the Civil Administration,64.

[85] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919,1-2.

سەرجەمی کۆی یارمەتییەکەی شێخ مەحموود بڕی. بێگومان ئەم کارە لای جافەکان ئەوەی بەجێهێشت کە بەریتانیا هەڵوێستی گۆڕیوە لە بەرانبەر سەرۆکی کورددا و ئێستا سیاسەتێکی نوێ جێی گرتووەتەوە .[86] لە مارتی ١٩١٩دا ناوچەکانی کەرکووک و کفری لە کۆنفیدراسیۆنی باشووری کوردستان و دەسەڵاتەکەی شێخ مەحموود دابڕاو بەشێکی نوێیان پێکهێنا .[87] قەزای هەڵەبجەش کە لەسەر سلێمانی بوو ئێستا خرایە ژێر ڕکێفی ڕاستەوخۆی بەریتانیاوە.

ئێستا ڕوون بووەوە کە شێخ بڕواو متمانەی بەریتانیای لەدەست داوەو بەو پێیە ئەو یارمەتیی و پاڵپشتە ماددیی و مەعنەوییەش لەدەستدەدات کە بۆیان دابینکردبوو. ئەم پیاوەی کە ماوەیەک لەمەوپێش جاڕی سەرۆکی کوردستانی باشووری بۆ دراو هەموو کوردی دڵسۆز دایانە پاڵی، وا ئێستا بە ساختەچییەکی فێڵباز لە قەڵەم دەدرێت و دەبێ هەموو کەسی لێ بتەکێتەوە. ئەم پەرەسەندن و پێشهاتە بە قووڵی کاری کردە سەر کوردەکانی باشوور. ڕکابەرو ناحەزەکانی گومان و دوودڵییەکی زۆریان لە ڕۆڵی شێخ دەربڕی وەک سەرۆک و دەمڕاستی باشووری کوردستان و قۆرخکردنی دەسەڵاتی ئەویان بەناچاری قبووڵ کرد. ئەم کەسانە ئێستا خۆشحاڵن بەوەی کە گلۆڵەی شێخ کەوتووەتە لێژی وەک پاکانەیەک بۆ هەڵوێستی ناچاریی پێشوویان لە ئاستیدا. بە هەرحاڵ، لە چاوی دەروێش و شوێنکەوتووانیەوە و ئەو ژمارە زۆرەی خزمەکانیەوە کە شێخ پیاوێکی ستەم لێکراوەو ئێستا لە هەموو کات زیاتر شیاوی بەزەیی و دڵسۆزییە.

هەڵپاچینی دەسەڵاتەکەی شێخ بە ئاشکرا جێبەجێکرا بێ هیچ ڕووداوێکی بەرهەڵستکاریی. ئەو واقیعەی کە دوژمنانی بەخۆشییەوە لێیان دەڕوانی و شێخ و دەستەو تاقمەکەشی لێی بێدەنگ بوون و بەرهەڵستییان نەکرد، وای لە سۆن کرد کە ڕاپۆرتێکی پێشوەخت بدات لەسەر کاریگەریی ئەم حاڵەتە لە سلێمانی و گوندەکانی دەوروبەری. بەپێی قسەی ئەو کاریگەریی شێخ مەحموود بە خێرایی وادابەزیوەو لە بەرقەراربوونی یاساو نیزامدا خەڵکی شارو عەشایرەکان باروودۆخی نوێیان پێ باشەو

---

[86] Less. " Two Years in Southern Kurdistan ".256.

[87] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919,1-2,4.

پێشوازیی لێدەکەن .[88]

بۆ بەدبەختیی، ئارامیی بارودۆخەکە ساختە بوو وە گەشبینیەکە لەجێی خۆیدا نەبوو. شێخ چەندە کەمکردنەوەی دەسەڵاتەکەی بە بێزارییەوە وەرگرت و چەند بە توندی لێیان دێتە دەست هەر زوو دەرکەوت. لە ڕاستیدا نەدەکراو ڕێی تێنەدەچوو کە چاوڕێی پیاوێك بکەیت لە سروشت و کەسایەتیی شێخ مەحموودا بێت هەروا بە ئاسانی لێگەڕێ دەسەڵاتی لە دەست بدات و بێدەنگەی لێ بکات و ئابڕووی بچێت بێ ئەوەی خەبات و ململانێ بکات. لە ڕاپۆرتێکی فەرمییدا کە ساڵێك پاش ئەو ڕووداوانە نووسرابوو. سۆن بە توندیی کارو ڕەفتاری شێخ لەو دەمەدا لە قاو دەدات . بەگوێرەی قسەکانی ئەم ، شێخ کۆسپی بۆ بەڕێوەبردنی ڕێك و ڕاست دروست دەکردو بە هەموو شێوەیەکی خراپ هەوڵی سووککردنی حکومەتی بەریتانیاو کاربەدەستانی دەداو تاقمێك شەڕخوازو داخ لە دڵی لەدەوری خۆی کۆکردبۆوەو کەوتە پلاندانان بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی لە حکوومەتی بەریتانیا بکاتەوە .[89] ئا بەم کینە و تووڕەییەوە بوو کە بەریتانیا ڕووبەڕووی دەسەڵاتی شێخ بووەوە.

## یاخیبوون و بەزینی شێخ مەحموود:

### گرتنی سلێمانی لەلایەن هێزەکانی شێخەوە:

لە کاتێکدا کە بەریتانییەکان بە جیددی بیریان لەوە دەکردەوە لەگەڵ شێخ مەحموودا بگەنە ڕێککەوتنێك ،[90] کەچی ئەو کوتوپڕ کەوتە هێرش و پەلاماردانێکی

---

[88] Bell,Review of the Civil Administration,64; A.T.Wilson,Loyalties,2:134-35.

[89] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1919,2.

[90] بە گوێرەی ویلسن، ئەو ئاگاداریی داوە لە بارەی بارودۆخی ئاسکەوە لە سلێمانی و وای نیاز بووە بچێتە ئەوێ بە مەبەستی ڕاوێژکردن لەگەڵ شێخ مەحموودا بەڵام شۆڕش و یاخیبوونەکە ڕێگەی ئەو کارەیان نەدا ویلسن دەنووسێت "من کاری ئەوەم ڕێکخست بە فڕۆکە بچمە ئەوێ، لە دەوروبەری ئاخرئۆخری مایۆدا بە مەبەستی

ئاتومێدانە بۆ گێڕانەوەی شکۆ و دەسەڵاتەکەی .[91] هێزێکی خێڵەکیی کە بەزۆری لە خێڵەکانی هەورامی و مەریوانیی لەو دیوی سنوورەوە لە ئێران پێکهاتبوو بەسەرکردایەتی مەحموود خانی دزڵی،[92] بەڵام لەژێر فەرمانی شێخ مەحموودا، لەبەیانی رۆژی ٢٣ مایۆی ١٩١٩ هاتە قەراخ سلێمانیو بێگرفتێکی ئەوتۆ توانی ئەو هێزەی لێڤیی بشکێنێت کە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان نێردرابوو. شوێنکەوتووانی تری شێخ مەحموود لە سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەری دایانە پاڵ ئەم هێزەو شاریان گرت. (مێجەرگرینهاوس) ، کە لەجێی مێجەرسۆن بەرپرس بوو، لەگەڵ ژمارەیەک ئەفسەری تری بەریتانییدا بەدیل گیران .[93]

شێخ مەحموود، وەک فەرمانڕەوای هەموو کوردستان خۆی راگەیاند و خەزێنەی گرت[94] و ئاڵای خۆی هەڵکرد[95] و کاربەدەستانی تایبەتی خۆی دامەزراند.[96]

---

کۆبوونەوە لەگەڵ شێخ مەحموودا بە شەخسی وەک هەوڵدانێک بۆ ئەوەی بگەینە چارەسەرێک بە مەبەستی گەڵاڵەکردنی چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیی کوردیی A.T.Wilson,Loyalties,2:136.

[91] شتێکی سەیرە کەوا ژمارەیەک سەرچاوەی بەریتانیی(بە تایبەتی E.J.R.16; Driver ," Kurdish and the Kurds ," 90; Bell,Review of the Civil Administration,66. لە بارەی شۆڕش یان یاخیبوونەکەوە بەم جۆرە دەست پێدەکەن "کوتوپڕ و چاوەڕوان نەکراو بەرپابوو". لیس، بە وریییەکی زیاترەوە دەڵێ: "بارودۆخی راەیاریی ئەگەری زۆری لەخۆگرتبوو، ئایا لەم هەوڵ و تەقەلایەماندا دەتوانین وردە وردە باڵی کەسی دەستنیشان کراو ببڕین یان ئەو هەوڵی خۆی سەردەخات بۆ باڵفڕەیەکی سەربەخۆ پێش ئەوەی تەگبیر و پیلان ئێمە جێبەجێ بکرێت؟"

Less, " Two Years in Southern Kurdistan ", 265.

[92] لە بارەی چالاکییەکانی مەحموود خانی دزڵی لەپێش پەلاماردانی سلێمانیدا بڕوانە:

Driver ,"Kurdish and the Kurds ," 90;Bell,Review of the Civil Administration,60; Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,30.

[93] E.J.R..,16; Driver ,"Kurdish and the Kurds,90; Bell,Review of the Civil Administration,64; A.T.Wilson,Loyalties,2:136;Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,30

[94] بە پێی سەرچاوەیەک ئەو پارەیەی دەستی بەسەردا گیرابووە بڕەکەی دەگەیشتە دووسەد هەزار رۆپی، کە ئەمە لەو دەمەی کوردستانی باشووردا پارەیەکی هێجگار زۆربوو . Driver ,"Kurdish and the Kurds,90 .

[95] بەپێی ئیدمۆندز، ئاڵاکەی بریتیبوو لە نیوە مانگێکی سوور "کەوانەیمانگ" لەسەر تەختێکی سەوز

Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs.30.

[96] ویلسن باس لەوە دەکات کەوا شێخ "مودیر و خەڵکی شوێنکەوتووی خۆی دادەمەزراند بۆ ئەوەی دەستبەسەر

خەتی تەلگراف بۆ کەرکووك پچڕاو ڕێگەیان لە پەیامنێرانی گرینهاوس بڕیو پۆستەکانیان پێگرتن.[٩٧] یەکەم هەواڵی ئەم ڕووداوانەی سلێمانی لە ڕێگەی لیس موە کە یاریدەدری ئەفسەری رامیاریی بوو لە هەڵەبجە گەیشتە جیهانی دەرەوە.[٩٨] لیس لە هەڵەبجە هەڵاتبوو و لە خانەقین خۆی حەشاردابوو پاش ئەوەی هەوڵی گرتنی درابوو.[٩٩] هەر دوا بەدوای هەراو ڕاپەڕینەکەی پیاوەکانی شێخ کاروانێکی حکوومەتیان ڕووتکردەوە کە لە کفرییەوە بەرەو سلێمانی دەهات. دەسکەوتەکان، کە پارەو تفەنگ و ئەسپ بوون سامانێکی گرنگ بوو بۆ ئەو سەرچاوە کەمەی شێخ.[١٠٠] لەراستییدا ئەمە سەرەتایەکی مژدەبەخش بوو، بەڵام شێخ هەر زوو چەندین سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنا.

## بەزینی بەریتانیا لە ملەی تاسلووجە:

بەریتانییەکان، پاش ئەوەی بە پێشهات و بارودۆخەکەیان زانی، بڕیاری دژەکاریان وەرگرت و وەك هەنگاوێکی ڕێخۆشکەر ئەو ئەفسەرەی فەرماندەیی سەربازخانەی کەرکووکی دەکرد ڕاسپێردرا هێزێك بنێرێتە چەمچەماڵ لەسەر ڕێگای سەرەکیی کەرکووك –سلێمانی. هەر چەندە فەرمان و ڕاسپاردەکان ڕوون بوون کە نابێ

---

تەواوی هەموو ناوچەکە بکەن"، سەرچاوەی هاوچەرخی تر باس لە دانانی "قایمقامی سەربەخۆی" دەکەن، بەگوێرەی ئیدمۆندز لێرەدا مەبەست لە قائیمقام شێخ محەممەد غەریب بووە، کە هەم زاوای و هەم پیاوی دەستە ڕاستی بووە لە شۆڕشەکەدا و پاشتر لە دەربەندی بازیان گیراوەو لە دادگایەکی سەربازیدا لەگەڵ شێخدا حوکمدراوە.
A.T.Wilson,Loyalties,2:136; Driver ,"Kurdish and the Kurds,90;E.J.R..,16; Bell,Review of the Civil Administration,64; Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,102.

[97] Less. " Two Years in Southern Kurdistan ",15;259-60; A.T.Wilson,Loyalties,2:136;f. Driver ,"Kurdish and the Kurds,90; E.J.R..,16;Bell,Review of the Civil Administration,60; Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,30.

[98] بۆ وردەکاریی زیاتر بڕوانە: Less, " Two Years in Southern Kurdistan ",260.

[99] لیس لە لاپەرە ٢٦٠-٦٤ی هەمان سەرچاوەدا ئەو هەوڵانەی ئەوی لەو کاتەدا بە ئەزموونی گاڵتەجاڕ داناوە.

[100] E.J.R..,16; also Bell,Review of the Civil Administration,65.

لەو شوێنە بەولاوە بڕۆن. بەڵام ئەفسەرە فەرماندەکە بایەخێکی بۆ کارامەیی جەنگاوەریی کوردەکان و سەختیی ناوچەکە دا نەنا و فەرمانی سەرووی خۆی بە هەند وەرنەگرتبوو. لەبەرئەوەی فەرمانی بۆ هێزێکی بچووك دەرکرد کە لە هێزی سوارەو لیڤیی و چەند ئۆتۆمبێلێکی زرێپۆش و ڕەشاشی لویسی سەر ئۆتۆمبێلی فۆرد پێکهاتبوو، تا دەربەندی تاسلووجە پێشڕەویی بکات کە دوانزە مایل لە سلێمانییەوە دووربوو. هێزەکە دووچاری تێکشکان و پاشەکشە بووەوە و کورد تا دووریی بیست و پێنج مایل ڕاویان نان و بە جارێك شپرزەیان کردن. هێزەکە زیانێکی مەزنی لێکەوت و چوار ئۆتۆمبێلی زرێپۆش و نۆزدە ئۆتۆمبێلی بارهەڵگری فۆردی لەدەستدا.[101]

سەرکەوتنی شێخ کاریگەرییەکی خێراو بروسك ئاسای دروست کرد لە سەرتاپای کوردستانی باشووردا دەنگی دایەوە. ویلسن، لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە، ئەو بڕوایەی لای دانیشتووانی کوردستانی باشوور چەسپاند کە جارێکی دی ئێمە توانای دەستبەسەرداگرتنی باروودۆخەکەمان نابێت. شۆڕش و یاخیبوون لە هەرێمەکانی ئێراندا بەرپابووەو گەلێ لە تیرەو خێڵەکان دژ بە حکوومەتی ئێران هەڵساون و بانگەشەی ئەوە دەکەن لە پێناوی کوردستانێکی سەرفراز و یەکگرتوودا جەنگاوەر و پارتیزانی شێخ مەحموودن."[102]

**بەزینی شێخ مەحموود لە دەربەندی بازیان:**

بەریتانییەکان تەواو دەرکیان بەمەترسیی دۆخەکە کردبوو. وا ئێستا هەموو باشووری کوردستان زانیوێتی کە شێخ بەریتانییەکانی لەسلێمانیدا بەزاندووەو لە دەربەندی تاسلووجەشدا بەسەریاندا زاڵ بووەو ڕاوی ناون. ئەوان لەوە تێگەیشتن کە مانەوەیان لەبەشێکی بایەخداری ناوچە داگیرکراوەکاندا بە جیدیی هەڕەشەی لەسەرەو هەستیان کرد کە ئەگەر هەنگاوی کاریگەرو بەپەلە نەنێن بۆ لە کۆڵکردنەوەی شێخ ڕەنگە بتوانێت تەواوی وڵاتەکە لە دژیان ڕاپەڕێنێت . ویلسن لێرەدا درێژە بە گوتەکانی پێشووی دەدا و دەڵێت: " فەرماندەی گشتیی لەوە گەیشتووە کە دەبێ بەخێرایی ئەم هەستە لای

---

[101] A.T.Wilson,Loyalties,2:136-37:Edmonds .Kurds, Turks and Arabs,31.

[102] A.T.Wilson,Loyalties,2:137.

بەریتانییەکان بڕەوێتەوە."[١٠٣] ئەرکی پێکهێنان و فەرماندەیی هێزێکی لووتشکێن دژ بە شێخ مەحموود بە مەیجەر ژێنراڵ (سێر تیۆدۆر فەرەیزەر) ی فەرماندەی تیپی هەژدە لە مووسڵ سپێردرا. ئەو هێزە لە کەرکووک کەوتە خۆئامادەکردن و بریتیبوو لە دوو لیوای پیادە بە پاڵپشتی هێزی سوارەو زرێپۆش و یەکەی هێزی ئاسمانیی. ستونێکی تریش ئەبوو لە خانەقینەوە بەرەو سلێمانی پێشڕەویی بکات .[١٠٤]

هێزەکەی ژێنراڵ فرەیزەر لە ١٥ی ژوونی١٩١٩دا گەیشتە چەمچەماڵ و لە ١٧ی ئەو مانگەدا تەواوی هێزەکە پێشڕەویی کرد بۆ گوندی تەکیەی کاک ئەحمەد، کە نزیکەی سێ مایلێک لە دەربەندی بازیانەوە دووربوو.[١٠٥] لە بەرەبەیانی ١٨ی ژووندا هێزەکانی پیادە بە بەرزاییە سەختەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دەربەندەکەی بازیاندا هەڵکشان و هێزەکانی تریش دەربەندەکەیان بە چەکی قورس کوتا .[١٠٦] هەر کە هێزەکانی شێخ هێرشیان هێنا بۆ بەرگریی کردن لە دەربەندەکە دژ بەهێزە سەرەکییەکەی ئینگلیز کە شەپۆل دەڕژانە دەربەندە تەنگەکەوە، و کاتێ بەخۆیان زانی لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دراون. ئەو هێزانەی زووتر بە ڕووی ڕۆژاوای شاخەکەدا هەڵگەڕابوون و ئێستا بە

---

[103] Ibid.

وا دەردەکەوێت بەریتانییەکان گەیشتوونەتەئەو باوەڕەی کە تاکە ڕێگە بۆ ئەنجامدانی ئەم کۆتاییە تێکشاندنی تەواوی هێز و توانای شێخ مەحموودە. سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوی بەریتانیی ڕاستییەکی سەرنجڕاکێش دەربەخات کە ئینگلیزەکان خوازیاری دانووستان نەبوون لەگەڵ شێخدا هەرچەندە ئەو دەیویست ئەو کارەیان لەگەڵ بکات بە پێی بێڵ "لە ١١ی ژووندا و سەرباری ئەوەی شێخ سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە بەرەنگاربوونەوەی هێزێکی هەواڵگریی بەریتانییدا، کەچی ئەو نامانەی گفتوگۆ بوو بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو"

Bell,Review of the Civil Administration,60

[104] A.T.Wilson,Loyalties,2:137;also Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,31.

[105] A.T.Wilson,Loyalties,2:137;also Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,46.

[106] لە لای ڕۆژئاواوە و لەو دەشتاییەوە کە لەبەر دەمی دەربەندی بازیاندایە کە تەماشا دەکەیت زنجیرە چیای قەرەداخ بە شێوەی دیوارێکی ستوونی و زۆر زەبەلاح ڕاوەستاوە و ڕێگەی لە هەموو شتێك داخستووە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە ئەبوونی لاپاڵ زۆری قەبەو زل کردووە و کردویەتیە بەربەست هەردوو شانی دەربەندەکە بە شێوەی پیتی٧ ئینگلیزییەو ڕێك ڕاست بووەتەوە بە بەرزیی هەزاروحەوتسەد پێ لە بنی دەربەندەکەوە

Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,45; A.T.Wilson,Loyalties,2:137-58.

ڕووکاری ئەمدیودا بەرەوخوار دەبنەوە. زۆری نەخایاند هێزەکانی شێخ لە هەر چوارلاوە نابلووقەدران و تێکشکان ، شێخ بە تەواویی شکستی خوارد و بەزی ، چلوهەشت کەس لە پیاوەکانی کوژران و زیاد لە سەد کەسیان بە دیل گیران و ئەوانی تریشیان پەرت و بڵاوبوون و هەڵاتن .[١٠٧]

بەم ڕەنگە لە ژوونی ١٩١٩دا شەڕی دەربەندی بازیان کۆتایی هات، کە یەکێك بوو لە چەندین شەڕ لەم شوێنە ستراتیجییەدا .[١٠٨] بەم جۆرە لە مێژووی ئیمپراتوریی

---

[107] بۆ زیاتر : A.T.Wilson,Loyalties,2:138; Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,46.

[108] دەربەندی بازیان، دەروازەیەکی بەرتەسکە ناوچە شاخاوییەکانی ڕۆژهەڵاتی قەرەداغ بە دەشتی میزۆپۆتامیا و دنیای دەرەوە دەبەستێ، بە درێژایی چەرخە جۆراو جۆرەکان بایەخێکی بازرگانی و ستراتیجی گەورەی هەبووە. لێرەدا هەمیشە هەمەوەند بۆسەیان بۆ کاروان و هێزەکانی عوسمانیی دادەنا کە دەنێردرایە سەریان .لە ساڵی ١٨٠٥دا و نزیکەی سەدەیەك پێش شۆڕشی شێخ مەحموود، ئەم دەربەندە شانۆی شەڕوشۆڕێکی هاوشێوەبوو لە نێوان شازادەی گەورەی کورد "عبدالرحمان پاشای بابان" و پاشای بەغدا دا چونکە پاش نێوان تێکچوونی لەگەڵ عوسمانیدا ئەم دەربەندە تەنگەی بە دیوارێکی بەرد هەڵچنی و چەند تۆپێکی لەسەر دامەزراند. هەرچەندە پلانەکەی یەکەمجار سەرکەوتووبوو، بەڵام دواتر شکستی هێنا چونکە مەحموود بەگی کوڕی خالید پاشای بابان کە ئامۆزای عبدالرحمان پاشاو ڕکابەری بوو،لە تووله ڕێیەکی پشتەوە کەوتە پێش سوپای عوسمانی و بەم جۆرە سەرداری کورد هیچ چارێکی نەما لە پاشەکشە بەولاوە. ئەوجا پاشای بەغدا ئەم دیوارەی تەخت کرد پێش ئەوەی پێشڕەویی بکات بۆ سلێمانی. . "المنشى البغدادى" کە وەك ئەمیندار یاوەری ڕێچی کردووە لە سەفەرەکەیدا بۆ کوردستان، باسوخواسی دەگێڕێتەوە بەڵام بە کورتی. دەربەندی بازیان لە نەخش و نووسینە مێخییەکاندا بە دەربەندی بابێت ناوی هاتووە.. دەربەندی بابێت بە ڕوونی لە ساڵنامەکانی ئەو سێ هێرشەدا دەردەکەوێت کەوا ئاشووڕناسرپاڵی سێهەم (١٠٤٧-١٠٢٧پ.ن) ئەنجامیدا لە دژی خەڵکی زاموا. کە وڵاتەکەیان پارێزگاری ئەمڕۆی سلێمانی دەگرێتەوە لە عێراقدا. شتێکی سەرنجڕاکێشە کەوا هۆکاری شەڕوشۆڕشەکانی ئاشووڕناسرپاڵ دژ بە خەڵکی زاموا جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ هۆکاری ئەوەی کە سوپای عوسمانیی بەهۆیەوە هێرشی کردە سەر عەبدولڕەحمان پاشای بابان لە ساڵی ١٨٠٥دا و ئەوەکەی سوپای بەریتانیا هێرشی کردە سەر شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩١٩دا بە پێی سپایزەر ساڵنامەکان جەنگەکان دەگێڕنەوە بۆ نور- ئەدەدی شازادەی دلگارا، بۆ ئەوەی هەر بە ملکەچی وڵاتی ئاشوور بمێنێتەوە. کاتێ ئاشوور دەستی دایە شۆڕش هەموو خەڵکی زاموا چوونە پاڵی. کاتێ پاشای ئاشوور هێرشی کردە سەر میللەتی زاموا تەماشای کرد "دەربەندی بابێت قایم کراوە و بە دیوارێك داخراوە" لە ئەنجامی شەڕی دەربەندەکەدا ١٤٦٠ پیاو لە یاخییەکان تیداچوون. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:

Sone," To Mesopotamia and Kurdistan, 328,329;Speiser, "Douthern Kurdiatan,"15.

بەریتانیادا ڕووداوێکی وا کە شۆڕشی شێخ مەحموودە بەرپابوو و ڕێوشوێنێکی بایەخداری وەرگرت لە مێژووی نەتەوەی کورددا. لەڕاستیدا ڕەنگە ئەمە هێندێك کاریگەریی لەسەر ڕەفتاری خێڵەکانی دەلۆ و زەنگەنەو داودە و خێڵە کوردەکانی تری باشووری کەرکووك بەجێهێشتبێت، کەساڵێك دواترو لە دەمی یاخیبوونە چەکدارییە ترسناکەکەی ناوچە عەرەبزمانەکانی مێسۆپۆتامیادا دژ بە دەسەڵاتەکانی داگیرکەر ڕاپەڕین و تەقینەوە.[109]

لەپاش تەواوبوونی شەڕی دەربەندی بازیان، ئینگلیزەکان چەند ساتێك بە دڵەڕاوکێوە بە دوای شێخ مەحموودا دەگەڕان کە دواتر بە بریندارییەکی سەختەوە دۆزییانەوە. بەپێی گێڕانەوەی ئەدمۆندز کە وەك ئەفسەرێکی ڕامیاریی هاوەڵیی هێزەکەی فەرەیزەری کردبوو "ئەوەی زۆر گرنگ بوو ئەوەبوو کە نە بمرێت ، پێش ئەوەی لەلایەن کەسایەتییەکی کوردەوە دەستتیشان بکرێت ، نە هەڵیشبێت و هەر دیارنەمانێکی ئەفسانە و موعجیزە ئامێز دواتر کێشەو گرفتی لەڕادەبەدەری بۆ دروست دەکردین ."[110]

مەسەلەیەکی دی کە لەم کاتەدا خولیای بەریتانییەکان بوو ئەویش چارەنووسی ئەفسەرە دیلەکان لە سلێمانی بوو .[111] هەرچەندە ئەوە زانرابوو کە زیانیان پێنەگەیشتووە، بەڵام ترسی هەبوو کە پاش ئەوەی هەواڵی بەزینی شێخ لە سلێمانیدا ئاشکرا بوویکوژرێن .[112] بەم پێیە فەرماندرا بە هێزێکی سوارەی بچووك دەستبەجێ بۆ سلێمانی بڕۆن . هێزەکە ئەرکی خۆی بە سەرکەوتوویی بەجێهێنا و پێش ئەوەی دەنگوباسی کارەساتەکەی بازیان بگاتە

---

[109] Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of the Kirkuk Division for the Year 1918,( Baghdad Government Press, 1921) ,6-12.

[110] Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,49.

[111] حەفسەخان، ئامۆزای شێخ مەحموود و ژن خوشکی وا باسدەکرێت کە پارێزگاریی لە ئەفسەرەکان کردووە لە ماوەی بەندکردنیاندا بە پێی ئیدمۆندز. شێخ قادری مێردی حەفسەخان، کەوا ئەفسەری فەرماندەی لیڤیی بووە، مەیجەر ئەی.ئێم دانلیسی مەشقدەری بەریتانیی لیڤییەکانی بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ بردووەتە ماڵی خۆی و لەو ماوەیەدا کە لەوێ بووە حەپسەخان لە ڕاڕەوی بەردەمی ژوورەکەی ئەمدا خەوتووە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە هیچ زیانێکی پێنەگات

Ibis.,83:Cf.Barth,120-21.

[112] ئیدمۆندز باس لەوە دەکات گوایە لە پاش شەڕی بازیان لە دوو ئەفسەری لیڤییەوە بیستوویەتی کەوا شێخ مەحموود ڕایسپاردووە ئەگەر ڕۆژگار لە دژی ئەم وەرگەڕا ئەوە دیلەکان بکوژن. Edmonds .Kurds..47.

ناوخەڵکی شار گەیشتە سلێمانی . پاشان دیلەکان ئازادکران و شاریش دەستی بەسەرداگیرایەوە .[113]

## تاوانبارکردن و حوکمدانی شێخ مەحموود:

برینەکەی شێخ مەحموود زوو چاکبووەوە و درا بە دادگایەکی سەربازیی و تاوانبارکراو حوکمی لەسێدارەدانی درا. بەڵام فەرماندەی گشتیی بەریتانی (سێر جۆرج ماکمون) حوکمەکەی بۆ گۆڕی بە زیندانیی هەتاهەتایی. پاشان جارێکی دی بەر بەزەیی کەوت و ئەم حوکمەش گۆڕا بە دوورخستنەوەی بۆ هندستان لە ساڵی ١٩٢١دا .[114] ویلسن، لە ساڵی ١٩٣٦دا دەنووسێت کە هەرچەندە لەو کاتەدا لەو هۆیانە تێدەگەیشت کە پاڵی ناوە بە فەرماندەی گشتییەوە ئەم هەڵوێستی بەزەییە وەربگرێت، بەڵام ئەم "واتە ویلسن" لەسەر بنەمایەکی کردارییی بەرهەڵستیی ئەو بڕیارەی کردووە. ئەم لەوە ترساوە کە هەتا شێخ مەحموود لە ژیاندا بێت هیچ هیوایەکی ڕاستەقینە بەهێمنیی و ئارامیی لە ناوچەی سلێمانیدا نابێت .[115] چەند ساڵێک دواتر سێر جۆرج ماکمون ئەو بارو زرووفی سووککردنی سزاو بەزەییە بەم جۆرە لێکدەداتەوە: "شێخ مەحموود وەك دیلێك لە دەربەندی بازیانەوە هێنرا. من دامە دادگاو حوکمی سێدارەدانی بۆ دەرچوو. من دەمزانی خەڵکی دەیانویست ئەم کابرایە کەللەپووتە نەفرەتییە هەڵواسم، بەڵام من

---

[113] لە بارەی ئازادکردنی دیلەکانی ئینگلیزەوە بڕوانە:

Less, " Two Years… ", 264-65. A.T.Wilson,Loyalties,2:138. Edmonds ,Kurds…47.

[114] بەگوێرەی بێل سزای شێخ دە ساڵ حوکم بووە و شێخ محەممەد غەریبی زاواشی پێنج ساڵ و دە هەزار ڕۆپی جەزا بووە. بە پێی لیس شێخ بیست ساڵ بە کاری قورس و بە دورخستنەوە بۆ هندستان حوکم دراوەو دەستەو تاقمەکەشی سزای لەوە کەمتر دراون بە پێی ئیدمۆندز حکومەکەی شێخ بۆ دە ساڵ بەندکردن کەمکراوەتەوە و پاشان نێردراوە بۆ هندستان

. A.T.Wilson,Loyalties,2:138-139; Bell,Review of the Civil Administration,65;Less, " Two Years… ", 265; Edmonds ,Kurds…52.

[115] بە پێی ویلسن شێخ مامەڵەی نەرمی لەگەڵ کراوە چونکە خراپەی دەرهەق دیلە ئینگلیزەکان نەنواندووە و لە سەرێکی تریشەوە سیاسەتی حکومەتی بەریتانیی لە ویلایەتی مووسڵی ئاڵۆزدا دژزینەوەی بیانوو نەبوو بۆ ئیعدام کردنی ئەم سەرکردەیی شۆڕش .A.T.Wilson,Loyalties,2:139.

وای بۆ دەچووم کە کردەوەیەکی ئاوها ڕەوا نییە. بەگشتیی دوائکەوتنی سەقامگیرکردنی پاشەڕۆژی عێراق هێندە کارێکی گەورە بوو کە هەموو کەسی تووشی چەواشەو سەرەگێژە دەکرد. شێخ مەحموود قەرزاری دڵسۆزیی کاتیی بەریتانیی نەبوو . کاتێك کە کوودەتاکەی ئەنجامدا ئەو چوارپێنج ئەفسەرە ئینگلیزەی نەکوشت کە کەوتبوونە دەستی و من وای بۆ دەچووم کە کوشتنی گەمەیەکی عادیلانەی بەریتانیا نەبوو." [116]

هەنگاوەکان، وەك لە ڕووداوە یەك لە دوای یەکەکاندا سەلماندیان، لە بەدیهێنانی هەر ئەنجامێکی جێگیردا شکستیان هێنا . وێڕای ئیشارەتی تایبەتی چاکبوونێکی ڕووکەش، دۆخەکە هەر وەك پێشتر بە لەقیی مایەوە . تەنانەت دوو ساڵیش دوای ئەم ڕووداوانە، ئارامیی کە ئامانجی سەرەکیی ئینگلیز بوو لە باشووری کوردستاندا، پێ دەچوو هەر لە ئارادا نەبێت. بەریتانییەکان، بە ئائومێدییەکی ئاشکرا، پەنایان دەبردە بەرچارەسەریی چاوەڕوان نەکراو. ئەوان شێخ مەحموودیان بەخشی و هێنایانەوە بۆ سلێمانی و جارێکی دی کردیانەوە بە حوکمدار، بۆ ئەوەی چەند مانگێك دواتر خەبات و ململانێکە دەست پێ بکاتەوە. چیرۆکی ئەم تاقیکردنەوە بێهوودەیە لە بەشی یازدەیەمی ئەم باسەدا دێت. لەهەمان کاتدا پێویستە هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی شۆڕشی یەکەمجاری شێخ هەڵسەنگێندرێن، کە لە دەربەندی بازیان تووشی ئەو نوشوستیی و بەزینەیان کرد .

## هۆکارەکانی شکستهێنانی ڕاپەڕینەکەی شێخ:

ڕێکخستنی لاوازو سەرچاوەو دەرامەتی ناتەواو ڕەنگە بەرپرسی سەرەکیی سەرنەکەوتنی ڕاپەڕینەکە بووبێتن. بەپێی سەرچاوەیەك نامەو نووسراوی دەست بەسەراگیراو ژمارەیەك هۆکارو ڕاستیی بایەخی تایبەتیی سەربازیی ڕوون دەکاتەوە. یەکەم، تەواوی هێزەکەی شێخ لە تاکە یەك بەتالیۆن پێکهاتبوو بە چوار لقەوە، لەهەمان

[116] ئەم بەیانە لە لایەن لیوتینانت- جەنراڵ سێرجۆرج ماکمونەوە لە ١٤ی مارتی ١٩٢٨ دا دەرکرا، لە دەرئەنجامی موحازەرەیەك لەلایەن جی ئێم ئیبەوە درا لە کۆمەڵەی ئاسیای سینترال. Less, " Two Years… ", 277.

کاتدا توانای جموجوڵی ئەم هێزە سنووردار بوو ، بەهۆی نەبوونی هێزێکی سوارەی تۆکمەوە .[117] دووەم، بەماوەیەکی کەم پاش هەڵگیرسانی شۆڕشەکە، شێخ مەحموود نەیتوانی پارەی مووچەی هێزی خێڵەکیی دابین بکات و نارەزایەتییەکی بەرچاوی هێنایە ئاراوە و خۆدزینەوەیەکی زۆری لە راژەی سەربازیی لێکەوتەوە .[118] سێیەم، کەمی چەك و فیشەك کێشەیەکی بایەخدار و مەزن بوو، وەك لە فەرمانێکی دەست بەسەردا گیراودا دەردەکەوێت سەبارەت بە قەدەغەکردنی سەرفکردنی تەنانەت یەك فیشەکیش بێ رەزامەندیی پێشتر و بەپێچەوانەوە ئەو کەسە سزای توندو سەخت بدرێت. بە پێی ئەم فەرمانە، هەموو جۆرە تەقەکردنێك بە توندیی قەدەغەیە تاوەکو رەشاشەکان دەستڕێژ نەکەن .[119] خاڵی چوارەمیش لە سەرچاوەی پێشوودا باسیی لێوە نەکراوە بەڵام بە گشتیی ئاماژەی پێکراوە، ئەویش مەسەلەی وورە بوو ،[120] ئەگەرچی شێخ و ژمارەیەك لە شوێنکەوتووانی بە ئازایەتیی و وورەیەکی بەرزەوە جەنگان ، بەڵام جێی گومانە تەواوی هێزەکەی لە هەمان رۆحییەتدا بووبێتن. لەراستییدا ئەو هێزە لیڤییانەی کە بەرێکی مووچەیان نەدەدرایە و لەسەر دەستی بەریتانییەکان مەشقیان کردبوو، وەك باسدەکرا لەشەڕەکەدا تفەنگەکانیان خستبووە لاوە و تەقەیان نەکردبوو بۆ ئەوەی هەرکاتێك گیران و تفەنگەکانیان پشکنرا بیسەلمێنن کە شەڕیان نەکردووەو تەقە لە تفەنگەکانیانەوە نەکراوە .[121]

هێزو پێکهاتەی چەکدارەکانی شێخ مەحموود متمانەیەکی بەجێیان

---

[117] رەنگە ئەم خاڵە پێویستی بە هەندێ روونکردنەوە بێت ئەم سەرچاوەیە بە ئاشکرا ئەوە دەگەیەنێت کەوا شێخ مەحموود هێزێکی سوارەی مەشقدراوی شیاوی نەبوو و بەم پێیەش جەنگاوەری سوارەی قاڵبووی شك نەدەبرد ئیدمۆندز باس لەوە دەکات کە لە پێش پەلاماردانی دەربەندی بازیاندا لە لایەن ئینگلیزەوە نزیکەی دووسەد ئەسپ سوار بینرابوون چاودێرییان دەکرد. درایڤەر باس لەوە دەکات کە ئەسپ لەنێو ئەو دەسکەوتانەدا بوو کە لەپاش شەڕەکە لە لایەن بەریتانیەکانەوە بەدەستهاتن.

Driver ,"The Kurdish Question ," 92,113; Edmonds ,Kurds…46.

[118] Driver ,"The Kurdish Question ," 92;Cf. Bell,Review of the Civil Administration,65.

[119] Driver ,"The Kurdish Question ," 92.

[120] Edmonds ,Kurds…46.

[121] Driver ,"The Kurdish Question ," 92.

دەگەیاندو بەڵگەی تواناو میللەت پەروەریی ئەویان دەنواند لەو دەمەی شۆڕشەکەدا. بێجگە لە دەروێش وشوێنکەوتووانی لەناو سلێمانی و دەوروبەریدا ، [١٢٢] خزمە زۆرەکانی لە بنەماڵەی بەرزنجەو دۆست و ناسیار ، [١٢٣] ژمارەیەکی زۆری خەڵکی تیرە و خێڵەکانیشی لەگەڵ بوو ، [١٢٤] لەوانە هەورامانیی بە سەرکردایەتیی مەحموود خانی دزڵیی، [١٢٥] مەریوانیی [١٢٦] بەسەرکردایەتیی مەحموود خانی کانی سانان ، [١٢٧] هەمەوەند

---

[122] قەبارەی شوێنکەوتووانی شێخ مەحموود لە ناوچەی سلێمانیدا پێدەچێت دەسکێشی گوندەکانی خۆی بووبێت لەو دەوروبەرەدا. Less, " Two Years… ", 254;also Barth,127.

[123] Driver ,"The Kurdish Question ," 90; Less, " Two Years… ", 273-75; A.T.Wilson,Loyalties,2:139; Edmonds ,Kurds…30.

[124] سەرچاوەی جۆراوجۆر ژمارەی جیاوازی خێڵەکانی هەورامانیی و مەریوانیی باسی دەکەن. ئەوانەی کە چوونە پاڵ شۆڕشەکەی شێخ مەحموود. راپۆرتێکی فەرمیی باس لە ژمارەی١٥٠،١٠٠جەنگاوەری پیادە و (٥٠)سوارە دەکات تەنها لە لایەن هەورامییەکانەوە .لیس ژمارەکە بە (٥٠٠)دەدات و ویلسن، تێکڕا ژمارەی جەنگاوەران لەودیو سنووری ئێرانەوە بە ٣٠٠ لەقەڵەم دەدات.

Driver ,"The Kurdish Question ," 90; Less, " Two Years… ", 259; A.T.Wilson,Loyalties,2:136; Bell,Review of the Civil Administration,64.

[125] مەحموود خانی دزڵیی، سەرۆکی بنەماڵەی بەهرام بەگی لە هەوراماندا. بوو بە نووکی نێزەی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود بە گرتنی سلێمانی بەینێک لەوەوپاش لە سنەی کوردستانی ئێران گیرا بەهۆی بۆتێچاندنی ئەفسەرێکی ئینگلیزەوە. هەردوک ئەو و مەحموود خانی کانیسانانیی هاوڕێی تەسلیمی دەسەڵاتدارانی بەریتانیا کران لە میسۆپۆتامیا. مەحموود خانی دزڵی دوورخرایەوە بۆ هندستان. بەڵام چەند مانگێک دواتر ڕێگە درا بگەڕێتەوە وڵاتەکەی. وەك باس دەکرێت لەپاش گەڕانەوە چالاکانە کەوتە کارکردن لە دژی ئینگلیزەکان. سەرچاوەیەکی فەرمیی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە کوردەکانی ئێران لەپاش گرتنی سلێمانی خێرا گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، بەڵام ئەمە بەتەواوی ڕاست نیە چونکە هەردوولا هەورامانیی و مەریوانییەکان بەردەوام بوون لەسەر بێزارکردنی بەریتانییەکان بۆ ماوەیەکی دووروودرێژی دواتر لە ناوچە شاخاوییەکانی خۆیانەوە کە دەڕوانێت بەسەر دەشتی شارەزووردا

Less, " Two Years… ", 258-59; Edmonds ,Kurds…122,180; E.J.R..,16.

[126] سەرچاوەیەك لە بایەخی ڕۆڵی مەریوانییەکان کەمدەکاتەوە و وا باسی دەکات کە هەڵوێستیان بە درێژایی ماوەی شۆڕشەکە لەگەڵ شێخدا یەکلا نەبوو. Driver ," Kurdistan and The Kurds ," 90

[127] دوای ئەوەی حکومەتی ئێران مەحموود خانی کانی سانانی تەسلیم بە ئینگلیزەکان کرد پاشان لە ژوونیەی

بەسەرکردایەتیی کەریمی فەتاح بەگ ،[128] تیرەی میکایەلیی جاف ،[129] جەباریی بەسەرۆکایەتیی سەید محەمەدی جەباری ،[130] شێخ بزێنی بە سەرۆکایەتی فارس ئاغای سەرۆکیان،[131] بەشێک لە سمایل عوزێریی ،[132] تاقمێک لە شوان بەسەرۆکایەتیی عەزەی

---

١٩٢٠ دا بەردرا و ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە ماڵی خۆی لە ناوچەی مەریوان لە ئێران. وا دیارە گەڕانەوەی ئەم، ئەرفەعول مولکی حاکمی مەریوانی هێند ترساند کە ناچاریکرد هەڵبێت بۆ سنە. حکومەتی ئێران دواتر فەرمانڕەوایی مەریوانی دا بە سەرۆکێکی خەڵکی ناوچەکە بەناوی کەیخەسرەو خان، کە دواتر گلۆڵەی کەوتە لێژی. بۆ ماوەیەک، هەردوو سەرۆک هۆز، مەحموودخانی کانیسانان و کەیخەسرەو خان پێکەوە حوکمی ناوچەکەیان دەکرد، بەڵام فرەی نەخایاند بوو بە ناکۆکی و ململانێیان.

Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1920,5.

[128] A.T.Wilson,Loyalties,2:135;Driver ,"The Kurdish Question ," 90; Less, " Two Years… ", 273,275; Edmonds ,Kurds…245-46.

[129] A.T.Wilson,Loyalties,2:135;Cf. Edmonds ,Kurds…30.

[130] سەید محەمەدی جەباریی کە سەرۆک و دەمڕاستی بیست سێ گوند بوو لە باشووری چەمچەماڵدا یەکێک بوو لە دۆستە دڵسۆزەکانی شێخ مەحموود و تاسەر لەگەڵی مایەوە. ئەو جەخت کردنەوەی کەوا سەید محەمەدی جەباریی و دەستەو تاقمەکەی لە ٥ی حوزێرانی ١٩١٩دا وازیان لە شێخ مەحموود هێناوە، وەک لە ڕاپۆرتێکی ڕەسمی بەریتانیدا دەردەکەوێت، ڕاست نیە.

Edmonds ,Kurds…37,39; Iraq (British Administration),Office of Civil Commissioner, Administration Report of Sulaimaniyah Division for 1920, ,( Baghdad Government Press, 1922),4; Driver ,"The Kurdish Question ," 90.

[131] وایاسە نزیکەی پەنجا کەس لە هۆزی شێخ بزێنی کە چووبوونە پاڵ شێخ، زۆربیان وازیان لێهێناوە :

Driver ,"The Kurdish Question ," 90; Edmonds ,Kurds…37.

ئیدمۆندز لە ل ٣٨-٤٢دا فارس ئاغا وا دەناسێنێ کە برازای تۆفیق ئاغای قەسرۆکە، کە کوڕەزای مەلا عەباسەو یەکێک لەو چوار برایەی هۆزی شێخ بزێنییان لێکەووەتەوە.

[132] بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی فەرمیی کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات عەشیرەتی سمایل عوزەیری بەشدارییان کردووە لە شەڕی ملەی تاسڵووجەدا و پاشان زوو بڵاوەیان لێکردووە و گەڕاونەتەوە ماڵەکانی خۆیان لە دۆڵی سلێمانیدا

Driver ,"The Kurdish Question ," 90.

شەریف جەلال[١٣٣] و دەستەو تاقمی بچووکتر وەك دەروێشانی شێخ عەبدوڵای عەسکەر لە ناوچەی قەڵاسێوکە (ناغجەلەر).[١٣٤] سەرەڕای ئەم هەموو ناوە شکۆدارانەی عەشایەر، ئەو یارمەتی و پشتگیرییەی لە شێخ دەکرا لاواز و بێسوود بوو، چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی بە یەکدڵیی لە بەرەی ئەمدا بوون هەرگیز لە چەند سەد کەسێك تێپەڕی نەدەکرد، دەنا هەموو ئەوانی دی جگە لە هێندێك ، وا دیارە دڵسۆزییان جێی متمانە نەبوو و پشتگیرییان هەروا بەرێکەوت و سەرپێی و کورتخایەن بوو. دڵسۆزە کەمەکانیش لەسەر بناغەی کۆمەڵگای خێڵەکیی رێکخرابوون نەیاندەتوانی دژ بە سوپای گەورە و توندوتۆڵ بووەستنەوە. خەڵکی خێڵەکیی کورد بەهۆی ناکۆکیی ناوخۆ و ناحەزیی نێوان خێڵەکانیان بەکەمی دەتوانن بەرەیەکی یەکگرتوو پێکبێنن لەبەرانبەر دوژمنی هاوبەش بۆ تێکرا خەڵکی خێڵەکی ئەرکێکی دژوارەو لەم ڕووەوە دوژمن واتە دوژمنەکەی و ئەم بارە بەتەواویی پێچەوانەی ئەقڵ و ژیربێژیی خێڵەکییە کە خۆی لەم پەندە باوەدا دەبینێتەوە "دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە".

هەڵبەت کاتی زۆر دەوێ بۆ کورد لە تەواوی ناوچەکەیاندا کە جیاوازییان بخەنە لاوەو کینەو ناحەزییان بەرانبەر بە یەکتر لە بیربچێتەوە بۆ ئەوەی لە دژی نەیاری دەرەکی یەکبگرن و ئێستا ئەو یەکگرتنە، زیاتر بەدەرە وەك لەوەی ئەریتی چەسپاو بێت. لەوەش زیاتر ئەم یەکگرتن و هاوپەیمانتییانە هەرگیز ئەوەندە بەردەوام نەبوون تا بتوانن مەبەستی خۆیانی دژ بە دەسەڵاتی زاڵ و ناحەزی ستەمکاریان بەدیبێنن.

وەك بینیمان شێخ مەحموود داوای لە کوردەکانی باشوور کرد کە شەڕی بەریتانیا بکەن بە ناوی نەتەوایەتیی کورد و ئیسلامەوە، واتە ئەمە خەباتی نەتەوەیی و جیهاد بوو. بەهەرحاڵ بۆ زۆرینەی کورد نەتەوایەتیی "ناسیونالیزم" چەمکێکی تازە بوو و پێی ئاشنا نەبووبوون، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو شکستی هێناو ئەنجامی خواستراوی بەدەستەوە نەدا، بە پێچەوانەوە ، تا ئەو دەمە جیهاد زۆر ئاشنا بوو بەخەڵکەکە وەك

---

[١٣٣] شوان بەسەرۆکایەتیی عەزەی شەریف جەلال، وەك باسدەکرا ژمارەیان ٢٥٠ کەسێك بووە و لە قەرەهەنجیر شەڕیانکردووە. عەزەی شەریف جەلال وەك جەردەیەکی بەدناو لەوناوەدا ناسرابوو.

Ibid.,90.Cf. ; Edmonds ,Kurds…276.

[١٣٤] وەك دەگوترێت شێخ عەبدوڵا، کە دە دوانزە گوندی لەژێر دەستدابووە، هەر لە سەرەتاوە بووە بە جەنگاوەری شێخ Edmonds .Kurds…39

هۆکارێکی بێهیوایی. کوردەکان پێشتر ئەزموونی ئەم جۆرەیان لە لایەن کەسێکەوە هەبوو کە زۆر گەورەتر و بەتواناتر بوو لە شێخ مەحموود، بەڵام شکستی هێنا. بانگەشەکردن بۆ جیهاد لەلایەن سوڵتان یان خەلیفەوە پاشخانی دەستدانە چەکی هەبوو و بەزۆریی ئامرازی دەستی ئیمپراتۆریی عوسمانیی و هاوپەیمانەکانی بوون بەڵام لە دژی هەمان دوژمن کە ئینگلیز بوو لە پاش چوار ساڵی جەنگ شکستیهێنا.

شێخ دەیزانی کە ناتوانێ کوردستانی باشوور بخاتەوە جووڵە ئەگەر گیانێکی نوێ نەکاتەوە بەر هاوڕەگەزەکانیدا. بەئاشکرا ئەمەشی پێنەدەکراو شکستی هێنا لەچارەسەرکردنی ناکۆکییان و بۆردانی ئەو ڕکابەرانەی بەرهەڵستیان دەکرد. جاف و پشدەر دوان لە بەهێزترین هاوپەیمانیی خێڵەکیی بوون لە باشووری کوردستانداو بە ناحەزی مانەوە و چالاکانە پاڵپشتی ڕکابەرە ئینگلیزەکانی دژ بە شێخیان دەکرد .[١٣٥]

بێڵ، ساڵی ١٩٢٠دا دەنووسێت : "لاوازیی و ناکارامەیی شۆڕشەکەی شێخ مەحموود لەوەدا بوو کە لەو هەزاران کەسەی بەناو لەپشتی بوون، پاڵپشت و دڵسۆزە چالاکەکانی لە سێسەد کەس تێپەڕیان نەدەکرد ."[١٣٦] هەرچەندە ئەم مەزەندە کەمەی بێڵ ڕەنگە هەوڵدانێك بێت بۆ کەمکردنەوەی بەئەنقەستی بایەخی شێخ مەحموود، بەڵام گومانیش لەوەدا نیە ژمارەی پیاوەکانی زۆر لەوە کەمتربوون کە باسی لێوە دەکرا. چونکە لە دەروێشەکانی بترازێت "کە ئەمانە لەڕووی ئاین و تەریقەتەوە دڵسۆزی بوون". لەگەڵ ئەوانەی پەیوەندیی خزمایەتیی یان بەرژەوەندییان لەگەڵیدا هەبوو، دەنا ژمارەی ئەوانەی دڵگەرم و دڵسۆزی مەسەلەکەی شێخ بوون زۆر کاریگەر نەبوون

---

[١٣٥] دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کەوا هەموو جاف و هەموو پشدەر لەپشتی ئینگلیز نەبوون لە دژی شێخ مەحموود هەرچەند عادیلە خانم و زۆربەی بەگزادە لە هەڵەبجە سەر بە ئینگلیز بوون، بەڵام حامید بەگی نزیکویی عادیلە خانم سەر بە شێخ بوو بە هەمان شێوە گەرچی بابەکری سەلیم ئاغای سەرگەورەی پشدەر سەر بە ئینگلیز بوو. بەڵام عەباسی مەحموود ئاغای خزمی دژیان بوو

E.J.R..16;Less, " Two Years… "; Edmonds ,Kurds…229.

[136] Bell, Review of the Civil Administration,65.

# بەشی یازدەیەم : دووەمین راپەڕینی شێخ مەحموود

## پێشینە :

چارەنووسی ویلایەتی موسڵ تەنیا پاش ملململانێیەکی سەخت جێگیر بوو کە تێیدا بەریتانیی ، تورکان ، هەروەها عەرەب و کوردە خۆجێییەکان بەشدار بوون .جێگەی بەبیرهێنانەوەیە ، عێراقی هاوچەرخ وەختێك پێکهات کە ویلایەتی موسڵ بووە بەشێکی بنەڕەتیی ، هەرچەندە تائێستا کێشەی موسڵ جێگەی مشتومڕ و بێنە و بەرەیە . کێشەی موسڵ زادەی چەندین پەرەسەندنە کە کاریگەریی قووڵی لە رەوت و ئاراستەی ئەو رووداوانەدا کرد کە نەك تەنیا لەو ویلایەتەدا روویاندا کە بەو ناوەوەیە ، بەڵکو لە سەراسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا . هەربۆیە بایەخ و ئاوڕدانەوەی ئێستای ئێمە بۆ ئەو پەرەسەندنانە تەرخان دەکەین .

لە ٩ی مایۆی ١٩١٦دا ، رێکەوتننامەی سایکس-پیکۆ لەنێوان بەریتانیای مەزن و فەرەنسا مۆرکرا .[1] ئەم رێکەوتننامەیە ئیمپراتۆری عوسمانیی بۆ چەند هەرێم و ناوچەیەکی جیاواز دابەشکرد . رووسیا سەرەتا دژ وەستا ، بەڵام دواتر ، پاش ئەوەی چەند مەرجێکی پێشکەشکرد ، رێکەوتننامەکەی پەسەند کرد .[2] بەشێوەیەکی بەرفراوان بە پێی ئەم پلانە بەراییەدا بوو کە هەرێمە ئاسیاییەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی

---

[1] ئەم رێکەوتنە لەنێوان (سێر ئێدوار گرای) وەزیری دەرەوەی بەریتانیی و (ئێم پاوڵ‌ژکامبۆن)ەوە لەو بەروارەدا ئاماژەی بۆ کراوە گەیشتە دوا قۆناغی ئامادەیی و وتووێژکردن بڕوانە :

V.Minorsky ,"The Mosul Question," Bulletin of The Reference Service on International Affairs of The American Library in Paris, nos. 9-10(Apr.15,1926):8-45

[2] بەگوێرەی رێکەوتننامەی سایکس-پیکۆ بەشێك لەو ناوچەیەی کە ویلایەتی موسڵیش دەگرێتەوە بۆ ناوچەی فەرەنسیی دانرابوو بە ئامانجی ئەوەی لەنێوان ناوچەی رووسیی و بەریتانییدا لەمپەرێك پێکبهێنرێت . واپێدەچێت رووسیا دەرکەوتنی هێزێکی نوێی لەسەر سنوورە ئایندەییەکەی پێ باش نەبووبێت . ئەو نارەزایەتییەی کە لەلایەن (ئێم سازانۆف) ەوە لە ٢٩ی فێبرایەری ١٩١٦ەوە پێشکەشکرا هەرچەندە پاشتر لە ٢ی ئەپرێلی ١٩١٦دا رووسیا بەو مەرجە پرۆسەکەی پەسەند کرد کە ناوچەی باشووری وان و بدلیس بخرێتە سەر هەرێمی رووسیی Ibid.

بەلقانیزە و دابەشکرا .

لە ٣٠ی ئۆکتۆبەری ١٩١٨دا ، ئاگربەستەکەی لە مۆدرۆس مۆرکرا ، کۆتایی بە شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان تورك و هاوپەیمانەکان هێنا ، ئەوەش سەرەتای ڕووداوێك بوو کە بە قووڵیی شوێنی لەسەر دانیشتووانی ویلایەتی موسڵ بەجێهێشت . ئەم ڕووداوە لە ٧ی نۆڤەمبەری ١٩١٨دا لە شاری موسڵ ڕوویدا ، ئەویش ئەوەبوو کە لە میانەی ئەو کۆنفرانسەی نوێنەری سەربازیی بەریتانییەکان و تورکەکانی تێدا ئامادەبوون ، ژێنراڵ جۆن مارشاڵ فەرماندەی بەریتانیی ، وێڕای نارەزایەتیی ژێنراڵ علی ئیحسان پاشای فەرماندەی تورك ، جەختی لەوە کردوە کە بەندەکانی ئاگربەستەکەی مودرۆس ئەوە لە تورکان دەخوازێت کە تەواوی ویلایەتی موسڵ چۆڵبکەن . لەبەرامبەر هەڵوێستی ئەم نەیارە سەرکەوتووە سەرسەختەدا ، علی ئیحسان پاشا ئەو داوایەی بە بێزارییەوە بەسەردا سەپێنرا .[٣] هەر بۆیە لە سۆنگەی ئەم دیفاکتۆیەوە بوو کە ویلایەتی موسڵ بووە بەشێك لە عێراق .

لە ٢٨ی یەنایەری ١٩٢٠ دا ، کەمالیستەکان بەڵێننامەی نیشتمانییان ڕاگەیاند ، ئەو بڵاوکراوەیەی بەشێوەیەکی بەرفراوان لەسەر بنەمای ئەو بڕیارانە فۆرمەڵەکراوە کە پێشتر لە کۆنگرەی سیواس و ئەرزڕۆم بەسترابوو . ئەم بەڵگەنامەیە بەرجەستەی دیدی کەمالیستەکانی سەبارەت بەو هەرێمانەی پێشوو دەکرد کە کەوتبوونە باشووری هێڵی ئاگربەستەکەی ساڵی ١٩١٨ ەوە و ئەوەشی ڕوون کردبووەوە کە هەموو ئەو ناوچانەی دانیشتووانەکەی موسوڵمانی نا عەرەبن بە بەشێکی دانەپچڕاو لە تورکیا لەقەڵەم دەدرێت . بێگومان مەبەست لەو دوا ئاماژەیەی بەڵگەنامەکە بریتیبوو لە ویلایەتی موسڵ ، کە بەشێوەیەکی بەرفراوان دانیشتووانەکەی موسوڵمانی ناعەرەب یاخود کورد بوون .بەڵێننامەی نیشتمانیی یەکەمین بانگەشەی تورکەکانە بۆ گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵ لەو کاتەوەی کە لە ٧ی نۆڤەمبەری ١٩١٨ەوە دەسەڵاتی بەریتانییەکانیان پەسەند کردبوو .[٤] هەروەها ئەم بەڵێننامەیە سەرەتای ئەو وروژاندن و هاندانەی تورکیا بوو کە هەرێمەکەی بۆ ماوەی چەند ساڵێکی داهاتوو لە ئاڵۆزیی و نائارامییدا تێوەگلاند ، تا ئەو کاتەی

---

[٣] A.T.Wilson,Loyalties,2:21.

[٤] For The Text ,see H.W.V. Temperley, A History of The Peace Confrance of Paris,vol.6,London,1924,605-6.

کێشەکە کۆتاییهات لەڕێگەی ڕێکەوتننامەی ئینگلیزی –تورکی–عێراقییەوە لە ساڵی ١٩٢٦دا مۆرکرا .

لە میانەی ڕووداوەکانی داهاتوودا پەسەندکردنی ماندێتی بوو بەسەر عێراقدا لە لایەن بەریتانییەکانەوە لە ئەپرێلی ١٩٢٠دا . وێڕای پشتگیریی بەرپرسیارێتیی کۆمەڵەی گەلان لەمەڕ هەردوو بەشە عەرەبیی و کوردییەکەی وڵاتەکە . بەم توانایەوە بوو کە بەریتانییەکان لە کۆمەڵەی گەلان و لە لۆزان دا دژی داواکارییەکانی تورک سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ وەستانەوە و بەرهەڵستیی گەڕانەوەی هێزەکانی تورکە بووژاوەکانیان بۆ ئەو ناوچەیە کرد .

هاوپەیمانەکان ، کە سووربوون لە سەر هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی و بەتەواویی لە بەڵێننامەی ئیشتمانیی کە شەش مانگ لەوەوپێش لەلایەن کەمالیستەکانەوە ڕاگەیەندرا ، بێ ئاگابوون ، ڕژێمی لاوازی سوڵتانیان ناچار کرد ڕێکەوتننامەی سیڤەر لە ١٠ی ئووتی ١٩٢٠دا مۆربکات . بڕگەکانی ٦٢، ٦٣ و ٦٤ی ئەم ڕێکەوتننامەیە مافی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی کوردیی فەراهەم کرد . هەرچەندە پاش ئەمێکی کەم لەلایەن کەمالیستە سەرکەوتووکانەوە پووچەڵکرایەوە و شوێنی بە ڕێکەوتننامەی لۆزان گیرایەوە ، وێڕای ئەوەش ڕێکەوتننامەی سیڤەر بەردی بناغەی مێژووی نەتەوایەتیی کوردە ، چونکە یەکەمین جارە خەونی سەربەخۆخوازیی کورد لە بەڵگەنامەیەکی نێودەوڵەتییدا ڕێزی لێگیراوە .

لە ئینگلتەرا ، بەشێکی سەربەخۆ بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ئۆفیسی کۆلۆنیالیی پێکهێنرا تاکو مامەڵە لەگەڵ کێشەکانی ئەو ناوچەیەدا بکات . ئەم بەشە ئەرکی بەرپرسیارێتی کارگێڕیی لە عێراقدا گرتە ئەستۆ و سەبارەت بە دیارییکردنی سروشتی ئایندەیی حکومەت و دەسەڵاتی ڕامیاریی لەو وڵاتەدا بەرپرس بوو . لە مارتی ١٩٢١دا ، ماوەیەکی کەم پاش دامەزراندنی ئۆفیسەکە ، وینستۆن چێرچڵی وەزیری نوێی دەوڵەت بۆ کۆلۆنییەکان ، بانگەوازی سازدانی کۆنفراسێکی لە قاهیرە کرد تا ئاییندەی ئاراستەی سیاسەتی بەریتانیی سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی تێدا دیاریی بکرێت .[5]

---

[5] کۆنفرانسی قاهیرە ، سێر پێرسی کۆکس ی کۆمیسەری باڵا لە عێراق و ژمارەیەک لە کارمەندانی بەریتانیی تێدا ئامادەبوون لەگەڵ دوو وەزیری عێراقی کە جەعفەر پاشای عەسکەریی وەزیری بەرگریی و ساسۆن حەسقیلی وەزیری دارایی بوون

چەند بڕیارێکی گرنگ لەم کۆنفرانسەدا پەسەند کرا ، لەوانە بڕیاری پشتگیریی کردنی هەڵبژاردنی ئەمیر فەیسەڵ بۆ بەدەستهێنانی تەختوتاجی عێراق . فەیسەڵ کە لە دواتر لە ژوونی ١٩٢١دا گەیشتە بەسرە ، لە ٢٣ی ئووتدا وەك پاشا ڕاگەیەندرا . پاش ئەوەی ریفراندۆمێك کرا و گوایە تێدا ٩٦ لە سەدی تێکڕای دەنگەکانی بەدەستهێنا .

پێش ئەوە ، لە ١١ی نۆڤەمبەری ١٩٢٠دا ، حکومەتێکی کاتیی نیشتمانیی بە سەرۆکایەتیی سەید عەبدولرەحمان ئەلنەقیب دامەزرێنرا . پەرەسەندنەکان کوردی تووشی دڵەڕاوکێ کرد ، چونکە ترسیانی سەبارەت بە ئەگەری دەستبەسەرداگرتنی ئایندەییان لەلایەن حکومەتێکی عەرەبییەوە لە بەغدا وروژاند . کۆمیساری باڵای بەریتانیی بە مەبەستی هێورکردنەوەی ئەم دڵەڕاوکێیانەی کورد لە ٦ی مایۆی ١٩٢١دا بەیاننامەیەکی دەرکرد ، کە پێویست بوو لە لایەن ئەفسەرانی رامیاریی بەریتانییەوە لە موسڵ و هەروەها لە لیوای سلێمانی سەرنجی کوردانی بۆ رابکێشن .[٦]

بەیاننامەکە بەوە دەستپێدەکات کە کوردان لەوە ئاگادار دەکاتەوە کە کۆمیساری باڵا هەست بە نیگەرانیی کوردان سەبارەت بە ئاییندەی رامیارییان و خواستیان بۆ رژێمێکی ئۆتۆنۆم دەکات . بەیاننامەکە ئاماژە بۆ ئەو پەیوەندیی و هاوبەستەگییە ئابوورییە دەکات کە ناوچە کوردییەکان بە عێراقەوە دەبەستێتەوە هەروەها خواست و ویستی کۆمیساری باڵا سەبارەت بە بەدیهێنانی ئارەزووەکانیان لەو بارانەوە بە کورد دەگەیەنێت . لە کۆتاییدا بێ ئەوەی باس لەوە بکات کە کەی و لەچ رێگەیەکەوە ئارەزووەکانی کورد بەدی دەهێنرێت ، دەستدەکات بە دیارییکردنی ئەو پێشنیازانەی سەبارەت بە کارگێڕیی ناوچە کوردییەکان " پێویستە کە بەباش بزانرێن بۆ مانەوە لە ژێر سایەی حوکمەتی عێراقدا ." دواتر پێشنیازی سێ خاڵی پرۆگرامی کارگێڕیی کردووە .

---

Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, October 1920 to March, 1922 (London:H.M. Stationary Office,1923),10.Cf. Edmonds ,Kurds. Turks and Arabs,117-118.

[٦] زانیارییمان هەیە کە ئەو بەیاننامەیە بەگوێرەی سیاسەتێك بڵاوکراوەتەوە کە لە کۆنفرانسی قاهیرەدا لەسەری ڕێکەوتوون . بڕوانە :

Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, October 1920 to March, 1922 ,11.

خاڵی یەکەم بۆ پێکهێنانی لیوایەکی لاوەکیی کوردیی تەرخانکرابوو کە لە چوار قەزای کوردییەکەی موسڵ واتە : زاخۆ ، ئاکرێ ، دهۆك هەروەها ئامێدیی پێکبهێنرێت . ئەم لیوایە بخرێتە ژێر سایەی متەسەرفێکی بریکاری بەریتانیی ، هەروەها قایمقامەکان کە تا ئەو کاتە بەریتانیی بوون " پێویستە کوردیان لە جێگە دابنرێت یان ئەو عەرەبانەیان بخرێتە جێ کە زمانی کوردیی دەزانن و لەلایەن کوردەوە پەسەند دەکرێن " تا ئەو کاتەی کەسانی گونجاو ئامادە دەکرێن .لیواکە لە رووی دارایی و دادوەرییەوە دەبێت سەر بە حکومەتی بەغدا بێت –کە مافی ئەوەی دەداتی نوێنەری خۆی بۆ ئەنجومەنی دامەزراندن بنێرێت . لە رووی کارگێڕییەوە ، قایمقام دەبێت سەر بە متەسەریفە بریکارەکە بێت ، هەموو دامەزراندنە کارگێڕییەکانیش دەبێت لەلایەن کۆمیسەری باڵای بەریتانییەوە بێت ، دوای ئەوەی راوێژی خۆی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی خۆجێدا دەکات .

دووەمین بەشی بەرنامەکە مامەڵەی لەگەڵ کارگێڕییەکەی هەولێر ، کۆیسنجەق و رەواندزدا دەکرد . گوتبووی کە کۆمیسەری باڵا هەوڵدەدات " کارمەندانی بەریتانیی بکاتە بەشێك " لە کارگێڕیی ئەو سێ قەزایە . دامەزراندنی کارمەندانی میریی ، وەك بەڵێنی لەبارەوە درابوو ، بە لەبەرچاوگرتنی گونجاوی خواستی دانیشتووانەکە دەبێت .

سێیەمین و دواخاڵ بۆ هەرێمی سلێمانی تەرخانکرابوو . پێویستە سلێمانی پلەی متەرسەریفیەتی پێبدرێت و لەلایەن متەسەریفێکەوە لە ئەنجومەنێکدا بەڕێوەببرێت . متەسەریف کە لەلایەن کۆمیسەری باڵاوە دەستنیشاندەکرێت . لەلایەن ئەفسەرانی رامیاریی بەریتانییەوە لە سلێمانی هاوکاریی دەکرێت و بەو توانایەوە هەڵدەسوڕێت . متەسەریف لە ئەنجومەندا ئەو دەسەڵاتەی پێدەبەخشرێت کە کۆمیسەری باڵا بە گونجاوی دەزانێت ، پاش ئەوەی لەگەڵ خۆی یان ئەنجومەنی دەوڵەت راوێژ دەکات .

ریفراندۆمەکە کە لە کۆتایی ژوونی ١٩٢١دا بۆ پێدانی رەوایەتیی بە هەڵبژاردنی فەیسەڵ وەك پاشای عێراق ئەنجامدرا ، دوو پەرەسەندنی سەرنجڕاکێشی لەگەڵ خۆیدا هێنا . سلێمانی ئامادە نەبوو بەشداریی بکات ، هەروەها کەرکوکیش بە دوودڵییەوە ئەو کارەی کرد ، ژمێردرابوو ، وەك دەڵێن بۆ ٤٠لەسەدی دەنگی ئەخێر. ئەوەی بەتەواویی جێگەی بایەخ بوو بۆ بۆنەی ئاهەنگی تاج لەسەرنانەکەی فەیسەڵ کەلە ٢٣ی ئووتی ١٩٢١

له بەغدا ئەنجامدرا هیچ نوێنەرێك لەهەر یەك لەودوو لیوایە ئامادە نەبوون .[7]

لەو گفتوگۆیەی رابوورد دەردەکەوێت کە هەلومەرجەکەی ویلایەتی موسڵ چەندە سەخت و ئاڵۆز بووە . کوردان بەتایبەتیی لەباروودۆخێکی نالەباردا بوون .چەند بەڵێنێکی وەك چوارده بەندەکەی سەرۆك ویلسن ، بلاوکراوەی ئەنگلۆ-فەرەنسیی ، رێکەوتننامەی سیڤەر ، هانی دەدان و ئومێدەواری دەکردن ، هەروەها لەبەرامبەردا کەوتبوونە بەر هاننەدان و رەتکردنەوەی و سەرسەختیی بەریتانییەکان لەگەڵ دەست بە پشتداهێنان و هەڕەشەی تورکەکان ، ئەمانە هەمووی تووشی سەرسامیی کردبوون لەوەی کە دەبێت کام تولەرێ بگرنەبەر . ئیدمۆندز بەجوانی ئەو سەرسامییەی کوردانی خستۆتەبەرچاو کە لەم قۆناغەی گفتوگۆی لەسەردەکرێت خۆیانیان تێدا بینیوەتەوە :

" دوای مۆرکردنی رێکەوتننامەی سیڤەر ئاناسایی نەبوو کە تورکەکان هەوڵەکانی خۆیان دووهێندە بکەن بۆ ئەوەی کار لە تەواوی دانیشتووانەی ئەو ویلایەتە بکەن ، ئەوانەی کە نرخێکیان لەو لاپەڕەیە نەدەگرت کە لەسەری نووسرابوو : هەڕەشەی داگیرکارییەکی بەرفراوان بەرێوەیە ، نوێنەرانی نهێنی لەگەڵ رێبەرانی کۆمەڵگەی شارنشین ، شاندی نهێنی بۆلای خێڵەکییە بێزارەکان ، هاندانی ئاشکرا بۆ یاخیبوون ، هەڕەشە لە "ناپاك و خۆفرۆشەکان" هەروەها چوونە نێو هەمووان ، داواکردنی وەفاداریی بۆ سوڵتان کە لەهەمان کاتدا خەلیفەشە . ئامانجی سەرەکی ئەم پرۆپاگەندەیە کوردان بوون ، کە ئێستا بەهۆی ئەو سۆز و راکێشانە دژبەیەکانە پەرت بوون : ئەمەکداریی بۆ ئایینەکەیان ، رێز و ترس لە توانای سەردارەکەی پێشوویان ، خەونی سەربەخۆیی کە تەنیا بە پشتگیریی ئەو بەریتانیایە دێتە دی کە ئامادەنیە بیکات ، ئاارامیی و بێزاریی کە لەلایەن ئەو دەسەڵاتەوە بەسەریاندا سەپێنراوە کە فەرمانڕەوایەتیان دەکات ، دڵککردنی بەهێزیان لەمەڕ ئەوەی کە لە رووی ئابوورییەوە بە توندی بە بەغداوە بەسراونەتەوە ، هەروەها نیگەرانییان لەوەی تەنانەت لەگەڵ بوونی رژێمێکی ئۆتۆنۆمییشدا سەر بۆ پاشایەتییەکی عەرب دانەوێن .[8]

---

[7] Ibid.,15. Cf. Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,118.

[8] Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,118.

مێجەر سۆن ، ئەفسەری رامیاریی بەریتانیی بۆ هەرێمی سلێمانی ، هەوڵیدا لەو هەرێمەدا جەخت لە ئاستێکی بەرچاوی هێمنیی و ئارامیی بکاتەوە ، تەنانەت لەو قۆناغە سەختەی کە راپەرینەکەی شێخ مەحموودیشی تێدا قەوما .[9] دوای ئەو گۆڵد سمس هات ، کە ئەویش وادەردەکەوت بە باشیی بچێتە پێش تا ئەو کاتەی تەوژمێکی لەتاکاوی ئاڵۆزیی و ناثارامیی ئەو هێمنییە رووکەشەی سلێمانی و تەواوی ئەو بەشانەی کوردستانی رەواندەوە کە لەلایەن بەریتانییەکانەوە بەڕێوەدەبرا . ئاشکرابوو کە ئەم ئاڵۆزییانە لەلایەن بەریتانییەکانەوە نەورووژێنرا .

لە زستانی ١٩٢١-١٩٢٢ دا ، مەحموودخانی دزڵی ، کە پەیوەندی بە پیاوانی نهێنی تورکەوە هەبوو ، لە قەزای هەڵەبجە دەستی بە راووڕووت کرد و چالاکییەکانی لەرێگەی هێزەوە بەربەست کرا . هەرچەندە تا ئەو کاتەی لەکۆتایی مایۆی ١٩٢٢دا رێکەوتنی لەگەڵ کرا ، هێشتا سەرچاوەیەکی گرفت و ئاڵۆزیی لەو ناوچەیەدا پێکدەهێنا.[10] یەك لە یاخییبوونە لاوەکییەکانیش کە لەو ناوچەیەدا گرفتی بەردەوام بوو تا ئەوکاتەی ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەشی هێزەکانی لیڤیی و هێزی ئاسمانیی پاشایەتیی(هاپ) دژی ئەنجامدرا و پاش ئەوەی (بانی بنۆك) کە لە دەوروبەری هەڵەبجەدایە ، لێدرا .[11]

لەسەرەتای بەهاری ١٩٢٢دا ، حکومەتی تورك شێلگیرانە هەنگاوی هاویشت و سیاسەتێکی بالادەستی تورکیی لە کوردستانی عێراقدا دەستپێکرد کە ئەو ناوچەیەی بۆ ماوەی چەندین مانگی داهاتوو خستە حاڵەتی هەژانەوە . حکومەتی تورك لە ١٧ی مارتی ١٩٢٢دا ، پیاوێکی خۆی کە رەمزی بەگ بوو بە ناوی قایمقامی رەواندز دامەزراند و یەکسەر رەوانەی ئەو قەزایەی کرد . بەرەو کۆتایی مانگی مایۆ ، هەر ئەوەندە رەمزی بەگ گەیشتە رەواندز ، دەستیکرد بە هەڵمەتێکی توندی بەرفراوان لەنێو خێڵەکاندا ، لەو

---

[9] وا پێدەچێت سۆن وەك نارەزایەتییەك دژ بەو سیاسەتە نوێیەی بەریتانیا کوردستانی جێهێشتبێت. Ibid.,122.

[10] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,32.

[11] Ibid.,33.

پێناوەشدا هەڕەشە و خۆبردنەپێشەوەی بەکاردەهێنا . ئەو باسی لە هاتنی هەرچی زووتری هێزێکی مەزنی تورک دەکرد کە مەبەستی سەندنەوەی سلێمانی ، کەرکوک و هەولێرە لەدەست بەریتانییەکان .[12] لەناوەڕاستی ژوونی ١٩٢٢دا ، ژێنراڵ عەلی شەفیق ئەلمیسری کە بە (ئۆزدەمیر) ناسراوە ، بەدوای رەمزی بەگدا گەیشتە ئەوێ . ئەمەی دواییان بە هاتنەکەی خۆی وای راگەیاند کە ئەرکەکەی سەرلەنوێ گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵە .[13]

لە کۆتایی ١٩٢٢دا ، چالاکییەکانی پیاوەکانی تورک بەری خۆی دا ، سەید محەمەدی سەرۆک عەشیرەتی جەباریی ، گەر بەبیر بیهێنرێتەوە ، یەکێک بوو لە پارتیزانەکانی شێخ مەحموود لە راپەڕینەکەی ١٩١٩ دا ، بەهۆی رق و کینەی شەخسییەوە پەلاماری بەڕێوەبەری ناحیەی دا و برینداری کرد و داوای لە شوێنکەوتەکانی کرد دژی حکومەت راپەڕن . ئەو کارەی واپێدەچوو فەتاحی کەریم بەگی جوڵاندبێت ، ئەوەی سەرۆکی بەشێکی خێڵی سەرکەشی هەمەوەند و یەك لە یاخییەکانی دیکەی ١٩١٩ بوو .

کەریمی فەتاح بەگ جوڵانەوەکەی خۆی دژی حکومەت بە شێوازێکی تاڕادەیەك نائاسایی دەستپێکرد . ئەو دەستیکرد بە ناردنی نامەی هەڕەشە ئامێز بۆ کاپتن بۆندی جێگری ئەفسەری رامیاریی ، پاشتر وای پێشاندا کە هەڵوێستی خۆی گۆڕیوە و لەو کارەی پێشووی پەشیمانی دەربڕیی . ئەو بانگهێشتی هەریەك لە کاپتن بۆند و کاپتن ماکنات ی کرد کە بەرپرسی هێزەکانی لیڤیی خۆجێ بوون بۆ ئەوەی لە گوندێکی نزیك دەربەندی بازیاندا لە ١٨ی ژووندا چاوی پێیان بکەوێت .هەرچەندە ئەوان لەلایەن سەرخێڵە دۆستەکانەوە هۆشیارکرانەوە ، بەڵام بڕیارياندا کە ئەو مەسەلەیە بەئەرکێکی خۆیان بزانن و بانگهێشتەکەی پەسەند بکەن . بە گەیشتنیان بۆ شوێنی کۆبوونەوەکە ، دەرکەوت کە ئەو دوو ئەفسەرە بە تەواویی بەو نامە گەرموگوڕ و دۆستانانەی کە

---

[12] Ibid. Cf. Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,245.

[13] ئۆزدەمیر لە بنەچەدا چەرکەسییەکی میسرییە . ئەو لە ساڵی ١٩١٩دا خۆی هاویشتە باوەشی کەمالیستەکان و پاش هاتنی بۆ کوردستانی عێراق رۆڵێکی گرنگیی لەو ناوچە سنوورییەدا بینی بڕوانە :

Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,33.Cf. Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,245.

سەرخێڵی هەمەوەند بۆی ناردبوون هەڵخەڵەتابوون و کاتێك شان بە شانی کەریم بەگ بەسواریی دەڕۆیشتن لە پشتەوە تەقەیان لێکرا و پێکران .

کەریمی فەتاح بەگ جگە لەوەی بەم شێوازە بەدکارییە ناشکرایەی ململانێ و ڕکابەریی دەستەی کارگێڕیی بەریتانیی دەستپێکرد ، ئەمێستاش بە جەبارییە یاخییبووەکانەوە پەیوەست بوو .[14] هێزەکانی لیڤیی و هێزی ئاسمانی پاشایەتیی (هاپ) زیاتر لە مانگێك لەو وڵاتەدا بەدوای کەریمی فەتاح بەگدا دەگەڕان . بەڵام دەرکەوت کە ئەو لێهاتووانە خۆی لێ حەشاردابوون . لە کۆتایی ژوونی ١٩٢٢دا ، هەواڵی ئەوە هەبوو کە کەریم بەگ بەرەو باکوور ڕۆیشتووە و بە تورکەکانەوە پەیوەست بووە .[15]

هەمان کات ، ئەو لیڤییانە گەیشتنە پشدەر و بەدوای سەرۆکی ڕاکردووی هەمەوەندا چووبوونە ئەوێ ، بابەکرئاغای سەرۆکی ئینگلیزخوای پشدەریان لە دۆخێکی پەشێودا بینیەوە کە کەوتبووە بەر فشار و دوژمنایەتیی دەستەیەك لە خێڵەکەی خۆی . بوونی هێزەکانی لیڤیی لە ناوچەی پشدەر سەرلەنوێ سەنگی هێزەکانی بە قازانجی بابەکرئاغا گۆڕیی و ئاسانکاریی بۆ کرد دەسەڵاتی خۆی بەسەر خێڵەکەیدا بگێڕێتەوە . هەلومەرجەکەی ئەو ناوچەیە بە دەستێوەردانی سمکۆئاغای شکاك و سەید تەهای نەهریی هاوپەیمانی بە قازانجی کارگێڕییەکە هێورتر بووەوە ، دەگوترێت هەردوو سەرکردەکەی کورد بەدرێژایی سنوورەکان سەرخێڵەکانی کوردی ئێرانیان وریا کردۆتەوە کە هاوکاریی ڕەگەزە چەکدارە یاخییبووەکانی سلێمانی نەکەن .[16]

## هەلومەرجەکەی ڕانیە

هەلومەرجەکەی ڕانیە بە تەواویی لە ئاکامی هاتنی ئۆزدەمیر و ڕێکخستنەکانی لە ڕەواندزدا لە لایەك و بەهۆی عەباسی مەحموودی سەرۆکی بەشە ناحەزەکەی خێڵی

[14] Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April. 1922 to March. 1923 ,34.Cf. Edmonds .Kurds. Turks and Arabs.245.

[15] Edmonds .Kurds. Turks and Arabs,245-46.

[16] Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April, 1922 to March. 1923 ,34.

پشدەر کە لە دەوروبەری پشدەر بوو ، لەلایەکی ترەوە ، ئاڵۆزا و تێکچوو . سی .جەی .ئیدمۆندزی ئەفسەری رامیاریی کە ئاگاداری هەلومەرجە مەترسییدارەکە بوو ، شێلگیرانە داوای ناردنی هێزی سەربازیی کرد تاکو پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت سزای رەگەزە یاخیبووەکان بدات . داواکەی ئیدمۆندز لەبەرچاو نەگیرا ، بەڵام هەلومەرجەکەی ئەو ناوچەیە کە لەسەر نائارامیی خۆی بەردەوام بوو ، بەرەو خراپتر ئەڕۆیشت .[17]

وێڕای ئەوەی هەلومەرجەکەی رانیە لە ئاکامی پەرەسەندنێکی ناوەختی دیکەوە کاری تێکرا کە گەیشتنی کەریمی فەتاح بەگی سەرخێڵی هەمەوەند بوو بۆ نێو تورکان و ئەوەش هانیدان کە هیوایەکی زیاتریان بەهاوکاریی خێڵەکان هەبێت . لەپێناو بەدیهێنانی ئەم ئامانجەدا ، چەند دەستەیەکی تورکیان بەرەو باشوور و بە ئاراستەی رانیە نارد ، کە لەوێ تێکەڵ بە خێڵی پشدەرییە ناحەزەکان و چەکدارە خێڵەکییەکانی کەریمی فەتاح بەگ بوون .[18] ئۆزدەمیر وەك بەشێك لە پیلانێکی گشتیی بۆ وروژاندنی خێڵەکان ، نامەی بۆ تەواوی پیاوە ناسراو و سەرۆکەکانی ناوچەی ناودەشت نارد و داوای لێکردن پەیوەندیی بە هێزەکانیەوە بکەن . ئەم تاکتیکەی وەك شێوازێك لە پرۆپاگەندە سەرکەوتنێکی خێرا و بەرایی لە ناوچەی رەواندزدا بەدەستهێنا .[19]

لە ٢٧ی ژوونی ١٩٢٢دا ، کۆڵۆنێل (ئی.سی.تی مێیت) بەخۆی و لیڤییەکەی سلێمانییەوە لەناکاو گەیشتە دەربەند ، کەریمی فەتاح بەگ لە دوکانەوە لە زێ پەڕییەوە و

---

[17] Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,248ff.

[18] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,35.Cf. Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,246.

سەبارەت بەو چاوەڕوانییە درێژخایەنەی بۆ گەیشتنی کەریمی فەتاح بەگ بۆ نێو تورك دەکرا بڕوانە :

Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,252.

[19] بەریتانییەکان دەستیان بەسەر ژمارەیەك نامەدا گرت کە لەلایەن فەرماندەی تورکەوە لە جەزیرەی ئیبن عومەرەوە بۆ چەند پیاوماقوڵێك لە رەواندز نێردرابوو فەرماندە تورکەکە دڵنیایان دەکاتەوە کە هیچ کات رێگە نادرێت ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە بلکێنرێت ، داواشی لێکردبوون بەدەنگ بانگەوازی جیهادەوە بچن پاش جەخت کردنەوە لە پەیوەستی ئایینیی و بەڵێنی هاوکاریی ، نووسەری نامەکە بەم دەستەواژەیە کۆتایی هێنابوو :" نەفرەتی خوا لەو کافرانەی ئایینی خۆیان بە ئینگلیزەکان دەفرۆشن و هەروەها نەفرەت لە فەیسەڵ و شوێنکەوتەکانی ، ئامین "

Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,246.

بەخێرایی بەرەو رەواندز رۆیشت . منیت هیچ کاتێکی بەفیڕۆ نەدا بۆ ئەوەی دوای سەرۆکی هەمەوەند بکەوێت و بەوهیوایەی پێش ئەوەی بگاتە شوێنەکەی خۆی رێگەی لێبگرێت و رووبەڕووی بێتەوە ، بەڵام هەواڵەکان ناکامی ئەم هەوڵە پێشان دەدەن .[٢٠]

وادەردەکەوێت کە گەیشتنی لیڤییەکانی سلێمانی بۆ دەربەند کاریگەرییەکی باشی لەسەر خێڵە راڕاکانی دەوروبەری رانیە هەبووبێت ، هەروەها هەلومەرجەکەی بۆ ماوەیەك جێگیر راگرتبێت . هەرچەندە ئەم وچانە بەردەوامییەکی کورتخایەنی لەچارە نووسرابوو . ماوەیەکی کەم پاش ئەوە کۆلۆنێل منیت بڕیاریدا کە پێویستە بەمەبەستی " حەوانەوە و خۆرێکخستنەوە" بگەڕێنەوە سلێمانی . ئەو لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی ئەو کارەیان ئەنجامدا و یەکەیەکی سەربازیی بە سەد تفەنگ و چوار دۆشکەوە لە پشت خۆیەوە بەجێهێشت .[٢١]

هەمان کات ، کەریمی فەتاح بەگ توانی بەخۆی و دەستەیەك لە چەکدارە خێڵەکییەکانیەوە بگاتە رەواندز . تورکان بە پەیوەست بوونی ئەم هێزە پێیانەوە ورەیان بەرزتر بووەوە . ناو و ناوبانگیان وێڕای توانای پەلاماردان و هەراش بوونیان لە ناوچەکەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان زێدەتر بوو . ئەوانەی هیچ کاتێکیان بۆ ئامادەکاریی بەمەبەستی پەلاماردانی رانیە بەفیڕۆ نەدا . لە ١٢ی مانگدا ، وەك ئەفسەری رامیاریی لە رانیە دەڵێت :"دەرکەوت کە بەتەواویی گەڕاوینەتەوە ئەو جێگەیەی پێش گەیشتنی منیت لێی بووین و ئەوەش سەرەتای قەیرانێکی نوێ بوو ".[٢٢]

ئەفسەری رامیاریی سەرلەنوێ لە حاڵەتێکی ترس و تۆقیندا تکایەکی بۆ ناردنی هێزی زەمینی و دەستپێکردنی هێرشی ئاسمانیی بۆ سەر هێزە خێڵەکییەکان بەرز کردەوە ، ئەوانەی کە لەگەڵ تورکەکاندا خەریکبوون بەرەو رانیە پێشڕەویی بکەن . لەکۆتاییدا ، لەئێوارەی ١٧ی نوٚڤەمبەری ١٩٢٢دا ، ئەفسەری رامیاریی بە تەلەگراف ئاگادار کرایەوە کە هێزێك بەناوی (رانیکۆڵ/کاروانی رانیە) ەوە بەمەبەستی رووبەڕووبوونەوەی

---

[20] Ibid.,250.

[21] بەگوێرەی ئیدمۆندز ، شەپۆلێکی گەرمای توند و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی مەلاریا کە چوار لە پێنجی سەربازەکانی هێزەکەی منیت ی گرتبووەوە ، وای لەو فەرماندە بەریتانییە کرد ئەو بڕیارە بدات

Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,245.

[22] Ibid.

هێزە تورکییە-کوردییەکانی ناوچەی رانیە پێکهێنراوە . هەرچەندە چەند رۆژێکی خایاند تا کاروانی رانیە ئامادەکرا ، کاتێك بەرێکەوت دەرکەوت کە تواناکەی بەشێوەیەکی بەرچاو لەوە کەمترە کە بەڵێنی لەبارەوە درابوو . ئەو کاروانە لە ٢٩ی ئووتدا بارەگاکەی لە دەربەندی رامکان خست و لە ساتەکانی بەرایی سەرلەبەیانیی ٣١ی ئووتدا لەلایەن هێزەکانی ئۆزدەمیرەوە پەلاماردرا .[٢٣]

فەرماندەیی بودەڵە و لاوازی کاروانەکە بە ئاشکرا لەو شکستەی بەسەریدا هات بەرپرسیاربوون . لە کۆتایی ئەو رۆژەدا ، بۆی دەرکەوت کە هێزەکە ناتوانێت شوێنی خۆی لە دەربەند بپارێزێت . هەربۆیە فەرمانی پاشەکشەی دا . بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو رۆژە فەرمانی رووبەڕووبوونەوەی بە سەربازەکانی خۆی دابوو ، هەر بۆیە رانیەیان لەدەستدا و کەوتە دەست دوژمن ئەویش لەجیاتی ئەوێ بەرەو کۆیسنجەق کشایەوە . ئەوەی کە دەبوو بەشێوەیەکی رێك‌وپێك بووایە بەخێرایی بووە نیشانەی هێزەکانی دوژمن . ئەوانەی لە گردەکانی دەوروبەرەوە دابارینەخوارێ پاش و پێشی کاروانەکەیان پەلاماردا . پاش ئەوەی کاروانەکە قوربانییەکی زۆری دا و کەل‌وپەلە سەربازییەکانی تێداچوون بە خێرایی بە ئاراستەی کۆیسنجەق قوچانی . ئەوەی مابووشەوە بەهۆی ئەوەوەبوو کە لەکاتی خۆیدا (هاپ) لەرێگەی بۆمباران و تۆشکەبارانی پەلاماردەراندا ، ناچاری کردن دەست لە راونانی کاروانەکە هەڵگرن .[٢٤]

سۆن پاش ساڵێك دواتر گوتوویەتی کە سەرکەوتنی تورك لە ناوچەی رانیە بەشێوەیەکی مەزن بەهۆی ناجێگیریی سیاسەتی حکومەتی بەریتانیی لە کوردستان و هەروەها لە ئاکامی شکستی سمکۆ لە باکووری ئێران بوو ، کە بەشێك لە شوێنکەوتەکانی ناچاربوون لای تورکەکان شوێن و کار بۆ خۆیان پەیدا بکەن .[٢٥] گومانی تێدا نیە کە چەند هۆکارێك لەم رووەوە سەنگی تورکەکانیان قورستر کرد. ئاشکراشە شکستهێنانی کاروانی رانیە -هەرچەندە لە رووی دیدی سەربازییەوە بایەخەکەی بەشێوەیەکی رێژەیی سنووردار بوو- یەك لە دەستکەوتە بەرچاوەکانیان بوو . ئەو راستییەی کە هێزێکی

---

[23] Ibid.,253-55.

[24] Ibid.,255-59.

[25] E.B.Sone," Evacution of Kurdistan : An Ill-Fated Expedition." Epedition," Journal of Central Asian Society 10,part1,(1923):73-75.

بچووك ، به توانا و سەرچاوەیەكی سەربازیی سنووردار بتوانێت ناوچەیەكی مەزن لە دەوروبەری وڵاتی كوردەواریی بهەژێنێت و هێزێكی سەربازییش كە بەریتانییەكان فەرماندەییان دەكرد و لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی بەریتانییەكاندا تێكبشكێنێت ، ئەمە بۆ لیهاتوویی ، بوێریی ، هەروەها توانای رێكخراوەیی دەستەی ئەفسەرانی تورك دەگەیەنێت . راپۆرتێكی بەریتانیی ئەم ئاڵۆزییە لەناكاوەی هەلومەرجەكەی رانیەی بۆ ئەو پرۆپاگەندە سەركەوتووانەیە سەبارەت بە گەیشتنی هێزێكی توركیی مەزن گەڕاندۆتەوە . بێگومان ، ئەمە ، تێكڕای ئەو ڕاڕایانەی وا لێكرد كە وابزانن قازانجیان لەوەدایە پەیوەندیی بە جوڵانەوەی دژە بەریتانییەكان بكەن .[٢٦] لەڕاستییدا توركان ئەم جۆرە هەواڵانەیان لەبەرچاوگرتبوو .

## چۆڵكردنی سلێمانی

واپێدەچوو ئەو ڕووداوانەی پێشتر لە ناوچەی ڕانیە قەومان هانی بەریتانییەكانی دابێت كە كارێكی خێرا و لەناكاو لە سلێمانیدا ئەنجام بدەن . كۆمیسەری باڵا لەترسی ئەوەی لەوانەیە دوژمنەكانیان پاش ئەوەی دەستیان بەسەر ڕانیە و ناوچەی پشدەردا گرتووە ، هێرشێكی لەناكاو بكەنە سەر سلێمانی ، بڕیاریدا بۆئەوەی ژیانی بەریتانییەكان و كارمەندانی دیكە نەكەوێتە مەترسییەوە ، پێویست دەكات سلێمانی چۆڵ بكرێت .[٢٧]

مەیجەر گۆڵد سمیس ی ئەفسەری ڕامیاریی پێش جێهێشتنی شارەكە ، متمانەی بەڕێوەبردنی كاروباری كارگێڕیی هەرێمەكەی خستە ئەستۆی ئەنجومەنێكی هەڵبژێردراو، كە بەپێی ڕاگەیاندنەكەی كۆمیسەری باڵا لە ٦ی مایۆی ١٩٢١دا ، پەیوەندییان لەگەڵ خۆیدا دەبێت ، كۆمسیۆنەكە لەلایەن خۆیەوە شێخ قادری برابچووكی شێخ محموودی وەك سەرۆك دیاریی كرد . شێخ قادر كە لە بەغدا بوو ، ڕێگەی درایە چەند

---

[26] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,35.

[27] Ibid.Cf. E.B.Sone," Evacution of Kurdistan ,73-75; Edmonds ,Kurds, …,245.

ڕۆژێك زووتر بگەڕێتەوە سلێمانی . لەگەڵ ئەم گواستنەوەیەی دەسەڵاتدا ، کەلوپەلەکانی بەشی گەنجینە و بارووتخانەش ڕادەست کرا .[28]

ئەندامانی بنەماڵەی بەرزنجیی ، کە لەوپەڕی بێزارییدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی شێخیان دەکرد ، ئاگادارکرانەوە ، لەبەرئەوەی خۆیان لەو هەراوئاڵۆزییەی ئەم دواییە پاراستووە و بەشداریان نەکردووە ، ڕێگە بە شێخ محموود دەدرێت کە بگەڕێتەوە بەغدا و ئایندەی کارگێڕیی هەرێمەکەش پاش گەیشتنەوەی شێخ بۆ شارەکە دەچەسپێنرێت . هەلومەرجەکەی سلێمانی لەو ماوەیەی دەکەوتە پێش گەڕانەوەی شێخ مەحموود بەو چەشنە چووە پێش .[29]

شکستە ئابڕووبەرانەکەی کاروانی بەریتانییەکان لەناوچەی ڕانیە ، هاوکات بوو لەگەڵ چۆڵکردنی لەناکاوی شاری سلێمانی ، ئەوەش بەشێوەیەکی مەزن تورك و لایەنگرەکانی هاندا . زۆری نەبرد دەستەیەکی هێزی هەواڵکۆکەرەوەی تورك لە زێی بچووك دەرکەوتن و هەڕەشەی پچڕاندنی هێڵی پەیوەندیی بەریتانییەکانیان کرد . ماوەیەکی کەم پاش ئەوە ، هێزێکی بچووکی تورك کۆیسنجەقیان گرت و بەمەبەستی گرتنی تەقتەق لەسەر زێی بچووك کەوتنەخۆ . تورکان لە شوێنی یەکەم قایمقام و لە شوێنی دووەم بەڕێوەبەری ناحیەیان دانا .[30] هەواڵی ئەوە هەیە کە عەشیرەتی شێخ بزێنیی ، کە لەسەر ڕۆخی هەردووبەری زێی بچووك نیشتەجێن و دەکەوێتە نێوان کەرکوك – کۆیە ، سەری خۆی بەلای تورکەکاندا قەبڵاندووە .[31]

ئەمێستا تورکان تەمایان بوو جووڵانەوەیەکی دیکە ئەنجام بدەن . عەباسی مەحموود ئاغا ، سەرۆکی بەشە ئاحەزەکەی خێڵی پشدەر بەسەرکردەیی هێزێکی

---

[28] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,35;and Edmonds ,Kurds, ...,245.

بەگوێرەی سۆن ، ٤٥٠٠٠ ڕووپی لە خەزێنە و پێنج سەد تفەنگیش لە گەنجینەکەدا هەبووە

Sone," Evacution of Kurdistan ,74.

[29] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,35.

[30] Ibid; Edmonds ,Kurds, ...,296,298.

[31] Edmonds ,Kurds, ...,298.

خێڵەکیی و هەروەها ژمارەیەک سەربازی تورکدا بۆ هەڕەشە خستە سەر سلێمانی ڕەوانە کرا . هەرچەندە پیاوماقوڵانی سلێمانی توانیان وا لە ئەو سەرۆکەی پشدەر بکەن پێشڕەویی خۆی لە سورداش بوەستێنێت تا گەڕانەوەی شێخ مەحموود .[٣٢] هەروەها دەگوترێت کە ئامادەباشیی بۆ پەلاماردانی ئاکرێش لەبەرنامەدا بووە و کاری بۆ کراوە .[٣٣] هەرچەندە پێش تێپەڕینی مانگێک ، چەند هەڵمەتێکی شێلگیرانە و دژە پەلامار لەلایەن (هاپ) و لیڤییە بەریتانییەکان دەستپێکرد و دەسەڵاتی بەریتانیی بۆ سەراسەری ئەو ناوچە راپەڕیوە گێڕایەوە .

## گەڕانەوەی شێخ مەحموود

### تێڕوانین و پلانە نادروستەکانی شێخ

لە بەهاری ١٩٢٢دا ، هەلومەرجەکەی کوردستانی عێراق بەچەشنێک ئاڵۆز و شێوا کە بەریتانییەکان بڕیاریاندا جارێکی دی شێخ مەحموود بگێڕنەوە . ئەوەی کە دەبێت بەبیر بهێنرێتەوە ، پاش شکستی راپەڕینەکەی لە ١٩١٩دا بۆ هندستان دوور خرابووەوە . ئێمە زانیاریمان لەبارەیەوە دا کە لایەنگرانی شێخ مەحموود کە لەلایەن خزمانی دەستڕۆیشتووی بەرزنجییەوە سەرۆکاریی دەکران ، بۆ ماوەیەک لە پێناوی گەڕانەوەی شێخدا کەوتبوونە ورووژانکاریی .[٣٤] هەرچەندە وادەردەکەوێت ئەم جوڵانەوەیە پشتگیریی تەواو و پێویستی لە سەراسەری هەرێمی سلێمانیدا نەبووبێت . هەواڵی ئەوە هەیە کە لەباشوور ، بەگزادەکانی جاف بە گومانێکی مەزنەوە ڕوانیویانەتە ئەگەری گێڕانەوەی شێخ . لە باکوور ، لەنێو پشدەرییەکاندا ، وەک دەبینین ، ئەو

[32] Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April. 1922 to March. 1923 ,35; Edmonds .Kurds, ...,296.

[33] Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April. 1922 to March. 1923 ,35

[34] Ibid.,33;also Edmonds .Kurds, ...,112-123.

دەستەیەی لەلایەن بابەکرئاغاوە سەرکردایەتیی دەکرا بەتوندیی دژایەتیی شێخیان دەکرد ، لەکاتێکدا دەستەکەی کە لەلایەن عەباسی مەحموود ئاغاوە سەرکردایەتیی دەکرا بەتوندیی پشتگیرییان دەکرد .[35]

هەست و سۆزی دانیشتووانی ناوچەکە لەحاست شێخ مەحموود هەرچۆنێك بێت ، واپێدەچێت کە بەریتانییەکان چەند مانگێك پێش ئاشکراکردنی مەسەلەکە سەریان بە بیرۆکەی گەڕانەوە و گێڕاندنەوەی شێخ قاڵ بووبێت .[36] لە پاییزی پێشوودا ، شێخ لە هیندەوە هێنرابووە کوێت ، لەوێ کار بۆ ئامادەکردنی لەپێناو ئەرکەکەی داهاتوویدا دەکرا .لەهەمان کاتدا ، شێخ قادری برای رەوانەی سلێمانی کرا ، لەوێ ، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێدرا ، بەسەرۆکی ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراو دەستنیشان کرا .

لە ١٢ای سێپتەمبەری ١٩٢٢دا ، شێخ مەحموود گەیشتە بەغدا ، لەمیانەی ئەو دانوساندنەی لەوێ ئەنجامدرا ، شێخ مەحموود بەڵێنی دابوو کە نەك تەنیا کار بۆ بەرهەڵستییکردنی داگیرکاریی تورکەکان بۆ سلێمانی دەکات ، بەڵکو لە بەشەکەی دیکە هەرێمەکەشیان دەریدەپەڕێنێت . هەروەها ئەوەی پەسەندکرد کە دەست لە کاروباری هەرێمی کەرکوك و هەولێر وەرنەدات . لە بەرامبەردا ، هەردوو لای بەریتانیی و حکومەتی عێراق بە هەموو توانایانەوە هەوڵدەدەن لە یەکخستنی سۆزی نەتەوەیی کورددا هاوکاریی شێخ بکەن . هەروەها مەلیك فەیسەڵ رێگەی بە ژمارەیەك لە ئەفسەرانی کوردی سوپای عێراقی دا تا هاوکاریی شێخ مەحموود بکەن هێزە چەکدارەکانی خۆی رێکبخات .[37]

شێخ مەحموود کە قۆناغ بە قۆناغ بەرەو سلێمانی گەڕایەوە ، لە ٣٠ی

---

[35] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,33.

[36] لە لاپەڕە ١٢٤ی کتێبەکەی ئیدمۆندزدا وا دەردەکەوێت کە بەریتانییەکان تەواو سەرقاڵی مەسەلەی گێڕانەوەی شێخ مەحموود بووبن مەیجەر گۆڵد سمیس ی ئەفسەری رامیاریی لە سلێمانی بیرۆکەکەی پێ باش بوو ، بەڵام ئیدمۆندز بەتوندیی دژی وەستاوە و لایەنگریی دامەزراندنی سەید تەهای ئەمریی کردووە واپێدەچێت مەیجەر نۆئێلیش گێڕانەوەی شێخ مەحموودی پێ باش نەبووبێت لەلایەکی ترەوە بەریتانییەکان دانانی کەسێکیان لە بنەماڵەی بابانیی سلێمانی پێ باش بوو ، بەڵام بینیان کە دەستیان بەتەواویی لە کاروبارەکەی سلێمانی بەردەبێت

[37] Ibis.,301. Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,36.

سێپتەمبەری ۱۹۲۲دا بە هاوەڵی مێجەر نۆئێل ی ئەفسەری رامیاریی بەریتانیی کەوەك راوێژکاری شێخ راژەی ئەکرد گەیشتەوە شارەکە . بەدرێژایی رێگای گەرانەوەی بۆ سلێمانی ، شێخ لەنێو هەستی پرجۆش و خرۆشێکی مەزندا لەلایەن شاندی نێردراوی خێڵەکانەوە پێشوازیی لێکرا . لە سلێمانی ، کە دەسەڵاتی سەرۆکایەتیی ئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکەی لە براکەی وەرگرت ، وەك حوکمداری کوردستان پێشوازیی لێکرا . بڵاوکراوە خۆماڵییەکان مێجەر نۆئێل یان وەك جۆرە کۆنسوڵێك پێشاندابوو .[٣٨] بە بەخشینی سیفەتێکی دیپلۆماسیی بە راوێژکارە بەریتانییەکەی شێخ ، نەتەوەخوازانی کورد ، بێگومان وایان بیردەکردەوە کە خەت لە سەربەخۆیی ئەو ناوچە کوردییە لە سایەی شێخ مەحموود و جیابوونەی لە عێراق بکەنەوە .

لە ١٠ی ئۆکتۆبەری ۱۹۲۲دا ، شێخ مەحموود فەرمانێکی سەبارەت بە پێکهێنانی کابینەیەکی هەشت ئەندامی راگەیاند .[٣٩] لە ئەندامانی کابینەکە ، شێخ قادری برای وەك سەرۆك وەزیران ، ساڵح زەکی ساحێبقڕان کە سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراو بوو ، وەك وەزیری بەرگریی نیشتمانیی ، حاجی مستەفاپاشای ژێنراڵی پێشووی عوسمانیی وەك وەزیری خوێندنی نیشتمانیی ، هەروەها عەبدولکەریمی عەلەکە پیاوماقوڵێکی کریستیانیی سلێمانی وەك وەزیری دارایی .[٤٠] هەروەها شێخ پولی پۆست و رۆژنامەشی چاپ و بڵاوکردەوە ، ناوی رۆژنامەکە (رۆژ کوردستان) بوو.[٤١] راپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی ئاماژەی بەوە داوە کە سەرخێڵەکانی هەردوو بەری سنووری کوردستان هێز و دەسەڵاتی خۆیان لە کارگێڕییەکەی شێخدا هەیە ، هەروەها بە گاڵتەجارییەوە ئەوەشی بۆ زیاد کردووە :" ئەوەش لەوانەیە بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو بایەخە بێت کە وەزارەتی دادپەروەریی تاکو ئێستا کەسی بۆ دانەنراوە ."[٤٢]

---

[38] Edmonds ,Kurds, ....301.

[39] Ibid.

جێگەی سەرنجە ، بە گوێرەی ئیدمۆندز ئەم فەرمانە لە سلێمانی پایتەختی کوردستان دراوە کابینەکەش کە پێکهێنرا ناوی (کابینەی کوردستان) ی لێنرا

[40] Rambout,57.

[41] بۆ کۆڵینەوە لەم رۆژنامەیە بروانە : Edmonds ,"AKurdish Newspaper."

[42] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March,

## پەرەگرتنی ناکۆکیی نێوان شێخ و بەریتانییەکان

زۆری نەخایاند ، ساردیی و ناکۆکیی بەتوندیی لەنێوان شێخ محموود و بەریتانییەکان پەرەی سەند ، ئەوەی هەر دەبوو روویدات . شێخ بەو مەرجە گەڕێندرابووەوە کە ئەوەی پێی سپێردرابوو لەبەرچاوی بگرێت و ئەویش پەسەندی کردبوو . بەڵام جارێکی دی کە خۆی لەدەسەڵاتدا بینیەوە و لەنێو ئەو گێژاوەی دەوروبەریدا نەیدەتوانی جڵەوی حەز و ویستی بەدیهێنانی خواستە بەرزەفڕەکانی بگرێت . شێخ پیاوێك بوو بە هەستێکی قووڵەوە خۆی بە خاوەن پەیامێك دەزانی ، نەتەوەخوازێك بوو خۆی بە پێشەوا و پارێزەری دەوڵەتێکی ئایندەیی کوردیی دادەنا . کابرایەکی خاوەن ئومێد و سەرسەخت بوو ، هێندێك جاریش دەیتوانی وەك خۆپەرست و بێوژدانێکیش خۆپێشاندات .[43]

شێخ مەحموود سەبارەت بەمەلومەرجی ئاڵۆزی گێڕانەوەکەی بەئاگا نەبوو ، داخۆ بەریتانییەکان سەریان بۆ داوای جەماوەر سەبارەت بە گێڕانەوەی شێخ دانەواندووە یاخود بەریتانییەکان هێندە لاوازن بێ شێخ محموود ناتوانن جڵەوی کوردستان بگرنە دەست . گەڕانەوەکەی بە ئاشکرا دەریخست کە ئەوان شێخیان بە بایەخدارترین کەسایەتیی لە باشووری کوردستاندا لەقەڵەم داوە . تورك بەو دواییە پێشڕەوییەکی بەرچاویان دژی بەریتانییەکان ئەنجامدابوو ، بێئەوەی بەریتانییەکان ئەو توانایەیان

---

1923 ,37.

[43] شێخ هەرچەندە بێئەوەی شکۆمەندیی خۆی لەدەستدابێت لە زیاتر لە بۆنەیەکدا سەلماندوویەتی کە نەیارێکی رێك و لەباری بەریتانییەکان بووە دوای گەڕانەوەی لە شاخ و نیشتەجێبوونی لە گوندی داری کەلی کە دوا ساڵی ژیانی تێدا بردە سەر ، لەلایەن رۆژنامەنووسێکی بەریتانییەوە سەردانی کرا ، ئەو کاتێك باسی لە ململانێ و دژایەتییەکانی پێشووی دەکرد نە رق و نە تورەیی پێوە دیار نەبوو و پێشانی دان کە دڵێکی گەورە و لێبوردەی هەیە بەگوێرەی رۆژنامەنووسەکە ، شێخ مەحموود هەستێکی دۆستانەی لەهەمبەر ئینگلتەرا دەربڕیوە بە سروشتێکی گاڵتەبازانەوە ئەم تێبینییەی خوارەوەی دا :" بە حکومەتی بەریتانیا بڵێ کە ئامادەم لە هەرکاتێکدا شۆڕشیان بۆ بکەم ، ئینجا چارێکی داگرت ."

Cited in Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no.8 ,(1949),8.

هەبێت بەری بگرن . هەلومەرجەکە ئالۆز ، ناجێگیر و مەترسییدار بوو . ئەمێستا پاش گەڕانەوەی شێخ پوختەی هەلومەرجەکە بەم شێوەیە بوو : ئایا شێخ ئامادەیە لە پێناو پاداشتێکی پوچدا کە فەرمانداریی سلێمانی و دەوروبەرەکەیەتی ئەو ولاتە هێمن و یەك بخاتەوە ؟ لەسەروو ئەوەشەوە ، شێخ بە دژایەتییکردنی تورك خۆی دەخاتە بەر مەترسییەکی گەورە ، ئەوانەی کە هێشتا وەك هێزێکی مەزن دەهاتنە پێش چاو و بەو پەڕی متمانە بەخۆبوونەوە قسەیان لە گەڕانەوەی خۆیان دەکرد ، ئەو گەر بێتو هەر بڕیاریدابێت گەمەیەکی مەترسییدار بکات وا باشە کە بۆ دەستکەوتێکی مەزنتر بێت .

هەڵوێستی خۆبەدەستەوەنەدانی ڕاپەڕیوە عەرەبەکان لە باشووری عێراقدا بەودواییە بەشێکی گەورەتری پێ ڕەوا بینین . ڕاستە ڕاپەڕینەکەیان خامۆشکرا ، بەڵام داوای ڕاپەڕیوەکان سەبارەت بە حکومەتێکی عەرەبی هاتەدی و سەرکردەی ڕاپەڕیوانیش ئەهامەتییەکی ئەوەندە زۆر چاوەڕوانکراویان ئەچێژت . ئەگەر شێخ بەشێوەیەکی گونجاو دەست بجوڵێنێت ، ئەوە دەستکەوتێکی زۆرتر بەدیدەهێنێت ، بۆ کورد دەوڵەتێکی سەربەخۆ و بە خۆشی ئەمریی و تەختوتاجی پاشایەتیی .

گەر هیچ گومانێکی سەبارەت بە خۆی هەبووبێت ، ئەوا بەو شێوە گەڕانەوەیەی و ئەو پێشوازییە خرۆشاوەی لەلایەن نوێنەری خێڵەکانەوە لێی کرا ، هەمووی ڕەوینەوە ، سەرباری ئەوەش ، ئەو کوردە ئەتەوەخوازانەی لە دەوری بوون ، زیاتر خەونەکانیان بۆ دەڕازاندەوە و دەیان چرپاند بە گوێیدا تا قۆڵی لێ هەڵماڵێت . ئەم بیروبۆچوونانە هەر زوو پاش گێڕانەوەی شێخ و گەیشتنەوەی بۆ سلێمانی مێشك و بیریان داگیرکرد . هەر بۆیە زووبەزوو خۆی وەك کەسێکی سەرسەخت و چاوتێبڕیو لە ناوچە کوردییەکانی دەوروبەر پێشاندا ، وێڕای ئەوەی بەڵێنی دابوو کە دەست لە کاروباری ئەو ناوچانە وەرنەدات .

ئومێدە ئەسرەوتووەکانی شێخ مەحموود و پەرۆشی بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتێکی لەوە زیاتر بۆی دانرابوو هەر زوو دەرکەوت . لە نۆڤەمبەری ١٩٢٢دا ، نازناوی مەلیکی کوردستانی بەخۆی ڕەوا بینی .[44] ئەمێستا ئەو خۆی بە دەسەڵاتداری

---

[44] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,36;Cf. Edmonds ,Kurds, ...,301.

سەرجەم ناوچە کوردەکانی عێراق دادەنا . بەپێی ڕاپۆرتێکی فەرمیی بەریتانیی ، ئەو کارێکی وەهای بێ لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە کردبوو کە نە هەولێر و نە کەرکوك و نە قەزا کوردییەکانی لیوای موسڵ ئەو خواستەیان دەرنەبڕیوە کە سەر بۆ فەرمانڕەوایەتییەکەی دانەوێنن . ڕاپۆرتەکەی ئاماژەی بەوە داوە کە خێڵە کوردییەکانی کفریی لە لیوای کەرکوك لایەنگریی خۆیان بۆ شێخ محموود ڕاگەیاندووە ، بەڵام باسی ئەوەشی کردووە کە ئەو خێڵانە لە حاڵەتێکی وادا هاندراون ئەو کارە بکەن کە لە سایەی فەرمانڕەوایەتیی ئەودا هیچ کۆت و لێپرسینەوەیەکیان لەسەر نابێت و بەتەواویی دەستیان کراوە دەبێت .[٤٥]

بەئەستەم مانگێك بەسەر گێڕانەوەکەی شێخدا تێپەڕیبوو کە پەیوەندیی ناوبراو بە تورکەکانەوە ئاشکرا بوو . دەستبەسەرداگرتنی نێردراوێك کە لە لایەن ئۆزدەمیرەوە بۆ سەرکردایەتیی سەربازیی تورك لە جەزیرەی ئبن عومەر نێردرابوو ، پەردەی لەسەر ئەو ڕاستییە هەڵدایەوە کە شێخ لەگەڵ تورکەکاندا لە دانوساندایە .[٤٦] لەکاتێکدا ئۆزدەمیر بەرپەری خۆبردنە پێشەوە و پیاهەڵدانەوە شێخی دواندووە ، زۆر وریایانە خۆی بەهیچ شتێکی دیاریکراوەوە نەبەستۆتەوە . بە پێی نووسراوی ڕاپۆرتە فەرمییە بەریتانییەکە " خۆی لە هەموو خواستێك پاراستووە کە سەبارەت بە ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمییەکی کوردیی بێت . هەروەها لەو نووسینەدا کە ئاراستەی ئەو کۆمیتە تورکییەی کردووە کە لە کەرکوك پێکهێنراوە ، چەندین جار دڵنیای کردوونەتەوە کە حکومەتەکەی هیچ مەبەستێکی نیە پشتی خواست و ئیدیعاکانی شێخ محموود بگرێت . ئەو لە ڕاستییدا شێخی نەك تەنیا وەك ئامرازێك لە گەمەکەدا بەکاردەهێنا ، ئەو گەمەیەی ئامانجی گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بوو ، جا بە ویستی یاخود بەدەر لە ویستی دانیشتووانەکەی بێت ."[٤٧]

شێخ مەحموود وای دەبینی کە دەتوانێت لە ڕێگەی کێشانی تورکەکان دژی ئینگلیز بە باشی ڕاژە بە بەرژەوەندییەکانی بکات . بەڵام کەسایەتییە میانڕەوەکان لە

---

[45] Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April. 1922 to March. 1923 .36-37.

[46] Ibid.,36.C.f. Edmonds .Kurds. ...,310,314.

[47] Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April, 1922 to March. 1923 .36.

سلێمانیدا بە نیگەرانییەوە لەم پیلانگێڕییەی شێخیان لەگەڵ تورکەکاندا دەڕوانی . زۆر لەوانە لە ئاکامی فەرمانڕەوایەتیی تاکڕەوی شێخ و ئاکاری ناڕوون و دژبەیەکیدا وازیان لێهێنا . هێندێک لە بەدەسەڵاترین ئەندامەکانی بنەماڵەی شێخ خۆی ، ئەوانەی چەند مانگێک پێشتر فشاریان بۆ گەڕانەوەی دەکرد ، ئەمێستا وا دەردەکەوێت بڕوایان بەوە هێنابێت کە شێخ کاروباری هەرێمەکەی پێ بەڕێوەناچێت .[48]

ئەمجارەش دەرکەوت کە بەریتانییەکان لە پێکەوە کارکردنێکی سەرکەوتووانە لەگەڵ شێخ مەحموود بێهیوا بوون . لە نۆڤەمبەری ١٩٢٢دا ، شاندێک لەسەر داوای نوێنەری باڵای مەدەنیی بەریتانیی لە سلێمانییەوە بەرەو بەغدا ڕۆیشت . ئامانج لەو بانگێشتە ئەوە بوو سەبارەت بە پێگەی شێخ محموود و ئایندەی پەیوەندیی سلێمانی بە بەشەکانی دیکەی وڵاتەوە بگەنە ڕێکەوتنێک . ئاشکرا بوو کە هەر بەرەوپێشەوە چوونێک لە دانوساندنەکەدا کارێکی مەحاڵە ، ئەویش بەهۆی داوا زێدەڕۆییەکانی شێخەوە ، شاندەکە بێ هیچ دەستکەوتێک گەڕایەوە سلێمانی .[49]

## گۆڕانی هەلومەرجەکەی کورد لە عێراق

### کاریگەریی کۆنفرانسی لۆزان

ئایندەی کورد لە عێراق و هەروەها سروشتی کێشەی کورد لەو وڵاتەدا بە قووڵی لەژێر کاریگەریی دانوسان و پەرەسەندنەکانی کۆنفرانسی لۆزاندا بوو . پێویستە بەبیربهێنرێتەوە ، کە ڕێکەوتننامەی سیڤەر دانی بە دەوڵەتێکی ئۆتۆنۆمی کوردیی لە ئەنەدۆڵی ڕۆژهەڵاتدا نابوو . هەروەها دانی بەوەدا نابوو کە کوردانی عێراق ببنە بەشێک لەو دەوڵەتە کوردییە پێشنیازکراوە . بەگوێرەی ئەو ڕێکەوتننامەیە ، پەیوەندیی کوردان بە عێراقەوە مەسەلەیەکی کاتییە و دەتوانرێت پاش تێپەڕینی ساڵێک کۆتایی پێبهێنرێت و

---

[48] Ibid.,36-37.Cf. Edmonds ,Kurds, ...,311.

[49] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,37.

مل بۆ بەدیهێنانی چەند مەرجێکی تایبەت دادەنەوێنێت ،[50] لەلایەن ئەوانەی پشتگیریی دەوڵەتێکی کوردیی دەکەن . لە رێکەوتننامەی لۆزاندا ،[51] کە شوێنی رێکەوتننامەی سیڤەری گرتەوە ، تەواوی بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی وەلانرا . ئەم گۆڕانە بە شێوەیەکی قووڵ پێگەی کوردانی لە عێراقدا گۆڕی و پێویستی بە چاوخشاندنەوەیەکی نوێ کرد بە سەرجەم پرسەکەیان و پەیوەندیی ئایندەییان بەو وڵاتەوە .

ئەمێستا بایەخی زێدەتر بە بیرۆکەی بەستنەوەی ناوچە کوردییەکان بە وڵاتی تازە داتاشراوی عێراقەوە هاتە ئارا . بێگومان ، تورکان بە توندیی دژی ئەم بیرۆکەیە وەستانەوە . ململانێ و کێشمەکێشێکی توند لەنێوان تورکیا و بەریتانیای مەزن لەسەر ئەم ناوچانە لە لۆزان و هەروەها لە کۆمەڵەی گەلان دەستپێکرد . ئەم کێشمەکێشە بوو کە ناوەرۆکی (کێشەی موسڵ)ی بەناوبانگی پێکهێنا . نوێنەری تورک لە لۆزان فشاری لەپێناو گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بۆ تورکیا هێنا بە پشتبەستن بەو بنەمایەی کە زۆرینەی دانیشتووانی ئەو ناوچەیە عەرەب نین . ئەو داوایەی کە بەو بیانووە بەرپەرچی درایەوە کە دانیشتووانی ئەو ویلایەتە –واتە کوردەکان – تورکیش نین ، هەروەها ویلایەتەکە لەرووی "ئابووریی و ستراتیژییەوە ئەوەندە بە توندی بە عێراقەوە گرێدراوە کە ئەستەمە لێی جیابکرێتەوە ."[52]

ئەمێستا بەریتانییەکان لە هەوڵی ئەوەدا بوون بەدوای چارەسەرێکی گونجاو و ئاشکرای ئەوتۆدا بگەڕێن کەبەهۆیەوە کورد و عەرەب بتوانن پێکەوە بە ئاشتیی لە سایەی هەمان تەختوتاجدا بژین . دەگوترێت فەیسەڵ ئارەزووی کردووە " بەرەو لیوا کوردییەکان بکشێت و بیانخاتە چوارچێوەی عێراقەوە بەوەی رێژەیەکی تەواوی

---

[50] Ibid.,38.

[51] Great Britain, Parliament, Papers by Command: Lausanne Conference (1923),Cmd.1814(London:H.M. Stationary Office,1924);and Papers by Command:Treaty of Peace Signed With Turkey and Other Instrument Sgined at Lausanne,24 Julay 1923,Cmd .1929 (London:H.M. Stationary Office,1924).

[52] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,38

ئۆتۆنۆمی خۆماڵییان بۆ دابین بکات" بەڵام ئەوە کوردەکان خۆیانن کە دەبێت بڕیار لەو شێوازە بدەن کە پێی بەڕێوەدەچن . بێگومان لەم رووەوە پێناچێت یەکڕاییەکی گشتیی لەنێو کورددا هەبێت .[53]

## راگەیەندراوەکەی ئەنگلۆ-عێراقیی ٢٤ی دیسەمبەری ١٩٢٢

بەریتانییەکان و حکومەتی عێراق لەبەرامبەر هەڵوێستی سەرسەختانەی تورک لەلایەك و بەهۆی وروژانکارییە نەتەوەییەکانی شێخ مەحموودەوە لەلایەکی ترەوە ، بڕیاریاندا سیاسەتێك رابگەیەنن لە پێناو هێمنکردنەوە و گەر بگونجێت راکێشانی رەگەزە میانڕەوەکان و رای گشتیی کورد کە هێشتا خۆی بەهیچ لایەکدا ساغ نەکردبووەوە بەگوێرەی گوتەی راپۆرتی کۆمیسەری باڵا ، " وادەردەکەوێت کاتی ئەوە هاتبێت راگەیاندنێکی دیارییکراو لە لایەن بەریتانیا و حکومەتی عێراقەوە بڵاوبکرێتەوە کە جڵەوی خواست و ئومێدەکانی شێخ مەحموود بگرێت و لەهەمان کاتدا میانڕەوەکان دڵنیا بکاتەوە کە خواستە رەواکانیان پشتگوێ ناخرێت."[54] بەم بۆ چوونەوە ، ئەم راگەیەندراوەی خوارەوە بە رەزامەندیی پێشوەختی مەلیك فەیسەڵ و کابینەکەی لە ٢٤ی دیسەمبەری ١٩٢٢دا بڵاوکرایەوە:

" حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیی و حکومەتی عێراق ، دان بەماڧی ئەو کوردانەدا دەنێن کە لەچوارچێوەی سنووری عێراقدا نیشتەجێن بۆئەوەی لەچوارچێوەی ئەو سنوورەدا حکومەتێك بۆخۆیان پێکبهێنن . هەروەها هیوادارن کە رەگەزە جۆربەجۆرەکانی کورد هەرچی زووە لەسەر ئەو شێوازە رێکبکەون سەبارەت بە حکومەتەکەیان دەیخوازن ، هەروەها ئەو سنوورەش کە دەیانەوێت بیگرێتە خۆ ، هەروەها نوێنەری لێپرسراوی خۆیان بنێرنە بەغدا تا سەبارەت بە پەیوەندییە ئابووریی و رامیارییەکانیان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆ و حکومەتی عێراق دا بکۆڵنەوە "[55]

---

[53] Ibid.

[54] Ibid.

[55] Ibid.Cf. Edmonds ,Kurds, …,312;Rambout,58-59.

ئیدمۆندز زیاتر له جارێك لەدوا لێدوانی سەبارەت بەو راگەیەندراوە ، هێمای نەبوونی نیازپاکیی یاخود راستگۆیی له بڵاوکردنەوەیدا بەدەستەوە دەدات . ئەو وەك ئەفسەرێکی رامیاریی لەو کارمەندانە بوو کە متمانەی ئەوەی درابوویە ئەو راگەیەندراوە بگەیەنێتە سەرخێڵەکان و سەرۆکەکانی دیکەی رای گشتیی کورد . ئەو تۆماری ئەوەی بۆ جێهێشتووین کاتێك بڵاوکراوەکەی بۆ شێخ عەبدولکەریمی قادرکەرەم وەرگێڕاوە :" ئەم تێکستە ، بەتایبەتیی ، کە چەمکی (حکومەتی کوردستان) ی لە جێی (کارگێڕیی کوردستان) دانابوو ، هەروەها روون نەکردنەوەی هەرێمی جوگرافیایی گەلێك زیاتر لەو چاوەڕوانییە بوو کە حکومەتی عێراق و هەروەها کۆمیسەری باڵا له هزری مندا زەقیان کردبوووەوە ، هەروەها ، بڵاوکراوەکەم بە گومانێکەوە و بەدەمیی بۆ شێخ عەبدولکەریم وەرگێڕا . هەرچەندە لە بەغدا هەستیان بە دڵەڕاوکێیەکی ئەوتۆ نەکردبوو و پێکەوە ئەوەیان وەك بڵاوکراوەیەکی فەرمیی چاپکردبوو ."[56]

## چالاکییەکانی سەید تەهای نەهریی

پێش گێڕانەوەی شێخ محموود ، سەید تەها بۆ ئەو کارە لەبەرچاوگیرا بوو . هەرچەندە تێپەڕینی خێرای رووداوەکان و رۆیشتنی لەناکاوی سەیدتەها بۆ ئێران تەگەرەی خستە بەردەم پتر لەبەرچاوگرتنی بایەخدان بەو بابەتە . لە کۆتایی ئۆکتۆبەری ١٩٢٢دا ، سمکۆئاغای شکاك و سەیدتەهای هاوەڵی لەناکاو گەیشتنە هەولێر ، پاش ئەوەی سمکۆ لەئاکامی ئۆپەراسیۆنێکی سەربازیی هاوبەشیی تورك و ئێرانییەکان تێکشکابوو . هەلومەرج و پێگەی ئەو دوو کەسە بە تەواویی جیاواز بوو . سمکۆ کە رەعییەتی ئێران بوو ، هەر زوو لەگەڵ حکومەتەکەیدا پێکهاتەوە و گەڕایەوە ئێران ، بەڵام زۆری نەخایاند ، سەرلەنوێ کەوتەوە نێوگرفت و ئاڵۆزیی . ئەوەی پێشتر باسی لێوەکراوە.[57]

سەیدتەهای نەهریی ، کوڕەزای شێخ عوبەیدوڵڵای بەنێوبانگی کورد ، رەعییەتی

---

[56] Edmonds ,Kurds, ...,312..

[57] Ibid.,405-13.

تورك بوو و موڵكوماڵیشی له عێراق له دەورووبەری ڕەواندز هەبوو ، هەربۆیە پێگەی ئەو لەعێراقدا بە تەواویی لەوەكەی سمكۆ جیاواز بوو .[٥٨] ئەو هەر زوو پەیوەندیی بە بەریتانییەكانەوە لە عێراقدا كرد و لەو دیدەوە كە پشتگیریی خۆی بۆ دەركردنی تورك لە هەرێمی ڕەواندز پێشكەش بكات .

لەم زانیارییانەوە دەردەكەوێت كە سەیدتەها لێبڕاوانە دژی كەمالیستەكان بوو ، ئەو نە ئارەزوو و نە ئومێدیشی بە ڕێكەوتن لەگەڵ توركەكاندا نەبوو . ئەو مەبەستی خۆی سەبارەت بە كۆكردنەوەی خێڵەكان و ئاراستەكردنی دژی توركان لەناوچەی ڕەواندز ئاشكرا كرد . ئەو خێڵانەی كە سەیدتەها دەسەڵاتی بەسەریاندا دەڕۆیی . هەربۆیە ئەو داوای ناردنی تفەنگ و تەقەمەنیی و پارەی كرد بۆ ئەوەی ئارەزایەتییەكی چەكداریی خێڵەكیی دژی توركەكان ڕێكبخات . هەروەها لەلایەن بەریتانییەكانەوە هەنگاوێكی دیكەش بەقازانجی سەیدتەها نرا كە بریتیبوو لەوەی ژمارەیەك كوردی خۆبەخش كە لەسوپای عێراقدا بوون بخرێنە ژێر دەسەڵاتی سەیدتەهاوە تا پێگەی ناوبراو لەنێو خێڵەكاندا بەهێز بكەن .[٥٩]

بەشێوەیەكی ئاوازە ، وادەردەكەوێت باریبی بارانێكی توند ڕێی بە سەیدتەها نەدابێت هەڵمەتێكی سەربازیی ئەنجام بدات . وێڕای ئەوەی كەوتنەوەی دەنگۆی ئەگەری ڕووبەڕووی كارێكی لەو شێوەیە شوێنی لەسەر ویستی خێڵەكانی ناوچەی ڕەواندز بەجێهێشت. هەواڵی ئەوە هەیە كە بوونی ئەو لە ناوچەكەدا هاوكاریی (هاپ)ی كردبێت تا تورك ناچاربكات ڕانیە چۆڵ بكەن ، هەروەها یارمەتی بابەكرئاغای ئینگلیزخواشی دابێت جڵەوی خێڵەكەی بگرێتەوە دەست . بەگوێرەی ڕاپۆرتێكی كۆمیسەری باڵا ، هێزە نەیارەكانی مەحموود لە سلێمانی پێشوازیی دەركەوتنی سەیدتەهایان وەك هێزێكی نوێ لە سیاسەتی كوردییدا كرد و وەك پارسەنگێك دژی چالاكیی ناحەزەكانیان هیوایان لەسەر هەڵچنی بوو .[٦٠]

---

[58] Great Britain,Colonial Office, Report on Iraq Administration,April,1922 to March, 1923.

[59] ئیدمۆندز ژمارەی یەكەی خۆبەخشە كوردەكانی بە ١٥٠ كەس داناوە .

Edmonds ,Kurds, ...,308.

[60] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March,

ئەو رۆڵەی کە دەبوو سەیدتەها بیگێڕێت لەبەر چەندین هۆکار نەهاتەدی . وێڕای ئەوەی بارینی بارانێکی توند نەگەری هەڵمەتێکی سەربازیی ئەستەم کرد ، ئەو گوللە تۆپانەشی لەلایەن بەشی تۆپخانەوە پێیدرابوو زۆربەیان چرووك و بێ سوود بوون . هەروەها ئەو سەبارەت بە دەسەڵاتی لەنێو خێڵەکاندا زێدەڕۆیی کردبوو ، تەنانەت خێڵی هەرکییش کە ئەو زۆر پشتی پێدەبەستن ، دەرکەوت فرە بۆ مەبەستەکەی سەیدتەها پەرۆش نین . هەروەها پلانەکەی سەیدتەها بۆ هەڵمەتەکەی دەرکەوت لەگەڵ شێوازی کارکردنی بەریتانییەکاندا یەکی نەدەگرتەوە و پشتگیریی ئەوانی بەدەستنەهێنا . بەگوێرەی ئیدمۆندز :" ئەو بە رواڵەت کارێکی بۆ هەڵسوڕاندنی کارەکەی نەبوو و پشتی بە بۆمبارانی رەمەکیی دەبەست ، نەك تەنیا لەحاست ئامانجە دوژمنکارەکاندا ، بەڵکو دژی ئەو سەرخێڵانەش کە لەهاوکاریکردنیدا سستیان نواندبوو ."[٦١]

سەیدتەها لە ئەپڕێلی ١٩٢٣دا کرایە قایمقامی رەواندز . جێگەی سەرنجە ئەم دامەزراندنە کە لەلایەن (سێر هێنری دۆبس)ەوە کە لەو کاتەدا کۆمیسەری باڵا بوو پشتگیریی و جەختی لێکرا ، لەلایەن حکومەتی عێراق و ژمارەیەك لە کارمەندە بەریتانییەکانەوە دژایەتیی کرا .[٦٢]

## هاوکاریکردنی شێخ مەحموود لەگەڵ تورك

لە هەمان کاتدا ، هەلومەرجەکەی سلێمانی شێوا ، بەچەشنێك ئاسۆی باشبوونی تا دەهات تاریکتر لە پێشوو خۆی دەنواند . هەواڵی ئەوە هەبوو کە شێخ مەحموود لەناکاو

---

1923.

[61] Edmonds ,Kurds, ….308.

[62] بەگوێرەی ئیدمۆندز ، مەلیك فەیسەڵ ، سەرۆك وەزیران ، متەسەریفی هەولێر ، ئەمانە لەلایەن کۆلۆنۆلیس و بۆدیلۆن و کاپتن لاینەوە پشتگیریی دەکران لەوەی سەید تەها بکەنە قایمقام کۆمیسەری باڵا کە لەلایەن فەرماندەی (هاپ)ەوە پشتگیریی دەکرا . جەختیان لە دامەزراندنی سەید تەها وەك کارمەندێك (گوللە گێڕەوە)بەریتانییەکان ئەم چەمکەیان بەکاردەهێنا بۆ کەسانێك کە بەهۆی پەیوەندیی خێڵایەتییانەوە و لەسۆنگەی ترس لە دوژمنایەتیی خێڵایەتیی لە گوللەی ناکاوکوژ پارێزراوبوون پێداگریشیان بەو هۆیەوە بوو کە چاوەڕێ دەکرا تورکان دەستەیەك لە لایەنگرانی خۆیان بە مەبەستی راووڕووت رەوانەی ئەودیو سنوور بکەن بۆئەوەی هەلومەرجی ناوچەکە بشێوێنن

خۆی له قهیرانێکی داراییدا بینییهوه . شێخ لهماوهی سێ ههفتهی یهکهمی پاش گێڕانهوهی بۆ سلێمانی ، کهوته بهفیڕۆدانی زۆربهی ئهو پارهوپولهی لهگهنجینهکهیدا ههڵگیرابوو ، ئهویش به بهخشینهوهی بهسهر ئهو سهرخێڵانهی که سهردانیان دهکرد یاخود وهك موچه دهیدا به خزمهتکار و دهستوپێوهندهکهی . ئهو توانی به سهندنی باجی توتن و باجی دهیهکی کشتوکاڵی ڕێگهیهکی خێرا بۆ پڕکردنهوهی گهنجینهکهی بدۆزێتهوه . بازرگانانی توتن ، زیاتر لهوهی که بازرگانییهکهیان بهتهواویی وهستابوو ، باجیان بهسهردا سهپێنرابوو .ڕاپۆرتهکان باس لهو دهکهن که شێخ به شێوازه ١٥٠٠٠٠ ڕوپییهکی کۆکردۆتهوه .[٦٣]

شێخ مهحموود ، پاش ئهوهی له ڕووی داراییهوه بهشی خۆی پهیداکردهوه، ڕاوێژی ڕهگهزه میانڕهوهکانی ڕهتکردهوه ، ئهوانهی تا ماوهیکی زووتر شێخیان هاندهدا که ههڵوێستێکی نهرمتر لهمهڕ بهریتانییهکان پێشانبدات . ئهو ئێستا گهڕایهوه سهر ههڵوێستهکهی پێشووی . ئهو نهك ههر تهنیا نهچوو بۆ ئهو کۆنفرانسهی که له کهرکوك بهسترا ، بهڵکه ئهو دووانهشی لهجێی خۆی ناردبوونی هێنده ههڵوێستێکی ڕهق و سهرسهختانهیان پێشاندا که هیچ شتێکی لێ سهوز نهبوو . ئهوان بهو تێگهیشتنهوه گهڕانهوه سلێمانی که دانوساندن تهنیا لهسایهی ڕاگهیهندراوهکهی بهونوایییهی ئینگلۆ-عێراقییدا ئهگهری بهرێوهچوونی ههیه .[٦٤]

ڕووداوهکان بهخێرایی پهرهیان سهند . لهکۆتایی یهنایهری ١٩٢٣دا ، ئهفسهرانی تورك سهردانی شێخ مهحموودیان له سلێمانی کرد ، لهوێ پلانێکیان بۆ پهلامارێکی توندی خێڵهکیی بۆسهر کهرکوك و کۆیسنجهق داڕشتبوو . پهیوهندیی کرا به عولهما شیعهکانی نهجهف و کهربهلاوه ، لهکاتێکدا کۆمیته تورکهکهی کهرکوك بهگهرمیی خهریکی ئامادهکاریی بوون به ههڵگیرساندنی ڕاپهڕینێك .[٦٥] ئۆزدهمیریش لهلای خۆیهوه پلانی بۆ ئهوه دادهڕشت که لهدوای پهلامارهکهی ئهوان بۆ کهرکوك ، ههڵکوتێته سهر

---

[63] Ibid.,304-5.C.f. Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,39.

[64] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,39

[65] Ibid.see also Edmonds ,Kurds, ....314; Longrigg, Iraq (1900-1950),145046.

هەولێر . لەم باوەڕەوە ، وادەردەکەوێت کە نۆزدەمیر پەیوەندیی بە فەرماندەیی سەربازیی ئێرانیی لەسەر سنوور کردبێت بۆئەوەی رەزامەندیی ناوبراو بەدەستبێنێت تاکو هێزەکانی خۆی لە سنوورەوە بەنێو خاکی ئێراندا بگوێزێتەوە و ئەو کوردە خێڵەکییەیانەی ئێرانیش بۆ هەڵمەتەکەی چەکداربکات .[٦٦]

## کاری بەریتانییەکان بۆ شکستپێهێنانی راپەڕینەکەی شێخ مەحموود

بەریتانییەکان لەترسی ئاکامەکانی پەرەسەندنی رووداوەکان بڕیاریاندا دەستبەکاربن . ئەوان پەیوەندییان بە ناحەزەکانی شێخ مەحموود لەنێو هەمەوەندەکان ، پشدەرییەکان و هەروەها جافەکاندا کرد و خستیاننە دۆخی ئامادەباشییەوە .[٦٧] لە ١٦ی فێبرایەری ١٩٢٣دا ، کۆنفرانسێك بۆ گفتوگۆ لەمەڕ هەلومەرجەکەی سلێمانی لە بەغدا گیرا کە تێیدا ئەفسەرانی مەدەنیی و سەربازیی ئامادەبوون و بە بڕیاردان لەم پلانی کارەی خوارەوە کۆتاییهات :

١- لەرۆژی ٢١ی مانگدا بەبروسکە داوا لە شێخ مەحموود بکرێت بچێتە بەغدا .
٢- ئەگەر ئەو داوایەی جێبەجێ نەکرد ، هێزی ئاسمانیی بچێتە سەر سلێمانی و خۆی پێشان بدات و فەرمانی وەلانانی شێخ بەسەر شاردا بڵاوبکاتەوە و دوای ئەوە ماوەی پێنج رۆژ دەرفەتی بدرێتێ کە لەگەڵ تەواوی ئەندامانی ئەنجومەنی کارگێڕییدا بچنە بەغدا.
٣- بۆ پێشگیریکردن لەمەڕ چەشنە هێرشێکی لەناکاو و بەهێزکردنی هێزەکانی لیڤیی ، دوو یەکە لە هێزی ١٤ی سیخ بە قەتار بچێتە کنگربان و لەوێوە بەفڕۆکە بەرەو کەرکوك بنێردێن (ئەو کردەوەیەی کە لەو کاتەدا داهێنانێکی نوێ بوو ) .
٤- گەر مەحموود ئامادە نەبێت شارەکە بەجێبهێڵێت ، ئەوا بنکە و بارەگاکەی لە

[66] Edmonds ,Kurds, …,318..

[67] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,39.

سلێمانی بۆمباران بکرێت .[٦٨]

هیچ کاتێك بۆ جێبەجێکردنی ئەو خاڵە بەفێرۆ نەدرا ، ئیدمۆندز خۆی لە ئێوارەی ٢٠ی فێبرایەردا پەیامی کۆمیسەری باڵای بە شێخ مەحموود راگەیاند . شێخ مەحموود داوای روونکردنەوەی زیاتری کرد ، بەڵام ئیدمۆندز پێی راگەیاند کە ئەو دەسەڵاتی ئەوەی نیە گفتوگۆ لەسەر فەرمانی سەرۆکەکەی بکات .[٦٩] بەگوێرەی راپۆرتێکی کۆمیسەری باڵا کە بۆ دەزگای کۆلۆنیالی ناردووە ، شێخ مەحموود نەك هەر تەنیا نەیتوانیوە بەشێوەیەکی گونجاو ئەو پەیامە وەربگرێت و کاری پێ بکات ، بەڵکو لەمەڕ بەهێزکردنی بەرنامەکەی خۆی بۆ هێرشکردنە سەر کەرکوك ئامادەبوو .[٧٠] لە ٢٢ی فێبرایەردا ، هێزەکانی سیخ سەرکەوتووانە بە قەتار و دواتر بە فڕۆکە گەیەندرانە کەرکوك . لە ٢٣و٢٤ ی فێبرایەردا ، فڕۆکەی بەریتانیی چوونە سەر شاری سلێمانی و بڵاوکراوەیان بەسەر شاردا بەردایەوە کە تێیدا هاتبوو ، لەبەر ئەوەی شێخ مەحموود نەیتوانیوە ئەرکی خۆی وەك پێویست رابەڕێنێت ، هەربۆیە لێخراوە .[٧١] لەئێوارەی ٢٤ی فێبرایەردا شێخ مەحموود لەپێناو پێکهاتنەوە لەگەڵ بەریتانییەکاندا دوا هەوڵی خۆی دا . وێڕای ئەوەی دانوسانێکی چەند ساتی بە تەلەگراف لەگەڵ ئیدمۆندزدا نەیتوانی ئاکامی خوازراو بەدەستبهێنێت .[٧٢]

---

[68] Edmonds ,Kurds, ....314-15.

[69] Ibid.,315.

[70] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,39.

[71] بە گوێرەی ئیدمۆندز زۆربەی فڕۆکەکان لە ٢٣ی فێبرایەردا بەمەبەستی فڕێدانەخوارەوەی بەیاننامەکان هێنرانەدەر بەڵام نەتوانرا . ئەوە بوو رۆژی دواتر ئەو کارە ئەنجامدرا .کۆمیسەری باڵاش رۆژی ٢٤ی فێبرایەری بۆ بەردانەوەی بڵاوکراوەکان داناوە

Edmonds .Kurds, ....315-316.;Great Britain .Colonial Office , Report on Iraq Administration. April, 1922 to March. 1923 ,35

[72] ئیدمۆندز ئاماژەی بەوەداوە کە شێخ مەحموود لە لایەن شێخ قادری برای و هێندێك ئەشراف سلێمانییەوە لە مەسەلەی دانوسانەکاندا هاوکاریی کراوە

Edmonds .Kurds, ....316.

شێخ مەحموود واپێدەچوو هەوڵی کات دەستخستن بدات و وای پێشاندەدا کە بڕیاری دەست لەکارکێشانەوەی دابێت ، بەڵام هەواڵی ئەوە هەبوو کە کاروانێکی هێزە خۆماڵییەکانی بەمەبەستی هەڕەشەخستنە سەر کەرکوك بۆ چەمچەماڵ گواستۆتەوە .[73] هەربۆیە فەرمانی پێدرا لە ١ی مارتەوە سلێمانی جێبهێڵێت ، دانیشتووانەکەش ئاگادار کرایەوە ، گەر شێخ گوێڕایەڵی نەکات شارەکە بۆمباران دەکرێت . فەرمانەکە پشتگوێ خرا ، هەربۆیە لە ٣ی مارتی ١٩٢٣دا ، بارەگای حکومەت لەسلێمانی لە ئاسمانەوە بۆمباران کرا .

بۆمبارانکردنی شارەکە ، هاوکات بوو لەگەڵ گەیشتنی نوێنەرایەتییەکی سلێمانی بۆ شاری کەرکوك کە لە شێخ قادری برای شێخ مەحموود و مستەفا پاشا یامولکیی پێکدەهات ، پاش ئەوەی کە هەواڵی پەرەسەندنی ڕووداوەکانیان بیست ، بە تەلەگراف لەگەڵ شێخ مەحمووددا کەوتنە پەیوەندییەکی درێژخایەنەوە و هانیاندا شارەکە جێبهێڵێت . لەگەڵ ئەوەی وادەرکەوت کە شێخ مەحموود گوێ بۆ ئەو تکایانە شل ناکات ، بەڵام هەواڵەکان رایان دەگەیاند کە ئەو هەر لە بەرەبەیانی ٤ی مارتی ١٩٢٣وە بەخۆی دووسەد کەس لە هێزە خۆماڵییەکانەوە لە شاری سلێمانی چۆتە دەرەوە و چیش لەگەنجینەدا هەبووە هەمووی لەگەڵ خۆی بردووە، دەگوترێت کە پەنای بردبووە چیاکانی سورداش کە دەکەوێتە باکووری سلێمانییەوە ،[74] لەوێ لەلایەن نۆزدەمیرەوە سەردانی کرا ، بەپێی هەواڵەکان نۆزدەمیر هانی شێخی داوە کە سەرلەنوێ سلێمانی بگرێتەوە .[75]

لەسەرەتای مارتدا ، بەشێك لە لایەنگرانی شێخ مەحموود لە دەوروبەری سلێمانی مۆڵیان خواردبوو بەڵام بە هێرشێك پەرتەوازە کران .[76] وێڕای ئەوەی هێشتا شێخ سەرکەش و ڕکابەر مایەوە . بەگوێرەی هەواڵەکان ، ئەو بارەگاکەی خۆی لە ئەشکەوتێکی گەورەی جاسەنە لە ناوچەی سورداش دانابوو ، هەروەها هێزەکانیشی

---

[73] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,39.

[74] Ibid.,39-40.Cf. Edmonds ,Kurds, ....316-17.

[75] Great Britain ,Colonial Office , Report on Iraq Administration, April, 1922 to March, 1923 ,40.

[76] Ibid.

بەسەر گوندەکانی دەوروبەردا دابەشکردبوو . لەوێ هەروەکو پێشوو لەسەر کۆکردنەوەی باج و بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی خۆی بەردەوام بوو .[77]

شێخ لەکاتی هەڵاتنەکەی لە سلێمانی ، ئەوەی لەبیرنەچووبوو کە ماشێنی چاپخانەکەی شارەوانیی لەگەڵ خۆیدا بەرێت و هەر زوو بەشێوەیەکی باش سوودی لێوەرگرت . ئەو لە ٨ی مارتی ١٩٢٣دا دەستی بە بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی (بانگی حەق) کرد .[78] ئەم بڵاوکەرەوەیە کە شوێنی رۆژنامەی (رۆژی کوردستان) ی زمانحاڵی فەرمیی کارگێڕییەکەی شێخ مەحموودی گرتەوە ، لێی نووسرابوو کە لەلایەن (سەرکردایەتی گشتیی لەشکری کوردستان) ەوە دەردەچێت . ئەو رۆژنامەیەی بانگەشەی جیهادی وەك نووسراوێك بەسەرەوە بوو .

ئەوەی بە تەواویی ئاشکرا بوو ئەوە بوو کە تا شێخ مەحموود لەو بنکەیەی هەڵنەکەندرێت و هێزەکانی لە سورداش پەرتەوازە نەکرێت ، نەك تەنیا سلێمانی لەژێر رەحمەتی شێخ مەحمووددا بەبەردەوامیی دەبێت ، بەڵکو کەرکوکیش لە مەترسییەکی بەردەوامدا دەبێت . بەریتانییەکان درکیان بەو راستییە کرد کە لە سایەی هەلومەرجێکی وەهادا بەدیهێنانی ئاشتی و ئارامیی لەناوچەکەدا مەحاڵە . وێڕای ئەوەی ، ئەوەش گرنگ نەبوو کە چەند هەوڵ بۆ بەهێزکردنی ناوچەی سلێمانی –کەرکوك دراوە ، چونکە بەدیهێنانی ئارامییەکی جێگیر لەو ناوچەیە و لە هەر شوێنێکی کوردستاندا بێ رووبەڕووبوونەوەی رکابەری ئۆزدەمیر و زاڵبوون بەسەریدا نەدەچووە سەر . پێگەی شێخ مەحموود بۆ ئێچیرێکی راونراو هاتبووەخوار ، بەڵام ئۆزدەمیر کە لە سەرکەوتنێکەوە بۆ یەکێکی تر هەنگاوی دەنا ، هێشتا لە مەیدانەکەدا بوو . لەو دووانە ، ئەوەی دواییان بە ئاشکرا سەرچاوەیەکی مەترسیی مەزنتریان پێکدەهێنا . لەبەر ئەم هۆیە ، بەریتانییەکان بڕیاریاندا یەکەمجار لەگەڵ ئەوەی دووەمیاندا کێشەی خۆیان یەکالابکەنەوە .

## تێکشکاندنی ئۆزدەمیر

[77] Edmonds ,Kurds, ….319.

[78] مانای وشەکە لە (حەق)ی عەرەبییەوە هاتووە . بەڵام نێوەرۆکی وشەکە لە رووی ئایینیی و سۆفیگەرایییەکەیەوە بەمانای (راستیی)ە کە بۆ خوداوەند ئاماژەی پێدەکرێت وەك ئیدمۆندز دەڵێت بەکارهێنانەکەی دەمارگیرییەکی ئایینیی زیرەکانەی دەگەیاند

یەك لە بڕیارەكانی كۆنفرانسی قاهیرە بریتیبوو لە گواستنەوەی سەرۆكاریی هێزەكانی بەریتانیا لەلایەن سوپاوە بۆ هێزی هەوایی . گواستنەوەكە لە ١ی ئۆكتۆبەری ١٩٢٢دا ئەنجامدرا . فەرماندەی نوێی دامەزراوی هێزە هەواییەكان ، جێگری مارشاڵ (سێر . جۆن .سالمۆند ) كاتی لەدەستنەدا بۆ ئەنجامدانی چەند هەنگاوێك تاكو زەمینە بۆ تێكشكاندنی ئۆزدەمیر و پەرتەوازەكانی هێزەكانی خۆش بكات .[79]

ئەو فڕۆكانەی لە بنكەكانی موسڵ و كەركوك بوون ، چالاكانە دەستیانكرد بە پەلامارێكی بەرفراوان بۆسەر گوندەكانی شێخ بزێنیی كە دەكەوێتە نێوەندی ڕێگای رووباری زێی بچووكەوە ، هەروەها بنكەكانی هێزەكانی تورك لە كۆیسنجەق .هێزی لیڤیی بە فەرماندەیی كۆلۆنێل منیت شان بە شانی هێزە هەواییەكان كەوتنە هەڵمەتی سەربازیی رووبەرووی بەرگرییەكی كەم بوونەوە . لە ئۆكتۆبەری ١٩٢٢دا ، توركان دەستیان لە كۆیسنجەق هەڵگرت ، هەروەها زۆربەی سەرۆكەكانی شێخ بزێنیی گوێڕایەڵی خۆیان پێشكەش كرد . ئەمێستا بەرەی هەڵمەتەكانی هێزی هەوایی رووەو باكوور وەرچەرخا ، لەوێ هێزەكانی دوژمن لە رانیە ، مەرگە و ناوچەی پشدەر بە بەردەوامیی لە ئاسمانەوە بۆردومان كران .هەروەها دۆڵی شاوریش ، كە ڕێگەی سەرەكیی ئەو ناوچانەی بەرەو رەواندزە پێدا تێدەپەڕێت ، تووشی بۆردومانێكی سەخت بووەوە .[80] ئۆپەراسیۆنەكە بە درێژایی لە پایزی ساڵی ١٩٢٢ و هەروەها لەگەڵ هاتنی زستانیشدا بەردەوام بوو .

لە مارتی ١٩٢٣دا ، هەموو ئامادەكارییەكان بۆ ئەنجامدانی پەلامارێكی توند بۆ سەر ئۆزدەمیر و هێزەكانی بە تەواویی كۆتاییهات . ئەم هێزانە لە دوو كاروان پێكدەهات (كۆیكۆڵ/كاروانی كۆیە) بەفەرماندەیی (كۆلۆنێل ڤینسنت) و هەروەها (فرۆنتیەركۆڵ/كاروانی سنوور) بە فەرماندەیی (كۆلۆنێل دۆبن) .[81] هەردوو كاروانەكە لە لایەن هێزی هەواییەوە پشتگیریی دەكرا . لەهەمان كاتدا دەبوو جوڵانەوەیەك بۆ بادانەوە بەسەر دوژمندا لەگەڵی سپیلك ئەنجام بدرێت ، لەشەوی ١٩/٢٠ ی ئەپڕێلدا ، ئۆزدەمیر شوێنەكەی خۆی لە گەلییەكە جێهێشت .شاری رەواندز كە لە كۆتاییدا سەیدتەهای وەك

---

[79] Ibid.,296-297.

[80] Ibid.,298-300.

[81] Ibid.,318-19.

قایمقام لیّ دانرا ، له ٢٢ی ئەپرێلی ١٩٢٣دا دەستی بەسەردا گیرا . لێرە بەدواوە کەس ناوی ئۆزدەمیر و هێزەکانی نەبیستەوە .

## ئەنجامدانی کاری سەربازیی زیاتر دژی شێخ مەحموود

بەریتانییەکان دوای خۆرزگارکردن لە ئۆزدەمیر ، بڕیاریاندا ئاوڕ لە سلێمانی و شێخ مەحموود بدەنەوە . کاروانی کۆیە ئەرکی سەرلەنوێ داگیرکردنەوەی سلێمانی خرابووە ئەستۆ ، هەروەها ئەنجامدانی کاری پێویست بۆ تێکشکاندنی شێخ مەحموود ، لێدانی پێگە و پرستیژی ، هەروەها ئەو خێڵانەی لایەنگریی دەکەن . لە ٨ی مایۆی ١٩٢٣دا ئاگاداری بەسەر شاری سلێمانیدا بڵاوکرایەوە و ئامانجی حکومەتی سەبارەت بە داگیرکردنەوەی شارەکە ئاشکراکرد .[٨٢]

شێخ مەحموود لەناوچەی پشدەر گەڕایەوە ، پاش ئەوەی نەیتوانی لەو هەوڵەیدا بۆ ڕاپەڕاندنی خێڵەکان لە پشت هێڵی کاروانی کۆیە و هەڵمەتە سەربازییەکەی دژی ئۆزدەمیر ، سەرکەوتوو بێت . لێرەوە شێخ نامەیەکی بۆ فەرماندەی کاروانەکە نارد و ئاگاداری کردەوە کە نەکات بەرەو چەمچەماڵ پێشڕەویی بکات . ڕۆژی دواتر ، شێخ مەحموود بەرەو سلێمانی بنکەی خۆی بەجێهێشت و ئامانجی ئەوە بوو ڕێگە لە کاروانەکە بگرێت . هەرچەندە پاش ئەوەی هەواڵی گەیشتنی کاروانەکەی بۆ پشتی گەلی تاسلوجە بیست ، ئەو خاڵەی کە دەکەوێتە نێوان سلێمانی و دەربەندی بازیانەوە و بۆ بەرگرییکردن شیاوە ، فەرمانیدا بەخێرایی بەرەو سنووری ئێران پاشەکشە بکەن .[٨٣] دواتر زانرا کە بەرەو پیران کشاوەتەوە ، ئەو گوندەی دەکەوێتە دوو مایلی ئەو دیوی سنووری ئێرانەوە.[٨٤] کاتێك کاروانەکەی کۆیە گەیشتە سەرچنار لە دەرەوەی سلێمانی ، لەلایەن دوو پیاوماقوڵەوە دیدەنی کران ، ئەوانەی پرسیاری ئەوەیان کرد کە چەند ڕۆژ لەوێ دەمێننەوە . کاروانەکە بۆ ماوەی یەك ڕۆژ لە سەرچنار مایەوە ، لەکاتێکدا ئیدمۆندز بە

---

[82] Ibid.,327-28.

[83] Ibid.,330-31.

[84] Ibid.,336.

پێی ئەو دەسەڵاتەی وەك ئەفسەرێکی رامیاریی هەیبوو ، رۆیشتە سلێمانی و لەوێ دەزگایەکی فەرمانڕەوایەتیی لێپرسراوی پێکهێنا . ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ کرایە کارگێڕی مەدەنیی ، شێخ قادر کرایە بەرپرسی ئاسایشی گشتیی ، ئەندامانی پێشووی پۆلیس و سەرۆکی پێشووی پۆلیس کارەکانیان پێ سپێردرایەوە . دوای گەیشتنی سەرخێڵە گوێڕایەڵەکان و نوێنەرایەتییەکانیان ، ئیدمۆندز شارەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە لای کاروانی کۆیە ، ئەوەی لە ١٧ی مایۆدا بەرەو ناوچەی رەواندز بەمەبەستی سزادانی خێڵی شیلانە کشا .[٨٥]

لەسەرەتای ژوونندا ، سەرۆك وەزیرانی عێراق و کۆمیسەری باڵای بەریتانیی لە سلێمانی ئامادەی کۆنفرانسێك بوون و بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەشرافی شارەکەدا سەبارەت بە هەلومەرجەکە گفتوگۆ بکەن . گفتووگۆکە وەختێك تێکچوو کە کۆمیسەری باڵا نەیتوانی سەرۆکەکانی کورد لەوە دڵنیا بکاتەوە کە لەشکر تا سەقامگیرکردنی هەلومەرجەکە و گەڕانەوەی دۆخی شارەکە بۆ باری ئاسایی دەمێنێتەوە . ئیدمۆندز هێمای بۆ ئەوە کردووە کە هۆکاری سەرەکیی تێکچوونی گفتوگۆکە ئەو راستییە بووە کە لایەنی عێراقی ئامادەنەبووە هیچ جیاوکێك بە هەستی کوردیی ببەخشێت .[٨٦]

لە ١٤ی ژووندا ، کاتێك ئیدمۆندز ئاشکرای کرد کە هێزە بەریتانییەکە دەیەوێت لەماوەی سێ رۆژی داهاتوودا سلێمانی جێبهێڵێت ، ئەندامانی ئەنجوومەنە کاتییەکە دەستیان لەکار کێشایەوە . دانیشتووانە ترساوەکە ، ئەوانەی لە گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ شارەکە دەترسان ، بە پەلە خۆیان کۆکردەوە بۆئەوەی شارەکە جێبهێڵن .[٨٧]

بەریتانییەکان پاش ئەوەی سلێمانیان جێهێشت ، کەوتنە ئەوەی کار بۆ پلانێك بکەن کە ناوی (پشتێنەی ئاسایش) یان لێنا ، بەپێی ئەو پلانە شێخ مەحموود گۆشەگیر دەکرێت و

---

[85] ئیدمۆندز باسی لەوە کردووە کاتێك چۆتەوە سلێمانی ئەو ژوورەی بەکارهێناوە کە پێشتر شێخ مەحموود وەك ئۆفیسێك بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری فەرمیی تێدا بووە وێنەیەکی شێخ لە پشتی کورسییەکەوە بە دیوارەکەدا هەڵواسرابوو ، لەگەڵ ئاڵایەکی کوردیی و تاجێکی نەخشێنراو کە ئامادەکرابوو بە ئاڵاکەوە بلکێنرێت و بکرێتە ئاڵای ستاندەری پاشایەتیی

[86] Ibid.,337.

[87] بەگوێرەی ئیدمۆندز ژمارەی تێکڕای ئەوانەی شارەکەیان جێهێڵا دوو هەزار کەس بوون Ibid.,338

له هەر دەستومردانێك لە کاروباری ناوچەکانی دەوروبەر دادەبڕێت .[٨٨]

وەك چاوەڕواندەکرا ، شێخ مەحموود و شوێنکەوتەکانی هەر زوو پاش چوونە دەرەوەی هێزە بەریتانییەکان ، خۆیان بە شاردا کردەوە ، بەڵام بۆخۆی تاکو ١١ی ژوون سەری بەشاردا نەکردەوە . ساڵح زەکی ساحێبقڕان لەجیاتی ماجید مستەفا فەرماندەیی هێزەکانی شێخ مەحموودی گرتە ئەستۆ کە تا ئەو کاتە بە "سوپای میللی کوردستان" ناودەبرا . بەریتانییەکان لەسۆنگەی سەردانەواندنیانەوە بۆ مەسەلەی گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی ، بیریان لەوە کردەوە هەوڵێك بۆ دیارییکردنی پێگە و دەسەڵاتی بدەن . ئیدمۆندز ئەم نامەیەی خوارەوەی ئاراستەی شێخ مەحموود کردووە :

"جەنابی کۆمیسەری باڵا بیستوویانە کە ئێوە گەڕاونەتەوە سلێمانی . بەڕێزیان فەرمووی کە پێتان رابگەیەنم کە ئەو بۆ خۆی رەوتی پێڕاگەیشتن بە کاری قەزاکانی رانیە ، قەڵادزێ ، چەمچەماڵ ، هەڵەبجە ، قەرەداغ ، سەنگاو و ناحیەی ماوەتی روونکردووەتەوە و ئێوە بە هیچ شێوەیەك نابێ دەست لە کاروباری ئەو ناوچانە و گوندەکانی سەر بە ساداتی سەرگەڵوو وەربدەن . ئەگەر "خوا نەکردە" بە پێچەوانەی ئەو فەرمانە بجوڵێنەوە و دەست لە کاری ئەم ناوچانە وەربدەن و هەر شێوەیەك کۆسپ بخەنە سەر رێگای میریی ، زۆر بە توندیی دژی ئێوە کار دەکرێت . ئێستا کە دەستتان لە کاروباری ئەو ناوچانە وەرنەداوە ، جەنابی کۆمیسەر بڕوای بەوە نیە کارێك دژ بەئێوە ئەنجام بدات .[٨٩]

وێڕای ئەم ئاگادارکردنەوەیە ، شێخ دەستی کردبوو بە دەستێوەردانی کاروباری ئەو ناوچانەی لەنامەکەدا ئاماژەیان بۆ کرابوو . لەئاکامدا بارەگاکەی لە سلێمانی بۆمباران کرا ، ئەوەش شەپۆلێکی دزیی و جەردەیی بەدواداهات لە ناوچە بەرزاییەکانی دەوروبەر کە لایەنگری شێخ مەحموود بوون .[٩٠] واپێدەچوو هێزە تەمێکارەکانی بەریتانیی شێخیان چاوترسێن نەکردبێت ، هەربۆیە لە هەوڵی ئەوەدابوو دەسەڵاتی خۆی بەرەو ئەو ناوچانە بکشێت کە لێی قەدەغەکرا بوو . لە هەمان کاتدا ، ئەو بەبەردەوامیی نۆ ئیدمۆندز و کۆمیسەری باڵای دەنووسی و بێتاوانی خۆی پێشاندەدا و پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە

---

[88] Ibid.,345.

[89] Ibid.,346.

[90] Ibid.,350

بەهەڵە لێی تێگەیشتوون .[91] سەبارەت بە لایەنگران و ئەوانەشی لەگەڵیدابوون . ئەو زۆر بە وریاییەوە هەڵمەتێکی پرۆپاگەندەیی بڵاوکردەوە بۆئەوەی سەری بۆ دانەوێنن دەسەڵاتی بەسەریاندا بڕوات . بەگوێرەی ئیدمۆندز "بایەخدارترین پرۆپاگەندەی شێخ مەحموود ئەوە بوو کە راگەیاندنێك لەبارەیەوە بڵاودەکرێتەوە تێیدا باس لەو کارانە دەکات کە دژی کراون تاکتیکێکی نێودەوڵەتیی لە پشتییەوە بووە و ئەو لەماێندەیەکی نزیك و گونجاودا دەیگێڕنەوە شوێنی خۆی و پلەوپایەی دەسەڵاتەکەی پێشووی دەدەنەوە ."[92]

دەرکەوت هۆشیارکردنەوەکەی پێشوو سوودێکی نەبووە ، هەربۆیە میریی بڕیاریدا سەرلەنوێ شێخ بۆمباران بکاتەوە ، بنکەی شێخ لە رۆژی جەژنی سەری ساڵی ١٩٢٣دا پەلاماردرا ، بۆئەوەی شێخ لەخەت دەرنەچێت ، نمایشی فڕۆکەکان بۆ ماوەی چەند مانگی داهاتووش بەسەر شاری سلێمانیەوە بەردەوام بوو .[93]

یاخیبوونە چەکدارییەکەی شێخ مەحموود لەکۆتاییدا کۆمیسەری باڵای گەیاندە ئەو باوەڕەی کە جگە لەدەستبەسەرداگرتنەوەی شاری سلێمانی رێگەچارەیەکی دیکە نیە . شارەکە لە ناوەڕاستی ژوونی ١٩٢٤دا بەتەواویی داگیرکرا . ئەو هێزانەی ئەرکی داگیرکردنەوەی شارەکەیان ئەنجامدا و پاشتر وەك هێزێکی دەسەڵاتپارێز دامەزرێنران لە : ستوونێکی سوپای عێراق ، هێزێکی پۆلیس ، یەکەیەکی هێزی ئاسووریی ، هەروەها (هاپ) پێکدەهاتن .بەڕێوەبەرایەتیی هەرێمەکە بە ئەفسەرێکی رامیاریی بەریتانیی سپێردرا کە ناوی (ئەی.جەی.چاپمەن) بوو ، ئەوەی ئەرکەکەی خۆی وەك متەسەرفێك لە سایەی حکومەتی عێراقدا گرتە ئەستۆ ، بەڵام لە راستییدا سەر بە کۆمیسەری باڵا و هەر لەویشەوە فەرمانی وەردەگرت .[94]

شێخ مەحموود هێشتا وەك گرفتێك مایەوە ، لەناوچەکانی دەورووبەر پەلاماری لەناکاوی ئەنجام دەدا ، لە هێزەکانی میریی دەدا و بێزاری دەکرن ، باجی وەردەگرت و لەهەر شوێنێك بۆی بلوایە دەیسەپاند .ئینجا بە خێرایی دەکشایەوە سنووری ئێران و

---

[91] Ibid.,365.

[92] Ibid.

[93] Ibid.,371-72,377-78.

[94] Ibid.,387.

دەپەڕییەوە .[٩٥] ئەم دۆخە تا ئەو کاتە بەردەوام بوو کە شێخ وازی لە ململانێی و تێکۆشان هێنا و لە گوندی پیران دانیشت . پاش ماوەیەکی کەم لە ژوونی ١٩٢٧دا شێخ ملکەچیی خۆی پیشاندا و فەرمانی لێخۆشبوونی بۆ دەرچوو ، هەروەها ڕێگەی درا بگەڕێتەوە عێراق و ماڵومولکەکە دەستبەسەرداگیراوەکەی بۆ گەڕێنرایەوە .[٩٦]

---

[95] کۆلۆنێل ئێلفینستۆن کە خۆی لەو دەمەدا لە عێراق خەریکی ڕاژەکردن بووە ، سەبارەت بە پارمەتیی ماددیی چالاکییەکانی شێخ مەحموود ئەم تێبینییە سەرنجڕاکێشەی خوارەوەی دا :" لەمیەمە سالی ١٩٢٧ کاتێک شێخ مەحموود لە سەر سنووری ئێران پەرەوازەبوو . بەرنامەی ئەوەمان دانا کە ئەو سەرچاوەیە سنووردار بکەین کە شێخ مەحموود بەهۆی ناردنی باجگرەکانیەوە لە نێو خێڵەکییەکاندا باج کۆدەکەنەوە .پاشتر بۆمان دەرکەوت کە ئەو خێڵەکیانەی بە ڕۆژ واخۆیان پیشانەدا کە لەو کارانەمان بۆ ڕێگریی لە باجگرەکانی شێخ سوپاسگوزار بوون ، هەر شەوی بەسەردا دەهات بۆ خۆیان چیان لێ داواکاربوو بۆیان ڕەوانە دەکرد ، بەراستیی ئەو کابرایە شکۆیەکی ئایینیی مەزنی هەبوو . ., Elphinston, Kurds and The Kurdiah Question,"45

[96] Edmonds ,Kurds, …,422n.1.

# بەشی دوازدەیەم : شۆڕشەکانی کورد لەتورکیا

## شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٢٥ بە ڕێبەری شێخ سەعید پیران

شۆڕشە کوردییەکەی ساڵی ١٩٢٥ لە قۆناغێکی زۆر ناسکی مێژووی هاوچەرخی تورکیادا قەوما . ئەو چەند ساڵە کەمەی تێپەڕیبوون پڕبوون لە هەڕەشەی مەترسیدار و دەستکەوتی ئەوتۆشی تێدابەدیهات کە سەرەتای قۆناغێکی مێژوویی نوێی هێنایە کایەوە . لەماوەی کەمتر لەنیودەیەدا ، تورکان سەرکەوتنێکی یەکجار بەرچاویان بەسەر یۆنانییەکاندا بەدەستهێنا ، سەرکەوتووانە لە ئەستەمبوڵ و شوێنەکانی دیکە ململانێی هاوپەیمانەکانیان کرد ، لە لۆزان سەرکەوتنێکی پرشنگداریان تۆمارکرد ، لەنێوخۆی وڵاتیش نازایانە کەوتنە جێبەجێکردنی پلانێکی ریفۆرمی گشتگیر . بەڵام سەرکردەکانی تورکیای نوێ ، لەگەڵ ئەو هەموو متمانە و بڕوابەخۆبوونەشدا دەبوو ترس و دڵەڕاوکێی خۆیان هەبێت . ئەگەر ئەم قۆناغە قۆناغێکی پڕ جۆش و خرۆش و دەستکەوتە مەزنە بەدیهاتووەکانی ئێستا و ئایندەیە ، هەروەها قۆناغێکی گواستنەوە ، ناجێگیر ، هەستیار و ناثارامە . هێشتا زۆر کار مابوو ئەنجام بدرێت ، چەندین مەترسیی و هەڕەشەی سەرەڕێ مابوون دەبوو ڕووبەڕوویان ببنەوە و بەسەریاندا زاڵبن . ئەرکەکان دەبوو بەتەواویی جێبەجێ بکرانایە . زۆربەی ئەو دەستکەوتانەی بەدەستهاتبوون سەرەتایی و کاتیی و ناجێگیر بوون ، پێویستییان بە کاری سەخت و ماندووبوونێکی زۆر بوو تا بچەسپێن . مەترسییەکانی دەرەوە و پەرەگرتنی نارەزایەتییەکان لە نێوخۆی وڵاتدا ، هەڕەشەی ڕاستەقینەیان تەنانەت لە هەرە چەسپاوترینی ئەو دەستکەوتانە دەکرد .

وێڕای هەموو ئەمانەش ، سەرکردەکانی تورکیای نوێ سەرگەرم و بەجۆش و بەرۆشەوە ، بە بڕوابەخۆبوونێکی ئاشکرا و چارەسەری لێبڕاوانە ، ڕووبەڕووی جیهان و وڵاتەکانی بوونەوە . سەرکەوتنەکان هانیدان بەئاشکرا بانگەشە و داوای گێڕانەوەی ویلایەتی دەوڵەمەندی موسڵ بکەن کە پێشتر هەرێمێکی ئیمپراتۆرییە لەدەستچووەکەیان

بوو . بەڵام موسڵ لە دەستی بەریتانییەکاندا بوو ، ئەوانیش تەمای ئەوەیان نەبوو دەستی لێهەڵگرن ، هێشتا سەرگەرمیی تورکان بە سەرکەوتنەکانیان دانەمرکابوو ، هەڕەشەی مەترسییدار دەهاتە رێیان بە گەرمکردن و قووڵکردنەوەی کێشەکە لەسەر ئەو هەرێمەی ململانێیەکەی لەسەر بوو . مەسەلەکە کە لە کۆنفرانسی لۆزاندا هێنرایە پێشەوە جێگای مشتومڕێکی توند بوو ، بڕیاری ئەوەشی لێدرا کە بە رێکەوتنی هەردوولا بۆ ماوەی ساڵێک هەڵپەسێردرێت .

### پەیوەندییەکانی نێوان کورد و تورک

بە درێژایی ئەم ماوەیە ، پەیوەندییەکانی کورد و تورک تادەهات رووی لە تێکچوون و ئاڵۆزبوون دەکرد ، تورکان زۆر بە وردی و لە نزیکەوە چاودێریی کوردەکانیان دەکرد ، ئەوانەی مەزنترین پێکهاتەی رەگەزیی غەیرە تورک بوون و پاش جەنگ لە نێو تورکیادا مابوونەوە . لەبەر ئەم هۆکارە ، ئەوانە هەڕەشەیەکی مەترسییداریان بۆ بۆ یەکێتی نەتەوەیی ئەو وڵاتە نوێیە پێکدەهێنا . تورکان بەتەواویی لەوە ئاگاداربوون کە بەهێزبوونی خواستی توێژە باڵاکانی کۆمەڵگای کوردیی خۆی لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ دەبینێتەوە . لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانییدا ، هێندێک لە کوردە دیار و ناسراوەکان پەیوەندییان بە هەریەک لە بەریتانییەکان و رووسەکانەوە کردبوو و مەسەلەیەکی لەو جۆرەیان لەگەڵیاندا هێنابووە بەر باس . بەرهەمی ئەو پەیوەندییانە لەو کاتەدا کەم بوون ، بەشێکی بەهۆی ئەو پشێویی و نائارامییە گشتییەی بەدوای جەنگەکەدا هاتن ، هەروەها بەهۆی سەرقاڵبوونی هاوپەیمانەکان بە کێشەی ئەرمەنەکانەوە . لە پاش جەنگ ، وەک دەبینین ، کوردان ناکۆکییەکانیان بەپەلە لەگەڵ ئەرمەنەکاندا چارەسەرکرد و نوێنەری هەردوولا پێکەوە لە کۆنفرانسی ئاشتییدا دەرکەوتن . لەراستییدا لە قۆناغی تێکشکان و لاوازیی تورکیادا ، تورکان لە ترسی ئەوەی ئەوەکا هەرێمەکانی رۆژهەڵاتیان بە قازانجی ئەرمەنەکان لەدەستبچێت ، هەوڵی زۆریان دا باوەش بە خولیا نەتەوەییەکانی کورد دا بکەن و هانی کوردان بدەن داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیی کوردیی لە رۆژهەڵاتی ئاسیای بچووکدا بکەن . هەرای بانگەشەی کوردان هێندێک ئەنجامی

بەرجەستەی لێکەوتەوە ، لە پەیماننامەی سیڤەردا ، دەقێك بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی لەو چەشنە جێگیرکرا ، بەڵام پاش رابوونی کەمۆڵیستە و ناناسایی تورکان لەسایەی مستەفا کەمال هاتەپێش و ئەوان سەرەتا کەوتنە لاوازکردن و پەراوێزخستنی نەتەوایەتیی کوردیی و پاشتریش قەدەغەیان کرد و رێگرییان لێکرد.

ماوەیەکی کەم پێش هەڵگیرساندنی شۆڕشە کوردییەکەی ساڵی ۱۹۲۵ ، سەرخێڵە کوردەکان ، روناکبیران و نەتەوەخوازە کوردەکانی دیکە ، بۆ رۆژئاوای ئەنەدۆڵ دوور دەخرانەوە ، بەکارهێنانی زمانی کوردیی قەدەغەکرا .[1] ئەم هەنگاوانە هاوکات بوو لەگەڵ نارەزایەتیی بەشێکی گەورەی کۆنەپارێزانی ئایینیی کورد و سەرخێڵەکان بەرامبەر ریفۆرمە نوێیەکان کە لەنێویاندا لابردنی خەلافەت و رەتکردنەوەی شەریعەت و یاسا ئیسلامییەکانی لەخۆگرتبوو ، ئەوەش بێگومان هۆکارێکی بەرچاوی شۆڕشەکە بوون.

شۆڕشەکە ، دروست لەو کاتەدا دەستپێکرد کە کێشەی موسڵ گەیشتبووە قۆناغێکی هەستیاری ، ئەوەش کارێکی وای کرد کە قورسایی و کاریگەریی خۆی سەبارەت بە بانگەشەکانی هەریەك لە بەریتانیا و تورکیا بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئەو هەرێمە هەبێت . شۆڕشەکە سەنگی داواکارییەکانی تورکیای بۆ گێڕانەوەی ئەو هەرێمە کوردنشینە بە تەواویی سووك کرد و هەڵوێستی حکومەتی تورکی لەو رووەوە لاوازکرد . بە پێچەوانەوە ، بەڵگەیەکی بەهێز و کەمۆڵیستەی دایە دەست بەریتانییەکان و پشتگیرییەکی بایەخداری هەڵوێستی بەریتانییەکانی کرد ، ئەو راستییەی بەشێوەیەکی ئاسایی گومانی تورکەکانی وروژاند و هانیدان کە بەریتانییەکان بە خەمڵێنەری شۆڕشەکە تۆمەتبار بکەن . ئەوەندەی پەیوەندی بە نەتەوایەتیی کوردەوە هەیە ، شۆڕشەکە لە کاتێکی زۆر گونجاودا هەڵنەگیرسا ، ئەو شۆڕشە خواستی جیاخوازیی نەتەوەیی کوردی قووڵکردەوە ، لەکاتێکدا تێکڕای چاوەکان لەسەر کوردانی ویلایەتی موسڵ بوون . هەرچەندە شۆڕشەکە لە بەدیهێنانی ئامانجەکانی لە تورکیا شکستیخوارد ، بەڵام هەرێمێکی مەزنی کوردەواریی لە عێراق لە هەژموونی تورکان پاراست .

---

[1] Chirguh, La question kurde, 31; Rambout,26;S.Bedir Khan,46a.

## هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە

شۆڕشەکە لە مارتی ١٩٢٥دا هەڵگیرسا ، لەکاتێکدا کۆمسیۆنی کۆمەڵەی گەلان لە ویلایەتی موسڵ و باشووری ئەو هێڵەی برۆسلی پێدەگوترێت ، خەریکی بەڕێوەبردنی لێکۆڵینەوەی راپرسییەك بوون تا روونیبکاتەوە و بڕیار لەوەبدات داخۆ دانیشتووانەکە خوازیاری ئەوەن لەنێو دەوڵەتی تازەدامەزراوی عێراقدا بمێننەوە یاخود پێیان باشە بگەڕێنەوە باوەشی تورکیا . هەروەك (تۆینبی) چەند ساڵێك دواتر ئاماژەی پێداوە ، هەڵیگرساندنی شۆڕشەکە لە باکووری ئەو هەرێمەی کێشەکەی لەسەر بوو " لە چەند ناوچەیەکدا بوو کە لەو دەمەدا هیچ هێزێکی بیانیی ململانێی سەروەریی و دەسەڵاتی تورکانیان تێدا نەدەکرد ."[2]

شێخ سەعید پیران ، سەرۆکی تەریقەتی نەقشبەندیی ، رێبەرایەتیی شۆڕشەکەی کرد .[3] شێخ سەعید دەسەڵات و نفوزێکی زۆری لە ناوچەکانی دەوروبەردا هەبوو ، نەك تەنیا بەهۆی ئەو پیرۆزییەی کە بە میرات بۆی مابووەوە ، بەڵکو بەهۆی ئەو پەیوەندییە ژنوژنخوازییەی کە بە سەرخێڵە کوردەکانی دەوروبەرەوە دەیبەستەوە .بەتایبەت لەگەڵ زازاکانی بەرزاییەکانی دەرسیمدا .[4]

ژمارەیەك نووسەر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن ، هەرچەندە شێخ سەعید رێبەری گشتیی و سیمبولی شۆڕشەکە بوو ، بەڵام ئەو تەنیا یەکێك بوو لە زۆرێك لەوانەی هەڵگری ئەو بڕوایە بوون و بەشێوەیەکی کرداریی جێبەجێیان کرد . بە بۆچوونی ئەوان

---

[2] Toynbee,507.

[3] سەرکردەی ئەم راپەڕینە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا شێخ سەعیدی پیرانە . بەڵام هێندێك سەرچاوە ناوی شوێنەکەی شێخ بەجۆرێکی دیکە دێنن ، (راندۆت) دەڵێت شێخ سەعیدی پالو ، (کارل)یش دەڵێت شێخ سەعیدی گەنجە

Rondot,"Les tribus Montagnardes,"48;August Ritter Von Krl, Kamal Ataturk' s land."48.

[4] Toynbee,507-8.

سەبارەت بە بنەماڵەی شێخ سەعید بڕوانە : Rondot,"Les tribus Montagnardes," 48 .

، شۆڕشەکە ناکامی پلانێك بوو هۆشیارانە لەلایەن ژمارەیەك لە نەتەوەخوازانی کوردەوە ئامادە و بەڕێوەدەچوو ، پلانی هەڵگیرساندنی شۆڕشەکە بە میرئالا خالید بەگ ، کە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی خێڵی گەورەی جوبرانلی ، سپێردرابوو .[5]

۲۱ی مارتی ۱۹۲۵ وەك بەروارێك بۆ دەستپێکردنی راپەڕینێکی سەرتاسەری دەستنیشانکرا ، هەرچەندە شۆڕشەکە بەشێوەیەکی نابەکام لە ۷ی مارتدا هەڵگیرسا ، واتە چواردە رۆژ پێش ئەو مێژووەی بۆی دانرابوو .[6] ئەم گۆڕانە نەخوازراوە لە بەرواری راپەڕینەکەدا بووەهۆی تێکدانی یەکجارەکی بەرنامە چەکدارییەکانی کورد . نەك تەنیا بنکە جیاوازەکانی بەرەنگاریی بێئاگابوون لە هەڵگیرساندنی کارە چەکدارییەکان و بەو هۆیەشەوە لەگەڵ ناوچەکانی دیکەدا پێکەوە رانەپەڕین ، بەڵکو ئەو ئەفسەرە کوردانەش دانرابوون بۆ سەرپەرشتیکردنی ئۆپەراسیۆنە چەکدارییەکان لەو بەرانەی بۆیان دانرابوو ، نەیانتوانی لە کاتی گونجاودا پەیوەندیی بە یەکەکانیانەوە بکەن .[7]

راپەڕینەکە بەخێرایی پەرەیگرت ، راپەڕیوان توانیان پێشڕەویی بکەن و دەست بەسەر ژمارەیەك شاری گرنگدا بگرن .ئەوان توانیان بۆ ماوەیەك دەست بەسەر شاری خەرپوتدا بگرن ، بەڵام لە گرتنی شارەکانی وەك دیاربەکر ، ئەرغانە ، مەلاتیا و چەند مەڵبەندێکی دیکەدا شکستییانخوارد ،[8] واپێدەچوو راپەڕینەکە ئەو هێزو

---

[5] S.Bedir Khan,46;Chirguh, La question kurde, 31; Rambout,26; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,11.

[6] راپەڕینەکە بە شێوەیەکی لەناکاو کاتێك دەستپێکرد کە دەستەیەك جەندرمەی تورك لەگەڵ ژمارەیەك لە پیاوەکانی شێخدا بە یەکیاندا هەڵپڕژان .سەفرستیان دەڵێت کە راپەڕینەکە بەهۆی پیلانی تورکانەوە بەو نابەکامییە تەقیەوە و توانی لە رێگەی بەکرێگیراوەکانیەوە لەباری بەرێت .بەگوێرەی ئەو تورکان شێخ سەعیدیان بانگ کردووەتە بنکەیەکی خۆیان ، ئەویش وایزانیوە بۆ سزادانە و داوای لە پیاوەکانی کردووە دەستبکەنەوە کە چەند سەد کەسێك بوون ئەوەش وایکرد راپەڕینەکە لە جیاتی ۲۱ی مارت ، لە ۷ی مارتدا بتەقێتەوە .

S.Bedir Khan,46;Chirguh, La question kurde, 32; Rambout,26,Safrastian,83.

[7] Chirguh, La question kurde, 31; Rambout,26; Safrastian,83

[8] Toynbee,509.

سەفرستیان دەڵێت راپەڕیوەکان توانیویانە دەست بەسەر بەشی باشووری شاری دیاربەکردا بگرن

Safrastian,83

جۆش‌وخرۆشـەی بـەرایی لـە ئـەنجامی ئـەو شکست و پاشەکشێیانەدا لەدەسـتدابێت . وێڕای ئەوەی پەرەگرتن و بڵاوبوونەوەی ڕاپەڕینەکە ڕێی لێگیرا ، بەڵام هێشتا دوور بـوو لەوەی بە تەواوەتیی کۆنترۆڵ بکرێت . زۆربەی شەڕ و پێکدادانەکان لە ناوچە بەرزایی و چیاییەکان دەقـەومان ، هێشتا وەرزەکـە زوو بـوو بـۆ ئـەوەی جوڵـە بـە یەکـە سـەربازییە گەورەکان و چەکی قورس بکرێت و ڕەوانـەی ئـەو ناوچانە بکرێن . گـەرووی چیاکان بە بەفر گیرابوون ، تەنیا چەند تولە ڕێیەکی ناخۆش هەبوون کە لە سایەی بارودۆخێکی زۆر نالەبار و پڕ ئاستەنگدا دەتوانرا کەڵکیان لێوەربگیرێت .[9]

## سەرکوتکردنی شۆڕشەکە

بەلەبەرچـاوگرتنی بـاری سـتراتیژیی و لۆجـستیی ، پێویـستیی دۆزینـەوەی ڕێگەیەک بگاتە ناوچەکانی ڕاپەڕین زیاتر جێگەی بایەخ بوو . ئەو ناوچانەی بەو لەمپەرە چیاییانە پارێزرابوون کە بواری تێپەڕینیان نەدەدا . وەڵامەکەش خۆی لـە بەکارهێنانی هێڵی ئاسنیی بەغدادا بینییەوە کە بەشێکی کەوتبووە سووریاوە . پاش ئەوەی حکومـەتی تـورک داوای مۆڵـەتی ڕێپێـدانی لـە دەسـەڵاتدارانی فەرەنسیی لـە سـووریا کـرد تـا بەشـە سوورییەکەی هێڵی ئاسنیی بۆ گواستنەوەی سەرباز و چەک و ئازوقە بەکاربهێنن . بە پێی بەنـدی ۱۰ی ڕێکەوتننامـەی فەرەنـسیی–تـورکیی کـە لـە ۲۰ی ئۆکتۆبـەری ۱۹۲۱دا مۆرکرابوو ، مۆڵەتی ڕێپێدان وەرگیرا .[10]

لـە دواهەفتـەی مـانگی مـارتی ۱۹۲٥دا ، دژە هێرشـی تورکان بـۆ سـەر چەکدارە

---

[9] Toynbee,509.

[10] ئەم ڕێکەوتنە بە ڕێکەوتنی ۱۹۲۱ی فرانکلین–بۆیلۆن یش ناودەبرێت . سەرچاوە کوردییەکان و ئەوانەی لایەنگرییان دەکەن جەخت لەو قازانجە گەورەیە دەکەن کە تورکان لە بەکارهێنانی بەشەکەی سووریای هێڵە ئاسنییەکەی بەغدا دەستیان کەوتووە . هەرچەندە تۆینبی لە ساڵی ۱۹۲۷ ئاماژەی بەوەداوە کە پێش ئەوەی ئەم خۆکۆکردنەوانەی تورک کار لە هەلومەرجە سەربازییەکە بکات ، شکستی شێخ سەعید لە گرتنی دیاربەکردا بە شێوەیەکی مەزن جوڵانەوەکەی لاواز کرد

Chirguh, La question kurde, 32: Rambout,26; Safrastian.83; Toynbee,59.

یاخیبووەکـان دەسـتپێکرد .[11] هەڵـسوڕانی سـەرکردایەتیی بـاڵای جـەنگی تـورك وا دەرەخـات کـە نەخشەی گەمارۆیـەکی بـەرفراوانیان دارشـتبێت بەمەبەستی رێگـرتن لـە پەرتـەوازەبوونی یـاخیبووان و پاشـتر سـەرلەنوێ کۆبوونـەوەیان لـە دەسـتە و تـاقمی بچووکدا بتوانن بەشێوەی پارتیزانیی بجەنگن .[12] تورکان سەرکەوتووانە توانیان بەشێکی سـەرەکیی هێزەکـانی راپـەڕین لـە ٨ی ئـەپرێلی ١٩٢٥دا ، لەشـەڕەوە بگلێـنن . لـە پێکـدادانێکی تونـد و یەکلاکـەرەوەدا کـە لـە هـەرێمی چـاپوکجار روویـدا ، هێـزی راپەڕیوەکان بەسەختی تێکشکان .[13] پاش ئەوە بە ماوەیەکی کەم ، گەنجە گیرا ، شێخ سەعید و ٣٤ کەس لە هاوکارە نزیکەکانی دەستگیرکران . باقی دیکەی راپەڕیوەکانیش چەکەکانیان فڕێدا .[14]

سەرکوتکردنی راپەڕینەکە هاوکات بوو لەگەڵ دادگاییکردنێکی کورتخایەندا کە دواتریش هەر بەردەوام بوو . راگواستنی بەکۆمەڵ ، هەنگاوی تەمێکارانەی توندوتیژ ،[15] بەچەشنێك کـە گیـانی بـەرگریی کـورد تێکبـشکێنێت و دوایـین بـەرەنگاریی کـە دژی فەرمانڕەوایەتیی تورك مابوو لە پێ بخا . وادەردەکەوێت کە کردەوە سەرکوتکارییەکان بەشێوەیەکی وا دارێژرابوون و جێبەجێدەکران کە وانەیەك بێت هەرگیز لەیاد نەچێتەوە . ژمـارەی راسـتەقینەی ئەوانـەی کـوژراون یـا دوورخراونەتـەوە ، هـەروەها ئـەو مـاڵ و گوندانەی وێرانکرابوون هـەرگیز بەتـەواوی نازانرێت ، بەپێی سەرچاوە کوردییەکان ، زیانی خەڵکی مـەدەنیی وێرانکردنـی ٢٠٦ گونـد ، سووتاندنی ٨٧٥٨ خـانوو ، کوشتنی ١٥٢٠٦ پیاو و ژن و منداڵ .[16] سورەیا بەدرخان پاش دوو ساڵ لە شۆڕشەکە رایگەیاند

[11] Timse (London),Mar.28,1925;cited in Toynbee,509.

[12] Timse (London),Apr.1,1925;cited in Toynbee,509-10.

[13] Toynbee,510.

[14] Toynbee,510.

[15] کاپتن (ئارمسترۆنگ) کە خۆی وەك وابەستەی سەربازیی بەریتانیی لە تورکیا رازەی کردووە وێنەیەکی تاریکی سەبارەت بە سزادانە راگواستووە کە تورکان دوای سەرکوتکردنی راپەڕینەکە دەرحەق بە کوردیان کردووە

H.C.Armstrong, Gray Wolf, Mustafa Kemal: An Intimate Study of a Dictator (London:A.Barker,1932),265.

[16] Chirguh, La question kurde,49-52; Rambout,28.

کە یەك ملیۆن کورد کوژرا و راگوێزراون .[17] شێرکۆ پێنج ساڵ دواتر ، جیاواز لەو ، جەخت لەوە دەکاتەوە کە بەرێژایی وەرزی زستانی ساڵەکانی ١٩٢٥-٢٦ ، ١٩٢٦-٢٧ ، ١٩٢٧-٢٨ زیاتر لە ٥٠٠٠٠٠ کورد راگوێزراون ، هەروەها زیاتر لە ٢٠٠٠٠٠ لە راگوێزراوەکان لە ئەنجامی پرۆسەی بەزۆر دوورخستنەوەیان بۆ رۆژئاوای ئەنەدۆڵ گیانیان لەدەستداوە .[18] هەمان ئەو سەرچاوانە باس لەوە دەکەن کە کوردەکان لەشەڕ و پێکدادانێکدا ٢٤٠٠ کەسیان کوژرا و بریندار هەبووە . وەك دەگوترێت ئەو هەڵمەت و لەشکرکێشییەی تورکان ٦٠ ملیۆن لیرەی تورکیی زیانی بە گەنجینەی حکومەت گەیاندووە .[19]

## دادگاییکردن و هەڵواسینی رێبەرانی شۆڕشەکە

لەپاش سەرکوتکردنی راپەڕینەکە ، دادگای سەربازیی تایبەت بەناوی (دادگاکانی سەربەخۆیی) پێکهێنران و دەستبەکار بوون . بەناوبانگترینی ئەو دادگاییانە ئەوەیان بوو کە دادگایی شێخ سەعید و باقی دیکەی سەرانی راپەڕینەکەی کرد . لەماوەی دادگاییکردنەکەدا لە ٢٧ی مایۆ لە دیاربەکر دەستیپێکرد تا ٢٨ی ژوونی خایاند ، داواکاریی گشتیی و دادوەری سەرەکیی ، ژمارەیەك خاڵی سەرنجراکێشیان ریزکردبوو . داواکاری گشتیی بەم گوتەیەی خوارەوە کەوتە ئاشکراکردنی تۆمەتەکان :

" هۆکارەکان و بنەماکانی ئەو شۆڕشەی کە بەم دواییە لە هەرێمەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا ولاتی هەمیشەیی باوباپیرانمان تەقییەوە هەمان ئەوانەیە کە لە رابردوویەکی زۆر دوور نیە بووەهۆی راپەڕینەکانی بۆسنە و هێرزەگۆڤینیا ، کە لە سێ لاوە لەگەڵ رەگەزە نەتورك و نەموسوڵمانەکاندا نزیك بوو . ئەو هۆکارانەی کە لەگەڵ ئەوانەدا و وێڕای برایەتیی پێنج سەدە ، هانی ئەلبانییەکانی دا لەماوەی شەڕی بەلقاندا ، لە پشتەوە هێرش بکەنە سەر تورکان ، ئەو تورکانەی هەمیشە هاوسۆزییەکی فرەیان بۆ

---

[17] S.Bedir Khan.46

[18] Chirguh. La question kurde, 33.

[19] Ibid.,23-33.Cf. S.Bedir Khan.46.

ئەوانە هەبووە لەگەڵیان ژیاون . ئەو بیر و ئامانجەی ڕێنیشاندەری شۆڕشە کوردییەکە بوو هەمان ئەو بیروئامانجە بوو کە لە سوریا و فەلەستین دا هەرای نایەوە "[20]

سەرۆکی دادگا لەکۆتایی هۆنینەوەی بڕیارەکانیدا ، ڕووی لە تاوانباران کرد و گوتی :" هێندێك لە ئێوە گیانی خۆپەرستیی هانیداون ، هێندێکیشتان بە فیکی بێگانە و ناحەزیی سیاسیی ، بەڵام هەمووتان کۆك بوون سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ ، شۆڕشتان هەڵگیرساند ، هەربۆیە پێویستە باجی وێرانکردنی وڵات و ئەو ڕووباری خوێنەی هەڵتان ساندووە لەسەر تەختی سێدارە بدەن ."[21]

بەپێی ئاکامی ئەو دادگایە ، لە ٢٨ی ژوونی ١٩٢٥دا ، سزای مردن بەسەر پەنجاوسێ کەس لە سەرکردە کوردەکاندا سەپێنرا و فەرمانەکە دەستبەجێ جێبەجێکرا .[22] یەك لەوانەی لەگەڵ شێخ سەعیددا سزای کوشتنی درا ، شێخ عەبدولقادری کوڕی کەسایەتیی ناودار شێخ عوبەیدوڵڵا بوو ، ئەوەی ئەندامی ئەنجومەنی پیران و کارمەندێکی بڵندی دەوڵەتی عوسمانیی بوو ، هەروەها هەشت شێخی دیکەش . فەرمانی داخستنی تەواوی تەکیە و خانەقای سۆفییەکانیش لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا دەرچوو.[23]

چەند ڕووداوێکی کورت و خوێناویی دیکە بەدوای ڕاپەڕینەکەدا هاتن ، پاش هەڵواسینی ڕێبەرانی کورد لە دیاربەکر ، ڕاپۆرتەکان هەواڵی دەستپێکردنەوەی

---

[20] Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds.12; Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 2(1948),9.

[21] S.Bedir Khan,46; Rambout,27;Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,12; Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no.2,(1948)9;Malik,18.

ئەو گوتەیە لە ژمارە ٢٨ی ڕۆژنامەی (Vakit) ی تورکیی ساڵی ١٩٢٥ەوە وەرگیراوە .

[22] Toynbee.510. Cf. S.Bedir Khan.53; Rambout.27; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,12; Bulletin du Centre d Etude Kurdes. no.2,(1948)9.

[23] Toynbee.510.

لە ٢ی سێپتەمبەری ١٩٢٥ بڕیارێك لە ئەنجومەنی باڵای نیشتمانییەوە بۆ داخستنی سەرجەم تەکیێ و خانەقاکان دەرچوو ، هەروەها شوێنکەوتەی تەریقەتە ئایینییەکان بە توندیی سەرکوتکران Toynbee,72-73.

ڕاپەڕینیان لە بەدلیس ، موش و قەزای شەمدینانی هەکاری ڕاگەیاند .[24] شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ عەبدولقادری نەهری (یەکێك بوو لەوانەی لە دیاربەکر هەڵواسرا) لە تۆڵەی کوشتنی باوکیدا ڕاپەڕیبوو ، هەواڵی ئەوەش هەبوو کە لەسەرەتادا سەرکەوتنی بەدەستهێنا بێت . بەڵام لە نووتدا بەسەختیی تێکشکا ، لەبەر ئەوە لەگەڵ دووسەد خێزانی کورددا سنووریان بەزاند و بەرەو عێراق هەڵاتن .[25] کوڕەکەی شێخ سەعید ، هەروەها براکەشی ، ناچار بوون پەنا بۆ عێراق بەرن .[26] هەڵمەتەکانی سەرکوتکاریی زۆربەی خێڵە کوردەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیای گرتەوە ، وێڕای پاشماوەی ئەو کریستانییە یاقوبیی و کلدانییانەی کە لە هەمان ئەو ناوچەیەی وڵاتدا دەژیان .[27]

تۆینبی گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی ، وێڕای ئەوەی حکومەتی تورك لە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەدا توانا و لێهاتوویی پێشاندا ، بەڵام بڕیارەکانی سەبارەت بە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ کورد و کێشەکە و ئەمامەتییەکانیدا ناشایستە و دووربوون لە دانایی ڕامیاریی ، تورکان بۆئەوەی بایەخێك بۆ خواستە نەتەوایەتییەکانی کورد دابنێن ، بە تین و تاوێکی نوێوە کەوتنە جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی ناوەندگەرایی ، تورکاندن ، سێکیولاریزم ، ڕۆژئاواگەرایی ، هەمان ئەو سیاسەتانەی هۆکاری تەقینەوەی شۆڕشەکە بوون .[28]

---

[24] Ibid.,511.

[25] Great Britain ,Colonial Office , Report by H.B.M. s Government to the Council of thr League of Nation on the Administration of Iraq for the Year 1925 (London:H.M. Stationary Office,1926),12.

[26] Ibid.

[27] بەگوێرەی لۆنگریك ، ئەو ڕەگەزە جۆراوجۆرانەی لەبەر دەم سوپای تورك وەك پەنابەر هەڵاتوونەتە عێراق بریتیە لە : ژمارەیەکی دیارینەکراو لە کوردانی میران ، دەهەزار گۆیانیی ، هەزار کریستیانی ناوچەی تۆرعابدین ، نزیکەی دەهەزار ئارتوشیی Longrigg, Iraq, 1900-1950,157.Cf. Toynbee,511

[28] Toynbee,510-11.

## هۆیەکانی شۆڕشەکەی ١٩٢٥

سەرنج و دیدی حکومەتی تورکیی: حکومەتی تورکیی ڕاپەڕینەکەی شێخ سەعیدی بە کاردانەوە و جوڵانەوەیەکی کۆنەپەرستانە ناساند کە لەلایەن ڕێبەرانێکی دواکەوتوو و کاڵوکرچی ئایینیی و سەرخێڵەکانەوە سەرکردایەتیی دەکرا. ئەو سەرکردایەتییەی وەك بۆچوونەکەی تورك جەختی لەسەر دەکردەوە، خوازیاری ئەوە نەبووە دەست لەو مافە بۆماوەییانەیان هەڵگرن کە لە ئەنجامی بەرەوپێشچوونی پرۆسەی چاکسازییە پێشکەوتووخوازانەکەی مستەفاکەمالەوە، هەڕەشەی کاڵبوونەوە و لەنێوچوونیان لەسەر بوو. سەرچاوە فەرمییەکانی تورك هەروەها بەریتانییەکانیان بە هاندەری ڕاپەڕینەکەی کورد دەدایە قەڵەم، بەڵام ئەمەی دواییان پاشتر قسەی لێوەدەکرا.

ڕاستودروستی تۆمەتەکانی تورك هەرچییەك بن، بەرژەوەندیی حکومەتی تورکیی لەوەدا بوو جەخت لە پاشکەوتوویی و ئایینگەرایی ڕاپەڕینەکە بکات تا قسەکردن لەمەڕ کاریگەریی نەتەوایەتیی. پێویستە ئەویش بە بیر بهێنینەوە کە حکومەتی تورکیی لەو ماوەیەدا سەرقاڵی مەسەلەی گێڕانەوەی ویلایەتی موسڵ بوو، ئەوەش پشتی بە ڕازیبوونی کوردان و خاترجەمیی و نیازباشیی بەدەوامیان و هەروەها پشتگیریی کۆمەڵەی گەلان دەبەست. دانپێدانانی حکومەتیی تورکیی بە تایبەتمەندیی نەتەوەیی ڕاپەڕینە کوردییەکەدا بە تەواویی سەنگی تورکەکانی لە مەسەلەکەدا سووك دەکرد. تورکان نەیاندەتوانی بە باشی ئەوە پشتڕاست بکەنەوە و مل بەوە بدەن کە کوردەکانی باکووری هێڵی برۆسل لە پێناوی سەربەخۆییدا لە ململانێیەکی خوێناوییدا دژی سوپای تورك تێوەگلاون، لە کاتێکدا بۆ ئەوە تێبکۆشن کە پێشانی بدەن کوردانی باشووری ئەو هێڵە بۆ دووبارە گەڕانەوەیان بۆ باوەشی دەوڵەتی تورك پەرۆشن.[29]

حکومەتی تورکیی هاندەرێکی بایەخداری دیکەی هەبووکە وای لێبکات جەخت

---

[29] تۆینبی بە درێژییەکی پتر لەم مەسەلانە دواوە. ئاماژەی بەوەداوە کە سەرچاوە فەرمییە تورکییەکان هەوڵێکی تایبەتیان داوە تا جەخت لە ڕووی کۆنەپەرستیی و ئایینیی ڕاپەڕینەکە بکەنەوە. ئەو وەك نموونە ئاماژەی بە گوتارەکەی عیسمەت پاشا لە ئەنجومەنی باڵای نیشتمانیی لە ٧ی ئەپرلی ١٩٢٥دا داوە. هەروەها ئەو بابەتەی کە لەلایەن حیلمی بەگی والی مەعمورەتولعەزیز لە ژمارە١١ی ئەپرلی ١٩٢٥ لە ڕۆژنامەی (Tanin) ی تورکییدا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها ڕاپۆرتی فەرمیی دادگاییکردنەکەی شێخ سەعید.

لە سروشتی پاشکەوتووخوازانەی راپەڕینەکەی کورد بکاتەوە . ئەوەش دەرفەتێکی نایابی دا بە رژێم کە زەبرێکی دەمکوتکەر لە نەیارانی بوەشێنێت . هەموو ئەوانەی بەشێوەیەک لە شێوەکان بەرامبەر مستەفا کەمال وەستان و هاوڕای سیاسەتەکانی نەبێت ، بەوە تاوانبارکران کە لەگەڵ راپەڕیوەکاندا خەریکی پیلانگێڕانن . ئەوانە تووشی چەندین پەلامار و کردەوەی سەرکوتکەرانە بوون و تەنانەت راپێچکرانە بەردەم دادگا بەدناوەکانی سەربەخۆیی . بەم شێوەیەش ، دەنگە نارازییەکان کپکران و نەیارانی رژێم تێکشکێندرا .[30]

بیروڕای جۆراوجۆر سەبارەت بە سروشتی راپەڕیوەکان : وادەردەکەوێت کە هێندێک نووسەر دیدی حکومەتی تورکیان پەسەندبێت ، نەک تەنیا ئەوەی پەیوەندیی بە سروشتی پاشکەوتووخوازانەی راپەڕینەکەوە هەیە ، بەڵکو سەبارەت بەو نەیارانەی رژێمیش کە گوایە پەیوەندییان بە راپەڕینەکەوە هەبووە . (ریتەر ڤۆن کارڵ) لەوبارەیەوە دەڵێت :

" ئەوە سەلمێنرا کە سەرکردەکان ، لەسایەی شێخ سەعیددا کە خەڵکی گەنجەیە ، لە رۆژئاوای دەریاچەی وان ، لە پەیوەندییدا بوون لەگەڵ هاوڕێ تایبەتییەکانی دوا خەلیفە و هەروەها لەگەڵ میر سەلیم کە لە سوریا و نزیکی سنوور دەژیا و داوای تەختی دەسەڵاتی دەکرد . ئامانجەکە ئەوە بوو کە شۆڕشگێڕەکان دروشمی (بەرگریی لە بیروباوەڕی ئیمپراتۆرییەکە بکەن) بەرز بکەنەوە و پاشتر راپەڕین وەک بروسک بەسەراپای رۆژئاوای ئەنەدۆڵدا بڵاوبێتەوە و لە کۆتاییدا رێگە بۆ دەست بەسەرداگرتنی پایتەخت خۆش بکات ، بەڵام ئەو دروشمە نەیتوانی بچێتە ئەودیو ئەو ویلایەتەی کە لە بنەڕەتەوە تێیدا بەرزکرایەوە ."[31]

---

[30] تۆینبی شێلگیرانە پرسیاری سەبارەت بە رەوایەتیی ئەو تۆمەتانە کردووە کە دژی ئەندامانی ئۆپۆزسیۆن ناراستە کراوە ئەو حوسێن جاهید بەگی وەک نموونە هێناوەتەوە کە سەرنووسەری بەناوبانگی رۆژنامەی (Tanin)بوو ، ئەوەی بە بۆنەی چالاکیی کۆنەپەرستانەی ناراستەکرابوو ، بەو تۆمەتەش خرابووە بەردەم دادگای سەربەخۆیی و سزای دوورخستنەوەی بەسەردا درا تۆینبی ئاماژە بەوە دەکات کە حوسێن بەگ هەمیشە رۆژئاواگەرایەکی دڵسۆز و وەفادار بووە . بەگوێرەی ئەو هیچ بەڵگەیەک نەبووە کە بیسەلمێنێت چ حوسێن جاهید و یا هەر ئەندامێکی دیکەی ئۆپۆزسیۆن لە یاخیبوونەکەی شێخ سەعید بەرپرسیار بن

[31] Kral,21.

نووســـەرێکی دی زۆر کـــە راشـــکاوانە هاتۆتـــەگۆ و ســـەبارەت بـــە گرووپـــی دژەچاکسازیی قسان دەکات ،(سێر.نەی.تێلفۆرد ۆوگ) ە ، ئەوەی لە ساڵی ۱۹۳۰دا دەڵێت :" ئەوانە پارتێکی نوێیان دامەزراند کە ناوی پارتی گەشەپێدانی کۆماریی بوو ، دەتوانرێت رادەی هێز و توانای ئەم پارتە بەو نامەیەدا بزانرێت کە بۆ شێخ سەعید نووسرابوو و تێیدا هاتبوو کە پارتەکەی کازم قەرە بەکر پشتگیریی راپەڕینەکە دەکات . لە راستییدا ، شێخ سەعید پشتیوانیی و هاندانی لە پارتە ئایینییەکەوە وەردەگرت."[32]

(جێنیتـزۆن) کە پاش ماوەیەکی کەم لە سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی شێخ سەعید نووسیویەتی ، ئەوەی ئاشکرا کردووە کە یاخیبوونەکە ململانێیەك بووە لە نێوان پاشکەوتوویی و پەرەسەندندا :" هۆکاری قووڵی بەرهەمهێنەری یاخیبوونە کوردییەکە سروشتێکی کارگێڕیی و ئایینیی هەبوو . جوڵانەوەکە لە لایەکەوە و لە هەمان کاتدا کاردانەوەی فیوداڵیزمی کوردیی بوو دژی دەوڵەت و هەروەها ململانێیەك بوو لەنێوان تورکیای کۆن کە بە یاسا ئیسلامییەکانەوە پەیوەست بوو لەگەڵ تورکیای نوێی سێکیولار و پەرەسەندوودا."[33]

(جێنیتـــزۆن) گەلآڵـــەی ئـــەوەی کـــردووە کـــە لـــەئاکامی جێبـــەجێکردنی ئـــەو چاکسازییە بـە شێوازە ئەورووپییەکـەی ، گرفت و ئـاڵۆزیی بـۆ دەرەبەگـەکان پێکهـات ، ئـەوەش لەسـەر هەلومەرجـە رامیارییـە کاڵوکرچـەکەی کوردسـتان رەنگیدایـەوە . ئـەو راپەڕینەکـەی کوردسـتانی لەگـەڵ جوڵانـەوە کۆنـەپارێزە دژە شۆڕشـەکەی سـاڵی ۱۹۰۸ بەراورد کـردووە نـاوی لێنـاوە (تەقینـەوەی دەمـارگیریی ئایینیی) . بە بۆچوونی ئەو ، مەبەستی ئەو شێخ سەعیدەی ئاڵای سەوزی ئیسلامی هەڵدابوو ، بریتیبوو لە گێڕانـەوەی کارکردن بە یاساکانی شەریعەت ."[34]

(رامبۆت) بە پێچەوانەوەی ئەو پێداگرییەی جێنتێنزۆن ، ئەوەی گەڵاڵە کردووە کـە لـە دادگاییکردنەکـەی شێخ سـەعید و هاوەڵانیـدا ، هەریـەك لـە داواکـاری گشتیی و هـەروەها سـەرۆکی دادگـاش جـەختیان لـەوە کردووەتـەوە کـە نەتەوایـەتیی هانـدەرێکی

---

[32] Sir A.Telford Waugh,Turkey:Yesterday, Today ,and Tomorrow (London:Chapman and Hall ,1930),263 .

[33] P.Gentizon ,"L insurrection Kurse.", 834-56.

[34] Ibid.,841-43.

گرنگی راپەڕینەکە بووە .[35] هەروەك چاوەڕێ دەکرێت سەرچاوە کوردییەکان و ئەوانەی لایەنگریانن زیاتر جەخت لە هۆکاری نەتەوەیی راپەڕینەکە دەکەنەوە تا هاندەری کاردانەوەی ئایینیی . لەساڵی ١٩٢٧دا ، (تۆینبی) گومانێکی قووڵی دەربڕی سەبارەت بە ئەگەری زانینی ئەو راستییەی داخۆ کام یەك لەو دوو هۆکارە –ئایینیی و پاشکەوتوویی لەلایەك و نەتەوەیی لەلایەکی ترەوە– چەسپاو و بەهێزترە . ئەو روونیکردەوە کە بەدەستهێنانی سەرنجی لێبڕاو و بێ ئەملاولا لەو بارەیەوە کارێکی ئەستەمە ، ئەویش لە سۆنگەی ئەو راستییەوە کە تێکڕا یا زۆربەی ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە راپەڕینەکە بڵاودەکرێنەوە لە سەرچاوە تورکییەکانەوەن . دیارە حکومەتی تورکیاش هۆکار و مەبەستی چەسپاوی خۆی لەوەدایە کە لایەنی نەتەوەیی راپەڕینەکە بچووك پێشانبدات و رووی کاریگەریی ئایینیی و پاشکەوتوویی لەسەر راپەڕینەکە زەقبکاتەوە و گەورە بکات .

کاتێك دێتەسەر مەسەلەی گفتوگۆ و لێدانەوەی ئەم بابەتە ، تۆینبی دێتە سەرخاڵێك " وێڕای ئەوەی هێندێك بەڵگە وا پێشان دەدەن کە هاندەری ئایینیی و پاشکەوتوویی لە پشت راپەڕینەکەوە لە هۆکاری نەتەوەیی بەهێزتر بێت ."[36] بەڵام ئەو زۆربەی کات لەبەردەم بەڵگەی زیاتری ئاشکرا و قایلکەردا پێچەوانەی خۆی دەوەستێتەوە :

" لەلایەکی ترەوە ، ئەوە شتێکی بەرچاوە کە راپەڕینەکە بەنێو کۆمەڵانی خەڵکی ئەرزڕۆم ، ترابزۆن و سامسۆن دا بڵاونەبووەوە ، کە بەگشتیی ئەوانیش وەك کوردەکانی هاوسێیان پاشکەوتوو و کۆنەپارێز بوون ئەوانەی کە چیدی پاش ئەوە (لە نۆڤەمبەری ١٩٢٥)دا لەسەر حسابی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دژی چاکسازییە رۆژئاواگەراییەکەی ئەنقەرە نەوەستان . ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت راپەڕینەکە و سەرکوتکردنەکەی ململانێیەکە لە نێوان نەتەوایەتیی کورد و تورك نەك ململانێیەك بێت لەنێوان پاشکەوتوویی و پێشکەوتوویی‌دا . بەم کەمە زانیارییەی خوارەوە پشتگیریی

---

[35] رامبۆت ئەو زانیارییەی جینتیزۆنی خستۆتە پاڵ ئەوەکەی داواکاری گشتیی و سەرۆکی دادگاکە ، ئینجا بەسەرسوڕمانە پرسیاری ئەوە دەکات " توبڵێی مستەر جێنتیزۆن لە دادوەرەکە چاکتر ئاگاداربێت ؟"

Rambout.28.

[36] Toynbee.508 fn3.

دەکرێت کە نووسەری ئەم دێڕانە لە هاوڕێیەکی تورکەوە وەریگرتووە ، ئەوەی کە لە پلەو پایەیەکی وادا بووە راستییەکان بزانێت : کاتێك راپەڕینەکە گەیشتە خەرپوت ، تەواوی دەستەوتوێژەکانی خەرپوت لە سایەی ڕێبەرانی نوری ئەفەندی دا کە جێگری هەڵبژێردراوی ئەندام پەرلەمان بوو ، دژی راپەڕینەکە وەستان و راپەڕیوەکانیان پاش رۆژێك لە هاتنە ناوەیەمیان بۆ نێوشارەکە شاربەدەر کرد ، پیاوماقوڵانی شار و دانیشتووانەکەی کە دژی راپەڕینەکە وەستانەوە سەر بەهەردوو پارتە سیاسییە جیاوازەکە بوون . بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە خەڵکی ولایەتی خەرپوت (مەعمورەتولعەزیز) لە رووی ئایینییەوە دەمارگیرترین خەڵکانی ویلایەتەکانی ئەنەدۆڵی رۆژهەلات پێکدەهێنن ، هەڵوێستی ئەوانە بەڵگەیەکی ئاشکرا و لێبڕاو دەخاتە بەردەست کە سروشتی راپەڕینەکە لانی کەمی ئایینی نەبووە و پارتە ئۆپۆزسیۆنە تورکییەکەش ع پەیوەندییەکی ئەوتۆی بەراپەڕیوەکانەوە نەبووە ."[٣٧]

پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە تۆینبی دەرئەنجامی توێژینەوەکەی سەبارەت بەم بابەتە لە کارێکی دیکەدا وردتر و راشکاوانەتر ، بەڵام کورتر و پوختەتر پێشکەش کردووە .[٣٨]

## رۆڵی هەردوو مەسەلەی نەتەوایەتیی و ئاین لە راپەڕینەکەدا

وێڕای ئەو لێکدانەوە جۆراوجۆرانەی سەبارەت بە هۆکارەکانی راپەڕینە کوردییەکەی سالی ١٩٢٥ کراوە ، ئەو راپەڕینە دەرئەنجامی هۆکاری نەتەوەیی و ئایینی بوو . کوردان بە شێوەیەکی گشتیی لە رووی نەتەوایەتییەوە کەوتبوونە بەر پەلامار . بلاوبوونەوەی بنەماکانی بیری نەتەوایەتیی لە نێوکوردان و دەرکەوتنی نەوەیەکی نوێی نەتەوەیی خوێنگەرم ، وایلێکردن کە بەوپەڕی هەستیاریی و مەترسییەوە بڕواننە ئەو هەوڵانەی کە دەدرێن بۆئەوەی ناچاربن دەست لە نەتەوایەتیی خۆیان هەڵگرن . لەبەر ئەم هۆیە ، ئەوانە بەرەنگاریی چالاکییەکانی سەرکوتکردنی

---

[37] Ibid.,508-9.

[38] Toynbee and Kirkwood,264-73..

نەتەوایەتیی کورد بوونەوە و سەبارەت بە قەدەغەکردنی زمانی کوردیی تورە و بێزار بوون . ئەوانە دژی تورکاندن وەستانەوە ، چونکە بەو پێیە دەبوایە کوردان خۆ بە تورک بگۆڕن ، دەستبەرداریی کوردبوونی خۆیان بن و هەڵگری ناسنامەیەکی دی بن . بێهوودەیی هەوڵێکی بەو چەشنە لەو قۆناغە هەژانەی نەتەوایەتییدا زۆر ئاشکرایە و پێویست بە درێژدادریی ناکات .

وێڕای ئەوەی سیاسەتی رۆژئاواگەرایی و سێکیولاریزم (ئاییندجودایی) حکومەتی تورك لای روناکبیرانی کورد بەربەرەکانی نەدەکرا ، بەڵام بێگومان بەلای بەشێکی زۆری کۆمەڵانی خەڵکی کوردەوە بێزراو و نابەجێ بوو . بە تایبەت سەرخێڵەکان و رۆحانییەکانی کورد بە توندیی دژی ئەو سیاسەتانە وەستانەوە کە دژی باوەڕی چەسپاو و ماف و جیاوگە بۆماوەییەکانیان بەرێوە دەچوو . بەلای رۆحانییەکانی کوردەوە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و رەتکردنەوەی کارپێکردنی یاساکانی شەریعەت لەلایەن دەسەڵاتدارانی تورکیای نوێوە ، پچڕاندنی ئەو هاوبەستەگییە مێژوویی و قووڵەی برایەتیی ئیسلامیی دەگەیاند کە پێشتر لە نێوان ئەوان و تورکاندا هەبوو . ئەوان هەستیان بەوە کرد چیدیکە هیچ شتێکی هاوبەش بەو تورکانەوە نایانبەستێتەوە کە دژایەتیی ئایین و نەریتی باویان داهێناوە و بەو کارانەیان خۆیان لە باقی دیکەی باوەڕداران دابڕیوە . ئەوەی بۆ ئەوان ئاڵۆز و تەمومژاویی بوو ئەو گۆڕانکارییانە و حکومەتە ناثایینییە رەتکەرەوەکەی تورك بوو کە لێرە بەدواوە پێیان دەڵێت ئیدی دەبێت بەرەو ئەوە بڕۆن کە ببنە تورك نەك کورد ، ئەوەش وەك ئەوە وایە پێیان بڵێت دەست لە نەتەوایەتیی و بیروباوەڕەکەیان هەڵگرن و خۆهەڵواسن بە تاقمێکی دینسز و ستەمکاردا ، ئەو سەپاندنەی ئەوان ئامادە نەبوون ملکەچی بن .

بەمەش سۆزێکی ئیسلامیی بەهێز بووە پایەیەکی گرنگی نەتەوایەتیی کوردیی ، وێڕای ئەوەی زۆرینەی نەتەوەخوازەکان بایەخێکی ئەوتۆیان بە ئایین نەدەدا ، بەڵام گومانێکی کەم هەیە لەوەی ئەوانە هانی پێناسە ئایینییەکەی کوردیان دا و قۆزتیانەوە ، ئەوەی بەڵێنی یەکێتیی هاوڵاتیانی کوردی لە قەیرانە نیشتمانییە مەزنەکاندا دەدا . هەربۆیە ئەوانە هیچ کاتێکیان بەفیڕۆنەدا لە کۆکردنەوە و گرتنەخۆی ئەو هاوپەیمانە بەهێزە لەپێناو راژەکردنی کێشەکەیاندا ، کە بەتەواویی مایەی تێکەیەشتنە .ئەوەش یەکەمین جار نیە ئاین بقۆزرێتەوە و بەکاربهێنرێت . تورکان خۆیان زۆرجار ئایینیان وەك

ئامرازێك لە هەردوو بواری دابەشكردن و یەكگرتندا بەكارهێناوە ، بە چەشنێك كە خزمەتی ئامانج و مەبەستەكانیانی پێبكەن .

## تۆمەتی هاندانی بەریتانییەكان

مەسەلەیەكی دیكە كە جێگای مشتومڕە بریتیە لە تۆمەتباركردنی ڕاپەڕینە كوردییەكە بەوەی دەستی بەریتانییەكانی لەپشتە . ئەو تۆمەتەی كە زۆرجار دووبارەكراوەتەوە و لەزۆربەی كاتیشدا جێگای باوەڕ بووە . سەرەتا توركان ئەو دەنگۆیەیان بڵاوكردەوە ، پاشتر سەرچاوەكانی دیكە قۆزتیانەوە و برەویان پێدا .

بەگوێرەی گوتەی (ئارمسترۆنگ) ، مستەفاكەمال لە حاڵەتێكی تووڕەبوونیدا بەریتانییەكانی بەوە تۆمەتبار كردووە كە لە پشت ڕاپەڕینەكەوەن و چەك و پێویستییەكان دەدەنە ڕاپەڕیوەكان . ئەو بە بەردەوامیی لە ئەنجومەنی نیشتمانیی مەزندا هەمان ئەو تۆمەتانەی چەندبارە دەكردەوە :"ئەوەی مەسەلەكەی فرە نالەبار كردووە ئینگلتەرا كە لە پشت تەواویی ڕاپەڕینەكەوەن ، ...ئینگلیزەكان هەمیشە كوردیان بەكارهێناوە تا زیان بە توركیا بگەیەنێن ، لەجەنگی جیهانییدا ، پیاوەكانی خۆیان نارد ، وەك لۆرانس و نۆئێل بۆ ئەوەی كوردەكان هانبدەن لە پشتەوە گورز لە توركیا بوەشێنن ، لە پەیمانی سیڤەریشدا بەڵێنی ئەوەیان پێدان كە دەوڵەتێكی سەربەخۆیان بۆ دامەزرێنن . ئەمجارەش دووبارە پیاوەكانی بەریتانیا كەوتوونەتەوە كار بۆ چەكداركردن و وروژاندنی خێڵەكان .

ئینگلتەرا موسڵ و نەوتەكەی گەرەكە ، كوردەكانیش كلیلی موسڵ و نەوتی عێراقن . هەربۆیە ئەو مشتە لە پشتەوە دەقۆزێتەوە تا توركیا ناچار بكەن دەست لە موسڵ بەربدات."[39]

سەرچاوە فەرمییەكانی شورەویی بۆ جارێك ئاماژەیان بەم تێزە داوە .[40] چەند

---

[39] Armstrong.225.

[40] دەگوترێت ڕاپەڕینەكانی ١٩٢٥، ١٩٣٠ ، ١٩٣٧ بە پیلانی ئیمپریالیستەكان بە مەبەستی دژایەتیی بەرژەوەندییەكانی تورك و شورەویی هەڵگیرساوە هەرچەندە ئەو تۆمەتانە لە چاپەكانی دواتری ئینسایكلۆپیدیای یەكێتی شورەوییدا دووپات نەكرانەوە . ئەوەش بێگومان گۆڕینی هەڵوێستی شورەویی لەهەمبەر هەریەك لە تورك و كورد دەگەیاند . وەك لە بەشی حەوتەم باسی لێكراوە .

نووسـەرێکی جۆراوجـۆریش کاتێـک لەسـەر تورکیـای هاوچـەرخ نووسـیویانە ، لـە کارەکانیانـدا ئاماژەیـان بـۆ ئـەم بۆچـوونە داوە .[٤١] کـوردە نەتەوەییـەکان و شـارەزایانی بـەریتانیی وەك بـاوە ئـەم جـۆرە دەنگۆیانـەیان رەتکردۆتـەوە .[٤٢] پێویـستە ئامـاژە بـەوە بکرێـت کـە تورکـان نـەیانتوانی هـیچ بەڵگەیـەکی بـاوەڕپێکراو بـۆ سـەلماندنی قسەلۆکەکانیان پێشکەش بکەن . راستیی بابەتەکە هەر شتێك بێت ، گومانی لەوەدا نیە کە بەریتانییەکان سوودیان لەو رووداوە نەخوازراوە وەرگرت کە لە کوردستانی تورکیا هاتە پێش ، بێگومان شۆڕشەکەی شێخ سەعید و سەرکوتکردنەکەی ، کاریگەریی خۆی هەبوو تا کێشەی موسڵ بە قازانجی بەریتانیا بڕیاری لێبدرێت .

## کۆمەڵە کوردییەکە : خۆیبوون

سەرکوتکردنی شۆڕشە کوردییەکەی ١٩٢٥ ، کۆتایی بە نەمامەتیی کوردەکان و هەروەها دڵەراوکێی تورکەکان نەهێنا ، دوورخستنەوەی کورد لە ناوچەکانی خۆیان ، هاوکـات بـوو لەگـەڵ چـەندین هـەنگاوی سـەرکوتکەرانە و وێرانکـەردا . لـە کاتێکـدا پێکدادان لە ناوچە دووردەستەکانی هەرێمەکانی رۆژهەڵات بە بەردەوامیی لێرە و لەوێ روویـان دەدا ، ژمـارە و چـەندبارەبوونەوەی ئـەم پێکدادانـە ، بـە تـەواویی ئـەوەیان دەردەخست کە کوردان خۆیان بۆ قۆناغێکی دیکەی بەهێزبوونەوە و رووبەڕوو بوونەوە ئامادە دەکەن .[٤٣]

لەبـەهاری ١٩٢٧دا، کۆنگرەیـەکی کـوردیی نەتـەوەیی لـە یـەکێك لـە چیاکانی کوردسـتان پێکهـات . کـۆنگرە لەلایـەن کـوردە نەتەوەییـەکانی سـوریاوە کرایـەوە ، بەئامادەیی چەندین نوێنەرانی خێڵ و رێکخراوە مەدەنییەکان . هـەروەها نوێنـەرانی ئـەو

---

[41] Cf. for example Karl Kruger, Kamalist Turkey and the Middle East.

[42] Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,11ff.: Toynbee and Kirkwood,275-276.

[43] بۆ زیاتر سەبارەت بە تێکهەڵچوون و پێکدادانەکانی ئاگریداغ بڕوانە:

S.Bedir Khan, 50-51;Elphinston,"The Kurdish Question,"96 .

چەکدارە راپەڕیوانەش ئامادەبوون کە پەنایان بۆ چیا سەختە دووردەستەکانی کوردستان بردبوو .[44] نوێنەران لەسەر چەندین بڕیار و ئامانجی گشتگیر ڕێکەوتن . ئەوان بڕیاریاندا تەواوی ڕێکخراوە نەتەوەییەکان هەڵبوەشێننەوە و تێکڕایان لە ڕێکخراوێکیدا بەناوی (خۆیبوون) یەکبگرن ، کە لە تێکۆشاندا بەردەوام بێت تا " دوا سەربازی تورك خاکی کوردستان جێدەهێڵن" یەك سەرکردایەتیی پێکبهێنن ، پەناگە و شوێنی گونجاو بۆ شاردنەوەی ئازووخە و تەقەمەنیی دابینبکەن ، کۆتایی بە ناکۆکییەکانی نێوان کورد و ئەرمەن بهێنرێت . ناوچەی کوردنشینی چیای ئاگرداغیش وەك پایتەختیی کاتی کوردستان رابگەیەنرێت . هەروەها بڕیاری ئەوە درا هەوڵی تێگەیەشتن لەگەڵ حکومەتی ئێران و " نەتەوەی فارسی برا بدرێت و جەخت لە بەستنی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ دەوڵەتانی ماندێتیی لە عێراق و سوریا بکرێت .[45]

لە ئۆکتۆبەری ١٩٢٧دا ، لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە بەیروتی لوبنان ئەنجامدرا ، دامەزراندنی خۆیبوون بە فەرمیی راگەیەندرا .[46] میر جەلادەت بەدرخان بە سەرۆکی یەکەمی ڕێکخراوەکە هەڵبژێردرا .[47] بە گوێرەی کۆنگرە کوردییە نەتەوەییەکە ، ڕێکخراوە نوێیەکە شوێنی تەواوی ئەو ڕێکخراوە کوردییە نەتەوەییانەی پێشووی گرتەوە کە ئارەزوومەندانە خۆیان هەڵوەشاندۆتەوە و یەکیانگرتووە تا ئەو ڕێکخراوە نوێیە کە (خۆیبوون)ە پێکبهێنن .[48] شۆڕشی ئاگرداغ ئاکامێکی راستەخۆی

---

[44] S.Bedir Khan ,54; Chirguh, La question kurde, 34;Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,12.

[45] Chirguh, La question kurde, 34-35; S.Bedir Khan ,54-55; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,2-13; Elphinston,The Kurdish Question,"96.

[46] Elphinston,The Kurdish Question,"96

بەگوێرەی بەدرخان ، کۆبوونەوەکە لە دەرەوەی کوردستان بووە و راگەیاندنی خۆیبوونیش لە ٢٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٧دا جاڕدراوە . بەگوێرەی رامبۆت لە ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٧ راگەیەندراوە و شوێنی کۆبوونەوەکەش نەزانراوە

S.Bedir Khan ,54;Rambout,29.

[47] Elphinston, The Kurdish Question,"96.

[48] ئەم دەستە بەراییانە وەك : کوردستان تەعالی ، کورد تشکیلات اجتماعی جمعیت ، هەروەها کورد ملت فیرقەسی.

S.Bedir Khan ,35;Rambout,29.

چالاکییەکانی خۆیبوون بوو .

## شۆڕشی ئاگریداغ ساڵی ١٩٣٠

خۆیبوون ، ئیحسان نوری بەگی ، کە دواتر بە ئیحسان نوری پاشا ناسرا[49] و سەرچڵێکی پێشووی سوپای تورك و سەرکردەی لەشکرێکی راپەڕیوەکان بوو لە شۆڕشەکەی ١٩٢٥دا ، بەسەرکردەی گشتیی هێزە کوردییەکان لە ئاگریداغ دەستنیشان کرد ، هەروەها کارگێڕیی مەدەنییشی بە ئیبراهیم پاشا حسکی تیلۆ سپارد .لە ١٩٢٨دا ، دەوڵەتۆکەیەکی کوردیی لە ئاگریداغ دامەزرێنرا . سوپایەکی چکۆلە کە لە چەند هەزار جەنگاوەرێکی کوردیی باش راهێنرا و پەرداخت کۆکرایەوە ، جێگەی شیاو بۆ کۆکردنەوەی پێویستییەکان و ئازووخە ئامادەکرا ، ئاڵای کورد هەڵکرا .[50] ئەوەش بە ئاشکرا ئاوکی ئەو دەوڵەتە کوردییە بوو کە کار بۆ دامەزراندنی دەکرا . دەسەڵاتی تورکیی نەیدەتوانی لەو زیاتر بێبایەخانە بڕوانێتە بەرەو پێشەوەچوونی ئەو رووداوە شوومانە . هەربۆیە بە ناچاریی و بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بڕیاریدا هەڵوێستێکی رازیکەرانە پێشانبدات و پەنا بۆ گێڕانەوەی گفتوگۆ و دانوساندن بەرێت تا لەوەی پەنا بۆ بەکارهێنانی هێز بەرێت .

## هەوڵەکانی تورك بۆ رازیکردن

پرۆسەی دوورخستنەوە وەستێنرا ، هەروەها یاسایەکی نوێ بڵاوکرایەوە کە بەپێی ئەو یاسایە هەموو ئەو کوردانەی لەماوەی سێ مانگدا لە بەرواری دەرچوونی بڕیارەکەوە بە فەرمیی ملکەچیی خۆیان پێشان بدەن ، دەبەخشرێن . بەهەمان شێوە ، هەموو ئەوانەی دوور خراونەتەوە رێگایان پێدەدرێت بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان

---

[49] ئیحسان نوری خەڵکی بدلیسە ، نازناوی پاشا ، بەگوێرەی شێرگۆ ، لەلایەن ئێکرای نەتەوەی کوردەوە بەسەریدا دابڕاوە Chirguh, La question kurde, 35

[50] Ibid.:Rambour,29; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds.13.

. هەروەها هەموو ئەو کوردە نەتەوەخوازانەی لە زیندانەکانی تورکدان ، ئازاد دەکرێن . دەسەڵاتدارانی تورک هەوڵی زۆریاندا تا هانی کورد بدەن لە چوارچێوەی ئەو بڕیارانەدا سەر بۆ دەوڵەت دانەوێنن . مۆڵەت بە والی بایەزید درا کە دەرگای دانوساندن بە رووی شۆڕشگێڕەکانی ئاگریداغ دا بکاتەوە . هەروەها کارمەندانی دیکەی تورک هاندران تا بە مەبەستی چارسەرکردنی ئاشتییانەی کێشەکان . پەیوەندیی بە سەرکردە کوردەکانەوە بکەن ، هەرچەندە تێکڕای ئەو هەوڵانە بێهوودە بوون . کوردە نەتەوەییەکان ، تورکەکانیان بە نیازخراپیی تۆمەتبار دەکرد ، جەختیان لەوە دەکردەوە کە حکومەتی تورکیی هیچ مەبەستێکی نیە کە نەرمیی لە هەمبەر خواست و ئامانجەکانی کوردە نەتەوەخوازەکان بنوێنێت و تەنیا مەبەستێتی کات بەدەستبێنێت و بە گرتنەبەری چەندین ڕێگای فێڵ و هەڵخەڵەتاندن وایان لێبکات چەکەکانیان دابنێن .[51]

پاش ئەوەی حکومەتی تورک لە بەدەستهێنانی ئاکامێکی ئەوتۆ شکستیخوارد ، بڕیاریدا راستەوخۆ لەگەڵ ئیحسان نوری پاشادا بکەوێتە گفتوگۆ . لە سۆنگەی ئەمەوە ، سەرکردایەتیی کورد ئاگادارکرایەوە کە شاندێکی فەرمیی لە شەیخلی کۆپرو ، کە پۆستێکی سنوورییە و سێ مایل لە بایەزیدەوە دوورە ، چاوەڕێی ئیحسان نوری دەکات .[52] ئیحسان نوری بانگهێشتەکەی پەسەند کرد و بە هاوەڵی شەست جەنگاوەری چیایی بۆ دیدەنی تورکەکان سەردانی شێخلی کۆپروی کرد . لە چاوپێکەوتنەکەدا ، کە دەگوترێت لە دەوروبەری ناوەڕاستی سێپتەمبەری ١٩٢٨ دا ئەنجامدراوە ، تورکان ئەوەیان پێشکەشکرد کە لێخۆشبوونێکی گشتیی دەردەکەن ، ئیحسان نوری و شوێنکەوتەکانی بگرێتەوە ، هەروەها ژمارەیەك سوود و بەرژەوەندیی تایبەت و شەخسیی ، گەر ئیحسان نوری و شوێنکەوتەکانی چەکەکانیان دانێن و سەنگەرە سەختەکانیان لە چیا جێبهێڵن .[53] نووسەرانی کورد باس لەوە دەکەن گوایە ئیحسان

---

[51] Chirguh, La question kurde, 31; Rambour,30; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds.13.

[52] نوێنەرەکان لەمانەی خوارەوە پێکدەهاتن : دوو ئەندام پەرلەمانی تورک ، والی قەرەکلیس ، فەرماندەی تیپی بیست‌ونۆی سوپای تورک ، فەرماندەی جەندەرمەی هەرێمەکە و هەروەها قایمقامی دیادین و بایەزید .

Chirguh, La question kurde, 36.

[53] لەنێو ئەو بەڵێن و پاداشتانەی بە ئیحسان نوری درابوون ، پلەی ژێنەراڵێتی سوپایە و دامەزراندنێتی بە

نوری ئەو داوایانەی رەتکردۆتەوە ، چونکە شاندە تورکەکە بە تەواوی خواستە نەتەوەییەکانی کوردیان پشتگوێ خستبوو .[54]

## سەرکوتکردنی راپەڕینەکە

دوای بێهیوا بوون بە گەیشتنە ڕێکەوتن لەگەڵ کوردە چەکدارە تەیارەکانی ئاگریداغ دا ، ئەوانەی هەڕەشەیەکی مەزن و پەرەگرتوویان پێکدەهێنا ، تورکان بڕیاریاندا پەنا بۆ چەك بەرنەوە . لە مایۆی ١٩٣٠ دا ، دوو لەشکری سوپای تورك ، لەشکری چوارەم و شەشەم ، بە سەرکردایەتیی ساڵح پاشا ، لە ناوچەکانی دەوروبەری ئاگریداغ گردببوونەوە .[55] پەلاماری تورك لە ١١ی ژوونی ١٩٣٠ دا و بەمەبەستی تێکشکاندنی ئەو هێزە کوردییانەی لە ئاگریداغ دا کۆببوونەوە ، دەستپێکرد .لە ١٥ی ژووندا ، هێزەکانی کوردە نەتەوەییەکان دژە هێرشیان لە ناوچەکانی تێندارەك ، ئیگدیر ، ئێردیجش ، سیپان داغ ، کاگسیمات ، شاتاك ، وان و بدلیس دەستپێکرد . تورکان کە خۆیان لە هەلومەرجێکی نالەباردا لە هێندێك شوێندا بەرامبەر پەلاماری کوردەکاندا بینییەوە ، ناچاربوون کە دەست لە پەلامارەکەیان بۆ سەر ئاگریداغ هەڵگرن . تاکو ناوەڕاستی ژوونیە ، پێکدادانی توند لە چەند شوێنی جیاوازدا بەردەوام بوو . کوردەکان باسیان لەوە دەکرد گوایە گورزی قورسیان لە هێزەکانی تورك وەشاندووە .[56] وێڕای ئەو

---

وابەستەی سەربازیی باڵیۆزخانەی تورکیی لە هەر دەوڵەتێکی ئەورووپیی خۆی پێی خۆش بێت .

[54] شێرکۆ بە درێژیی باسی رەتکردنەوەی پێشنیازەکەی تورك دەکات ، وێڕای وەرگرتنی نامەیەك کە لەلایەن ئیحسان نوریەوە بۆ خۆیبوون نووسراوە . Ibid.,pp36-38.

[55] Elphinston, The Kurdish Question,"96; Chirguh, La question kurde, 38;Rambout,30; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,13.

[56] ئەو زیانانە بریتیبوون لە ١٧٠٠دیل ، ٦٠ رەشاش ، ٢٤تۆپ ، کەلوپەلی دیکەی سەربازیی دەستی بەسەردا گیراوە خستنەخوارەوەی ١٢فڕۆکە ، کوشتنی ٢٨٠٠کەس ، پتر لە ٤٠٠٠برینداز . زیانی کوردیش ٩٠٠ کوژراو و ٢٤٠٠ بریندار .. ئێلفینیستۆن دەڵێت کە کوردان لە سایەی ئیحسان نوری باش جەنگاون و زیانی ٢٠٠٠ قوربانیان لە تورکان داوە

Chirguh, La question kurde,39;Rambout,30; Elphinston, The Kurdish Question,"96.

دەنگۆیانە ، کوردان وردە وردە ململانێیەکەیان دۆڕاند .

لە ئووت و سێپتەمبەری ١٩٣٠ دا ، کوردەکان بە مەبەستی سەرلێشێواندن ، چەند پەلامارێکی سەختیان دژی هێزەکانی تورک لەچەندین قوڵی ناوچەی سەرەکیی شەڕگەکەدا ، هەر لەسەرەوە هەتا خوارەوە ، ئەنجامدا . ڕاپۆرتەکان باس لە هەڵگیرساندنی ئاگری ڕاپەڕینیان لە ناوچەکانی جۆلەمێرگ ، سیرت ، ماردین ، سیڤرێك و ئۆرفە دەکرد . یەك لە یەکلاکەرەوەترین ئەو پەلامارانە ، ئەو وروژمە بەهێزە بوو کە لە لایەن هێزێکی کوردیی بەرچاوەوە لە ٢ی سێپتەمبەری ١٩٣٠ دا ئەنجامدرا .[57]

دەرکەوت ئەم پەلامارە دوا هەوڵی گشتیی بێت لەلایەن بەرەی کوردە ڕاپەڕیوەکانەوە ، تین و تاوی ڕاپەڕینەکە تا دەهات بەرەو کزیی دەچوو .قورسایی و بالادەستییشی لە ڕووی ژمارە و دابینکردنی پێویستییەکانییەوە لاواز بوو . بە دەرکەوتنی ئاسۆی زاڵبوونی تورکان ، هێزەکانیان هیچ سستییەکیان لە پێشڕەویی نەنواند . لە هەموو ناوچەکانی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات گەمارۆی کوردە ڕاپەڕیوەکانیان دا و تێکیانشکاندن . ئەوانەی لەمردن ڕزگاریان بوو ناچار بوون هەڵبێن و بڵاوەی لێبکەن ، ئیحسان نوریش پەنای بۆ ئێران برد .[58]

هاوکات لەگەڵ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە هەڵمەتێکی تەمێکارانەی بەرفراوان لەلایەن تورکانەوە دەستپێکرد ، کە وەك دەگوترێت دوورخستنەوە ، دەستبەسەرکردن و زینداننییکردنی بەکۆمەڵ ، هەروەها تیرەبارانکردنی دەستبەجێی گرتبووەوە .[59] گوندە کوردییەکانی ناوچەکە بۆمبارانکران و سووتێنران و سەرجەم خەڵکەکە زیانی مەزنیان بەرکەوت .

---

[57] Chirguh, La question kurde, 31;

[58] Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds,13.

[59] سەبارەت بەو دڕندایەتییەی لەلایەن کوردانەوە نوێندراوە بڕوانە : Chirguh, La question kurde,39-40.

پێویستە ئاماژەش بەوە بکرێت کە تورکیش لە لای خۆیانەوە کوردیان بە ئەنجامدانی دڕندایەتیی تاوانباردەکرد .بە پێی (سێر تێلفۆرد واوگ:Waugh,273.) " چەکدارە ڕاپەڕیوە کوردەکان لە دیاربەکر شتێکیان بەناوی (یاسای کوێرانە) داهێنابوو کە جۆرێك لە دادگایی سەرپێیی و هەر تورکێکیان بکەوتایەتە بەردەست دەیان شێواند و سزایەکی توندیان دەدان."

خۆیبوون و لقەکانی لەوەدا فرە چالاك بوون کە کێشەی کوردانی تورکیا بخەنە بەردەم رای گشتیی جیهان ، بۆ ئەو مەبەستەش نوێنەریان نارده جنێف تا کۆمەڵەی گەلان لە هەواڵی ئەهامەتیی و باروئۆخی براکانیان لە کوردستان ئاگادار بکەنەوە . ئینتەرناسیونالیستی دووەم (I.S.O) کە ئەو کاتە لە زیوریخی سویسرا کۆبوونەوەکانی خۆی ئەنجام ئەدا بریارێکی دەرکرد تێید نارەزایی دژی سەرکوتکردنی کوردانی تورکیا و پێشێلکردنی پەیماننامەی لۆزان دەربریبوو . ئەمەی خوارەوە وەرگێردراوی دەقی بریارەکەیە :

" دەستەی کارگێریی (I.S.O) سەرنجی جیهان رادەکێشێت بۆ ئەو کۆمەڵکوژییەی کە بەهۆیەوە حکومەتی تورکیی دەیەوێت نەك بە تەنیا خەباتی کورد لە پێناو ئازادیی خۆیدا تێکبشکێنێت ، بەڵکو ئەو خەڵکە ئاشتییخواز و بێدیفاعەی کوردیش لەناوبەرێت کە لە کارە چەکدارییەکاندا بەشدارییان نەکردووە ، هەروەها خوازیارن لەو رێگایەوە هەمان چارەنووسی ئەرمەنەکان بەسەر گەلی کورددا بێنن بۆ ئەوەی رای گشتیی وڵاتانی سەرمایەداریی نارەزایەتیی دژی ئەم دڕندایەتییە خۆێناوییە پێشان بدەن .

بە هەمان شێوە ، دەستەی کارگێریی سەرنجرادەکێشێت بۆ ئەو هەرەشە مەترسییدارەی لەسەر ئاشتیی هەیە لە ئاکامی بەزاندنی ناوچەکانی دەوڵەتی ئێرانەوە لە لایەن سوپای تورکیاوە . ئەمەش بێتواناییەکی ئاشکرای رێکخراوی نێودەوڵەتیی لە جیهان دەگەیەنێت کە چۆن هێزە سەربازییەکان دەتوانن بڕژێنە خاکی وڵاتێکی دراوسێی لاوازەوە بێئەوەی رێکخراوێکی مرۆڤدۆست بتوانێت بە ئەرکی پێویستی پارێزگاریی خۆی هەڵبستێت .

لە سەرنجراکێشان بۆ ئەو مەترسییانەی کە دەگونجێت لە ئاکامی ئەو رووداوانە لە کوردستان بێتە کایەوە ، دەستەی کارگێریی داوا لە رای گشتیی جیهان دەکات لەو کاتەدا ئەو توندوتیژییە شەرمەزار دەکەن کە لەلایەن ئۆلیگارکیی تورکەوە ئەنجامدەدرێت ، لەهەمان کاتیشدا دژی ئەو ئەهاتنە دەنگ و خۆکەرکردنەی حکومەتە سەرمایەدارەکان بوەستنەوە لە هەمبەر ئەو تاوانە خوێناوییانەی کە قوربانییەکەی گەلی کوردە ."[601]

[601] Chirguh, La question kurde,40;Rambout,31; Elphinston Kurdish League .

بڕیارەکە ئاماژەی بە بڕگەکانی ۳۷ ، ۳۸ ، ۳۹ و ٤٠ ی پەیماننامەی لۆزان کرد کە بە پێی ئەو بڕگانە ، تورکیا بڕیاریداوە کەمایەتییەکان بپارێزێت .[٦١]

## سەرهەڵدانی ناکۆکییەکانی تورکیی-ئێرانیی لەسەروبەندی شۆڕشەکەی ئاگریداغ دا

شۆڕشی ئاگریداغ چەند ناکۆکییەکی قووڵی لەنێوان تورکیا و ئێراندا لێکەوتەوە . هەریەک لە هەوڵی تۆمەتبارکردنی ئەوی دیکە و رەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەدا بوون کە ئاراستەی یەکتریان دەکرد . تورکان ، ئێرانیان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە چالاکانە پشتگیریی راپەڕیوەکان دەکات و رێگایان پێدەدات خاکی ئێران وەک بنکەیەک بۆ هێرشکردنە سەر تورکیا بەکاربهێنن . ئێرانییەکانیش ئەو تۆمەتەیان رەتکردەوە و تورکانیان لە لایەن خۆیانەوە بەوە تۆمەتبار دەکرد کە سنوورەکانی خاکی ئێرانیان بەزاندووە . لە قۆناغێکدا هەلومەرجەکە ئەوەندە مەترسیدار بوو ، زۆری نەمابوو ببێتە ململانێیەکی چەکداریی ، بەڵام خواستی عەقڵ باڵی بەسەر کێشەکەدا کێشا . گرفتەکە لەو راستییەوە سەرچاوەی دەگرت ، ئەو بەشەی چیای ئاگریداغ کە بارەگای سەرەکی شۆڕشگێڕەکانی لێبوو ، لە بنەڕەتدا دەکەوتە سنووری ئێرانەوە . هەر بۆیە زۆر ئاسان بوو ، شۆڕشگێڕەکان بخزێنە نێو چیا سەختە نەپارێزراوەکانی سنووری ئێرانەوە و وەک پێدەچێت ئازوخە و تەقەمەنیی و پێویستییەکانیان لەوێوە چنگ بخەن و سەرلەنوێ خۆیان رێکبخەنەوە . گرفتەکە بە سات و سەودا و گۆڕینەوەی چەند ناوچەیەکی سنووری وەک ئاگریداغ و قتور چارەسەرکرا .

باسیش لەوە دەکرێت کە یەکێتی شورەویی هەوڵی خۆی وەک ناوبژیوانێک پێشکەش کردووە ، بێگومان ئەوەش لە خواستی هێنانەدی چەسپاندنی ئاشتیی و ئارامیی ، لەو ناوچانەی نزیک سنوورەکانی باشوورین ، هەڵدەقولا .[٦٢] شورەویی بە

---

Memorandum on the Situation of the Kurds,13.

[61] Chirguh, La question kurde,40-42.

[62] Kruger,179.

دڵەڕاوکێیەکی قووڵەوە دەیڕوانیە ئەگەری هەڵایساندنی جەنگ و ململانێی نێوان دوو دەوڵەتی هاوسێی باشووری خۆی ، لەناوچەیەکدا کە درێژ دەبووەوە بۆ هەرێمەکانی قەفقاسی شورەویی . شایەنی باسە رووسیا لە پێشکەشکردنی ئەم هەوڵەیدا گەڕایەوە بۆ شێوازە کۆنەکە ، ئەوەی زیاتر لەماوەی حەفتاساڵ ، لە ١٨٤٣-١٩١٤ ، بەریتانییەکان و رووسیای سزاریی ، وێڕای تێکڕای لەمپەر و گرفتەکان ، وەك هێزێکی ناوبژیوان لە پێناو یەکالاکردنەوەی کێشەی ئاڵۆزیی سنووری نێوان تورکیا و ئێراندا گرتبوویانە بەر [٦٣] . بەریتانیای مەزن چیدی لەم پێناوەدا لەگەڵ رووسیا هەماهەنگیی نەکرد ، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی پەیوەندییەکانی بەریتانیا-رووسیا گۆڕابوو ، بەڵکو لەبەر ئەوەش تورکیا کە یەکێك بوو لە لایەنی ناکۆکییەکە ، بەگشتیی و راشکاوانە رۆڵی بەریتانیای وەك ناوبژیوانێك رەتدەکردەوە . ناکۆکییەك کە لە بنەڕەتدا لە ئاکامی پەرەسەندنی شۆڕشەکەی ئاگریداغ دا تەقییەوە ، تێیدا تورکان جارێکی دیکە بەریتانییەکانیان تاوانبارکرد کە هاندەری هەڵگیرساندنی ئەو راپەڕینە کوردییە نوێیەن . [٦٤]

## شوێنی کورد لە تورکیا پاش شۆڕشەکە

لەوانەیە دژترین ئاکامی شۆڕشەکەی ئاگریداغ ، ئەوەندەی پەیوەندیی بە کوردەکانی تورکیاوەیە ، بریتیبێت لە دەرکردنی یاسایەکی سەرکوتکەرانە لە لایەن حکومەتی تورکییەوە کە هەرێمەکانی رۆژهەڵات و دانیشتووانە کوردەکەی لە سایەی هەلومەرجێکی لاوازیی و چاودێرییەکی تونددا بهێڵێتەوە . لە ٥ی مایۆی ساڵی ١٩٣٥دا یاسایەك بڵاوکرایەوە کە تورکیای کرد بە چەند پشتێنە و هەرێمەوە کە سێیانیان لە کوردستاندا بوو . یەك لەو ناوچانەی کە بە تەواویی چۆڵکرا و بە هۆکاری تەندروستیی ، ماددیی ، کەلتووریی ، رامیاریی و ستراتیژیی ، هەروەها لەپێناو بەرژەوەندیی ئاسایشی گشتیی ، وەك هەرێمێکی قەدەغەکراو راگەیەندرا . [٦٥] هەروەها خێڵەکانیش وەك

---

[٦٣] لەمەڕکێشەی سنووری تورکیی-ئێرانیی بڕوانە: Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,125-139

[64] Kruger,116,179ff.

[65] Rambout,32;Kurdish League ,Memorandum on the Situation of the Kurds,14.

کایەیەکی نایاسایی ڕاگەیەندران ، تەنانەت ئەوانەشی کە بوونیان پشتی بە بڕیارێك یاخود ڕێپێدراوییەکی یاسایی دەبەست و تا ئەو کاتە خاوەنی تێکڕای مافەکانیان بوون ، هەموویان هەڵوەشێندرانەوە .دەسەڵاتی سەرخێڵەکان و شێخە ئایینییەکان ، هەردووکیان لەگەڵ تەواوی ئەو دەزگا و ئۆرگانانەی پەیوەندییان پێیانەوە هەیە ، هەڵوەشێنران . بێئەوەی هیچ داب و نووسراوێك بخوات کە بوونیانی لەسەر بنیاتنرابوو . تەواویی موڵك و دارایی ئەو دەزگایانە گەڕێندرایەوە بۆ حکومەت و بڕیاری دابەشکردنی نوێی موڵکەکان و قەواڵەکانیان لە لایەن حکومەتەوە دەرچوو . هەروەها بە پێی ئەم یاسایە هەرچی سەرخێڵ ، شێخ و پیاوماقوڵانی دانیشتووی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات هەیە دەبوو بۆ چەند هەرێمێکی تایبەت و دیاریکراو دووربخرێنەوە . هەموو ئەوانەی زمانی دایکیان تورکیی نەبوو ، تووشی ڕێگریی و لەمپەری گەورە دەبوونەوە [66] .

ئەمەش ، وێڕای ئەوەی ناکامی پێشتری هەلومەرجە ئاڵۆزەکەی شۆڕشەکەی ١٩٣٠ بوو ، زۆری نەبرد ، دانایی ئەم کار و هەنگاوانە بەرەو ئەوە ڕۆیشت کە لە تاقیکردنەوەیەکی سەخت و توندا جێبەجێ بکرێت .

## ڕاپەڕینی دەرسیم لە ساڵی ١٩٣٧دا

لە بەهاری ١٩٣٧دا ، ڕاپەڕینێکی بەرچاو لە چیاکانی دەرسیم قەوما . دانیشتووانی ئەم ناوچە سەخت و دابڕاوە ، کە بە شێوەزاری زازایی دەدوێن و بە توندیی پەیڕەویی لە مەزهەبی شیعە دەکەن ، پێشتر لە هیچ ڕاپەڕینێکی کوردییدا بەشدار نەبوون . ئەوان وەك شیعەیەك بایەخێکیان بە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت نەدەدا و سۆزیشیان بۆ ئەو دەنگۆیانە نەدەجوڵا کە شێخە کوردەکان بڵاویان دەکردەوە . تێکهەڵکێشکردنی یاسا تورکییە نائایینییەکان ، بە دەسەڵاتی کارگێڕیی و سەربازیی ، هەموو ئەو بەربەستە زمانیی ، هەرێمیی و جوگرافییانە تێکڕا ڕێگریبوون لەبەردەم بڵاوبوونەوەی نەتەوایەتیی کوردیی لە نێو کوردەکانی دەرسیمدا [67] .

---

[66] Rambout,32-33;Kurdish League ,Memorandum on the Situation of the Kurds,13-15.

[67] Elphinston, Kurds and The Kurdish Question."44.

## هۆکارەکانی راپەڕینەکە

لەیەنایەری ۱۹۳۷دا ، حکومەتی تورکیی بڵاویکردەوە کە یاسایەك ئامادە دەکات بۆ سەپاندنی تواندنەوەی رەگەزەکان ، ئەمەش کوردەکانی دەرسیمی تورەکرد و داوایان کرد کۆبوونەوەیەکی گشتیی بە مەبەستی گفتوگۆکردن سەبارەت بەو یاسایە سازبدەن . لەدوایدا بڕیاریاندا نێردراوێك بە نامەیەکەوە بنێرنە لای فەرمانداری سەربازیی تورك کە تێیدا دژایەتیی خۆیان سەبارەت بەو یاسایە رابگەیەنن . بەپێی سەرچاوە کوردییەکان ، فەرماندارە تورکەکە ئەو نێردراوانەی دەست بەسەر کرد کە نامەکەیان بۆ بردبوو و پاش چەند رۆژێکیش هەموویانی لە (ئیلازیغ) تیرباران کرد ، لە تۆڵەی ئەوەشدا ، کوردەکان پەلاماری کاروانێکی ئۆتۆمبێلی پۆلیسیان داو ژمارەیەك پۆلیسیان فڕاند ، ئەو کارەی کە بەسەرەتای راپەڕینەکەی دەرسیم دادەنرێت .[٦٨]

ئەم راپەڕینە ، کە لەلایەن رێبەرێکی ئایینیی هەشتاودووساڵە کە سەید رەزای دەرسیمە ، سەرکردایەتیی کرا . ماوەی دوو ساڵی خایاند و زیانێکی مەزنی گەیاند بە حکومەت و راپەڕیوەکانیش .[٦٩] (ئەلفینستۆن) سەبارەت بە هۆکارەکانی راپەڕینەکە دەڵێت :" وەك پێدەچوو کە سیاسەتی حکومەتی تورکیی ، بە پلەی یەکەم ، دژایەتیی رێبەرایەتیی کوردیی فیوداڵی پەتریارکیی بکات . لە پلەی دووەمیشدا ، بووە هۆی ناڕزایەتیی رێبەرە ئایینییەکان . لە کۆتاییشدا بە گەلی کورد خۆی ، کە لەترسی ئەگەری لەدەستدانی ناسنامەی رەگەزیی جیاوازیان ، وروژان ."[٧٠] بە بۆچوونی ئەو ، وێڕای ئەوەی ئەم هۆیە وادەردەکەوێت کە دیارترین و ئاشکراترینیانە ، بەڵام گێڕانەوەی هۆکارەکانی راپەڕینەکە تەنیا بۆ ئەو هۆیانە هەڵەیە ، چونکە لە پشتی ئەو جۆرە راپەڕینانەوە گیانی نەتەوایەتیی خۆی حەشارداوە .[٧١]

---

[68] Elphinston. The Kurdish Question."96-97.

[69] Nuri Dersimi . Kurdistan Tahrihinde Dersim(Aleppo:Ani Matbaasi ,1952).173-88.

[70] Elphinston, Kurds and The Kurdish Question."44.

[71] Ibid.

## سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکە و قۆناغی پاشتر

زۆر کەم سەبارەت بە بەڕێوەبردنی لەشکرکێشی سەربازیی دژی کوردەکانی دەرسیم زانراوە . سانسۆری سەربازیی لە قۆناغی ڕاپەڕینەکە و سەرکوتکردنیدا فرە توند بوو ، هەروەها بۆ چەند ساڵ پاشتریش ، تەواوی دەرسیم(تونجلی) ناوچەیەکی گەمارۆدراوبوو ، گوزەرکردن و مانەوە تێیدا قەدەغە بوو ، دزەکردنی هەواڵی ئەو ناوچەیە بۆ دەرەوە دەستی بەسەردا گیرابوو . بە پێی ئەو زانیارییانەی لەبەر دەستدان پێش دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنەکە هێزێکی تورکی مەزن لە مانگی مایۆدا لە نزیک دەرسیم مۆڵی خواردووە .[72] خاڵە ستراتیژییەکان دەستیان بەسەردا گیراوە ، هەروەها چەکی نوێ وەکو فڕۆکەی جەنگیی هێنرا ، تا لە لێدانی حەشارگە سەختەکانی کورددا بەشداربێت . بەرهەڵستکارەکان بێهیوا شەڕیان کرد ، بەڵام ناچارکران پاش وێرانکردنی گوندەکانیان ، خۆیان و خێزان و مێگەلەکانیان ڕووەو بەرزاییە سەختەکان پاشاکشە بکەن .[73] وێڕای ئەوەی حکومەت وای بڵاوکردەوە گوایە سوپا هەلومەرجەکەی کۆنترۆڵکردووە .[74] بە پێی ئەلفینستۆن ، کوردان بە شێوەی پارتیزانیی دەجەنگان و بۆ ماوەی چەند مانگێك ململانێی سوپای تورکیان دەکرد ، هەربۆیە هەڵمەتە سەربازییەکان "تا ساڵی ١٩٣٨ بە باشیی بەردەوام بوو."[75]

دوای ئەوەی ڕاپەڕیوەکان تا توانیان خۆڕاگریان کرد و بۆ ماوەی دوو ساڵ لە جەنگ و تێکۆشانی بەردەوامدا بوون ، بڕیاریاندا چەکەکانیان دانێن . سەید ڕەزا بە هاوەڵی چەند سەرکردەیەکی دیکە و خێزانەکانیان ، خۆیاندا بەدەست سوپای تورکەوە . سەرکردەکان دادگایی کران و لە سێدارەدران ، کۆچاندن خرایە قاڵبێکی بەرفراوانەوە .[76]

کوردان ، تورکیان بەوە تاوانبار دەکرد کە لەکاتی ڕاپەڕینەکە و دواتریش پەنای

---

[72] ئەم هێزانە لەو کاتەدا بە بیست وپێنج هەزار جەنگاوەر دانرابوو

Le Temps,Aug.18,1937;Cf. Irmine Romanette, Le Kurdistan et Le question Kurd,18.

[73] Le Temps,Aug.18,1937

[74] Ibid.

[75] Elphinston, The Kurdish Question,"45

[76] Safrastian,86.

بردۆتــەوە بــۆ جێبــەجێکردنی دڕندانــەترین و نامرۆڤانــەترین شــێوازی تــەمێکردنی ڕاپــەڕیوەکان .[٧٧] ئامارێکی فــەرمیی ســەبارەت بــە ژمــارەی کوژراوەکــانی ڕاپــەڕینەکــە و خەڵکە دوورخراوەکانی پاش سەرکوت لەبەر دەستدا نیە . یەك لە سەرچاوەکان ژمارەی کوژراوەکانی بە چل هەزار داناوە .[٧٨] سەرچاوەیەکی دیکەش ژمارەی دوورخراوەکانی بە سـی هــەزار خێــزان دانــاوە .[٧٩] تورکــان پێیــان لەســەر ئــەوە دادەگــرت گوایــە ڕەگــەزە پاشکەوتوو ئایینییەکان لە نێو کوردانی دەرسیمدا لە ڕاپەڕینەکە بەرپرسن . بە پێی گوتارێك کە لە (Le Temps) پاش ماوەیەکی کەم لە هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینەکەدا دەرکەوت ، کە بۆچوونی فەرمیی تورکانی دەردەخست ، ڕاپــەڕیوەکان پــێش ئــەوەی پەنابەرنە بەر چەك هــەڵگرتن ، بە چەند شێوازێك حکومەتیان ئاگادار کردۆتەوە ، لەو ئاگادارکردنەوەیــەدا ، ڕاشــکاوانە داوایــان لــە حکومــەت کــردووە تــەواوی هێــزە سەربازییەکانی لە هەرێمەکە بکشێنێتەوە . گشت هەواڵەکانی بنیاتنانی ڕێگەی هاتوچۆ وەك : شــەقام ، پــرد و ڕێگــەی ئاســن لــە ناوچــەکەدا بوەســتێنن ، بــاج کەمبکرێتــەوە ، ڕێگەشیان پێبدرێت چەکەکانیان لا بمێنێتەوە .[٨٠]

پاش سەرکوتی ڕاپەڕینەکەی دەرسیم . جەلال بایار ، کە لەو دەمەدا وەزیری نێوخۆی تورکیا بوو ، لەنێو ئەنجومەنی نیشتمانیی مەزندا ڕایگەیاند کە چیدیکە شتێك نیە بەناوی کێشەی کورد و جەردەکان دەکرێنە مرۆڤی شارستانیی . بەپێی ئەلفینستۆن ، ئەو بەیاننامەیە وەك هەڵوێستێکی فەرمیی تورك بوو لەهەمبەر گەلی کورد ، ئەوانەی تــاکو ئێستاش لــە تورکیــا بــە شــێوەیەکی فــەرمیی بــە (تورکــانی چیایی) ئاماژەیــان بــۆ دەکرێت .[٨١] ویلایەتی دەرسیم کە بە فەرمیی بە (تونجلی) ناودەبرێت وەك ناوچەیەکی داخــراو ڕاگەیەنــدرا و خرایــە ژێــر کــۆنترۆڵێکی تونــدی ســەربازیی . لــە زســتانی ســاڵی ١٩٤٥دا ، ئەنجومەنی نیشتمانیی تورکیی گفتوگۆی لەسەر ئەو سیستەمە کارگێڕییە کرد کــە لــە تــونجلی تــا ئــەو دەمــە بــەڕێوە دەبرا و دواتــریش خــستیە دەنگدانــەوە . ئاکــامی

---

[77] Dersimi.190-203.Cf. Le Temps.Aug.18.1937; Rambout.39.

[78] Rambout.39.

[79] Timse (London).Dec.31.1946.

[80] Le Temps.Aug.18.1937.

[81] Elphinston, The Kurdish Question."97

دەنگدانەکە بە شێوەیەك بوو کە ماوەی کارکردن بەو سیستمە کارگێڕییە بۆ ماوەیەکی درێژتر نوێ بکرێتەوە .[٨٢]

## رووخساری سیاسەتی نوێی تورکیا لەهەمبەر کورد

ساڵێك دواتر ، لە ١٩٤٦دا ، کاتێك هەمان بابەت سەرلەنوێ هێنرایەوە بەردەم ئەنجومەنی نیشتمانیی تورکیی ، ئەنجامەکەی لەوەی پێشوو جیاواز بوو ، ئەمجارەیان ئەنجومەن دەنگی بۆ یاسایەك دا کە سیستمە کارگێڕییە تایبەتەکەی رژێمی رەتکردەوە ، ئەو سیستمەی کە لە سەردەمی راپەڕینەکەی دەرسیمەوە لە ساڵی ١٩٣٧ەوە لە ویلایەتی تونجلی بەڕێوەدەبرا .[٨٣] ئەم پەرەسەندنە مژدەی دەرکەوتنی سەرنجێکی نوێی دەدا .لە ٢٨ی مارتی ١٩٤٧دا ، سەرەك وەزیرانی تورکیی ، لە میانەی گوتارێکیدا لەبەردەم خوێنکارانی زانکۆ ، ستایشی کوردانی کرد وەك هاووڵاتییەکی باش و بەتایبەت جەختی خستە سەر ئەو خزمەتەی کوردان لە سوپادا بە دڵسۆزییەوە دەیکەن .[٨٤]

وێڕای ئەو راستییەی بەشێکی زۆری کۆت و رێگرییەکانی پێشوو وەك خۆی مابوونەوە ، بەڵام بۆ یەکەمین جار لە ماوەی چەندین ساڵدا دەنگی تورکیی بۆ داواکردنی دادپەروەریی بۆ "دانیشتووانی رۆژهەڵات" بەرزبووەوە . لە ساڵی ١٩٤٨ و ١٩٤٩دا ، تاوانی کارە نارەواکانی کارمەندانی حکومەت لە هەرێمەکانی رۆژهەڵات ، چ لە ئەنجومەنی نیشتمانیی و چ لە نێو رۆژنامەکاندا راشکاوانە قسە و باسی لێوەکرا . سروشتی هێندێك لەو قسە و باسانە گشتیی بوون ئاماژەیان بە کێشەکانی وەك : بەدکارگێڕیی ، کەمتەرخەمیی و پشتگوێخستنی حکومەت و بێلیاقەتی کارمەندەکانیان دەکرد ، لە کاتێکدا هێندێکی دیکەیان پەیوەست بوون بە مەسەلە ورد و تایبەتییەکان ، لە ساڵی ١٩٤٨ دا ،کێشەی ئەو سی وسێ کەسەی کە لە ساڵی ١٩٤٣دا بێ دادگاییکردن و بە فەرمانی جێگری والی بایەزید تیرەکرابوون ، لە لایەن خێزانەکانیانەوە خرایە بەردەم ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانیی . پاش ئەوەی کێشەکە لە ئەنجومەنی نیشتمانیی

---

[82] Le Monde ,Dec.28,1945

[83] بەگوێرەی رۆژنامەی (Timse (London).Dec.31.1946) وەزیری ناوخۆ لە میانەی گفتوگۆیەکدا رایگەیاند کە خێزانەکان رێگەیان دراوە بگەرێنەوە شوێنی خۆیان

[84] Elphinston, Kurds and The Kurdish Question."45.

خرایە بەر باس ، وەك بابەتێك دەنگیدایەوە . حەسەن سەكای سەرەك وەزیران ، رەخنەی لە كەموكورتییەكانی بەڕێوەبەرایەتیی حكومەت لە هەرێمەكانی رۆژهەڵاتدا گرت و ئاماژەی بەوەدا كە دانیشتووانی ئەو ناوچانە لە سایەی چەندین شێوازی چەوسانەوەدا دەناڵێنن و ژیانی ئابووریی و كەلتووریی و ئاستی خۆشگوزەرانیان بەخراپیی پشتگوێخراوە .[85]

ئەحمەد ئەمین یەلمان ، رۆژنامەنووسی ناوداری تورك ، ئەو دەرفەتەی قۆزتەوە و گوتارێكی بەپێزی سەبارەت بە پێویستییەكانی جێبەجێكردنی چاكسازیی بنەڕەتیی لە ناوچەكەدا نووسی . هێندێك لەو خاڵانەی لە گوتارەكەدا رووژاندبوونی پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی تایبەتەوە هەبوو . ئەو گوتبووی كە هیچ یەك لەو هەرێمانە بە كۆڵۆنیی و زەوییەكی داگیركراو لەقەڵەم نەدراون ، تێكڕایان بەشێكن لە توركیا و هەمان مافی هاوتای هەرێمەكانی دیكەیان هەیە . دەستوور لە هیچ روویەكەوە جیاوازیی لەنێوان هاوڵاتییاندا دانەناوە ، نە جیاوازیی ئایینیی و نە رەگەزیی و نە هیچ شتێكی دیكە . ئەو پێشینە مێژوویییە دەریدەخات كە جیاوازكاریی لەسەر بنەمای زەمینەی رەگەزیی كارێكی نەشیاو و پەسەند نەكراوە . لەو دیدەشەوە كە هەڵقوڵاوی بەرژەوەندییە گشتییەكانی وڵاتە ، هەڵپەكردن لە خراپ بەكارهێنانی دەسەڵات ، لە هەر شوێنێك بێت راژە بە بەرژەوەندییە تایبەتەكان و خواست و ئارەزووی چەند كەسێك دەكات ، ئەوەش هیچ بەشدارییەكی لە پاراستن و پارێزگارییكردنی ئارامیی گشتیی یان لە بەدیهێنانی خۆشگوزەرانی كۆمەڵدا نابێت . ئنجا رایگەیاند :

" لە ئاكامی ئەو كردەوە ستەمكارانەیەی بەناوی ئاسایشی نیشتمانییەوە ئەنجامدەدرێت ، شێوازیی كارگێڕیی تایبەتیی كە تا ئێستا لە هەرێمەكانی رۆژهەڵاتدا بەردەوامە ، بۆتە مایەی ئەهامەتیی بۆ ئەو بەشە مەزنەی وڵات . دەیان ساڵە هەرێمەكانی رۆژهەڵات ئارامیی و هێمنییان بەخۆوە نەبینیوە .گرفت و ئاژاوە و شۆڕش باڵی بەسەر ئەو ناوچەیەدا كێشاوە . ئەو راستییەی وای لە حكومەت كردووە قوربانی بدات و پەنابەرێتە بەر كاری توندوتیژیی .

---

[85] Dicle Kaynagi (Istanbul)no.21,1948;cited in Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no.4, (1949)1-2.

بەڵام گەر هەلومەرجەکەی هەرێمەکانی رۆژئاوا لەسایەی تێروانینێکی دادپەروەرانەوە بکۆڵرێتەوە ، دەردەکەوێت کە هۆکارە بنەڕەتییەکانی تێکرای ئەو گرفت و ئاڵۆزییە بەردەوامە پەیوەندیی بە وروژاندن و هاندانی هێزە بیانییەکانەوە نیە ، هەروەها نۆباڵیش ناکەوێتە ئەستۆی سۆز و خواستی کاردانەوەی خەڵکە کۆنەپارێزەکان ، بەڵکو ئاکامێکی راستەوخۆی کارگێڕییەکی خراپ و گەندەڵە .

بەگشتیی دانیشتووانی هەرێمەکانی رۆژهەڵات لە خەڵکێکی چەوساوە و زەحمەتکێش پێکدێن ، خەڵکانێکی بەئەزم و رێزی یاسایان لایە . ئەمێستا ئێزگەی رادیۆیی شورەویی لە بەرنامەکانیدا شوێنێکی بەرچاوی بۆ پڕۆپاگەندەی کوردان تەرخان کردووە . پێویستە ئەو کارگەرییە پشتگوێ نەخەین کە ئەو کێشەیە لە عێراق و ئێران بەدوای خۆیدا دەیهێنێت . وەك ئاشکرایە کێشەی کورد لە تورکیا دا بەو واتایەی وشەکە هەڵیدەگرێت ، نیە ."[86]

یەلمان درێژەی دەداتێ و دەڵێت کە بەدکارگێڕیی و بێدادیی بوونەتە مایەی دەرکەوتنی بیری جیاخوازیی . ئەو جەختی لەسەر ئەو راستییە کردەوە کە تورکان پێویستە وریا بن و دوژمن بۆ وڵاتەکەیان پەیدا نەکەن ، دوژمنانێك کە خوازیاری کاولکردنی وڵاتن و دەرفەتی ئەوەشیان بخرێتە بەردەم . ئەو گەیشتە ئەم دەرئەنجامە :" لە تورکیادا ، گیان و ویستێکی دادپەروەرانە و کارگێڕییەکی لێهاتوو و شیاو هەبێت ، هیچ گرفتێك بێ چارەسەر نامێنێتەوە ."[87]

گومانی تێدا نیە ، ئەو بیروباوەڕ و هەروەها ئەو پەرەسەندن و رابوونەی پاش جەنگی دووەمی جیهانیی دەرکەوت ، بەشێوەیەکی بەرفراوان بەرپرسە لەو گیانە بوردبار و چاوپۆشییە . وێڕای ئەو دیدە سەربەست و ئازادییگەراییەی لای ژمارەیەك لە بەرپرسانی تورك دەرکەوتن .

سیستەمی دوو پارتی کە لەپاش جەنگ لە تورکیا سەریهەڵدا ، بۆخۆی گیان و کاریگەرییەکی نوێی کارکردنی لەگەڵ خۆی هێنا ، ئەوەش بە شێوەیەکی بەرچاو هاوکاریی هێورکردنەوە و نەرمکردنی هەڵوێستی فەرمیی لە هەمبەر کورداندا کرد .

---

[86] Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no.5, (1949)1-2.

[87] Ibid.,2.

لەسایەی سیستمی دوو پارتیدا –بەپێچەوانەی ئەو ڕۆژانەی تێیدا تورکیا لەلایەن دەستەیەکەوە فەرمانڕەوایەتیی دەکرا و پشتگیریی جەماوەریی بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو – پاڵێوراوانی دوو پارتە ڕکابەرەکە بۆ لەخۆنزیککردنەوە و ڕاکێشانی جەماوەری دەنگدەران تێدەکۆشان .

پارتی دیموکرات ، ئەو پارتە نوێیەی پەرۆشی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات بوو ، بەتایبەتیی لە بواری وەدەستهێنانی دەنگی کورداندا تێدەکۆشا . (لۆرد کینرۆس بێلفۆر) سەبارەت بە گفتوگۆیەکی لەگەڵ ئەندامێکی پێشووی پەرلەماندا کە ئێستا نوێنەرایەتیی پارتی گەل دەکات دەڵێت :

"هەروەها ئەو ڕەخنەیەی لە هەڵوێستی دیموکراتەکان لەمەمبەر کورد گرت . لە ڕابردوودا سیاسەتی تورک ئەوە بووە کە بەهێز شۆڕشگێڕە چیاییەکان بڕانێت . ئەمڕۆ سیاسەتەکە وایە کە پەروەردەیان کات و باریان بهێنێت ، بە تایبەت فێری زمانی تورکییان بکات ، بەوەش هێدی هێدی لە نێو کۆمەڵگای تورکییدا دەتوێنرێنەوە . وێڕای ئەوەش ، دەستی پۆلایین تاکو ئێستا پێویستە ، شێخە ئاژاوەگێڕەکانی کورد ناوبەناو لەلایەن پارتی گەلەوە بۆ بەشەکانی دیکەی تورکیا دوورخراونەتەوە . بەڵام دیموکراتەکان ، لەبەر هۆکاری هەڵبژاردن ، ئەمێستا ڕێگەیان داون بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان ، ئەوان هەروەها هانی مانەوەی پاشکەوتوویی ، ئایین و پۆشاک و بەرگی کوردان دەدەن – ئەوەی ئەو بە کارێکی قێزەونی دەزانی – پەچە سەرلەنوێ گەڕاوەتەوە ، کوردان لە گوندەکاندا ڕێگەیان پێدەدرێت کڵاوە تایبەتییەکەی خۆیان لەجیاتی شەبقە گشتییەکە لەسەر بکەن . لاوانی دیاربەکر لە شارەکەدا ئارەزوو دەکەن بگەڕێنەوە بۆ لەپێکردنی شەرواڵە فش و دەرلنگ پانەکانیان کە لە سایەی ڕژێمی پێشوودا تا ئەو کاتە لە پێیان دەکرد کە جەندرمەکانی ئەتاتورک بەزۆر و بەمقەستێکی گەورە ئاقەکەکانیان دەبڕین ...تێکڕای ئەوانە میوانی بەڕێزم ، مەترسیدارترین مەسەلەن "[88]

مامەڵەیەکی دادپەروەرانە و دروستتر لەگەڵ کورداندا ڕاستەوخۆ لەو ساڵانەی

---

[88] Patrick (Lord Kinross) Balfour. Within the Taurus: A Journey in Asiatic Turkey. John Murray. 1954.144-145.

پاش جەنگ وای دەردەخست کە بەڵێنی دەروازەیەکی ڕووناکتری بە ڕووی کێشەی کورد دا لە تورکیا کردبێتەوە . هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو ڕەوتە نوێیەی پاش جەنگ ، هەواڵی ئەوە هەبوو کە حکومەتی تورکیی چەند هەنگاوێکی بە ئامانجی چاککردنی باروذۆخی ماددیی و خۆشگوزەرانی کوردان گرتۆتەبەر .

لە ساڵی ١٩٤٦دا ، نووسەرێکی بەریتانیی بەشێوەیەکی ئەرێی و پیاهەڵدانەوە باسی لە گەشەسەندنی ناوچە کوردییەکانی تورکیای کردووە ، بەوەی بەرنامەیەك بۆ ریفۆرمی زەوییە کشتوکاڵییەکان و چاککردنی ئاستی گوزەرانی گوندنشینان بەسەرکەوتوویی دەستپێکردووە . ئەفسەرە سیاسییە لاوەکان کە لەنێو سوپادا کێشرابوونەوە ، بە باشی لەنێو کورداندا ئەرکی خۆیان رادەپەڕاند ، بەگوێرەی ئەم سەرچاوەیە ، ئاستی باری تەندروستی ، لە ناوچە کوردییەکانی تورکیا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا بەرزترە .[89]

ئەم گەشەسەندن و پەرەسەندنە لە ئایندەدا چاوەڕێی چاکتری لێدەکرێت ، هەرچەندە ئەو کێشەیەی کە هەمیشە نەهامەتیی و بێزاریی سەرەکیی کورد لە تورکیا پێکدەهێنێت ، بێچارەسەر ماوەتەوە . سەبارەت بە حکومەتی تورکیا تا ئێستا ئەوە رەتدەکاتەوە کوردان وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ و جیاواز بناسێت ، یاخود ئەو ئازادییەیان پێببەخشێت کە چالاکییە کەلتوورییەکانی خۆیان هەڵسووڕێنن .

[89] Malcolm Burr,"A Note on the Kurds," Journal of the Royal Central Asian Society 33, parts 3 and 4 (July-Oct., 1946): 289-92.

# بەشی سیازدەیەم : راپەڕینی بارزانیی لە ١٩٣١-١٩٣٢

ڕاپەڕینی بارزانیی لە ١٩٣١-١٩٣٢ لە هێندێك حاڵەتدا وەك دیاردەیەکی تەموموژاویی دەمێنێتەوە . زنجیرە ڕووداوەکانی ناوچەی بارزان لە عێراقدا ، کە ئاکامەکەی پاشتر لە کۆتایی هاوینی ١٩٣١دا وەك ڕاپەڕینێکی ئاشکرا دەرکەوت . بە ڕوونیی دیار نیە و بابەتێکە جێگای مشتومڕ و لێکدانەوەی جیاوازە .

حکومەتی عێراق ، کە بێگومان زیاترین زانیاریی گرنگی لەبەردەستدا بوو ، خۆی لە لێدوان و گفتوگۆی ئاشکرا سەبارەت بەو ڕاپەڕینە دەبوارد . لە ڕاستییدا ، هۆکارگەلێکی فرە هەبوون ئەو بڕوایە بچەسپێنێت کە دەسەڵاتدارانی بەغدا تەنیا خۆیان لە گفتوگۆ و باسکردنی هۆ و سروشتی ڕاپەڕینەکە نەدزیوەتەوە ، بەڵکو لە هەوڵی شاردنەوە و دیزە بەدەرخۆنەکردنی هەر ڕاستیی و سەرەداوێکەوە بوون کە بە ڕاپەڕینەکەوە پەیوەست بێت . بەیاننامە فەرمییەکان ، لە کاتێکدا بە ڕاشکاویی ئەوەیان ڕادەگەیاند کە شێخ ئەحمەد یاخییە و تێکدەری ئارامییە ، کەچی تەنیا ئاماژەیەکی کورت و ناڕوونی سەبارەت بە سروشتی ئەو تاوانانە تێدابوو کە دەبوایە شێخ ئەحمەد کردبێتی تا وەك تاوانبار بناسرێت .

بێگومان ، سروشتی فرە ناسك و هەستیاری کێشەکە هاندەری ئەم خۆپارێزییە فەرمییە بوو . ئەو بڕوا و کارە نائاساییانەی درابوونە پاڵ بارزانییەکان تەنیا داهێنانێکی نوێ نەبوو ، بەڵکو لە چاوی هەموو موسوڵمانێکی تەواودا وەرگەڕانێکی ئاشکرابوو لە تاکپەرستییەوە بەرەو فرەپەرەستی ، تاوانێك کە هەتا بڵێی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا ئەستەمە . لە دژی ئەم تاوانە ، ئەرکی موسوڵمانە شەڕێکی ئاییینی دژی ئەم وەرگەڕاوانە بەرپاکەن و هانیانبدەن بگەڕێنەوە سەر ڕێگای ڕاستیی ئاییینەکە یاخود بە تەواویی لەناویانبەرن .

باسکردن و لێدوان لەو تۆمەتانەی درابوونە پاڵ بارزانییەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا تەنیا موسوڵمانان و ڕای گشتیی دژی بارزانییەکان نەدەورووژاند ، بەڵکو بارزانییەکانی دەخستە دەرەوەی چوارچێوەی ئیسلام و حکومەتی ناچار دەکرد تا لەناوبردنیان شەڕی لەگەڵ بکردنایە ، خۆ تێوەگلان و بەردەوام بوون لە گرتنەبەری سیاسەتێکی توند و ڕەق ، حکومەتی دەخستە هەلومەرجێکی فرەئاڵۆز و نالەبارەوە بە

چەشنێك ئارامكردنەوەی بارودۆخەكە بە تەواویی ئەستەم و مەحاڵ بوو . سەرباری ئەوەش هاوبەستەگیی ئایینیی لە ئیسلامدا ئەوەندە بەهێزە كە هیچ دەستەیەكی موسوڵمانی بەرپرس یان حكومەت ئەو هەنگاوە پەرگر و توندە نانێت تا پێویستییەكی زۆر ناچاری نەكات . خواستی پاراستنی یەكێتی كۆمەڵگەی ئیسلامیی هەمیشە ئەوەندە بەهێزە بە چەشنێكی سونەتیی وایكردوە ئیسلام بە بەراورد لەگەڵ ئایینەكانی دیكەدا ، سەبارەت بە ئەندامە لادەرەكانی زیاتر لێبوردەتر بێت .

بابەتێكی گرنگی دیكە هەیە دەگونجێت حكومەت لەبەر چاوی گرتبێت بۆ پەنابردنە بەر سیاسەتی شاردنەوەی راستییەكان كە سروشتەكەی تەواو جیاوازە ، ئەویش تێوەگلانی ئاسوورییەكانە لە راپەرینەكەدا . ئەوانە بە پێی هەواڵەكانی ململانێیەكە سەرەتا وەك مێملێكی بارزانییەكان و دواتریش وەك هاوپەیمان و پشتگیریكەریان رۆڵیان بینی ، مەسەلەیەكی وا كە لە لایەن حكومەتەوە قوربانییەكی تایبەتی پێویست بوو . رۆڵی ئاسوورییەكان لە راپەرینی بارزانییەكاندا هەرچییەك بێت – واش دەردەكەوێت كە ئەو رۆڵە پشتگویێ خرابێت–دژایەتیی رای گشتیی بۆ ئەم كەمینە ئایینییە لە عێراقدا هەمیشە بەردەوام بوو . هەربۆیە دەگونجێت حكومەت وای بۆچووبێت كە دانایی نیە تەواویی ئەو بابەت و كێشانەی پەیوەندییان بە راپەرینەكەوە هەیە بخرێنە بەر باس ، لە ترسی ئەوەی ئەوەكا سەروماڵی ئاسوورییەكان لە تەواوی وڵاتدا بكەوێتە بەر پەلامار و مەترسییەوە .

### هۆكارەكانی راپەرینەكە

تێكڕای ئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵ راپەرینەكەی بارزانیی ساڵی ١٩٣١–١٩٣٢ كردووە بەسەر دوو دەستە یا قوتابخانە دابەشبوون . دەستەیەكیان كە بە شێوەیەكی سەرەكیی لە كارمەندەكانی پێشووی بەریتانیا لە عێراق پێكدێن ، پێ لەسەر ئەوە دادەگرن كە هۆكاری راستەقینەی راپەرینەكە پێویستە لە كەسایەتیی نامۆ و ناوازە و ئاڵۆزی شێخ ئەحمەدی بارزان و ناكار و بۆچوونە ئایینییەكانیدا ببینرێت . ئەوانە بایەخێكی بنەڕەتیی بۆ هۆكاری ئایینیی دادەنێن و وا لێكیدەدەنەوە كە ئۆباڵی گەورە دەكەوێتە ئەستۆی شێخ ئەحمەد . ئەوانە هەوڵێكیان نەداوە بێزاریی و كینەی خۆیان

سەبارەت بە شێخ ئەحمەد بشارنەوە ، ئەو شێخەی دوو رۆڵی دەبینی ، وەك راپەڕیوێك و وەك ئایینییەکی پەرگریش ، ببووە مەترسییەك بۆیان هەوڵ و ماندووبوونی چەند ساڵەی بەفیڕۆ دەدان . بەوپێیەش شێخ لەنێو لاپەڕە نووسراوەکانی ئەوانەدا وەك کەسایەتییەکی نەفام و سەرەڕۆ وێناکراوە ، کەسایەتییەك کە دەگونجێت شایەنی بەزەیی بێت ، نەك سۆز و لایەنگریی .

دەستەی دووەم لە نووسەرەکان ، زۆربەیان لەو کوردانە پێکدێن کە ئارەزوویەکی بەهێزی نەتەوەییان هەیە ، وێڕای ژمارەیەکی کەم لە عەرەب ، ئەوانەی لە سۆنگەی پەیوەستبوونیان بەو ئارەزووە گشتییە موسوڵمانانەیەی کە چاو لە کەسی لادەری ئایینەکەی دەپۆشێت کە گەڕابێتەوە سەر ڕێگای ڕاست و نێو کۆمەڵی باوەڕداران ، ئەو نووسەرانە بە ساکاریی بەلای کارتێکردنی ئایین لەسەر راپەڕینەکە تێپەڕیوون ، هەروەها وەك دەبینین ، بەشێکی مەزنی بەرپرسیارێتیی دەخاتە ئەستۆی ئاسورییەکان .

پێویستە ئەوەشمان لەبیر بێت ، کە شێخانی بارزان ڕێبەرانی تەریقەتی نەقشبەندیی بوون . (ئیدمۆندس) ئاماژەی بەم تەریقەتە کردووە و دەڵێت :" ئەم تەریقەتەش وەك بەشێکی ڕاست لە ئایین وەرگیرا ، بەڵام بەهۆی نەبوونی کەسێکی وەك نەقیبی بەغدا لەو دەوروبەرە یا بەهۆی شتێك کە پەیوەندیی بە بواری فێرکردنەکەیەوە هەبوو ، چەند مریدێکی بارنەهێنراوی ئەم تەریقەتە لە کوردستان ئارەزوویەکی تایبەتیان بۆ کاری سەیر وسەمەرە هەبوو ."[1]

(دەلوجی) ، ئەوەی ئایینزا سۆفییگەراییەکانی لە کوردستاندا بە هێندێك درێژیی باسکردووە ، ئاماژەی بەوە داوە کە گەندەڵیی و شێواویی تێکەڵ بە ئاکاری هێندێکیان بووە . جێگەی سەرنجە کە ئەو نووسەرە بەمەبەستی سەلماندنی بۆچوونەکەی ئاماژەی بە شێخەکانی بارزان داوە :

" لەسەردەمی شیخ عەبدولسەلامی یەکەمەوە ، باپیری عەبدولسەلامی دووەم ، تەریقەتەکە شێوێنرا ، بنەما سەرەکییەکانی گۆڕدران و دەستکاریی کران . موریدان بە چەشنێکی ئەوتۆ تەماشای شێخەکەیان دەکرد کە ئیسلام ڕێگەی پێنادات . هەروەها

---

[1] Edmonds ,Kurds, Turks and Arabs,63.

هۆکاری بنەڕەتیی ئەو بڕوا شێواوییەش لەوانەیە بۆ نەفامیی ریشەیی بارزانییەکان و هەروەها ژیانیان لە ناوچەیەکی چیایی سەخت و دووردەستدا بگەڕێتەوە . ژیانی گۆشەگیریان ، کە لە جیهانی دەرەوەی دابڕیبوون ، هاوکات لەگەڵ شەیدایی و دڵسۆزیی زۆریان بۆ شێخەکانیان ، وای لێکردبوون کە وەك خوداوەندێك تەمەشای ئەو پیاوانە بکەن و بیانپەرستن ."[2]

## رووداوەکانی چەند ساڵێك پێش راپەڕینەکە

سەرچاوە بەریتانییەکان راشکاوانەتر و بە درێژییەکی زێدەتر بەبەراورد لەگەڵ زۆربەی نووسەرەکانی دیکەدا قسەیان لەسەر ئەو رووداوە سەیر و نامۆیە کردووە کە زەمینەیان بۆ راپەڕینەکەی بارزان خۆشکردووە . بەگوێرەی (دەبلیو.سی.ئێف.ویلسن) کە کارمەندێکی باڵای کارگێڕیی بەریتانیی و خاوەنی چەندین ساڵ رازەیە لە عێراقدا ، شێخ ئەحمەد ، بە هاوکاریی براکەی و باندێکی چەکداریی چەندسەد کەسیی لە موریدەکانی ، دەستی بەسەر ناوچەی بارزاندا گرتبوو ، ئەو بەچەشنێك شکۆی لێدەنرا کە وەك خوداوەندێك خۆی لەقەڵەم دەدا ، یەکێك لە موریدە پەرگرەکانی کە بە (مەلا جوك) دەناسرا ، باسی لێدەکرێت کە بەتەواوی ناوچەی بارزاندا گەڕاوە و رایگەیاندووە کە شێخ ئەحمەد بۆتە خودا و ئەویش پەیامبەرەکەیەتی . واپێدەچێت مەلاجوك کەسێکی زمانپاراوی زۆرزان بووبێت و قسەکانی وای لە خەڵکانێکی زۆر کردبێت شوێنی کەون . ناو و ناوبانگی مەلاجوك ، وەك ئاگادار کراینەوە ، ئەوەندە بڵاو بوو کە ناوبانگی پیرەکەی تێپەڕاندبوو . ئەم راستییەش بەپێی قسەی ویلسن ، هانی یەکێك لە براکانی شێخی داوە ، مەلاجوك لەسەر رێگای خۆیان لابەرن .[3] ئەم زنجیرە رووداوە لەوەدەچێت رووداوی دیکەی پەرەسەندووتری بەدوادا هاتبێت . بە پێی گوتەی ویلسن :

" تا ئەو دەمە قورئان رێز و پیرۆزیی خۆی هەبوو ، ئەمێستا شێخ فەرمانێکی

---

[2] دملوجي ، امارة بهدينان ،٦٥.

[3] W.C.F Wilson. "Northern Iraq and Its People ." Journal of the Royal Central Asian Society 24, parts 2 (April. 1937),291.

ده‌ركردووه بۆ له‌ناوبردنی هه‌ر كۆپییه‌كی قورئان به‌رده‌ستكه‌وێت . ئه‌و هه‌روه‌ها قه‌ده‌غه‌كردنی خواردنی گۆشتی به‌رازی هه‌ڵگرت ، چونكه به‌رازه‌كێویی له بارزان زۆر بوون . شێخ نوێنه‌ری ئایینیی و چه‌كداریی خۆی ناردە ده‌ره‌وه‌ی سنووری بارزان ، ئه‌و گوندانه‌ی ئاماده نه‌بوون مل بۆ شێخ كه‌ج كه‌ن سووتێنران و ژماره‌یه‌كیش پیاوی دانیشتووی ناوچه‌كه كوژران . نه‌ده‌توانرا چاو له‌م جۆره باروودۆخه بپۆشرێت ، هه‌روه‌ها حكومه‌تی عێراق ناچار بوو به‌هه‌ماهه‌نگیی هێزی ئاسمانی پاشایه‌تیی (هاپ) بكه‌وێته كار.[4]

ئه‌مه گێڕانه‌وه‌یه‌كه له‌و رووداوه نامۆیانه‌ی كه پێش هه‌ڵگیرساندنی راپه‌ڕینه‌كه له ساڵی ١٩٣١ له بارزان روویانداوه . ویلسن كه گوتاره‌كه‌ی له ئه‌پرێلی ١٩٣٧دا ده‌ركه‌وتووه ، ج مێژوویه‌كی دانه‌ناوه . به‌ڵام له شوێنێكدا ئاماژه‌ی به‌وه داوه كه ئه‌و رووداوه‌ی باسی لێوه‌كردووه پێنج ساڵ پێشتر روویداوه .[5]

(ستیفن.ئێچ.لۆنگریك) كارمه‌ندێكی پێشووی به‌ریتانیی دیكه‌یه كه خاوه‌ن راژه‌یه‌كی زۆره له عێراقدا و زانیارییه‌كی فره‌ی سه‌بارەت به‌و وڵاته هه‌یه ، ئه‌ویش رووداوه‌كان به‌هه‌مان شێوه ده‌گێڕێته‌وه . به‌گوێره‌ی قسه‌ی ئه‌و ، هه‌ر له سه‌ره‌تای ساڵی ١٩٢٧ موه گرفت و هه‌را له‌ناوچه‌ی بارزان ده‌ستپێكرد.

شوێنه‌كه‌ی شێخ مه‌حموود وه‌ك رابه‌رێكی كورد كه ئارامیی و ئاشتیی شێواندبوو له هه‌مان ساڵدا ، ساڵی ١٩٢٧ ، له‌لایه‌ن شێخ ئه‌حمه‌دی بارزانه‌وه گیرایه‌وه ، كه سوپای عێراق له ناوچه‌كه‌یدا به‌و دواییه خه‌ریكی مانۆڕی سه‌ربازیی بوو . ئه‌م كابرا كاڵفامه ده‌ره‌به‌گه ، كه خواستێكی شێتانه‌ی مه‌زنگه‌رایی هانیداوه ، ئه‌مێستا خۆی وه‌ك خوداوه‌ندێك راگه‌یاندووه ، هێندێك موریدی له رێگه‌ی گوتاره‌كانی مه‌لایه‌كی خوێنگه‌رمه‌وه بۆ په‌یدا بووه . به‌ڵام كاردانه‌وه‌ی ترسناكیی گوێگران بووه هۆی شه‌ڕێكی توند و قوربانیی لێكه‌وته‌وه ، كه یه‌كێكیان براكه‌ی خۆی بوو ، پاش ئه‌وه‌ش پۆلیس تێكه‌ڵ به مه‌سه‌له‌كه بوو . هێزه‌كانی سوپاش له سه‌ربازخانه‌كه‌ی بله ، له نزیك بارزان خرانه ئاماده‌باشییه‌وه . ئایینه نوێیه‌كه كۆتاییهات ، به‌ڵام شێخ و لێدوان و نووسینه‌كانی

---

[4] Ibid.,291-92.

[5] Ibid.,291.

که هانی جەنگ و یاخیبوون و ئاژاوەی دەدا بۆ تێکدانی ئەوانەی گوێیان دەگرت و دەنگۆی پێشێلکردنەکانی ئاسورییەکانیان بڵاودەکردەوە ، وەك كەسێکی مەترسیدار مابووەوە .[6]

پێویستە تێبینیی ئەوە بکرێت ، کە ئەم دوو گێڕانەوەیە لە دوو خاڵی لاوەکییدا جیاوازییان هەیە . لەکاتێکدا لۆنگریك جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە سەروبەندی شەڕەکاندا یەکێك لە براکانی شێخ ئەحمەد لەگەڵ مەلاجوك دا کوژراوە ، ویلسن پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە مەلاجوك خۆی بەدەستی یەکێك لە براکانی شێخ کوژراوە . حەڵاڵکردنی گۆشتی بەراز لەلایەن شێخەوە ، کە ویلسن ئاماژەی پێداوە ، لەو بەشەی نووسینەکەی لۆنگریکدا دەرنەکەوتووە ، چونکە ئەو روداوە پاش چوار ساڵ لە رووداوەکانی ساڵی ١٩٢٧ کە دوا ساڵی کوشتنی مەلاجوك بووە ، روویداوە . لۆنگریك لە نێو ئەو رووداوانەدا باسی لێوەکردووە کە ساڵی ١٩٣١ قەوماون .

راگواستنی نووسینەکەی لۆنگریك دوو خاڵی سەرنجراکێشی تێدایە کە دەگونجێت شوێنی لەسەر ئەدامەتیی و بێزارییەکانی شێخ ئەحمەد دابنێت کە پاشتر رایگەیاندن . خاڵی یەکەم دەکەوێتە سەرەتای وەرگێڕاوەکەوە و پەیوەندیی بە مانۆڕی سەربازیی سوپای عێراقەوە لە ناوچەی بارزان هەیە ، خاڵی دووەمیش لە دوا دێڕی نووسینەکەیدایە کە ئاماژە بە دەنگۆی پێشێلکاریی ئاسورییەکان دەکات .

## هاتنی یەکەکانی سوپا و نیشتەجێکردنی ئاسورییەکان

بێگومان شێخ هاتنی سوپای عێراقی بۆ ناوچەی بارزان پێناخۆش بوو ، واپێدەچێت ئەو مەسەلەکەی بە هەڕەشەیەك لەسەر دەسەڵاتی بێ چەندوچوونی خۆی کە تا ئەو کاتە لە ناوچەکەدا هەیبوو ، لەقەڵەم دەدا و پێیخۆش نەبوو دەسەڵاتی میریی لەو ناوچانەدا بچەسپێت . کاردانەوەی ئەو دژ بە دەستێوەردانی دەسەڵاتێکی دەرەکیی وەك میریی لە ناوچەکەدا دەگونجێت هاوشێوەی ئەو دەرەبەگە نیمچە سەربەخۆیە جۆراوجۆرانەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بێت کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا

[6] Longrigg, Iraq (1900-1950),294.

تووشی هەمان ترس بوونەوە . گومانی تێدا نیە ، لۆنگریك كە باسی لە چوونی سوپای عێراق بۆ ناوچەی بارزان كردووە بەو شێوە لەناكاو و ناشایستەیە ، لەوانەی ئەم بۆچوونەی لە بیری خۆیدا لێكدابێتەوە هەربۆیە لەباسكردنی شێخدا بە (دەرەبەگ)[٧] ناوی بردووە .

شێخ وەك دەبینین ، ناڕەزایەتیی و بێزاریی خۆی لەمەڕ هاتنی سوپای عێراق بۆ وڵاتی بارزان دەربڕی . ئەو ناڕەزایەتییەی شوێنی لەسەر ژمارەیەك نووسەر داناوە كە لەگەڵ سەركردەی بارزاندا هاوسۆزین . لە ڕاستییدا وا دەردەكەوێت ئەو مەسەلەیە یەكێك بێت لە پەژارە بنەڕەتییەكانی شێخ وەختایەكی ئاڵای ڕاپەڕینی بەرزكردەوە .

ترس و دڵەڕاوكێی شێخ لەشوێنی خۆیدا بوو و چەند لایەنێكی باڵای سەر بە دەسەڵاتیش جەختیان لەسەر كردووە . لە ساڵی ١٩٣١دا ، (سێر ڕۆبەرت برۆك پۆفام) كە وەك سەركردەی (هاپ) لە عێراقدا ڕاژەی كردووە ، دەڵێت :" لە ساڵی ١٩٢٨دا ، وەختایەكی چوومە عێراق ، ناوچەی بارزانیان لەسەر نەخشە پیشاندام كە ئەو كاتە پۆلیس پێی تێنەنابوو ، ترك بەوەكرا كە زوو یا درەنگ ئەم ناوچەیە دەستی بەسەردا بگیرێت . مەبەستمان بوو لەكاتی پێویستدا بەشێوەیەكی ئاشتییانە خۆمان لەو ناوچەیە بخزێنین ."[٨]

ئەمێستا دێینە سەر خاڵەكەی دیكە لە نووسینەكەی پێشووی لۆنگریكدا ، ئەوەی ناوی لێناوە گازەندە و ناڕەزایەتیی شێخ ئەحمەد لە (پێشێلكاری ئاسورییەكان) .

---

[7] دەرەبەگ زاراوەیەكی توركییە بەمانی (سەرداری دۆڵەكان) دێت و بۆ ئەو میرە نیمچە سەربەخۆ و سەرۆكە فیوداڵانە لە سەراسەری ئیمپراتۆریی عوسمانییدا بەكار دەهات . سوڵتان مەحموودی دووەم لە چارەكی یەكەمی سەدەی نۆزدەیەمدا هەوڵێكی بەرنامە بۆ داڕێژراوی دا تا دەسەڵاتی ئەو دەرەبەگە دەسەڵاتدارانە تێكبشكێنێت و بیانخاتە ژێر ركێفی دەسەڵاتی ناوەندییەوە دەوڵەتی عوسمانیی توانی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا بە سەر زۆربەی ئەم میرانەدا زاڵ بێت

[8] ئەم زانیارییانە لە لایەن (برۆك پۆفام)ەوە لە میانەی لێدوانێكیدا سەبارەت بە گوتەیەكی (فلیپ مومفۆرد) لە دیدەنییەكی ناوەندی كۆمەڵگای ئاسیایی لە ٢٦ی سێپتەمبەری ١٩٣٢ بڕوانە :

Mumford, Phillip." Kurds, Assyrian and Iraq " " Journal of the Royal Central Asian Society 20, part 1 (Jan. 1933): 117.

بەدەر لە ڕەوایەتیی ئەو هۆکارانەی هاندەری شێخ بوون ، ئەو هێندێك بنەمای هەبوون هەڵوێستی دژە ئاسووریی خۆی لەسەر بنیات بنێت . ڕێبەری بارزانیی ئاگاداری ئەوە بوو کە پلان بۆ نیشتەجێکردنی ئاسوورییەکان لە کەناری زێدی ئەودا لەگۆڕێدایە . وادەرەکەوێت شێخ بەراستیی سەبارەت بە نیشتەجێکردنی خەڵکانێکی سەربەگۆبەندی وەك ئاسوورییەکان و هاوسێیەتیان سڵەمیبێتەوە . تەنیا چەند ساڵێك لەوەو پێش ، لەسەردەمی ئەو جوڵانەوە شوومەی کە بۆ گێڕانەوەی ئاسوورییەکان بۆ زێدی خۆیان بە ڕێبەری (ئاغا پەترۆس) ئەنجامدرا ، شێخ ئەحمەد بەدەست ئاسوورییەکان زیانێکی زۆری پێکەوت و وەختایەکی ویستی لەگەڵ زێبارییەکانی هاوپەیمانییدا ڕێگە نەدەن بە ئاسوورییەکان بە ناوچەی زێبار–بارزان دا بەرەو بەرزاییەکانی هەکاریی تێپەڕن . هەروەها شێخ لە مەبەستی حکومەت ئاگادار بوو کە دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەرەو ناوچەی بارزان فراوان بکات . هێرشەکانی لیڤی ئاسووریی و سوپای عێراق بەو دواییە لە دەوروبەری ناوچەی ئەودا دەسوڕان و لە هێندێك شوێنیشدا بنکەی جێگیر و هەمیشەییان دامەزراندبوو کە پەلاماری لەناکاویان کارێکی ئاسان و چاوەڕوانکراو بوو .

ئا لەم هەلومەرجەدا ، کارێکی گونجاو نیە شێخ ئەحمەد مەسەلەی نیشتەجێبوونی ئاسوورییەکانی بەو چالاکیی و جموجۆڵە سەربازییانەوە گرێدابێت کە لە دەوری ئەو شوێنی خۆیان دەگرت . گەر وابێت ، ئەوا شێخ ئەو مانۆڕەی بەو دواییەی سوپای وەك نیشانەیەکی شووم و هەواڵی خواستێکی شەڕەنگێزیی بۆ خۆی و گەلەکەی لەقەڵەم دەدا . سەرباری ئەوەش ، گەر بڕوا بە هێندێك هەواڵی تایبەت بکەین ، ترس و دڵەڕاوکێی شێخ تا دەهات زێدەتر دەبوو لە ئەنجامی کاری ئەو ئاژاوەگێڕانەی کە لە دڵەڕاوکێی ئەوەدا بوون کورد و ئاسوورییەکان لە گەرووی یەکتردا ببینن .[9]

هەر هۆکارێك لەوانە دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە شێخ ئەحمەد کەمتر ئارەزووی ئەوەی هەبوو چاو لە هەر یەك لە بەرنامەی نیشتەجێبوونی ئاسوورییەکان یاخود لە خزاندنی میریی و هێزەکانی بۆ بارزان بپۆشێت .بەڵام فرە ئاشکرا نیە کام لەم دووانە زیاتر بە سەرچاوەی هەڕەشەیەکی توند لەسەر دەسەڵاتی بێ چەندوچوونی تا ئەو کاتەی

---

[9] لۆنگریك دەڵێت خراپ بەکارهێنانی پەیوەندیی ئاڵۆزیی نێوان کورد و ئاسوورییەکان لەلایەن سیاسەتکارە عێراقییەکانەوە بە ئاشکرا دەبینرا .Longrigg, Iraq (1900-1950),198.

خۆی زانیوە . (جیاوك) کە یەکێکە لەوانەی بە توندیی بەرگریی لە شێخ دەکات کلیلی ئەو نهێنییەی خستۆتە بەردەستمان .

بەگوێرەی جیاوك ، شێخ ئەحمەد سکالآنامەیەکی ئاراستەی مەلیك فەیسەڵی یەکەم کردبوو ، تێیدا داخ و بێزاریی خۆی سەبارەت بە بنیاتنان و دامەزراندنی بنکە و بارەگای سەربازیی لە ناوچەی بارزان دەربڕیبوو ، هەروەها هەوڵی دابوو هۆکارەکانی ئەو کارە بزانێت . گەر بۆ پاراستنی بارزانییەکانە ، وەك جەختی لێدەکرێت ، ئەوە لە رابردوودا ئەوان سەلماندوویانە کە خۆیان بە شێوەیەکی شایستە و تەواو توانای ئەو کارەیان هەیە ، خۆ ئەگەر سوپاش بۆ ئەو مەبەستە هاتۆتە بارزان کە ئاسوورییەکان لەوێ نیشتەجێ بکات ، ئەوە بڕیارێکی نادروست و ستەمکارانە ئەنجام دەدات ، بڕیارێك بەشێوەیەك زۆرەملێیانەیە کە بە بڕوای ئەو نە مەلیك و نە وەزیرەکانیش پشتگیریی لێناکەن [10].

وێڕای ئەو خۆدزینەوەیەی شێخ و هەوڵی شارەزایانەی بۆ دوورکەوتنەوە لەو دوو خاڵەی کێشەکە ، گومانی تێدا نەهێشت کە ئەو بە هیچ جۆرێك خوازیاری بوونی سوپای عێراق لە بارزان نیە . هەرچەندە ، ئەو دانایانە خۆی بەدوور گرت لەوەی بوونی سوپای عێراق لە ناوچەکەدا بکاتە کێشەیەك و لەجیاتی ئەوە بایەخی بە ئاسوورییەکان دا . نارەزایەتیی شێخ لەحاست بەرنامەی نیشتەجێکردنی ئاسوورییەکان زەنگی رەوایی بێزاریی پێبەخشی و بەرەو ئەوە دەچوو لە چەندین لاوە پشتگیریی و سۆزی بەرچاو بەدەستبێنێت .

### دیدی نووسەرە کوردەکان

ماوەیەکی زۆر پاش ئەوەی شێخ خۆشی وازی هێنابوو لەوەی مەسەلەی نیشتەجێبوونی ئاسوورییەکان بکاتە کێشەیەك ، ژمارەیەك لە نووسەرانی کورد مەسەلەکەیان زیندوو کردەوە و رایانگەیاند گوایە ئەو بابەتە یەکێکە لە پرسە سەرەکییەکان ، ئەگەر کێشەی سەرەکیی راپەرینەکەی بارزانی ١٩٣١-١٩٣٢ نەبێت .

---

[10] جیاوك ، ماساة بارزان المظلومة ، ١٢٨-١٢٩.

(ئەردەڵان) یەکەمینی ئەو کەسانە بوو ئەم بابەتەیان وروژاند ، جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە تەواوی مەسەلەکە لەو بیروباوەڕەوە سەرچاوە دەگرێت کە حکومەتی بەریتانیی بۆ نیشتەجێکردنی ئاسورییەکان لە ناوچەی بارزاندا دای ، ئەو راستییەی کە بارزانییەکانی بە تەواویی بێزار کرد و بەتوندی دژی وەستان . بە پێی بۆچوونی ئەو ، وەختایەکی شەڕلەنێوان ئاسوریی و بارزانییەکاندا هەڵگیرسا ، بەریتانییەکان داوایان لە حکومەتی عێراق کرد خۆی لەو مەسەلەیەوە بگلێنێت ، ئەوەش زەمینەی راپەڕینەکەی خۆشتر و قەومانی خێراتر کرد .[11]

(ئەلبریفکانی) جەختی لەوە کردۆتەوە کە نیشتەجێکردنی ئاسورییەکان لە وڵاتی بارزان ، هاوکات بووە لەگەڵ خواستی بەریتانییەکان بۆ فراوانکردن و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەو ناوچە سنوورییە ستراتیژیی و گرنگەدا ، ئەوەش دوو هۆکاری راستەقینەی راپەڕینەکە بوون . بەگوێرەی ئەو ، پلانی نیشتەجێبوونەکە بریتیبوو لە نیشتەجێکردنی ئاسورییەکان لە ناوچەکانی بیرازگەرد ، شیروان ، برادۆست و مێرگەسوور ، گرنگترین هۆکاری راپەڕینەکە بوون . بارزانییەکان ، وەك ئەو دەڵێت ، بڕیاریاندا دژی ئەم سیاسەتە بوەستنەوە و بەرهەڵستیی بکەن ، هەروەها ، لە ئاکامدا ، حکومەتی عێراق دەستیکرد بە ئەنجامدانی هێرشکاری سەربازیی دژی بارزانییەکان .[12]

جیاوکیش هەمان بۆچوونی دووبارە کردۆتەوە ، گوایە سەراپای کێشەی بارزان لەو هەوڵانەی بەریتانییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت بۆ ناچارکردنی بارزانییەکان تا دەست لە موڵك و ماڵی خۆیان هەڵگرن و بیدەنە ئاسورییە جێگیرکراوەکان .[13]

هەرچەندە ، ئەو بۆچوونەی پێیوایە گوایە راپەڕینی بارزانی ساڵی ١٩٣١-١٩٣٢ تەنیا بەهۆی خواستی نیشتەجێکردنی ئاسورییەکانەوە روویداوە جێگای باوەڕ نیە . لەگەڵ ئەوەی تەواو دروستە کە هەریەك لە حکومەتی عێراق و حکومەتی بەریتانیا وەك هێزێکی ماندێتیی لە هەوڵی ئەوەدا بوون نیشتمانێك بۆ ئاسورییەکان لە باکووری عێراق پەیدا بکەن ، گەڕانێك بەدوای هەرێمێکی گونجاوی ئەوەندە فراوان کە لە توانایدا بێت ببێتە نیشتمانی هەموو لە مەرگ رزگاربووەکانی ئەو گەلە تێکشکاوە بێهوودە بوو . وەك

---

[11] اردلان ، اسرار بارزان ، تهران ، ١٩٤٦، ٣

[12] البريفكاني ، حقيقة الطريقة النقشبندية البارزانية، ١٢٣-١٣

[13] جياوك ، ماساة بارزان المظلومة، ٤٩-٥١

لۆنگریك دەڵێت :" ئەو گەلە لە مەرگ رزگاربووەی کە نزیکەی ۲۰۰۰۰ کەسێك دەبوون نەدەتوانرا لە هەرێمێکی چەپەکی بەدوژمن دەورەدراودا چڕبکرێتەوە ، لە کاتێکدا عێراق هیچ ناوچەیەکی فراوانی چۆڵی پێشکەش نەکرد کە زەویەکەی بۆ چاندن بشێت ."[14]

ئاکامی چارەنووسساز بریتیبوو لە پەرتەوازەکردنی کۆمەڵگای ئاسوریی لە چەند بەشێکی جیاوازی کوردستانی باکووری عێراق . لە پاش ئەوەی نیشتەجێکردن لە ناوچەکانی دهۆك ، ئامێدیی ، بەرواری باڵا ، بەرواری ژێریی ، ئاکرێ ، زاخۆ و شێخان دەستپێکرد ، هەروەها لە ناوچەکانی حەریر و دیانای سەر بە رەواندز .[15] هەوڵەکان بۆ نیشتەجێکردنی ئاسورییەکان لە ناوچەی برادۆست لە ئەنجامی چەند هۆکاری جیاواز شکستیخوارد ، یەك لەوانە هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاکۆکیی بوو لەنێوان شێخ ئەحمەدی بارزان و شێخ رەشیدی برادۆست .[16]

پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت کە نووسەرە کوردەکان تێزەکەی خۆیان سەبارەت بە بەرپرسیارییەتیی ئاسورییەکان لە راپەڕینی ۱۹۳۱ دا وەختایەك پێشکەشکرد کە دەمی دووەمین راپەڕینی بارزانیی ساڵی ۱۹٤۳-۱۹٤٥ بوو ، لە کاتێکدا بارزانییەکان ، بەزیو و پەرتەوازە ، لە پەژارە و نەهامەتییەکی مەزندا بوون . ئامانجی ئاشکرای ئەو نووسەرانە بەرگرییکردن لە کێشەی بارزانییەکان بوو ، بۆئەوەی نەهامەتییەکانیان پێشانبدەن ، جەخت لەو مامەڵە ستەمکارانەیە بکەن کە دەرحەقیان کراوە ، تۆمەتی یاخیبوون و خراپەکاریی لە ئەستۆیان داماڵن ، هەروەها سۆز و لایەنگریی خەڵك و کارگێڕە فەرمییەکانیان بۆ راکێشن . بێگومان مەبەستی ئەو نووسەرانە شایەنی پێزانینە ، سەبارەت بە بارزانییەکان -بەتەواویی لەسۆنگەی هەڵەی خۆیانەوە نەبوو - بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە پەژارە و نەهامەتییدا دەژیان . هەر لە دەورانی عوسمانییەوە ، نەهامەتیی و پەژارەی بارزانییەکان پشتگوێ خراوە ، داواکارییەکانیان بۆ چاکسازیی و دادپەروەریی ئاوڕی لێنەدراوەتەوە . گرفت و کێشە و بارگرانییەکانیان بەگشتیی سەرئەنجامی کەموکوڕیی ولاوازیی تێگەیشتن و نەبوونی هاوسۆزیی میرییە .[17]

---

[14] Longrigg. Iraq (1900-1950),158.

[15] Ibid.,158,197.

[16] Ibid.,197,199.

[17] پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە اردلان یەکەم کەس بووە هەوڵ بدات لەو بارەیەوە بدوێت ، دواتریش بریفکانیی و

## هەڵگیرساندنی راپەرینەکە

ئەو ناشتیی و هێمنییە ناجێگیرەی کە لە پاش هەراکەی ساڵی ١٩٢٧ موە لە بارزان هەبوو لە هاوینی ساڵی ١٩٣١ دا کۆتاییهات . لەهەمان کاتدا پشکنەری بەڕێوەبەرایەتیی بەریتانیی وەك پێویستییەك سەردانی شێخ ئەحمەدی کرد و لەمەڕ هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی بەغدا هۆشیاریی پێدا .[18] لۆنگریك بەم چەشنەی خوارەوە باس لەسەرەتای تەقینەوەی راپەرینەکەی بارزان دەکات :

" لە ژوئێنی دوا ساڵدا (١٩٣١) ، ئەو (شێخ ئەحمەد) سەرلەنوێ عەقڵی خۆی لەدەستدا ، بوو بە کریستیانیی و بەسەر خەڵکیشدا سەپاندی ، هەروەها فەرمانی بە مورێدە تۆقیوەکانی دا هەمان بیروباوەڕی ئەو هەڵگرن بەوەی گۆشتی بەراز ببرژێنن و بیخۆن . هێندێك لە مورێدە ترساوەکانی ملکەچییان پێشاندا ، شێخ رەشیدی برادۆستیی هاوسێی ، نارەزایەتیی و بێزاریی پێشاندا و پەلاماریدا ، بەوەش جەنگێکی خێڵەکیی هەڵگیرسا . براکەی شێخ ئەحمەد ، مەلا مستەفا ، لەگەڵ چەند خێرخوایەکی دیکە ، بێهوودە بەشێوەیەکی دیپلۆماسیی لە هەوڵی کوژاندنەوەی شەڕەکەدا بوون ، بەڵام ئەو خۆی (شێخ ئەحمەد) گەڕایەوە سەر ئاینی ئیسلام و چەند پەلامارێکی دڕندانەی کەموێنی ئاراستەی وڵاتی برادۆست کرد ."[19]

لێرەوە زنجیرەی رووداوەکان بۆ یاخیبوونێکی پێگەیشتوو پەرەی گرت ، بەوەی هەریەك لە سوپای عێراق و هێزی ئاسمانیی پاشایەتیی (هاپ) دەستیان لە مەسەلەکە وەردا . هەرچییەك سەبارەت بە ئاکاری ئاناسایی شێخ بگوترێت ، ناتوانرێت بەوە تاوانبار بکرێت کە توندوتیژییەکی هاننەدراوی دژی هاوسێکەی ئەنجامداوە . بۆ رێبەری تەریقەتێکی سۆفییگەرایی وەك شێخ ، ئەو کارە نامۆ و ئاناساییانە دەگونجێت کارێك بێت وەك تاقیکردنەوەی توانا و دەرخستنی دەسەڵاتی جەماوەرکێشیی شێخ ، کە جگە لە

---

جیاوك بەدوایدا هاتن لە تێکڕاین هاوسەنگتر بریفکانییە کە ئالوزیی و گرفتی بارزانییەکانی بۆ سەردەمی عوسمانیی گێڕاوەتەوە

[18] Longrigg, Iraq (1900-1950),194-95.

[19] Ibid.,195.

موریدەکانی نەبێت ، ئەویش تاڕادەیەك ، کەسی دیکە بڕوای بەوە نەبوو کە خاوەنی بێت . ئەو ڕاستییەی کە موریدەکانی ناچار بووبن کاتێك فەرمانیان پێدرابێت گۆشتی قەدەغەکراوی بەراز بخۆن زیاتر لە دانپێدانانیانەوە بووە بۆ ئەو توانا و دەسەڵاتە تایبەتییەی شێخ وەك لەوەی لە ترسی سزادانیانەوە بووبێت .

سەرچاوەیەکی دیکە تیشکێکی گرنگی خستۆتە سەر نەك تەنیا شێخ ئەحمەد ، بەڵکو شێخ ڕەشیدی پەلاماردەریش –کە ئەویش شێخێکی نەقشبەندیی بوو –(هاملتۆن) لە ساڵی ١٩٣٧دا نووسیویەتی کە (ئیسماعیل بەگ) ی کوڕەزای عەبدوڵڵا پاشای ڕەواندز و لەهەمان کاتیشدا فەرمانداری شارەکە لە درێژەی ئەم گفتوگۆیەی لای خوارەوە پێی گوتووە :

" شێخ ئەحمەد پیاوێکی گەنجە و خاوەن بۆچوونێکی نامۆیە لەهەمبەر ئایینی محەممەدی پەیامبەرمان ، ماوەیەك ببووە نیوە کریستانییەك و بانگەشەی بۆ دۆستایەتیی لەگەڵ ئاسورییەکان دەکرد. دەستبەجێ دەنگۆ لە کوردستاندا کەوت گوایە شێخ ئەحمەد لەگەڵ ئاسورییەکاندا کەوتوونەتە پیلانگێڕان بۆ سەرکوتکردنی هەموو موسوڵمانەکان –ئەوە بێگومان درۆیە ، بەڵام هاوسێ دەمارگیرەکەی شێخ ڕەشید ، لەلایەن بەکرێنگیراوێکی نهێنی ڕامیارییەوە کە ئاماژەم بۆ کرد ، هاندراوە ، کە پەلاماری کافران یان بێباوەڕان بدات . ئەو گوتی کە گوللەکانیان نەبێت بە ئاو ، ئەو بەڕاستیی کابرایەکی گێل بوو کە بڕوای بەوە کرد و پەلاماری شێخ ئەحمەدی دا .ئەو لە تەولوی شەڕەکاندا خراپ شکا ، بەدوای ئەوەش سوپای عێراق هێنرا ، وەك گوترا بۆ ئەوەی ئاشتیی لە کوردستان بەرقەرار کات ، هەر لەو کاتەی سوپا هاتە ناوچەکە تووشی گرفت و بارگرانیی هات ، تەنیا کاتێك لە تێکشکاندن ڕزگاری بوو کە هێزی پاشایەتیی ئێوە بۆمبارانی خۆی کرد "[20].

ئەم زانیارییە بەرپەرچدانەوەیەکی ئاشکرای ئەو بۆچوونەیە کە پێی وایە شێخ ئەحمەد بەهۆی بوونی پلانی نیشتەجێکردنی ئاسورییەکانەوە ناچارکراوە ڕاپەڕێت . بە پێچەوانەوە ، وا دەردەکەوێت کە بە تەواویی لەگەڵ ئاسورییەکاندا پێکهاتبێتەوە و وازیشی لەو تۆمەتبارکردنە هێناوە کە لە ساڵی ١٩٢٧دا دژی ئاسورییەکان کاری بۆ

---

[20] Hamilton.299.

ئەکرد .وەك بەشێك لە راستیی ، ئەتوانرێت ئەنجامگیریی بکرێت کە بەهۆی بیروباوەڕ و ناکاری ناتەبای شێخ ئەحمەد لەگەڵ رەوتی باوی ئایینیی ، هاوکات هەڵوێستی دۆستانەی لەهەمبەر ئاسورییەکان ، وای کرد بە نیوە کریسانییەك بدرێتە قەڵەم و پەلامار بدرێت و وەك کافرێك بەنەفرەت بکرێت .[21]

ئەو زانیارییەی ئەڵێت " بەکرێگیراوی نهێنیی " شێخ رەشیدی هانداوە بۆ هێرشکردنە سەر شێخ ئەحمەد فرە گرنگ و سەرنجڕاکێشە . وەك ئیسماعیل بەگ کراوەتە بەڵگە لە نووسینەکەیدا ، لە درێژەی گفتوگۆکەی لەگەڵ هامیلتۆن دا ئاماژەی بەو بەکرێگیراوە داوە .[22] خۆشباوەڕی شێخ رەشید لەوەدا دەردەکەوێت کە ساکارانە باوەڕی بەو دڵنیاکردنەوە و قسەیە کردووە کە ئەگەر پەلاماری "کافران" بدات ، گوللەکانیان دەبێتە ئاو و ئەویش وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێت بێئەوەی رووبەڕووی سزایەك بێتەوە .

## بڕیاری میریی بۆ دەستێوەردان

لە نۆڤەمبەری ١٩٣١دا ، شێخ ئەحمەد گوزرێکی هێند توندی لە شێخ رەشید دا کە حکومەتی عێراق بڕیاریدا دەست وەرداتە کێشەکەوە و فەرمان بە سوپا بدات بکەوێتەکار بێئەوەی گرفتەکانی هەڵمەتی زستان لەبەرچاو بگرێت .[23] بڕیاری حکومەتی عێراق بۆ سزادانی شێخ ئەحمەد شەپۆلێکی نارەزایی بەرچاوی وروژاند . ئیسماعیل بەگ لە درێژەی وتووێژەکەیدا لەگەڵ هامیلتۆن بێزاریی خۆی لەو راستییە دەربڕیوە کە پێش ئەوەی سوپا پەلاماری شێخ ئەحمەد بدات ، میریی هیچ هەوڵێکی نەداوە لە هۆکارەکانی کێشەکە بکۆڵێتەوە یاخود بەشێوەیەکی ئاشتییخوازانە کار بۆ هێورکردنەوە و چارەسەرکردنی بکات .[24]

هەروەها (کاپتن فیلیپ مێمفۆرد) کە بۆ ماوەی حەوت ساڵ ئەفسەرێکی

---

[21] خواردنی گۆشتی بەراز بەگشتیی بە کریستیانییەکانەوە پەیوەستکراوە وەك چۆن خەتەنەکردن بە موسوڵمانەوە ئەوەش وایکردووە کە شێخ ئەحمەد بە نیمچە کریستانییەك لەقەڵەم بدرێت

[22] Hamilton,299.

[23] Longrigg, Iraq (1900-1950),195.

[24] Hamilton,300..

هەواڵگری بەریتانیی لەعێراق بوو ، لۆمەی حکومەتی عێراقی کردووە کە رێگەی سزادانی دژی شێخ گرتۆتەبەر . بپێی قسەی ئەو :" سەرۆکێکی دیکەی کورد هەبوو کە ئەوەندە بەهێزبوو دەیتوانی حکومەتی عێراق زیاتر بشڵەژێنێت ، ئەویش شێخ ئەحمەدی بارزان بوو . ئەم پیاوە لە تێکڕای سەرۆکە چیاییەکانی ئەو ناوچە دواکەوتووانە خراپتر نەبوو ، هەروەها بەریتانییەکان کە بۆ ماوەی ئەو پازدەساڵەی دوایی لێی بەرپرسیار بوون ، هیچ بیانوویەکیان بەدەستەوە نەبوو تا پەلاماری بدەن . وێڕای ئەوەش ئەو لە سەرەتای زستانی رابردووەوە لە لایەن حکومەتی عێراقەوە پەلامار دراوە ."[25] هاوکات لەگەڵ ئەوەی مێمفۆرد لۆمەی حکومەتی عێراقی کردووە کە دژی شێخ ئەحمەد دەستی بە لەشکرکێشیی کردووە ، رەخنەشی لە حکومەتەکەی خۆی گرتووە بەوەی پەسەندی کردووە هێزی ئاسمانیی پاشایەتیی دژی بارزانییەکان و راپەڕیوانی کورد بەکاربهێنێت[26] .

بەگوێرەی جیاوک ، بڕیاری حکومەتی عێراق بۆ ئەنجامدانی کاری سزادەرانە دژی بارزانییەکان لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە بنیاتنراوە ، کە هیچ یەک لەوانەی ئەو جەختی کردوونەتە سەر بنەمایەکی راست و دروستیان نیە :

١-بارزانییەکان سەرژمێری ساڵانەی مەڕەکانیان رەتکردۆتەوە ، جیاوک ئاماژەی بەوەداوە ، لەکاتێکدا لەسەردەمی عوسمانییدا ، بارزانییەکان بەخشرابوون لەوەی باجی مەڕانە بەشێوەیەکی ساڵانە پێشکەش بکەن . شێخ ئەحمەد بەوە رازیی بوو باج بەو چەشنە بدات کە حکومەتی عێراق داوای دەکات ، ئەو سیستەمەی کە داوای سەرژمێری ساڵانەی مێگەلەکان دەکات و لە هەر سەرێک بڕێک پارە دەسێنێت . جیاوک جەخت لەوە دەکاتەوە کە مەسەلەی سەرژمێریی مەڕەکان تەنیا بیانوویەک بوو بە مەبەستی سزادان و هێرشکردنە سەر بارزانییەکان وروژێنراوە .[27]

٢- نارەزایەتیی بارزانییەکان لەحاست دامەزراندنی بنکەی پۆلیس لەناوچەی بارزاندا . ئەم ئیدیعایەش هەروەها ، بەپێی رای نووسەر ، بەڵگەیەک نیە بیسەلمێنێت . هەروەک پێشتر ئاماژەمان پێدا ، شێخ ئەحمەد سەبارەت بەم پرسە نامەیەکی بۆ مەلیک فەیسەڵ

---

[25] Mumford,112.

[26] Ibid.

[27] جیاوک ، ماساة بارزان المظلومة ، ١٣٨

نووسیوه ، جیاوك ئەم بەشەی خوارەوەی لەنامەكە وەرگرتووە تا پشتگیریی بۆچوونەكەی خۆی بكات :

" ئەگەر مەسەلەكە {بنیاتنانی ئەو بنكانەی پۆلیس} بریتییە لە پاراستنمان دژی پەلامارێكی دەرەكیی ، ئێمە بەڵێن بە حكومەت دەدەین كە بەرگریی لە خاكەكەمان بكەین هەروەك لە رابردوودا بەرگرییمان لێكردووە لەو كاتەدا كە رووسە سزارییەكان خوازیار بوون موسڵ داگیر بكەن . خۆئەگەر مەبەست لە بنیاتنانی ئەو بنكانەش بێزاركردنمانە ، ئەوەیە كە ئێمە بە ئازاوەی دەبینین و ئێمە خۆمان بە وەفادارتر بۆ دەرباری شكۆمەند لە غەیری خۆمان دەزانین . ئێمە چەند دەستێكی نادیار لە پشتی پەردەكەوە دەبینین كە لە هەوڵی ئەوەدان ئێمە لە خاك و ئاوی خۆمان دەركەن و نەستورییەكان (ئاسورییەكان) لە شوێنەكەمان نیشتەجێ بكەن -ئەوەی كە پاشای خاوەن شكۆمان و حكومەتە سەنگینەكەشی پێی رازیی نابێت ."[28]

جیاوك دەڵێت ، وێڕای ئەم نامە دڵنیاكەرەوەیە ، حكومەت شێخ ئەحمەدی وەك یاخییەك راگەیاند ، ئەو ئاماژەی بەوە داوە كە بەرچاوترین بەڵگە بۆ وەفاداریی شێخ ئەحمەد لەو وەڵامەیدا دەردەكەوێت كە لە ساڵی ١٩٣٠ دا بۆ شێخ مەحموودی سلێمانی نووسیوە كاتێك ئەوەی دووایییان داوای یارمەتیی دژی حكومەت لێكردبوو ،" شانازییە بۆ من كە ببمە خزمەتكاری مەیتەرەكەت ، بەڵام لە هەمان كاتدا رێگە بەخۆم نادەم دژی عەرەبە موسوڵمانەكان بجەنگم"[29] ، بەڵام میریی ، وەك جیاوك دەڵێت ، بیستنی داوا و هاوارەكانی شێخی رەتكردەوە و پێی لەسەر ملكەچكردنی دادەگرت ، ئەوەی شێخ ئامادە نەبوو بیكات .[30]

---

[28] هەمان سەرچاوە .١٣٨-١٣٩

[29] هەمان سەرچاوە بریفكانییش هەمان چیرۆكی لە شێخ ئەحمەد گێڕاوەتەوە بێ ئەوەی ناوی شێخ مەحموود بهێنێت بەگوێرەی ئەو ، لایەنگەلێكی دیارییكراو داوایان لە شێخ كردووە كە چەك دژی میریی هەڵگرێت وەڵامی دەستبەجێ و توندی شێخ بریتیبووە لە :" هیچ كات راپەڕینێك ، جوڵانەوەیەك و پێكدادانێكم دژی دەوڵەتی عێراق نەكردووە و نایكەم چونكە دەوڵەتێكی عەرەبی موسوڵمانە و ملكەچكردنیش بۆ ئەو دەوڵەتە ئەركێكی ئیسلامییە چونكە خوای گەورە گوتویەتی :واطیعوا الله ورسوله و اولی الامر منكم " البریفكانی ، حقیقة الطریقة النقشبندیة البارزانیة ، ٤٠

[30] جیاوك ، ماساة بارزان المظلومة ، ١٣٩

٣- جەربەیی و ئاژاوەنانەوەی بارزانییەکان ، جیاوك ئەو تۆمەتەشی بەرپەرچداوەتەوە ، جەخت دەکاتەوە لەوەی کە پێداگریی بەریتانیی لەسەر نیشتەجێکردنی ئاسورییەکان لە دەوروبەری ناوچەی بارزاندا بەرپرسی یەکەمی بێزاریی بارزانییەکانە ، ئۆباڵی پەلاماری بارزانییەکان بۆ ئەو ئاسورییانەی بەشێوەیەکی ناڕەوا هاتبوونە ناوچەی بارزان لە ئەستۆی بەریتانییەکانە ، ئەو دەڵێت ، چونکە تێکڕای ئەوانە ئاکامی ڕاستەوخۆی چالاکیی بەریتانیی بوون"[٣١]

٤- شکایەتی شێخ رەشید دژی بارزانییەکان . شکایەتی شێخ رەشیدی برادۆست ڕێبەری تەریقەتی نەقشبەندیی دژی بارزانییەکان وەك بیانوویەك بۆ سزادانی شێخ ئەحمەد بەکار هێنرا ، بە پێی بۆچوونی جیاوك ، شێخ رەشید یەك لە دژوارترین دوژمنەکانی شێخی بارزان بوو ، لە ئەنجامی ئەو پێکدادانە چەندبارەوەبووانەی کە لەنێوان هەردوولادا بەهۆی مەسەلەکانی شێخایەتیی و موریدگیریی و ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە تەریقەتەکەوە هەیە ، روویان دەدا .[٣٢]

٥- بیروبڕوا و ئاکاری لادەرانەی بارزانییەکان . جیاوك دەڵێت ، میریی بارزانییەکانی بە لادان لە ئایین تۆمەتبار دەکرد . بە بۆچوونی جیاوك ، ژمارەیەك لە شێخە ئاژاوەگێڕەکان میرییان هاندا ، ئەوانەی کە چاویان بەرایی نەدەهات ئەو هەموو موریدە ببینن کە بە شێخی بارزانەوە پەیوەست بوون "[٣٣]

## ئۆپەراسیۆنی سەربازیی دژی بارزانییەکان

ڕاگەیاندنی فەرمیی حکومەتی عێراق ، کە لە نۆڤەمبەری ١٩٣١دا بڵاوکرایەوە ، دەستپێکردنی هەڵمەتی سزادان و تەمێکارانەی دژی شێخ ئەحمەدی بارزان ڕاگەیاند ،[٣٤] تێیدا هاتبوو کە شێخ لە پەلامارێکی کاولکارانەدا کوشتوبڕی گەیاندۆتە ژمارەیەك گوندی ئاشتییخواز و بێدیفاع . هەروەها ئاماژەی بەو پێکدادانە دابوو کە لە ٩ی

---

[11] هەمان سەرچاوە، ١٤٠

[12] هەمان سەرچاوە

[13] هەمان سەرچاوە

[14] بریفکانیی لە ل ١٤دا بەدرێژیی باسی لە شەڕەکان و ناوی فەرماندە و یەکە سەربازییە بەشداربووەکانی کردووە.

ئۆقەمبەردا لەنێوان میریی و هێزی راپەڕیوەکاندا روویدا بوو ، قوربانییەکانی هەردوولای تۆمار کردبوو ، راگەیاندنەکە بە چەشنێکی متمانە نامێز کۆتایی هاتبوو ، گوتبووی کە حکومەت هەنگاوی کاریگەری ناوە تا سزای پێویست و شایستە بسرەوێنێتە تێکدەرانی هێمنیی و ئارامیی گشتیی .[35]

هێزێکی سوپای عێراق کە لە خزینە نێو قووڵایی ناوچەی راپەڕیوەکانەوە سەرکەوتوو بوو ، لە نزیك گوندەکانی بارزانەوە بەتوندی تێکشکاو تەنیا کاتێك لە لەناوچوون رزگاری بوو کە هێزی ئاسمانی پاشایەتیی بەریتانیی فریایان کەوت ، ئاکامی ئەو بۆمبارانە بە ئاشکرا شێخی ترساند کە تا ئەو کاتەش وەفاداری خۆی پیشاندا ، ئەو دیلانەی گرتبوونی بەریدان ، لەناوچەی برادۆستیش کشایەوە ، ئەو ناوچەیەی شانۆی سەرکەوتنی بەو دواییەی بارزانییەکان بوو دژی شێخ رەشید .[36] بەو چەشنە قۆناغی یەکەمی هەڵمەتەکە کۆتاییهات ، زیانێکی بەرچاو ، هاوکات لەگەڵ بارودۆخی زستانێکی سەخت ، هەردوولای ناچار کرد چالاکییە سەربازییەکانیان بوەستێنن .

لەسەرەتای ساڵی ۱۹۳۲دا ، کاتێك یەکەکانی سوپای عێراق سەرلەنوێ بەرەو ناوچەی برادۆست جوڵان ، کۆمیساری باڵای بەریتانیی هۆشیاری دایە شێخ ئەحمەد کە بەرهەڵستیی نەکات . هۆشیارییەکە بەهەند وەرنەگیرا ، ستونێکی سوپا پەلاماردرا زیانی قورسی بەرکەوت کە بووە هۆی شکستی دووەم . جارێکی دی داوا لە هێزی ئاسمانی پاشایەتیی کرایەوە کە دەست وەرداتە مەسەلەکەوە ، راپەڕیوەکان بە توندی کەوتنە بەر بۆمبارانێکی توند و بە زوویی پەرتەوازە بوون . ستونێکی عێراقیی لەژێر چەتری هێزە هەواییەکاندا بەرەو وڵاتی بارزان پێشڕەوییان کرد و گوندەکانی بارزان و دەوروبەریان گرت . ئەو پەرەسەندنە ئاگربەستی بەدوادا هات کە تێیدا شێخ ئەحمەد فڕۆکەوانێکی دیلی ئازاد کرد ، بەڵام هەوڵەکان بۆ گەیشتنە چارەسەرێکی ئاشتییخوازانە بێبەر بوو .[37]

ئۆپەراسیۆنەکان دەستیانپێکردەوە ، بارزانییەکان لە ئاسمانەوە کەوتنە بەر

---

[35] جیاوك ئەم بڵاوکراوەی وەرگرتووە بەلیستی قوربانییەکانەوە وەرگرتووە بەگوێرەی ئەو ، ئەو بیستوسێ کوژراو بریندارەی هێزەکانی میریی و شەش کوژراوەکەی راپەڕیوەکان هەڵەیە و بەهۆی مەزەندەوە کراوە ئەو وادەبینێت کە بارزانییەکان تەنیا یەك قوربانییان هەبووە جیاوك ، ماساة بارزان المظلومة ، ۱٤٣-٤٤

[36] Longrigg. Iraq (1900-1950),195; Cf.Mumford,112.

[37] Longrigg. Iraq (1900-1950),195; Cf.Mumford,112.

پەلامارێکی دڕندانە ، ژمارەیەکی زۆری موریدەکانی شێخ کوژران و زۆربەی جێگەکانی داگیرکران . ئەو بۆمبە هێشوویيانەی کە فڕۆکە بەریتانییەکان بەریاندەدانەوە و دواتر لەکاتی جیاجیادا دەتەقینەوە ، حاڵو باڵی بارزانییەکانی گران کردبوو ، گەر مەحاڵ نەبێت ، ئەوانە نەیاندەتوانی پشتگیریی لە گوندە چۆڵکراوەکان بەدەستبێنن .[38] ژمارەی هێزەکانی کەمبوونەوە ، توانایان سنووردارکرا . پێویستیی و نازووخەش لەدەست چوو . بەوەش شێخ بە ئاشکرا کەوتە قۆناغی دوا هەناسە . لەهاوینی ساڵی ۱۹۳۲دا ، لەناکاو وازی لە شەڕی نابەرابەر هێنا و پەنای بۆ تورکیا برد .[39] خۆی دا بەدەست پاسەوانی سنووری تورکەوە و دەستبەجێ لەگەڵ براکەی و خێزانەکانیان گواسترانەوە بۆ ئەدرنە (ئەدریانۆپوڵ) لە تورکیای ئەورووپیی . لەوێ هێڵرایەوە تا ئامادەکاریی کرا بۆ ئەوەی بۆ عێراقیان بگێڕنەوە . وەك ئەلبریفکانی دەڵێت ، تورکان پێ بەپێی مۆرکردنی ڕێکەوتنێکی نێوان هەردوو وڵات ، بارزانییان رادەستی دەسەڵاتدارانی عێراق کردەوە .[40] هەرچەندە ، چاکترە ئاماژەی بۆ بکرێت ، تورکان ئەو کارەیان کرد پاش ئەوەی ئەوەیان زامنکرد کە شێخ و براکەی و موریدەکانی پەرتەوازە بکرێن .[41] راستەوخۆ پاش ئەوەی گەیشتنەوە عێراق ، شێخ ئەحمەد و مەلامستەفای برای یەکەمجار بۆ ناسرییە لە فوراتی خوارەوە دوورخرانەوە و پاشتر بۆ سلێمانی لە باشووری کوردستانی عێراق گواسترانەوە .[42]

لەو دەمەدا کە ڕاپەڕینی بارزانیی ساڵی ۱۹۳۱-۱۹۳۲ کۆتاییهات ، خوێنێکی زۆر ڕژا و پارەیەکی زۆریش بەفیڕۆچوو ، ناوچەی بارزان کە شانۆی پەلامار و لەشکرکێشییە سەربازییەکان بوو ، وێرانکرا و دانیشتووانەکەشی ئاوارە بوون ، بەزێدەکردنی نەهامەتیی و چارەرەشیی نوێ بۆ ئەو بارە ناهەموارەی پێشتر هەبوو ، راپەڕینەکە ئاڵۆزییەکی توندی لە پەیوەندییەکانی کوردو عەرەبدا هێنایەوە کایەوە . لەوانەیە زیانبەخشترین ئاکام کە شوێنێکی بەدی بێنەژماری لەسەر شان و شکۆی میریی دانابێت ، ئەو راستییە کە چەند سەد کەسێك چەکدار بە چەکی ساکار دەتوانن زیاتر لە

---

[38] بۆ لێدوانەکەی سێر ویلسن و سێر رۆبەرت برۆك پۆمقام بڕوانە : Mumford,116-17.

[39] Longrigg. Iraq (1900-1950),195;Cf.Mumford,112-13.

[40] Ibid.

[41] وەرگیراوە لە :اردلان ، ٣

[42] هەمان سەرچاوە

جارێك سوپای نیزامیی ببەزێنن ، ئەوەی میریی ناچارکرد داوای هاوکاریی لە هێزی ماندات بکات ، ئەو پەرەسەندنەی کە زۆر مانا و هێمای جیاوازی لەخۆدەگرت . هیدی گومانێك سەبارەت بە توانای حکومەت نەمابوو کە لەو کاتەدا خاوەنی نەبوو . لاوازیی تەواو و رادەی پشتبەستنی بە هاوکاریی بێگانە بۆ هەمووان ئاشکرا بوو . ئەوانەی لەمیری گۆڵەمزنانەوە بوون لە ئایندەدا ، دەگونجێت ئەو پرسیارەیان لادروست بووبێت : هەڵگیرساندنی هەر راپەڕینێك لە ئایندەدا دژی حکومەتی عێراق ، پاش ئەوەی هێزی ماندێتی لە وڵات پاشەکشە دەکات ، پێویستی بە هیچ ترس و دوودڵییەك هەیە ؟

## ئاڵۆزیی زیاتر لەناوچەی بارزان ١٩٣٤-١٩٣٥

لەسـاڵی ١٩٣٤ و ١٩٣٥دا ، هێزێکـی گـەورەی بارزانییـەکان بەسـەرکردایەتیی خەلیل خۆشەویی لەو ناارامییە بەرپرسیار بوون کە لـە کوردستانی عێراقدا تـەنیبووەوە . دانانی ئـەم ناارامییـە وەك دوا تروسـکەی راپەڕینەکـەی بارزانیی تـەواو ئاشکرا نیـە ، لۆنگریك وەك پەرەسـەندنێکی جیـا مامەڵـەی لەگەڵدا کردووە کە هـیچ پەیوەندییـەکی بـە راپەڕینەکەی بەو دواییەی شێخ ئەحمەدەوە نەبێت :" ئـەم تاقمـە" لۆنگرێك سەبارەت بـە خۆشەویی دەڵێـت :" بـۆ ماوەیـەکی زۆر بەرسـنگی ئۆپەراسـیۆنی هاوبەشـی عێـراق و تورکەکانیان گرتبوو ، ئەمبەر و ئەوسەری سنوورەکانیان دەکرد لەم دۆڵ بۆ ئەو دۆڵ ئـەو گوندانـەیان وێرانـدەکرد کـە هـەواڵیان لێـدەدان . دواتـر لـە سـاڵی ١٩٣٥دا زۆربـەی شوێنکەوتەکانی دەستبەسەرکران ، دەستەیەکیان لێهەڵواسین ، خۆشیان کوشت ، کاتێك لەناوەراسـتی زسـتاندا گرتیـان و لـە مـارتی ١٩٣٦دا تیرەبارانیـان کـرد .[43] ئـەلبریفکانی جەخت لەو دەکاتەوە کە ئەم راپەڕینەی دوایی درێژەپێدەری راپەڕینەکەی شێخ ئەحمەد بووە لەژێر سەرکردایەتییەکی نوێدا ، ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە هێزەکانی راپـەڕیوان ، کە لەلایەن مامی دایکی شێخ ئەحمەد (ئاڵوبەگ) و هەروەها خۆشەرییەوە بە هاوبەشیی سـەرکردایەتیی دەکـران لـە جـەنگاوەرە دێوانـەکان ، موریـدە پـەیڕەوەکانی شـێخ ، پێکهاتبوون . ئەلبریفکانی ئاماژەی بەوەداوە کە ئامانجی راپەڕینەکە تـەواو ئاشکرابووە ،

---

[43] Longrigg. Iraq (1900-1950),243.

ئەوەی وا دەردەکەوێت پاش ساڵێك شەڕکردن هاتبێتە دی . وەك ئەو دەڵێت ، کاتێك میریی داوای لە ئالۆ بەگ کرد پەلامارەکانی بوەستێنێت . ئەو بە دوو مەرج ئامادەیی خۆی پێشاندا ١:خۆی و هاوەڵەکانی ڕێگەیان پێبدرێت بگەڕێنەوە بارزان و نیشتەجێبن ٢:حکومەت شێخ ئەحمەد و هاوەڵەکانی کە لە ناسرییە دوورخراونەتەوە بەربدات . میریی مەرجی یەکەمی پەسەند کرد و بڕیاریدا مەرجی دووەمیش جێبەجێ بکات . ئالۆبەگ و هاوەڵانی ڕێگەیان پێدرا لە بارزان بژین ، شێخ ئەحمەد و مەلامستەفاش گوێزرانەوە بۆ سلێمانی . ئەم پێکهاتنە ، وەك ئەلبریفکانی دەڵێت ، کۆتایی بە ڕاپەڕینی بارزانیی ساڵی ١٩٣١-٣٢ هێنا .[44] سەبارەت بە چارەنووسی خەلیل خۆشەویی ، ئەلبریفکانی هیچی نەگوتووە .

[44] البريفكاني . حقيقة الطريقة النقشبندية البارزانية ،١٢٢-١٢

# بەشی چواردەیەم : راپەڕینی بارزان بە ڕێبەریی مەلامستەفا (١٩٤٣-١٩٤٥) و پەرەسەندنی ڕێکخراوە سیاسییە کوردییەکان

## هەڵاتنی مەلامستەفا

لەهاوینی ساڵی ١٩٤٧دا ، مەلامستەفا ، برای شێخ ئەحمەد لە سلێمانی هەڵات و توانی سەرکەوتووانە ئەو ڕێگە سەختانە تێپەڕێنێت کە لەنێو دەوڵەتی ئێراندا (فارسی پێشوو) بوون و خۆی بگەیێنێتە ناوچەی بارزان . وادەردەکەوێت هەڵاتنەکەی مەلا بەباشی پلانی بۆ دارێژرابێت . بەپێی سەرچاوەیەك ، ئەو لە هەڵاتنەکەیدا لەلایەن شێخ لەتیفی بەرزنجیی ، کوڕی شێخ مەحموودەوە هاوکاریی کراوە .[1] دەگوترێت مەلامستەفا هاوکاریی لە ژمارەیەك لەو شوێنکەوتووانەی خۆی وەرگرتووە کە لەنێو خێڵەکانی مەنگوڕ و مامشدا لە ناوچە سنوورییەکانی عێراق–ئێران نیشتەجێبوون .[2] گەیشتنەوەی ئەو بۆ نێو خێڵەکەی لە بارزان سەرەتای دەستپێکردنی چەندین ڕووداوی بەرچاوە کە زۆری نەخایاند بە ئاراستەی پێکدادانی چەکداریی لەگەڵ هێزەکانی میرییدا پەرەیسەند .

سەبارەت بە هەڵاتنی مەلامستەفا لە سلێمانی کە لەماوەی حەوت ساڵی رابردوو لەوێ لەسایەی نیشتەجێکردنی بەزۆردا دەژیا، چەندین هۆکار دەخرێنە بەرچاو.ژمارەیەك نووسەر جەختیان لەسەر گرفت و ناهەمواریی گوزەران و باری دارایی کردۆتەوە . وادەردەکەوێت ئەو بڕەخۆراکە کەمەی لەلایەن میرییەوە دەیاندرایە لانی کەمی بژێوی سەرانی بارزانیی و خێزانە دوورخراوەکانیان و شوێنکەوتەکانیانی دابین نەدەکرد .[3]

---

[1] Rambout,72.Cf.Nikintine,Les Kurdes,201.

بەگوێرەی جیاوك هەڵاتنی مەلامستەفا لەلایەن شێخێکی تایبەتەوە ئامادەکراوە کە ناوی نەهێناوە . هەروەها مەلامستەفا سێ موریدیشی لەگەڵ خۆی بردووە بەگوێرەی بریفکانیی . مەلامستەفا بە شێوەیەکی نەناسراو و لەبەرگی مەلایەکدا هەڵاتووە . جیاوك ، ماساة بارزان المظلومة ،١٥٣-٥٤.. البریفکانی . حقیقة الطریقة النقشبندیة البارزانیة ،١٧. هەروەها بڕوانە : [1] اردلان . اسرار بارزان ، ٤ .، پسیان نجفقولی ، مرگ بود بازگشت هم بود ،٣١..

Longrigg, Iraq (1900-1950),324-25.

[2] البریفکاني،٢٧

[3] جیاوك ،١٥٤; Longrigg, Iraq (1900-1950),324-25; بەگوێرەی بریفکانی ، شێخ ئەحمەدی براگەورەی

وادەردەکەوێت دەسەڵاتدارانی ناوچەیی ، کە سەرۆکەکەی متەسەریفی کورد (شێخ مستەفای قەرەداغی) بوو ، سیاسەتی هەراسانکردنی لەحاست سەرانی بارزانیی گرتبێتە بەر .

نووسەر کورد مەعروف جیاوك جەخت لەوە دەکاتەوە کە رێگە لە خەڵکی هاوسۆزی سلێمانی گیراوە هاوکارییە داراییەکانیان بە سەرانی بارزانیی بگەیەنن . ئەو باس لەوە دەکات لە میانەی دیدەنییەکدا کە لەگەڵ شێخ ئەحمەد ، ئەو رێبەرە بارزانییە بە توندیی و بێزاریی لەو بارە ناهەموار و نەهامەتییە دووا کە بە دەستیەوە دەناڵێنن ، بەهۆی بڕی کەمی هاوکاریی و هەڵوێستی نالەباری میریی . شێخ ئەحمەد ئاشکرای کرد و گوتی:" ئەوە راستە کە کاپتن لاین ،[4] سەرۆکی پشکنەرە کارگێڕییەکان لە باکوور ، بێتە کنم و سەردانم بکات و پارە بخاتە ژێر بەرەکەم ، لەکاتێکدا شێخ (مستەفا) ی قەرەداغیی رێگە بەخەڵکی نەدات یارمەتیمان بدەن و بەبێ هۆ و نابەو چەشنە توندوتیژییە مامەڵەمان لەتەکدا بکات؟"[5]

بەپێی جیاوك ، شێخ ئەحمەد تاکو هەڵاتنی مەلامستەفا هیچ زانیارییەکەی سەبارەت بەمەبەستی هەڵاتنی ناوبراو نەبووە . هەرچەندە شێخ ئەحمەد لەو بڕوایەدا بووە دووشت هاندەری مەلامستەفا بوون لە سلێمانی هەڵاتبێت ، یەکەمیان هەرچییەکی هەبوو خورابوو و پارەیەکی بەدەستەوە نەمابوو ،[6] هەروەها ئەو سووکایەتییەی بە کەسایەتیی

---

مەلامستەفا و رێبەری رۆحیی بارزانییەکان مانگانە لەلایەن حکومەتەوە بیست‌وپێنج دیناری بۆ بڕابووەوە کە لەو کاتەدا بەرامبەر بە سەد دۆلاربوو، لەکاتێکدا مەلامستەفا دوازدە دیناری بۆ بڕابووەوە . داوای چەندبارەوەبووی مەلامستەفا بووەهۆی زیادکردنی تەنیا دوو دینار بۆسەر مانگانەکەی .البریفکانی، ١٠٢١

[4] ئاماژەکردنەکە بۆ (کۆلۆنێل دەبلیو ئەی لاین)ی ئەفسەری بەریتانییە لە عێراق .

[5] جیاوك باس لەوە دەکات کە پاش ئەوەی ئەم قسەیەی بیستووە ، بە شێخی گوتووە کە کۆلۆنێل لاین ئەوەی بۆ رۆڵێتیی کردووە ئەك بۆ دۆستایەتیی ، هەروەها چاوەڕێی ئەوەی دەکرد شێخ پتر لەو بارەیەوە بدوێت . جیاوك دواتر بە شێخی راگەیاند کە هۆکاری راستەقینەی دۆستایەتیی لاین مەسەلەی هەڵاتنی مەلامستەفایە بۆ ناوچەی بارزان .جیاوك باسی ئەوەی نەکردووە سەرنجی شێخ ئەحمەد لەو رووەوە چی بووە

[6] واپێدەچێت مەلامستەفا ئەوەندە پێویستی بە خەرجی بووبێت کە ناچار بێت لیرەی سەروبەستی ژنەکەی بۆ بژێوی بەکاربهێنێت چەند رۆژێك پێش هەڵاتنەکەی . داوای لە ژنەکەی کردبوو لیرەیەکی بۆ لێبکاتەوە . ئەویش بێ‌ئەوەی هیچ بڵێت سەروبەستەکەی خستبووە بەردەستی کە دوو ناڵی ئەسپی پێوە لکاندبوو جیاوك دەڵێت ژنانی

کرابوو .[٧] راستیی ئەم بۆچوونانە هەرچییەک بن ، ئەوە گرنگە کە ئەو نووسەرە بەرچاوەی کورد برەوی پێداوە . باس لەوە دەکرێت کە مەلامستەفا پێش هەڵاتنەکەی پەیوەندیی بە رێکخراوە نەتەوەییە کوردییەکانەوە هەبووبێت .[٨] گەر راست بێت ، لەوانەیە ئەمە لە گرنگترین هۆیەکانی هەڵاتنی بێت .

## کێشمەکێشی مەلامستەفا لەگەڵ حکومەتی عێراق

هەر ئەوەندە مەلامستەفا گەیشتەوە وڵاتی بارزان ، دەگوترێت کە داوای لە حکومەتی عێراق کردووە بریاری لێبوردن بۆ بارزانییە دوورخراوەکان دەربکات و هاوکاریی ئابووریش بگەیێنێتە خەڵکی بارزان .[٩] گومانی تێدا نیە کە هەلومەرجی ئابووریی ئەو ناوچەیە تا رادەی نائومێدیی ناهەموار بوو . لەوکاتەدا دەنگۆیەک هەبوو ، پاشتر راست دەرچوو ، کە پەتای برسێتی لەوڵاتی بارزاندا بڵاوبووەتەوە ، تا ئەو ئاستەی خەڵک لەبەر بێدانەوێڵەیی پەنا بۆ خواردنی بەڕوو دەبەن.[١٠]

وەڵامی میریی ئەوە بوو داوایکرد مەلامستەفا خۆی بەدەستەوە بدات و هەروەها فەرمانی بە هێزەکانی پۆلیس دا بەدوایدا بگەڕێن و بیگرن .ئەو وەفاداریی بۆ میریی راگەیاند ، بەڵام هەر لەسەر جێبەجێکردنی داواکارییەکانی خۆی سوور بوو . کاتێک وەڵامێکی ئەوتۆی لە میرییەوە چنگ نەکەوت خواستەکانی بهێنێتەدی ، تورە بوو ،

---

کورد پارەی زێڕو زیو بە سەروبەستەکانیان دەبەستن و بەوە کێشی گران دەکەن ، ئەگەر ئەو پارانەیان لێکردەوە شتێکی کەی پێوە دەکەن کە هەمان سەنگی هەبێت .

[7] بەگوێرەی شێخ ئەحمەد ، مەلامستەفا لەلایەن شەلاتییەکی خۆماڵییەوە و لە گەرمارێکی گشتییدا بەهاندانی فەرماندار زللەیەکی لێ دراوە ، پاشتر مەلامستەفا ئەو رووداوەی گەیاندووەتە دەسەڵاتداران ،هیچیان وەڵام نەداوەتەوە .

[8] اردلان ،٤٠

[9] البریفكاني، ١٧-١٨

[10] ماوەیەکی کەم پاش ئەم رووداوانە ، راستیی ئەم دەنگۆیانەم بۆ دەرکەوت ئەو کاتە وەک چاودێری ناوخەی هەرێمەکانی باکوور نێردرام بۆ بارزان بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەیەک لە بارودۆخی ئابووریی ناوچەکە بکەم

Elphinston,"The Kurdish Question,"99.

بڕیاری ڕاپەڕینی چەکداریی دا .[١١]

## پەلاماری مەلامستەفا بۆسەر بنکەکانی پۆلیس

هێرشەکانی ئەو سەرکردە کوردە بە پەلامارەکانی بۆسەر بنکەکانی پۆلیس دەستپێکرد و سەرکەوتووانە دەستی بەسەر بنکەکانی پۆلیس لە شانەدە و خێزۆك دا گرت . ئەم سەرکەوتنانە ، وێڕای ئەوەی پلەوپایەی ئەو بەهێزتر کرد ، بووە هۆی ئەوەی بڕێکی زۆر چەك و تەقەمەنیی پێویستیشی دەستکەوێت و ژمارەی چەکدارەکانیشی بەخێرایی زێدەتر بن .[١٢] پەلێك لە پۆلیسی بزۆز نێردرایە گیانی ، بەڵام شکستیانخوارد و بەزین .

مەلا لە پەلاماردانی بنکەکانی پۆلیس بەردەوام بوو تا ژمارەیەکی زۆری لێگرتن . ئەو هیچ بایەخێکی بەو نامانە نەدا کە لەلایەن نوری سەعیدی سەرۆك وەزیرانەوە ئاراستەی کرابوو و تێیدا داوای لێکردبوو خۆی بەدەستەوە بدات . نامەکە بەهۆی شێخ ئەحمەدەوە نێردرا بوو کە تا ئەو کاتە لە سلێمانی دەستبەسەر بوو .[١٣] ستونێکی سوپای عێراق دژی هێزە ڕاپەڕیوەکان نێردرا بێئەوەی بتوانێت ئامانجەکەی بپێکێت . میریی هەوڵیدا گفتوگۆ لەگەڵ مەلامستەفادا بکات و ئەوەی خستە بەردەم کە مەلا یا بەرەو ئێران بڕوات یاخود بڕواتە ناوچەی پشدەری سەر بە لیوای سلێمانی لەوێ بژی ، بەڵام ئەو پێشنیازەکەی میریی ڕەتکردەوە و سەرلەنوێ داوای مافەکانی کوردی کرد .[١٤] ئینجا مەلامستەفا ئاگادارییەکی توندی لە لایەن باڵیۆزخانەی بەریتانیاوە پێگەیشت فەرمانیان پێدابوو هێرش و چالاکییەکانی خۆی ڕاگرێت و دەستبەجێ لەگەڵ حکومەتی عێراقدا

---

[11] بەگوێرەی لۆنگریك ، مەلامستەفا لەگەڵ هێزەکانی سەعید بیرۆخی کەوتبوو کە کوردێکی چەتەی تورکیا بوو لەکاتێکدا سەعید لەلایەن دەستەیەکی هێزەکانی تورکەوە گیرا ، مەلامستەفا هێزو دەسەڵاتی پەیداکرد

Longrigg, Iraq (1900-1950),325.

[12] " البريفكاني ، ١٧-١٨.. "Unrest in Kurdistan," Times (London), Apr.11, 1946

[13] Longrigg, Iraq (1900-1950),325.

[14] Ibid.

پێکبێن .[15]

مەلا ، کە تا ئەو کاتە توند بوو ، لەمەڕ هەوڵەکانی بەو دواییەی میریی بۆ هێورکردنەوەی هێمنانەی کێشەکە نارازیی بوو . ئەمێستا نیشانەکانی نەرمیی تێدا دەرکەوتن . لە ٢٥ ی دیسەمبەری ١٩٤٣دا ، نوری سەعید گۆڕانکاریی لە کابینە وەزارییەکەی خۆیدا کرد ، گرنگترین گۆڕانکاریش بریتیبوو لە دانانی ماجیدمستەفا ، کە کوردێکی ناسراو بوو ، وەك وەزیرێکی بێ وەزارەت لێپرسراوی کاروبارەکانی کورد .[16] ئەم هەنگاوە کە هێمایەك بوو بۆ ئاشتەوایی ، هاوکات لەگەڵ فشاری بەردەوامیی بەریتانییەکان ، دواجار سەرۆکی ڕاپەڕیوەکانی هاندا هێرش و پەلامارەکانی ڕاوەستێنێت

مەلامستەفا نە مامەڵەکردنی هەروا ئاسان بوو ، نە بەتەواویش شایەنی لۆمەکردن بوو . ئەو ڕۆڵە نوێ و لەوانەیە چاوەڕواننەکراوە ، هێز و توانایەکی زێدەتری پێببەخشێت وەك لەو هێزەی کە سەرەتا جوڵانەوەکەی پێ دەستپێکردبوو . ئەم پیاوە ، کە پێش چەند مانگێکی کەم تەنیا وەك سواڵکەرێکی بەشمەینەت بوو ، ئەمێستا لە پێشەنگی جوڵانەوەیەکدایە و وەك پاڵەوانێکی گەلەکەی و بەرجەستەکەری کێشەکەیان ڕاوەستاوە .

## خواستەکانی مەلامستەفا

مەلامستەفا ، ئەمێستا وەك کەسێکی بەرزەدەماغ ، دەگوترێت کە چەند خواستێکی خستۆتە بەردەم میریی :

١- دامەزراندنی هەرێمێك لە تەواوی ناوچە کوردییەکان کە لیواکانی کەرکوك ، هەولێر و سلێمانی بگرێتەخۆ ، وێڕای قەزا کوردییەکانی لیوای موسڵ وەك دهۆك ، ئامێدیی ، ئاکرێ ، زاخۆ ، شەنگار و شێخان .[17] هەروەها قەزا مەزنە کوردییەکەی خانەقین لە لیوای

---

[15] پێش ئەوەش ، مەلامستەفا تکای لە باڵیۆزی بەریتانیا کردبوو کە هەوڵبدات لەجیاتی ئەو لەگەڵ حکومەتی عێراقدا وەك نێوەندێك بۆ چارەسەری کێشەکە هەڵسوڕێت هەرچەندە بە تەواویی ئاگادار کرابووەوە کە لەلایەن بەریتانییەکانەوە هیچ هاوکارییەك ناکرێت . جیاوك ، ١٥٦ ،. اردلان، ٦،. البریفکانی ، ١٩

[16] "Unrest in Kurdistan; Longrigg, Iraq (1900-1950),325;١٩ ،جیاوك،١٥٧ ـ اردلان، ٦،. البریفکانی

[17] قەزا کوردییەکانی موسڵ لە لیوایەکی نوێدا بەناوی لیوای دهۆك یەکبخرێن .

دیاله .

٢- دامەزراندنی کارمەندێکی کورد بە پلەی وەزیر لە کابینەدا بۆ ئەوەی ئەو هەرێمە کوردییە تازە دامەزراوە بەڕێوەبەرێت .

٣- بریکارێکی کورد بۆ هەریەك لە وەزارەتەکان دابمەزرێت .[١٨]

٤- دابینکردنی ئۆتۆنۆمیی کوردستان لە بوارەکانی کەلتووریی ، ئابووریی ، کشتوکاڵیی بە فراوانترین شێوەکەی ، جگە لەو کاروبارانەی پەیوەندییان بە سوپا و پۆلیسەوە هەیە .[١٩]

٥- لابردن یاخود گواستنەوەی ئەو کارمەندانەی لەناوچە کوردییەکاندا بە بەرتیلخۆریی یان بە بەدبەکارهێنانی دەسەلات ناسراون .[٢٠]

٦- زمانی کوردیی بکرێت بە زمانێکی فەرمیی .[٢١]

وێڕای سروشتی زێدەڕۆیی ئەم خواستانە ، میریی ویستێکی راستگۆیانەی پێشاندا تا لەگەڵ ئەو سەرکردە بارزانییەدا پێکبێت و هۆیەکانی بێزاریی لە کوردستان لابەرێت . ماجید مستەفا پاش ماوەیەکی کەم لە دامەزراندنی ، بەمەبەستی گفتوگۆکردن لەگەڵ مەلامستەفادا ، بەغدای بەجێهێشت و لە مێرگەسوور دیدەنی کرد . هەردوولا لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە گەیشتنە رێکەوتنێك :

١- شێخ ئەحمەد و تێکڕای ئەو پیاو ، ژن و منداڵە بارزانیانەی لەگەڵی دەستبەسەرن و لە شاری حلەن (پاش ئەوەی لە سلێمانی دوورخرابوونەوە بۆ ئەوێ گواسترابوونەوە) ئازاد بکرێن و رێگەیان بدرێت بۆ بارزان بگەڕێنەوە.

٢- مەلامستەفا بچێتە بەغدا و گوێڕایەڵی خۆی پێشانی میریی بدات .

٣-کارگێڕیی ناوچەی بارزان بدرێتە ئەو کارمەندانەی بەراستگۆیی ، دەستپاکیی و دادپەروەریی ناسراون .

٤-کردنەوەی خوێندنگا و تەختکردنی رێگەوبان و بنیاتنانی بنکەکانی پۆلیس و

---

[18] سێ داواکەی یەکەم لەلایەن پسیان ،٢:٣٢ و جیاوك،١٥٧ .. اردلان، ٦. موە ئاماژەی بۆ کراوە .

[19] اردلان ،٧ ـ پسیان ، ٢:٣٢

[20] جیاوك،١٥٧

[21] هەمان سەرچاوە

تێکڕای ئەو هۆیانەی بۆ چەسپاندنی هێمنیی و ئاسایش و گەشەسەندن پێویستن .[٢٢]

وەزیرە کوردەکە ، پاش ئەوەی لەگەڵ مەلامستەفادا ڕێکەوت ، بەمەبەستی بینینەوەی ڕاستییەکان گەشتێکی بە ناوچە کوردییەکاندا کرد .ئەو لە ئەنجامەتیی ، لابردنی کارمەندە بەدناوەکان ، هەروەها ناردنی بەپەلەی خۆراك بۆ ئەو بارزانیە خێڵەکییە ماندوو و بێنەوایانەی ئەمێستا لەسەر لێواری برسێتیی و قاتوقڕیی ڕاوەستابوون ، کۆڵییەوە .[٢٣] پاش گەڕانەوەی بۆ بەغدا ، ڕاپۆرتێکی گشتیی پێشکەش بە ئەنجومەنی وەزیران کرد . یەکێك لەو شتانەی ماجید مستەفا پێشنیازی کردبوو بریتیبوو لە دانانی ئەفسەری پەیوەندیی لەنێوان میریی و خێڵە کوردییەکاندا .[٢٤] چەندین ئەفسەری کورد لە سوپای عێراقدا دەستنیشان کران تا ئەو ڕۆڵە بگێڕن .

هەڵوێستی ئەنجومەنی وەزیران لەحاست جوڵانەوەی بارزانیی یەکگرتوو نەبوو .دەگوترێت نوری سەعیدی سەرۆك وەزیران لایەنگری سیاسەتێکی نەرمڕەو و ئاشتیخوازانە بووە ، بەڵام ژمارەیەك لە هاوەڵانی کە لە سەرکەوتنەکانی مەلامستەفا و پێداگریی لەسەر خواستەکانی دەسڵەمینەوە ، لایەنگریی سیاسەتی یەکلاییکردنەوەی ئاشکرابوون .[٢٥] ئەم جیاوازیی و دووبەرەییە هێشتا چارەسەر نەکراو بوو کاتێك سەرۆك وەزیران لە ٩ی یەنایەری ١٩٤٤دا عێراقی بەرەو فەلەستین بەجێهێشت .[٢٦]

## بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران

پاش ئەوەی کەمتر لە دوو هەفتە بەسەر سەردانەکەی سەرۆك وەزیراندا تێپەڕی ،

---

[22] هەمان سەرچاوە، ١٥٨-١٥٩ .

[23] " Unrest in Kurdistan; Longrigg. Iraq (1900-1950),325.

[24] لە کۆتاییدا ئەم ئەفسەرە کوردانەی سوپا وەك ئەفسەریی پەیوەندیی دامەزرێنران : ئەمین ڕەواندزیی لە ڕەواندز، عیزەت عەبدولعەزیز لە بلە ، مستەفا خۆشناو لە بارزان ، میرحاج ئەحمەد لە عەقرە ، ماجید عەلی لە ئامێدیی ، سەید عەزیز سەید عەبدوڵڵا لە مێرگەسوور و برادۆست ، هەروەها داود عارف لە پشدەر .
اردلان ، ٧ـ البریفکانی ، ١٩ ـ جیاوك ، ١٥٧

[25] Longrigg. Iraq (1900-1950),327; جیاوك ، ١٥٦

[26] سەرۆك وەزیران تا ٧ی فێبرایەری ١٩٤٤ نەگەڕایەوە بۆ عێراق جیاوك ، ١٥٩.

ئەنجومەن هەوڵێکی دیاری دا تا کێشەی بارزانیی و تێکڕای ئەو گرفتانەی لەو کێشەیەوە سەرچاوەیان گرتبوو یەکلایی بکاتەوە .[٢٧] لە ٢٥ ی یەنایەری ١٩٤٤دا ، ئەنجومەنی وەزیران لە کۆبوونەوەیەکدا کە (تۆفیق ئەلسویدی) ی جێگری سەرۆك وەزیران سەرۆکایەتیی کرد گەیشتنە بڕیارێك ، ئەم بڕیارە کە کاردانەوەی دیدوبۆچوونی زاڵی ئەندامانی ئەنجومەن بوو لەم خاڵانەی خوارەوە پێکدەهات :

١- سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی یەکە کارگێڕییەکان لە قەزاکانی زێبار ، ڕەواندز و ئامێدیی ، هەروەها لە ناحییەکانی مێرگەسوور ،شیروان ، مەزن و بارزان ، دامەزراندنی کارمەندانی دەستپاك و لێهاتوو ، هەروەها گەر پێویستی کرد ، سوود وەرگرتن لە ڕاژەی ئەفسەرانی کورد لە سوپادا وەك نوێنەرانی حکومەت و ئەفسەرانی پەیوەندیی .

2- بنیاتنانی بنکەی پۆلیس لەناوچە سنوورییەکانی عێراق و گەیاندنی ڕێگە بۆ ئەو ناوچانە ، هەروەها فراوانکردنی ئەو بنکانەی پۆلیس کە لە دەوروبەری ناوەندی ناحییەکانن .

٣- بنیاتنانی ڕێگەوبان و دامەزراندنی بنکەکانی پۆلیس لە خەلیفان ، رایزان ، ئامێدیی ، بلە ، ئاکرێ ، بارزان ، مێرگەسوور ، شیروان ،مەزن ، دیانا و کانی ڕەش .

٤- دوورخستنەوەی دەستبەجێی مەلامستەفا لەناوچەی بارزان و ناچارکردنی بۆ نیشتەجێبوون لەناوچەی پیران .[2٨]

٥-گێڕانەوەی شێخە دوورخراوەکانی بارزانیی بۆ سەر ماڵوحاڵی خۆیان و پەسەندکردنی چوونی مەلامستەفا بۆ بەغدا تا گوێڕایەڵیی خۆی ڕاگەیەنێت ، لەو کاتە و بەو چەشنەی لە لایەن وەزیری ناوخۆ و وەزیرە کوردە بێ وەزارەتەکەوە دیاریی دەکرێت .

٦-گێڕانەوەی ئەو چەك و کەلەپەلە سەربازییانەی میریی کە لەلایەن مەلامستەفا و شوێنکەوتەکانییەوە دەستیان بەسەردا گیراوە و کارکردنی دەستبەجێ بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە .

---

[٢٧] ئەنجومەن لەوبارەیەوە دوو ڕاپۆرتی لەبەردەستدا بوو ، یەکێکیان لەلایەن ماجید مستەفاوە ئامادەکراوە و ئەوی دیکەیان لەلایەن کۆمیتەیەکی تایبەتەوە کە ئەرکی لێکۆڵینەوەی لە ڕاپەڕینەکەی بارزان پێ سپێردرابوو بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ١٥٩ ، عبدالرزاق الحسنی ، تاریخ الوزارات العراقیة ، ٦:٢٧٤.

[28] واپێدەچێت ئەم خاڵە ئاماژەبێت بۆ زێدی ئەو بەشەی خێڵی پیران کە لەدەشتی بێتوێن لە عێراق دەژین ، زیاتر لەوەی ئاماژەیەك بێت بۆ ئەو بەشەی پیران کە لە ناوچە چیاییەکانی سنووری ئێران دەژین .

٧-رەزامەندیی میریی لەسەر بنەمای ڕاگەیاندنی لێبووردنێکی گشتیی بۆ چەکدارە یاخییبووەکانی بارزانیی جگە لەو ئەفسەرە سەربازیی و کارمەندانەی میریی کە بە یاخییبوونەکەوە پەیوەست بوون ، مێژووی ڕاگەیاندنی ئەو لێبووردنەش دواتر لەلایەن میرییەوە دیاریی بکرێت .

بڕیارەکەی ئەنجومەنی وەزیران سەرکەوتنی دەستەی دژ بە کوردی لە کابینەکەدا بەرجەستەکرد . گرنگییەکەشی لەوەدا بوو کە کاتێك پەسەند کرا نوری سەعید لەوێ نەبوو ، ئەوەی وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا پێکهاتنی بۆ چارەسەری تێکڕای کێشەکە لاپەسەند بوو .

جیاوك ڕەخنەی لەو بڕیارە گرتووە بەوەی بڕیارێکی ژیرانە نیە و بەپەلە دراوە ، هەروەها ژمارەیەك حاڵی هەڵهێنجاوە کە بە بۆچوونی ئەو هەڵەی مەزنی ئەو بڕیارەی حکومەت پێکدێنن :[29]

١-بڕیاری دانانی ئەفسەرانی کوردی سوپای عێراق کە وەك ئەفسەری پەیوەندیی لە ناوچە خێڵەکییە کوردییەکاندا بێ هەڵەیەکی گەورە بوو کە ئاکامی نەخوازراوی لێکەوتەوە ، ئەو پیاوانە بێ هیچ هەڵەیەك کە لەخۆیان ڕوویدابێت ، تێکەڵ بە جوڵانەوەی بارزان کران و پاشتریش لەسەر بەشدارییان لە ڕاپەڕینەکەی بارزاندا لەسێدارەدران .

٢-لەکاتێکدا هەوڵەکان بۆ پێکهاتنەوە لەگەڵ ڕاپەڕیوەکاندا خرابوونە گەڕ ، بڕیاری دوورخستنەوەی دەستبەجێی مەلامستەفا بڕیارێکی سەرەڕۆیانە و لەجێی خۆیدا نەبوو ، ئەو بڕیارەی بێگومان دەبێتە هۆی بێزاریی و بەرهەڵستیی خێڵەکان و بەتوندیی بڕوایانی بەنیازپاکیی میریی لەقدەکرد .

٣-بڕیاری گێڕانەوەی تەواوی چەك و کەوپەلەکانی میریی کە ڕاپەڕیوەکان دەستیان بەسەرداگرتووە بە گشتیی داوایەکی مەحاڵە . وێڕای ئەوەی ڕێبەرانی بارزانیی تێکڕای ئەو چەکانەیان گێڕاوەتەوە کە لە هەلومەرجێکدا لەو کەسانەیان کۆکردۆتەوە کە سەر بۆ دەسەڵات دادەنەوێنن ، زۆربەی ئەو چەك و کەلوپەلانەی دیکە کە کەوتوونەتە دەست خەڵکی لەیاسادەرچوو و چەتە ناتوانرێت بگەڕێنرێتەوە .

٤- دواکەوتنی بڕیاری بەخشینی بارزانییەکان ڕۆڵی هەبوو لە ئاڵۆزبوونی توندی

---

[29] جیاوك ، ١٦٠-١٦١

پەیوەندییەکانی نێوان بارزانییەکان و حکومەتی عێراق تا ئەو کاتەی یاسای پێویست لەو بارەیەوە لە ئەپرێلی ١٩٤٥دا دەرچوو .

٥- بڕیاری لێبووردن ئەو کارمەندە کوردانەی میریی و ئەو ئەفسەرانەی سوپای نەدەگرتەوە کە بە راپەڕینی بارزانەوە پەیوەست بوون هەڵەیەکی مەزن بوو . ئەو پیاوانە بێئومێد رێگەی شەڕی مانەوەمانیان هەڵبژارد وەك ئەوەی خۆبەدەستەوە بدەن و هەڵبواسرێن . سەرباری ئەوەش شێخ ئەحمەد لە هەلومەرجێکی وادا نەبوو پشت لەو پیاوانە بکات و بیانداتەوە دەست میریی .

## هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەی بارزانیی

سەرۆك وەزیران ، پاش ئەوەی لە ٧ی فێبرایەری ١٩٤٤دا گەیشتەوە بەغدا ، لەپێناو هێورکردنەوەی کێشەی بارزانییدا کەوتەوە هەوڵدان . ئەوەش ئەرکێکی ئاسان نەبوو ، بێگومان ئەو چەندە لە خەمی هێورکردنەوەی راپەڕیوە بارزانییەکان و کەمکردنەوەی ترس و دڵەراوکێیاندا بوو ، هێندەش لە خەمی پتەوکردنی دەسەڵات و پلەوپایەی میرییدا بوو .

لەهەمان کاتدا ، وا پێدەچوو کە لەلایەن هەردوولاوە بە ئاراستەی رێکەوتن لەسەر چەند خاڵێك چوونەپێش هەبێت . بڕێك لەو چەك و تەقەمەنییانە کە بارزانییەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو ، بۆ حکومەت گێڕدرایەوە .[٣٠] رێگەی شێخ ئەحمەد درا بگەڕێتەوە سەر ماڵوحاڵی خۆی لە بارزان ، وێڕای ئەندامانی خێزانەکەی و خێزانی ئەو شوێنکەوتانەی کاتی دوورخراوەیی هاوەڵی بوون .[٣١]

## سەردانی مەلامستەفا بۆ بەغدا

لە ٢٢ی فێبرایەری ١٩٤٤دا ، زۆر بەسەر گەڕانەوەی شێخ ئەحمەددا بۆ بارزان تێنەپەڕیبوو ، کە مەلامستەفا بەمەبەستی پێشاندانی گوێڕایەڵییکردنی میریی سەردانی

---

[10] هەمان سەرچاوە ،١٦١ .،الحسني ، ٦:٢٧٥.

[11] سەبارەت بە گەڕانەوەی شێخ بۆ ماڵەکەی بڕوانە : جیاوك ، ١٦٠-١٦١.

بەغدای کرد . وەصی [٣٢] پێشوازیی لە مەلامستەفا کرد کە ژمارەیەك لە سەرکردەی بارزانیی و هەروەها فەتاح بەگی هەرکیی ، [٣٣] سەرۆکی بەرچاوی عەشیرەتی مەزنی کۆچەریی کوردیی لەگەڵدا بوو . لە درێژەی چاوپێکەوتنەکەدا مەلامستەفا داوای لێخۆشبوونی کرد و پێیبەخشرا و وا هاتەبەرچاو کە ئاشتیی لەگەڵ میرییدا بەرقەرار کردووە . [٣٤]

سەردانەکەی مەلامستەفا بۆ بەغدا نەیتوانی هیچ چاکبوونێکی بەردەوامی پەیوەندییەکانی نێوان میریی و بارزانیی بێنێتەدی ، گەر لە راستییدا راژەیەکی فەرمیی بە خراپبوونی تێروانینی هەردوولا بۆ یەکتری نەکردبێت . هەستی کینە و ناحەزیی هەردوولای بەرامبەر یەکتر قوڵکردەوە لەجیاتی ئەوەی لایبەرێت . نەتەوەپەرستە عەرەبەکان بە تەواویی لە دووشت بێزاربوون کە بریتیە لە گەیشتنی سەرکردەی بارزانیی بۆ بەغدا بە هاوەڵی زۆرێك لە دەستوپێوەندەکانی لەسەرخێڵەکان و شوێنکەوتەکانی ، هەروەها لەو پێشوازییە گەرمەی لەلایەن کارمەندانی باڵای حکومەتەوە لێیانکرا . لەوانەیە جێگەی سەرسامیی نەبێت کە دەرکەوتنی ژمارەیەکی زۆری جەنگاوەری پرچەکی کورد لەسەر شەقامەکانی بەغدا چاوەڕێی رووداوی شوومی لێدەکرا . هێندێك ئەوەیان بە هەڕەشە و سووکایەتیی بەدەسەڵاتی دەوڵەت لەقەڵەمدەدا ، هەروەها ئەوە هانی رۆژنامەکانیدا هێرشی توند بکەنە سەر بارزانییەکان ، ئەوەش رای گشتیی وروژاند و رۆیشتنی مەلامستەفای لەبەغدا خێراترکرد . [٣٥]

---

[32] ئەمین عەبدوڵئیلا ، برای عالیەی شاژنی عێراق کرا بە وەصی لە ١٩٣٩دا پاش ئەوەی مەلیك غازی تەمەن ٢٧ساڵان بە رووداوێکی ئۆتۆمۆبێل گیانی لەدەستدا عەبدوڵئیلا تاکو کوڕە چوارساڵانەکەی عالیە گەورە بوو و تاجی نرایە سەر ، فەرمانڕەوایەتیی عێراقی کرد

[33] بۆ گێڕانەوەی سەرنجڕاکێشی دیداری فەتاح ئاغا کە نووسەرێکی شورەویی بە (فەرمانداری فیودال) و وەك جێبەجێکەرێکی چالاکیی ئاراستەکراوی بەریتانییەکان ناوی بردووە بڕوانە :

V.Stepanov ,"A Visit to the Kurds," New Times, Mar.no.25(Jun 15 , 1949).23-24.

لەبیرم دێت لە بەهاری ١٩٤٤دا فەتاح ئاغام لە هەولێر بینی . ناوبراو کابرایەکی بەرێز و چاك بەڵام کەمدوو بوو

[34] جیاوك، ١٦٣

[35] بەگوێرەی جیاوك کارمەندێکی باڵای بەریتانیی کە راژەی حکومەتی عێراقی کردووە پێی گوتووە کە بەلای رای گشتیی بازنەی کارمەندانی بەغداوە مەلامستەفا بە چوونەوەی خێرای بۆ ناوچەکەی خۆی کارێکی باشی کردووە بۆ

بەپێی سەرچاوەیەك ، مەلامستەفا ڕێگەی پێدرابوو بۆ بارزان بگەڕێتەوە لەپێناو ئەو مەبەستە ڕاگەیەنراوەی بریتیە لە کۆکردنەوەی ئەو چەك و کەلوپەلانەی لەلایەن بارزانییەکانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو . لەجیاتی ئەوە ، هەرچەندە ، باسی ئەوەی لێدەکرا کە گەشتێکی فراوانی لە ناوچە کوردییەکانی دەوروبەر بە مەبەستی پتەوکردنی شوێنپێی خۆی لەنێو پیاوماقوڵان و سەرخێڵەکوردەکاندا دەستپێکرد تا پشتگیرییان بۆ کێشەکەی خۆی بەدەستبێنێت .[36]

## پێشنیازەکەی سەرۆك وەزیران

وێڕای ئەو ڕووداوە نەخوازراوانە ، نوری سەعیدی سەرۆك وەزیرانی عێراق لەسەر هەوڵەکانی خۆی بەردەوام بوو بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك کە لەلای هەردوولاوە جێگەی ڕەزامەندیی بێت . ئەو لە مایۆی ١٩٤٤دا سەردانێکی ناوچە کوردییەکانی کرد ،لەکاتێکدا نیشانە و کاری توند و ناهەمواریی لە نێوان کورد و عەرەب ، بەتایبەتیی لە نێو سوپادا ، لەپەرەسەندندا بوو .[37] سەرۆك وەزیران لە هەوڵێکیدا بۆ جێبەجێکردنی هێندێك لە خواستەکانی کورد ڕەزامەندیی خۆی بۆ پێکهێنانی لیوای دهۆك پێشاندا ، بەو پێیە لیوایەکی نوێ لە یەکە بەڕێوەبەرایەتییە کوردییەکانی لیوای موسڵ کە بریتین لە قەزای دهۆك ، زاخۆ ، ئامێدیی ، ئاکرێ ، شەنگار پێکبهێنرێت . ماجید مستەفای وەزیری کوردیش سەرپشك بێت لەوەی کارمەندی کورد لەو لیوا نوێیە کوردییەدا دابمەزرێنێت . نوری هەروەها لەچەند خاڵێکی دیکەدا نەرمیی نواند ، وەك دامەزراندنی جێگرێکی کورد بۆ بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی مەعاریف ، چاککردنی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان لە ناوچە کوردییەکان ، بەخشینی قەرزی کشتوکاڵیی ، سەرلەنوێ پشکنینێکی خاتردارانەی توتنە هەڵگیراوەکان ، کە سەرچاوەیەکی هەمیشەیی ناکۆکیی نێوان میریی و توتنەوانە کوردەکان بوو .[38]

---

ئەوەی خۆی لە پەرەسەندنێکی نەخوازراوی ڕووداوەکان بپارێزێت   هەمان سەرچاوە ، ١٦٥.

[36] الحسني ، ٦:٢٧٥.

[37] Longrigg. Iraq (1900-1950),198

[38] Ibid.

هەرچەندە سەرۆك وەزیران لە بەدەستهێنانی پشتگیریی هاوەڵانی شكستیخوارد ، هەروەها بیرۆكەی پێشنیازكراوی لیوای دهۆك لەلایەن وەصیەوە قبووڵنەكرا . هەروەك چاوەڕوان دەكرا ، پەرەسەندنی ئەم ڕووداوانە قەیرانیان خستە نێو كابینەی حكومەتەوە ، هەروەها نوری سەعید ناچاركرا كە لە ٣ی ژوونی ١٩٤٤دا دەست لەكاركێشانەوەی خۆی پێشكەش بكات . لەگوتەی چاودێرێكی بەریتانییدا هاتووە :" گیانی دژ بە كورد سەرلەنوێ لەنێو زۆربەی ئەندامانی چینە سیاسییەكانی بەغدا دا بڵاوبووەوە ، ئەو گیانەی هەروەك كاتەكانی دی لەسەر بنەمای ترس لە جیاخوازیی بنیاتنرابوو . لەو ڕاستیەوە كە هەر ئاسانكارییەك لە باكوور ، هەمان خواست یاخود گەورەتری شیعەكانی بەدوادا دێت ، هەروەها لەسەر خولیا و ئارەزوویی كاڵوكرچی خۆپەرستانەی سەركردەكانی كورد ."[39]

## سیاسەتی كابینەی نوێ لەحاست بارزانییەكان

كابینەكەی حەمید پاچەچیی ، كە پاش ئەوەكەی نوری سەعید هات ، سیاسەتەكانی سەرۆك وەزیری دەست لەكاركێشاوەی سەبارەت بەكورد جێبەجێ نەكرد . دژایەتییكردنی ئەو سیاسەتانە بەشێوەیەكی سەرەكیی لەلایەن مستەفا ئەلعومەریی وەزیری ناوخۆ و هەروەها تەحسین عەلی وەزیری بەرگرییەوە بوو ، لەكاتێكدا پاچەچیی سەرۆك وەزیران و ئەرشەد ئەلعومەریی وەزیری دەرەوە سیاسەتەكانی نوری سەعیدیان پێ باش بوو .

لە ژوئێنی ١٩٤٤دا ، ماوەیەكی كەم پاش ئەوەی كابینە نوێیەكە دەسەڵاتی گرتە دەست ، تۆفیق وەهبی وەزیری ئابووریی ، وەك نێردراوێكی نیازپاكیی ڕەوانەی كوردستان كرا . ئەو ڕایگەیاندبوو كە لەنێو بارزانییەكاندا گیانێكی ناحەزی دژبە میریی درك پێكردووە ، ئەو بارزانییانەی كە بەو دواییە هێز وتواناییان لە ڕێگەی ژن و ژنخوازییەوە لەگەڵ ئەیارە سونەتییەكانیدا كە ئاغاكانی زێبارە بەشێوەیەكی مەزن زێدەبووە . ئەو گیانە دژبە میرییەی كە زوو لە ئاكارەكانی مەلامستەفادا ئاشكرابوو .

---

[39] Ibis., 325-26.

ئەوەی لۆنگریك بەشێوەیەکی گونجاو ، بەڵام بوێرانە بەم شێوەیە سەرنجی خۆی دەربڕیبوو " دوای رۆیشتنی وەزیر ، مەلامستەفا تینی دایە خۆی و بۆ دەست بەسەرداگرتنی گەنجینەکانی دانەوێڵە ، بنکەکانی پۆلیسی تالآن کرد . پەیوەندییەکی ناکامی لەگەڵ متەسەریفی موسڵدا بەڕێوەبرد ، داواشی لە بەغدا کرد کە بەڵێنەکانی نوری پاشا جێبەجێبکەن ." [40] بەهۆی نەمامەتیی باری ئابووریی و نالەباریی ژیانی بارزانییەکان میریی دانەوێڵە و جلوبەرگی لەناوچە نابووتەکاندا دابەشکرد ، هەروەها هەوڵدرا ئاشتییەکی لەق بە درێژایی زستانی ١٩٤٤-١٩٤٥ پایەدار بێت .

لە ١٠ی ئەپرلی ١٩٤٥دا ، پەرلەمانی عێراق دەنگی بۆ بڕیارێکی لێبووردن دا کە تێکڕای یاخییە کوردەکان تا بەرواری ٢٢ی فێبرایەری ١٩٤٤ دەبەخشێت ، جگەلەو ئەفسەرانەی سوپا کە لەراپەڕینەکەی بارزاندا بەشدار بوون . [41] ئەم بڕیارە هێمایەك بوو کە جێگای پێشوازیی و دڵنیابوونەوەی بارزانییەکان بوو ، تا رادەیەکی زۆر گومان و نیگەرانی ئەوانی لەحاست نیازپاکیی میریی رەواندەوە ، مەلامستەفا و وەزیری ناوخۆ لە موسڵ یەکتریان دیت ، بە ئاشکرا هەوڵیاندا چارەسەر بۆ تێکڕای ئەو کێشانەی هێشتا چارەسەر نەکرابوون ، بدۆزنەوە . گەیشتنە هیچ رێکەوتنێك یاخود نا ، نازانرێت ، بەڵام دەردەکەوێت لەسەر خواستی بارزانیی ، قەزای بارزان لە لیوای موسڵ دابڕا و کرایە بەشێك لە لیوای هەولێر . [42] لە هەمان کاتدا ، میریی کە بە هێواشی ، بەڵام راشکاوانە هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنانەی دەدا کە بە بارزانییەکانی دابوو ، خەریك بوو بە ئاراستەی فراوانکردنی بەرنامەی خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتیی دەستبەکار بێت . بەرنامەی خوێندنگا و خەستەخانە نوێیەکان دارێژرا و لەراستییدا کار لەسەر ژمارەیەك لەو پرۆژانە دەستپێکرد . [43]

---

[40] Ibid.

[41] ئەم لێبووردنە ئەو ئەفسەرە کوردانەی سوپای نەگرتەوە کە لە راپەڕینی بارزاندا بەشدارییان کردبوو ، ئەو بڕیارە دواتر بووە گرفتێکی جددیی لە نێوان حکومەت و سەرکردەی بارزانییەکان .الحسني ، ٦:٢٧٥ .

" Unrest in Kurdistan,"5; Longrigg. Iraq (1900-1950),325.

[42] Longrigg. Iraq (1900-1950),327.

[43] " Unrest in Kurdistan,"5.

## تێکچوونی پەیوەندییەکانی بارزانیی و میریی

لەکاتێکدا ، ئەم پەرەسەندنە ئەرێنییانە واپێدەچوو ببێتە زەمینە خۆشکەرێك بۆ چارەسەریی ئاشتییانەی تێکڕای کێشەی بارزان . بەڵام ئەم چارەسەرییە کاریگەرییەکی قووڵی لەبواری کردارییەوە جێنەهێلا . بێگومان ، گومانی هاوبەش بنەمای بڕوا و متمانەی نێوان میریی و مەلامستەفای سنووردارکرد ، ئەوەش لێك تێگەیشتنی بنەڕەتیی و بەردەوامی نێوان هەردوولای کردە کارێکی مەحاڵ . هەر هەوڵێکی میریی ، هەرچەندە شەرعیش بێت بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی خۆی یان جیاوگەکانی تەنیا ڕاژەی بە وروووژاندنی گومانی سەرکردەی بارزانییان ئەکرد . سروشتی ڕۆڵە نوێیەکەی سەرکردەی بارزانیی وایلێکردبوو هەوڵی ئەوەبدات دەستکەوتەکانی خۆی پتەوتر و زیندەتر بکات ، چونکە سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکەی گیانی ڕێبەریی و بەرزەدەماخیی و پاوانخوازییەکەی سەیری لاپێکهێنابوو کە زۆر لەوە زیاتر بوو کە تەنیا خواستی ناوبانگ بێت . میریی لە سەرسەختیی و کەللەشەقی مەلامستەفا دەسڵەمییەوە و لە ئاکامەکانی ترسابوو کە تا دەهات توندتر و بێبەرتر دەهاتە بەرچاو . وادەردەکەوت ئەو تاڵە دەزووەی کە میریی و مەلامستەفای پێکەوە گرێدا بوو لەسایەی کەڵەکەبوونی گرفتە چارەسەرنەکراوەکاندا گەیشتبێتە ڕادەی پچڕانی .

## بێزاریی بارزانیی لە داواکارییەکانی میریی

دەبێت ئەوە وەبیربێنینەوە کە داواکارییە بەردەوامەکانی میریی لە سەرکردەیی بارزانییان سەبارەت بە گێڕانەوەی ئەو چەك و کەلوپەلە سەربازییانەی دەستیان بەسەردا گیرابوو نەگەیشتە ئاکامێکی خوازراو . میریی سەرلەنوێ ئەو داوایەی کردەوە ، سەرکردەی بارزانییان کە ماوەیەك پاش وەستانی شەڕ و پەلامارەکان بڕێك چەك و تەقەمەنیی گەڕاندبووەوە ، جەختی لەوە کردەوە کە ناتوانێت باقی دیکەی چەك و تەقەمەنییەکان بگێڕێتەوە ، چونکە کەوتوونەتە دەستی ڕەگەزە یاسابەزێنەکان و ئەوانەش هەڵاتونەتە ناوچە دووردەست و سەختەکان .

بەهەمان شێوە ، میریی داوای خۆبەدەستەوەدانی ئەو کارمەندە بەڕێوەبەرایەتیی

و ئەفسەرانەی سوپا دەکرد کە بەشدارییان لە راپەڕینەکەی بارزاندا کردبوو و لە پاش وەستاندنی شەڕەکانیش هێشتا ژیانیان لە وڵاتی بارزان دەگوزەراند . جیاکردنەوەی ئەمانە لە بڕیاری بەخشینەکەی ئەپڕلی ١٩٤٥ بەڵگەی ئەوە بوو کە میریی لەم بارەیەوە تەمای هەبوو فشار بکات .

سەرکردەی بارزانییان بەئاشکرا بڕیارییدابوو ئەم خواستە پشتگوێ بخات ، بێگومان هۆی باشیشی بەدەستەوە بوو تا ئەمە بکات ، میریی نەیتوانیبوو ئەوە بێنێتە پێش چاو کە دابی کۆنی خێڵەکەیی ئەوە دەخوازێت هەرکەس داوای پەنا بکات پەنا بدرێت . سەرباری ئەوەش ، میریی ئەو راستییەی فەرامۆش کردبوو کە سەرکردەی بارزانییان بەشێوەیەکی سروشتی حەزناکات ئەو کەسایەتییانە رادەست بکاتەوە ، ئەوانەی بێ ترسی لە گیانی خۆیان لە پرسی کوردەوە ئالابوون . کارێکی غەدر و ناپاکیی بەوشێوەیە کە نەك هەر شەرمەزاریی هەتاهەتایی بۆ شێخانی بارزان دەهێنایە ئارا ، بەڵکو ئەو رۆڵە نوێیەشی کە هەنووکە وەك پاڵەوانێکی نەتەوەیی کوردیی دەیانبینی پووچەڵ و چرووك دەکردەوە .

بەراستیی جێگەی سەرسوڕمانە میریی داوایەکی بەوچەشنە پێشکەش بکات ، چونکە هەرگیز چاوەڕێ نەدەکرا پیاوانێکی بێئومێدی وەك ئەوانە چارەنووسی شوومی خۆیان بزانن و ئامادە بن بێ بەرگریی خۆیان بەدەستەوە بدەن ، تەنانەت گەر شێخی بارزانیش خوازیاربێت داواکەی میریی جێبەجێبکات . لەم بارەشدا ، پێویست دەکات بارزانییان ئەو لایەنگرانەی پێشوویان بەزەبری چەك ملکەچ بکەن و رادەستی میرییان بکەنەوە . هێندێك نووسەری کورد ئەم دوو داواکارییەی میرییان زیاتر وەك بیانوویەك لەقەڵەم داوە کە ئامانجی بێزارکردن و جاڕسکردنی بارزانیی بووە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ لەشەڕ و کێشمەکێشی چەکدارییەوە تێوەیان بگلێنن .[44]

---

[44] وەرگیراوە لە : البريفكاني ، ٢١ .

## هەڵوێستی میریی لەحاست مەلامستەفا

میریی بەنیگەرانییەوە دەیڕوانییە هەڵوێستی مەلامستەفا و پەرەگرتنی هێز و دەسەڵاتی ناوبراو کە کردبویە کەسایەتییەکی دیار لە هەرێمەکەی خۆی و ناوچەکانی دەوروبەریدا . ئەو پێناسەیەی کە دواتر بۆ چالاکییەکانی مەلامستەفا دەکرا ، هەتا گەر زێدەڕۆییەکیشی تێدا بێت ، ئەوە پیشان دەدات کە هێندێك بنەما بۆ ترس و دڵەڕاوکێی میریی هەبوون . بەپێی ڕۆژنامەی (تایمس) ی لەندەنیی :" مەلامستەفا وەك فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ هەڵدەسوڕا . ئەو مافەی بەخۆی دابوو دەست لە ناکۆکیی نێوخۆی عەشیرەتەکان وەردات ، دەستی لە کارگێڕیی میریی و دابەشکردنی کەلوپەلە پێویستەکان وەردەدا ، ژمارەیەك چەکداری لەگەڵ خۆی خستبوو ، بەڵێندەرە بنیاتنەرەکانی دەتۆقاند و کاری دروستکردنی بنکەکانی پۆلیس ، خوێندنگاکان و خستەخانەکانی وەستاند . لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٥ دا هیچ سنوورێك ئەما سەرەڕۆییەکانی نابراو ڕاگرێت و وڵاتی بارزان لەدەرەوەی دەسەڵاتی حکومەتدا بوو ."[٤٥]

هەروەها ئەو سەردانە بەردەوامانەی مەلا بە نێو عەشیرەتەکاندا دەیکرد هۆکارێکی راستەقینەی دڵەڕاوکێی میریی بوو .[٤٦] ئەو سەردانانە کە بە ئاشکرا و بەمەبەستی پتەوکردنی توانا و دەسەڵاتی خۆی ئەنجامی دەدان هەستی نەتەوایەتیی کوردی دەوروژاند و کاریگەرییەکی مەترسییدار و مەزنی لەسەر کورد هەبوو .

پێویستە ئاماژە بۆ ئەو بکرێت کە لەو کاتەدا پەیوەندییەکانی حکومەت بە مەلامستەفاوە بەچەشنی پەیوەندیی دەوڵەتێك بە هاووڵاتییەکی خۆیەوە نەبوو ، گومان لەو ڕاستییەدا نیە کە ئەو توانا و دەسەڵاتێکی زۆری بەهێزی چەك پەیدا کردبوو و وەك سەرکردەی کورد لەقەڵەم دەدرا کە دووەمین کەمینەی ڕەگەزیی مەزنی وڵاتەکە بوون ، ئەوەش ئەو هەستەی لادروست کرد کە خۆی لە پلەیەکی نوێدا ببینێتەوە ، هەرچەندە ، هیچ بنەمایەکی شەرعیی یا دەستووریی نەبوو کە لەلایەن میرییەوە ئەو پلەوپایەیەی پێ ببەخشێت .وێڕای دڵەڕاوکێی میریی ، ئەوەندەش گرنگ نەبوو مەلا چەند بەهێز بوو ،

---

[٤٥] " Unrest in Kurdistan."

[٤٦] البریفکاني ، ٢٠-٢١، جیاوك ، ١٧٠ ، الحسني ، ٢٧٥.

لەکۆتاییدا هەر هاوولاتییەکی دەولەتی عێراق بوو پێویست بوو زوو یا درەنگ دەستبەرداریی هەر دەستکەوتێکی کاتیی بێت کە وەک سەرکردەیەکی یاخیی چنگی خستبوو .

هۆیەکی گرنگی بایەخداری دیکەش هەیە کە بریتیە لەوەی شێخەکانی بارزان بەئاشکرا باوەڕیان بەوە بوو دەتوانن گرەو لەسەر پشتگیریی بەریتانییەکان بکەن ئەو راستییەی بێگومان هەڵوێستیانی لەحاست حکومەتی عێراق توندتر کرد .[47] وێڕای ئەو راستییەی کە بەریتانییەکان و دەسەلاتدارنی عێراق لەگەڵ مەلامستەفا و نوێنەرەکانیدا لە پەیوەندیی بەردەوامدا بوون ، ناکۆکییەکان توندتر دەبوون و هەلومەرجەکەش بە بەردەوامیی ئالۆزتر دەبوو . بەریتانییەکان بەردەوام بوون لە هاندانی ئەو سەرکردە بارزانییە تاسەر بۆ میریی دانەوێنن ، لەکاتێکدا ئەویش بە بەردەوامیی پێی لەسەر جێبەجێکردنی خواستەکانی دادەگرت .[48]

## دەستپێکردنەوەی هێرشەکان و بەزینی مەلامستەفا

ستونێکی سوپای عێراق بەرەو ناوچە چیاییەکانی باکووری عێراق کەوتە جوڵە ، جوڵەیەک کە مەلامستەفا بە نیگەرانییەوە تێیدەڕوانی . بەریتانییەکان بەفەرمیی ئەو سەرکردە کوردەیان ئاگادار کردەوە کە ترسێکی لەو جوڵەیەی سوپا نەبێت و ئەوە تەنیا بەمەبەستی راهێنانی هێزەکانی عێراقە لە مەیدانی جەنگی چیادا .[49] لەو دەمەدا رووداوێکی نەخوازراو قەوما کە بووە هۆکاری دەستپێکردنەوەی پێکدادانەکان . هەوڵێکی هێزەکانی پۆلیس لە مێرگەسوور بۆ چەککردنی ئالۆبەگ ، خاڵی دایکی رێبەرانی بارزانیی و یەک لە سەرخێڵەکانی عەشیرەتی شیروان ، بووە هۆی کوژرانی ئالۆبەگ و یەک لە

---

[47] " Unrest in Kurdistan,"Cf. Longrigg, Iraq (1900-1950).327.

[48] بۆ زیاتر : اردلان ، ٢٧-٣١

[49] ئەم دڵنیاکردنەوانە لەلایەن باڵیۆزی بەرتانیی لە دووتوێی نامەیەکدا کە کاپتن ستۆک لە ٢٥ی مارتی ١٩٤٥دا بە مەلامستەفای دابوو خۆی دەبینێتەوە . وەڵامی مەلامستەفا ئەوە بووە " یان دەمرین یان ئازادیی بەدەستدێنین".هەمان سەرچاوە ، ٢٧

پیاوەکانی ، لەگەڵ چوار پۆلیسدا .[50] کاتێك شێخ ئەحمەد ئەم رووداوەی بیست ، دەگوترێت بریاری رووبەڕوو بوونەوەی چەکداری دا . نامەیەکی ئاراستەی مەلامستەفای برای کرد کە لەو دەمەدا سەرقاڵی گەشتێکی بوو بەنێو خێڵەکانی بادیناندا ، تێیدا بە درێژیی هەواڵی رووداوەکەی مێرگەسووری پێراگەیاند . مەلامستەفا داوای لە ئینگلیزەکان کرد کە رۆڵێکی باش ببینن لە وەستاندنی ئەو شەڕو پێکدادانەی کە لە زۆربەی ناوچەکاندا هەڵگیرسا بوو .[51]

سێ ستونی سوپا لە نزیك بارزان کۆکرانەوە ، لەکاتێکدا ستونێکی پۆلیسیش لە ئامێدییەوە کشا ، هەروەها تورکان بە پەلە سنوورەکانیان داخست . وێڕای ئاستەنگ ، هەر سێ ستونەکە لە هەڵمەتی سەربازیی خۆیان دژی یاخیبووان بەردەوام بوون .بەکارهێنانی جەنگاوەرە خێڵەکییەکان لەلایەن وەزیری ناوخۆوە سەلماندی کە سوودێکی تایبەتیان هەیە . ئەوە وای لە میریی کرد هاوشێوەی ئەو جەنگاوەرە چیاییانە دژی مەلامستەفا بەکاربهێنێت کە ئەو شەڕی میرییان پێدەکات . سەرباری ئەوەش ، هاندانی کورد دژی کورد ، میریی کارێکی کرد کە یەکخستنی زۆرینەی کوردەکان لەلایەن سەرکردەی راپەڕیوەکانەوە بۆ رازەی کێشەکەی مەحاڵ بێت ، ئەوەش گورزێکی وای لێوەشاند کە لەهەر شکستێکی سەربازیی فرە تاڵتر بێت .[52] بەشێکی زۆر لە جەنگاوەرە خێڵەکییەکان دژی مەلامستەفا چوونە سەنگەرەوە ، شایەنی باسە ، بەتایبەتیی ئەو خێڵە هاوسێیانەی " ئامەزرۆی ئەو دەرفەتە بوون تا تۆڵەی رابردوویان بسێنن و ئامادەبوون لەپێناو کارێکی وادا بەرتیلیش بدەن"[53]

لەناوەراستی سێپتەمبەری ١٩٤٥دا ، مەلامستەفا گورزێکی کەمەرشکێنی بەرکەوت کاتێك مەحموودئاغای زێباریی بایدایەوە .[54] مانگێك دواتر لەگشت لایەکەوە گەمارۆ درا ، هەر بۆیە خۆی ئامادەکرد تا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارەکانی لەخاڵی

---

[50] البريفكاني ،٢٢ ـ اردلان ، ٣١

[51] البريفكاني ، ٢٢

[52] Longrigg. Iraq (1900-1950),327.

[53] Ibid.

[54] Times (London). Spt.18, 1945 .

سنووری کێلەشینەوە بخزێنە نێو ئێرانەوە .[55]

## رۆڵی حیزبی هیوا لە راپەڕینەکەی مەلامستەفادا

وادەردەکەوێت حیزبی هیوا ، کە یەکەمجار ساڵی ١٩٣٥ دامەزرێنرا ،[56] سەرلەنوێ بوژابێتەوە و تا پێش راپەڕینەکەی ١٩٤٥ ی مەلامستەفا لە چالاکیی و پشتگیریی خۆی بەردەوام بووبێت . باس لەوەش دەکرێت کە هیوا کۆبوونەوەی خۆی لە بارزان ئەنجامداوە و تێیدا رێبەرەکانی هەڵبژاردووە ، ئەندامانی ناونووس کردووە ، دەنگی بە پەیرەو و ئەساسنامەی خۆی داوە ، ناوی (هیوا) شی بە فەرمی راگەیاندووە . بارزان بەشێوەیەکی کاتیی ببێتە بنکەی سەرکردایەتیی . لەم کۆبوونەوەیەدا دوو بڕیاری گرنگ درا ، یەکەم ئەوە بوو حیزب ئۆتۆنۆمیی بۆ کوردستان رابگەیەنێت ، دووەمیش حیزب بە خۆبەستنەوە بە هیچ یەك لە هێزە بیانییەکان باری شانی خۆی گران نەکات .[57]

کۆمیتەی ئازادیی دامەزرێنرا ، هەروەها ئەم بەرنامەیەی خوارەوەی بۆ خۆی پەسەند کرد[58] :

١- کار بۆ یەکخستنی خێڵەکان بکەن . لەقۆناغی یەکەمی ئەم ئەرکەدا ، هەوڵی یەکخستنی ئەو خێڵانە بدرێت کە لە بارزانەوە نزیکن . بەرنامەی یەکخستنی خێڵەکان بە گەرمیی کاری بۆ بکرێت تا تێکڕای خێڵەکانی کورد دەبنە یەك .

٢- بەرێگەی رامیاریی کوردستان رزگار بکرێت .

٣- لەگەڵ تێکڕای پارتە ئازادیخوازەکاندا پەیوەندیی ببەسترێت.

٤- پەیوەندیی بە نوێنەرانی دپلۆماسیی حکومەتەکانی دیکەوە بکرێت بە لەبەرچاوگرتنی پاراستنی هێنەری پشتگیرییەکانیان .

٥- لەرێگەی بڵاوکراوەکانەوە پرۆپاگندەیەکی بەرفراوان دەستپێبکرێت .

٦- دژایەتیی سیاسەتی کۆلۆنیالیستیی لە عێراقدا بکرێت .

٧- سوپایەکی کوردیی دابمەزرێنرێت .

---

[55] لۆنگریك ژمارەیانی بە دە هەزار داناوە Unrest in Kurdistan; Longrigg, Iraq (1900-1950),327. " "

[56] محمد شیرزاد ، نهضة الاكراد ، قاهرة ، ١٩٤٦، ٢٤ .

[57] اردلان ، ١١

[58] هەمان سەرچاوە

ئامانجێکی گرنگی هیوا جەختکردنەوە بوو لەسەر پەیوەندیی گرتن لەگەڵ پارتە کوردییەکانی دیکەدا ، هەروەها لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسییە غەیرە کوردییەکاندا .[٥٩] هیوا دەستیکرد بە جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە .

لەچەند سەرچاوەیەکەوە دەزانین کە ماجید مستەفا ، وەزیری بێ‌وەزارەتی کورد ، لەگەڵ ئەندامەکانی هیوادا پەیوەندیی هەبووە . هەروەها وادەردەکەوێت کە پەیوەندیشی لەگەڵ مەلامستەفادا هەبووبێت .[٦٠] چالاکیی بەرفراوانی ئەندامەکانی هیوا بەتەواویی ڕۆڵی هیوای لە ڕاپەڕینەکەی مەلامستەفادا دەرخست . دەگوترێت ئەفسەرەکانی سوپا کە ماجید مستەفا وەك ئەفسەری پەیوەندیی لە نێوان میریی و خێڵەکاندا دایمەزراندبوون ، ئەندامانی هیوایان تەرخانکردبوو کە فەرمانەکانی حیزب جێبەجێ بکەن . هەریەك لەوانە وا دەردەکەوێت کە تۆمەتبارکرابوون بە " پتەوکردنی گیانی نەتەوایەتیی لەوناوچانەی ئەوانەی لێدانرابوون و لەژێر دەسەڵاتیاندا بوو ."[٦١] ئەو کەسایەتییانە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەنێو خێڵەکانی ئاکرێ ، شێخان ، بادینان ، برادۆست ، باڵەك و ناوچەکانی دیکە وەك هەوڵێك بۆ یەکخستنی خێڵە کوردەکان .[٦٢]

بەپێی بەرنامەکەی هیوا ، وا پێدەچوو هێزێکی جەنگاوەری کاریگەری کورد ڕێکخرابێت . لەکاتێکدا لەهاوینی ١٩٤٥ دا ، سەرلەنوێ شەڕ هەڵگیرسایەوە ، مەلامستەفا توانی نزیکەی پێنج هەزار جەنگاوەری خێڵەکیی بخاتە مەیدانەوە . ئەمانە بەگشتیی سەر بە کۆنفدراسیۆنی خێڵەکانی بارزانییەکان بوون کە لە مزووریی ژووریی ، مزووریی ژێریی ، بێرۆژیی ، شیروانیی ، دۆڵەمەریی و خێڵی برادۆستیی پێکدەهاتن .

لەوەدەچوو پەیوەندیی نزیك لەگەڵ ڕێکخراوە کوردییەکانی ئێراندا بەسترابێت[٦٣] هەروەها لەگەڵ خۆیبوون لە سوریا.[٦٤] بەهەمان شێوە ، هیوا لەگەڵ کوردە عێراقییە

---

[59] هەمان سەرچاوە

[60] هەمان سەرچاوە، ٧، هەروەها جیاوك ، ١٥٧٨ .

[61] اردلان ، ٧

[62] البریفکانی ، ٢٠-٢١

[63] ئەندامانی هیوا بە ڕێك‌وپێکی بڵاوکراوەی نەتەوەیی کوردیی (نیشتمان) یان لە ئێرانەوە بەدەست دەگەیشت

Longrigg, Iraq (1900-1950).326.

[64] زانیاریی هەیە کە حکومەتی عێراق عیزەت عەبدولعەزیزیان بەوە تاوانبارکردبوو کە لەکاتی سەردانێکی بۆ سوریا

کۆمۆنیستەکاندا پەیوەندیی هەبوو و لە لایەنگریی و پشتگیرییان بەهرەمەند بوو ،[٦٥] هەروەها لەگەڵ چەندین نوێنەری بیانیی لە بەغدا . ئەندامانی هیوا پەیوەندیی بەردەوامیان بە باڵیۆزخانەی بەریتانیی لە بەغدا و بەشێوەیەکی تایبەتیش لەگەڵ چەندین کەس لە ئەفسەرانی رامیاریی بەریتانیی لە کوردستانی عێراق هەبوو .[٦٦] هەروەها دەزانرێت کە زیاتر لە جارێك پەیوەندییان بە نوێنەرانی دیپلۆماسیی ئەمەریکییەوە کردووە .[٦٧] لە ٢٠ ی ئووتی ١٩٤٥دا ، لەکاتی دوا راپەڕینەکەی مەلامستەفادا ، سەرکردە بارزانییەکانی هیوا نامەیەکی ئاراستەی نوێنەرانی بەریتانییەکان ، ئەمەریکییەکان ، شورەویی ، فەرەنسییەکان و هەروەها چینییەکان لەبەغدا ، هەروەها بۆ حەمید پاچەچیی سەرۆك وەزیرانی عێراق کرد ، تێیدا شکایەتی سەبارەت بەو کار و هەنگاوە سەرکوتکەرانە کردبوو کە حکومەتی عێراق دژی کورد ئەنجامی داون ، هەروەها ئاماژەشی بە پەیمانی ئەتلانتیك دابوو .[٦٨]

حیزبی هیوا پاش بەزینی مەلامستەفا و هەڵاتنی بۆ ئێران هەڵوەشایەوە . شکستی جوڵانەوەی بارزانیی لە نێو کورداندا پەژارە و یەکتر تاوانبارکردنێکی قووڵی

---

و میسر پەیوەندیی بە خۆیبوونەوە کردووە .لە راستییدا چالاکییە نەتەوەییەکانی خۆیبوون لە عێراق و ئێران زۆری پێوەنرابوو . اردلان ، ١٠ ،، جیاوك ، ١٤٩

William Linn Westermann ,"Kurdish Independence and Russian Expansion,"Foreign Affairs 24,no 4(Jul 1946),675-86.

[65] Walter Z. Laqueur," Communism and Nationalism in the Middle East ,2d ed .(New York:1957), 225-27. Cf. Longrigg, Iraq (1900-1950),326.

[66] اردلان ، ٢٧-٣١.

[67] هەمان سەرچاوە

[68] Rambout,75. جێگای سەرنجە تێبینیی ئەوە بکرێت کە ئەو ئەفسەرە کوردانەی سوپا کە بە هێزەکانی بارزانییەوە پەیوەست بوون ، ناوکی هیوایان پێکدەهێنا ، لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراقەوە هاتبوون : عیزەت عەبدولعەزیز لە ئامێدیی ، مستەفا خۆشناو لە بێتواتە ، عەبدولحەمید باقر لە خانەقین ، محەمەد مەحموود لە سلێمانی ، ئەحمەد ئیسماعیل لە هەولێر ، هەروەها حیفزوڵڵا ئیسماعیل لە عەقرە اردلان ، ١٠.

لێکەوتەوە . ماجید مستەفا ، وەزیرە کوردەکە ، کرایە نیشانەی پەلامارێکی توند بۆ ئەو ڕۆڵەی وەك نێوەندێك لە دانوساندنی نێوان ڕێبەرانی بارزانیی و حکومەتی عێراقدا بینیویەتیی . فرە نیشانەی پرسیار خرایە سەر ڕاستگۆیی و نیازپاکیی و هاندەرەکانی لە ئەنجامدانی کارە ئاشتەواییەکەیدا . ئەو بەوە تاوانبار دەکرا کە خیانەتیی لە کێشەی کورد کردووە ، بەوەی کاتی تەواوی بۆ میریی دەستەبەر کردووە تا تواناکانی خۆی کۆبکاتەوە و ئامادەباشییە سەربازییەکانی تەواو بکات . دەگوترا کە گوایە خۆنیشاندانی ماجیدمستەفا وەك هاوسۆزێکی بارزانییەکان تەنیا کارێکی ڕیاکارانە بووە و ئامانجی ڕاستەقینەشی تەنیا بەهێزکردنی باڵادەستیی بەریتانیا و دەسەڵاتدارانی عێراق بووە .[69]

ماجید مستەفا نموونەیەك بوو زۆر بە وریایی زەمینەی کەسێکی ئاشتیکاری بۆ خۆی خۆشکرد بەوەی بە خۆلەپێشیی، متمانەی خوێندکار و ڕۆشنبیرانی کوردی ، بەتایبەت ئەندامانی حیزبی هیوا ، بەدەستهێنابوو.[70] دەگوترێت کە مەبەستی ماجید مستەفا لە خۆنزیککردنەوە لە هیوا ئەوە بوو کە گومانی وەفادار نەبوون بە کێشەی کورد لەسەر خۆی لابەرێت .[71] هەروەها دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە چالاکییەکانی ماجید مستەفا دووبەرەکییەکی ئاشکرای لە حیزبدا پێکهێنا ، لەنێوان ئەوانەی بڕوایان بە دڵسۆزیی ئەو بۆ کورد هەبوو لەگەڵ ئەوانەی گومانیان لە ڕاستگۆیی ئەو هەبوو .[72] بێگومان ئەرکەکەی ماجید مستەفا وەك ئاشتکەرەوەیەك گران و سەخت بوو . پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە ئەو ڕەخنانەی لە ماجید مستەفا گیراون هیچ بەڵگەیەکی قانعکەرانەی تێدا نیە ئەو تۆمەتانە بسەلمێنێت کە خراونەتە پاڵی .

## پارتی شۆڕش و ڕزگاریی کورد

پاش شکستی جوڵانەوەی بارزانیی ، ڕێکخستنی حیزبی هیوا بەشێوەیەکی قەرەبونەکراوە زیانی پێکەوت ، هەروەها زۆربەی ئەندامەکانی بێ پلانێکی دیاریکراو بەسەر دەستە و تاقمی بچووکدا دابەش بوون . هەرچەندە ، زۆری نەبرد ژمارەیەك لە

---

[69] هەمان سەرچاوە ، ٧
[70] هەمان سەرچاوە
[71] جیاوك ، ١٥٧.
[72] اردلان ، ٨

ئەندامە چەپەکانی هیوا لەگەڵ هێندێك خەڵکانی دیکەی چەپدا پارتێکی کۆمۆنیستی کوردیان بەناوی (شۆڕش) پێکهێنا .[٧٣]

لە سۆنگەی نەبوونی پارتێکی نەتەوەیی کاریگەریی کوردییدا ، شۆڕش لەوەدا سەرکەوتوو بوو کە ببێتە سەنگەرێکی پتەوی نەتەوایەتیی کورد . بەگشتیی شۆڕش بەرپرسیاربوو لە دامەزراندنی حیزبی رزگاریی کورد کە رێکخراوێکی مەزنتری نیشتمانیی یاخود بەرەیەکی چەپی جەماوەریی بوو . جگە لە شۆڕش هیچ یەك لەو دەستە و تاقمە جیاوازانەی کە پێکەوە شۆڕشیان دامەزراند ناسنامەی رامیاریی خۆیان نەپاراستبوو ، شۆڕش هەر لە جەختکردنەوە لە پاراستنی رێکخستنی جیای نێوخۆی خۆی بەردەوامبوو .[٧٤] لە سەرویەندی دامەزراندنی حیزبی رزگاریی کورددا ، شۆڕش داوانامەیەکی سەرنجراکێشی ئاراستەی گەلی کورد کردبوو ، تێیدا هانیدابوون لە دەوری ئەو حیزبە نوێیە کۆببنەوە و پشتگیریی تەواویی خۆیانی پێشکەش بکەن .[٧٥]

## بەیاننامەی حیزبی رزگاریی کورد

حیزبی رزگاریی کورد بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کە مەبەست و ئامانجەکانی خۆی تێدا ئاشکرا کرد :

یەکەم : بەرزترین ئامانجمان یەکخستنەوە و رزگارکردنی کوردستانی گەورەیە ، لەبەر ئەوەی حیزبەکەمان لەکوردستانی عێراقدایە ، خەبات دەکەین لەپێناو پاراستنی عێراق لە هاتنەناوەوەی ئیمپریالیزم و حکومەتە کۆنەپەرستەکان ، ئەوانەی تا ئێستاش گەورەترین لەمپەر لەبەردەم دیارییکردنی چارەنووسی نەتەوەییمان پێکدەهێنن .

دووەم : خەبات لە پێناو بەدیهێنانی سەربەخۆیی بەڕێوەبەرایەتیی بۆ کوردستانی عێراق ، هەنگاوێکی گرنگە بەرەو بەدیهێنانی دیارییکردنی چارەنووسی کوردان .

سێیەم : خەبات لە پێناو کۆتاییهێنان بە هەموو ئەو جۆرە ئازار و جیاوازییانەی کە کورد و کەمینەکانی دیکە بەدەستیەوە دەناڵێنن .

---

[٧٣] شێرزاد ، ٢٤

[٧٤] هەمان سەرچاوە ، ٢٤-٢٥

[٧٥] بۆ تەواوی دەقەکە بڕوانە : هەمان سەرچاوە ، ٢٥-٢٧

چوارەم : خەبات لە پێناو بەستن و بەهێزکردنی پەیوەندیی لەگەڵ تێکڕای پارتە کوردییەکان و ناوەندەکانی دەرەوەی عێراق بەمەبەستی یەکخستنی هەموو تواناکان لە پێناو بەدیهێنانی بەرزترین ئامانج —ماف دیارییکرنی چارەنووسی نەتەوەیی و رزگاریی سەرتاسەریی .

پێنجەم : خەبات لە پێناو چاکسازیی سەرتاسەریی تەواوی کێشە رامیاریی ، کۆمەڵایەتیی ، ئابووریی و کەلتوورییەکان لە رێگەی دەستەبەرکردنی مافە دیموکراتییەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی کشتوکاڵیی و پیشەسازیی ، بڵاوکردنەوەی فێرکردن ، هەروەها بوژاندنەوەی مێژوو و فەرهەنگی کورد .

شەشەم : بەکارهێنانی زمانی کوردیی بەشێوەیەکی گشتیی لە خوێندنگاکان و دەزگا حکومییەکان لە تێکڕای ناوچە کوردییەکاندا .

حەوتەم : تێکۆشان لە پێناو روونکردنەوەی کێشەی کورد بۆ گشت گەلان ، بەتایبەت گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست .

هەشتەم : تێکۆشان لە پێناو بەستنی پەیوەندیی لەگەڵ پارت و رێکخراوە دیموکراتخوازەکان و هاوکارییکردن لەگەڵیاندا .

نۆیەم : هەوڵدان لە پێناو بەستنی پەیوەندیی لەگەڵ وڵاتە دیموکراتەکان بە ئامانجی دژایەتییکردنی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستیی ، هەروەها بەکرێگیراوەکانیان ، ئەوانەی هەوڵی زیندووکردنەوەی پەیماننامەی سەعدئاباد دەدەن ، هەروەها بۆ لێدانی تەواوی بلۆکە ئیمپریالیستیی و کۆنەپەرستییەکان کە رێگرە لەبەردەم ئازادیی بەگشتیی و ئازادیی کوردان بەتایبەتیی .[٧٦]

حیزبی رزگاریی کورد بەشەێوەیەکی خێرا پەرەیسەند و زۆری نەخایاند بووە هێزێکی رامیاریی کە بایەخی خۆی هەبوو ، بەتایبەت لەنێو رووناکبیران و لاوانی کورد دا . هەرچەندە ئەم حیزبە بەرەییە نیشتمانییە لە چەندین لاوە بەتوندیی دژایەتیی دەکرا ، دەگوترێت کە بەریتانییەکان و حکومەتی عێراق بەدەرکەوتنی ئەم حیزبە دڵەڕاوکێیەکی گەورەیان پێکەوت . وادەردەکەوێت بەریتانییەکان ئەوەندە بێزاربووبن بەچەشنێک بیریان لەوەکردبێتەوە کە هانی رێبەرە ئایینیی و شێخەکانی کورد بدەن کە فەتوایەك بدەن تێیدا

---

[76] هەمان سەرچاوە ، ٢٧-٢٨

پەیوەندییگرتن بەو حیزبە نوێیەوە قەدەغە بکەن .[٧٧]

## کۆمۆنیستە کوردەکان و حیزبی رزگاریی کورد

بەشداریی کۆمۆنیستە کوردەکان لە حیزبی رزگاریی کورد و لایەنگریی ئاشکرایان لە دیارییکردنی چارەنووسی نەتەوەیی کورد رەخنەیەکی توندی لەلایەن حیزبی شیوعیی عێراقیی لێکەوتەوە ، خۆهەڵواسینی کۆمۆنیستە کوردەکان بە حیزبی رزگارییەوە وەك کارێکی تێکدەرانەی زیانبەخش بۆ کێشەی جەماوەری عێراق ، کە کورد بەشێکە لەوان ، راگەیەندرا . ئەم پەلامارە بووە هۆی شەڕە دەنوکێکی توند لەنێوان کۆمۆنیستە کوردەکان و ئەو کۆمۆنیستانەی دیکەی لەبەغدا بوون .[٧٨]

لەکۆتایی نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا ، کۆمۆنیستە کوردەکان حیزبی رزگاریی کوردیان جێهێشت . هەرچەندە لە هاوکاریی کردنی تاقمی رزگاریی بەردەوام بوون ، کە ئەمێستا ناوی خۆی بۆ پارتی دیموکراتی کورد یان (پ.د.ك) گۆڕیبوو ، بەڵام هەر لەسەر کارکردن وەك بەرەیەکی نیشتمانیی بەردەوام بوون . هەرچۆنێك بێت ، کشانەوەی کۆمۆنیستە کوردەکان لە حیزبی رزگاریی بەهۆی کاریگەریی کۆمۆنیستەکانی بەغداوە دیار نیە ، (لاکوێر) جەخت لەوە دەکات کە کۆمۆنیستە کوردەکان لە ئاکامی فشاری تاقمە کۆمۆنیستەکانی بەغدا ، حیزبی رزگاریی کوردیان بەجێنەهێشتووە ، بەڵکو زیاتر بۆ ئەوە بووە کە ئامرازێکی کاریگەر بن لە دوورەوە تاقمە غەیرە کۆمۆنیستەکان ئاراستە بکەن ، هەروەها بۆ ئەوەی لەبەر چاوی دەسەڵات ئەو تاقمە بە (سەلامەتتر) بهێنێتە پێش چاو ، ئەو فێڵەی تاڕادەیەك سەرکەوتوو بوو ."[٧٩] ئەو ئاماژەی بەوەداوە کە پ.د.ك لەو هەڵمەتەی کە لە ١٩٤٨ دا حکومەتی عێراق دژ بە کۆمۆنیستەکان ئەنجامیدا ، بە سەختی لێدرا .[٨٠]

---

[٧٧] هەمان سەرچاوە ،٢٨-٢٩

[78] Laqueur.226-227.

[79] Ibid., 227.

[80] Ibid.,342.n.20.

# بەشی پازدەیەم : کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد

داگیرکردنی ئێران لەلایەن بەریتانیا و شورەوییەوە لە سێپتەمبەری ١٩٤١دا ، بووە هۆی هەرەسهێنانی دەسەڵاتی ئێرانیی لە تەواوی ناوچە خێڵەکییەکاندا . یەکێك لە بەرچاوترین ناکامەکانی ئەو هەرەسهێنانە لەناوچە کوردییەکاندا ئەوە بوو کە کوردان دەستیان گرت بەسەر بڕێکی زۆر لەو چەك و تەقەمەنییانەی هێزەکانی ئێران کە لە بەرامبەر پێشڕەویی رووسەکاندا هەڵاتبوون و بەجێیان هێشتبوو .[1] پێویست بە گوتن ناکات ، ئەم پەرەسەندنەی رووداوەکان هاوسەنگیی هێزەکانی لەنێوان دەوڵەت و خێڵەکاندا بەتەواویی هەڵگێڕایەوە ، ئەوەی دوایی ئەرکی دەوڵەتی لە سەرلەنوێ گێڕانەوەی دەسەڵاتی خۆی بۆ ئەو بەشەی دەسەڵات سەختتر کرد . ئەو راستییەی کوردانی ئێران کە هەستیان بە نارەزایەتییەکی قووڵ دژی حکومەتی شا دەکرد ، لەناکاو خۆیان پڕ چەك و لەهەلومەرجێکی تەواو ئازاد و بێ بەربەستدا دیتەوە ، ئەوەش بارودۆخێکی ئاڵۆز و ئەگەری مەترسیداری بەدواوە بوو .

## سیاسەتی رەزاشا لەهەمبەر خێڵەکان

بۆ ئەوەی سروشت و سەرچاوەی ئەهامەتیی و بێزارییەکانی کورد دژی ئێران تێبگەین ، لەوانەیە پێویست بەوە بکات ئاوڕێك لەسیاسەتی رەزاشا لەهەمبەر خێڵەکان بدەینەوە . بەگشتیی بۆ ماوەی دوو دەیە ، کوردان ناچار کران مل بۆ فەرمانڕەوایەتیی توندوتیژی رەزاشا و هەڵسوکەوتی کارمەندە گەندەڵەکانی دانەوێنن بێئەوەی ئومێدێکیان

---

[1] Elphinston, "The Kurdish Question,"97.

وێڕای بڕێکی زۆر چەك کە کوردان لە سەربازخانەکان چنگیان کەوت ، ئەو هەڵاتووانەشی لە سوپای ئێرانییەوە دەچوونە لایان چەکەکانی خۆیان دەدا بە خێڵەکییە کوردەکان

Roosevelt, Archie ."The Kurdish Republic of Mahabad." Middle East Journal 1,no 3 (July 1947):247-69.

به چارەسەرییەکی ئەو بارە ناهەموارەیان هەبێت کە لەسایەیدا دەناڵێنن . هەوڵە سەرکەتووەکانی رەزاشا دژی ژمارەیەک لە خێڵە یاخییەکان ، وەک هێمایەک رازەی بە دەرخستنی باڵادەستیی تواناى ئەو لە ئێراندا کرد . چونکە ئەو بە ئەزموون دەیزانی کە وەفاداریی تەسکی خێڵایەتیی ، تواناى جەنگاوەرییان ، هەروەها رێکخستنی کۆمەڵایەتیی ، ئابووریی و رامیارییان ، رێگرێکی سەختە لەبەردەم بەدیهێنانی خولیاکەیدا کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی هاوچەرخی نەتەوەییە . ئەو خێڵەکانی وەک رەگەزێکی یاساشکێنی و ناجێگیریی ، وەک قامچییەک بۆ گیانی خەڵکە نیشتەنییەکان ، هەروەها وەک درکێك لە گەرووی حکومەتدا دەبینی . هەربۆیە بڕیاریدا کە دەسەڵاتی خێڵەکان بەیەکجاریی تێکبشکێنێت و وزەی بزێویان بە ئاراستەیەکی هێمنانەدا بەرێت .

سیاسەتی رەزاشا لەهەمبەر خێڵەکان پەلامارێك بوو بۆ سەرجەم بنەماکانی ژیانی خێڵایەتیی ، هەربۆیە ئەو سوور بوو لەسەر " تێکشکاندنی رێکخستنی خێڵەکان ، رێگرتن لە کۆچوبارییان ، هەوڵدان بە گۆڕینی پیاوە خێڵەکییەکان بە وەرزێڕ و کشتکار "[2] ئەو سیاسەتەش بە شێوەیەکی سروشتیی هێرشێکی گشتیی بۆ سەر ئ تەواوی بوارەکانی ژیانی خێڵایەتیی لێکەوتەوە . رەزاشا لە سەرکوتکردن و تێکدانی دەزگا خۆجێیەکاندا تا بڵێی زیرەست و توندوتیژ بوو ، تەنانەت پۆشاك و بەرگی خۆجێشی لەدەست دەرنەچوو .[1] گەلێك توندوتیژیی ناڕەوا دەرحەق بە رەعیەتی کورد و لەراستییدا دەرحەق بە تێکڕای پێکهاتەی داب و ئاکاری ژیانیان ئەنجامدرا . ئەو بێ گرنگییدان و لەبەرچاوگرتنی ئەو مەسەلەیە ، بڕیارییدا سیاسەتەکانی خۆی بسەپێنێت و گوێ بە ئاکامەکانیشی نەدات ، هەمو بەرگرییەك بە شێوەیەکی دڕندانە سەرکوتکرا . سەرخێڵەکان تیرەباران کران ،

---

[2] Ann K.S.Lambton," Landlord and Peasant in Persia :A Study of Land Tenure and Land Revenue Administration (London : Oxford Univ .Press ,1953),285.

[1] بە گوێرەی رۆزفێلت ." کوردان هەروەك ئێرانییەکانی دی لەلایەن رەزاشاوە ناچارکران واز لە جلوبەرگە خۆماڵییەکانیان بێنن و جلوبەرگەکانیان کە جێی شانازیی نەتەوەییان بوو لە ماڵەوە شاردیانەوە تا ئەو کاتەی ئێران لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە داگیرکرا . ئەودەمە لەپڕ بە جلوبەرگە کوردییەکانیانەوە دەرکەوتنەوە قەدەغەکردنی جلوبەرگی کوردی وای کردبوو رژێمەکەی رەزاشا لای کورد زۆر بێزراوبێت

Roosevelt, 251 n .1;also Hamilton ,296.

دەرمانخوارد کران یا دوورخرانەوە .[4] تەنانەت تەواوی خێڵەکان تێکشکێنران و لە شوێنەکانی خۆیان هەڵکەنران .[5] سیستمێکی سەربازیی توندوتۆڵ و پێکەوەگرێدراو بە ڕێگەی نوێی تازە بنیاتنراو دامەزرێنرا ، ڕەگەزە یاخییەکان هێدی هێدی خرانە ژێر چەپۆك .[6] هەرچەندە سیاسەتە " توندوتیژ بەڵام کاریگەرەکەی"[7] ڕەزاشا تەنیا لەو کاتەدا سەرکەوتوو بوو کە خۆی فەرمانڕەوایەتیی دەکرد .

ڕاستیی ئەوەی ئەم سیاسەتە بووە هۆی خوێنڕێژیی و نەهامەتییەکی مەزن ، کەمتر لە ئامانجی سیاسەتەکەوە سەرچاوەی دەگرت وەك لەو شێوازە دڕندایەتیی و سەرەڕۆییەی کە لە کاتی جێبەجێکردندا پیادە دەکرا . شێوازێکی گونجاو و مامەڵەیەکی مرۆڤایەتییانە لە جێبەجێکردندا دەگونجا ئاکامگەلێکی باشتر و چەسپاوتری لێبکەوتایەتەوە . بەڵام دیدێك ، بەرنامەیەکی هۆشیارانە ، هەروەها ئامراز و پێویستییەکی گونجاو و مرۆڤدۆستانە کە بۆ سەرکەوتنی خولیایەکی فراوانی بەوچەشنە پێویست بوو ، لەوپەڕی کەموکورتییدا بوو ، هەربۆیە جێگەی سەرسامیی نیە کە پرۆسەکە شکستیخوارد و ئاکامی کارەساتهێنەری بۆ خێڵەکان و هەروەها بۆ تەواوی

---

[4] وەك پێشتر باسکراوە ، سمکۆئاغای شکاك و ژمارەیەك لەسەرکردە خێڵەکییە کوردەکان لە شنۆ بە غەدر کوژران ، هەروەها ڕەزاشا سەید تەهای گرت و دواتر وەك زانیارییەکان دەڵێن ژارخواردووی کردووە دۆگلاس بە درێژیی باس لە دوورخستنەوەی سەرخێڵەکانی بەختیاریی ، کوشتنی مەشتا سەرخێڵی لوڕ ، هەروەها کوشتنی سەرۆکی ناسراوی قاشقاییەکان دەکات ، ئەوەی ژاریان بۆ کردبووە ناو قاوەوە . بەگوێرەی دۆگلاس ، ڕەزاشا ئەوەندەی پەنای بۆ قاوەی ژاراویی دەبرد بۆ کوشتنی نەیارەکانی ، وای لێهاتبوو چەمکی (قاوەی پەهلەوی) بۆ ئەم جۆرە کوشتنانە بەکار دەهێنرا

William O. Douglas, "Strange Lands and Friendly People (New York: Harper and Bros.,1951),125-126.

[5] باشترین نموونە بۆ ئەم جۆرە کارە ڕاگواستنی خێڵی گەڵباخییە . ئەوانەی لەشوێنی خۆیان هەڵکەنران و بۆ ناوچەکانی وەك هەمەدان ، ئەسفەهان و یەزد دوورخرانەوە و پەرتەوازەکران ، هەروەها گوندەکانیان درا بەو دانیشتووە تورك زمانانەی کە لە ناوچەکانی دیکەی وڵاتەوە هێنرابوون . گەڵباخییەکان دوای کەوتنی ڕەزاشا گەڕانەوە بۆ ماڵ و گوندەکانیان Lambton,285-86

[6] Elphinston, "The Kurdish Question,"97

[7] Ibid.

وڵات لێکەوتەوە . بەگوتەی یەك لە شارەزایانی کاروباری ئێران " سیاسەتی رەزاشا لەهەمبەر خێڵەکان نەفامانە دارێژرابوو ، بە خراپیش جێبەجێ کرا ، ئاکامەکەشی زیانێکی بێشوماری بە سامانی مەڕومالآت گەیاند ، خێڵەکانی داڕوتاند و ژمارەی ئەندامەکانی کەمکردنەوە ."[8]

## کاریگەریی داگیرکاریی هاوپەیمانان بەسەر ئێرانەوە

هەڵوەشاندنەوەی کتوپڕ و ئەو گۆڕانە قووڵەی کە دوای داگیرکردنی ئێران لە لایەن هاوپەیمانانەوە لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانییەوە هاتە کایەوە ، لەمپەرێکی مەزنی خستەبەردەم سیاسەتی رەزاشا لەهەمبەر خێڵەکان . پێداگرتن لەسەر دەسەڵاتێکی ناوەندگەرای بەهێز کە مەرجێکی پێویستی پاڵپشتییکردنی ئەو جۆرە سیاسەتە بوو ، دوای رووخاندنی رژێمی رەزاشا و هەڵوەشانەوەی داب و دەزگاکانی حکومەت لەناوچە خێڵەکییەکان ، بە ئاشکرا کارێکی ئەستەم بوو . سەرباری ئەوەش ، تەنانەت گەر دەسەڵاتدارانی ئێرانیش لە هەلومەرجێکی وادا بوونایە کە مەبەستیان بووایە هەمان رێچکەی شای پێشوو بگرێتەبەر ، ئازاد نەبوون کارێکی ئەوتۆ بکەن . بێگومان ئینگلتەرە و یەکێتی شورەویی هانی بزاوتێکی بەو چەشنەی ئێرانییەکانیان نەدەدا کە خێڵەکان بوروژێنێت . هێمنیی و ئارامیی مەسەلەیەکی بنەڕەتیی بوون بۆ پێداگریی لەسەر بەرنەوامبوونی گواستنەوەی پێویستییە جەنگییەکان بۆ یەکێتی شورەویی . هەردوو هێزە داگیرکەرەکە بڕیاری ئەوەیان دابوو کە هەموو شتێك بخەنە پێناو سەرکەوتنی یەکجارەکیی جەنگەوە .

## سێ هەرێمەکەی کوردستانی ئێران

یەکێك لە ئاکامە بەرچاوەکانی داگیرکردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە بۆ سێ بەشی جیاواز ، ناوچەی شورەویی ، ناوچەی بەریتانیی ، هەروەها هەرێمێك کە

---

[8] Lambton,286.

بەدەست کوردانەوە بوو و کەوتبوونە نێوان هەردوو ناوچەی دەوڵەتانی هاوپەیمان . ناوچەی شورەویی بەرەو باشوور تا دەورووبەری رەزائیە درێژ دەبووەوە . ناوچەی بەریتانیش هەتا رێگەی خانەقین –کرماشان درێژ دەبووەوە . ئەوەی لەنێوان ئەو دوو ناوچەیەدا بوو ، پاش هەڵاتنی هێزە ئێرانییەکان و هەڵوەشاندنەوەی کارگێڕیی مەدەنیی ، لەدەست کورداندا مابووەوە .[9]

لە هەرسێ ناوچەکەدا ، کوردان خولیایەکی ئاشکرایان پێشاندا تا لەو پەیوەندییە لاوازەی بە ئێرانەوە دەیانبەستێتەوە دابیڕێن ، یاخود بەلای کەمەوە ئاستێکی دیارییکراوی خودموختارییان هەبێت . هەربۆیە زوو بە زوو پاش ئەوەی شورەوییەکان گەیشتنە باکووری رۆژئاوای ئێران ، کوردان بۆ گفتوگۆ لەگەڵیاندا هیچ کاتیان بەفیڕۆ نەدا . بەڵام شورەوییەکان وا دەردەکەوێت لەو کاتەدا پێیان لەسەر هەڵوێستی خۆپارێزیی و دەستوەرنەدان لە کاروبارەکانی خۆجێی ئێران داگرتبێت ، هەربۆیە ئاماژە بەوە دەکرێت کە هانی گفتوگۆیەکی وا زوویان لەگەڵ کورد دا نەدابێت . بەگوێرەی دەسەڵاتدارێکی فرە ئاگاداریی بەریتانیی " لە باکوور ، کوردان چاویان لە رووسەکان بڕی ، وەختایەکی رووسەکان لە ١٩٤١دا چوونە ئێرانەوە ، هیوایەکی زۆریان بەوە هەبوو کە لەوانەیە رووسەکان هاوکاریی جوڵانەوەی سەربەخۆخوازیی کورد بکەن ، بەڵام ئاکاری فەرمرووستی رووسەکان بە خێرایی کوردانی تێگەیاند کە هەر هیوایەکی بەو چەشنە بێهوودەیە ."[10]

نەبوونی دەسەڵاتێکی ئێرانی چالاک لە ناوچە کوردییەکاندا هانی شورەویی دا راستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ خێڵەکانی جەلالیی ، شکاک ، هەرکیی و ئەو خێڵە کوردییانەی دیکە بکەن کە لە ناوچەکەیاندا نیشتەجێن . ئەوان ئەرکێکی گرانیان نەخستبووە سەرشانی خێڵە کوردەکان ، یاخود بە چەشنێکی نەگونجاو دەستیان لە کاروباری نێوخۆییان وەرنەدەدا . چاودێرێکی ئەمەریکیی کە لە رووداوەکان نزیک بوو دەڵێت :" سەرۆکی ئەو خێڵانە لەلایەن شورەوییەکانەوە رێگەیان پێدرابوو کاروباری خێڵەکانیان بەڕێوەبەرن ، شورەوییەکان تەنیا پاراستنی هێمنیی و ئاسایش و دابینکردنی

---

[9] Roosevelt,248.

[10] Elphinston. "The Kurdish Question,"97 ;also Elphinston, Kurds and The Kurdish Question,"46.

دانەوێڵەیان بۆ سوپای سوور لێکردبوون ."[11]

باس لەوەش دەکرێت کە سەرخێڵە کوردەکانی ئێران پەیوەندییان بە باڵیۆزخانەی بەریتانیاوە لە بەغدا کردووە و داوایان لێکردوون چاویان لەو کوردانەوە بێت کە لە ناوچەی بەریتانییدان ، هەنگاوێکی بەو چەشنە کە پێشتر لەلایەن سەرۆکە کوردەکانی کوردستانی ئێرانەوە نراوە . هەڵوێستی رەتکەرەوانەی بەریتانیا و لەبەرچاونەگرتنی داواکەیان . بەراشکاوی سەرۆکە کوردەکانی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە هەوڵەکەیان بێبەر بووە ، هەربۆیە باس لە هەوڵی زیاتری دیکە نەکراوە .[12]

## پەرەسەندنی رامیاریی لە هەرێمە کوردییەکە

هەر لەو هەرێمەی ناوەڕاستدا کەبەدەست کوردانەوە بوو بۆ یەکەمجار وورووژاندن و هەروەها پێگەیشتنی چالاکی رامیاریی کوردیی هاتە ئاراوە . لێرەدا ، دوور لە هەموو داگیرکارییەکی بێگانە و دەسەڵاتی رێگری ئێرانیی ، کوردان بە قووڵی دەمیان وەردایە هەموو ئەو شتانەی لێی بێبەش کرابوون و جوامێرانە خودموختاریی خۆیان بەدەستهێنا .

حەمە رەشید ، سەرۆکی بنەماڵەی بەگزادەکانی بانە . کە لە ماوەی پێشوودا بۆ چەند ساڵێک لە عێراق پەرەوازە ببوو . وێڕای بەرەو ئێران لە سنوور تێپەڕێت . بە هاوکاریی ژمارەیەك لەوانەی شوێنی کەوتن و لایەنگرییان لە کێشەکەی دەکرد ، لەمەسەلەی دانانی خۆی وەك سەرۆکێکی نیمچە سەربەخۆ بەسەر ناوچەی بانە –سەردەشتدا ، سەرکەوتنی بەدەستهێنا .[13] وێڕای ئەوەی حەمە رەشید بەرپرس بوو لە کوژرانی ئەفسەرێکی پایەبەرزیی سوپای ئێران و بە یاخیی لە قەڵەم دەدرا ، بەڵام لاوازیی

---

[11] Roosevelt,248.

[12] لۆنگریك ئەم رووداوەی راگواستووە بەڵام نەیگوتووە کە داخۆ ئەو سەرەك خێڵانە لەناوچەی ژێردەسەڵاتی بەریتانییەکانەوە هاتوون یاخود لەو ناوچەیەی کە بەدەست کوردەکانەوە خۆیانەوە بوو . هەروەها سروشتی داواکارییەکەشیانی روون نەکردۆتەوە . Longrigg, Iraq, 1900-1950,324.

[13] Elphinston, "The Kurdish Question,"97; Roosevelt,248.; Longrigg, Stephen H. Iraq, 1900-1950,325.

دەسەڵاتی ئێرانیی لە ئاستێکدا بوو نەیدەتوانی هیچ کارێک دژی ئەنجام بدەن . ئەوان حەمە رەشیدیان وەک فەرماندارێکی نیمچە فەرمیی دانپێدانا ، مانگانەیان بۆ بڕییەوە ، هەروەها کردیانە لێپرسراوی پاراستنی نەزم و ئاسایش لە ناوچەکەدا .[14] هەر لەم سەردەمەدا حکومەتی ئێران دانی بە سەرۆکێکی دیکەی کورددا نا ، کە مەحموودخانی کانی سانان بوو ، ئەوەی توانی دەسەڵاتی خۆی وەک فەرماندارێکی نیمچەسەربەخۆ بە سەر ناوچەی مەریواندا بسەپێنێت .[15]

لەهاوینی ١٩٤٢دا ، حەمە رەشید لەگەڵ مەحموودخاندا پێکیانداداا ، ئەوەی دواییان چاوی لە یارمەتی ئێران بوو و جەنگیشی کەوت ، هەروەها بە هاوکاریی دوو ستونی ئێران کە تانکی سووک پاڵپشتیی دەکردن ، توانی هێزەکانی حەمە رەشید ببەزێنێت و رایانماڵێت تا سەر سنوور و بەرەو عێراقیان دەرپەڕێنێت .[16] حکومەتی ئێران کە خۆی لە حەمە رەشید رزگار کرد ، وا پێدەچێت کە کاتی بەفیڕۆ نەدابێت لەوەی رووی هێزەکانی خۆی دژی مەحموودخان وەرگێڕا ، ئەوەی ناچار بوو کە وەک مێمڵەکەی روو بکاتە عێراق .[17]

لەئاکامی ئەو رووداوانە ، لەسەروبەندی پاییزی ١٩٤٥دا ، حکومەتی ئێران تەواوی ناوچە کوردییەکانی لە باشووری هێڵی سەقز-بانە-سەردەشتەوە لە بندەستدا بوو .[18] هەرچەندە ، وادەردەکەوت کە حکومەت توانای ئەوەی نەبێت دەسەڵاتی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ئەو هەرێمەی لەدەستی کورداندا مابووەوە ، ئەو ناوچەیەی دەکەوتە نێوان هێڵی سەقز-بانە-سەردەشت و سنووری باشووری هەرێمەکەی شورەویی . لەشاری

---

[14] Elphinston, "The Kurdish Question,"98; Roosevelt,248; Longrigg, Iraq, 1900-1950,324.

[15] Roosevelt,248.

[16] Elphinston, "The Kurdish Question,"98.

بەگوێرەی لۆنگریك ، حەمەرەشید خان کە لەدایکبووی عێراقە ، خۆی بە عێراقیی و ئێرانییش دەزانی  ئەو پاش ئەوەی سەرلەنوێ سنووری ئێران-عێراقی بەزاند گیرا و لە کەرکوك خرایە بەندیخانەوە .

Longrigg, Iraq, 1900-1950,324.

[17] Roosevelt,248

[18] Ibid.

مەهاباد (ساوج بولاق) دا بوو ، کە ناوەندی هەرێمەکە و لەچوارچێوەی ئەو ناوچەیەدا بوو کە ئازەربایجانی ئێرانی تێدا نیشتەجێن ، کە زۆربەی پەرەسەندنی رامیاریی کوردیی تێیدا سەریهەڵدا .

## کاریگەریی پرۆپاگەندە

بوژاندنەوەی چالاکیی نەتەوەیی کورد لەم ناوچەیەدا ، کە دامەزراندنی (کۆمەڵەی ژیانی کورد)ی لێکەوتەوە و هەروەها گەیشتە ئاستی دامەزراندنی کۆمارە کوردییەکە لە مەهاباد ، لە ژێر کاریگەریی ورووژانێکی بەهێزی ئەو هەوێنە رامیارییەدا بوو کە زادەی جەنگی دووەمی جیهانیی بوو . وێڕای ئەو راستییەی کە ئەم هەرێمە لە دەرەوەی هەر دوو ناوچە بەریتانیی و شورەوییەکەیدا مایەوە ، بێگومان خەڵکەکەی بە رادەیەکی مەزن لەژێر کاریگەریی پرۆپاگەندەکانی دەورانی جەنگی هاوپەیماناندا بوون . پێویستی بەبیرهێنانەوەیە کە جگە لە جیاوازیی چەمك و زاراوەکان ، سیما و شەقڵی پرۆپاگەندەی هاوپەیمانان ، شورەویی و هەروەها رۆژئاوا ، لە دەوری هەمان بابەت دەسووڕا . ئەوەش بۆ خەڵکی ساکاری کوردی ئەو سەردەمە هەموار نەبوو کە جیاوازیی لەنێوانیاندا بکەن . هەریەك لە پرۆپاگەندەی شورەویی و رۆژئاواییەکان باسیان لەوە دەکرد کە دەوڵەتانی ناوەند بۆ قازانجی خۆیان نەتەوەکانی دیکە دیل و ژێرچەپۆك دەکەن . بە شان‌وباڵی ئازادیی رامیاریی و دیاریکردنی چارەنووسدا هەڵیان دەدا ، بەڵێنیان دەدا کۆتایی بە ستەمکاریی بەهێزەکان بەسەر لاوازەکاندا بهێنن .

## هەڵوێستی هێزە داگیرکارەکان لەهەمبەر کورد

بەریتانیای مەزن و یەکێتی شورەویی ، ئەو دوو زلهێزەی کە زیاترین بەرژەوەندییان لە ناوچەکەدا هەبوو ، لەو گرفتە ئاگاداربوون کە پەیوەندیی بە کوردانەوە هەبوو ، بەتایبەت لە کوردستانی ئێران و عێراقدا . هەستیاریی تورکان لەمەڕ کێشەی کورد بۆ هەموو لایەنەکانی جەنگ روون و ئاشکرا بوو . سیخوڕە ئەڵمانییەکان بە شێوەیەکی سەرقاڵ تێوەگلان و لە هەوڵی ئەوەدا بوون هەرا لەنێو کوردە داخ لەدڵەکانی

ئێران ، عێراق وسوریا بنێنەوە و ئۆباڵەکەشی بخەنە ئەستۆی بەریتانییەکان . لەراستییدا پرۆپاگەندەی ئەڵمانییەکان هەمیشە بەریتانییەکانی بە هۆکاری ناثارامیی لەنێو کوردانی ئێراندا تۆمەتبار دەکرد .[19]

هەربۆیە هەلومەرجەکە دژوار و مەترسییدار بوو ، بەدرێژایی ساڵە پڕ کێشە و هەستیارەکانی بەرایی جەنگ ، لەکاتێکدا ئەڵمانەکان لە گەیشتنە باکووری قەفقاس سەرکەوتنیان بەدەست هێنا ، بەریتانیا و یەکێتی شورەویی لە دڵەڕاوکێی ئەوەدا بوون کارێکی وا نەکەن هانی تورکان بدات لە پاڵ ئەڵمانەکاندا تێکەڵ بە جەنگەکە بن .لەبەر ئەم هۆیە ، هەردوو هێزەکە لەسەرەتای ساڵانی جەنگەکەدا هەڵوێستێکی خۆپارێزیی و بێبایەخانەیان لەحاست کورددا گرتەبەر .

بەڵام هەردوو هێزەکە بڕیاری ئەوەیان نەدابوو بۆ هەتاهەتایە هەمان سیاسەت لەمەڕ کێشەی کورد ، یاخود هەر پرسێکی دیکە پەیوەندیی بە کێشەکەوە هەبێت ، بگرنەبەر . بەڵام لەگەڵ رەوینەوەی مەترسیی ئەڵمانیا و دەرکەوتنی سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە ئاسۆدا ، ئەو یەکێتییەی لەسایەی ترسی هاوبەش لە دوژمن هاتبووە کایەوە ، درزی تێکەوت . هەریەك لەو دوو هێزە وادەرکەوتن کە سوورن لەسەر گرتنەبەری سیاسەتێکی وەها کە بە گونجاوترین شێوە لەگەڵ بەرژەوەندیی نەتەوایەتییاندا هاوجووت بێت .

بەریتانیای مەزن ، کە گرێبەستی هاوپەیمانیەتیی لەگەڵ تورکیا وعێراقدا هەبوو ، هەروا هیوای بەوە بوو پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ ئێراندا ببەستێت ، بەشێوەیەکی سروشتیی خولیای پشتگیریی لە هەلومەرجە بارەکە بوو ، بۆ ئەوەی هەموو بەدحاڵیبیوونێك لەخۆی دووربخاتەوە ، زۆر بە وریاییەوە خۆی لە پێشاندانی هەر لایەنگرییەك بۆ حەزە نەتەوایەتییەکانی کورد دەپاراست .

یەکێتی شورەویی ، بەپێچەوانەوە ، هیچ پەیوەندییەکی دۆستایەتیی تایبەتیی لەگەڵ تورکیا و پەیوەندییەکی دیپلۆماسیشی لەگەڵ عێراقدا نەبوو . پەیوەندیشی لەگەڵ ئێراندا تا ئەو کاتە نادیار و دوور لە دڵنیایی بوو . ئەو کەمی هەبوو لەدەستی بدات و زۆریشی دەستدەکەوت تا پۆزی قارەمانی نەتەوایەتیی کورد لێبدات . سیاسەتێکی وا کە

---

[19] پرۆپاگەندەی دەوڵەتانی ناوەند لە تورکیا کوردانی دەورووژاند . Times (London). Apr.29. 1942

بریتیبوو له زامنکردنی دۆستایەتیی و لایەنگریی له تێکۆشانی فراوانی کەمینەکانی هەریەك لەو سێ وڵاتە ، ئەوەی له کۆتاییدا سەلماندی که ئامرازێکی بەنرخی فشاره له هەریەك له قۆناغی ئاشتییدا و چەکێکی سەربازیی بەهێزیشه له کاتی جەنگدا . سەرباری ئەوەش ، ئەوە تەنیا شورەویی نەبوو که خولیای دۆستایەتیی بەو چەشنەی هەبوو ، بەڵکە کوردان خۆشیان ، کاتێك له یارمەتیی بەریتانییەکان جاڕس بوون ، ئامادەبوون رووی خۆیان بەرەو ئەو نموونە نوێیە وەرگێڕن .

وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا ، شورەوییەکان یەکەمجار هیچ پەرۆشییەکیان بۆ پێشاندانی بایەخێکی تایبەت به کوردان پێشان نەدا و هەڵوێستی دوورەپەرێزیی و دەستوەرنەدانی بێ ئەملاولایان گرتەبەر . یەکەمین نیشانەکانی گۆڕینی هەڵوێستی شورەویی لەهەمبەر کوردان له ساڵی ١٩٤٢دا دەرکەوت . لەو ساڵەدا ، دوو هەوڵی بایەخدار ئەنجامدرا ، یەکێکیان له لایەن شورەوییەوە و ئەوی دیکەیان لەلایەن کوردەوە . شورەوییەکان بۆ یەکەمجار ژمارەیەك گەورە پیاوانی ئاسراوی کوردیان بۆ دیدەنیی له باکۆ بانگهێشت کرد .[20] لەهەمان کاتدا دەگوترێت سێ ئەفسەری کوردی سوپای عێراق پەیوەندییان به دەسەڵاتدارانی داگیرکەری شورەویی له ئێرادا کردووە و داوای ئەوەیان لێکردوون که یارمەتیی چەکداریی هاونیشتمانەکانیان له جەنگدا دژی ئەڵمانیا بدەن .[21] کامەیان لەو دوو هەوڵە لەپێش ئەوی دیکەیانەوە بەتەواویی روون نیه . هەرحاڵ ، وادەردەکەوێت که شورەوییەکان تا ئەو دەمەش حەزیان بەوە نەکردبێت کوردان بخەنە ژێر باڵی خۆیانەوە ، چونکه له بەهاری ئەو ساڵەدا ، لەکاتێکدا ژمارەیەك له کوردان پەلاماری گوندەکانی رۆژئاوای دەریاچەی ورمێیان دا ، شورەوییەکان له بانگکردنی سوپا و هێزی ژاندارمی ئێرانیی بۆ تەمێکردنی ئەو کوردانە هیچ سستییەکیان نەنواند ، هەرچەندە دواتر وایان پێشاندا که دڵیان گۆڕیوە و چاکترین هەوڵیاندا تاکو تێکۆشانی هێزی ژاندارمەریی ئێرانییەکان پوچەڵ بکەنەوە .[22]

---

[20] Roosevelt,251

[21] Witold Rajkowski ,"Another Danger spot-Kurdistan ,"World Review(June 1946),31.

[22] Roosevelt,251.

## کۆمەڵە

### دامەزراندنی کۆمەڵە

لە١٦ی نوڤتی ١٩٤٣دا (١٩٤٢ راستە/سەرەشتیی) ، دەستەیەك لە کوردە نەتەوەخوازەکان کۆمەڵەی ژیانی کوردیان لە مەهاباد دامەزراند ، ئەو کەسایەتییانە لە وردە بازرگان و کارمەندی ساکار پێکدەهاتن . لەپێناو پاراستنی پەیرە و کارنامەی ڕێکخراوەکەدا ، تەولوی ئەندامانی کۆمەڵە لەخوار سەتەوە بوون و لە شانەکاندا ڕێکخرابوون . کۆبوونەوەی نیوەهەفتانە لە ماڵە تایبەتەکاندا ئەنجامدەدرا ، بەلام دوو کۆبوونەوە پێکەوە لەهەمان ماڵدا ئەنجام نەدەدرا .[23] ئەو راستییە نەتەوایەتیی توندی کۆمەڵە دەسەلمێنێت کە ئەوەی لەدایك و باوکەوە کورد نەبوایە بە ئەندام وەرنەدەگیرا . تەنیا حاڵەتێك لەو یاسایە بەدەر بوو ئەویش ئەو کەسە بوو کە باوکی کورد و دایکی ئاسوریی بێت . ئەوەش جۆرە لەبەرچاوگرتنێکی سەرسوڕهێنەرە ، سەبارەت بەو پەیوەندییە ئاڵۆز و نالەبارەی لەنێوان ئەو دوو گەلەدا پاش جەنگی یەکەمی جیهانیی هاتەکایەوە ، بەلام وەك (ئارچی ڕۆزفێلت جی ئار) ی ئەمەریکیی دەڵێت ، دەگونجێت " بەلگەیەك بێت بۆ پەیوەندییەکی دۆستانەی هەنوکەیی لەنێوان کوردان و ئاسورییەکاندا ".[24]

کۆمەڵە ، کە تا دەهات پێی خۆی لە کوردستانی ئێراندا دەچەسپاند ، هیچ کاتێکی سەبارەت بە فراوانکردنی چالاکییەکانی بۆ نێو ناوچە کوردنشینەکانی وڵاتانی هاوسێ بەفیڕۆ نەدا . بەتایبەت لە عێراقدا فرە چالاك بوو ، لەوێ لقی تایبەتی لە موسڵ ، کەرکوك ، هەولێر ، سلێمانی ، ڕەواندز و شەقلاوە هەبوو . تەنانەت باس لە بوونی لانی کەمی لقێکیش لە تورکیا دەکرێت .[25]

---

[23] Ibid.,250.Cf.Douglas,57ff.

[24] Roosevelt,250.

[25] Ibid.

## پەیوەندیی شورەویی بە کۆمەڵەوە

لەساڵی ١٩٤٤دا ،ژمارەی ئەفسەران و نوێنەرانی شورەویی بەشێوەیەکی بەرچاو لە ئازەربایجان و کوردستانی ئێراندا زێدە بوون . ئەم پیاوانە موسوڵمان بوون و ڕۆڵێکی کاریگەر و چالاکیان دەبینی . یەك لەوانە ئەفسەرێکی سێ‌ئەستێرە بوو بە ناوی (جافەرۆڤ)، کە کوردێکی شورەویی بوو ، بە کونسوڵخانەی شورەوییەوە لە ڕەزائییەوە پەیوەست کرا ، دەگوترێت ئەم کابرایە بە ئارەزووی خۆی بەنێو لادێیی و خێڵەکییەکاندا جرت‌وفرتی بوو و هەروەك ئەوانیش جلوبەرگی دەپۆشی . دوو نوێنەری دیکەی شورەویی ، عەبدوڵلاۆڤ و حاجییۆڤ بوو ، دەگوترێت ئەو دووانە وا خۆیان پێشان دەدا گوایە سەرقاڵی ئەسپ کڕینن بۆ سوپای سوور ، ئەوانە بە گرتنی پەیوەندیی لەگەڵ جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد بەرپرسیار بوون . دەگوترێت دەرفەتی دیدەنیی عەبدوڵلاۆڤ و ژمارەیەك لە ئەندامانی کۆمەڵە بەردی بناغەی یەکەمین پەیوەندیی شورەویی لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە داناوە . پاش ماوەیەك ، قسەکەری ڕووسیی ئەندامانی کۆمەڵە وەك ئەفسەرێکی پەیوەندیی لەنێوان کۆمەڵە و دەسەڵاتدارانی داگیرکەری شورەویی دامەزرێنرا .[٢٦]

نوێنەرایەتیی پڕۆپاگەندەی نێودەوڵەتیی شورەویی(VOKS/کۆمەڵەی پەیوەندییە کەلتوورییەکان لەگەڵ وڵاتانی بیانیی) لەم دەمەدا سەرقاڵی دامەزراندنی چەندین لقی جیاوازی کۆمەڵەی پەیوەندییە کەلتوورییەکانی شورەویی–ئێران بوو لەسەراسەری ئێراندا . ڕێبەرانی کۆمەڵەی ژ.ك داوایان لەو نوێنەرایەتییە کرد لقێکی خۆی لە مەهاباد بکاتەوە ، ئەوەی ، بەوپەڕی بایەخەوە ، ناوی کۆمەڵەی کەلتووریی کوردستان –شورەویی لێنرا .[٢٧]

لە ئەپرڵی ساڵی ١٩٤٥دا ، لە ئاهەنگێکی یانەی کۆمەڵەی پەیوەندییە کەلتوورییەکانی کوردستان–شورەوییدا کۆمەڵە بۆ هەمووان ئاشکرا کرد . کۆنسوڵی شورەویی لە ڕەزائییە و سەرۆکی VOKS ی ئازەربایجان لە ئاهەنگەکەدا میوانی

---

[26] Ibid.,251.

[27] Ibid.,252.

شەرەف بوون . سەرەکییترین بابەتی بەرنامەکە پێشکەشکردنی شانۆنامەیەك بوو بەناوی (دایکی نیشتمان) پیرەژنێك کە بەرجەستەی کوردستانی دەکرد ، لەلایەن سێ چەقۆکێشەوە سووکایەتیی پێدەکرا ، ئەو سیانەی بەرجەستەی عێراق ، ئێران و تورکیایان دەکرد . دوا دیمەنی شانۆنامەکە دەگاتە ئەو شوێنەی (دایکی نیشتمان) بە هەوڵی یەکگرتووی کوڕانی رزگاردەکرێت . ئەو دیمەنەی دوایی سەرنجڕاکێش بوو . بەپێی رۆزفێلت " بینەران کە بەدیمەنی شانۆیی بەو چەشنە ئاشنا نەبوون ، بەتوندیی خرۆشان ، ئەوانەش چەندین ئەوە دوژمنایەتیی قووڵیان لەنێواندا هەبوو ، بەگریانەوە دەست لە ملانیی یەکتربوون و سوێندیان خوارد تۆڵەی کوردستان بکەنەوە "[28]

## چوونی قازیی محەمەد بۆ نێو کۆمەڵە

لەم کۆبوونەوەیەدا بوو کە قازیی محەمەد ، سەرۆکی ئایندەیی کۆماری مەهاباد ، چووە نێو کۆمەڵەوە . کارمەندانی شورەویی بەم پەرەسەندنەی رووداوەکان خۆشحاڵ بوون ، چونکە وا دەردەکەوێت کە بە شوێن کەسایەتیەکی بەتوانای وادا گەڕابن کە رێبەرایەتیی رێکخراوەکە بکات . بە پێی ئەو ئاگادارییەی سەبارەت بەتوانا و دەسەڵاتی خێڵەکان هەبوو ، شورەوییەکان هەوڵێکی بێهوودەیان دا تا هانی یەکێك لەسەرخێڵەکان بدەن رێبەرایەتیی جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد بگرێتە دەستۆ . شایەنی باسە شورەوییەکان بۆ ئەو مەسەلەیە سێ لە بەهێزترین سەرخێڵەکانی کوردستانی ئێرانیان لەپێش چاوی خۆیان دانابوو کە قەرەنی ئاغای رەیس عەشایری سەرخێڵی مامش ، عەمەرخانی شەریفیی سەرخێڵی شکاك ، هەروەها ئەمیر ئەسعەد ی سەرخێڵی دیبوکریی . هەریەك لەو سێ کەسایەتییە بەرێزە داواکەی شورەوییان رەتکردبووەوە .[29]

شورەوییەکان کە لەگەڕان بۆ دەستکەوتنی پێشەوایەکی کورد بەردەوام بوون ، دواجار بڕیاریان لە قازیی محەمەد دا ، کە بە میرات قازییەکی ئایینیی مەهاباد و یەکێك لە رێبەرە ئایینییەکانی ئەو شارە بوو . پاش ماوەیەکی کەم توانیان متمانەی قازیی بەدەست

---

[28] Ibid.

[29] Ibid.,252-53.

بێنن . سەردانی بەردەوام بۆ لای قازیی محەمەد و ئەو تێبینیانەی چڕکرانەوە لە کۆتاییدا پەرەسەندنی بایەخداری لێکەوتەوە . شورەوییەکان بەفشارخستنە سەر حکومەتی ئێران ، توانیان ئەمیر ئەسعەد کە نوێنەری ژاندارمەریی ناوچەکە بوو بگۆڕن و (سەیفی قازیی) کوڕەمامی قازیی محەمەد ، بخەن شوێنی و بیکەن بە فەرماندەی خۆجێی هێزی ژاندارمەریی . ئەم بایەخە ، بەڵگەیەکی راستەقینەی بەهای ئەو دۆستایەتییەی شورەوییە ، هەروەها نموونەیەکە بۆ ئەگەری هەر دەستکەوتێکی ئایندەیی کە لە ڕێگای هاوپەیمانیەتییەکی بەرهەمداری بەوچەشنە بێتە دی .

پاش ماوەیەکی کەم ، قازیی محەمەد بەتەواویی دەستی بەسەر کومەڵەدا گرت . وا دەردەکەوێت هێندێك لەرێبەرانی کۆمەڵە بە چاوی گومانەوە لەم پەرەسەندنەیان روانیبێت . هەورەك رۆزفێلت دەڵێت :

" دەگوترێت کە قازیی محەمەد پاش ساڵێك لە دامەزراندنی کۆمەڵە بە بوونی ئەو رێکخراوەی زانیوە کاتێك بەشێوەیەکی نهێنی نوێنەری نارد تا لایەنگریی خۆی پێشکەش بکات . رێبەرانی کۆمەڵە بڕیاریاندا رێگای نەدەن ، ئەوان لە کەسایەتیی بەهێز و دەسەڵاتخوازیی قازیی دەترسان ، هەروەها لەترسی ئەو گوێڕایەڵییەی هەر لە منداڵییەوە لەراست قازیی و بنەماڵەکەیدا لێڕاهاتبوون . لە کۆتاییدا ئەو دەستی بەسەر کۆمەڵە و روخسارە دیموکراتییەکەیدا گرت . بەڵام کاتێك بەهۆی پێداگریی رووسەکان ناچاربوون وەریبگرن ، ئەوەی لێی دەترسان هاتەدی ، فەرمانڕەوایەتیی کۆمەڵە لەلایەن تاقە پیاوێکەوە "[٣٠]

ئەو تەنیا دەسەڵاتی توندی خۆی بەسەر کۆمەڵەدا نەچەسپاند ، بەڵکو رەوتێکی رامیاریی ئەوتۆشی گرتەبەر کە شورەوییەکان پێیان باش بێت . قازیی هەرچەندە خوازیاریی ئەوە بوو لەگەڵ شورەوییەکان بچێتە پێش ، پەرەسەندنی رووداوەکانی داهاتوو دەریدەخات .

---

[30] Ibid.

قازیی محەمەد سەر بە یەکێك لە دیارترین بنەماڵەکانی کوردستانی ئێرانە- بنەماڵە ی قازییە میراتگرەکانی مەهاباد . دەرکەوتەیی ئەم بنەماڵەیە تەنیا بۆ خواپەرستیی و زانایی ئەندامەکانی ناگەڕێتەوە ، بەڵکو بۆ رۆڵی بوێریی و نیشتمانپەروەریشیان دەگەڕێتەوە کە لە قۆناغە قەیراناوییەکاندا بینیویانە . ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە زیاتر لە جارێك بوونەتە پێشڕەوی گەلی خۆیان ئازایانە ئەرکی لێپرسراویەتییان لە قۆناغە پڕ مەترسیی و ناهەموارەکاندا گرتۆتە ئەستۆ . بەم چەشنە ، خەڵکانی مەهاباد و دەوروبەری بەشێوەی رێبەرێکی ئایینیی و دنیایی دانپێدانراوی ناوچەکە لێیان دەڕوانین .

باوکی قازیی محەمەد ، قازیی عەلی ، هەروەها یەك لە ئامۆزاکانی ، قازیی مونعیم، گەلێك تێکۆشاون لەپێناو کەمکردنەوەی تونوتیژیی داگیرکاریی سەربازیی رووسیا بەدرێژایی سالأنی جەنگی یەکەمی جیهانیی ، وەختایەکی برسێتیی ، نەخۆشیی و کاولکارییەکانی جەنگ ، باکووری رۆژئاوای ئێرانی وێران کردبوو . مامی قازیی عەلی ، قازیی فەتاح ، رۆڵێکی رێبەرانەی لەدامەزراندنی ئەنجومەنی بەرگریی هەرێمییدا بینی دژی دەستێوەردانی ئازەربایجان لەلایەن سزارییەکانەوە ، هەروەها لەماوەی ئەو ئاڵۆزیی وپاشاگەردانییەی لە دەورانی شۆڕشی (مەشروتە)دا ساڵی ۱۹۰۵ وڵاتی شێواندبوو ، دەگوترێت ئەو کفنێکی بە باڵادا بڕیبوو و داوای لەخەڵك دەکرد بەمەبەستی جیهادکردن دژی هێزەکانی سزاریی پەیوەندی بکەن ، هەر ئەو هێزانەش بوون کە دواتر قازیی فەتاحیان کوشت .[٣١]

لەبەر ئەوە شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە ، کە چ خەڵك و چ دەسەڵاتدارانی ئێران بە چاوی رێزەوە بڕواننە ئەو بنەماڵەیە . تەنانەت رەزاشاش ، وێڕای هەڵوێستی ناحەزانەی لەهەمبەر پیاوانی ئایینیی پایە بەرز ، دەگوترێت کە سەبارەت بەم بنەماڵەیە رێزێکی تایبەتی پێشانداوە و بەشێوەیەکی شیاو مامەڵەی لەگەڵ باوکی قازیی محەمەد دا کردووە . پاش مردنی قازیی فەتاح لەناوەڕاستی ۱۹۳۰دا ، قازیی محەمەد بە پشتگیریی

---

[31] پسیان ، ۲:۱۵۱ بەگوێرەی نیکیتین ، قازی فەتاح لەماوەی سالأنی جەنگی یەکەمی جیهانیی مەزنترین پلەی لەنێو بنەماڵەکەیدا هەبووە Nikitine,Les Kurdes,136n.1.

دەسەڵاتدارانی مەدەنیی و سەربازیی مەهاباد وەك قازیی ئەو شارە دامەزرێنرا .[32]

بێگومان خوێندەواریی و زانایی قازیی محەمەد و کەسایەتیی بەهێز و پلەوپایەی بنەماڵەکەی ، لەگەڵ پۆستەکەیدا ، لە مەهاباد توانا و دەسەڵاتێکی بەرچاویان پێبەخشی . سەبارەت بە جیهانی دەرەوە ، هەرچەندە ئەو لەسەرەتادا بەتەواویی نەناسرابوو ، تا ئەو کاتەی رووداوەکان گەیاندیانە ئەو شوێنەی لەئاستی نێودەوڵەتیی وەك سەرۆکی کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد بناسرێت . دڵسۆزیی و راستگۆیی قازیی محەمەد ، هەڵسەکەوتی ئاسایی و جلوبەرگە ساکارەکەی کاریگەری بەرچاوی لەو بیانییانە کردبوو کە ئەو دیمانەی لەگەڵ سازداون و بینیویانە .

لەنێو ئەوانەی چاویان بە قازیی محەمەد کەوتووە ، هیچ کامیان وەك ئارچی رۆزفێڵت جی.ئار وەسفێکی دۆستانەی ئەو پێشەوا کوردەیان نەکردووە . ئەو وێنەیەی قازیی کە لە نووسینەکەی رۆزفێڵت دا دەردەکەوێت بریتییە لە نیشتمانپەروەرێکی رەسەن ، پیاوێکی رووناکبیر و هۆشمەند کە بەهرەیەکی فرە لە لێبوردەیی و چاوپۆشیندا دەبینێتەوە . تەنانەت پاش ئەوەش گەیشتە دەسەڵات ، هیچی وای لێنەدیتراوە کە وەك دەمارگیرێکی زێدەڕۆ و ئارەزووباز ، یان کەسێکی خاوەن پایەی سەرەڕۆ و خۆبەزلزان ، یان کەسێکی توندوتیژ کە بەزۆر سواری ملی دەوروبەری بێت ، خۆی بنوێنێت . بە پێی رۆزفێڵت " وەك پیاوێکی متمانەبەخۆ ، پشت ئەستور بە ئازایەتییەکی کەم وێنە و لەخۆبورد دەردەکەوت ، بەڵام بیرفراوان و لێبوردە و نەرمونیان. "[33] پاش ئەوەی دواتر کۆماری مەهاباد رووخا ، لەکاتێکدا قازیی محەمەد بەوەی زانی کە خۆی و سەدری قازیی برای سزای مەرگیان بەسەردا دراوە . کاردانەوەیەکی سەرنجراکێشی لێدەرکەوت . ئەو بۆ رزگارکردنی گیانی خۆی نەدەپاڕایەوە ، بەڵکو بۆ براکەی تێدەکۆشا . ئەوەی بەبڕوای

---

[33] Roosevelt,262.

لەم بارەیەوە جێگەی سەرنجە بەراورد لەنێوان قازیی محەمەد و سەتارخانی سەرکردەی بەناوبانگی (خۆبەخشە نیشتمانپەروەرەکان)ی ئازەربایجان لەماوەی جوڵانەوەی دەستوورییدا بکرێت . سەبارەت بە دابەزینی پلەبەپلەی پێگەی سەتارخان بڕوانە :

Browne,Edward. The Persian Revolution of 1905-1911.Cambridge :Cambridge Univ. Press,1910,570.

قازیی محەمەد ، قوربانی بێدادییەکی مەزن بوو .[٣٤]

# حیزبی دیموکراتی کوردستان

## پلانەکانی شورەویی بۆ حیزبە کوردییەکە

لەهاوینی ١٩٤٥دا ، یەکێتی شورەویی بڕیاریدا سیاسەتێکی نوێ لە ئێراندا بگرێتە بەر کە ئامانجی هاندانی هەرێمەکانی باکووری ڕۆژئاوای ئێران بوو تا خودموختارییەك بۆ خۆیان بێننە دی یاخود لەباقی دیکەی وڵات جیاببنەوە . بۆ ئەوەی زەمینە لە پێناو جێبەجێکردنی ئەم پلانە خۆشتربێت ، لقی حیزبی تودە لە ئازەربایجان خۆی هەڵوەشاندەوە و لەژێر ناوی حیزبی دیموکراتی ئازەربایجاندا خۆیان ڕێکخستەوە . ئەم حیزبە زمانی تورکیی ئازەریی وەك زمانی فەرمیی خۆی ڕاگەیاند و داوای جیابوونەوەی لەئێران کرد . شورەویی پەنای بۆ ئەم تاکتیکە برد ، بەگوێرەی ڕۆزفێڵت ، بۆ ئەوەی بۆ ئەوەی ڕەگەزە چەپەکان لە ئازەربایجاندا دەستکراوەتر بن ، بێئەوەی هیچ گرفتێك بۆ حیزبی تودە لەبەشەکانی دیکەی ئێران پێکبهێنن . بەپێی گوتەی ئەو ، ئەوان ئیدی دەتوانن " شۆڕش بەرپاکەن ، سەربەخۆیی هەرێمەکە ڕابگەیەنن ، هەروەها دەگونجێت داوای ئەوە بکەن بە یەکێتی شورەوییەوە پەیوەست بن ."[٣٥] لە دیسەمبەری ١٩٤٥دا ، حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان ، بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی خودموختاریی ، کۆماریی دیموکراتیی ئازەربایجانی لەتەبرێز ڕاگەیاند .

هەروەها پلانەکەی شورەویی ، دامەزراندنی حیزبێکی نوێی کوردیی لەبەرچاوگرتبوو . وەك ڕۆزفێڵت ئاماژەی پێداوە ، ئەستەم بوو چاوەڕێی ئەوە بکرایە کە کوردان پەیوەندیی بە حیزبێکەوە بکەن کە بۆ نەتەوایەتیی ئازەربایجان تەرخانکرابێت . لە ١٢ی سێپتەمبەری ١٩٤٥دا ، کاپتن نەمازەلییێف ، سەرکردەی هێزەکانی شوروەویی لە میاندوئاو ، هەواڵی ئەوەی داوە کە ژمارەیەك لە ڕێبەرانی کورد ، کە قازیی محەمەد و سەیفی قازییشیان لەنێودابووە ، کۆکراونەتەوە و لەگەڵ کۆنسوڵی شورەویی لە تەبرێز

---

[٣٤] پسیان ، ١:١٧٦

[35] Roosevelt.261.

چاوپێکەوتنیان کردووە . پاش ئەوەی گەیشتنە تەبرێز ، داوا لە کوردەکان کرا بچنە وێستگەی شەمەندەفەر ، لەوێرا خستنیانە ناو فارگۆنی قەتارێکەوە کە بەرەو باکۆیان بەرێت .[٣٦] لەو ماوەیەدا برابوونە گەڕان و نمایشی شانۆیی و ئۆپەرێتیان بینیبوو ، دواتر گەیشتبوونە ئەوەی چاویان بە کارمەندێکی گرنگی شورەویی بکەوێت . بەگوێرەی رۆزفێلت:

" لەرۆژی چوارەمدا رێنوێنیی کران بۆ بینینی باقرۆڤ ی سەرکۆماری ئازەربایجانی سۆشیالیستیی شورەویی (لەراستییدا سەرۆکی ئەنجومەنی سۆڤێتی بالآی ئازەربایجان) کە بە گوتارێك باسی لەو ئەهامەتییە کرد ئەوان لەسایەی رەزاشا چەشتوویانە ، هەروەها گوتی کە حکومەتی شورەویی پشتگیریی ئەو حیزبە دیموکراتە نوێیە دەکات کە لە پێناو ئازادیی چەوساوەکاندا دامەزراوە و بەکوڵ هانیدان کە پێوەی پەیوەست بن . ئەو سەرزەنشتی هەردوو حیزبی تودە ، کەوەك دەستەیەك ئاژاوەگێڕی دەستەپاچە ناوی هێنان ، هەروەها کۆمەڵەی کرد ، کە وەك ئەو گوتی لەعێراق لەژێر چاودێریی سیخوڕە بەریتانییەکاندا دامەزراوە و جگە لە ئامرازێکی دەستی ئیمپریالیزم هیچ شتێکی دیکە نیە . ئینجا پاش ئەوەی وریاکرانەوە کە سەبارەت بەو سەردانە ، هیچ شتێك نەدرکێنن . کوردەکان خرانە ناو قەتارێکەوە بەرەو تەورێز ، لەوێش سواری ماشێنی سوپای سوور کران بۆ بەرەو ماڵی خۆیانیان گێڕانەوە .[٣٧]

ئەم گێڕانەوەیە پێشانی دەدات کە دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان بە هاندانی شورەوییەکان بووە . گەیشتنی سەرانی کورد بۆ باکۆ لەهەموو حاڵەتێکدا بەشێوەیەکی وا ئامادەکراو بوو کە ئامانجێك بێت تێیدا فەرمانی پێویستیان بدرێتێ .[٣٨]

---

[36] Ibid.

[37] Ibid.

[38] حاجی بابەشێخ کەوەك سەرۆك وەزیرانی رژێمەکەی مەهاباد رازەی کردووە ، باسی لە گەشتێکی کردووە کە لەگەڵ ژمارەیەك لە سەرکردەکانی کورد چوونەتە باکۆ ، لەوێ ، چاوی بە ژێنراڵ (ئەتاکیشۆف) کەوتووە کە یەك لە سەرکردە سەربازییەکانی شورەویی بووە . ئەو ژێنراڵە فەرمانێکی پێداون و گوتوویەتی کە دەبێت جێبەجێ بکرێت دەنا سزای گران چاوەڕێیان دەکات حاجی دەڵێت گوایە گرفتەکە لەوێوە دەستیپێکرد کە خۆی وەك ناڕازییەك پێشان داوە ، قازیی محەمەد هەڕەشەی ژارخواردنی کردووە . پاش ئەوەی بۆ ماوەی پازدە رۆژ هێشتوویانەتەوە ئەوجا رێگەیان داون بگەڕێنەوە لەوەدەچێت سەرکردەکانی کورد چەند جارێك سەردانی باکۆیان کردبێت

## دامەزراندن و ئامانجەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان

پاش ئەوەی قازیی محەممەد گەڕایەوە مەهاباد ، بانگێشتی کۆبوونەوەیکی لە پیاوماقوڵان ، ڕووناکبیران ، ڕۆژنامەنووسان و ئەندامانی پەرلەمان کرد بۆ ئەوەی تێیدا دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان ڕابگەیەنێت . ئەو داوای لە تێکڕای کوردان کرد پەیوەندیی بەو حیزبەوە بکەن و زۆر کەسیش ئەو کارەیان کرد .

بەیاننامەیەك کە ئامانجەکان و سیاسەتی حیزبی تازەدامەزراوی گرتەخۆ ، بە واژۆی قازیی محەممەد و ژمارەیەکی مەزنی سەرانی کورد بڵاوکرایەوە . لە بەیاننامەکەدا هاتووە ، ئەمێستا کە جیهان لەدەست فاشیزم ڕزگاری بووە ، کوردیش خوازیارە لە سوودەکانی پەیمانی ئەتلانتیك بەهرەمەند بێت . هەروەها بەردەوام دەبێت و دەڵێت کە کوردان جگە لەمافە دەستووریی و مرۆڤایەتییەکانیان لە خەیاڵی شتێکی دیکەدا نین ، ئەو مافانەی کە ڕەزاشا بۆ ماوەیەکی زۆر خۆی لێ لادەدا و نەیدەسەلماند .[39] بەرنامەی حیزب لەم خاڵانەی خوارەوە پێکدەهات :

– میللەتی کورد لە ئێراندا لە هەڵسوڕاندن و پێکهێنانی کاروباری جێگای خۆی ئازادبێت و لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا خودموختار بێت .

– زمانی کوردیی بکرێتە زمانی خوێندن و زمانی فەرمیی لە کاروباری کارگێڕییدا .

– ئەنجومەنی ویلایەتی کوردستان دەبێت دەستبەجێ بە پێی قانونی ئەساسیی هەڵبژێردرێت و چاودێریی هەموو کاروبارە دەوڵەتیی و کۆمەڵایەتییەکان بکات و پێیان ڕابگات .

– کارمەندانی دەوڵەت دەبێت لە خەڵکی ناوچەکە بێت .

---

بەگوێرەی بابەشێخ ، قازیی دوو جار و سەیفی قازییش سێ جار چوونەتە باکۆ پسیان ، ۲:۱۷۲-۱۷٤

[39] Roosevelt,254; Kurdish League . Memorandum sur la situation des Kurdes. 39; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds ,21-22; Bulletin du Centre d Etude Kurdes, (1948),17.

**– یاسایەکی تایبەت بۆ هەردوو رەعییەت و ئەرباب دابنرێت کە دوارۆژی هەردووکیان زامن بکات .**

**– حیزبی دیموکراتی کوردستان تێدەکۆشێت لەنێوان میللەتی ئازەربایجان و ئەو میللەتانەی لە ئازەربایجان دەژین (ئاسووری ، ئەرمەنیی و هتد) یەکێتیی و برایەتیی تەواو بەرقەرار بکات .**

**– حیزبی دیموکراتی کوردستان تێدەکۆشێت لە پێناو چاککردنی کاروباری ئاکار و رەوشی ئابووریی میللەتی کورد لە رێگای دۆزینەوەی سەرچاوە جیاوازە سروشتییەکان ، پەرەپێدانی کشتوکاڵ و بازرگانیی ، هەروەها پەرەپێدانی لەشساغیی و فەرهەنگ .**

**ئێمە دەمانەوێت ئەو نەتەوانەی کە لە ئێراندا دەژین بتوانن بە ئازادیی بۆ بەختەوەریی و سەرکەوتنی نیشتمانی خۆیان تێبکۆشن .**[٤٠]

## کۆمارەکەی مەهاباد : ئامانج و سیاسەتەکانی

**کۆماری مەهاباد لە یەنایەری ١٩٤٦ دا ، پاش مانگێك لە دامەزراندنی کۆماری ئازەربایجان ، دامەزرا .**[٤١] **قازیی محەمەد لە کۆبوونەوەیەکدا کە لەمەهاباد سازدرا و سەرخێڵەکان ، رێبەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان ، مەلامستەفا و سێ لە ئەفسەرانی شورەویی تێدا ئامادە بوون ، سەرەتای کۆمارە کوردییەکەی راگەیاند . ئەنجومەنێکی نیشتمانیی کە لە سیازدە کەس پێکهاتبوو ، دامەزرێنرا و قازیی محەمەد بە سەرۆکی هەڵبژێردرا . کۆمارەکەی مەهاباد بەشێوەیەکی فەرمیی لە مارتی ١٩٤٦ راگەیەنرا .**[٤٢] **لە ئەپرێڵدا ، کاربەدەستانی هەردوو رژێم رێکەوتننامەیەکیان مۆرکرد کە دەڵێت " هێزە سەربازییەکانی هەردوو لایەنی واژۆکەر هەرکاتێك پێویستی کرد یارمەتیی یەکتر دەدەن**

---

[40] Quoted in Roosevelt,255; Kurdish League . Memorandum sur la situation des Kurdes, 39; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds .21-22; Bulletin du Centre d Etude Kurdes, (1948),17-18.

[41] Nikitine,Les Kurdes,201-2;Rambout,102-3. پەیمان، ٢:١٥٦-٦٠.

[42] Daily Express, Mar. 16, 1946;also Rambout,101-2.

".

ئەو رۆژەدا کە کۆمار ڕاگەیەندرا ، قازیی محەمەد هەوڵی کردنەوەی خوێندنگایەکی باڵای بۆ کچان ئاشکرا کرد .[43] ئەمەش هێمایەکی پڕبایەخ بوو ، چونکە لە ناوچەیەکی دواکەوتوو و پڕ نەخوێندەوارییدا ، خولیای فێربوون لەکزییدا بوو ، ئەو ژمارە خوێندگا کەمەی هەبوون وا ئامادەنەکرابوون تا کوردان بە زمانی خۆیان فێری خوێندەواریی بکەن و چ مەبەستێکیشیان نەبوو ئەو کارە بکەن . خوێندن و فێرکردنی کچان بەتایبەت لە ناوچەکەدا نەبوو . یاسای تایبەت سەبارەت بە بە یەک بەرگیی و خوێندنی بەزۆری قۆناغی سەرەتایی دەرچوو . منداڵانی هەژار ، بەخۆڕایی خوێندن ، جلوبەرگ، خواردن ، هەروەها پەرتووک و پەڕاوی دەدرایە .[44] نەبوونی پەرتووک بە زمانی کوردیی یەک لە گرفتە سەرەکییەکانی خوێندنی پێکدەهێنا . سەرەتا ، وەک رۆزفێڵت دەڵێت گوایە " مامۆستایانی کورد وەرگێڕدراوی پەرتووکە فارسییەکانیان لە ڕێگای دەمەوە بە خوێندکارانی پۆلەکان دەگوتەوە . بەڵام پێش ماوەیەکی کەم لە رووخاندنی کۆمارە کوردییەکە ، پەرتووکی کوردیی بۆ تەواویی قۆناغەکانی سەرەتایی چاپکرابوو ."[45]

یەک لە بەپەلەترین پێویستییەکان بریتیبوون لە دابینکردنی ڕێگای پێویست بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاریی ، چ بە مەبەستی رامیاریی یاخود بۆ برەوپێدانی فەرهەنگی گشتیی . بە وەڵامدانەوەی ئەم پێویستییە ، حکومەت دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی رۆژنامەیەکی رۆژانە و مانگنامەیەکی رامیاریی وەرزیی .[46] دوو گۆڤاری دیکە ، هاوار و هەڵاڵەی بە روویی بەدوادا هات .[47] هەڵاڵە گۆڤارێکی ژنان بوو ، لە مایۆی ١٩٤٦ دەستی بەبڵاوکردنەوە کرد .[48] هەموو ئەو بڵاوکراوانە لەسەر ئەو پرێسانە چاپدەکران کە لە یەکێتی شورەوییەوە دەست دەکەوتن ، هەر ئەویش بوو کاغەزی چاپی

---

[43] Rambout,104.

[44] Stepanov,24.

[45] Roosevelt,262.

[46] ئەم دوو بڵاوکراوەیە هەردووکیان ناویان (کوردستان) بوو و وەک ئۆرگانی فەرمیی ڕژێمەکەی مەهاباد دەردەچوون. Ibid.,262;Rambout,103.

[47] Roosevelt,262.

[48] Roosevelt,104.

بۆ دابیندەکردن .[49] بەڵگەیەك بۆ ئەوەی قازیی محەممەد بایەخیی بە زمان و فەرهەنگی کوردیی ئەدا ، ئەتوانرێت لەو راستییەوە چنگ بکەوێت کە قازیی دوو هونەر لەنێو ستافەکەی خۆیدا هەبوو ، هێمن و هەژار ، ئەوانەی رێگەیان درابوویە وێرای کەمی کاغەز ، شیعرەکانیان بە چاپ بگەیەنن .[50] وەك چاوەڕوان ئەکرا ، ئە بابەتانەی کە لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا بڵاوەکرایەوە کاریگەریی زۆری شورەویی بەسەرەوە بوو . وەك رۆزفێڵت ئاماژەی بۆ کردووە " ئەوانەی بەشێکی مەزنی وەرگێڕدراوی بابەتەکانی شورەوییان لەخۆگرتبوو کە وشە بە وشە ئەکرانە کوردیی "[51]

پاش چەند مانگێکی کەم لە دامەزراندنی کۆماری مەهاباد ، ژمارەیەکی زۆری پیاوە ناسراوەکانی کورد بیرخەرەوەیەکیان پێشکەش بە حکومەتی ئێران کرد کە تێیدا داوای پێکهێنانی (ئەنجومەنی باڵای کوردستان) یان کردبوو . ئەوان ئاماژەیان بەوەدابوو کە کێشەی کورد تەنیا پەیوەندی بە بەرژەوەندیی ئەوانەوە نیە . بەڵکو پەیوەندیی بە هەموو کوردێکەوە لە تەواویی ئێراندا هەیە . هەروەها لەسەری رۆیشتبوون ، کە کێشەی کورد بە بڕیاری ئەفامانەی حکومەتی ئێران چارەسەر ناکرێت . بیرخەرەوەکە رایگەیاندبوو " هەنگاوەکەمان ، سۆزی و وەفاداریمان بۆ ئێران پێشانئەدات ، هیواداریین حکومەت رێگە نەدات ئەم دەرفەتەی خستومانەتە بەردەستی بە هەدەر بڕوات "[52]

قازیی محەممەد لە ١ی ژوونی ١٩٤٦دا سەرنجی خۆی بۆ هەواڵنێرێکی نوێنەرایەتیی راگەیاندنی فەرەنسیی دەربڕی . ئەو گوتی :" کوردان بەوە رازیی ئەبن گەر حکومەتی ناوەندیی بڕیاربدات بە ڕاستیی یاسای دیموکراتیی لەسەراسەریی ئێراندا جێبەجێ بکات ، هەروەها دان بەو یاسایەدا بنێت کە ئێستا لە کوردستان سەبارەت بە خوێندن و فێرکردنی کورد و هەروەها خودموختاریی کارگێڕیی نێوخۆ و سوپا

---

[49] حکومەتی ئێران لە تێبینییەکدا کە پێشکەش بە یەکێتی شورەویی کردووە سکاڵای ئەوەی کردووە کە کوردەکان ماشێنی چاپکردنی رۆژنامەیان لە یەکێتیی شورەوییەوە هێناوە تا چالاکییەکانیان فراوانتر بکەن . بەگوێرەی (رۆزفێڵت ،ل٢٦٢-٦٣). سوپای سوور ئەو ئامێر و کەلوپەلی چاپخانەیەی پێشکەش بە حیزبی دیموکراتی کوردستان کردووە

[50] Ibid.,263.

[51] Ibsd.,264.

[52] Kurdish League . Memorandum sur la situation des Kurdes,40-41;also Rambout,105.

بەڕێوەدەبرێت ."[53] کاتێك ڕۆژنامەوانە فەرەنسییەکە سەبارەت بە دەستێوەردانی بیانیی پرسیاری لە قازیی محەمەد کرد ، پێشەوا وەڵامی دایەوە :

" هەلومەرجەکەی کوردستان زۆر لە ئازەربایجان جیاوازترە ، وڵاتی ئێمە هیچ کات لەلایەن لەشکری شورەوییەوە داگیرنەکراوە ، هەر لە کاتی رووخاندنی ڕەزاشاوە ، نە ژاندەرمەریی و نە ئەرتەشی ئێران ، نەهاتوونەتە نێو کوردستانەوە . هەر بۆیە لە رووی کردارییەوە ئێمە لەو دەمەوە بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەژین . لەوەش زیاتر هیچ کات چاو لە دەستێوەردانی بیانیی ناپۆشین لەسەر شوێنێکەوە بێت . کێشەی کورستان بە تەواویی کێشەیەکی نێوخۆییە کە دەبێت لە نێوان کورد و حکومەتی ناوەندییدا چارەسەر بکرێت[54] .

ئینجا قازیی محەمەد رابردووی کوردستانی وەبیرهێنایەوە و گوتی:" گەر ئێستا کوردان داوای خودموختاریی بکەن ، ئەوە بەهۆی بێبایەخیی حکومەتی ناوەندییە بە بەرژەوەندییەکانیان . " ئێمە حەز ناکەین لاسایی ئەمەریکا یا رووسیا بکەینەوە" ئەو گوتی " بەڵام ئەوەش ڕەتدەکەینەوە وەك ئاژەڵی وڵاتانی شارستانیی بژین ."[55]

## گرفت و لاوازییەکانی رژێمەکەی مەهاباد

### رەگەزەکانی ناکۆکیی و دووبەرەکیی

مەهاباد سەرگوزشتەیەکی خەمناکی دیکەی نەبوونی یەکڕیزیی باوی بەرجەستەکارانی چالاکییە ڕامیارییەکانی کوردە . جارێکی دی ، لەکاتی قەیرانە

---

[53] Kurdish League . Memorandum sur la situation des Kurdes,41; "Resume due Memorandum sur la situation des Kurdes," Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no.2(1948),19; Summury of the Memorandum on the Situation of the Kurds and Their Claims (Parise:Imprimerie Louis Jean Gap,1949),23.Cf.Rambout,106.

[54] Kurdish League . Memorandum sur la situation des Kurdes,41;Rambout,106; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds ,23

[55] Rambout,107; Kurdish League . Memorandum sur la situation des Kurdes,41; Kurdish League . Memorandum on the Situation of the Kurds ,23.

نەتەوایەتییەکاندا ، کوردان نەیانتوانی کۆتایی بە ناکۆکییەکانیان بهێنن و سەلماندیان کە توانای یەکخستنی ریزەکانیان نیە . رەگەزەکانی ناکۆکیی و دووبەرەکیی زۆر و هەمەجۆر بوون . خۆخوازیی ، ململانێ و هەروەها پیلانگێڕان لەبەردەم لێکگەیشتنی هاوبەشیی دەستە و تاقمە جیاوازەکاندا رێگر بوو . دژبەیەکیی بەرژەوندییەکان راژەی بە سەرسەختیی و ناتەبایی دەکرد و هۆکاری دابڕان و پەرتبوون و ناکۆکیی بوو .

یەکڕیزیی خێڵە خۆجێیەکان ، کە داهاتووی رژێمەکەی لەسەر بەند بوو ، بێهیوا بۆ دوو بەرەی ناتەبا دابەش بوو ، یەکێکیان لایەنگریی کۆمارەکەی مەهاباد و ئەو دیکەیان دژی بوو . وێڕای ئەوەی دەستە و سەرکردە خێڵەکییە جۆربەجۆرەکانی دەرەوەی ناوچەکە ، وەك حەمە رەشید خانی بانە و پیاوەکانی ، شکاکەکان ، هەرکییەکان ، هەروەها بارزانییەکان ، ئەمانە هەموویان یەك خواست نەبوون . وەك دەبینین ، ئەمانە هەر یەکەیان بەدوای مەبەستی خۆیانەوە بوون کە زیانی بە ئامانجە گشتییەکە گەیاند .

ئەو گرفتانەی کە رژێمەکەی مەهاباد و لە راستییدا کۆمەڵگای کوردەواریی بە گشتیی پێوەی دەینالاند تەنیا بەوەوە نەدەوەستا . کۆمەڵگای کوردەواریی کە لە چەقبەستووییەکی درێژخایەندا بوو ، بەهەرا و نالەی جەنگێکی مەزن و هەروەها لە گێژەنگێکی توندوتیژیی ئایدۆلۆژییا ناکۆکەکاندا بێدار بووەوە و خۆی لە دوو بەرەی جیاوازدا بینیەوە کە هەر یەکەیان لە دژایەتییەکی توندی ئەوی دیکەدا بۆ بەدەستەوەگرتنی جڵەوی رێبەرایەتیی گەلی کورد تێدەکۆشا . ئەوانەش رێبەرایەتیی سونەتیی و رووناکبیرانی تازە دەرکەوتوو بوو .[56]

رەگەزە کۆنەپارێزەکان وەك خەڵکە بەتەمەنەکان ، زۆرینەی سەرخێڵەکان ، چینی بازرگانان ، ئەمانە بە گومانەوە لە نزیکبوونەوەی شورەوییەکانیان دەڕوانی و لەبەر ئەو هۆیەش پشتگیریی شورەوییان رەتکردەوە . ئەمانە هێنانەدی ئامانجە نەتەوایەتییەکانیان بە شێوەیەکی قۆناغ بە قۆناغ لا پەسەند بوو ، هەربۆیە دوورەپەرێزانە و خۆپارێزانە

---

[56] بۆ لێکۆڵینەوە لە ناکۆکیی و پەرتبوونی نێوان کوردەکان بڕوانە:

Maurice Ferro , "La Republicque Autonome Kurd d Azerbaidjan ," Le Monde, May. 8, 1946 ;The Scotsman ,Nov .26,1946; Nikitine,Letter to editor,Manchester Guardian,Spt.15,1950.

هەڵوێستیان وەرگرت . ڕەگەزە گۆڕانخوازە خوێنگەرمەکان ، کە لە لاوان و ڕووناکبیران پێکدەهاتن ، ئەوانەی خۆشخەیاڵتر و سەرەڕۆتر بوون ، هەنگاونانی زیاتریان بەقازانج دەزانی . ئەوانە نەك هەر تەنیا سوپاسگوزاری پشتگیریی شورەویی بوون ، بەڵکو لە زۆر حاڵەتدا بە پەرۆشەوە هانیان دەدا . گومانی تێدا نیە ، ئەم ناتەباییە ڕامیارییە بە توندیی ناکۆکییەکانی قووڵتر کردەوە و یەکڕیزیی کوردەکانی ئێرانی لاوازدەکرد و وەرینی چرۆی کۆمارەکەی خێراتر کرد .

هلومەرجی خێڵایەتیی ناوچەکانی سەر بە دەوڵەتی مەهاباد بەم شێوەیە بوو : سێ خێڵە سەرەکییەکەی ناوچەکە : مامش ، مەنگوڕ ، دیبوکریی بە ئاشکرا دژایەتیی ڕژێمە کوردییەکەیان دەکرد .[٥٧] قەرەنی ئاغا ، پیرە سەرۆکی مامش ، یەك لەو سێ سەرۆکە بوو کە شورەوییەکان ئەو کاتەی بەدوای ڕابەرێك بۆ جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد دا دەگەڕان ، لێی نزیکبوونەوە ، بەڵام ئەو داواکەیانی ڕەتکردەوە . قەرەنی ئاغا و مام عەزیزی کوڕی ، پێکەوە لەگەڵ مەنگوڕی هاوپەیمانانیاندا کە لە ژێر سەرۆکایەتیی بایەزید ئاغابوو ، ئەوەندە ڕاشکاوانە دژی ڕژێمەکەی مەهاباد بوون کە جێگری کونسوڵی شورەویی لە ڕەزائیە ، هەڕەشەی ئەوەی لێکردن کە بارزانییەکانیان تێبەردا . ئەو هەڕەشەیەی لە ڕاستییدا پاش ماوەیەکی کەم جێبەجێ کرا و مام عەزیز و ژمارەیەك لە پیاوەکانی وایان بە پێویست زانی بەرەو عێراق هەڵبێن . ئەم کردەوە تەمێکارانەیە لە ڕاستییدا تەنیا هەلومەرجەکەی ئاڵۆزتر کرد و دوژمنایەتییەکەی قوڵتر کردەوە . ئەمیر ئەسعەد دیبوکریی ، کە ئەویش پێشنیازەکەی شورەویی لەمەڕ سەرکردایەتیی جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد ، ڕەتکردبەوە ، لە پۆستەکەی وەك نوێنەری حکومەتی ناوەندیی لە مەهاباد لابرا ، ئەویش پێی لەسەر هەڵوێستی هاوکارییینەکردن و دوورەپەرێزیی داگرت و لەگەڵ کۆمارە کوردییەکەدا سەروکارێکی نەبوو .[٥٨]

[57] Roosevelt,252-53,265-66.

[58] Ibid.,252-53,265.

## کەسایەتیی و چالاکیی چەند سەرکردەیەکی کوردی ناسراو

لەبەرچاوگرتنێکی کورتی کەسایەتیی و چالاکی ئەو پیاوانەی لەسەر شانۆی رووداوەکانی مەهاباد کاریگەرییان هەبوو ، هێندێك لە کەموکوڕییە نێوخۆییەکانی رژێمەکەمان بۆ دەستنیشان دەکات . ئەو کەسایەتییانە رۆڵێکی گرنگیان لە پەرەسەندە هەمەلایەنە رامیاریی و سەربازییەکاندا بینیوە . هێندێك لەوانە لە رژێمەکەی مەهاباد دا پۆستی بالاّیان هەبوو ، هەروەها لە ژمارەیەك بڕیاری گرنگ بەرپرسیار بوون .

**حەمە رەشیدخان** : حەمە رەشیدخانی بانە یەك لە سەرکردە یاخیی و سەربەگۆبەندەکان بوو کە خۆی بە رژێمەکەی مەهاباد دا هەڵواسیی . وەك پێشتر تێبینی کرا ، پاش هەوڵە شکستخواردووەکەی بۆ دانانی خۆی وەك سەرکردەیەکی نیمچە سەربەخۆ لە دەوروبەری بانە لە ساڵی ١٩٤٢دا ، ناچار بوو رابکات بۆ عێراق . پێکدادانە جۆربەجۆرەکانی لەگەڵ سوپای ئێران و کوردەکانی دیکەدا ئەوەی پیشاندەدا کە ئەو تەنیا هەڵپەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی بوو . ئەو زۆربەی کات خەریکی ئەمبەر و ئەوبەرکردنی سنووری عێراق–ئێران بوو تا ویستەکانی بێنێتە دی یاخود حەوانەوە و پاراستنی خۆی دابین بکات . حەمە رەشید ، کە یەکێك بوو لەو پێنج کەسەی کە لە سایەی کۆمارەکەی مەهاباد دا پلەی (مارشاڵ) یان پێدرا ، لەو شەڕانەدا بەشداربوو کە لە ناوچەی سەقز–بانە –سەردەشت لە ساڵی ١٩٤٢ دا قەومان .[٥٩]

رۆزفێڵت بەم چەشنە باس لەم سەرکردە کوردە دەکات :

" حەمە رەشید بۆ کوردان بەهایەکی گومانلێکراو بوو ، ئەو لەگەڵ ئەرتەشی ئێراندا لە گفتوگۆیەکی بەردەوامدا بوو تا بیکەنەوە بە فەرمانداری بانە ، لە هەمان کاتدا ئەولای کورد و ئێرانییەکان جێگەی گومان بوو بەهۆی ئەو پەیوەندییە نهێنییەی کە لەگەڵ بەریتانییەکاندا هەیبوو . لە ئووتدا ، بیستیەوە کە لە مەهاباد کار بۆ لەناوبردنی ئامادە دەکرێت . حەمە رەشید هەڵات و بەرەو عێراق گەڕایەوە .[٦٠]

---

[59] Ibid.,260.

[60] Ibid.,260n.8.

**زێرۆبەگی هەرکیی** : زێرۆبەگی هەرکیی سەرەرۆیەکی دیکە بوو ، سەرۆکێکی لاوەکیی خێڵی هەرکیی بوو ، سەرەتای کارەکانی خۆی وەك چەتەیەك لە کۆتایی ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە دەستپێکرد و هاوپەیمانێکی سەرکردەی چەتەی یاخیی بەناوبانگ سمکۆئاغا بوو . دوای کوشتنی سمکۆ لەلایەن رەزاشاوە ، زێرۆبەگ بۆ عێراق هەڵات ، لەوێ لە هەلومەرجێکی نادیاری رێژەییدا ژیانی دەبردەسەر ، هەتا داگیرکردنی ئێران لەلایەن ئینگلۆ-رووسەکانەوە کە دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساند بگەرێتەوە ئەو وڵاتە . ئەو پاش رووخاندنی دەسەڵاتدارانی ئێرانیی لە باکووری رۆژئاوای ئێران ملی لە سنوورنا و پەرییەوە و توانی لە ناوچەی دۆڵی باراندوز کە زۆر لە سنووری ئێران -عێراقەوە دوور نیە ، دابمەزرێت .[61] پاش ئەوەی قازیی محەمەد بەسەرۆکی کۆمارە کوردییەکە راگەیەندرا ، زێرۆبەگ یەك لەوانەیە کە کرا بە (ژێنراڵ) . هەروەها یەك لەونوێنەرە کوردانە بوو کە واژۆیان لەسەر ئەو رێکەوتننامەیە کردبوو کە لە ٢٣ی ئەپرڵی ١٩٤٦دا ، لەنێوان دیموکراتە ئازەربایجانییەکان و کوردانی مەهاباد مۆرکرابوو . یەك لە قارەمانیەتییەکانی ، ئەو هەڵاتنە کتوپڕەی بوو بەرەو شنۆ ، کاتێك پیاوەکانی چەند سەربازێکی ئێرانیان خستە بۆسەوە و ئەویش لەگەڵ ژێنراڵ هومایۆنی خەریکی دانوساندن بوو . لەوێ بە مەلامستەفاوە پەیوەست بوو ، پێش ئەوەی مەلا داستانی هەڵاتنەکەی بەرەو شورەویی دەستپێبکات .[62]

بەهای زێرۆبەگ بۆ رژێمەکەی مەهاباد بەتەواویی چەند بووە ، دیار نیە . باس لەوە دەکرێت کە توانیویەتیی خۆی لە دەسەڵاتدارانی شورەویی بەرێتە پێش و ئەوانیش بە باشی دەیانپاراست . جا چەند پەیوەندیی خۆی بە شورەوییەوە بۆ قازانجی خەڵکەکەی بەکار هێناوە تا وەك نێوەندێکی پەیوەندیی لەنێوان ئەوان و دەسەڵاتدارانی شورەوییدا بێت ، یاخود چەندە سوودی لە شورەوییەکان وەرگرتووە بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی تایبەتیی خۆی ، ئەوە نازانرێت .

[61] Ibid.,257n.3.

[62] Ibid.,268.

**عەمەرخانی شەریفیی :** چالاکییەکانی ژمارەیەك لە سەرکردەکوردەکان گومان لەسەر ویست و هاندەرەکانیان دەوروژێنن . یەك لەو نموونە دیارانە عەمەرخانی شەریفییە ، کە یەکێکە لەسەرخێڵە ناسراوەکانی شوکاك و یەك لە بەهێزترین و رێزلێگیراوترین کەسایەتییەکانی کوردستانی ئێرانە . وا دەردەکەوێت کە شوێنی لەسەر چەند چاودێرێکی ئەمەریکییش دانابێت . رۆزفێڵت پێی گوتووە " پیرە پیاوە مەزنەکەی کوردستان "[٦٣] هەروەها (ویلیەم ئۆ .دۆگلاس) دادوەری دادگای باڵای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ، کە چەند ساڵێك پاش رووخاندنی کۆمارەکەی مەهاباد ، بووە بە میوانی ماڵی عەمەرخان و بەرێزێکی زۆرەوە ناوی هێناوە و پەسنی داوە .[٦٤] بەڵام سەبارەت بە ناکاری ، ئەستەمە لە پەڵەی رەشی هەلپەرستیی رزگاریی بێت .

عەمەرخان هاوکاریی لەگەڵ رژێمەکەی مەهاباد کرد و بوو بو یەکێك لە بەدەسەڵاترین و ناسراوترین ئەندامە باڵاکانی ئەو رژێمە تا ماوەیەکی کەم پێش رووخاندنی . ئەو وەك وەزیری جەنگ (حەمەحوسێن خانی سەیفی قازیی وەزیری جەنگ بوو /سەردەشتیی) راژەی ئەو کۆمارەی کرد و یەك لەو پێنج کەسایەتییە بوو کە پلەی ژێنراڵی درایە . هەروەها یەکێك بوو لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستان و یەك لە واژۆکەرانی رێکەوتننامەی ٢٣ی ئەپرلی ١٩٤٦ ی نێوان کورد و ئازەرییەکان بوو .[٦٥] پیاوەکانی خێڵەکەی بە هێزەکانی مەهابادەوە پەیوەست بوون و لەچەند بۆنەیەکدا بەشداریی کارە سەربازییەکانیان کردووە . کاتێك دەرکەوت کە رووخاندنی کۆماری مەهاباد تەنیا مەسەلەی کاتە ، عەمەرخان دەستی لە پشتگیریی کۆمارەکە بەردا و گەڕایەوە ماڵی خۆی لە زایندەشت و چاوەڕێی پەرەسەندنی رووداوەکانی دەکرد .[٦٦] پاش چەند ساڵێك ، کاتێك سەبارت بە پەیوەستبوونی بە کۆمارەکەی مەهابادەوە پرسیاری لێکرابوو ، دەگوترێت کە گوتوویەتی ئەو لە پێناوی ئەوەدا ئەو کارەی کردووە تا گەردنی خۆی رزگارکات .[٦٧]

---

[63] Ibid.,252;Douglas,82.

[64] Ibid.,73-76.

[65] Roosevelt,259.n.5.Cf. پسیان، ٨٢

[66] Roosevelt,265.

[67] Douglas,59.

عەمەرخان کە بەدرێژایی ماوەی کارکردنی لەگەڵ رژێمەکەی مەهاباد ، وادەردەکەوێت کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە (جۆرج ئالن) ی باڵیۆزی ئەمەریکا لە تاران بووبێت . کارێك کە گومانی تێدا نیە ، هەمان پەرۆش و خۆپارێزیی و باداناوە لە پشتیەوە بوو . دۆگلاس باسی لەوە کردووە کە چۆن عەمەرخان بەهۆی هەوڵ و کارکردنی باڵیۆزی ئەمەریکاوە خۆی رزگارکردووە ." کاتێك عەمەر خان بە حکومەتەکەی قازیی محەممەدەوە پەیوەست بوو . پەیوەندیی خۆی لەگەڵ جۆرج ئالن دا پاراست و سەنگی خۆی لە تای تەرازووی حکومەتەکەدا بەدژی لایەنگرانی دەسەڵاتی شورەویی دانا بوو . دوای رووخاندنی حکومەتی مەهاباد ، جۆرج ئالن بە قازانجی کێشەکەی عەمەرخان لەبەردەم شادا بۆی تێکەوت و توانی سەرکەوتووانە عەمەرخان رزگار بکات و وەفاداریشی بۆ ئەمەریکا مسۆگەر بکات .[68]

**حاجی بابە شێخ** : دووڕوویی و هەلپەرستی لە دەورانی کۆماری مەهاباد دا دیاردەیەکی ئاسایی و بەربڵاو بوو . تەنانەت حاجی بابە شێخێکی بەتەمەن و زێدە رێزلێگیراو ، هاوکات لەماوەی ساڵێك تەمەنی کۆمارەکەدا لەگەڵ ئەوەی وەك سەرۆك وەزیران هەڵدەسوڕا ، کەچی پەیوەندییەکی بەردەوامی لەگەڵ حکومەتی ناوەندییدا هەبوو . بە دانپێدانانی خۆی ، ئەو لەپێناو ئاگادارکردنەوەی حکومەتی ئێران و پێدانی زانیاریی سەبارەت بەهەر کارێك کە لەنێوان شورەویی و هاوەڵانی خۆی لە مەهاباد دەگوزەرا ، هەڵدەسوڕا .[69]

**قوباد** : هەواڵی ئەوەش هەیە کە قوبادی کوڕی سمکۆی سەرخێڵی بەناوبانگی شکاك ، لە رێگای عەمەرخانی شەریفیی خزمیەوە ، داوای لە حکومەتی ئێران کردووە تا پیاوەکانی خێڵەکەی چەکدار بکات بۆئەوەی هەڵکوتنە سە مەلامستەفا و هاوەڵانی .[70] مەلا کە لە کۆتاییدا توانی بەرەو شورەویی هەڵبێت . لەو دەمەدا بێهیوا بوو ، لەهەوڵی

---

[68] Ibid.,73.

[69] پسیان ، ٢:١٧٤.

[70] هەمان سەرچاوە ، ٢:٩٢

ئەوەدا بوو لەلایەن هێزە ئێرانییەکانەوە گەمارۆ ئەدرێت . زۆر ئەستەم بوو حکومەتی ئێرانیی داواکەی قوباد بێنێتە دی ، چونکە وەك دەزانین ، عەمەرخان خۆشی بەشدارییەکی لە کاروکردەوە سەربازییانەدا هەبوو کە لە دەوروبەری ولآتی شکاك بەڕێوە دەچوو . لەو رووەوە رۆزفێلت تێبینییەك دەردکێنێت :" حکومەتی ئێران کە بە ئاشکرا نەیدەویست ئەو منەتە بێنێتە سەرخۆی ، عەمەرخانی لەبەرنامەکەی خۆی بۆ پەلاماری ئازەربایجان ئاگادار نەکردەوە ، هەربۆیە وەختایەکی ئەو پیاوەخێڵەکییەکانی بۆ لێدانی دیموکراتەکان خڕکردەوە ، جەنگ کۆتایی پێهاتبوو ."[71]

## رۆڵی بارزانییەکان

بارزانییەکان- بێهیوا ، سەرسەخت ، هەروەها خاوەن مەبەستی تایبەت کە بەدوای کەون- هەر لە سەرەتاوە سەرچاوەی هەردوو حاڵەتی بەهێزیی و لاوازیی دەوڵەتە کوردییەکە بوون ، وێڕای ئەوەی هەر لەسەرەتاوە لەلایەن رژێمەکەی قازیی محەمەدەوە باوەشیان بۆ کرایەوە . کەمێك پاش ئەوەی گەیشتنە ئێران ، دەستیانکرد بە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ئێراندا و بەوە رازیبوون چەکەکانیان دابنێن و وەك دوورخراوەیەکی رامیاریی نیشتەجێ بکرێن . پاش ئەوەی لەگەڵ حکومەتی ئێراندا نەگەیشتنە رێکەوتنێك ، بیریان گۆڕیی و چوونە ژێر سایەی قازیی محەمەدەوە .[72] بارزانییەکان لە رووی راهێنان و چەکدارییەوە لەزۆربەی هێزەکانی خێڵەجۆربەجۆرەکان باشتر بوون ، فرە بۆیان ئەستەم نەبوو شوێنی خۆیان لە پۆستە باڵاکانی سەربازییدا بگرن . ئەوان سەرکەوتووانە بەرسنگی سوپای ئێرانیان گرت ، خێڵە ناهاوکارەکانیان دەتۆقاند ، بەگشتیی سەلماندبوویان چالاکترین و کاریگەرترین هێزی جەنگاوەرن لە کوردستانی ئێراندا .

هەرچەندە ، دەرکەوتنی لەناکاوی هێزێکی بەرچاوی بەو توانایە لە ناوچەیەکی سنووورداری وەك کۆمارەکەی مەهاباد دا ، پەیوەندیی ئاسایی هێزەکانی لەنێو خێڵەکانی ناوچەکەدا شێواند . گەیشتنی بارزانییەکان بێگومان تورەیییەکی سەبارەت بە

---

[71] Roosevelt,267-68.

[72] پسیان ،٢: ٤٥-٤٧

داگیرکارییەکی نابەجێی(دەرەکیی) وروروژاند ، بە تایبەتیی لەنێو ئەو خێڵانەدا کە بەرژەوەندییەکانیان بە توندیی لێدرابوو . سەرەڕای ئەو سۆزە کوردایەتییەی کە لەو کاتەدا بڵاو بوو ، هەروەها سروشتی ئەرکی بارزانییەکان لە مەهاباد دا ، ئەو دەستێوەردانە لە کاروباری نێوخۆیی لەلایەن دەستەیەکی دەرەکییەوە ، واپێدەچوو لەلایەن کوردانی بیرتەسك و پەیوەست بە بەرژەوەندیی تەسکی خێڵایەتیەوە جێگای چاوپۆشین نەبێت .

هەروەها هاتنی بارزانییەکان بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆماری مەهاباد گرفت و ناڕەزایەتییەکی دیکەی لێکەوتەوە . دابینکردنی خواردەمەنیی و ئازووخە بۆ چەند هەزارکەسێك دەبووە هۆی داچۆڕینێکی قورسی ئەو برەکەمەی سەرچاوە خۆراکییەکانی ناوچەکە و دەبووە هۆی بارگرانییەکی سەختی دانیشتووانەکەی .[73] هەرچەندە ، گرنگترین کێشە و گرفتێك کە پەیوەندیی بەهاتنی بارزانییەکانەوە بۆ کوردستانی ئێران هەیە ، وادەردەکەوێت کە پەیوەندی بە سروشتێکی تەواو جیاوازەوە هەبێت .

وا دەردەکەوێت سەرانی بارزانیی سەرەتا لەگەڵ قازیی محەمەد نەگونجابێتن و هەر زوو پاش گەیشتنیان بۆ ئێران لەگەڵیدا کەوتبنە ناکۆکیی و بەزمەوە . شێخ ئەحمەدی بارزان گوتوویە گوایە ئەو شتانە بیۆە هاتنە پێشەوە چونکە بارزانییەکان ئەو داوایەی قازیی محەمەدیان ڕەتکردەوە کە دەیویست وەك هێزێکی تەمێکارانە بیاننێرێتە سەر خێڵە یاخییەکان . سەرانی بارزانیی جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پەیوەندیی نێوان ئەوان و قازیی محەمەد تا ڕادەیەکی وا تێکچووە کە قازیی لەبەردەم کارمەندانی شورەوییدا بەتوندی وەك داردەستێکی بەریتانیی تاوانباری کردبوون . سەرەنجامی دوایی ئەم ناکۆکییە وەك شێخ ئەحمەد دەڵێت ، ئەوە بوو کە ئەو نێردرایە شەیتان ئاوا و ناچارکرا لەوێندەر تا ڕووخاندنی کۆمار بمێنێتەوە .[74]

[73] Roosevelt.265.

[74] بەگوێرەی پسیان ، ئەم ئاشکراکارییە لەلایەن شێخ ئەحمەدەوە بوو . پاش ئەوەی دوای ڕووخاندنی کۆمار چاوپێکەوتنی لەگەڵدا سازداوە شێخ ئەحمەد پێش چاوپێکەوتنەکە قورئانێکی هێناوە و سوێندی پسیانی داوە کە جگە لە بەرژەوەندیی و بەرزیی ئێران شتێکی دیکەی لە دڵدا نیە . پسیان ،٢: ٢٥-٢٦

## هۆکارەکانی ناحەزیی خێڵەکان بۆ رژێمەکەی مەهاباد

دژایەتیی خێڵەکان بۆ کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد لەئاکامی چەندین هۆکاری مێژوویی ، رامیاریی ، ئایینیی ، کۆمەلایەتیی و ئابوورییەوە بووە .

**هەستی دژە شورەویی** : رژێمەکەی مەهاباد بە ئاشکرا چەندین سوود و پێویستیی لە پەیوەندیی خۆی بە شورەوییەوە دەستدەکەوت . ئەوەی زۆری ئەخایاند بووە جێگای دڵەراوکێی کوردان ، گومانی تێدا نیە کە ناوی مەزنی یەکێتی شورەویی و پلەو پایەکەی ، شوێنی لەسەر زۆرێك لە کوردان دانا و هانی دان لەدەوری دەوڵەتە نوێیەکە کۆببنەوە ، وێرای ئەوەی هەمان پەیوەندیی رازەی بە پەیدابوونی نیگەرانی و ناحەزیی لای بەشێکی بەرچاوی سەرکردە خێڵەکییە دەسەلاتدارە کوردەکان کرد . هەڵوێستی دژە شورەویی ئەم سەرکردانە لە ئاکامی پەیوەندییەکی ئالۆزستانەی مێژووییەوە شەقڵی وەرگرتبوو .

هەمیشە شەڕ لە نێوان رووسیا و ئێران یا رووسیا و تورکیادا بووە و دەبوو ، کوردان وەك دوژمنێکی قەستسەر رووبەڕووی رووسیا ببونایەتەوە . سەرباری ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە بەشێکی بەرفراوانی ولاتی کوردان دەکەوێتە سەر سنووری رووسیا و ئەو دوو ولاتەی هاوسێی باشووری ، هەر ململانێیەکی نوێ زیانێکی مەزن و ئەهامەتییەکی بێوێنەی بۆ کورد لێدەکەوتەوە . بۆ ماوەی نزیکەی دوو سەدە ، کوردانی رەعیەتی شا و سوڵتان وا پەروەردە دەکران کە رووسیا بە دوژمنی پلەیەك و کافری موتڵەق بزانن .

جەنگی یەکەمی جیهانیی ، بەتایبەتیی ، میراتێکی تۆقێن و سڵەمینەوەی سەبارەت بە رووسەکان جێهێشتبوو . ئەو ململانێیە ، کە لە ئاکامی راگەیاندنی جیهادەوە لەلایەن تورکانەوە سەریهەڵدا ، ئاگری رق و کینەی رەگەزیی و ئایینیی هەڵگیرساند . جەنگ لەو بەرەیەوە زۆربەی جار ئەنجامدانی کوشتاری بەکۆمەڵی لە یەکدی لێدەکەوتەوە ، هەریەك لە هەوڵی ئەوەدا بوو بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵبێت . هەستی دژە رووسیا وەك چاوەڕواندەکرا ، لەنێو ئەو رەگەزە کوردانەی کوردستانی ئێراندا بەهێز بوو کە گوێبیستی

پرۆپاگەندە پان-ئیسلامییەکانی تورکیا بوون .[75] ئەوانەی زۆرینەی کوردانی ئێرانیان پێکدەهێنا ، ویڕای ئەوەی نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێت ، کە هێندێکیش هەبوون لەپاڵ رووسەکاندا بوون .[76]

لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕش لە رووسیا و دامەزراندنی رژێمی شورەویی ، جۆرە هەڵوێستێکی نوێ لەهەمبەر رووسەکان سەریهەڵدا . نیگەرانی لە هەڵوێستی ئایینکوتانی حکومەتی شورەویی بووە سەرباری ئەو هەستە دژ بە رووس و دژ بە کریستانییەی پێشتر لای کوردان هەبوو . بێگومان ئەو هەستە دژ بە شورەوییە لەنێو سەردارە کورد و خانەدانە موڵکدارەکانی دیکە زۆر بەهێزتر بوو ، ئەوانەی دەترسان لەسایەی سیستمێکی هاوشێوەی شورەوییدا بە تەواویی دەسەڵات و موڵك و ماڵەکانیان لەدەستبچێت .

**هۆکاری ئابووریی :** هۆکارێکی دیکەی گرنگی بێزاریی کوردانە دژی رژێمەکەی مەهاباد . جوتیارانی کورد ، بەتایبەتیی توتنەوانەکانیان ، ئەوانەی بژێوییان بەشێوەیەکی سەرەکیی پشتی بە بازاڕی ئێرانیی دەبەست ، تووشی زیانێکی ماددیی مەزن بوون بەوەی لەبەشەکانی دیکەی بازاڕی ئێران دابڕان . وەك پێشتر تێبینیی کرا ، ئەهامەتیی و بارگرانییەك کە کەوتبووە سەرشانی کوردان ئەوەبوو کە دەبوایە ئەو خۆراك و دانەوێڵە کەمەی هەیانبوو ، بەشی ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەرانی بارزانی لێبدەن .[77]

**بێزاریی لە سەرکردایەتیی قازیی محەمەد :** لە کۆتاییدا ، زۆربەی سەرخێڵە

---

[75] پێویستە تێبینیی ئەوە بکرێت کە بە هۆی پەیوەندیی کۆماری مەهاباد و یەکێتی شورەویی توڕەبوون و چالاکانە دژایەتیی قازیی محەمەدیان دەکرد . لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیی ١٩١٤-١٩١٨ لەنێو بەرەی سەرسەختترین لایەنگرەکانی تورکدا بوون دوای شەڕێکی توند لەنێوان یەکە قەفقاسییەکان و چەکدارە خێڵەکییە کوردەکاندا ، بایزپاشای سەرۆکی بەناوبانگی مامش کوڕێکی لەو شەڕەدا لەدەستدا ، دەگوترێت ئەو تەلەگرافێکی ناردووە و دەڵێت : " کوڕە لاوەکەم کە ژمارەیەکی زۆر رووسی کوشت ، بەدەم برینەکەیەوە گیانی دەرچوو و بووە قوربانیی سوڵتان . گەر خوا پێی خۆش بێت ، کوڕەکەی ترم و خۆشم لەسەر هەمان رێباز دەڕۆین و خۆمان بۆ خەلیفە دەکەینە قوربانیی " عباس العزاوي ، عشائر العراق ، ٢: ١١٦ .

[76] وەك پێشتر تێبینیی کرا ، عەمەرخان لە لایەنگرانی بەرایی رژێمەکەی مەهاباد بوو بەگوێرەی (دۆگلاس.ل٢٤) عەمەرخان دەساڵی لە زیندانی تورکەکاندا بەسەر بردووە بەهۆی ئەوەی کە ساڵانی جەنگ دژیان جەنگاوە

[77] Roosevelt.265.

کوردەکان سەبارەت بە دەرکەوتنی قازیی محەمەد لە پلەوپایەی دەسەڵاتێکی باڵادا و لە رێگای تاڕادەیەك نائاسایی میکانیزمی پارتایەتیی و هەروەها بەهۆی پشتگیریی خەڵکی شارنشینەوە بێزاربوون . دەسەڵات لە کوردستاندا ، هەر لە کۆنەوە لەدەستی ئەوانەدا چڕبۆتەوە ، کە دەستیان بەسەر رێکخراوی نیمچە سەربازیی خێڵە جەنگاوەرەکاندا گرتووە . ئەم دەستبەسەرداگرتنە لە رێگای پەیوەندییە خێڵەکیی و دەرەبەگایەتییە زاڵەکانەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە . چینە دەسەڵاتدارە فەرمانڕەوا سونەتییەکانی کورد زادەی سێ دەستەی جیاوازن : میرایەتییە میراتییەکان ، شێخی تەریقەتە ئایینییەکان و هەروەها سەرخێڵەکان . هەموو ئەو سەرکردە کوردانەی بانگەشەی کوردایەتییان دەکرد و خەونی فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆیان بۆ ناوچە کوردییەکانی دیکە هەبووە ، سەر بە یەك لەم سێ دەستەدەسەڵاتدارە بوون . کارەکانی میربەدرخانی بۆتان ، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی و هەروەها سمکۆئاغای شکاك ، دەتوانرێت وەك سێ نموونە ئاماژەیان بۆ بکرێت.

لەسایەی هەلومەرجێکی ئەوتۆدا، ئاستەنگ دروستبوون لەبەردەم خواستی رێبەرایەتیی نەتەوەیی کەسێکی وەك قازیی محەمەد ، مەسەلەیەکی حەتمییە . ئەوە راستە کە ئەو ئەندامێکی بەرێزی بنەماڵەیەکی بەناوبانگ و ناسراوی شارەکەی خۆی واتە مەهاباد بوو ، بەڵام ئەو تەنیا کەسایەتییەکی پایەبەرزی ئایینیی و شارنشین بوو ، بێبەش لە هەر پلەوپایە و جیاوگێك کە ئەندامانی دەستەی مەزنە فەرمانڕەواکانی کورد لێی بەهرەمەند بوون . وەك رێبەرێکی نەتەوەیی ، لە خەسڵەتەکانی ئەو رێبەرایەتییە بێبەش بوو کە هەزارەها وەفادار و لایەنگر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە ، ئەوەی لای رێبەرانی پێشوو بەدی دەکرا . ئەو نە پلەوپایەی دەسەڵاتە کۆنەکانی هەبوو کە بەشێوەیەکی کەموێنە لەدەست میرە مەزنەکاندا بوو و بە میراتیی فەرمانڕەوایەتییان دەکرد ، نە ئەو پیرۆزییەی هەبوو کە شێخەکانی تەریقەتی قادریی و نەقشبەندیی لای مووریدەکانیان هەیانبوو . هەروەها نە ئەو دەسەڵات و ناوبانگەی ئەو سەردارانەی هەبوو کە سەرکردایەتیی کۆنفدراسیۆنی خێڵەکانیان دەکرد .

وێڕای تێکڕای ئەو ئاستەنگانە ، قازیی محەمەد بۆ ماوەیەك توانی ببێتە پێشەوای باڵای گەلەکەی . لەنێو تێکڕای ئەو هۆکارانەی ئەویان گەیاندە دەسەڵات ، هیچ یەکیان وەك ئەوەیان بایەخدار نەبوون کە وەك سەرکردەیەکی نەتەوەیی لەلایەن بەشێکی

مەزنی کوردانی ئێرانەوە قابیلی قبووڵ بوو . بێگومان ئەمە مژدەی بایەخێکی قووڵ بوو کە تەنیا هێمای کۆمەڵایەتیی و رامیاریی خۆی هەبوو . ئەوەش بەڵگەیەکی ئاشکرابوو بۆ سووانی دابە کۆمەڵایەتییە کۆنەکە ، هەروەها ئەوەی کە ئەو سیستمە فەرمانڕەوایەتییەی بۆ چەندین سەدە رەگی داکوتا بوو ، خەریکە بکەوێتە بەر مەترسیی رووخان .

ئەو سووانە لە ئاکامی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیی و ئەو رووداوانەی بەدوایدا هاتن ، خێراتربوو . بنیاتنانی کارگێڕییە هاوچەرخەکان لە تورکیا ، ئێران و عێراق لەپاش جەنگ ، پرۆسەی نیشتەجێبوون و هەڵوەشاندنەوەی ژیانی خێڵایەتیی چالاکتر کرد ، هەروەها رەوتی فێرکردن و خوێندەواریی ، پیشەسازیی و شارنشینیی خێراترکرد هێزەکانی گۆڕان بە شێوەیەکی هێواش بەڵام چەسپاو پەرەی سەند و لەگەڵ چوونە پێشی سەدەدا و بۆ دووردەستترین کەنارەکانی کوردستان خۆی دەکوتا و مۆرکی خۆی لە هەموو لایەك دەدا . پەیوەندییە دەرەبەگایەتیی و خێڵایەتییە کۆنەکان لە ئاکامی گۆڕانی خێرا و هەمەلایەنەی جیهان بەشێوەیەکی مەزن لاواز دەبوو ، ئەوەش هێدی هێدی زەمینەی بۆ هاتنە کایەی شێوازێکی نوێی پەیوەندیی و وەفاداریی دەڕسکاند . تیۆری هاوچەرخی نەتەوایەتیی ، لەگەڵ جێگرتن و خۆچەسپاندنی هێماکانی ئەم وەفادارییەدا ، شوێنی لەسەر سروشت سەرچاوەکانی هێز لە کوردستاندا دادەنا .

هەرچەندە ، رووداوەکانی دواتر ئەوەیان پێشاندا کە دەرکەوتنی ئەو گۆڕانانە هێشتا ئەوەندە قووڵ و ریشەیی نەبوو وەك چاوەڕوانی لێدەکرا . دەسەڵاتداریی بەهێزی چینە سونەتییەکان بەسەر کایەکانی ژیانی کۆمەڵگا تا رادەیەکی زۆر وەك خۆی مابوو ، هەروەها زۆرینەی کۆمەڵگا خێڵەکییەکان تازە لەسەرەتای ئەوەدا بوون هەست بە کاریگەریی ئەو بیروباوەڕە نوێیە بکەن . لێرەدا ، کاتێك هەردوولا هێزەکانی خۆیان رێکخست و لەبەرامبەر یەکدا راوەستان ، سەنگی هێزە سونەتییەکان و پەیوەندیی و وەفادارییە کۆنەکان سەلماندی لە نوێیەکە بەهێزترە .

ژمارەیەکی زۆری سەرخێڵەکان بەتایبەتیی ، بەسەرکردەی نوێ وەفادار نەبوون . وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا ، ئەوان لە دەسەڵات و پلەوپایەی تازە بەدەستهاتووی پێشەوا دەترسان و بە گومانەوە لێیان دەڕوانی . ئەو دەسەڵاتەی کە بە شێوازێکی باوی دانپێدانراو بەدەستی نەهێنابوو . بۆ زۆربەیان ، بەدەستهێنانی دەسەڵاتی باڵا لەلایەن

قازی محەمەدەوە لادانێکی بێوێنەی لە نەریت و شێوازی باو پێکدەهێنا . ئەوان بە سووکیی سەیری خواست و پلەوپایەی نوێی پێشەوایان دەکرد و چاویان بە دەسەڵاتیدا هەڵنەدەهات و ئیرەییان پێدەبرد . ئەوان وایان لەقەڵەم دەدا کە پێشەوا دەیەوێت لە سایەی ئەو بیروباوەڕە نوێیەدا حەز و ئارەزووی دەسەڵاتخوازیی بێنێتە دی .

## ڕووخاندنی کۆماری مەهاباد و ڕووداوەکانی دواتر

لەوانەیە ڕاستەوخۆترین تاکە هۆکار بۆ ڕووخاندنی هەردوو کۆمارەکەی ئازەربایجان و مەهاباد بریتیبێت لە بڕیارەکەی شورەویی سەبارەت بە کێشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ئێران لە مایۆی ١٩٤٦دا و لە ئاکامی فشاری توندی هێزە ئەورووپییەکان .لەسەرووبەندی پاشەکشەی هێزەکانی شورەوییدا ، حکومەتی ئێران چالاکانەتر بەرەو کاروکردنەوەی سەربازیی هەنگاوی نا . زیاتر و زیاتر هێزی ئێرانیی هێنرایە ناوچەکە ، قازیی محەمەد کە تەنیا هێزێکی جەنگاوەریی خێڵەکیی لەبەردەستدا بوو ، لە هەلومەرجێکی بێهیواییدا بوو .

لە دیسەمبەری ١٩٤٦دا ، ئەرتەشی شاهەنشاهیی ئێران پەلاماری ئازەربایجانی دا و لە ماوەی ٢٤ساتدا بەرهەڵستیانی تێکشکاند . بەزینی هێزەکانی دیموکراتی ئازەربایجان لەشەوی ١٠ی دیسەمبەری ١٩٤٦دا لە گەڵی قافلانکۆ لە لایەن سوپای ئێرانەوە ، زەنگی کۆتایی کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد بوو . هەروەك چۆن بەر لە ساڵێك ، گرتنی تەبرێز لەلایەن ئازەربایجانییەکانەوە مژدەی دامەزراندنی کۆمارە کوردییەکە بووە . جێگای سەرنجە تێبینی ئەوە بکەین کە فەرمانداری دیموکراتەکان لە ئازەربایجان لە نامەیەکی خۆیدا بۆ سەرۆك وەزیرانی ئێرانی ناردووە ، ڕایگەیاندووە کە سەیفی قازیی سەرکردەی کوردان سەری لەباردودۆخەکە سوڕماوە و فەرمانی وەستاندنی جەنگ و بەرگریی داوە .[٧٨]

دوو ڕۆژ دواتر ، سەدر قازیی ، برای قازیی محەمەد ، چووە میاندوئاو ، لەوێ چاوی چاوی بە ژێنراڵ (هومایۆنیی) سەرکردەی ئێرانیی کەوت . نێوەرۆکی سەردانەکەی

[78] Ibid.,266.

سەرقازیی بریتیبوو لە کارکردن بۆ هەماهەنگی نێوان هەردوو لا تا ناوچەی مەهاباد بێ شەڕ و بەشێوەیەکی ئاشتییانە لەلایەن سوپای ئێرانەوە دەستی بەسەردا بگیرێتەوە . لە ئاکامدا گەیشتنە ڕێکەوتنێک کە هەر زوو پاش ئەوەی بارزانییەکان مەهاباد جێدەهێڵن ، هێزە ئێرانییەکان بەرەو ناوچەکە بکشێن .

پاش ئەوەی بارزانییەکان بەرەو نەغەدە کشانەوە ، سوپای ئێرانی بەرەو مەهاباد کەوتە جووڵە و هێزی خێڵەکیی غەیرە ئیزامیشیان لە خێڵەکانی دیبوکریی ، مامەش و هەروەها مەنگوڕیش لەگەڵدا بوو ، ئەو سێ خێڵەی سەرکردەکانیان ئاحەزی کۆمارەکەی مەهاباد بوون . هەرچەند ، ئەو هێزانە لە نزیک شارەکەوە لەلایەن نێردراوێکی قازیی محەممەدەوە وەستێنران ، ئەوەی ئاماژەی بە ڕێکەوتنەکەدا کە داگیرکردنەوەی مەهابادی خستۆتە ئەستۆی سوپای ئیزامیی ئێران نەک پیاوە خێڵەکییەکان ، ئەوانەی ئامادەبوونیان مەترسیی کەوتنەوەی ئائارامیی و ئاژاوەی لێپەیدا دەبێت . بەڵام ئەم داوایە پەسەند کرا . چەکدارە خێڵەکییەکان پاشەکشەیان پێکرا ، سوپای ئێرانی چووە نێو مەهابادەوە ، هەروەها بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک پەیوەندییەکی دۆستانە لەنێوان سەرکردەکانی سوپا و ڕێبەرانی کورد بەرقەرار بوو .[٧٩]

وێڕای ئەوەش ئەم مانگی هەنگوینییە هەر زوو کۆتاییهات . لە ١٧و١٨ی دیسەمبەردا ، ژمارەیەکی زۆر لە سەرانی کورد ، لەوانە قازیی محەممەد و سەیفی قازیی ئامۆزای ، گیران و زیندانیی کران . لە ٣٠ی دیسەمبەر ، سەدرقازییش لەماڵەکەی خۆی لەتاران دەستبەسەر کرا و هێنایانەوە بۆ مەهاباد ، لەوێ لەگەڵ قازیی محەممەدی برایدا لە گرتووخانە ڕاگیران . بەپێی گشت ئەو بەڵگانەی هەن ، گرتنی سەدرقازیی کارێکی نادروست و نادادپەروەرانە و تۆڵەسێنانە بوو ، بەدرێژایی تەمەنی کۆمارە کوردییەکە ، ئەو جەختی لەسەر هەڵوێستێکی دروست و ناتوندوتیژ دژ بەو ڕژێمە دەکرد کە لەلایەن براکەیەوە ڕێبەرایەتیی دەکرا . ئەو ئەندامی پەرلەمانی ئێران بوو و لە تارانیش دادەنیشت . بەدرێژایی ئەو ساڵە ، تەنیا ئەو جارە تارانی جێهێشتبوو کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانییەوە داوی لێکرابوو وەک نێوەندێک هەڵسوڕێت .[٨٠]

---

[79] Ibid.

[80] Ibid.

به بوونی سەرانی کورد لە گرتووخانەدا ، ئەمێستا سوپای ئێران دەسەڵاتی تەواوی بەسەر مەهاباد دا هەیە ، هەربۆیە داوای لە تێکرای ئەوانە کرد کە شکایەتیان دژی گیراوەکان هەیە پێشکەشی بکەن بۆ ئەوەی تەواوی ئەو بەڵگانەی هەیانە بخرێتە بەرچاو .[81] ئەم هەڵسوکەوتەی دەسەڵاتدارانی ئێران دوا مۆری لە چارەنووسی تۆمەتبارەکان دا . ئەوەی بووە هۆی پێکهێنانی دادگایەکی سەرپێی ، کە بەپێی زانیاریی سەرچاوەیەکی ئێرانیی ، ئەو دادوەرانەی قازیی محەممەدیان دادگایی کرد ، پیاوانێك بوون دەمێك بوو خولیای کۆتاییهێنانی دەسەڵاتی قازییان لە کەللەدا بوو .[82]

ئەوتۆمەتانەی خرانە ئەستۆی قازیی محەممەد بریتیبوو لە : بردنی هەشتا هەزار ریاڵ لە گەنجینەی بۆکان ، هاوکارییکردن لەگەڵ حەمەرەشیدخان و بارزانییەکان ، هەروەها ناردنی پەنجا لاو بۆ یەکێتی شورەویی تا فێری راهێنانی سەربازیی بن .[83] پاش کۆتاییهاتنی دادگاکە ، سزای مەرگ بۆ قازیی محەممەد ،سەیفی قازیی و هەروەها سەدرقازیی بڕدرایەوە . پاش ئەوەی قازیی محەممەد هەواڵی چارەنووسی براکەی بیست ، سەری لە بێدادیی بڕیارەکەی دادگاکە سوڕما و بەرگریی لە ژیانی براکەی کرد ، بەڵام هەوڵەکەی بێهوودە بوو . لەبەر بەیانی رۆژی ٣١ی مارتی ١٩٤٧ ، هەرسێ کەسەکە لە مەیدانی مەهاباد دا بەدارا کران . ئەو شوێنەی بەسەربازانی ئێرانیی و رەشاش بەدەست تەنرا بوو .[84]

کوردان لە هەموو شوێنێك هەواڵی رووخاندنی مەهاباد و لەسێدارەدانی قازیی محەممەد و هاوەڵانیان بە داخ و بێزارییەوە پێگەیشت . لە تورکیا و عێراق ، دەربڕینی سۆزی گشتی لەبار و رێگەپێدراو نەبوو . لە کوردستانی ئێران ، کە لە سایەی یاسای سەربازییدا بوو ، خەڵکەکە داخ لەدڵ و تورە بوون بەڵام هێمن بوون ، وێڕای ئەوەش راپۆرتەکان باس لە کەوتنەوەی هەرا و ئاژاوە لە خورەمئاوا ، شاری سەرەکیی هەرێمی لوڕستان دەکەن ، ئەوانەی لە ١١ی مایۆی ١٩٤٧دا دژی لەسێدارەدانەکانی مەهاباد

---

[81] Ibid.

[82] پسیان ،٢:١٦٩

[83] هەمان سەرچاوە ، ٢:١٧٣

[84] هەمان سەرچاوە

بێزارییان دەربڕیوە و ئەو کارەیان ریسوا کردووە .[٨٥]

ئاسەرواری ناڵەباری رووخاندنی مەهاباد بۆ کوردان و ئەو خەڵکەی لە نێو مەهابادییاندا ژیابوون هێشتا کۆتایی نەهاتبوو . هەروەك پێشتر تێبینیی کرا ، ژمارەیەك لە ئەفسەرانی کوردی سوپای عێراق ، ئەوانەی لەکاتی راپەڕینی بارزانییدا پەیوەندییان بە مەلامستەفاوە کرد و پاش شکستی راپەڕینەکەش لەگەڵی بەرەو مەهاباد بەڕێکەوتن . رووخاندنی مەهاباد ئەو ئەفسەرانەی بەرەو عێراق گێڕایەوە . ئەوانەی هەر زوو پاش گەڕانەوەیان دەستبەسەر کران . لە ١٩ی ژوونی ١٩٤٧ چوار لەو ئەفسەرانە : عیزەت عوبدولعەزیز ، مستەفا خۆشناو ، محەمەد محمود ، هەروەها خەیروڵڵا عەبدولکەریم ، لە بەغدا لەسێدارە دران .[٨٦]

ئەم لەسێدارەدانە ، ترس و بێزارییەکی گەورەی لێکەوتەوە ، ئەمە یەکەمجار بوو عێراق بەو چەشنە مامەڵە لەگەڵ نەتەوەخوازانی کورد دا بکات . کاردانەوەی کوردانی عێراق و کوردانی هەر لایەکی دی ، کاردانەوەی کەسێکی سەرسوڕما و بێهیوا و توڕە بوو . نەتەوایەتیی کورد بەو گورزە نەلاواز بوو ، نە داچوو . لەجیاتی ئەوە سەلماندی بۆتە سەرچاوەی هێزێکی مەزنی دەستیەکی نەتەوەخوازانی کورد بەتایبەتیی . ئەمێستا ئەوانە توێژی رووناکبیری کوردن ، ئەو هێزە نوێیەی لەنێو کورددا لەپێناو بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات کەوتبوونە خۆ و لە ململانێدا بوو ، ئەوانەی توانییان شانازیی بە قوربانییدان و شەهامەتەوە بکەن و لەگەڵ دەسەڵاتدا کەوتنە گفتوگۆ .

بڵاوکراوەی پەناهەندەی کورد لە دەرەوە بەشێوەیەکی بەرفراوان هەواڵی لەسێدارەدانی قازیی محەمەد و هاوەڵانی لە مەهاباد ، هەروەها چوار ئەفسەرەکەیان لە بەغدا ، بڵاوکردەوە . کوردە نەتەوەخوازە تۆخەکان و چەپەکان چۆنیان بیرکردۆتەوە ، ئەوە بە راشکاوی لە دەنگی کوردستاندا دەردەکەوێت کە بڵاوکراوەیەکی دەستنووسی

---

[85] ئەم رووداوانە هانی نووسەرێکی بەناوبانگی کوردیان داوە تێبینیی ئەوە بکات کە لوڕەکان زیاتر لە بۆنەیەکدا سەلماندوویانە کە پاڵپشت و دڵسۆزن لەمەبەر هەموو نەتەوەخوازانی کورد

Hilmi ,The Map of Kurdistan ,8,cited in Rambout,80.

[86] جگە لەو چوار ئەفسەرە ، پازدە کەسی دیکەش لە سێدارە دران هەواڵەکان باس لەوە دەکەن کە هەزارەها لە خێڵەکییەکانی کورد دژی ئەو لەسێدارەدانانە خۆپێشاندانیان کردووە

Daily Express (London), June 23, 16, 1947 . البریفکاني ، ٢٩- ٣٠.

خوێندکارانی کورد بوو لە ئەورووپا . لە دەرچووی ئابی ١٩٤٩ی ئەم بڵاوکراوەیەدا بە دوور گوتاری جیاواز باس لە لە سێدارەدانەکانی مەهاباد و بەغدا کراوە . لە گوتاری :"سەربەرزیی هەتاهەتایی بۆ قازیی محەمەد " بە پشتبەستن بە دەستەواژەی توندی کۆمۆنیستانە ، رەخنە لە ئەمەریکا و ( بەتایبەت سەرۆك ترۆمان) ، بەریتانییەکان ، تورکان ، هەروەها ئێرانییەکان گیراوە . سەبارەت بە ئێران بڵاوکراوەکە بە بەکارهێنانی توندترین دەستەواژە و بەوپەڕی تووڕەییەوە دایەزیوەتە سەریان و بە " سەڵتەنەتخوازە فاشیستە تلیاکییەکان" ناوی بردوون .[87]

سەبارەت بە لەسێدارەدانی ئەفسەرانی کوردی سوپا ، لە بابەتی "پەیمانی شەهیدەکانمان" باسی لێوەکرابوو . ئەم گوتارە نێوەرۆکی ئەو قسانەی بڵاوکردۆتەوە کە ئەو ئەفسەرانە پێش لەسێدارەدانیان کردبوویان . دەگوترێت ئەفسەرەکان لە قسەکانیاندا هەستی خۆیان سەبارەت بە خێزانەکانیان و لەمە{ کوردستان دەربڕیوە ، ئەو هۆکارانەیان خستۆتە روو کە هاندەریان بوون لە پێناو بەرگرییکردن لە بیروباوەڕیان چەك هەڵگرن . هەموو ئەفسەرەکان بە دروشمدان کۆتاییان بە قسەکانیان هێناوە ، جگە لە مستەفا خۆشناو ، کە هیوای خۆی دەربڕیوە ژیانی بپارێزرێت . ئەوەش بۆ ئەوەی کاریگەریی لەسەر سێ منداڵەکەی هەبێت . محەمەد مەحموود هاواری کرد " بژی کوردستان " ، خەیروڵڵا عەبدولکەریم هاواری کرد "مردن بۆ دوژمنانمان و بژی کوردستان" ، عیزەت عەبدولعەزیز هاواری کرد "مردن بۆ ئیمپریالیزم و بەکرێگیراوە رووڕەشەکان"[88]

## بەراوردێك لەنێوان رژێمە دیموکراتەکەی ئازەربایجان و کۆمارە کوردییەکە لە مەهاباد

دەگونجێت هێندێك هۆکار کە رۆڵیان لە شکستی کۆماری مەهاباددا هەبووە ، بە بەراوردکردنی ئەو کۆمارە لەگەڵ رژێمە دیموکراتەکەی ئازەربایجان لە تەبریز ، ئاشکراتر بێتە بەرچاو . بەدەر لە و راستییەی کە هەردوو رژێمەکە ، زۆر و کەم لە هەمان کات و لە

[87] دەنگی کوردستان ، ژمارە ٢، (ئووتی ١٩٤٩) ١٠ .

[88] هەمان سەرچاوە ، ١١ وەرگیراوە لە : Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 4 , 10-11.

سایەی هەلومەرجی وەك یەكدا پەیدا و دواتریش ئاوا بوون .

لەو دوو رژێمە ، ئەوەی ئازەربایجان باش رێكخراوتر و لە رووی كاری رامیارییەوە بە ئەزموونتر بوو ، هەروەها پێشینەیەكی شۆڕشگێڕانەی كۆنتری هەیە كە بۆ دەورانی شۆڕی مەشرووتەی ئێرانیی لە سالآنی ١٩٠٥-١٩٠٩ دەگەڕێتەوە . ئەم جیاوازییانە لەوانەیە باشتر رەنگبداتەوە لەو تەرزە پیاوانەی كە رێبەرایەتییان لە ئازەربایجان و كوردستانی ئێراندا گرتە دەستۆ . جەعفەر پیشەوەریی ، دكتۆر جاوید و سەركردەكانی دیكەی ئازەربایجان كەسانی كۆمۆنیستی لێهاتوو و شارەزا و تێگەیشتوو بوون و ئەندامێكی پێگەیشتوو و قاڵبووی حیزبیی بوون و دەیانزانی چ شتێكی تایبەت و دیارییكراویان دەوێت .[٨٩] بە بەراورد ، سەرانی كورد كەسانێكی سادە و ساكاری خۆماڵیی بوون ، زۆربەیان لە رووی رامیارییەوە كاڵ وكرچ و خاوەنی كەمێك یاخود هەر هیچ ئاراستەیەكی ئایدۆلۆژیان نەبوو . سروشتی عەقڵییەتی بۆرجوازیی و دەرەبەگایەتیی سەرانی كورد تەواو لەگەڵ بیركردنەوەی ماركسیستی سەرانی ئازەربایجان پێچەوانە بوو . تەنانەت قازیی محەممەدیش ، كە لەنێو كورداندا لە هەموویان تێگەیشتووتر و رووناكبیرتر بوو ، كەمێك یان زیاتر لە پیاوێكی ئایینیی تێگەیشتوو ، شارەزاتر بوو .

جیاوازییەكی دیكە كە دەتوانرێت ببینرێتەوە لەنێوان بنەمای جیاخوازیی ئازەربایجان كە تەوژمی بە دامەزراندنی رژێمە دیموكراتەكەی ئازەربایجان بەخشیی ، لەگەڵ جوڵانەوەی نەتەوایەتیی كورد كە لە دەرەوەی ئەو ناوچەیەدا بوو كۆمارە كوردییەكەی مەهابادی تێدا رسكا . جیاخوازیی ئازەربایجان لەسایەی كاریگەریی چالاكییەكانی شورەویی و توركییدا پەرەیسەند ، ئەو چالاكییانەی بە ئامانجی لاوازكردنی پابەندبوون و وەفادارییی خەڵكە خۆجێیەكە و وەك هەنگاوێكی سەرەتایی بۆ

---

[٨٩] بۆ زیاتر لەبارەی پیشەوەریی و سەركردەكانی دیكەی فیرقەی دیموكرات و ئەندامانی كابینەكە لە دەمەدا :

L.P. Elwell-Sutton, L.P "Political Parties in Iran," Middle East Journal 1. no. 1 (Jan 1949): 45-62; George Lenczowiski,"The Communist Movement in Iran ," Middle East Journal 1. (1947),43n.37.

پێوەلکان و گرتنەخۆ ئاراستە دەکرا . ئازەربایجانی شورەویی پێشکەوتووتر و باشتر بەڕێوەبراو ، هەمیشە شوێنی لەسەر هاوڕەگەزەکانی خۆی لە ئازەربایجانی ئێران لەودیو سنوور دادەنا و دەیوروووژاندن . بێگومان شورەویی کە بەهیوای راکێشانی ئازەربایجانی ئێران بۆ نێو خولگەی خۆی و پاشتر هەڵلوشینی بوو ، لێهاتووانە سوودی لەگشت ئەو دەرفەتانە وەرگرت کە لێکنزیکیی رەگەزیی ، کەلتووریی ، جوگرافیی نێوان هەردوو ئازەربایجان لەبەردەمیان دانابوو .

تورکە عوسمانییەکان ، بە پێچەوانەوە ، کە لە سەردەمانێکدا بە ئامانجی دەستبەسەرداگرتنی ئازەربایجانی ئێران ململانێیەکی توندی رووسەکانیان دەکرد ، ماوەیەك پێشتر و بەدرێژایی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ، بە سەرکەوتنێکی مەزنەوە سیاسەتێکی ئیسلامچێتی تۆرانچێتییان (برەوپێدانی بەکارهێنانی زمانی ناوەڕاستی ئاسیا بەتایبەتیی زمانی ئۆراڵ-ئاڵتایی) بەڕێوە دەبرد ، بەوەش ، ئەو هێزە خۆ لەناوەند بەدوورگرانەی کە لەلایەن رووسیا و تورکیاوە دەست بە پشتیاندا دەهێنرا ، دەمێك بوو لەنێو ئازەربایجانییەکاندا خەریکی کارکردن و هەڵسوڕان بوون ، ئەوانە زیاتر لە جارێك خولیای خۆکێشکردنیان بە ئاشکرا بەرەو هەریەك لەو دوو دەوڵەتە ململانێکەر و رکابەرە پێشاندەدا . جوڵانەوەی شورەوییخوازانە کە لە ساڵانی ١٩٤٥-١٩٤٦ لەلایەن ئازەرییە دیموکراتەکانەوە رێبەرایەتیی دەکرا ، لەوانەیە زیاتر لەو درکەوە نزیکتربێت کە بۆ ماوەیەکی دوورە خولیای یەکگرتنی لەگەڵ رووسیادا لە سەردا بوو .

ئەو جوڵانەوەی کە بووە هۆی دامەزراندنی کۆماری مەهاباد بریتیبوو لە دوا دەرکەوتنی مەشخەڵی نەتەوایەتیی کورد کە بەشێوەیەکی پچڕپچڕ هەر جارە و لە ناوچەیەکی جیاوازی کوردنشیندا سەریهەڵدەدا . چەندبارەبوونەوەی ئەم راپەڕینانە بەڵگەی ئەوەیە وێڕای شکستی یەك بەدوای یەك ، خواستی کورد بۆ سەربەخۆیی هیچ کات بە تەواویی ریشەکێش ناکرێت . دەبێت تێبینیی ئەوە بکرێت ، ئەو راپەڕینانەی کورد بەشێوەیەکی پچڕپچڕ روویانداوە و سروشتێکی ناوچەییان هەبووە . هیچ کات روخساری راپەڕینێکی سەرتاسەریی بەرفراوانی بەخۆوە نەگرتووە . لەراستییدا ، هیچ کات کورد بۆ ئەنجامدانی راپەڕینێکی یەکگرتوو لەدەوری یەك کۆنەبوونەتەوە . تەنانەت لەچوارچێوەی هەریەك لەو دەوڵەتانەشدا کە تێیدا نیشتەجێن ، ئەوەش ، بێگومان ، ئاکامی نەبوونی رێکخراوێکی ناوەندییە کە بتوانێت چالاکییەکانی کورد لە تێکڕای

ناوچەكان ئاراستە بكات و هەماهەنگیی لەنێویاندا پێكبهێنێت .

وێڕای باڵادەستیی ڕێكخراوەیی ئازەربایجانییەكان و ئەزموونی مەزنی سەركردەكانی بەبەراورد لەگەڵ كوردەكانی مەهاباد دا ، ئەركەكەشیان ئاسانتر بوو كە بریتیبوو لە لكاندنی ئازەربایجانی ئێران بە یەكێتی شورەوییەوە .[90] ئەوان توانیان هەموو توانا و وزەی خۆیان بۆ جێبەجێكردنی ئەو ئەركە بخەنەگەڕ و لەسایەی یەك ئامانجی دیاریكراودا ملی ڕێگا بگرن . ئەركی ڕژێمەكەی مەهاباد بە پێچەوانەوە ، ئاسان نەبوو . ئەوان لەو خەیاڵەدا بوون ناوكێك بۆ دەوڵەتێكی كوردیی مەزنتر پێكبهێنن كە تەواوی خاكی كوردان بگرێتە خۆ . ئەوان وێڕای ئەوەی لەگەڵ حكومەتی ئێراندا لەململانێی و ناكۆكییدابوون ، دەیانزانی لە كۆتاییدا دەبێت بەشە مەزنەكەی دەوڵەتئایندەیەكەی كورد لە دەست توركیا ، عێراق و سوریا دەربهێنن .

جیاوازییەكی ئاشكرای نێوان كۆمارەكوردییەكە و ڕژێمی ئازەربایجان ئەو ئازادییە ڕێژەییە بوو كە لەحەست دەستێوەردانی شورەوییەكان هەیبوو .نوێنەر و كارمەندەكانی شورەویی لەوناوچانەی لەبەردەست كۆمارە كوردییەكەدا بوون هێندە دەرنەكەوتن و نەدەبینران وەك ئەوەی لە ئازەربایجان دەبینرا . هەروەها ئەوانەی كە ڕوویەدا لەوێندەر بن زۆر شارەزا و پەنامەكی هەڵدەسوڕان . وێڕای دانپێدانەنانی كورد ، دەردەكەوێت كە نوێنەری شورەویی لە مەهاباد بووە و دوا كارمەند كە بەم ئەركە هەڵسوڕابێت ، كەسێكە بەناوی (ئەسەدۆڤ) ، كە دەگوترێت تا ڕووخاندنی ڕژێمەكە لە مەهاباد بووە و سەركەوتووانە هەڵاتووەتە كۆنسولگەریی شورەویی لە تەبرێز .[91]

ئەو بارودۆخەی كە لە مەهاباد هەبوو بە توندی پێچەوانەی ئەوەكەی ئازەربایجان بوو . ئازادییەكانی تاكەكەسیی لە ئازەربایجان بەرتەسككرابوونەوە ، تەنانەت شێوازی تیرۆر و تۆقاندنیشیان هێنایە كایەوە ، لە كاتێكدا كوردان دوور لە هەراسانكردنی دەسەڵات تەواو لە ئازادیی بەهرەمەند بوون . هەروەها نواندنی توندوتیژیی دژی نەیار و ناحەزانی دەسەڵات دەگمەن بوو . هەواڵنێرێكی ڕۆژنامەیەكی ئێرانیی وا ڕێكەوتبوو كە

---

[90] بەگوێرەی ڕۆزفێڵت . ئامانجی فیرقەی دیموكراتی ئازەربایجان بریتیبوو لە :" شۆڕشێك بەرپابكەن و سەربەخۆیی هەرێمەكەیان ڕابگەیەنن و دەگونجێت داوای پەیوەستبوون بە یەكێتی شورەوییەوە بكەن Roosevelt.253

[91] بەگوێرەی سەرچاوەیەكی ئێرانیی . پێدەچێت ئەسەدۆڤ دەسەڵاتێكی زۆری لە مەهاباددا بەدەستەوە بووبێت پەسیان ٧٠، ١:٤٧

لەو دەمەدا لەنێوجەرگەی ئەم ڕووداوانەدا بووە و سروشتی فەرمانڕەوایەتیی لێبوردە و نەرمونیانی قازیی محەمەدی بەرز نرخاندووە . وەك ئەو دەڵێت ، قازیی محەمەد کۆتایی بە تاڵانیی و جەردەیی هێنا ، هاوڵاتیانی شاری مەهاباد لەماوەیەکی کورتی ئاشتیی و ئاسایش بەهرەمەند بوون . بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە قازیی لە پۆستەکەیدا بوو ، تەنیا باس لەوە دەکرێت کە تاکەکەسێك کوژراوە .[91]

ڕۆزفێڵت ئەم بەراوردەی خوارەوەی لەنێوان دوو ڕژێمەکەدا کردووە :

لەکاتێکدا تیرۆریزم بێ ڕێگر لە ئازەربایجانی ڕۆژهەڵات بەربڵاوبوو ، لە کوردستاندا ژمارەیەکی کەم ئەگەر هەر هیچ بەندییەکی رامیاریی هەبووبێت ، هەروەها یەك یا دوو کەس هەبوون کە پەیوەندیی بە ناکاوکوژیی رامیارییەوە هەبێت ، هەرچەندە ژمارەیەك لەو کوردانەی کە لایەنگری ڕژێمەکە نەبوون هەڵاتنە تاران . لەسەر شەقامەکانی مەهاباد ، پیاو دەنگی رادیۆ دەبیستێت کە لە ئەنکەرە و لەندەنەوە پەخشدەکرێن ، لەکاتێکدا بیستنی ئەم جۆرە نێزگانە لە تەبریز سزای کوشتنی لەسەرە . لەکاتێکدا هۆکاری ئەم ئازادیيە میانڕەویی و لیبراڵیبوونی قازیی محەمەد و کابینەکەیەتی ، یاخود بوونی خێڵەکان کە چاوپۆشیی لە کاری توندوتیژیی دژی کەسێك ناکەن کە سەر بەوان بێت . ئەو حاڵەتەی کە ببووە هۆکاری گەلێری ڕژێمەکە ، لانی کەم لەنێو هاووڵاتیانی مەهاباد دا ، ئەوانەی دوور لە ستەم و سەرکوت و چەوسانەوە کە حکومەتەکەی مەهابادی لە حکومەتەکەی تاران جیادەکردەوە ، ئاهێکیان پێدا هاتبووەوە .[92]

جیاوازییەکی سەرنجڕاکێشی دیکەی نێوان هەر دوو ڕژێمەکە ئەو دەمە ئاشکرابوو کە هەردووکیان ملیان بەرەو کۆتایی دەنا . لە ئازەربایجان کاردانەوەیەکی بەهێز دژ بە بە ڕژێمە دیموکراتەکە هەبوو ، لەکاتێکدا لە مەهاباد شتێکی بەو چەشنە نەقەوما ، وەك ڕۆزفێڵت دەڵێت :

"لە هەموو لایەکی ئازەربایجانەوە ، جووتیاران ، کرێکاران ، دوکانداران لەسەرەتای دەرکەوتنی ڕووخاندنی ڕژێمی ئازەربایجانەوە کەوتنە کوشتنی بە کۆمەڵی دیموکراتەکان . ئەم کاردانەوە ڕەمەکییە بەئاشکرا بەڵگەی داخ لەدڵی خەڵکەکەی

---

[92] پسیان ، ١:١٦١

[91] Roosevelt.264-65.

لەهەمبەر رژێمەکە پیشاندەدا . لەکاتێکدا لە مەهاباد هەموو شتێك بەهێمنیی چووە پێش ، ئەو بارودۆخەی بەتایبەتیی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە لە هەموو لایەکی ئازەربایجاندا پۆلیسی نهێنیی بەهێز بوون و بۆ حاڵەتی لەناکاو و نائاسایی بەو شێوەیە ئامادەکرابوون . لەکاتێکدا قازیی محەمەد تەنانەت هیچ جۆرە ئامرازێکی سەرکوتکەری بەو چەشنەی نەبوو . ئەو راستییەی ئەو گوتەیە بە تەواویی دەچەسپێنێت کە رژێمەکەی قازیی محەمەد گەلێر بوو ، لانی کەم لە پایتەختەکەی خۆیدا ."[94]

## پرسی یارمەتییدانی مەهاباد لەلایەن شورەوییەوە

ئەو هەژانە توندەی لەئاکامی پەیدابوون و ئاوابوونی کۆمارە جوانەمەرگە کوردییەکەی مەهاباد سەرپەهڵدا لەماوەی دەیەیەکدا خامۆش بوو ، بەڵام لێکدانەوە و دەربڕینی بیروڕای ناکۆك و جیاواز سەبارەت بە سروشت و بنەماکانی لەوپەڕی تێنوتاوی بەردەوامییدا بووە . هێندێك مۆری ئەوەیان لێداوە کە سەرمۆییەکی بێ ئەملاولای شورەویی بووە ، لەکاتێکدا کەسانی دیکە جەختیان لەوە کردووە کە گەشەکردنێکی خۆرسك و خۆیی هەستی نەتەوایەتیی کورد بووە . بەڵگەی زۆریش هەیە پاڵپشتی هەردوو بۆچوونەکە دەکات .

رژێمەکەی مەهاباد بەشێکی زۆری هێز و خواستی مەعنەویی خۆی لە یەکێتیی شورەوییەوە وەرگرتووە ، هەروەها زۆرێکیش لە کوردان هیوای سەرکەوتنی یەکجارەکیی کۆمارەکەیان بە بەردەوامیی هاوسۆزیی و پشتگیریی شورەوییەوە بەستبووەوە . هەرچەندە ، هەر هەوڵێك بۆ نەخوێندنەوە و لەبەرچاونەگرتنی هەستی نەتەوایەتیی کورد و کەمکردنەوەی رۆڵی کوردان خۆیان لەو بارەیەوە ، وادەکات ئەو هەوڵە نادروست و ستەمکارانە بێت . ئاماژەدان بە فاکتەری شورەویی چەندە گرنگ بێت ، گۆمانی تێدا نیە کە بوونی کۆماری مەهاباد بێ هاندەر و هۆکاری نەتەوایەتیی کورد مەحاڵ بوو .

لەودەمەدا ، زۆرێك لە یارمەتیی شورەویی بە رژێمەکەی مەهاباد دراوە ، هەواڵەکانی یارمەتیی بەرفراوانی سەربازیی و زێدەکردنی دەستێوەردانی شورەویی لە

---

[94] Ibid.,267.

کاروباری کورد له بڵاوکراوەکانی رۆژئاوادا دەستیکرد بە دەرکەوتن . ئەو هەوڵانەی کە لە بەهاری ١٩٤٦دا شێواز و سروشتی وریاکەرەوەیەکی تایبەتیی گرتبووە خۆ ، لەوکاتەی کوردان کەوتنە پەلاماردانی بانە ، سەقز ، سەردەشت و بنکەکانی دیکەی کوردستانی ئێران .

لەمارتی ١٩٤٦دا ، هەواڵی ئەوە هەیە کە شورەوییەکان کەوتوونەتە راهێنان و چەکدارکردنی کوردەکانی ئێران و بە قاچاخیش چەك بۆ کوردەکانی عێراق و تورکیا رەوانە دەکەن .ژمارەیەك لە ئەفسەرانی شورەویی وەك راوێژکار پەیوەندییان بە کوردەکانی ئێرانەوە کردبوو .[95] هەواڵی دیکە باس لەوە دەکەن گوایە شورەوییەکان ئامۆژگاریی و هاوکاریی تەکنیکیی و پێویستییە بنەڕەتییەکانیان بە کوردان داوە .[96] لەسەرەتای ئەپرێل ، هەواڵی ئەوە بڵاوبووەوە کە کوردان بیست تانك ، چوار زریپۆش ، هەروەها ژمارەیەکی دیارینەکراو تۆپ و چەکی دیکەیان لە شورەوییەکان وەرگرتووە .[97] هەرچەندە ئەو هەواڵ و راپۆرتانە بە ئاشکرا زێدەڕۆییان لە بڕی هاوکارییەکانی رووسەکان بۆ کوردەکان کردووە . ئەمێستا روونە کە سەرەکیترین هۆکارلە رووخاندنی کۆماری مەهاباد دا بەتەواویی نەبوونی ئەو هاوکارییانەیە . لەراستییدا ، رژێمەکەی قازیی محەمەد کەمی لە شورەویی وەرگرت ، ئەوەی زیاتر هەر هاندان و بەڵێنی بێ وادە بوو.

---

[95] New York Times, Mar.21 , 1946; Times (London), Mar.21, 1946.

[96] Times (London), Mar.23, 1946 .

[97] New York Times, Apr.4 , 1946; Times (London), Apr.4, 1946.

شایەنی باسە هەمان ئەو زانیارییانەی لەم بارەیەوە لە رۆژنامە ئەوروپییەکاندا بڵاوکراونەتەوە ، لە کاری چەند کۆڵەرێکی ئەمریکییشدا دەرکەوتوون لە (کاروباری نێونەتەوەیی) بڕوانە : Westermann,627.

# بەشی شازدەیەم : کێشەی کوردستان پاش کەوتنی مەهاباد

## هیوا و چاوەڕێیەکانی کورد بەدرێژایی جەنگی دووەمی جیهانیی و دواتر

هەرچەندە ئەم بەشە تایبەتە بەو پەرەسەندنە جۆراوجۆرانەی راستەوخۆ پاش کەوتنی مەهاباد روویانداوە، بەڵام کورتە گفتوگۆیەک لەسەر چەند بابەتێکی تایبەت کە دەکەونە پێش ئەو رووداوانە، لێرەدا کارێکی پێویستە. وێڕای ئەو راستییەی کە بە درێژایی جەنگی دووەمی جیهانیی هیچ بەڵێنێك هاوشێوەی ئەو بەڵێنانەی کە لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانییدا بەعەرەب درابوون، بە کورد نەدرابوو، هەلومەرجەکە بەچەشنێك بوو کە وا لە کوردان بکات هیوایان بە بەدیهێنانی بەرژەوەندییگەلێکی دیاریکراو هەبێت. بێگومان ئەم هیوایە لەسەر بنەمای ئەو راستییە بنیاتنرابوو کە بە درێژایی جەنگەکە و هەروەك هاوپەیمانان بۆی پەرۆش بوون، کوردان بە هێمنیی مانەوە. تەنانەت وەختایەك لە یەکێك لەو وڵاتانەی کوردی تێدایە کە عێراقە و لەگەڵ بەریتانییەکاندا کەوتە کورتە جەنگێکەوە، هەروەها لە یەکێکی دیکەیاندا، کە ئێرانە و خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی بەریتانیا و یەکێتی شورەوییدا دیتەوە و لەلایەن ئەوانەوە داگیرکرا.

فەرەنسییەکان و دواتریش بەریتانییەکان داوایان لە خۆیبوونی سوریا کرد، ئەوانەی بەگشتیی چالاکییەکانیان دژی تورکیا بوو، کە تا دەتوانن خۆیان لە کاری دوژمنکارانە دژی ئەو وڵاتە دوور راگرن و ئەوانیش ئەو داوایەیان پەسەندکرد.[1] لەراستییدا، هاوسۆزیی خۆیبوون بۆ پرسی هاوپەیمانان وا دەردەکەوێت لەوێوە بووبێت

---

[1] - لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانیی، ژەنەراڵ ( ویگاند ) لە گەڵ سەرکردەکانی خۆیبوون دا گەیشتە رێکەوتننامەیەك کە خۆیان لە چالاکی دژبەتورکەوە نەگلێنن پاش رووخاندنی حکومەتی ڤیشیی لە سوریا و داگیرکردنی ئەو وڵاتە لە لایەن بەریتانییەکانەوە، بەریتانییەکان هەمان رێکەوتننامەیان لەگەڵ سەرکردەکانی کورد نوێکردەوە Elphinston.W.G. " In Memoriam," 93.

، که لەو ڕۆژەدا توبروگ کەوتە دەست ئەڵمانەکان ، دەگوترێت میر جەلادەت بەدرخانی سەرۆکی ڕێکخراوەکە ، سێجار بانگکراوەتە بارەگای دەبڵیو .جی.ئەلفینستۆن ی کۆڵۆنێڵی بەریتانیی تا لایەنگری و هاوسۆزیی بێ ئەملاولای خۆی بۆ هاوپەیمانەکان دەربڕێت .[2]

لەعێراقدا ، کاتێك بەریتانییەکان خوازیاری بێدەنگیی و هێمنی کوردان بوون ، ئەوانیش بەو ئاراستەیەدا ڕۆیشتن کە لێیان چاوەڕێ دەکرا . لەراستییدا ، لە مایۆی ١٩٤١دا ، ڕژێمەکەی ڕەشید عالی لە عێراق لایەنی دەوڵەتانی ناوەندی گرت و ئەوەش هانی کوردانی ئەو وڵاتەی دا هیوایان بە گۆڕینی سیاسەتی بەریتانیا بە قازانجی ئەوان بژێتەوە . شێخ مەحموود ، کە پاش هەڵگیرساندنی شەڕی نێوان عێراق و بەریتانیا ، لە بەغدا هەڵات و لەکوردستانەوە سەرگەرمی دەستپێکردنی ڕاپەڕینێك بوو دژی ڕژێمی بەغدا – بیرۆکەیەکی وا لەلایەن لایەنە کوردییەکانەوە پشتگیرییەکی بەرچاوی بەدەستهێنا ، بەتایبەتیی لەنێو ئەوەی گەنجاندا . هەرچەندە ڕووخاندنی خێرای ڕژێمەکەی ڕەشید عالی وایکرد کە جوڵانەوەیەکی بەو چەشنە پێویست و تەنانەت ویستراویش نەبێت .[3]

وەك پێشتر ئاماژەی بۆکراوە ، پەرەسەندنێکی بایەخدار پاش ماوەیەکی کەم لە داگیرکردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە هاتەئارا . دەگوترێت چەند ئەفسەرێکی کوردی سوپای عێراق ، بێگومان بە ئامانجی بەدیهێنانی پشتگیریی شورەویی لە داهاتوودا ، پاش گەیشتنی شورەوییەکان بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٤١دا ، پەیوەندییان بە دەسەڵاتدارانی لەشکری شورەوییەوە کردووە و پێشنیازی پێکهێنانی هێزێکی خۆبەخشیان لە کوردان خستۆتە بەردەم شورەوییەکان تا شانبەشانی سوپای سوور بجەنگێت . ئەم پێشنیازە ڕەتکرایەوە.[4]

لەبەر ئەوەی کوردان بە درێژایی جەنگ جەختیان لە گرتنەبەری هەڵوێستێکی لایەنگریی هاوپەیمانان دەکردەوە ، سەرباری خۆبەدوورگرتنیان لە تێوەگلان لە چالاکی ڕامیاریی ئەوتۆ هاوپەیمانان بشڵەژێنێت ، هەربۆیە بەحەق یا بەناحەق چاوەڕێی ئەوەیان

---

[2] هەمان سەرچاوە . کۆڵۆنێڵ ئەلفینیستۆن لە کاتی جەنگەکەدا ئەفسەری هەواڵگریی بەریتانیی بووە بۆ کاروباری کوردیی

[3] Edmonds,C.J. " the Kurds of Iraq ." 59-60.

[4] Rajkowski,Witold." Another Danger ."29.

دەکرد لانیکەم بەدابینکردنی بەشێك لەخواستە نەتەوەییەکان پاداشتیان بدرێتەوە. سەرباری ئەوەش ، پرۆپاگەندەی دژەفاشیستیی هاوپەیمانان ، جەختێکی مەزنی لە رزگاریی و سەربەستیی گەلانی بندەست لە ئەورووپا و ئاسیا دەکردەوە . بێگومان کورد خۆی بەبەشێك لەو گەلانە دەزانی کە بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان پێ دەخەنە ژیانێکی نوێوە .

راپەڕینی بارزانیی لە عێراق و دواتر دامەزراندنی کۆمارەکەی مەهاباد لە ئێران ، کوردی لەو خۆشخەیاڵییە رزگارکرد کە لەو رووەوە چاوەڕوانیان دەکرد . پشتگیریی بەریتانییەکان لە حکومەتی عێراق لە کاتی راپەڕینی بارزانیی و هەڵوێستی ئەنگلۆ-ئەمەریکیی بە درێژایی ئەو ماوە کورتەی ژیانی کۆمارەکەی مەهاباد ، کوردی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە چاوەڕێکردنی پشتگیریی رۆژئاوا بۆ خواستی هێنانەدی نیشتمانێك بۆ کوردان تراویلکەیە . پەرەسەندنی تێخزانی رووسەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هانی رۆژئاوای دا لایەنی دەوڵەتەکانی تورکیا ، عێراق و ئێران بگرن ، ئەوەش بەمانای چیدی بەرژەوەندیی کوردان لەلای رۆژئاوا بایەخێکی نیە و ناخوێندرێتەوە . هێزە ئەورووپییەکان بۆئەوەی بەسەر هەڕەشەکانی شورەوییدا زاڵبن ، خۆیان لە هەر کارێك پاراست کە زیان بە هەستیاریی و گومانی حکومەتی ئەو وڵاتانە بوروژێنێت کە کوردیان تێدا نیشتەجێیە .

نائومێدیی و جارسبوون لە رۆژئاوا ، رووی کوردی رووەو شورەویی وەرگێڕا ، ئەمێستا ئەو وڵاتە بووە جێی هیوای کوردان . پشتگیریی شورەویی لە کۆمارەکەی مەهاباد ، پێدانی پەناگە بە مەلامستەفا و هاوەڵانی لە یەکێتی شورەویی ، هاوجووت بوو لەگەڵ پرۆپاگەندەی لێزانانە و هاوسۆزیی شورەویی ، هەموو ئەمانە هانی کوردیاندا ، بە تایبەت لاوان و ئیدۆلۆجیستەکانیان ، رووەو یەکێتی شورەویی روو وەرگێڕن . دوای راپەڕینی بارزانیی لەعێراق و رووخاندنی کۆمارەکەی مەهاباد لە ئێران ، هەردوو دەستەی کۆمۆنیزمی کورد و نەتەوەخوازانی کورد ناچار بە خەباتی ژێرزەمینی کرانەوە ، لەوێ هەردوو رەوتەکە یەکیان گرت و ئاوێتە بوون .

هەلومەرجەکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ١٩٤٥دا هەموو شتێك بوو دڵنیاکەرەوە نەبێت . کوردان هێندە بێزار و هەراسان بوون کە پێش کۆتایی ئەو ساڵە لە عێراق کەوتنەخۆ و تا رادەی راپەڕینێك ملیان پێوەنا . براکانیشیان لە ئێران بەخێرایی لە

دارشتنی بناغەی کۆمارە ئایندەییەکەی مەهاباد تێوەگلان . ئامادەکاریی کوردان لە هەمولاوە ، هەرچەندە نەیتوانی لە ئاستێکی پێگەیشتوودابێت ، وەك سەرچاوەیەکی قوولی دڵەڕاوکێ مایەوە . ئازەرییەکانی ئێران کە لە کوردی ئەو وڵاتە پێشکەوتووتر و ڕێکخراوتر بوون ، خەریکی تەواوکردنی پلانەکانیان بوون بۆئەوەی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان دابمەزرێنن . خودموختاریی ئامانجی هەنوکەیی ئەوان بوو ، بەڵام جیابوونەوە و تەنانەت پەیوەست بوون بە یەکێتی شورەوییشەوە دەگونجێت دواشامانجیان بووبێت .

یەکێتی شورەویی کە پشتگیریی کورد و ئازەرییەکانی دەکرد ، ڕێکەوتننامەی شورەویی–تورکیی بۆ هاوڕێیەتیی و بێلایەنیی لە مارتی ١٩٤٥دا ڕاگەیاند .[5] ئەم ئاراستە شوومە چەند ڕووداوێکی بێزارکەری بەدواداهات . لە ئووتی ١٩٤٥دا ، مەلامستەفا دژی عێراق لە ڕاپەڕینێکی ئاشکرادا بوو ، بەزینی لە ناوەڕاستی سێپتەمبەر و ڕاکردنی بۆ ئێران ، زۆری نەبرد پەرەسەندنی ڕووداوی شڵەژێنەری دیکەی بەدوادا هات . لە نۆڤەمبەری ١٩٤٥دا ، کۆماری دیموکراتی ئازەربایجان دامەزرا ، تورکیا کە ڕاپۆرتەکان بەردەوام لە کات و ساتی ڕاپەڕینێکی کوردیی و دەستێوەردانی شورەویی ئاگاداری دەکردەوە ، بەشێکی مەزنی هێزەکانی لەسەر سنووری قەفقاس کۆکردەوە ، ئەو کارەی بووەهۆی نارەزایەتیی دەستبەجێی شورەویی .[6]

لە ساڵی ١٩٤٦دا ، تێکڕای ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدایە بەهۆی وریاکەرەوەیەکی نوێ و دڵەڕاوکێیەکی تازەوەختەوە ئارامیان لێبڕا . کۆمارە کوردییەکەی مەهاباد کە بە فەرمیی لە سەرەتای مارتی ١٩٤٦دا ڕاگەیەندرا ، هەژانێکی مەزنی لەناوچە

---

[5] . Jacob C.Hurewitz, Diplomacy in Near and Middle East : A Documentary Record, 1944-1956, vol.2 (princeton, N.J. Van Nostrand, 1956), 143-43; New York Times, Mar.20 , 1945.

ئەم جوڵانەوەیە داخوازیی نافەرمیی سەبارەت بە داواکردنی قارس و ئەردەهان و هەروەها درێژکردنەوەی کەنارەکانی دەریای ڕەش بۆ سەر لازستانی بەدوادا هات

"The Background of Russo-Turkish Relations." The World Today 2,no.2 (Feb.1946): 57-58.

[6] The Observer (London), Nov. 11 ,1945.

کوردییەکاندا هێنایەئارا .[7] نەتوانینی یەکێتی شورەویی بۆ چۆڵکردنی هێزەکانی خۆی لە ئێران لە ٢ی مارتی ١٩٤٦دا ، ئەو بەروارەی بۆ چۆڵکردنی هێزەکانی دانرابوو ، نیگەرانییەکی قووڵی لەمەڕ دوامەبەستی شورەویی پێکهێنابوو .[8]

حکومەتی عێراق ، لە سۆنگەی درک کردنی بە سەرهەڵدانەوەی ئاژاوە لە کوردستان ، لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تورکدا کەوتە راوێژ . لەسەرەتای مارتی ١٩٤٦دا ، هەواڵەکان باس لەوە دەکەن کە نوری سەعیدی وەزیری دەرەوەی عێراق بەمەبەستی ئەگەری گفتوگۆ سەبارەت بە هاوکاریی تورک و عێراقییەکان لەحاست رووداوەکانی راپەڕینێکی ئایندەیی کوردان ، لەگەڵ کارمەندانی تورک لە ئەنکەرە یەکتریان بینیوە .[9] سەرەك وەزیرانی عێراق بە ئاشکرا باس لە بەستنی رێکەوتننامەیەکی ئەنگلۆ-عێراقیی دەکرد گەر بێتو شورەویی پشتگیریی لەو راپەڕینەی کورد بکەن کە نیازیانە لە عێراق بەرپای بکەن .[10] لە بەیاننامەکەدا کە لە (نیوزرك تایمز) دا بلاوکراوەتەوە ، ئەو سەردانەی نوری سەعیدی بۆ ئەنکەرە بۆ هەر مەبەستێك جگە لە گفتوگۆ سەبارەت بە کاروباری فەرهەنگیی و ئابووریی رەتکردۆتەوە .ئەو گوتوویەتی کە دانوساندنی رامیاریی لەو هەلومەرجەدا لە رووی باروئۆخی نێونەتەوەییەوە ئاکامێکی شلەژێنەری لێ دەکەوێتەوە،[11] کە پاکتی سەعدئاباد هێشتا بەکارە .

هەمان کات ، گوتارگەلێك کە سەرزەنشتی سیاسەتەکانی تورکان لەحاست کورد دا دەکات لە بلاوکراوەکانی شورەوییدا دەستی بە بلاوبوونەوە کرد . گوتارێك کە بە ئیمزای (ئای.ڤاسیلییڤ) لە بلاوکراوەی (ترود Trud) ی وەرزییدا بلاوبووەوە ، تێیدا باسی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی تورکیای دژی کورد کردبوو . بە ئاماژەدان بە رێکەوتنەکەی ٢٤ی مارتی ١٩٤٦ ی تورك و عێراقییەکان ، ئاکامگیریی ئەوەی کردبوو کە ئەو رێکەوتننامەیە پەیوەستێکی نهێنیی هەیە کە گرتنەبەری کاری هاوبەش دژبە کورد

---

[7] Daily Express, Mar. 16, 1946. Cf. Rambout,101-102.

[8] دواجار لەشکری شورەویی لە ٨ی مایۆی ١٩٤٦ دا ئێرانیان چۆڵکرد.

[9] The Scotsman,Mar. 12,1946.

[10] News of the World , Mar. 24, 1946.

[11] New York Times, Mar.25 , 1946.

هەمولر دەکات .[12]

لە بیرخەرەوەیەکدا بۆ تورکیا لە ٧ی ئووتی ١٩٤٦دا ، یەکێتی شورەویی پێشنیازی چاوخشاندنەوەی بە پەیمانی مۆنتریۆی ساڵی ١٩٣٦دا کردووە و تێیدا هاتووە کە بەرگریی لە تەنگەکانی سەرەڕێی چیای تاریق بەرپرسیارێتییەکی شورەویی–تورکییە . تورکیا نەك پێشنیازەی رەتکردەوە ، هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیاش دژی وەستان .[13]

تورکیا ، عێراق و ئێران بە توندیی لەلایەن رۆژئاواوە پشتگیرییان کرا، بەتایبەت لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە . ئەوان توانیان لەو گەردەلوولە رزگاربن . چۆڵکردنی هێزەکانی شورەویی لە ئێران لە ٨ی مایۆی ١٩٤٦دا ، بەشێوەیەکی مەزن پایەی کۆمارە دیموکراتەکەی ئازەربایجان و کۆمارە کوردییەکەی مەهابادی لاواز کرد . هەروەك بینیمان هەردوو رژێمەکەش پێش کۆتاییهاتنی ساڵی ١٩٤٦ رووخێندران .

ڕووداوەکانی دوو ساڵی پێشوو ، بۆ ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدا نیشتەجێیە ، هۆشیارکردنەوەیەك بوو بۆ ئەو مەترسییەی هەڕەشەیان لێدەکات . ئەوەش هاندەر بوو تا تورکیا ، عێراق و ئێران بێنە ریزێکەوە . هەڕەشەی هەمیشە ئامادەی راپەڕینی کورد و هەروەها دەستێوەردانی شورەویی ، لە ئاکامی فشاری بەردەوامیی شورەوییدا بەردەوام زیندوو بوو . ئەوەش ناچاری کردن بکەونە هەماهەنگیی تواناکانیان و بە ئاراستەی نزیکبوونەوە لە رۆژئاوا مل بنێن . ئاراستە و سیاسەتی رۆژئاواگەرای ئەو وڵاتانە ، تەنیا راژەی بە توڕەبوونی شورەویی و زێدەبوونی هێرشی توندی ئەو دەوڵەتە لەدژیان کرد .

لە ساڵی ١٩٥٠دا ، ورووژاندنی توندی شورەویی گەیشتە رادەی ورياکردنەوە . ئەم پەلامارە دەمەکییانە کە بەچەشنێکی زێدە دەکرایە سەر ئێران و وڵاتە یەکگرتووەکان . لە هاوین و کۆتایی ١٩٥٠دا تۆنێکی هەڕەشە ئامێزی تایبەتیی بەخۆوە گرت .[14] داوا لە کوردان کرا کە کارمەندانی حکومەتی ئێران ناکاوکوژ کەن ، کاری وێرانکاریی دژی حکومەتی ئێران ئەنجام بدەن ، هەروەها بەگشتیی بکەونە کاری پارتیزانیی .بەبەراورد

---

[12] Cited in New York Times, Jun.16 , 1946;Sunday Times (London) , Jun 16, 1946.

[13] بۆ گفتوگۆکردن لەمەڕ ئەم راسپاردەیە لە هەلومەرجی کوردستان بڕوانە :

The Observer (London), Aug. 18 ,1946.

[14] Sunday Times (London), July. 30 ,1950; New York Times, Jun.7, 1950.

لەگەڵ کۆریادا ، کە ئەمێستا بە بەردەوامیی لەلایەن شورەوییەکانەوە دەکرێت ، هەروەها هەڕەشەش بە بەکارهێنانی هێز کرا.[15] ئەم جەنگی بێزارکردن و دڵەڕاوکێیە ، کە بەگشتیی حکومەتی ئەو وڵاتانەی وریا کردەوە کە کوردیان تێدا دەژی ، کوردی لە هەلومەرجێکی هەژاندا هێشتبووەوە .

تورکیا ، عێراق و ئێران نەیاندەتوانی کاریگەریی پرۆپاگەندەی شورەویی لەسەر کورد پووچەڵ بکەنەوە . ئەوان نە بە لێوەشاوەیی و نە بە لێبڕاوانە مامەڵەیان لەگەڵ دانیشتووانی کوردی خۆیاندا کرد و خۆیان بە گرتنەبەری هەڵوێستێکی بەرمنگارییانە سەرمەست کرد . نە وڵاتە یەکگرتووەکان و نە بەریتانیاش توانیان هانی ئەو سێ وڵاتە بدەن کە سیاسەتێکی هاوسۆزیی و پێکهاتن لەحاست کوردان بگرنەبەر . لەم وەختەدا بوو کە راپەڕینی خێڵەکیی جوانڕۆییەکان لە ئێران سەریهەڵدا .

### راپەڕینی جوانڕۆییەکان لە ئێران

وێڕای ئەوەی ئێرانییەکان بە پێچەوانەوە رایانگەیاندووە ، جێگەی گومانە کە راپەڕینی خێڵی جوانڕۆیی لە ئێران لە سێپتەمبەری ١٩٥٠دا ئامانجگەلێکی رامیاریی لەپشتەوە بووبێت . دەگونجێت دەرئەنجامی ئاوێتەبوونی بەدکارگێڕیی ئێرانیی و سەرسەختیی کورد بێت . وێڕای ئەوەی وەک هەر راپەڕینێکی دیکەی کوردیی راژەی بە جەختکردنەوە لە ئەهامەتیی و بێدەرەتانیی کوردان کردۆتەوە ، ئەوەش لە کۆتاییدا بەرگێکی رامیاریی بە بەردا کردووە . هاوکات لەگەڵ چڕکردنەوەی سەرنجی نێودەوڵەتیی لەسەر کورد ، ئەوەش ناوێکی خوپی بۆ ناوی نەتەوەییەکان و پرۆپاگەندەی کۆمۆنیستەکان دەستەبەرکرد.

سەرچاوە ئێرانییە فەرمییەکان جەختیان لەوە کردەوە راپەڕینەکە وەختایەک روویدا کە جوانڕۆییەکان ، ئەوانەی فەرمانیان پێکرابوو چەکەکانیان دابنێن و بەڵام ئامادەنەبوون کارێکی وا بکەن ، دەستیانکردووە بە پەلاماردانی پادگانێکی سوپای ئێران . ئەم کارە ، هەروەک سەرچاوە ئێرانییەکە دەڵێت ، وای لە حکومەتی ئێران کرد پەنا بۆ

---

[15] New York Times, Aug.18 , 1950; New York Times, Sep.15 , 1950;Manchester Guardians, Sep. 7, 1950.

هەنگاوی تەمێکارانە بەرێت . حکومەتی ئێران زیاتری لەسەر رۆیشت و گوایە جوانڕۆییەکان خولیای کۆمۆنیستییانەیان هەیە و بۆ سەلماندنی ئەوەش ئەو بەرنامە هەژێنەرەی دەکردە بەڵگە کە بە زمانی کوردیی لە ئێزگەی رادیۆی شورەوییەوە بڵاودەکرایەوە .[16]

هەرچەندە سەرچاوە کوردییەکان ، ئاماژەیان بەوە دەدا گوایە راپەڕینی جوانڕۆییەکان لە ناکامی ستەمکاریی و رووتاندنەوەی قورسی ئێرانییەکانەوەیە . کوردانی جوانڕۆ و شاناوا داوایان لێکرا کە سەرباری باجی ئاسایی سەرشانیان ، ٢٠٪ خەرمانەکەیان وەك موڵکانەیەك بە شاهەنشا بدەن . ئەم داواکارییەی کە رژێمی ئێران داوای دەکرد ، بە پێی ئەو بڕیارە کۆنە بوو کە لە سەردەمی رەزاشای پەهلەوییدا دەرچوو بوو کە تێکرای زەوی خێڵەکانی ناوچەی جوانڕۆ و شاناوای بە موڵکی خۆی تایبەتیی دەربار لەقەڵەم دەدا . کاتێك جوانڕۆییەکان ئامادە نەبوون سەر بۆ ئەم رووتاندنەوەیە دانەوێنن ، ئەرتەشی ئێران دژیان جوڵایەوە .[17]

راپەڕینی خێڵی جوانڕۆیی و دامرکاندنەوەی لە لایەن سوپای ئێرانەوە کەرەسەیەکی چاکی خستە بەردەست شورەوییەکان تا لەو کاتەدا و بۆ چەند ساڵی پاشتریش هێرشی پێبکەنە سەر حکومەتی ئێران و ئەو سیاسەتەی لەهەمبەر کورد پەیڕەویی دەکات .لە ١٩٥٦دا ، کاتێك پەلامارەکانی شورەویی بەسەر پەیمانی بەغدا گەیشتە ترۆپك ، بڵاوکراوەکانی شورەویی بڵاویانکردەوە گوایە راپەڕینی جوانڕۆییەکان قوربانی ئەو پەیمانەیە . بە پێی ئەم سەرچاوەیە ، چەند ساڵێك بەر لە دەستپێکردنی هەڵمەتی سەربازیی بۆسەر جوانڕۆییەکان ، حکومەتی ئێران جۆرێك لە خودموختاریی پێدابوون و ئەوەشی پەسەند کردبوو کە پۆست و بنکەی سەربازیی و ژاندارمەریی لە ناوچەکەیان دانەمەزرێنێت .جوانڕۆییەکان بەم پێکهاتنە خۆشحاڵ بوون و ژیانێکی هێمن و دوور لە یاساشکێنییان دەگوزەراند .

بڵاوکراوەکەی شورەویی ئەوەی خستۆتە بەرباس کە لەبەر ئەوەی جوانڕۆییەکان لە گۆشەیەکی ستراتیژیی سەر سنووری عێراق– ئێراندا نیشتەجێن ، بەوە تاوانبار

---

[16] New York Times, Sep.5 , 1950.

[17] New York Times, sep.11 , 1950.

دەكران گوایە پشێویی و نائارامیی لەسەر سنوور پێكدەهێنن ، هەروەها ستونێكی تەمێكارانە دژیان ئاراستە كرا . پاش هەڵگیرساندنی شەڕو پێكدادانەكان لەنێوان حكومەتی ئێران و خێڵەكە ، گوتارەكە جەخت لەوە دەكاتەوە ، ئەو پیاوە خێڵەكییانە هەوڵیاندا بەرەو عێراق هەڵبێن ناچاركران بگەڕێنەوە ، لە ناكامی ئەو هەنگاوە سەربازییانەی كە عێراق بە پێی پەیمانی بەغدا هاویشتنی . گوتارەكە گەیشتبووە ئەو دەرئەنجامەی :" لەناوبردن و قڕكردنی كورد یەك لە ناكامەكانی پەیمانی بەغدا پێكدەهێنێت ."[١٨] پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت كە لەو كاتەی راپەڕینی جوانڕۆییەكان هەڵگیرسا ، پەیمانی بەغدا لەئارادا نەبوو . هەربۆیە ئەو زانیارییەی گوایە كردەوەی یەكە سەربازییە سنوورییەكانی عێراق بە پێی پەیمانی بەغدا بووە دروست نیە .

مۆركردنی پەیمانی بەغدا لە فێبرایەری ١٩٥٥دا تەنیا راژەی بە پڕتبوونی كینەی رووسیا لە هەمبەر وڵاتە ئەندامەكان كرد . كوردان ، كە لە پەیمانەكە بێزار بوون و وایان دەبینی راستەوخۆ دژی خواستە نەتەوەییەكانی ئەوان ئاراستەكراوە ، گوێیان باشتر تێڕوانینەكانی شورەویی دەبیست .

## لادانی كوردانی عێراق بەرەو كۆمۆنیزم

پەرتبوون لە بیری رامیاریی كورددا ، كە لە بەشی پێشوو ئاماژەی بۆ كرا ، توندتر و ئاشكراتر بوو . بیروباوەڕی ئەوە نوێیەكە كە لەلایەن چەند كەسانێكی پەرۆش و پەرگرەوە رێبەرایەتیی دەكرا ، خۆی لە بڵاوكراوەی نهێنیی (ئازادی) دا بینیەوە و لەوێدا بەرجەستە دەبوو ، ئەو گۆڤارە كۆمۆنیستییەی كە لەگەڵ شتەكانی دیكەدا ، لایەنگریی لە بەرەیەكی یەكگرتوو لەگەڵ عەرەبدا دەكرد . نەتەوەخوازە كۆنەكان ، ئەوانەی بەگشتیی كۆنەپارێز و گۆشەگیربوون ، (نیشتمان) یان دەركرد ،ئەو بڵاوكراوەیەی ئامانجی بەدیهێنانی یەكێتی كوردان بوو ، داوای مافەكانی كوردی دەكرد ، هەروەها داوای لە

---

هەروەها ئەو تێبینییانە ببینە كە بەناوی نوێنەرانی كوردەوە لە ١٣ی سێپتەمبەری ١٩٥٠ رەوانەی ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان ، زلهێزەكان و هەروەها ئەندامانی دیكەی نەتەوە یەكگرتوەكان كراوە لە:

Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 13 , (1950): 4-6.

[18] "Sud ba Plemina Jawanrudi ," in Mezhdunarodnaia Zhizn 4 (Apr. 1956):122-23.

سەرکردە دەرەبەگ و خێڵەکییەکانی کورد دەکرد شێوازیی خۆیان بگۆڕن .[19]

سلێمانی ، کە ببوە ناوەندێکی چالاکی بنەڕەتیی چالاکییە کۆمۆنیستییەکان لە عێراق ، لەبەر چەند هۆکارێك بە باشی هەڵبژێردرابوو . چالاکییە رامیارییەکان لە نێو شارێکی دووردەست کەمتر ئەگەری راکێشانی سەرنجی دەسەڵاتدارانی بەغدای لێ چاوەڕوان دەکرا . سلێمانی بۆ ماوەی چەندین ساڵ قەڵای نەتەوایەتیی کورد بوو ، مێژوویەکی دوور ودرێژیی هەڵسوکەوتی بەرهەڵستکارانەی لە حاست بەغدادا هەبوو . ئەو هەستە بەهێزە پەرەسەندووەی دژ بە حکومەت ، هاوجووت لەگەڵ ئەو راستییەی کە سلێمانی لە تێکڕای ناوەندە کوردییەکانی دیکە بەفەرهەنگتر و خوێندەوارترە . ئەوەش کردیە کێڵگەیەکی بەپیتی بڵاوبوونەوە و پەیڕەوکردنی کۆمۆنیستیی . بە هەژاندنی نەتەوایەتیی کورد ، کۆمۆنیستەکان توانیان خۆ بخزێننە نێو ریزی نەتەوەخوازە توندڕەوەکانەوە ، ئەو پەردەیەی کە ئەوان توانیان لە سایەیدا کاربکەن و بە شێوەیەکی رێژەییش لە لێپێچینەوە بەدووربن . وێڕای ئەوەش ، شانبەشانی ئەوەی کە سلێمانی بنکەیەکی بێوەیی بۆ کارکردن پێکدەهێنا ، بە شێوەیەکی گونجاریش لە سنووری نێودەوڵەتییەوە نزیك بوو ، ئەوەش پەیوەندیی لەگەڵ کۆمۆنیستەکانی ئێران و ئەولاتری ئاسان و هەموار دەکرد .[20]

هێندەی پەیوەندیی بە کوردانی عێراقەوە هەیە ، ئەوە لەوانەیە لە سلێمانی بووبێت کە هاوپەیمانیەتییەکی چالاك لەنێوان نەتەوەخوازانی کورد و کۆمۆنیستانی کورد هاتبێتە ئارا . لێرەدا بوو کە رێبەرایەتیی کۆمەڵانی خەڵکی کورد وردە وردە لە دەست ئاغا و شێخ و نەتەوەخوازە کۆنەکان هاتەدەر و کەوتە دەست توێژی رووناکبیران . ئەو هەرا و ئاڵۆزییە بەردەوامانەی ساڵی ١٩٤٨ کە خوێندکاران لە سلێمانی رێبەرایەتییان دەکرد بەڵگەیەکی روونی ئەم وەرچەرخانە نوێیەیە .[21]

لەماوەی تەقینەوەی توندوتیژییەکانی یەنایەری ١٩٤٨ لە بەغدا –وەیشوومەیەك بوو رێگای بۆ شۆڕشی ژوونیەی ١٩٥٨ خۆشکرد– خۆپێشاندەرە کوردەکان کە بە خەڵکە

---

[19] Longrigg. Iraq. 1900-1950.326

[20] Ibid.

[21] Ibid.,353.

ئاژاوەگێڕەکەوە پەیوەست بوون ، داوای بەردانی سەرانی بارزانییان دەکرد.[22] لە سلێمانی کە ئاژاوە و ئاڵۆزیی ببووە شتێکی باو و ڕۆژانە ڕوویدەدا ، خۆپێشاندەران کە سڵاویان لە دیداری رووسیا دەدا و دژی عەرەب و بەریتانییەکان دروشمیان دەدا ، " مامۆستایەکی ئینگلیزیان لە شارەکە وەدەرنا و بارەگای بەریتانییەکانیان گرتیبەردا."[23] لە کەرکوک ، خۆپێشاندەران پەلاماری کۆنسوڵخانەی بەریتانییان دا .[24]

ئەم نائارامیی و ئاڵۆزییە تا چەند بەهۆی بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم بوو ، تا ئێستاش ئەستەمە دیاریی بکرێت . سەبارەت بەم قۆناغە ، ئیدمۆندز نووسیویەتیی:" زۆربەی لاوانی کورد ، کە هەڵگری پەژارە و نەهامەتیی رەگەزیی بوون ، لەگەڵ دامەزراندنی ڕێکخراوە هاوبەشییەکانی لاوان لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی هاوسێی عێراق بوون ، هەستی نائومێدیی و نارەزایەتیی بووە زێدەباری خەمەکانیان . ئەوە ئەبوو کە ئەوانە زۆر سەریان لە مارکسیزم دەرچێت و لێیتێبگەن ، بەڵکو زیاتر لە هەلومەرجێکی وادا بوون خۆیان تێکەڵ بەو چالاکییانە بکەن کە لە مۆسکۆوە هاندەدرێت یاخود بەڕێوە دەبرێت ."[25]

ئیدمۆندز دەگاتە ئەوەی بڵێت کە رووسیا هیچ دەرفەتێکی بۆ سوود وەرگرتن لە نارەزایەتیی کورد و بەکارهێنانی بۆ قازانجی خۆی لەدەستنەداوە .[26]

تێڕوانینێکی هاوشێوە لەلایەن سەرچاوەیەکی دیکەی بەریتانییەوە ، نزیکەی ساڵێک پاش ڕاپەڕینەکە دەربڕاوە :" لە راستییدا ، لە عێراقدا نارەزایەتییەکی زیاتر لە کۆمۆنیزم هەیە ، خوێندکارانی کورد کە لە خولیا و ئاواتی ئەوەدان ڕۆژێك بێت کورد لە ژێر حوکمی بەغدا بێتە دەر و ئازادبێت ، لێرەدایە ئیدی کە چالاکییەکانی باڵی چەپ زۆرجێگای سەرنج و ئاوڕلێدانەوەیە ."[27]

---

[22] Ibid.,346.

[23] Ibid.

[24] Ibid.,347.

[25] Edmonds,C.J. " the Kurds and the Revolution of Iraq. " Middle East Journal 13. no. 1 (winter 1959). 2.

[26] Ibid.

[27] A.N.O "Nationalism in Iraq" The World Today 5,no.1 (Jan 1949).18.

یەك لەو گوتارانەی کە لە رۆژنامەی فەرەنسیی (لی مۆند) لە ساڵی ۱۹٥۱ بڵاوکراوەتەوە ، مامەڵەی لەگەڵ هەمان بابەت کردووە . بە بۆچوونی نووسەرەکەی ، کۆمۆنیستە کوردەکان ریشەیان لەنێو هەردوو جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد و جوڵانەوەی کۆمۆنیزمیی عێراقییدا هەیە . لەبەر ئەوە ، ئەوان هەمیشە لەنێوان هەردوو جەمسەری نەتەوایەتیی کوردیی و هاونیشتمانیی کوردیی-عەرەبییدا سەرەتاتکێ و ئەمبەروئەویەریان بوو .بە بۆچوونی نووسەر ، هەر ئەم ناجێگیرییەیە کە بۆتە هۆی چەند بارەبوونەوەی هاتنەدەر و گەڕانەوەی کوردە عێراقییەکان بۆ نێو پارتی کۆمۆنیست . ئەو وای پێشانداوە کە کوردە کۆمۆنیستەکان بە شێوەیەکی رێژەیی بەهێزن و سەرچاوەیەکی کردۆتە بەڵگە کە دەڵێت کوردان ٤٠٪ تێکڕای ئەندامە کاراکانی حیزبی شیوعیی عێراق پێکدەهێنن.[٢٨]

ئەم قەبلاندنە بە رێژەیەکی بەرز دێتە بەرچاو بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی ئەو ئامارە بڕواپێکراوانە سەبارەت بە ژمارەی دانیشتووان لەو کاتەدا پێشکەشکراون ، ئەوەی پێمان دەڵێت کە کوردانی عێراق لەنێوان شەشیەك و پێنجیەکی دانیشتووانی وڵاتەکە پێکدەهێنن .[٢٩] ئەگەر نووسەرەکەی لۆمۆند راست بکات ، ئەوە بە ئاسانیی ئەوە دەگەیەنێت کە تەنانەت بە گەڕانەوەی بۆ ساڵی ۱۹٥۱ ، نوێنەرایەتیی کورد لە حیزبی شیوعیی عێراقدا (٤٠٪) رێژەیانی لەنێو تێکڕای دانیشتووانی عێراق دا دووبەرابەر کردووە(۱۷٪-۲۰٪).

ناتوانرێت کۆنە نەتەوەخوازانی کورد بەوە تاوانبار بکرێن کە لە کاتێکدا کۆمۆنیستەکان رێبەرایەتیی لاوانی کوردیان گرتبووە دەست ، ئەوان بێکارە و دەست بە ئەژنۆ پاڵیان لێداوەتەوە . سەنگی تەرازووەکە بە قورسیی دژی نەتەوەخوازەکان بوو ، چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا حکومەتەکانی ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدایە نەیانتوانی لانی کەمی داواکاریی نەتەوەخوازانی کورد پەسەند بکەن . وێڕای ئەوەش هێشتا نەتەوەخوازانی کورد مانەوە و بە بەردەوامیی چەندەیان بۆ کرا لە پێناو کێشەکەیاندا درێغییان نەکرد . لەبەر ئەوەی سەبارەت بە بەدەستهێنانی هەر شتێك لە حکومەتەکەیان

[28] Le Monde, Dec. 7, 1951.

[29] Edmonds, " Middle East Focus on the Kurd ".

بێهیوابوون ، کەوتنە بیری ئەوەی داوای هاوکاریی لە زلهێزە ئەورووپییەکان و هەروەها ڕێکخراوە نێودەوڵەتییە جۆربەجۆرەکان بکەن . بابەتی دادێت ئەو تۆمارانە دەگرێتە خۆ .

## ئەو نامە و بیرخەرەوانەی لەلایەن کوردانەوە پێشکەشی کۆمسیۆنە نێودەوڵەتییەکان و سەرکردە دەوڵەتییەکان کراوە

هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانیی هیوای کوردی بوژاندەوە و چالاکییە نەتەوایەتییەکیانی پەرەپێدا . نەتەوەخوازانی کورد ژمارەیەک نامە و بیرخەرەوەیان ئاراستەی چەندین کۆمسیۆنی نێودەوڵەتیی کرد کە تێیدا پەژارە و نەهامەتییەکانی کوردیان خستبووە بەرچاو و خواستەکانی کوردیشیان تێدا روون کردبووەوە . چاوخشاندنێکی کورت بەو پەیوەندییکردنانە سەرنجێکمان سەبارەت بە سروشت و ئاستی چالاکییە کوردییەکان لەو بوارەدا پێدەبەخشێت . ئەو دکۆمێنتانە لێرەدا کورتکراوەتەوە و بە گوێرەی بەروارەکانیان ریزکراون :

١- لە ٣٠ی نوەتی ١٩٤٣دا ، بیرخەرەوەیەک لەمەڕ کێشەی کورد پێشکەش بە زلهێزەکان کراوە .[30] لەم بیرخەرەوەیەدا کورتە سەرنجێك لە مێژووی کورد ، سنووری ئێتنیی ، دانیشتووان ، رەگەز ، زمان ، ئایین ..هتد هاتووە . گرنگترین بەشی بیرخەرەوەکە دوابەشێتی کە بەدەقی ئینگلیزیی ، نەك فەرەنسیی نووسراوە ، ناونیشانەکەشی :" بۆچی پێویستە دەوڵەتێکی کوردیی دابمەزرێت ؟" لێرەدا بنەماکانی ویلسن بە بیر هاوپەیمانان هێنراوەتەوە ، ئەوەشی کە بە پێی پەیمانی سیڤەر دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی دانی پێدانراوە . هەروەها ئەو بنەمایانە بەبیر هاوپەیمانان هێنراوەتەوە کە لە پێناویدا دژی دەوڵەتانی تەوەر چەکیان بۆ هەڵگرتووە و پێیان گوتراوە کە ئارامیی لە

---

[30] ئەم بیرخەرەوەیە لە بنەرەتدا لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٢ دا پێشکەشی ژێنەراڵ ( دی گاوڵ ویندیل ویلکیا ) و کۆلۆنێل ( دەبلیو جی ئیلفینستۆن ) ی دەزگای هەواڵگریی بەریتانیی کراوە . هەرچەندە بەهۆی لەبەر چاوگرتنی هەلومەرجی نێودەوڵەتیی ئەو کاتە ، دەقەکەی تا ساڵی ١٩٤٨ بڵاونەکرایەوە

Randot,Pierrer. "Les revendications nationals Kurds (1943-1949). "Cahiers de l Orient Contemporian 18-19 (1049):65-66; Rambout, 137-38.

ناوچەکەدا نایەتەدی تا کورد لە لایەن تورکیا ، عێراق و ئێرانەوە سەرکوتبکرێن و ئازاد نەبن . ئەم بیرخەرەوەیە لەلایەن دەستەی بەدرخانیەکانەوە لە بەیروت ئامادەکراوە .

٢- بیرخەرەوەی ٣٠ ی مارتی ١٩٤٥ .[٣١] بیرخەرەوەیەکی نوێ بەناوی کۆمەڵەی کوردییەوە لە ٣٠ی مارتی ١٩٤٥ دا پێشکەش بە سەرانی نوێنەرە ئامادەبووەکانی کۆنفرانسی سانفرانسیسکۆ کراوە کە هەمان دەردەسەریی و ستەملێکراویی تێدا هاتووە.

٣- نامەیەك کە هاوپێچە لەگەڵ بیرخەرەوەکەی ٣٠ی مارتدا ، ئەویش لە ٣٠ی مارتی ١٩٤٥دا پێشکەش بە سەرانی نوێنەرانی کۆنفرانسی سانفرانسیسکۆ کراوە .[٣٢] لەم نامەیەدا ، داوا لە سەرانی شاندەکان کراوە هەوڵی خۆیان و حکومەتەکەنیان لە پێناو بەدیهێنانی سێ مەسەلەدا بخەنە گەڕ : یەکەم کۆنفرانسی سانفرانسیسکۆ ئەو بنەمایە پەسەند بکات کە مافی ئەو نەتەوانەی کە هێشتا سەربەخۆییان بەدەست نەهێناوە بناسێنێت تا داواکارییەکانیان بخەنە بەردەم ئەنجومەنە نێونەتەوەییەکان .دووەم ، کۆنفرانسی سانفرانسیسکۆ دانیشتنێك بە ئامادەبوونی تێکڕای بەشداربووانی پێکبهێنێت تاکو لەسەر کێشەی کورد وتووێژ بکەن . هەروەها سێیەم : کۆمسیۆنێکی نێونەتەوەیی تایبەت پێکبهێنرێت کە ئەرکی لێکۆڵینەوە و چارەسەرکردنی کێشەی کورد بگرێتە ئەستۆ .

٤- نامەیەك هاوپێچە لەگەڵ بیرخەرەوەکەی ٣٠ی مارت ، لە ٣١ی مارتی ١٩٤٥دا پێشکەشی زلهێزەکان کراوە .[٣٣] لە نامەکەدا گوتراوە کە بە پێی بنەماکانی مەنشوری ئەتلانتیك ، ئەمێستا پێویستە چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ کێشەی کورد بدۆزرێتەوە ، لەکاتێکدا ئەو جەنگەی لە پێناو دادپەروەریی و سەربەستییدا هەڵگیرساوە سەرکەوتووانە کۆتاییهاتووە .

٥- نامەیەك لەلایەن ئیحسان نوری پاشا ، فەرماندەی گشتیی هێزە نەتەوەییەکانی کورد لە ئاگریداغ ، لە ٢١ی ژوونیەی ١٩٤٥دا پێشکەشی زلهێزەکان کراوە .[٣٤] لەم نامەیەدا ،

---

[31] ئەم بیرەوەرییە کە لەلایەن کۆمەڵەی کوردییەوە ئامادەکراوە لە ساڵی ١٩٤٥ لە پاریس لەژێر ناونیشانی کوردستان بڵاوکراوەتەوە..Randot,. "Les revendications"66.

[32] بۆ دەقی ئەم نامەیە: Bulletin du Centre d Etude Kurdes. no. 5 .(1949): 8-10.

[33] Bulletin du Centre d Etude Kurdes. no. 6 , 18-19.

[34] Ibid.,21-19.

ئیحسان نوری پاشا کێشەی کوردی پێشاندا و داوای کرد کە ڕێگە بە نوێنەری کوردان بدرێت خواستەکانی خۆیان بخەنە بەردەم کۆنفرانسی سانفرانسیسکۆ ، جەختی لەو ڕاستییە کردەوە کە نەك تەنیا دەوڵەتە دامەزراوەکان ، بەڵکو گروپە نەتەوایەتییەکانیش مافی گوێلێگرتنیان بدرێتێ .

٦- بانگەوازێك لە ١٠ی سێپتەمبەری ١٩٤٥دا پێشکەشی وەزیری دەرەوەی زلهێزەکان کراوە کە لە لەندەن کۆبوونەتەوە .[٣٥] ئەم بانگەوازە ئۆپەراسیۆنی سەربازیی دژی کوردانی بارزانیی ، کە لە ئووتی ١٩٤٥ لە عێراق دەستپێکردووە ، ڕیسوا کردووە و خوازیارە مەسەلەکە لە لایەن وەزیری حکومەتەکان و کۆنفرانسەکەی وەزیرانی دەرەوە لەبەرچاو بگیرێت .

٧- بانگەوازێك لە ٢٦ی نۆڤەمبەری ١٩٤٥دا پێشکەش بە زلهێزەکان کراوە .[٣٦] لەم بانگەوازەدا ، کۆمەڵەی کوردان سەرلەنوێ داوایان لە زلهێزەکان کردووەتەوە چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ کێشەی کورد بدۆزنەوە .

٨- بانگەوازێك لە ٩ی دیسەمبەری ١٩٤٥دا ئاراستەی ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان کراوە .[٣٧] ئەم بانگەوازە سەرجەم ئەو نامە و بانگەوازانەی پێشووتری بەبیرهێناوەتەوە کە بۆ دەزگا نێودەوڵەتییە جۆراوجۆرەکان نێردراون و پێویستی چارەسەرکردنی کێشەکەی دووبارەکردۆتەوە ، ئەوەی کە ڕاگرتنی ئارامیی و جێگیریی تەواوی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگە .

٩- تەلەگرافێ ٢٤ی دیسەمبەری ١٩٤٥ ، ئاراستەی کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی زلهێزەکان لە مۆسکۆ کراوە .[٣٨] ئەم تەلەگرافە لەلایەن ڕێبەرانی کوردی عێراقەوە مۆرکرابوو ، تێیدا هاتبوو کە مافەکانی گەلی کورد و ئەو بەڵێنانەی پێیان درابوو جێبەجێ نەکراون و حکومەتە یەك بەدوا یەکەکانی عێراق بەرژەوەندییە ئابووریی ، کەلتووری و کۆمەڵایەتییەکانی گەلی کوردی پشتگوێ خستووە . تەلەگرافەکە پتر درێژەی دەداتێ و دەڵێت گەلی کورد هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو حکومەتانە ئامانجیان

---

[٣٥] Ibid.,21-22.

[٣٦] Ibid.,22-23.

[٣٧] Ibid.,23-24.

[٣٨] Ibid.,24; Rambout, 141-142.

بەعەرەبكردنی كوردە و رێز لە مافەكانیان وەك نەتەوەیەكی جیاواز ناگرن ، هەروەها داوای كردووە كە ئۆتۆنۆمییان لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی پاشایەتییدا پێ بدرێت .

١٠- بانگەوازێك لە حیزبی رزگاریی كوردەوە بۆ رێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان.[٣٩] لەم بەڵگەنامەیەدا كە لەسەرەتای ساڵی ١٩٤٦دا بڵاوكراوەتەوە . حیزبی رزگاریی كورد بانگەشەی بۆ رزگاركردن و یەكخستنی گەلی كورد كردووە و داوای ئەوەی كردووە كۆتایی بە رەتاندنی گەلی كورد بهێنرێت . هەروەها جەخت لەسەر چارەسەرێكی دادپەروەرانەی كێشەی كورد لە پێناو ئاشتیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا كراوەتەوە .

١١- بیرخەرەوەیەك لە ساڵی ١٩٤٦دا دراوە بە كۆمیتەی هاوبەشی ئینگلۆ-ئەمەریكیی بۆ لێكۆڵینەوە لە كێشەی فەلەستین .[٤٠] ئەم بیرخەرەوەیە كە لەلایەن كۆمەڵەی كوردانەوە نێردراوە ، باس لەو مامەڵە نابەجێیە دەكات كە دەرحەق بە كەمینەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجام دەدرێت و ئاماژەیەكی تایبەتی بە كوردانی عێراق داوە .

١٢- بیرخەرەوەیەك كە بۆ كۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتە زلهێزەكان لە پاریس لە ٢٦ی ژوونی ١٩٤٦ نێردراوە.[٤١] ئەم بیرخەرەوەیە لە لایەن كۆمەڵەی كوردانەوە پێشكەش كراوە ، باس لە پەرەسەندنی رووداوەكانی پاش جەنگی یەكەمی جیهانیی دەكات ، ئاماژە بە هەردوو رێكەوتننامەی سیڤەر و لۆزان كردووە. وتووێژی لەمەڕ دابەشكردنی نیشتمانی كوردان لەنێوان توركیا،ئێران،عێراق و سوریا و هەروەها تێكۆشانی بێهوودەی كوردانی لەپێناو سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ئازادییان كردووە. هەروەها ئامارێك سەبارەت بە دانیشتووانی و زیان پێكەوتووی كورد لە توركیا ، ئێران و عێراق دراوە .

١٣- بانگەوازێك لە ١٠ی مارتی ١٩٤٧دا پێشكەش بە كۆبوونەوەی چوار وەزیرەكەی دەرەوە لە مۆسكۆ كراوە .[٤٢] ئەم بانگەوازە لەلایەن كۆمەڵەی كوردانەوە ئاماژەی بە هەوڵە جۆربەجۆرەكانی كورد لە پێناوی بەدەستهێنانی مافەكانیان داوە ، هەروەها ئاماژە بە

---

[39] Rambout, 141-142.

[40] بۆ دەقی ئەم بیرخەرەوەیە بڕوانە:

Palestine Post, Mar. 28, 1946; Randot,. "Les revendications "69; Longrigg. Iraq,1900-1950, 335.

[41] Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 6 ,(1949): 24-26.

[42] Ibid27-28.

بێهیوایی کوردان و مەترسیی خزاندن و پەنابردنی لاوانی کورد بەرەو توندوتیژیی کوێرانە کردووە . داواش لە وەزیرانی دەرەوە کراوە دەستبەجێ بە قازانجی کورد تێکەڵ بە کێشەکە بن .

١٤- بانگەوازێك لە ٣١ی مارتی ١٩٤٧ دا پێشکەش بە ژێنراڵ مارشاڵ کراوە .[43] لەنێو ئەو شتانەی لەم بانگەوازەی کۆمەڵەی کورداندا هاتووە ، قامك خستنە سەر ئەو هاوکارییانەیە کە لەلایەن وڵاتە یەککگرتووەکانەوە پێشکەش بە تورکیا کراوە .

١٥- بانگەوازێك لە٣٠ ی ژوونی ١٩٤٧ ئاراستەی سەرۆکی کۆمیتەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەککگرتووەکان کراوە .[44] ئەم بانگەوازە باسی لەسەرکوتکردنی کورد لەلایەن حکومەتەکانی تورکیا و ئێران و عێراق کردووە . وردەکاریی رووداوی وێرانکردنی گوندەکانی کوردە بارزانییەکانی لەلایەن لەشکری عێراق و هێزی ئاسمانیی پاشایەتیی بەریتانییەوە باس کردووە ، وێڕای ئەو مامەڵە ناشایستەیەی کە پاشتر لەهەمبەر بارزانییەکانی نێو کەمپە زۆرە ملێکانی عێراقییدا کراوە .

١٦- بیرخەرەوەکەی ٢٩ی نۆڤەمبەری ١٩٤٨ .[45] ئەم بیرخەرەوەیە کە لەلایەن کۆمەڵەی کوردانەوە ئامادەکراوە ، یەك لە درێژترینی ئەو بەیاننامانەیە کە خواست و ئارەزایەتییەکانی کوردی گرتۆتەخۆ . هاوپێچ لەگەڵیدا نامەیەك ئاراستەی بەڕێز (تریگڤی لێی) سکرتێری گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکانی کراوە کە بەرواری ٢٩ی نۆڤەمبەری ١٩٤٨ ی لەسەرە .[46]

١٧- بانگەوازێك لە ٦ی یەنایەری ١٩٤٨ ئاراستەی بەڕێز (ئێرنست بیڤن) ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیی کراوە .[47] ئەم بانگەوازە وەختایەك پێشەکەش کرا کە دانوساندن لەسەر رێکەوتننامەیەکی نوێ لەنێوان بەریتانیای مەزن و عێراقدا لەگۆڕێدا بوو کە شوێنی رێکەوتننامەکەی ساڵی ١٩٣٠ ی ئینگلۆ عێراقیی بگرێتەوە . بانگەوازەکە بەهیوا

---

[43] Ibid.,28-31.

[44] Ibid.,31-32.

[45] دەقی تەواوی ئەم بیرخەرەوەیە بە زمانی فەرەنسیی و بە ناونیشانی ( بیرخەرەوەیەك سەبارەت بە هەلومەرجی کورد و خواستەکانیان ) بڵاوکراوەتەوە و کورتەکەشی بە زمانی فەرەنسیی ، ئینگلیزیی و ئیتاڵیی بڵاوکراوەتەوە

[46] Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 2 ,(1948) 22-23.

[47] Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 6 , 33-34.

بوون لە ڕێکەوتننامە نوێیەکەدا بڕگەیەك سەبارەت بە ناساندنی هەلومەرجی کورد لە عێراقدا جێبکرێتەوە . بانگەوازەکە ئاماژەی بەوە داوە کە پشتگوێخستن و نەبوونی بڕگەیەکی بەو چەشنە لە ڕێکەوتننامەی ساڵی ۱۹۳۰دا زیانی بە مافەکانی کورد گەیاندووە . هەروەها سەرجەم ئەو ڕووداوە جۆربەجۆرانەی هێناوەتەوە یاد کە پاش ڕێکەوتننامەی ساڵی ۱۹۳۰ و کۆتاییهاتنی ماندێتیی بەریتانییەکان لە میسۆپۆتامیا ڕوویاندا بوو .(دوا ئاکامی ئەم ڕێکەوتننامەیە بەستنی پەیمانی پۆرتسمۆس بوو .)

۱۸- نامەیەك لە ١٤ی فێبرایەری ١٩٤٩ دا ، لەلایەن محەممەد حیلمی بەگ و بەناوی حیزبی دیموکراتی نیشتمانی کوردەوە ڕەوانەی پاندت نەهرۆ کراوە .[48] ئەم نامەیە لە نەهرۆی خواستبوو کێشەی کورد بخاتە بەرنامەی ئەو کۆنفرانسە ئاسایییەی بڕیاربوو لە نیودلهی بگیرێت . هەروەها کۆپییەکی ئەم نامەیە ئاراستەی کۆنفرانسەکە کرابوو .

۱۹- نامەیەك لە ١٥ی یەنایەری ١٩٤٩دا ئاراستەی سەرۆکی کۆمسیۆنی ماف مرۆڤی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان کراوە .[49] ئەم نامەیە ئاماژەی بە بانگەوازەکەی پێشووی ۳۰ی ژوونیە بۆ سەرۆکی کۆمسیۆنەکە دابوو ، هەروەها بەومامەڵە ستەمکارانەیەی کە تورکیا ،عێراق و ئێران دەرحەق بە کوردی دەکەن ، بە تایبەتیی جەختی لەسەر نەهامەتیی و چارەڕەشیی پڕداخی بارزانییان لە عێراق کردووە .

۲۰- نامەیەك لە ۲ی مارتی ١٩٥٦ دا پێشکەش بە نەتەوە یەکگرتووەکان کراوە،[50] ئەم نامەیە نەهامەتیی و دەربەدەریی کوردی دووپاتکردووەتەوە و هانی لەبەرچاوگرتنی خواستەکانی کوردی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە داوە .

۲۱- نامەیەك لەلایەن خانمە بێوەکەی جەلادەت بەدرخان کە پێشکەشی کۆنفرانسی هاوپەیوەستەگیی ئاسایی –ئەفریکایی لە قاهیرە کرابوو .[51] دەقی ئەم نامەیە هاوشێوەی ئەوەکەی ۲ی مارتی ١٩٥٦ بوو کە ئاراستەی نەتەوە یەکگرتووەکان کرابوو . تێیدا ئاماژە بە بەدکارگێڕیی و کەموکوڕیی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان لە ناوچە کوردنشینەکان ، کەموکوڕیی هەلی خوێندن بۆ کورد بە زمانی خۆی ، هەروەها سەرکوتکردن و

---

[48] Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 5 , 8-10.

[49] Bulletin du Centre d Etude Kurdes, no. 4 , 8-10.

[50] Randot, "La Nation, 56.

[51] Ibid.,65-66.

سرینەوەی کەلتووری کورد ، بە تایبەت لە تورکیا و ئێراندا .بەڵام ئاماژەی بەوە دابوو کە هەلومەرج لە عێراق لەبارترە . نامەکە جەختی لەسەر ویستی کورد بۆ بەدیهێنانی سەربەستیی و یەکخستنی نیشتمانەکەیان کردبوو ، ئەو قسەڵۆکەشی پوچەڵکردۆتەوە کە دەڵێت گوایە راپەرینەکانی کورد بە هاندانی کاریگەریی دەرەوە بووە .

٢٢- نامەیەك لە لایەن کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٨ دا ، ئاراستەی سکرتێری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان کراوە .[52] لەم نامەیەدا ، کۆمەڵەی خوێندکاران داوای لە سکرتێری گشتیی کردووە ، کێشەی کورد بخرێتە بەرنامەی دانیشتنێکی تایبەتەوە کە گفتوگۆ لەسەر کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکات . نامەکە هیوای خواستبوو کە تورکیا و ئێران سیاسەتێکی نوێ لەحاست کورداندا بگرنەبەر و لەو رووەوە سیاسەتی نوێی عێراق هاندەریان بێت .

٢٣- نامەیەك لەلایەن کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردەوە لە ئەورووپا لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٨دا، پێشکەش بە جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر کراوە.[53] ئەم نامەیە بە بۆنەی کردنەوەی بەرنامەی رادیۆیی بە زمانی کوردیی لە قاهیرە سوپاسی سەرۆك ناسری کردووە .

٢٤- نامەیەك لەلایەن کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردەوە لە ئەورووپا لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٨دا ئاراستەی سەرۆك نیکیتا خرۆشۆف کراوە.[54] نامەکە پێزانینی خۆی سەبارەت بە بایەخدان بە چالاکییە کەلتوورییەکانی کورد لە یەکێتی شورەویی دەربڕیوە . نامەکە پێشنیازیی ئەوەی کردووە کە لەجیاتی ئەلفوبێی سلاڤیی کە بڵاوکراوە کوردییەکانی یەکێتی شورەویی پێ بڵاودەکرێتەوە ، بە ئەلفوبێی لاتینیی شوێنی بگیرێتەوە ، هەروەها بەرنامەی کوردیش لە نێزگەی مۆسکۆوە دەست بە بڵاوبوونەوە بکات . کۆپی ئەم نامەیە بۆ هەردوو کۆماری شورەویی ئازەربایجان و ئەرمینیا نێردراوە .

وێڕای تێکڕای ئەو بانگەواز و بیرخەرەوانە کە خراونەتە بەردەم نەتەوە

---

[52] ئەم نامەیە یەکێکە لەو چەندین نامانەی کۆنگرەی خوێندکارانی کورد کە لە ٤-٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٨ لە میونخ بەسترا و لەلایەن رێکخراوی خوێندکارانی کوردەوە لە ئەورووپا سەرپەرشتیی دەکرا

Edmonds," the Kurds and the Revolution," 8.

[53] Ibid.,9.

[54] Ibid.

یەکگرتووەکان . کوردان نەیانتوانی لە هەوڵەکانیاندا سەرکەوتووبن بۆ ئەوەی کێشەکەیان لەبەردەم ئەو دەزگایەدا بیستراوبێت . نەبوونی دەوڵەتێکی کوردیی و نەهاتنە کایەی دەوڵەتێکی ئەوتۆ کە ئارەزووی گرتنەخۆی کێشەکانی هەبێت ئەو مانایەی دەگەیاند کە چ رێگەیەك نیە بەهۆیەوە کێشەی کوردی پێدا بخرێتە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان . بەوەش ، کاتێك لە ساڵی ١٩٤٨دا ، داوایەك پێشکەشی سکرتێری گشتیی کرا . لەگەڵ بیرخەرەوەکەی نۆڤەمبەری ١٩٤٨ لە لایەن (نوێنەرایەتیی کورد) ەوە .[55] داواکەیان بەرێزەوە رەتکرایەوە و لەوە ئاگادار کرانەوە کە پێویستە بەدوای دەوڵەتێکدا بگەڕێن کێشەکەیان بگرێتەخۆ .[56]

ئەو ناڕەزایەتیی و شکایەتانەش کوردان ئاراستەی نەتەوە یەکگرتووەکانیان کردووە هەمان چارەنووسی هەبوو . سێر ئارنوڵد ویلسن ، لەکاتی دیدەنییەکدا لە کۆمەڵەی ئاسیای ناوەندیی پاشایەتیی ، لە ٢٦ی سێپتەمبەری ١٩٣٢ دا . تێبینیی کرد " کەمینەکانی عێراق بە شێوەیەکی بەرچاو لە کەمینەکانی دیکەی جیهان جیاوازن ، لە حاڵەتەکەی ئەواندا هیچ ئەندامێکی کۆمەڵەی گەلان نیە لە جنێڤ هەڵگری خواست و کێشە تایبەتەکانیان بێت ."[57]

جێگەی سەرنجە ، بلۆکی سۆشیالیستیی ، لەناویشیاندا یەکێتی شورەویی ، وێڕای پشتگیریی چالاکیان لە نەتەوایەتیی کورد ، هیچ هەوڵێکیان نەدا تا لەبەردەم نەتەوە یەکگرتووەکاندا ، کێشەی کورد لەخۆ بگرن و بەرگریی لێبکەن .

## پەیوەندییەکانی کورد و عەرەب : تەبایی و ناتەبایی

کورد ، هاوکات لەگەڵ تێکۆشانیان بۆ بەدەستهێنانی دانپێدانانی نێودەوڵەتیی و بگرە کاری نێودەوڵەتیش بە قازانجی کێشەکەیان ، هەروەها لە هەوڵی بەدەستهێنانی هاوسۆزیی و هاوکاریی هاوسێ عەرەبەکانیشیاندا بوون . بارودۆخی ناوازەیان ،

---

[55] ئەم نوێنەرایەتییە لە لایەن نەتەوەخوازیی لێهاتوو شەریف پاشاوە سەرکردایەتیی دەکرا . هەروەها بە هاوەڵی د کامەران بەدرخان ، د. م.و زازا ، د. فەرزەند شکاك.

Randot.Pierrer. "Ou en est La qestion Kurdes "L Afrique et l Asie2, no.2 , (1949), 52-53

[56] Ibid.,53.

[57] وەرگیراوە : Muford, 119.

سەرباری بوونی بەشێکی مەزنی دانیشتووانی کورد لە عێراق و سوریا ، بووەهۆی ئەوەی کارێکی لەم چەشنە شیاو و پێویست بێت .

پاش شکستی راپەرینەکەی بارزانیی و رووخاندنی کۆمارەکەی مەهاباد ، کوردان لە رووی رامیارییەوە خۆیان لە گۆشەگیرییدا دیتەوە . نیگەرانیی لە مەترسیدارترین گۆشەگیریی رامیاریی کوردانی ورياکردەوە ، هەربۆیە بێنەوەی کات بەفیڕۆ بدەن کەوتنە پەیجوی پەیوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ عەرەبدا ، پەیوەندییەك کە تەنیا سوود بە کوردان لە عێراق و سوریا ناگەیەنێت ، بەڵکو پشتگیرییەکی نێودەوڵەتیی بەهادار بە تێکرای کورد دەبەخشێت . لەنێو هەموو ئەوانەدا ، هیوادار بوون هەلومەرج برەخسێت تێیدا کوردان بتوانن کێشەکەیان بخەنە بەردەم نەتەوە یەککگرتووەکان . باڵی کوردیی حیزبی شیوعیی عێراق و رێکخراوە هاوشێوەکانیان لایەنگرێکی بەهێزی هەوڵ و کارێکی لەو چەشنە بوون .

کوردە نەتەوەییەکانیش لەو رووەوە نەکەوتنە پاش ، میر کامەران بەدرخان لە درێژەی چاوپێکەوتنێکدا لە ساڵی ١٩٥١ ، لەگەڵ پەیامنێری پاریسی رۆژنامەی (شەعب) ی بەغدادیی ، قامکی خستەسەر دۆستایەتیی کوردو عەرەب ، ئاماژەی بەو مامەڵە نەرمە کرد لە عێراق و سوریا دەرحەق بە کورد دەکرێت ، ئەو گوتی : لەو دوو دەوڵەتەدا ، کورد خاوەنی زۆر ماف و دەستکەوتن کە لە تورکیا و ئێراندا پێیان رەوا نابینرێت . ئەو ئاماژەی بەوەدا ، لەو دوو دەوڵەتە عەرەبییەدا رێگە بە کورد دراوە رۆژنامە ، گۆڤار و پەرتووك بە زمانی خۆیان چاپ و بڵاوبکەنەوە ، هەروەها بێ دەستوەردانی دەسەڵاتی رامیاریی ، بایەخ بە پەرەپێدان و پێشخستنی کەلتووری خۆیان بدەن . ئەو جەختی لەوە کردەوە کە وێڕای هێندێك جیاوازیی لەنێوان کورد و عەرەب لە عێراقدا ، کورد بەو چاوە ناڕوانێتە ئەو وڵاتە کە لە هەر یەك لە تورکیا و ئێرانی پێدەڕوانێت .[٥٨]

چوارساڵ پاشتر ، لەمیانەی چاوپێکەوتنێکی خۆمدا لەگەڵ میر کامەراندا ، ئەو پتر لەمەڕ ئەم بابەتە دووا و گوتی ، زۆر گرنگە بۆ کورد لەگەڵ عەرەبدا هاوکاریی بکات ، چونکە عەرەب تەنیا نەتەوەیەکن لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە لە کورد تێدەگەن هاوسۆزیی لەگەڵ دید و بۆچوونەکانیاندا پێشان دەدەن . دواتر ئاماژەی بەوەدا کە کوردان لە

[58] Maurice Clair, "An interview With Emir Badir Khan," Al-Sha b , Dec .17, 1951.

رابردوودا سەردانی لەندەن ، پاریس و پایتەختە ڕۆژئاواییەکانی دیکەیان کردووە تا کێشەکانیان بخەنە بەرچاو . ئەمێستا ، ئەو گوتی :" ئێمە هەموومان دەزانین ئەوە هەڵە بووە ، لە داهاتوودا پێویستە بۆ بەغدا ، دیمەشق و قاهیرە بچین ."[٥٩]

وادەردەکەوێت هەردوولا دانیان بە پێویستی تێگەیشتن و هاوکاری نزیکی نێوان کورد و عەرەب نابێت . بە بۆچوونی هێندێک سەرکردەی عەرەبخوا ، ئەمە دەبێتە سیاسەتێکی سارێژکاریی درێژخایەن ، کاتێک کاتی ئەوە هات وڵاتەکان یەکگرن . ئەوا کوردان ، گەر دۆست بن ، خۆ لە هێنانە کایەی هەر جۆرە گرفت و ئاڵۆزییەک بە دوور دەگرن .

لە گوتارێکی دوور و درێژدا سەبارەت بە جوڵانەوەی عەرەبایەتیی کە لە گۆڤاری (الهلال) ی میسریی بەناوبانگ لە ساڵی ١٩٤٣دا بڵاوکراوەتەوە ، عەبدولڕەحمان عەزام کە دواتر بووە سکرتێری گشتیی کۆمکاری عەرەب ، بە پەرۆشەوە خوازیاری دۆستایەتیی کورد و عەرەبە . عەزام بایەخێکی فرەی بە کورد داوە ، جەختی لە هاوبەستەگیی کۆنی ئیسلامی نێوان ئەوان و عەرەب کردۆتەوە و ئاماژەی بەو خزمەتە مەزنە کردووە کە لەلایەن (سەلاحەددین) و سەرکردەکانی دیکەی کوردەوە پێشکەش بە ئیسلام و عەرەب کراوە . ئەو جەختی لەوە کردەوە کە عەرەبەکانی عێراقیی بەهەر نرخێک بێت پێویستە خۆ لە برینداركردنی هەستی کوردان بپارێزن و رایگەیاند کە کوردان گەلێکی دڵسۆز و ئەمەکدارن و هیچ کارێکیان بە مەبەستی زیان گەیاندن بە خواستی عەرەب لێناوەشێتەوە.

بە بۆچوونی عەزام ، کوردان پێویستە هیچ کات هەست بەوە نەکەن کە یەکێتی عەرەب زیان بە بەرژەوەندییەکانی ئەوان دەگەیەنێت ، " هیوا و خواستەکانی عێراق " پێویستە وەک فرانخوازییەک لەسەر حسابی کورد نەهێنرێتە پێش چاو . پتر لەوەش ، نەتەوەی عەرەب (لە کاتێکدا یەکبگرن) پێویستە ئەو مافە بۆ کورد بهێڵنەوە کە ببنە بەشێک لەو ، یاخود سەربەخۆیی خۆیان بەدەستبێنن ، گەر خواستێکی (سەربەخۆییان) هەبوو ، پێویستە لەلایەن عەرەبەوە هەست بە بێزاریی و بەدبڕوایی نەکرێت . دواتر عەزام عێراقییەکان وریا دەکاتەوە کە خۆ لە پیلانگێڕیی بیانیی بپارێزن و هۆشیاربن لەگەڵ کورداندا نەکەونە کێشە و بگرە و بەردە و خۆ لە دوژمنایەتییکردنیان بپارێزن .

---

[٥٩] چاوپێکەوتنەکە لە بەهاری ١٩٥٥دا لە پاریس ئەنجامدراوە

ئەو بۆچوونی خۆی لەمەڕ پەیوەندییەکانی کورد و عێراقییەکان پوختە دەکات و دەڵێت :" مەسەلەکە گەلێك ئاسانە و ویست لە دەست کوردەکان خۆیاندایە ، گەر عێراق بەهێز بێت ، ئەبێت تەنیا وەك خاڵێکی گردکەرەوە و راژەکەر بەو نەتەوە رۆژهەڵاتیە برایە بکات ".[60]

بێگومان ویستی عەرەب و کورد هەردوو سەبارەت بە تێگەیشتنی هاوبەش و هاوکاریی راستگۆیانە بوو ، هەروەها دەربڕینی هاوبەشی رێز و متمانەی هەردوولا بۆ یەکدی مژدەی ئایندەی دەبەخشی . راستیی ئەوەی کە پەیوەندی باشی کورد و عەرەب لەو کاتەدا نەك تەنیا پێویست بوو ، بەڵکو بەدڵنیاییەوە بۆ گرتنەخۆ و کۆکردنەوەی ئەو دوو لایەنە کە عەرەبی میسر و کوردی سوریا بوو ، ئەوەی تێگەیشتنی دەستەم نەبوو . میسر کوردی تێدا نەبوو ، ئەو دانیشتووانە کوردە کەمەی سوریاش لەو وڵاتەدا مامەڵەیەکی ئاراەیەك باشی بەرامبەر دەکرا . بەڵام هەلومەرجەکە گۆڕانی بەسەردا هات ، کاتێك میسر وەك پاڵەوانێکی نەتەوەخوازی عەرەب ، لەگەڵ سوریا یەکیان گرت ، هەروەها پاش شۆڕشی عێراق ، بانگەشەی خواستی یەکگرتنی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا کرد بەڵام شکستیخوارد ، پتر بەهۆی نارەزایەتیی کوردەوە .

هەر زوو پاش شۆڕشی ژوئیەی ١٩٥٨ گرژیی لەنێوان نەتەوەخوازانی عەرەب و کورد لە عێراق پەیدا بوو . یەکێك بەرابیترین نارەزایەتییەکان لەلایەن بارزانییە دوورخراوەکانەوە پێشاندرا ، بەوەی گەڕانەوەیان بۆ عێراق لە رێگای بلۆکی رۆژهەڵات و بەهۆی سەفیری کۆماری عەرەبی یەکگرتوو لە پراگ بەڕێوەچوو . بارزانییەکان ئەوەیان ئاشکرا کرد گوایە لە سەروبەندی گەڕانەوەیان بۆ نیشتمان ، لە میسر وچانیان داوە و لەلایەن دەسەڵاتدارانی میسرەوە مامەڵەیەکی توندوبێزارکەریان دەرحەق کراوە بێئەوەی پێویست بکات گەڕانەوەکەیان دواخستوون . کۆنگرەی خوێندکارانی کورد کە ٤-٨ ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٨ لە میونخ بەسترا ، لەلایەن یەکێتی خوێندکارانی عەرەبەوە لە ئەڵمانیای خۆرئاوا پەلامارێکی توندی کرایەسەر . ئەوەی دوایی ئامانجەکانی کۆنگرەی خوێندکارانی کوردی وەك سوکایەتیی و مەترسییەك بۆ نەتەوایەتیی عەرەب ریسواکرد ، هەروەها داوای لە خوێندکارانی عەرەب کرد بەشداریی لەو کۆنگرەیە نەکەن و هەڕەشەی

---

[60] عبالرحمن عزام ، الوحدة العربية ، الهلال، قاهرة،الجزء الرابع ، سبتمبر- اكتوبر ١٩٤٣ ، ٤٦٥

لەوانەش کرد کە بەو شێوەیە ناجوڵێنەوە .[61]

پەلاقەی نێوان کوردو عەرەب لەبەر ئەوە تا دەهات فراوانتر دەبوو ، بە چەشنێك پردی نێوانیان هێندەی تاڵەمویەکی پەیوەست مابوو . نەتەوەخوازانی عەرەب لە عێراق و هەروەها لە کۆماری یەکگرتووی عەرەبیش بەتوندی کەوتنە دژایەتیی کورد . ئەوانەی لەگەڵ کۆمۆنیست و چەپەکانی دیکە سەبارەت بە رەتکردنەوەی پەیوەست بوونی عێراق بە کۆمارە یەکگرتووەکەی عەرەبەوە سەرەکۆنە و لۆمە کران . ململانێ و کێشمەکێش لەنێوان هەردوولا بەردەوام بوو .

کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا ، لە پەیوەندییەکیدا بە رۆژنامەی (خەبات)ی کوردییەوە لە ١٠ی دیسەمبەری ١٩٥٩ ، بێئاگایی خۆی لەو بەیاننامەیە راگەیاند کە پەلاماری عەبدولکەریم قاسمی رابەری شۆڕشەکەی ١٩٥٨ی لەعێراق داوە ، ئەو عەبدولکەریمەی تا ئێستا کەسی یەکەمی حکومەتە دامەزراوەکەیە (کە لە بابەتی دواتر وتووێژی لێکراوە) . ئەو بەیاننامەیە لە ئێزگەی رادیۆی سرییەوە بڵاوکرایەوە کە ناوی (دەنگی عێراقی ئازاد) ی لەخۆی نابوو . کۆمەڵە ئەم ئیزگەیەی بەوە تۆمەتبارکرد کە دروستکراوی ناسرە دەرکردنی بەیاننامەکەی خستۆتە ئەستۆی ئەوانەوە . کۆمەڵە، ناسر ، کۆماری یەکگرتووی عەرەب ، بەعسییەکان و ئەو ئیزگە رادیۆییەی بە توندترین شێوە ریسواکردووە ، بەڵام رێزو ستایشێکی گەرمی لەحاست رژێمەکەی قاسم پێشانداوە .[62]

لەهەمان پەیوەندییدا ، کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا ، گۆڤاری (کل شیء/هەموو شت) ی میسریی تاوانبار کردووە بەوەی بە هەڵە بەشێك لەنامەیەکی خوێندکارانی عێراقیی لە لەندەن وەرگرتووە و بڵاویکردۆتەوە . نووسەری نامەکە ، بەپێی یەکێتی عێراقیی بۆ قوتابیانی کورد ، نارەزایەتیی دژی یەکێتییەکە پێشانداوە لە سۆنگەی هاوکاریی لەگەڵ کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا و بەهۆی ئەوەی کە کۆمەڵە بە ئاشکرا لایەنگریی جیابوونەوە لە عێراق دەکات . پەیوەندییەکەی کۆمەڵە بە توندیی رەخنەی لەم دەربڕینە گرتووە و بە سەرچڵییەکی نادادپەروەرانەی ناوزەدکردووە و جەختی لە دڵسۆزیی و وەفاداریی تەواوی ئەندامەکانی بۆ کۆماری عێراق و رابەرەکەی

[61] Edmonds, " the Kurds and the Revolution of Iraq. ",8.

[62] رونکردنەوەیەك لە کۆمەڵەی خوێنکارانی کوردەوە لە ئەورووپا ، خەبات ، ژ ٨٣،نۆکتۆبەری ١٩٥٩

، عەبدولکەریم قاسم کردۆتەوە . دواتر کۆمەڵە بە بایەخەوە دەڵێت :" ئەم هەڵوێستەی ئێمە هەروەك خۆی دەمێنێتەوە هەتا گەلی کوردمان بەردەوام بێت لەسەر خاوەندارێتیی مافەکانی و تا کۆمارەکەش لە گرتنەبەری رێگای دیموکراسیی و ئازادیی بەردەوام بێت."[٦٣]

## کورد و کۆماری عێراق

کتوپڕیی ڕووداوەکانی ژوئیەی ١٩٥٨ لە عێراق ، وێڕای ئەو پەردە ئەستوورەی ڕژێمی نوێ بە باڵای تەواوی وڵاتەکەیدا پۆشیی ، کارێکی وای کرد مەزەندەکردنی زۆر بابەت لە عێراقدا ، لەوانەش حاڵی کورد زۆر ئاڵۆز و گران بێت .سنوورەکان بە توندیی داخران ، هەموو پەیوەندییەکان بە جیهانی دەرەوە هەڵپەسێردران . لەو چەند ڕۆژە کەمەی بەراییدا ، هەواڵێکی کەم لەمەڕ درێژەی شۆڕشەکە و حاڵەتی جێگیریی نێوخۆ سەری دەرکرد .

هیچ بەڵگەیەك بە دەستەوە نیە پێشانی بدات داخۆ پایەی بەدەستهاتووی بەرچاوی کوردان لەپێش یان ڕاستەوخۆ پاش شۆڕشەکەی ژوئیە هێنراوەتە بەرچاو . هەرچەندە ، بێگومان ئەوان بەشێوەیەکی مەزن سوودیان لە ململانێیەکە بینی کە لەنێوان دەستەی قاسم و بەعسییە نەتەوەییەکاندا لەئارادا بوو . گەر دەستەی دووەم باڵادەست بوونایە ، زۆر جێگای گومان بوو ، کوردان ئەو ماف و دەستکەوتانەیان بەرکەوتایە کە لەو دەمەدا بەدەستیانهێنا .

بەیاننامەیەکی نیوەفەرمیی بڵاوکراوە پشتگیرییەکی بەرچاو لەم بۆچوونە دەکات . تێیدا کورتە سەرنجێکی گشتیی لەمەڕ قۆناغی بەرایی شۆڕش لە عێراقدا هاتووە و پرسی سەرەکیی سەبارەت بە ململانێ و ڕکابەریی نێوان قاسم و عەبدولسەلام عارف جێگری یەکەمی تێدا هاتووە . ئەوەی لەگەڵ شوێنکەوتە بەعسییەکانی کە لایەنگری ناسر بوون ، عەرەبچییەکی توند بوو . بەیاننامەکە درێژەی دەداتێ و دەڵێت :

" هێندێك خوازیاری وروژاندنی کوردان بوون کە هاوبەشن لە عێراقی باوباپیرانیاندا ، هەرچەندە دانپیانانی تەواو و بێ کەموکوتیی مافەکانی کورد لەلایەن

---

[٦٣] هەمان سەرچاوە

قاسمەوە رێگەی لێگرتن و هەوڵەکەیانی پوچەڵ کردەوە . سەرانی کورد بێ دوودڵیی رایانگەیاندووە گەر خۆشیان لەدەسەڵاتدا بوونایە نەیاندەتوانی ئەوە پێشکەش بە کورد بکەن کە قاسم کردوویەتی ."[64]

لەم بەیاننامەیە و زانیارییەکانەوە دەردەکەوێت کە قاسم پتر لە سەرکردەکانی دیکەی شۆڕشەکە ، لە بەدەستهێنانی ئەو پایە بەرچاوەی کورد لەوکاتەدا بەرپرسیار بوو ، هەروەها بەخشینی ماف و دەستکەوتەکانی کورد پاشتر هات ، وەك ئەوەی پێش ئەو ململانێیە بێت کە لەنێوان قاسم و ناحەزانیدا لەسەر دەسەڵات هەبوو .

لە راستییدا ، دروستە بڵێین کە ئارەزووی ئاشتەوایی هەر زوو لەسەرەتاوە بە ئاشکرا درکی پێدەکرا . بەڵام سەرکردایەتیی نوێی شوڕش راستەوخۆ پاش ئەنجامدانی شۆڕشەکەی تاچەند ئامادە بوو لەگەڵ داوا نەتەوایەتییەکانی کورددا بچێتەپێش مەسەلەیەکە زۆر روون نیە . هەرچەندە رێی تێدەچێت عەبدولسەلام عارف و نەتەوەخوازە عەرەبچییەکانی دیکە ئەوەیان رەتکردبێتەوە کە بە ئەندازەی قاسم ملی پێوەنێن . دواتر پیاو ناتوانێت سەبارەت بە قاسم خۆشی گۆمان نەکات و پرسیار نەکات . ئایا هەر زۆر لەسەرەتاوە ویستوویەتی لەحاست کورددا دڵفراوان بێت یان پێشتر وای لێهاتووە ، یاخود ناچار بوو کە بەو شێوە رەفتار بکات ، کاتێك کورد و کۆمۆنیستە کوردەکان و دەستە چەپەکان بۆ پشتگیریی کردنی بە درێژایی ململانێی لەپێناو دەسەڵاتدا کۆبوونەوە ؟

گرنگ نیە وەڵامی ئەم پرسیارە چ دەبێت ، شتێك هەیە کە چەسپاو دەردەکەوێت ، هەرچەندە خواستێك بۆ ئاشتەوایی هەبوو ، بەڵام هیچ سیاسەتێکی دیاریکراوی تایبەت بەکورد بنیاتنەنرابوو . ئەمەش زۆر سەیر نیە کاتێك پیاو بیر لەو هزرە ناکۆك و سەرەڕۆیانە دەکاتەوە کە ئەو رەگەزە ناتەبایانەی لەسەر بوو بەشێوەیەکی کاتیی لە پێناو رووخاندنی رژێمە کۆنەکەدا کۆببوونەوە .

پاش رووداوە توندوتیژەکانی ١٤ی ژوونیەی ١٩٥٨ ، رژێمە شۆڕشگێرە نوێیەکە لە عێراق هیچ کاتێکی لە هەڵهێنانی چەند هەنگاوێك بەفیرۆ نەدا کە نەك تەنیا لەپێناو

---

[64] جمهورية العراق ، المجلس الاعلى للعلاقات ، ثورة ١٤ تموز في عامها الاول ، ( بغداد : منشورات دار الاخبار ، ١٩٥٩ ) ، ١١ .

ناشتەوایی لەگەڵ کورددا ، بەڵکو لە پێناو راکێشان و بەدەستهێنانی لایەنگریشیان بوو . خالد نەلنەقشبەندیی ، ئەو کوردە بوو کە یەکێك لە سێ ئەندامەکەی ئەنجومەنی سەروەریی کە پاش شۆڕش دامەزرێنرا .[٦٥] کابینە نوێیەکە کوردێکی دیکەی تێدابوو کە بابەعەلی کوڕی شێخ مەحموود بوو ، پۆستی وەزیری کاروپەیوەندییەکانی لە ئەستۆ گرتبوو .[٦٦] شێخ لەتیفی برای بابەعەلی ، کە ماوەی چوار ساڵ زیندانیی بۆ برابووەوە ، ئازادکرا . شێخ ئەحمەدی بارزان ، کوڕەکەی ، هەروەها برازاکەی (کوڕەکەی مەلامستەفا) تێکڕا لە دەرەوەی ناوچەی خۆیان دوورخرابوونەوە ، بەخشران و رێیان پێدرا بۆ شوێنەکانی خۆیان بگەڕێنەوە . وێنەیەك کە تێیدا قاسم لە پاڵ ئەفسەرێکی بریندار کورددا وەستا بوو لەکاتی شەڕکردن لە کۆشکی پاشایەتیی لە ١٤ی ژوئیەی ١٩٥٨دا ، بەشێوەیەکی فراوان بڵاوکرابووەوە .[٦٧]

ئەم هێماکارییە بۆ نیازپاکیی زۆری نەخایاند بەڵگەی چەسپاوی سەبارەت بە گۆڕانی شوێن و پێگەی کورد بەدوای خۆیدا هێنا . لە برگەی سێی ئەو دەستوورە کاتییەی کە دوای شۆڕش بڵاوکرایەوە ، دەڵێت :" عەرەب و کورد لەم نیشتمانەدا هاوبەشن ، مافە نەتەوایەتییەکانیان لەچوارچێوەی یەکێتی خاکی عێراقدا دانپێدانراوە ."[٦٨] بەوەش یەکەمین جارە لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە ، کوردان دانپیانانێکی فەرمیی لە دەستووردا بەخۆیانەوە ببینن و بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵ عەرەبدا لەیەك ئاستدا دابنرێن .

لە هەمان کاتدا ، گوتەی زۆر سەبارەت بە برایەتیی کورد و عەرەب و هاوبەستەگیی نێوانیان دەکرا ، بەیاننامەکانی لەلایەن قاسم و دەسەڵاتدارانی دیکەوە بڵاودەکرانەوە ، گوتاری ئەو ئەندامانەی لە لایەن نوێنەرایەتیی کوردەوە سەردانیان دەکرد

---

[65] خالید نەقشبەندی لە بنەماڵەی شێخانی بامەڕنێیە لە نزیك ئامێدیی  ئەندامەکانی دیکەی ئەنجومەنی سەروەریی بریتییە لە محەمەد مەهدی کوببە . کە عەربێکی شیعەیە . هەروەها نەجیب ئەلروبیعیی، کە عەرەبێکی سوننەیە و وەك سەرۆکی ئەنجومەنەکە هەڵدەسوڕا

Edmonds. " the Kurds and the Revolution of Iraq. ",8.

[66] Ibid.

[67] Ibid.

[68] کۆپی دەستوری کاتیی کە لە لایەن کونسولخانەی عێراقەوە دابەشکراوە . واشنتۆن دی.سی .

، هەروەها بڵاوکراوە فەرمییەکان ، بەرنامەکانی رادیۆ ، تێکڕای ئەوانە پتر قسەیان لە (کۆماری عەرەب و کورد) و یەکێتیی هەتاهەتایی هەردوو گەل دەکرد .

هاوکات ، مەلامستەفا کە لەپاش رووخاندنی کۆمارەوە وەك پەنابەرێك لە شورەویی بوو ، هیچ کاتی لە ناردنی تەلەگراف بۆ قاسم و ئەنجومەنی سەروەریی بە فیڕۆ نەدا کە تێیدا پیرۆزبایی و هیوای گەڕانەوەی خۆی دەربڕیبوو . وەڵامەکەشی دەستبەجێ و ئەرێیی بوو ، ئامادەکاریی پێویست لەرێگای باڵیۆزی کۆماری یەکگرتووی عەرەب لە پراگ لەپێناو گەڕانەوەی خێرای مەلامستەفا بۆ بەغدا ، کە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر نوێنەرانی کورد لە هەموو لایەکی عێراقەوە پێشوازییان لێکرا ، بۆنەیەك بوو بۆنەوەی ئاهەنگێکی خۆش و سەرنجڕاکێشی تێدا ئەنجام بدرێت .

## ناحەزیی کورد بۆ یەکگرتن لەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەبدا

گەڕانەوەی مەلامستەفا بۆ عێراق هاوکات بوو لەگەڵ پەرەگرتنی توندی کێبڕکێی نێوان ئەوانەی خوازیاری یەکگرتنی تەواو و دەستبەجێ لەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەبدا بوون و ئەوانەی دژ بوون . لەراستییدا ، تەنانەت دەگونجا گەڕانەوەی مەلامستەفا درزی نێوان ئەو دوو گروپەی بەرەو دەلاقە بردبێت . ژمارەیەکی زۆر لەوانەی نزیکبوونەوە و ریزبەندیی خێرایان لەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەب پێ باش بوو دەتوانرا لەنێو ئەندامەکانی باڵی راستی حیزبی ئیستقلال و هەروەها حیزبی بەعسدا ببنرێتەوە . چەپە میانڕەوەکانی پارتی بەرگریی دیموکراتیی نیشتمانیی بە رقەوە دەیانڕوانییە رەتکردنەوەی پارتەکان و رێگە لە چالاکییەکانی هەمووان گیرابوو ، جگە لەو چالاکییە رامیارییانەی لە کۆماری یەکگرتووی عەرەبدا هەبوو ، بەوەش ئەوان دژی بیرۆکەی یەکگرتن بوون .

کورد ، ئەوانەی لە سۆنگەی هۆکارگەلێکی ئاشکراوە نیگەرانییەکی مەزنیان لە پەیوەست بوون بە دەوڵەتێکی عەرەبی مەزنترەوە هەبوو ، چالاکانە دژی نزیکبوونەوە و یەکبوون بوون لەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەب . ئەوان دەترسان لە دەوڵەتێکی وادا کە عەرەب تێیدا باڵادەستە ، ئەوان ببنە کەمینەیەکی نەتەوەیی ئەوتۆ چارەنووسێکی گەورە و دەرکەوتویان نەبێت .

## کورد و کەوتنی عەبدولسەلام عارف

هاوکات ، سەرنجی نیشتمانیی و نێودەوڵەتیی بەشێوەیەکی خێرا لەسەر عەبدولسەلام عارف چڕبووەوە ، ئەوەی کە سەرەڕۆیی و دەمگەرمییەکەی وێڕای ناوبانگ ، کردبوویە کەسایەتییەک جێگەی مشومڕلەسەرکردن بێت . گوتارە توند و ئاگرینەکانی عارف گوێگرانی خۆی بە شێوەیەکی بەرفراوان دەخرۆشاند ، بەڵام ترس و دڵەڕاوکێی کەسانی فامیدەی نێو حکومەتی دەورووژاند .[69] گوتەکانی سەبارەت بە بابەتە دەرەکیی و نێوخۆییەکان کارمەندە بەرپرسەکانی دەوڵەتی سڵەماندەوە و تووشی نیگەرانی کردن .[70] وێڕای ئەوەش ، ئاکاری خۆسەپێنەریی دەنگی ئاخاوتنی سەرچڵانەی ، ژمارەیەک لەو کەسایەتییە رامیارییەکانی رێبەرایەتیی و هەروەها زۆرێک لە ئەفسەرەکانی هاوەڵی لێ تەکاندەوە .[71]

پڕبایەخترین چالاکییەکانی عارف ، لایەنگریی ئاشکرای بوو لە یەکێتی

---

[69] ئەونەیەک کە شێوازی خۆشخەیاڵی و توندی زمانی عارف دەربخات ئەو گوتەیەی بوو کە عێراقی پێناساند کە ( کۆمارێکی دیموکراتیی ، سۆشیالیستیی ، نیشتمانیی ،خولکردی ، خاکیی سەربازییە "
جمهورية العراق ، محكمة الشعب ، الجلسات السرية ، بغداد ، منشورات حكومية ، ١٩٥٣، ٣٧٤.

[70] لە میانەی ئەو دادگاییکردنەی عارف دا سەبارەت بە هەوڵدانی بۆ لەناوبردنی قاسم ، ژمارەیەک لە شایەتەکان کە هێندێکیان هاوڕێی خۆیبوون و هەمان بیروباوەڕی پان عەرەبیزمیان هەبوو ، ئاماژەیان بە گوتە ورووژێنەرانەیەی عارف سەبارەت بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەک ( دەوڵەتێکی ئیمپریالیست ) کرد ، هەروەها هێرشی توندی بۆ سەر ئێران لە سەرەتای ئەو کاتانەی کە حکومەتی ئێران بە فەرمی دانی بە رژێمی تازە دامەزراوی عێراقدا نابوو هەروەها لەسەر ئاستی ناوخۆش عارف لە گوتە و بۆنەکاندا هێرشی دەکردە سەر چینی موڵکدار و دەوڵەمەندان و دەیگوت ( لێرە بەدواوە ، نە کۆشک ، نە ماڵی بریق وباق ، نە فەرماندەر ، نە فەرمانبەر ) ، ئەوەش زۆربەی دانیشتووانی ترساند ، بە تایبەتی لەو گوتارەی لە شاری کوت دای ، هێرشی کردە سەر موڵکداران و بەشێکی زۆری وەرزێڕانی لە دەور کۆبیۆوە ،ئەوەی بووە هۆی رووداوی توندوتیژی لێبکەوێتەوە .

[71] ئەو سەرکردە سیاسییانەی کە عارف لە گەڵیاندا ناکۆک بوو بریتیبوون لە کامل چادرچی سەرکردەی چەپەکانی پارتی نیشتمانیی دیموکراتیی ، هەروەها سەدیق شەنشەل سەرکردەی راستەکانی پارتی ئیستقلال ، ئەو رادەیەی کە عارف هێندێک لە هاوەڵە سەربازییەکانی خۆی دابڕیبوو لەو زانیارییانەدا دەردەکەوێت کە ئەو ئەفسەرانە لە دادگاکەدا داویانە وەک عەقید ماهر ، عەقید ا.و ئەمین ، عەقید عادل

دەستبەجێ لەگەڵ کۆماری یەکگرتووی عەرەب و نزیکبوونەوەی لەگەڵ بەعسییەکاندا . ئەو هەڵوێستەی لەلایەن عەرەبچییەکانەوە پێشوازیی لێکرا و لە لایەن نەیارانییەوە سەرزەنشت کرا ، ئەوەش دووبەرەکییەکی قووڵی لێکەوتەوە و ململانێی بۆ دەسەڵات خێرا کرد ، ململانێیەك کە وا پێدەچوو نە عارف و نە شوێنکەوتەکانیشی خۆیان بۆ ئامادە نەکردبێت .

ئەو هێزانەی دژی عارف سەریان بە یەکدا کردبوو ، سەلماندیان کە توانای زاڵبوونیان فرەیە ، بە تایبەت ئەو کاتەی قاسم بڕیاریدا دژی عارف وەخۆکەوێت . عارف لە ٥ی دیسەمبەری ١٩٥٨دا دەستبەسەرکرا و لە ٢٧ی دیسەمبەردا بردیانە دادگای مەهداوی و تۆمەتی هەوڵدان بۆ کوشتنی قاسمی سەرۆکی تاقانە لە ١١ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٨ ، هەروەها هاندان بۆ ڕاپەڕین لە ٤-٥ی دیسەمبەر ، لەگەڵ چەند تۆمەتێکی لەوانە بچووکتر خرایە پاڵی . دوای دادگاییکردنێکی درێژی داخراو لە ٥ی فێبرایەری ١٩٥٩ ، بە مەرگ سزادرا و لە هێزە چەکدارەکان دەرکرا . هەرچەندە قاسم بڕیارەکەی دادگای لەسەر مێزەکەی خۆی هێشتەوە بێئەوەی واژۆی بکات . عارف بۆ سێ ساڵی داهاتوودا لە زیندان مایەوە تا ئەو کاتەی لە پایزی ١٩٦١دا ئازادکرا ، لەو کاتەدا کە سوریا لە کۆماری یەکگرتووی عەرەب هاتەدەر ،[72] وەلانانی عارف گورزێکی توندی لە بەعسییەکان و دەستە و تاقمە عەرەبچییەکاندا ، هەروەها سەرکەوتنێکی ئاشکرای بۆ لایەنگرانی یەکێتی بۆ لایەنگرانی یەکێتی عێراق پێکهێنا . ئەوانەی دوایی لە کۆمۆنیستەکان ، دیموکراتە نیشتمانییەکان و کورد پێکدەهاتن . هەستی قاسم خۆی سەبارەت بە تۆڕکردن و وەلانانی عارف هەرچییەك بێت ،[73] ئەو لەو رووە شاد بوو کە دەرفەتی رزگاربوونی لەدەست هەڤاڵێکی بێزارکەر و جێگرێکی سەرچڵ و مێملێکی مەترسیدار هاتەپێش .

---

[72] دەتوانرێت زانیارییەکی زۆر بەنرخ لە تۆمارەکانی دادگاکەی عارفدا ببینرێتەوە . بۆ ئەو زانیارییانەی خۆی داوێنی یان قسەی شایەتەکان سەبارەت بە کەوتنی عارف بڕوانە:

Majid Khadduri , Republican Iraq (Oxford: Oxford University press , 1969) 92-98.

[73] لە قسەی شایەتەکان و هەروەها ئەوەی عارف بەردەوام دووبارەی دەکردەوە دەردەکەوێت کە ئەو و قاسم دوو هاوڕێی خۆشەویست بوون . لە راستییدا عارف زۆرجار بە برای مەزن و تەنانەت بە باوکیشی ، ئاماژەی بە قاسم داوە .بڕوانە: جمهورية العراق ، محكمة الشعب .

لەمیانەی دادگاییکردنەکەی عارف دا ، ئاماژە بە دوو رووداو کرا کە تیشك دەخەنە سەر هەڵوێستی ناوبراو لە هەمبەر کورد . یەکەمیان پەیوەندیی بە گەڕانەوەی مەلامستەفاوە هەیە بۆ عێراق ، کە لە لایەن عەقید وەسفی تاهیری دوژمنی سەرسەختی عارفەوە باسی لێوە کرا . بەگوێرەی تاهیر ، کاتێك قاسم و سەدیق شەنشەلی وەزیری ئەودەمی ئیرشاد ، خەریك بوون وەڵامی ئەو تەلەگرافانەی مەلامستەفا بدەنەوە کە داوای کردبوو بۆ عێراق بگەڕێتەوە ، عارف گوتبووی: سەیری ئەم خەڵکە چی دەکەن ! گەر ئەرکەکەیان بە من بسپێرن بە ئاسانی دوو وشەی بۆ رەوانە دەکەم ، لەوەلاترچۆ ، لەوەلاترچۆ!"[٧٤]

لەوەش بایەخدارتر ، گەر راستبێت ، گوایە ئاکاری عارفە لەحاست شێخ ئەحمەدی بارزان ، برا گەورەی مەلامستەفا . بەپێی ئەو شایەتەی لە دادگاییەکەدا باسی لێوەکرد ، گوایە عارف بە توندیی و جۆرە رقێکەوە رووبەڕووی شێخ ئەحمەد بووەتەوە ، کاتێك شێخ بە نیازی پیرۆزبایی شۆڕش و دەربڕینی سوپاسگوزاریی سەبارەت بە ئازادکردنیان لە زیندان سەردانی عارفی کردووە بە چەشنێك وەك لای خوارەوە پێشوازیی لە میوانەکەی کردووە :" وریابە هیچ هەرایەك نەنێیتەوە ، بە پێچەوانەوە ئێمە بە توندیی سزات دەدەین ."[٧٥] دەگوترێت ئەو رابەرە بارزانییە زۆر بەم هەڕەشەیە بێزاربوو کە شتێك بوو هەرگیز پێویستی نەدەکرد .

لەو کاتەدا باس لەوە کرا کە تڕۆکردنی عارف و ئەوەی بەسەری هات جۆرێك پەیوەندیی بە ئاحەزیی ناوبراوەوە هەبوو لە هەمبەر مەسەلەی گەڕانەوەی مەلامستەفا . راستی ئەم باسەی کراوە هەرچییەك بێت ، شتێك هەیە کە چەسپاوە: دەسەڵاتی کورد لە سایەی رژێمە نوێیەکەدا پاش وەلاخستنی عارف بە ئاشکرا پەرەیسەند . لە

---

[٧٤] هەمان سەرچاوە ، ٣٦٩.

[٧٥] قسەکانی نەقیب سالم ئەلفەخریی لە هەمان سەرچاوە ، ٤٠٥-٦. هەرچەندە شایەتەکە گوتی کە کاتی گفتوگۆکردن لەمەڕ ئەو بابەتە ، عارف داوای پۆزشی کردووە و گوتوویەتی کە ئەو مەبەستی نەبووە سووکایەتیی بە شێخ بکات وێرای ئەوەش " عارف ئەوەی رەتنەکردۆتەوە کە ئەقیبەکە پێشنیازی کردوە کە لەجیاتی عارف داوای لێبوردن لە شێخ بکات هەمان سەرچاوە ، ٤٠٦ عارف لەکاتی بەرگرییکردنەدا لە کۆتایی دادگاییکردنەکەی ئەوەی لەسەرخۆی لابرد کە گوایە هەوڵی هەڕەشەکردن و سووکایەتیی پێکردنی سەرکردە بارزانییەکەی دابێت هەمان ٤٣٧.

راستییدا ، هاوبەستەگیی کوردان لەگەڵ رژێمەکەی قاسمدا بە خێرایی چووە پێش . لانی کەم لە دوو بۆنەدا ، کوردان رۆڵێکی بەرچاویان لە شکستپێهێنانی دوو راپەڕینی دژ بە قاسم هەبوو . لە هەردوو بۆنەکەدا ، کوردان لەگەڵ چەپەکاندا بەتایبەتی شیوعیەکانی لایەنگری رژێم لە سەنگەرێکی هاوبەشدا کۆبوونەوە .

## رۆڵی کورد لە راپەڕینەکەی موسڵدا

لەکاتی راپەڕینەکەی پیاوە خێڵەکییەکانی شەمەر ، لە سایەی رێبەرایەتیی عەبدولوەهاب شەوافدا ، لە بەهاری ۱۹۵۹ لە موسڵ ، یەکە خێڵەکییەکانی کورد رژانە نێو موسڵەوە و بە پشتگیرییکردنیان لە یەکەکانی سوپا کە بە قاسم وەفادار بوون ، هەروەها هێزەکانی بەرگریی گەلیی لە موسڵ ، ئەو رۆژەیان پاراست . تێوەگلانی کوردان تەنیا هاوکارییان بە شکستی هێزە دژەکانی نێو موسڵ نەهێنا ، بەڵکو بە شێوەیەکی چالاکانە رێگای هەموو هاوکارییەکی دەرەکییان لێبڕین . هێزەکانی بەشداربووی کورد ، وێڕای جەنگاوەرە بارزانییەکان ، لە خێڵەکییەکانی ناوچەی ئامێدیی و هەروەها لە ناوچەی شەنگار پێکدەهاتن . بە گوێرەی رۆژنامەنووسێکی عێراقیی ، زیاتر لە پێنج هەزار جەنگاوەری کورد تێوەگلان .[٧٦] وادەردەکەوێت ئێزیدییە خێڵەکییەکانی شەنگار ، کە ناوچە چیاییەکەیان دەکەوێتە سەرەرێگەی سەرەکیی سنوورەکانی سوریاو و خێوەتگاکانی خێڵی شەمەر ، رۆڵێکی بەرچاویان سەبارەت بە رێگرتن لە هێزەکانی لایەنگریی شەوافدا بنیبێت .

پاش راپەڕینەکەی موسڵ ، کورد و چەپەکان لە ئاکامی ئەو راژە ناوازەیەی پێشکەشی حکومەتەکەی قاسمیان کرد ، بوونە جێگەی متمانە و پشتپێبەستن . ئەوان بە شێوەیەکی پتەو بە رژێمەکەوە ئالآن . کوردانی بارزانیی ، پێکەوە لەگەڵ کوردە چەپەکانی دیکەی لایەنگری قاسم ، رۆڵێکی گرنگیان لە خامۆشکردنی راپەڕینێکی مەترسییدار بینی کە لە هەرێمی برادۆستی ناوچەی رەواندز سەریهەڵدا .

---

[٧٦] منير رزوق ، مؤامرة عبدالناصر ، بغداد ، دار البلاد للصحافة والنشر ، ١٩٥٩ ، ٢٦-٢٧ ، اتحاد الشعب ، بغداد ٧، ابريل، ١٩٥٩

## راپەڕینی برادۆست لە مایۆی ١٩٥٩دا

هۆکارەکانی راپەڕینە کوردییەکەی مایۆی ١٩٥٩ لە هەرێمی برادۆست لە ناوچەی رەواندز هەرگیز بە شێوەیەکی گونجاو لێکنەدراوەنەتەوە . وەختایەك هەڵمەتەکان دژی راپەریوەکان بەرێوەچوو ، زانیارییە فەرمییەکان کەم باسی لێوەدەکرا . حکومەتی عێراق بەچەند هۆکارێکی ئاشکرا ، نەیدەویست بوونی راپەرینێك لە کوردستاندا رابگەیەنێت ، لەکاتێکدا کوردان وەك پایەیەکی سەرەکیی رژێمەکە دەنرخێندران . تەنانەت پاش ئەوەی راپەرینەکەش کۆتاییهات ، سەرچاوە فەرمییەکان و بڵاوکراوە نێوخۆییەکان تیشکێکی کەمیان یان هەر هیچ تیشکێکیان نەخستە سەر ئەم رووداوە . بەگشتیی ئەم رووداوە یان وەك یاخیبوونێکی سەرخێڵە دەرەبەگەکان و هاندراوی دەستی ئیمپریالیزم وێنا دەکرد .[77] چاپکراوەکانی دەرەوە بە پێچەوانەوە ، رووداوەکەیان تەنیا وەك راپەرینێك دژی رژێمە شۆرشگێرییەکەی عێراق لەقەڵەم دا .[78]

ئەم راپەرینەش ، وەك تەقینەوەکەی عەرەبی شەمەر لەکاتی یاخیبوونەکەی شەواف موسڵ ، بریتیبوو لە کاردانەوەیەکی درەنگ وەختی رەگەزە کۆنەپارێز و دەرەبەگەکانی دژی شۆرشی ژووئیە . واپێدەچێت کتوپڕیی شۆرشەکە و ئەو توندوتیژییەی بەدوایدا هات بە شێوەیەکی کاتیی نارازییەکانی پێکەوە کۆکردبێتەوە و هانیدابن کە لەو دەمەدا سەردەربێنن .

هەر سێ کەسایەتییەکەی راپەرینەکەی ١٩٥٩ ، شێخ رەشیدی لۆلان ، زاواکەی واتە محەمەد خەلیفە سەمەد ، هەروەها شێخ محەمەد سەدیق . بە توندیی بە رژێمە کۆنەکەوە بەسترابوونەوە و دۆستانە لە رژێمی نوێیان نەدەڕوانی .[79] وێرای

---

[77] اتحاد الشعب ، بغداد ،١٨،١٩و٢٠ مايو. ١٩٥٩

[78] Washington Evening Star , Jun 1 . 1959 .

[79] شێخ رەشید سەرکردەیەکی بایەخداری تەریقەتی نەقشبەندیی بوو و بارەگاکەی لە گوندی لۆلان لە هەرێمی رەواندز بوو . محەمەد خەلیفە سەمەد یەك لە سەرخێڵەکانی برادۆست بوو . شێخ محەمەد سدیق بە شێوەیەکی بەرفراوان بە نازناوەکەی ( پوشوو ) بەناوبانگ بوو . ئەو کوڕەگەورەی سەید تەها و کوڕەزای مەزنی شێخ

ناحەزیی دژ بە رژێمە نوێیەکە ، دوو کەسی یەکەمیان دوژمنێکی سەرسەختیی شێخ ئەحمەد و مەلامستەفای بارزان بوون . پێکدادانە توندوتیژەکانی نێوان شێخ رەشید و بارزانییەکان هۆکارێکی سەرەکیی بوو بۆ کردەوە سەربازییەکانی ۱۹۳۱-۱۹۳۲ دژی بارزانییەکان . لەماوەی دەستپێکردنی راپەرینی بارزانیی سالّی ۱۹٤۳-۱۹٤٥ ، شێخ رەشید دیسان خۆی هاویشتە سەنگەری دژ بە بارزانییەکان و ئەمجارە محەمەد خەلیفە سەمەدیشی پێوە پەیوەست بوو .

شێخ محەمەد سەدیق زۆر لەوە لاوتر بوو کە هەر رۆڵێکی لە رووداوەکانی ۱۹۳۱ و ۱۹٤۳دا بینیبێت ، شێخ کە یەکێك بوو لە ناسراوترین سەرخێڵی لاوی کورد ، وێرای لاوێتیی ، زۆربەی کات ئەندامی پەرلەمان بوو ، هەر بۆیە مەبەستی بوو لە ململانێی نێوخۆیی خێڵەکانی ناوچەکە تێوە نەگلێت . لە بەهاری سالّی ۱۹٤۳دا ، ئاکارێکی گەورەم لە محەمەد سەدیق لە هەولێر بینی . ئەو رەخنەیەی ئەوم لە حکومەتی عێراق باش لە بیرە بەهۆی ئەوەی حکومەت پارە و چەك و تەقەمەنی ئەدایە محەمەد خەلیفە تا شەری بارزانییەکان بکەن . ئەو لەو دەمەدا زۆر هاوسۆزی مەلامستەفا و پەیوەندییشی لەگەڵ محەمەد خەلیفە دا ناخۆش بوو . ئەوەی کە لە دواییدا کە ئەیویست بەختی خۆی لەگەڵ شێخ رەشید و محەمەد خەلیفەدا تاقیبکاتەوە مانای ئەوە بوو کە بە تەواویی دڵی گۆڕیوە .

بێگومان ئەو توانا و پایە نوێیەی بنەماڵەی بارزانیی هەر لە دوای گەرانەوەی مەلامستەفا لە یەکێتیی شورەوییەوە بەدەستیهێنابوو پەیوەندیی بە راپەرینەکەوە هەبوو . جا ئایا شێخ رەشید و زاواکەی خۆیان چەکدار کردۆتەوە لە ئاکامی وورووژاندنیاندا یاخود ئەو کارەیان وەك هێمایەکی رکابەریی و ململانێ دژ بەو رژێمە کردووە کە بە شێوەیەکی مەزن دوژمنە سەرسەختەکانیانی بەسەردا زاڵکردوون ، مەسەلەیەکی زۆر ئاشکرا نیە . ئەوان بە شێوەی راپەرینێکی چەکدار سەریان بڵند کرد ، وێرای ئەو راستییەی کە بارودۆخی گشتیی بە توندیی دژیان بوو.

---

عوبەیدوڵلای ئەمریی بەناوبانگ بوو . ئەو کاتێك باوکی لە تاران دوورخراوە بووە ، لەگەڵ باوکیدا بووە و لەوێ خوێندوویەتی ، جگە لە زمانی کوردیی ، بە ئینگلیزیی ، عەرەبیی و فارسییەکی پاراویش قسەی ئەکرد

جەنگاوەرانی بارزانیی ، لەگەڵ یەکە خێڵەکییەکاندا کە لە لایەن پێکهاتەی نوێی کۆمەڵەی جووتیارانەوە پێکهاتبوو ، دژی راپەڕیوەکان وەك " هێزەکانی بەرگریی میللی" بە هەماهەنگیی لەگەڵ سوپای عێراق و هێزە ئاسمانییەکاندا کەوتنە پەلامار .[80] راپەڕیوەکان بەخێرایی تێکشکێنران ، بەڵام سەرانی راپەڕیوەکان بە هاوەڵی ژمارەیەك لە شوێنکەوتەکانیان توانیان لە سنوورەکانەوە بەرەو ئێران و تورکیا هەڵبێن . شێخ رەشید خۆی و چەند ئەندامێکی بنەماڵەکەی و چەند سەد کەسێك لە پیاوەکانی بەرەو تورکیا پەڕینەوە .[81]

بەمەش راپەڕینەکەی شێخ رەشید کۆتاییهات . بارزانییەکان لە کۆتاییدا سەرکەوتن و مێزەکەیان بەسەر ناحەزە سەر سەختەکەیاندا هەڵگێڕایەوە ، بۆ یەکەم جارە بەدرێژایی سێ جار پێکدادان و ململانێی توندوتیژ ، حکومەت لایەنگرییان لێبکات ، ئەمێستا ئەوان ئەو گورزەیان لە شێخ رەشید دا کە ئەو پێشتر دووجار لەوانی سرەواندبوو : بەزین و ئاوارەیی .

بۆ دووەم جار لەماوەی کەمتر لە شەش مانگدا ، بارزانییەکان راژەیەکی مەزنیان پێشکەش بە رژێمی فەرمانڕەوا کرد . ئەوەی کە شێخ رەشید توانی تەنانەت بۆ ماوەی چەند مانگێکی کەمیش بەرگریی لە شوێن و پایەکەی خۆی بکات ، جۆرە گورزێکی توندی لە بیرۆکەی هاوبەستەگیی کورد و عەرەبی سرەواند کە یەکێك بوو لە پایە سەرەکییەکانی رژێمی قاسم . ئەوەش سەرباری پەرتبوونی بەرەی کوردان ، پشتگیرییەکی زۆری عەرەبی بۆ قاسم دەستەبەر کرد . بارزانییەکان بە خێرایی پێشانیاندا کە بۆ رژێم زۆر بەنرخن ، گەر پێویست و بنەڕەتیی نەبن . پێویستە رۆڵی چەپەکان لەکاتی راپەڕینەکەی شێخ رەشیددا لە بیرنەکرێت . لێرەش هەروەك پێشتر لە موسڵ ، بە باشترین شێوە هەڵسوڕان بۆ شکستهێنانی یاخییەکانی دژ بە قاسم ، پڕۆپاگەندەکانیان هۆشیارانە جەختی لە برایەتیی کورد و عەرەب دەکردەوە . ئاماژەیان بەوەشدا کە راپەڕینەکەی شێخ رەشید یاخیبوونی کورد دژ بە حکومەتی قاسم نیە ، بەڵکو پتر راپەڕینێکی سەرخێڵە دەرەبەگە کۆنەپەرستەکان و پیاوەکانی

---

[80] اتحاد الشعب ، بغداد ١٩، ١٨، و٢٠ مايو، ١٩٥٩

[81] Washington Evening Star , Jun 1 , 1959 .

دیکەی ڕژێمی لە گۆڕنراوە .

## ناارامیی و توندوتیژیی لە کەرکوك

لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩٥٩دا ، ئاژاوەیەکی توند لە کەرکوك سەریهەڵدا ، کاتێك وردەکارییەکانی ئەم بابەتە بزانرێت ، سروشتی دڕندانە و دزێوی زۆر هەژێنەری ڕووداوەکەمان بۆ ئاشکرا دەبێت . قاسم ڕووداوەکە و ئەنجامدەرانی بە ناشرینترین شێوە ناوهێناوە ، ئەو گوتی کە دڵڕەقیی و دڕندەیی ڕووداوەکانی کەرکوك هەموو ئەو تاوانانەی تێپەڕاندووە کە لەلایەن هۆلاکۆ و جەنگیزخانەوە ئەنجام دراون ، ئەو پتر لەوەشی تێپەڕاند و گوتیی کە تەنانەت تیرۆرستە زایۆنییەکان لە دێریاسین ئەوەندە دڕندایەتیی و دڵڕەقییان پێشان نەداوە هێندەی ئەوانەی لە کەرکوك یاسایان لەدەستی خۆیاندا پلیشاندەوە .[٨٢]

قاسم کە لەکاتی گوتەکەیدا بێزاریی پێوە دیاربوو . ئەو ویستەی ڕیسوا کرد کە دەیەوێت هەمان خوێنڕێژیی لە سەراسەری وڵاتدا بەرپا بکات . ئەو جەختی لەو ڕاستییە کردەوە کە حکومەت لە هەلومەرجێکدا خەریکی بەڵگە کۆکردنەوەیە و خوازیارە هەموو توانا و ڕێبەرایەتییەکی دژی پیلانگێڕان ئاراستە بکات .

سەرچاوە کۆمۆنیستەکان تەقینەوەی توندوتیژییەکانی کەرکوکیان بە ململانێی نێوان لایەنگرانی ڕژێم و ڕەگەزە کۆنەپەرستەکان لەقەڵەم دەدا . هەرچەندە زانیارییەکی تەواو هەیە هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە کینەی ڕەگەزیی و دوژمنایەتیی شەخسیی ڕۆڵێکی تەنانەت گرنگتریان لە مەسەلە ئیدۆلۆژییەکان لە قەوماندنی ئەو ڕووداوەدا بینی . لە کەرکوك وا دەردەکەت کە کورد و کۆمۆنیستەکان دژی تورکەکان سەریان بە یەکدا کردبوو .

کورد و شیوعییەکان بە ئاشکرا دەستیان لە کەرکوکدا کراوە بوو . ئەو ڕاژە

---

[82] دێر یاسین کارەسات و نەگبەتییەکی عەرەبە . سەرکردە عەرەبەکان کاتێك هەر گروپێك بە زایۆنیستەکان لێکدەچوێنن و بەراوردکاریی لەنێوان چالاکییەکانی ئەوان و زایۆنیستەکان لە دێر یاسین دەکەن بۆ ئەوەی توندترین شێوەی بێزاریی و نارەزایی خۆیان دەربڕن

بەرچاوەی هەر دوو لا پێشکەش بە رژێمەکەی قاسمیان کرد ، هەردوولا لەکاتی راپەرینەکەی شەواف لە موسڵ ، هەروەها لەکاتی راپەرینەکەی شێخ رەشید لە ناوچەی رەواندز ، ئەمە وای لێکردن وەك پاسەوانێك و پاڵپشتێکی پتەوی رژێمە نوێیەکۆمارییەکە دەرکەون . شیوعییەکان ، هەرچەندە پاش رووداوە توندوتیژەکەی کەرکوك کە تۆباڵی خرایە ئەستۆی ئەوانەوە هەروەها قاسم بەتوندیی چالاکییەکانیانی سەرزەنشت کرد ، تووشی پاشەکشەیەکی توند هاتن . ناکۆکیی و دوورکەوتنەوە لە نێوان قاسم و شیوعییەکان دەستیپێکرد . واپێدەچوو ج ئەوان و ج کوردەکانیش شوێن و پایەی پێشتری خۆیان لە دەستدابێت . پیلانگێرانی رەگەزە عەرەبچییەکان بەو هەوڵەی لە پێناو کوشتنی قاسم دایان گەیشتە ترۆپك ، وێڕای ئەوەی بووە هۆی گێڕانەوەی پلەبەپلەی نێوانی قاسم و شیوعییەکان و وادەردەکەوت کە بە شێوەیەکی بەرچاو ئەو ساردی و ئاڵۆزییەی لابردبێت کە لە ئاکامی رۆڵی شیوعییەکان لە رووداوەکەی کەرکوکدا هاتبووە ئارا .

هەرچەندە چاوشۆڕییەکی بەرچاو بەسەر شیوعیی و کوردەکاندا هات ، هەردوولا زۆربەی جار لەمیانەی باسکردنی رووداوە نەخوازراوەکەی کەرکوکدا قامکیان بۆ رادەکێشرا ، بەڵام ناوبانگیی رێبەری بارزانیی زیانی پێنەکەوت . بارزانییەکان کەواپێدەچوو لەو کاتەدا لەو رووداوانەدا تێوەنەگلابن ، لێرە بەدواوە بە وریاییەوە هەڵوێستێکی دان بەخۆدا گرتن و خۆهەڵنەقورتانیان گرتبووەبەر .

## دەستکەوتەکانی کورد لە سایەی رژێمی نوێدا

دەستکەوتەکانی کورد لە عێراقدا بەرچاوبوو ، هەروەها کاردانەوەی ئەو بایەخە بوو کە لەلایەن رژێمی کۆماری نوێوە پێیان دەدرا . هەموو ئەو دەستکەوتانە ، کە دەتوانرێت وەبیربهێنرێتەوە ، لەنێو دەستووری کاتییدا ئاماژەی بۆکرابوو ، کە وەك هاوبەشێك لەگەڵ عەرەبدا و لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقدا و دانی پێدانابوون . ئەو گیانەی کە ببووە هێنانەکایەی دانپیانانەکە لە دانپیانانەکەی خۆی بەرچاوتر بوو . بیرۆکەی هاوبەشێتیی بە شێوەیەکی بایەخدار خۆی لە ئارمی کۆماری عێراقدا بینیەوە ، بەوەی کە خەنجەری کوردیی لەگەڵ شمشێری عەرەبییدا پێکەوە دانرابوون

دەتوانرێت پایەی کورد دەستبەجێ پاش شۆڕشەکە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو دەستکەوتانەی بەدەستیان هێنابوو لە بواری ڕۆڵیان لە حکومەتدا ، بەشیان لە پرۆژەکانی گەشەپێدان و خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان ، هەروەها ئەو ئازادییە فەرهەنگییەی پێیاندرا تاوەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ و جیا گەشەبکەن ، بە باشی بپێورێت .

## ڕۆڵی کورد لە حکومەتە نوێیەکەدا

بەهۆی زیندەبوونی بەشی کورد لە پایە گرنگەکانی حکومەت لە ڕژێمە نوێیەکەدا کە زۆر جیاواز نەبوو لەوەی پێشتر هەبوو ، هەرچەندە بەشدارییان لە ڕژێمە نوێیەکەدا بە دوو هۆ لەسەر پایەیەکی سەربەستانەتر و فراوانتر دامەزرابوو . یەکەم سیاسەتی نوێی دەوڵەت لە هەمبەر کوردان لە بنەڕەتەوە جیاوازیی لەگەڵ ڕژێمە کۆنەکەدا هەبوو ، ئەمەکەی ئێستا نەك وەك کەمینە بەڵکو وەك هاوبەشێك مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات . دووەم ئەو هەلومەرجە ناوازەیەی لە پاش شۆڕشی عێراق هاتە کایەوە قاسمی ناچار کرد هەوڵبدات پشتگیرییان بەدەست بهێنێت . ئەو ڕاستییەی بە شێوەیەکی مەزن سەنگی کوردەکانی لە عێراقدا گران کرد .

یەك لە بەراییترین و لە ڕووی سیمبوڵەوە بایەخدارترین پۆست بە کورد درا بریتیبوو لە دانانی خالید نەقشبەندیی وەك ئەندامێکی ئەنجومەنی سەروەریی ، پێویست بە گوتن ناکات ، ئەم دانانە هەر لە سەرەتای هاتنە کایەی ڕژێمە نوێیەکە دا، کوردی هێنایە پێگەیەکی یەکسان لەگەڵ دوو گروپە سەرەکییەکەی دیکەی عێراقدا ، کە عەرەبی سوننە و عەرەبی شیعەیە . دوو پۆستی وزاریی درا بە کورد . وەزارەتی پەیوەندییەکان لە لایەن حەسەن تاڵەبانیی و وەزارەتی کار و نیشتەجێکردن لە لایەن

---

[٨٦] ڕەنگی ڕەش و سپی کە دوو ڕەنگی ڕووی ئارمەکەی عێراق بوو وا لێکدراوەتەوە کە ئاماژەیە بۆ ( عەرەب و ئینگلیز ).

عەونی یوسفەوە .[٨٤] پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت ، ئەم دانانی وەزیرانە درێژەی هەمان رێچکەی پێشوو بوو چونکە لە سایەی رژێمە کۆنەکەشدا وەك باوبوو کورد یەکێ یان دووان لە پۆستە کانی کابینەیان وەردەگرت .

سەبارەت بە کاروباری دەرەوە ، عەلی حەیدەر سولەیمان کە دیپلۆماتێکی سەرکەوتووی کورد بوو بە پلەی سەفیر هێنرایەوە و وەك باڵیۆزی عێراق لە ئەمەریکا راژەی دەکرد . عیسمەت کەتانی وەك ئەندامی هەمیشەیی عێراق لە نەتەوە یەکگرتووەکان دانرا . جەلال جاف پۆستی جێگری باڵیۆزی عێراقی لە پەکین درایە . هەروەها لە بواری فەرهەنگیی و ئایینیشدا ، کوردان پۆستی گرنگیان پێبەخشرا . دکتۆر سادق ئەتروشی کە کوردێکی دهۆکیی بوو ، پۆستی بەرێوەبەری گشتیی پەروەردە و فێرکردنی گرتە ئەستۆ ، کە دووەم پۆستی گرنگە لە وەزارەتی پەروەردەدا ، عەبدولحەمید ئەتروشیی براشی موفتی بەغدا بوو کە بەرزترین پایەی شەرعیی ئایینیە لە نێو سوننییەکانی عێراقدا .[٨٥]

کورد بە باشیی لەنێو هەر سێ پێکهاتە بەهێزەکەی رژێمە نوێیەکەدا نوێنەریان هەبوو ، هێزەکانی بەرگریی میللیی (کە رێکخراوێکی چەکداریی خاوەن لق بوو لە تێکڕای وڵاتدا) ، دادگای گەل ، هەروەها کۆمسیۆنی دادگای سەربازیی کە بۆ دادگاییکردنی ئەندامانی رژێمە کۆنەکە و دوژمنانی رژێمی کۆماریی دامەزرابوو . عەقید بامەڕنیی فەرماندەی هێزەکانی بەگریی میللیی بوو ، عەقید عەبدولفەتاح شاڵیی بووە ئەندامی دادگای گەل ، هەروەها پارێزەر عەدنان بابەجان بە ئەندامی دەستەی دادوەریی گشتیی دامەزرێنرا کە هاوکاری دادوەری سەربازیی گشتیی دەکرد .

---

[٨٤] حەسەن تاڵەبانیی یەك لە ئەندامانی بنەماڵەی ناسراوی شێخەکانی تاڵەبانییە لە لیوای کەرکوك . عەونی یوسف کوردێکی خەڵکی هەولێرە و دەگوترێت خزمایەتیی لەگەڵ بارزانییان هەیە

[٨٥] عەلی حەیدەر سلێمان دەرچووی زانکۆی ئەمەریکییە لە بێروت و کوردی رەواندزە عیسمەت کەتانیی دەگوترێت پەیوەندی نزیکی خزمایەتیی لەگەڵ بارزانییاندا هەیە جەلال جاف ئەندامی بنەماڵەی فەرمانڕەوای خێڵی ناسراوی جافە . دکتۆر سدیق ئەتروشیی دەرچووی زانکۆی کلارکە و لە بنەماڵەیەکی ناسراوی دهۆکە .

## خزمەتگوزاریيە کۆمەڵایەتییەکان و گەشەسەندنی لادێ

بەگوێرەی سیاسەتی ڕاگەیەندراوی ڕژێمی نوێ ، نەخشەی پلانێکی قۆناغ بە قۆناغ بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی بە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان و چاککردنی هەلومەرجی گوزەران لە سەراسەری وڵاتدا بەڕێوە چوو و ئەوپەڕی بایەخی پێدرا . تێیدا پرۆژەی گەشەسەندنی لادێ و ڕەوتی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانی فراوان و خێراتر کرد . دەستکەوتە سەرەکییەکانی کوردستان لەو پلانانە هەر لە سەرەتاوە تا ١٤ی ژوونیەی ١٩٥٩ بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو :

نیشتەجێکردن : چەند سەد یەکەیەکی نوێی نیشتەجێبوون تەواو بوون و هێندێکی دیکەش لە سلێمانی ، سەرچنار، دەربەندیخان و هەولێر دەستپێکران .[٨٦]

کارەبا : دەزگاکانی وزەی کارەبا بۆ یەکەمجار لەو شوێنانەی ناوبراون بنیاتنران ، لە هێندێك شوێنی دی ئاسانکاریی کرا تا ئەو دەزگایانە فراوانتر بکرێن یاخود بە دەزگای نوێتر بگۆڕڕێن . زاخۆ ، ئاکرێ ، دهۆك ، پێنجوێن ، مەخموور ، قەڵادزە ، کفری ، هەڵەبجە ، ڕەواندز ، هەروەها شەقڵاوە لەم پلانە سوودمەند بوون.[٨٧]

دابینکردنی ئاو : سەرچاوەی نوێی ئاوی خواردنەوە بۆ خەڵکی ناوچە چیاییەکانی کەرکوك ، هەولێر ، سلێمانی و موسڵ دابینکرا .[٨٨]

تەندروستیی : خەستەخانەی دابینکراو بەتەواویی کەل‌وپەل و دەستەی کاری پێویستەوە خرایە بەرنامەوە و دەبوایە پێش ١٤ی ژوونیەی ١٩٥٩ لە شەقڵاوە بنیاتبنرێت .دەست بە دانانی پلانی دیاریکراو بۆ بنیاتنانی سەنتەرێکی بایەخدان بە منداڵان و دایکان لە سلێمانی و کەرکوك و هەروەها کلینکێکی پزیشکیی لە سلێمانی و نەخۆشخانەیەك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی سنگ لە موسڵ دامەزرا . پلانیش بۆ بنیاتنانی دوو خەستەخانەی چارەسەریی سیل لە هەولێر و سلێمانی دانرا .[٨٩]

---

[86] جمهورية العراق ، المجلس الاعلى للعلاقات ، ثورة ١٤ تموز ، ٢١٠-٢١٣.

[87] هەمان سەرچاوە ، ٢١٦-٢١٧

[88] هەمان سەرچاوە ،٢٤٨.

[89] هەمان سەرچاوە ،٣٠٠-٣٠١.

**نەخشەسازیی شارەکان :** شارەکانی سلێمانی ، کەرکوك ، هەروەها هەولێر لەناو ئەو شارانەدا بوون کە لە سایەی پلانێکی نوێی نەخشەسازیی شارەکان چەندین گۆڕانی بەرچاویان بەخۆیانەوە دیتبوو .[90]

**سەنتەری بوژانەوەی گوندەکان :**سەنتەرەکانی بوژانەوەی گوندەکان لە شارەکانی هەولێر ، موسڵ و کەرکوك لە پیناو هەلومەرجی ژیان لە لادێکاندا بنیاتنرا .[91]

**پیشەسازیی رستن و چنین :** کار بۆ بنیاتنانی کارگەی رستن و چنین لە ناوچەی شارەزوور لە سلێمانی ، هەروەها یەکەی گرتنەخۆی کرێکارانی ئەم کارگانە کران .[92]

ئەم سوود و قازانجانە لە سایەی رژێمی نوێدا درایە کورد یان بەڵێنی کردنیان درا . پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت کە بەشێکی ئەم پرۆژە و چاکسازییانە لە سایەی رژێمە کۆنەکەدا دەستپێکرابوو .

## هاندانی چالاکییە کەلتوورییەکانی کورد

**ئازادیی کەلتووری:** لەنێو تێکڕای ئەو دەستکەوتانەدا کە کورد لە سایەی رژێمی نوێدا بەدەستیهێنابوو ، ئەوانەی لە بواری فەرهەنگییدا هاتنەدی زۆر بایەخدار و جێگەی خۆشحاڵیی توێژی خوێندەوارانی کورد بووە ، لە راستییدا دەستکەوتەکانی ئەم بوارە سەرئەنجام و بەرهەمێکی ئەو دەستکەوتانەیان بوو کە لە بواری رامیارییدا بەدەستیان هێنابوو . هەروەك عەرەبە "هاوبەشەکانیان" ئەوان ئەمێستا ئازادن وەك نەتەوەیەکی جیا و یەکسان کەلتوورەکەیان پەرەپێبدەن .

کورد لە سایەی رژێمی پاشایەتییدا ئازادیی فەرهەنگییان هەبوو ، هەروەها ئازادبوون تا ئەو شوێنەی سنوورە قەدەغەکان نەبەزێنن، کەلتووری خۆیان بەکاربێنن . هەرچەندە لەو چوارچێوەیەدا کە فەرهەنگ و رامیاریی تێکەڵ بەیەك و ئاوێتە دەبن

---

[90] هەمان سەرچاوە .٣٣٠

[91] هەمان سەرچاوە .٣٣٩

[92] هەمان سەرچاوە .٣٥٥

و هێڵە جیاکەرەوەکان بو ئاشکرا نین ، مەسەلەکە جێگەی گومان دەبێت و هەر شتێك لە پشت ئەو چوارچێوەیە ناوچەیەکی قەدەغەکراوە و ڕێگەی بەزاندنی پێنادرێت . هەموو ئەوانە پاش شۆڕش گۆڕان ، ئاستی ئەو ئازادییە درایە کورد بەشێوەیەکی بەرچاو مەزنتر بوو ، ئەوان دەیانتوانی بەشێوەیەك کار بۆ ڕاژەکردنی کەلتوور و فەرهەنگە نەتەوایەتییەکانیان بکەن کە پێشتر هەرگیز بە خۆیانەوە نەدیتبوو . بەڵام نەك بە گیانێکی دوژمنکارانە و نیازخراپانە .

**فێرکردن :** لەو وڵاتانەی کاری فێرکردن و ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بەو بوارە هەیە ئەرکی دەوڵەتە ، دەستپێشکەری حکومەت پێویستییەکی بنەڕەتییە ، نەك تەنیا لەبەر ئەوەی کە تەنیا ڕێگەیەکە بۆ ڕاپەڕاندن و ئەنجامدانی تێکڕای شتەکان ، وەك وەڵامدانەوەیەك بە خواستی کوردان ، ڕژێمی نوێ بەڕێوەبەرایەتییەکی گشتیی نوێی بۆ فێرکردنی کوردیی لە وەزارەتی فێرکردن کردەوە و ئەرکی وەڵامدانەوەی پێویستییەکانی کوردی لە بواری فێرکردندا خستەئەستۆ .[93] وەك پێشتر ئاماژەی پێدرا ، کوردێکیان کردە بەڕێوەبەری گشتیی .[94] بەڵگەیەکی دی بۆ بایەخدانی پتری فەرمیی بە کەلتووری کورد بریتیبوو لە دامەزراندنی شاعیری بەناوبانگی کورد موسا حەسەن ، کە زیاتر بەنازناوی (جگەرخوێن)[95] بەناوبانگە ، وەك پرۆفیسۆری ئەدەبی کوردیی لە زانکۆی بەغدا .[96]

**ئێزگەی ڕادیۆی کوردیی :** پەرەسەندنێکی گرنگی دیکە لە بواری فەرهەنگییدا بریتیبوو لە زێدەکردنی ئەو کاتەی بۆ بەرنامەی کوردیی لە ڕادیۆی بەغدا تەرخانکرابوو ، لە دوو بۆ چوار سات . ئەو کاتە زێدەیەی بۆ پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی نوێ بوو بە زاری بادینیی .[97] ئەم پەرەسەندنە لەبەر چەند هۆیەك بەرچاو و بایەخدار بوو . زاری سلێمانی لە زمانی کوردییدا کە خوێندەواری

---

[93] هەمان سەرچاوە ، ٢٧٠-٢٧١.

[94] لەم بارەیەوە ئەو چاوپێکەوتنە سەرنجڕاکێشە لەگەڵ دکتۆر سدیق ئەتروشیی لە گۆڤاری ( التقدم ) ی بەغدادی لە ٣٠ ئۆکتۆبەری ١٩٥٩ دا ببینە .

[95] جگەرخوێن ڕابەری شاعیرانی کوردی سوریایە

[96] هەمان سەرچاوە

[97] جمهورية العراق ، المجلس الاعلى للعلاقات ، ثورة ١٤ تموز ، ٢٥٧

هەڵکەوتووی تێدا هەڵکەوتبوو ، تا ئەو دەمە تەنیا زاری دانپیانراوی فەرمیی کوردیی بوو لە عێراقدا و وەك شێوازێکی دانپیانراوی دەربڕین لە سەراسەری کوردستانی عێراقدا بەکار دەهێنرا . ئەم زارە بەشێوەیەکی بنەڕەتیی دەگەڕێتەوە سەر زاری موکریی کوردیی ، کە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن ئەو کوردانەی ئێرانەوە بەکاردەهێنرێت کە بەشێوەزاری موکریی قسان دەکەن .[98] لە راستییدا باڵادەستیی شێوەزاری سلێمانی ئەوەندە بە فراوانی دانی پێدانرابوو کە ئێزگە کوردییەکەی رادیۆی یەکێتی شورەویی بەرنامەکانی بەو زارە پێشکەش دەکرد.[99]

دانپێدانانی شێوەزاری بادینیی لەسایەی کاریگەریی پلەوپایەی مەلامستەفادا بەڵگەیەکە بۆ گۆڕینی سەرکردایەتیی کورد لە عێراقدا لە ناوچەی سلێمانییەوە کە ناوەندی شێخەکانی بەرزنجەیە ، بۆ ناوچەی موسڵ ، لانەی شێخانی بارزان . هەرچەندە ئەم هەنگاوە پاساوی خۆشی هەیە . بێگومان وەك دەربڕینێك بۆ تایبەتمەندیی و هەرێمگەرایی کورد ، دەگونجێت وەك بەڵگەیەکیش بێت بۆ نارەزووی کوردانی بادینیی کە لەژێر هەژموونی سلێمانی بێنەدەر ، کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە عێراقدا ناوەندی فەرهەنگیی دانپێدانراوی کوردیی بوو .

رامان لەو ئەگەرە هەمەجۆرانەی دەبنە دەرئەنجامی پێشکەشکردنی بەرنامەی رادیۆیی بە زاری بادینیی ، جیگەی سەرنجە . پێدانی زاری بادینیی و یەکسانکردنی هەمان پایەی لەگەڵ زاری سلێمانیدا دەکاتە ئەوەی کە بادینیی بۆ کوردانی عێراق بێت و سلێمانیش بۆ باشووری کوردستانی عێراق بمێنێتەوە .ئەم جیاوازییە کە دەبێتە ئاستەنگێك لە بەردەم پەرەسەندنی نەتەوایەتیی کورددا ، کە لە رابردوودا زۆر بەدەست نەبوونی زمانی یەکگرتووەوە ناڵاندوویەتی .

زاری سلێمانی لە زمانی کوردییدا وەك زارێکی دەربڕینی خوێندەواریی لە

---

[98] ئیدمۆندس لەم بارەیەوە دەڵێت : " هەرچەندە موکریی شێوازیی کۆنی ئاخاوتنی کوردی باشوور هێشتا پێگە و پایەی خۆی پاراستووە . ئەوە ئیدیۆمی نەرم و ناسکی سلێمانییە کە ئەمێستا نەك هەر تەنیا لە عێراقدا ئاکە ئامرازی دەربڕین و دەقی ویژەییە . بەڵکو لەبەری مەرزی ئێرانیشەوە هەروایە

Edmonds," Kurds ,Turks and Arabs ,11.Cf.Edmonds, "A Bibliography ,1937-1944.",187. and Edmonds, "A Bibliography , 1920-1936.",487-97 .

[99] The Scotsman, Jan. 9.1951.

زۆربەی بەشەکانی کوردستانی ئێران و عێراقدا پەیڕەو کراوە ، هەربۆیە دەرفەتی بەکارهێنانی ئەو شێوەزارە وەك زمانی سەراسەریی و هاوبەش لە کوردستاندا مەسەلەیەکی مژدەبەخش بوو . ویڕای ئەوەی بێگومان دامەزراندنی دوو شێوەزاری کوردیی جیاواز و هاوپلە لە عێراقدا راژە بە دروستکردنی ئاستەنگ لەبەر دەم فێربوونی جەماوەری نەخوێندەواری کورد لە وڵاتدا دەکات . پرۆسەی بەکارهێنانی جووت شێوەزاریی پێویستی بە ئەرکی پەرەسەندنی دوو شێوەزارە جیاوازەکەوە هەبوو تا ببێتە ئامرازێکی کاریگەریی خوێندەواریی و زانستیی ، ئەوەش لە دەرئەنجامدا دەبووە هۆی ئەوەی کات و توانایەکی زۆری تێدا بە فیڕۆ بڕوات .

پێشکەشکردنی بەرنامەی رادیۆیی لە ئێزگەی بەغداوە بە شێوەزاری بادینیی ، لەدەرەوەی عێراقدا دەنگدانەوەی خۆی هەبوو . کوردی تورکیا کە دەکەونە باکووری سنووری عێراقەوە ، هەروەها کوردی سوریا لە هەرێمی جەزیرە کە دەکەونە رۆژئاواوە ، بەشێوەزارێك دەدوێن کە تەواو لە بادینیی باکووری عێراقەوە نزیکە . ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە کوردی بۆتان و هەکاریی ، کە دوو هەرێمی کوردیین لە تورکیا ، هەروەها کوردی هەرێمی جەزیرە لە سوریا ، بەرنامە بڵاوکراوەکانی رادیۆی بەغدایان پێدەگات . هەرچەندە کوردی ئێران دەیانتوانی تەنیا بە شێوەزاری سلێمانی گوێ لەو ئێزگەیە بگرن .

## هەڵوێستی کورد لەحاست رژێمی قاسم

کورد بۆ رژێمی نوێی عێراق دەمارگیربوون و وادەردەکەوت بەو رژێمە زۆر وەفاداربوون . ئەو ماف و دەستکەوتانەی هەر لە سەرەتاوە بەدەستهێنرابوو لە سەرووی هەموو چاوەڕوانیی و پێشبینییەکانیانەوە بوو . لەبەر ئەم هۆیە ، زۆر دڵسۆزانە و راستگۆیانە لەگەڵ ئەو رژێمە مامەڵەیان دەکرد و کۆمارەکەی عێراقیان بە " کۆماری کورد و عەرەب " ناودەبرد . کورد هێندە رژێمە نوێیەکەی عێراقیان بە موڵکی خۆیان دەزانی کە یەك لە نووسەرەکان بە توندیی رەخنەی لە عەبدولحەمید سەراجی مەزنە پیاوی سوریا گرت کە دەگوترا لە بنەچەوە کوردە ، سەبارەت بە بەردەوامیی هاوکاریی لەگەڵ میسری عەبدولناسردا . ئەو نووسەرە عەبدولحەمیدی

بە خیانەتکار لە رەگەزە کوردییەکەی خۆی ناوبرد . کوردان لە سەراسەری کوردستاندا دەستیان بە پشتگیریی و لایەنگریی لە رژێمی نوێی عێراق و هەروەها عەبدولکەرم قاسمی سەرکردەکەی کرد ، ئەوەی بە "سەرۆکی عەرەب و کورد" نێودەبرا .

جێگەی سەرنجە ، ئەو پیلانەی دژی ژیانی قاسم ئەنجامدرا بووە هۆی کاردانەوەیەکی سۆزهەژێن و بێزاریی دەربڕین ، نەک تەنیا لە تەواوی کوردستانی عێراقدا ، بەڵکو تەنانەت لە لایەن کوردی وڵاتانی دەوروبەریشەوە.[100] یەک لەو نامانەی کە لە رێگەی "خەباتگێری ناسراو مستەفا بارزانیی" وە گەیشتبوو ، "تێکۆشەرانی کوردی کوردستانی بە ئێران بەستراو" ناردبوویان .[101]

دەستەواژەی "کوردستانی بە ئێرانەوە بەستراو" ببووە گوتەیەکی باو و بەردەوام لەلایەن کۆمۆنیستە عێراقییەکان و هەروەها رۆژنامە کوردییەکانی عێراق دووپاتەکرایەوە . بایەخ و مژەی ئەم دەستەواژەیە ئاشکرا نیە . ئایا تەنیا کلێشەیەکی دیکە بوو کە کە بەشێوەیەکی کاتیی ببووە باو ، یاخود ئامادەکارییەکی عێراق بوو تا رۆڵی ئەوە بگێرێت ماف داواکاریی لە خاکی دراوسێدا هەبێت ؟ ئەم ئاماژەکردنە بە دەستەواژەیەکی رزگاریی و یەکگرتنەوەخوازیی بەو شێوەیە بۆ کوردستانی ئێران زیاتر مەتەڵێکە .[102]

---

[100] – لەنێو ئەو نامانەی گەیشتبوون ، نامەی شێخ ئەحمەدی بارزان ( التقدم ، ۹ اکتوبر ۱۰۵۹ ) و هەروەها نامەی شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود ( خەبات ، ژمارە ٤ ، ۱۹٥۹ ) . هەردوو نامەکە بە شێوە زمانێک نووسرابوو کە چەکی کۆمۆنیستانەی زۆر تێدا بەکارهاتبوو .

[101] هەمان سەرچاوە .

[102] لەراستییدا پاش شۆڕشی ۱۹٥۸ و رووخاندنی رژێمی پاشایەتیی رۆژئاوالگەرای ئینگلیزخوای هاشمیی لە عێراق و کشانەوەی رژێمی کۆماریی لە پەیمانی بەغدا و توندوتیژبوونی جوڵانەوەی دژی ئیمپریالیزمیی لەناوچەکە . ئێران ترسێکی گەورەی لێ نیشت و کەوتەخۆ بۆ رێگرتن لە پریشکی شۆڕشەکەی عێراق و پیلانگێران دژی رژێمی کۆماریی . ئالەم قۆناغە هەستیارەدا کۆمەڵێک لاوانی کوردی رۆژهەڵات و هەڵاتوولە پەلاماری دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێمی شاهەنشاهیی پەهلەوی روویان لە عێراقی کۆماریی کردو تێکەڵ بە شەپۆلی هەڵچووی نەتەوایەتیی کوردیی بوون و لە شارەکانی سلێمانی و ناوچەی سنوورییەکان نیشتەجێ بوون ئەم لاوانە بە رێبەری (عەبدوڵلای ئیسحاقی' ئەحمەد تۆفیق) حیزبی دیموکراتی کوردستانیان ژیاندەوە و بەگوڕێکی نەتەوەیی

کوردستانیی شۆڕشگێڕانەوە کەوتنە تێکۆشان و تۆزی تودەگەرایی و ئێرانچێتیان لەخۆیان تەکاند و پێیان وابوو بە سەرکەوتنی شۆڕشی عێراق باشترین دەرفەت هاتۆتە پێشەوە بۆ خەباتی نەتەوەیی سەرتاسەریی .تێکڕای ئەو نامە و بەیاننامانە و گوتارانەی لەم سەردەمەدا بۆ گۆڤار و رۆژنامە جیاوازەکاندا نێردراون بۆ پشتگیریی لە شۆڕشی عێراق و ریسواکردنی رژێمی شاهەنشاهیی و ئاشکراکردنی پیلانەکانی لە ناوچەکە، رۆژهەڵاتی کوردستانیان بە (کوردستانی بە زۆر بە ئێرانەوە بەستراو) ناوهێناوە لەو باوەڕەوە کە کوردستانی رۆژهەڵات لە لایەن دەوڵەتی ئێرانی شاهەنشاهییەوە داگیرکراوە و کاتی ئەوە هاتووە بە سەرخستنی شۆڕشەکەی عێراق زەمینە بۆ ئامادەکردنی شۆڕشێك لە ئێران و رۆژهەڵاتی کوردستاندا بڕەخسێت لە پێناو رزگارکردنی ئەو بەشەی کوردستان و یەکخستنەوەی لە گەڵ بەشەکانی تردا و بەرەو سەربەخۆیی .هەر ئەم رەوتەش وایکرد پاشتر ئەم رێبەرایەتییە لاوە شۆڕشگێڕە ببێتە بەهێزترین پایەکانی ئەو جوڵانەوە چەکدارییەی پاشتر بە شۆڕشی ئەیلول ناوی دەرکرد /سەردەشتیی بۆ زیاتر خوێندنەوەی ئەم قۆناغە بە ئەنقەست سڕراوەیەی تێکۆشانی حیزبی دیموکراتی کوردستان و رێبەرایەتییە شۆڕشگێڕەکەی بڕوانە :

د.یاسین سەردەشتیی ، ژیان و تێکۆشانی سیاسیی ئەحمەد تۆفیق (عەبدوڵڵا ئیسحاقی) ، سلێمانی ، ٢٠٠٧

## دەرئەنجام

لەمێـژەوە لـەنێو کـورددا هەسـتێکی بـەهێزی نەتـەوەیی هەیـە ، هەرچـەندە ڕەسـەنێکی تێکـەڵی هەیـە ، بـەڵام کـورد ئـەو نەتەوەیـە پێکـدەهێنێت کـە بەدرێـژایی قۆناغـەکانی مێـژوو چـالاکیی خـۆی سـەلماندووە . ئـەوان توانیویانـە لەهەمبـەر گـەلانی لـەخۆیان زێـدەتر و پەرەسـەندووتر وەك :عـەرەب ، تـورك و فـارس ڕابوەسـتن ، وێـڕای نزیکییان لە گەلی فارسەوە ، توانیویانە جەخت لە ناسنامەی جیا و سەربەخۆی خۆیان بکەنەوە . چالاکیی و زیندوویيان لەوەدا دەردەکەوێت کە توانیویانە بەرەو هەرێمە غەیرە کوردییەکان بکشێن و گەلانی هاوسێشیان بکوردێنن .

هەرچەندە شێوەزارێك یا زمانێکی قسەکردنی هاوبەش لای کورد نیە ، کەچی قسەکەری هەریەك لەو شێوەزارانە خۆی بە کورد دەزانێت و هەریەکە و کوردبوونی ئەوی دیکـەی لا پەسـەندە . وێـڕای ئـەوەی لـە نێـو کـوردا :شـیعەی دوازدەئیمـامیی ، عەلـەویی(قزڵباش) ، ئـەهلی حـەق ، کاکـەیی و هـەروەها ئێزیـدیی هـەن ، بەڵام زۆربـەیان موسوڵمانی سوننی مەزهەبن .

لـە ڕووی زمانـەوە دەتوانرێـت کـورد بەسـەر دوو دەسـتەی سـەرەکیدا دابـەش بکرێت ، گەورەترینیان و بەرفراوانترینیان ئەوانەن کە بەشێوەزاری کرمانجیی یان هەر زارێکی دیکە کە سەر بە کرمانجییە قسان دەکەن . ئەوانە جگە لە کەمینەیەکیان نەبێت (کە ئێزدییەکانن) ، سوننی شافعیین ، کوردبوونی ئەوانە گومانی تێدانیە . دەستەی دووەم ئەوانەن کە بە شێوەزاریی دیلمیی دەئاخڤن ، لەنێو ئەوانەدا کوردی دەرسیم هەن کە بە ئێوەی زازا دەپەیڤن و لایەنگری بنەما پەرگرییەکانی شیعەگەرایەتین ، هەروەها ئەو گروپەی لە عێراق و ئێران بە شێوەی گۆرانیی قسان دەکەن وەك: عەشیرەتی گۆران ، باجەلان و کاکەییەکان ، کە تێکڕایان سەر بە بنەما ئاینییەکانی ئەهلی حەقن ، هەروەها دانیشتووانی چیاکانی ناوچەی هەورامان کە سوننەن . وێڕای جیاوازیی دوا گروپ لە ڕووی زمان و ئاینەوە لەو گروپەی بە کرمانجیی دەپەیڤن ، بەڵام بۆخۆیان بڕوایان بە کوردبوونی خۆیان هەیە ، هەروەها کرمانجییەکانی هاوسێشیان دژ بەم بڕوایە نین و لایان پەسەندە .

وێـڕای پێکهاتـەی لێکنەچـوو و ناهەماهـەنگی کـوردان ، کـە لەهێنـدێك بـاردا ترادسیۆنی هەمەرەنگی خێڵەکان گەواهی ئەو ڕاستییەن ، ئەوان بڕوایان وایە کە ئەوەی

یەك وەجاخن . هێندێك لە كۆڵەرە ئەورووپییەكان باس لەوە دەكەن گوایە میدییەكان باووباپیرانی كورد پێكدەهێنن ، ئەم بۆچوونەی بە شێوەیەكی بەرفراوان لە لایەن نووسەرانی كوردەوە پشتگیریی لێدەكرێت .گەرچی دەگونجێت ئەم بڕوایە لەگەڵ راستییەكاندا یەك نەگرێتەوە (پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت كە سەلماندنی ئەو گریمانە زۆر ئەستەمە) ، بەڵام ئەو بیرۆكەیە بەگشتیی لەلایەن ئەندامانی ئەو گەلەوە جێگای بڕوایە ، لەم بارەیەوە ، ئەم حاڵەتە بە یەك لە بەرزترین نۆرمە پەرەسەندووەكانی نەتەوەخوازیی جیهان هاوتەریبە . ئەو راستییەی كە پرۆسییەكان وێڕای بوونی چەند رەگەزێكی غەیرە ئەڵمانیی ، رێی ئەوەیان لێنەبەسترا رۆڵێكی پێشڕەو لە دامەزراندنی دەوڵەتێكی ئەڵەمانییدا ببینن.

شایەنی سەرنجە كە بنەماڵە جۆربەجۆرەكانی كورد خۆیان بەنەوەی عەرەب لەقەڵەمداوە و فرە شانازیشییان بە شەجەرەی عەرەبزادەبوونی خۆیانەوە كردووە ، ئەو راستییەی بێگومان لەو رێز و پێگەیەوە هاتووە كە لە نێو كورددا بۆ عەرەبزادەكانیان داناوە . هەرچەندە ، تەنانەت ئەوانەش خۆیان بە عەرەبزادە داناوە ، جگە لە كورد خۆیان بەشتێكی دیكە دانەناوە . شێخ مەحموود كە ئیدیعای عەرەبزادەیی بنەماڵەكەیانی دەكرد و خۆی بەنەوەی پەیامبەر دەزانی كە لەلایەن چەند شەجەرەناسێكی ناسراوەوە دانپێدانرابوو ، لە یاداشتێكییدا بۆ نەتەوەیەكگرتووەكان دژی ئەوە وەستاوەتەوە بخرێتە ژێر سایەی حكومەتێكی عەرەبییەوە .

لەنێو ئەو رەگەزە جۆربەجۆرانەی نەتەوایەتیی كوردیی پێكدێنن ، لەوانەیە گرنگترینیان رێكخستنی كۆمەڵایەتیی و ئابووریی بێت ، هەرچەندە چەند رەسەنێكی جۆراوجۆر بەشداریی لە پێكهاتنی گەلی كورددا دەكات ، هەروەها هەرچەندە بە پلەی جۆراوجۆر جیاوازیی لە زمان و شێوەزاردا لە نێو دەستە و گرووپە جۆراوجۆرەكاندا هەیە ، شێوازێكی تایبەتی رێكخستنی كۆمەڵایەتیی و ئابوورییە ، ئەوەی ئەو پێناسەیە دەگرێتە خۆ كە بە (كەلتووری چیا) ناودەبرێت ، بۆ هەمووان ئاشكرا و ناسراوە . ئەو كەلتوورە چیاییە تایبەتە زادەی هێزگەلێكی ژینگەیی ، جوگرافیی و مێژوویییە و پێكەوە كۆبۆتەوە تا پێكهاتەی گشتیی ژیانی كورد و داب‌ونەرگاكانی پێكبهێنێت . بەگشتیی ، لە هەرشوێنێك ئەم كەلتوورە چیاییە لەگۆڕێدا بێت ، هاوجووت لەگەڵ كرمانجیی ، دیملیی ، یاخود بەپێی هێندێك بنەما ، لەكی لوڕیی لە زمانی گرووپە ئێرانییەكاندا ،

خەڵکەکەی بە کورد و خاکەکەی بە کوردستان لەقەڵەم دەدرێت . ئەم رەگەزانە پێدەچێت کە دوو پێکهاتەی جیاوازی نەتەوایەتیی کوردیی پێکبهێنن .

وادەردەکەوێت چەندین ساڵ بەر لەوەی نەتەوایەتیی کوردیی ببێتە واقعێك ، کوردان لە ناسنامەی جیای نەتەوایەتیی خۆیان بەئاگابوون . هەستی هەماهەنگیی و خزمایەتییان کاتێك دەردەکەوێت کە پەیوەندیی لەگەڵ غەیرەکوردێکدا دەکەن . دەرکەوتەی سەیری خولیای نەتەوەیی کورد لەنێو ئەو دەستە و تاقمە کوردییە لادەرانەدا دەردەکەوێت کە لەنێویاندا پابەندبوون بە ئیسلامەوە بە شێوەیەکی مەزن لاوازە . ئێزدییەکان پابەندی ئەو ئایینەن کە پێدەچێت پەیوەندییەکی بە رابردووی دووری کوردەوە هەبێت . ئەوان لە یەکێك لە پاڕانەوە و نوێژەکانیاندا داوا لە خوداوەند دەکەن و دەڵێن:" ئەی خودێ ، تۆ خۆت تەخت و تاجی کوردان بەرەو بەهەشتەکان بڵند بکە ". جێگای سەنجە ئێزدییەکان بروایان وایە خودا بە کوردیی قسان دەکات ، هەروەها دەستەیەکی لادەری دیکە کە ئەهلی حەقن ، شانۆ و دیمەنی رۆژی حەشر لە دەشتی شارەزووری باشووری کوردستان دادەنێن .

کوردان سەبارەت بە نەتەوایەتیی خۆیان بەئاگابوون هەروەك سەدەی دوازدەهەم دەبێتە گەواهییەك لەو هەنگاوەی سەلاحەدین بۆ وەزارەت هەڵدەبژێردرێت . ئەو هەزرەش بە مەلا ئیدریس نامۆ نەبوو ، ئەوەی راوێژکاری سوڵتان سەلیم یاوز بوو ، لەسەردەمی هێز و دەسەڵاتی تورکدا رایەڵەیەکی هاوبەشی تورکیی-کوردیی پێکهێنا و وەك ئامرازێك خستیە راژەی پاراستنی دەسەڵاتە نۆتۆنۆمەکانی کوردەوە .

هەر ئەو هەزرە بوو محەمەدپاشای رەواندزی هاندا کە لەپێناو دەستبەسەرداگرتنی هەرێمە کوردییەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی بیر لە رێکەوتن و هەماهەنگیی لەگەڵ ئیبراهیم پاشای میسر بکاتەوە ، هەروەها هەمان هاندەر میربەدرخانی والێکرد سەربەخۆیی خۆی رابگەیەنێت و دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو کۆنفدراسیۆنە مەزنە کوردییەدا بچەسپێنێت کە خۆی پێکیهێنابوو .بێگومان ئەو هاندەرە نەتەوایەتییە بوو لەپشت جوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵلاوە ، هەروەها شێخ لەژێر کاریگەریی و هاندانی هەستی نەتەوایەتییەوە بوو کاتێك لە نامەیەکیدا بۆ بەرچاوی نوێنەرانی حکومەتی بەریتانیی رایگەیاندبوو " ئێمەی کورد گەلێکی جیاوازین. "

لەماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا ، رابوونی نەتەوەیی کوردیی لەگەڵ هەر

راپەڕینێکی کوردیی هەنووکەییدا بەشێوەیەکی خێرا گەشەی دەکرد. هەرچەندە لەو کاتەدا بە رووکەش وەك نەتەوایەتییەکی هاوچەرخ دەردەکەوت ، بەلام ناگایی نەتەوایەتیی کوردیی ، لەراستییدا تا دواچارەکی سەدەی نۆزدە نەگەیشتە ئەو قۆناغەی راشکاوانە خۆی پیشاندا، بەتایبەت پاش جولانەوەکەی شێخ عوبەیدوللا. ئەم جولانەوەیە هاوکاتبوو لە چەندین پەرەسەندن و رووداوی دیکە لە ناوەوە و دەرەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی ، کە دەرکەوتن و گەشەکردنی بنەماکانی نەتەوایەتیی لەنێو کورددا خێراتر کرد . بەمەش هەستی نەتەوایەتیی کوردیی توانای هاندەری نوێی دەستکەوت و بووە هێزێکی رامیاریی کە بایەخێکی مەزنی لە کاروباری رۆژهەلاتی ناوەراستدا هەبێت .

بلاوبوونەوەی بنەماکانی نەتەوایەتیی لەنێو کورددا زادەی بەشداریی چالاکیی روناکبیرانی کوردە لە چالاکییە نەتەوایەتییەکاندا و لە چوارچێوەیەکی بەرفراوانی ئەو هەنگاو و کاردانەوانەی لەهەمبەر نەتەوایەتیی ئەرمەن ، تورك ، عەرەب و فارسەکاندا هاتەئارا. سەرهەلدانی بلاوکراوە نەتەوایەتییە کوردییەکان و دامەزراندنی یانە و کۆمەلە کوردییەکان ، تەوژمێکی بەهێزی بە چالاکییە کەلتووریی و رامیارییەکان بەخشیی . وێرای رەمەکیی بوون و نەبوونی هەماهەنگیی رێکوپێك لە سەرەتادا ، بەلام ئەم هەول و تێکۆشانە بناغەی پەرەسەندنی نەتەوایەتییان بەرەو بزاڤێکی ئایندەیی جەماوەریی دارشت .

جەنگی یەکەمی جیهانیی و ئەو ماوەیەی پاشی ، قۆناغێکی گرنگیان لە گەشەی نەتەوایەتیی کوردیی هێنایە کایەوە . رادە و توندبوونی هەستی نەتەوایەتیی لەنێو کورددا بەشێوەیەکی قوول لەرێی چەند پەرەسەندنێکی بایەخدارەوە کاری تێکرا وەك: رووخاندنی سزاریی و هەلگیرساندنی شۆرشی رووسیی ، تێکشکاندن و هەلوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیی ، رووسیی و هەروەها نەمسا-مەجەر ، کەوتنی بنەمالەی فەرمانرەوای عوسمانیی هەلوەشاندنەوەی خەلافەت ، شانبەشانی هێزی شۆرشگێریی کە زادەی ئەم رووداوانە بوون ، هەروەها پرۆپاگەندەی بنەماکانی ویلسن سەبارەت خۆبریاردانی چارەنووس .

واندەرنەکەوت کە عەرەب لە حیجاز و لە سوریا ، باش بەرەو بەدیهێنانی خولیا و ئومێدە نەتەوایەتییەکانیان دەچوونە پێش . تەنانەت ئەرمەنییەکانیش لەبارودۆخێکی

وادا دەردەکەوتن کە خەریکن دەوڵەتی نەتەوایەتیی تایبەت بەخۆیان چنگ کەوێت . ئەم دەستکەوتانەی رەعییەتەکانی پێشووی دەوڵەتی عوسمانیی ، هاوکات لەگەڵ بۆشایی و نەبوونی دەسەلات کە لە کوردستانی تورکیا ، ئێران و عێراقدا راستەوخۆ پاش جەنگ هاتبووەئارا ، هەموو ئەمانە هیوایان بە کورددا و خولیا و ئومێدە نەتەوایەتییەکانی کوردیان توندتر کرد .خولیا و خواستی نەتەوایەتیی کورد کە لە رێکەوتننامەی سیڤەردا دانی پێدانرا و بەدینەهێنرا ، پاش سێ‌ساڵ دواتر لە کۆنفرانسی لۆزاندا گورزێکی توندی بەرکەوت .

کورد کە ئیدی لە حاڵەتێکی نائومێدیی و بێزارییدا بوون ، لە ئاکامی ئەو فشار و کاریگەرییەی شارستانییەتی رۆژئاوایی کە لە ساڵەکانی پاش جەنگدا هەڵیکوتایە سەریان ، بێزارتر و سەرکەشتر دەرکەوتن ، ئەو پەرەسەندنەی وایلێکردن هەست بە هەڕەشەی بەرتەسککردنەوەی شێوەی ژیانیان بکەن . جەماوەری کورد بە هاندانی سەرکردەکانیان کەوتنە ئەوەی لەحاست ئەو کاریگەریی و هەڵکوتانەسەرەدا بەرهەڵستیی بنوێنن . راپەرینە جۆربەجۆرەکانی لە تورکیا ، عێراق و ئێراندا ، شانبەشانی دەرکەوتنی توندی هەستی نەتەوایەتیی کوردیی ، هەڵچوونێکی بەرگرییکارانەبوو لە پێناو هێشتنەوەی شێوە ژیانی کوردانە . کشانی دەسەلاتی حکومەتی ناوەندیی لەدەرەوە بەرەو خاکی کوردستان ، شانبەشانی پرۆسەی ئابووریی و تەکنەلۆجیی شارستانییەتی هاوچەرخ کە بە کورد ئامۆ بوو ، بەرگریی و بەرهەڵستیی کوردانی هەژاند و نەتەوایەتیی کوردیی توندوتیژتر کرد .

شەڕەنگێزیی نەتەوایەتیی تازەخەمڵیوی تورکیی ، فارسیی و عەرەبیی ، بووە هۆی سەرچاوەی دەرکەوتنی ئەمامەتیی و بێزارییەکی نوێ ، کە شانبەشانی سووکایەتیی و بریندارکردنی نەتەوایەتیی کوردیی ، هەڕەشەی ئەمانیشیان لە پێناسەی نەتەوایەتیی کوردیی دەکرد . لە ساڵی ١٩٥٢ دا پرۆفیسۆر (ولیەم تۆماس) سەبارەت بە هەوڵەکانی تورکیا لەپێناو سڕینەوەی نەتەوایەتیی کورد و تواندنەوەیان دەڵێت:

" بەلام ئێران هەمان سەرکەوتنی لە بواری سڕینەوەی نەتەوایەتیی کورددا بەدەست نەهێناوە ، هەروەها عێراق رێژەیەك لە مافی چارەنووسی پێبەخشیوون . بەتەواویی ئاشکرایە کە رابەرانی تورکیا و ئێران لەبیریان کردووە ، یاخود بەشێوەیەکی گونجاو پرسەکەیان لەبەرچاونەگرتووە . لەوانەیە وانەی دابەشکردنی پۆڵەندا ، کە

یەکەمجار کێشەی نەتەوایەتیی تێیدا سەریهەڵدا ، نەک وێڕای ئەوەی لە ڕێگای بنەما و پاساوهێنانەوەی بوونی خۆیان بوو."[1]

لەماوەی نێوان دوو جەنگە جیهانییەکە ، کوردان چەند ڕاپەڕینێکی مەترسیدار و خویناوییان لە تورکیا ، عێراق و هەروەها ئێراندا بەرپاکرد . وێڕای ئەوەی هێندێک لەم ڕاپەڕینانە باش ڕێکخراوبوون و ئامانجی ڕامیارییان تەواو روون بوو ، بەڵام هێندێکی دیکەیان تەنیا نارەزایەتییەکی توندوتیژانە دژی ستەمێکی ڕاستەقینە یان وێناکراو بوو . هۆکارەکانیان هەرچییەک بن ، واپێدەچوو لەگەڵ هەر ڕاپەڕینێکی نوێ پیاڵەی سەرلێوی کوردانی تاڵتر و لێوانتر دەکرد. هێشتا ، سەیرتر لەوەی دەردەکەوت ، کوردان هەوڵ و تێکۆشانێکی یەکگرتوو و هەماهەنگییان نەبوو . زۆربەی ڕێبەرانی کورد ، لەکاتێکدا باسی نەتەوایەتیی کوردیان دەکرد ، کەچی بەردەوام سەرقاڵی کار و بەرژەوەندییە خۆجێی و ناوچەییەکانیان بوون . پێویست بە گوتن ناکات ، ناوچەگەرێتیی دژی پێکهێنانی ڕێکخراوێک بوو بۆ تێکڕای کورد و بووە هۆی ئەوەی هەماهەنگیی و پێکەوە گرێدانی تێکۆشانی کورد کارێکی فرە ئەستەم بێت .

ڕاپەڕینەکانی کورد بەردەوام بوو ، وێڕای ئەو ڕاستییەی کە پێویست بوو بۆ کوردان ڕۆشن بێت سەبارەت ئەوەی بێ هاوکاریی و یارمەتیی دەرکیی ناتوانن بەسەر دوژمنەکانیاندا زاڵبن . هەر بۆیە تەنیا دەرفەتیان بۆ سەرکەوتن یارمەتیی دەرەوە بوو ، تەنیا هیواشیان بۆ بەدەستهێنانی یارمەتییەکی بەو چەشنە بەریتانیای مەزن و فەرەنسا بوو ، ئەو هیوایەی هەرگیز نەهاتەدی ، بەڵام هەردووک هێز هەوڵیاندا کار بۆ بەدەستهێنانی دۆستایەتیی و متمانەی کورد بکەن . لە کۆتایی ١٩٣٠یەکاندا ، لێپرسراوانی کورد ئەو باوەڕەیان پەیداکرد کە خولیا و ئومێدە نەتەوایەتییەکانی کورد لەو هەلومەرجە پڕئاکۆکییەی جیهاندا نایەتەدی . گومانی تێدا نیە کە هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانیی ئەو دەرفەتەی بۆ هێنانە ئارا کە هەستیان دەکرد دەمێکە چاوەڕێی بوون .

ڕاگەیاندنەکانی هاوپەیمانان لە کاتی جەنگدا و نێوەرۆکی هەموو ئەو

---

[1] William Thomson, "Nationalism and Islam ," in Nationalism in the Middle East ( Washington D.C: Middle East institute, 1952), 58.

پرۆپاگەندانەی لە کاتی جەنگدا هاوپەیمانان دەیانکرد ، جارێکی دی هیوای کوردی ژیاندەوە بەوەی چاوەڕێی هێندێك بایەخ و بگرە جێبەجێکردنی بەشێك لە خواستە نەتەوایەتییەکانیشیان دەکرد . هەمان کات ، ئەوان بیریان لە دۆستایەتیی و پشتگیریی یەکێتی شورەویی دەکردەوە و بەدەستیشیان هێنا .تێپەڕینی خێرای ڕووداوەکان سەرەتایەك بوو ، تێکچوونی پەیوەندییەکانی کورد و ڕۆژئاوای تێدا دەردەکەوت ، لە لایەکی تریشەوە ، دۆستایەتیی نزیکییان لەگەڵ یەکێتی شوورەوییدا دەستپێکرد .

لە دوو بۆنەی بایەخدار و هەستیاردا ، یەکێتی شوورەویی لەمەڕ کورد بەتوندی پێچەوانەی هەڵوێستی ڕۆژئاوا وەستایەوە . لەکاتی ڕاپەڕینی بارزانیی لە ساڵی ١٩٤٣-١٩٤٥ دا ، بەریتانییەکان لەپاڵ حکومەتی بەغدا دژی ڕاپەڕیوان وەستانەوە ، هەروەها لە کاتی دامەزراندن و ڕووخاندنی کۆماری مەهاباددا ، هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکان پشتگیریی حکومەتی ئێرانیان دژی ڕژێمەکەی مەهاباد کرد.لە هەردوو حاڵەتەکەدا شوورەویی هەڵوێستێکی دۆستانە و هاوسۆزانەی لە هەمبەر کورد پێشاندا ، هەروەها لەمەڕ پرسی مەهاباد گومانی هاوکاریی و هاندانی شورەوییەکان بۆ نەتەوەخوازانی کورد لەئارادایە . پەنادانی مەلامستەفا و هاوەڵانی لەلایەن شوورەوییەوە پاش ڕووخاندنی مەهاباد، هەروەها پشتگیریی و هاندانی خولیا و ئومێدی نەتەوایەتیی کوردیی لەلایەن یەکێتی شوورەوییەوە ، ئەوەی بۆ کورد لە ڕێگای بڵاوکراوەکان و هەڵمەتەکانی دەزگای ڕادیۆییەوە بەدیارکەوت . هەروەها لە ڕێگای چالاکی پارتە کۆمۆنیستە خۆجێیەکانەوە ، ئەمانە هەموویان ڕازەیان بە نزیکبوونەوەی کورد لە یەکێتی شوورەویی کرد .

گومانی تێدا نیە ، کێشەی کورد یەکێکە لە ئاماەترین و مەترسیدارترین گرفتە ئاڵۆزەکانی ئەمڕۆی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کە ململانێ و کێشمەکێشی لەسەرە . بەتایبەت لەپاش کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییەوە ، بەشێوەیەکی بەرچاو سەرنجی حکومەتە بەرژەوەندییدارەکان و هەروەها بایەخدار و کۆڵەرانی کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان ڕاکێشاوە . (مالکوڵم بوو) کۆڵەرێکی بەریتانییە، وادەبینێت کە گرفتەکە لەبنەڕەتدا بریتییە لە ڕامکردنی گەلێکی خاوەن کەلتووری چیایی و ڕاکێشانی بۆ نێو جیهانی هاوچەرخ . بەو سیستمە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەوە کۆنەوە ، لە پرۆسەی داڕمان و هەڵوەشانەوەدا ، پێویستە هێندێك ڕێگا بۆ جێگیرکردنی کورد و بەستنەوەیان

به جیهانی هاوچەرخەوە ببینرێتەوە .بە گوێرەی ئەو ، ڕاپەڕینە جۆربەجۆرەکانی کورد بەرجەستەی خۆراگریی و بەرووداراوەستانی پیاوانێکی ئازا و سەرەتاییە بەدژی پەلاماری توندی هێزگەلێکی نەناس و نامۆ لەو ناوچەیەدا .[1]

هەروەها (مۆرگان فلیپ پرایس) ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانیی و ئەندامی پارتی کرێکارانە لە پارلەمان ، لە ناوەڕاستی ١٩٤٠ەکاندا ، گرفتی کورد بەشێوەیەکی سەرەتایی وەك گرفتێکی کۆمەلایەتیی و ئابووریی دەبینێت .ئەو بڕوای وایە ئەم گرفتە بەشێکە لە گرفتی تێکڕای ئەو کۆچەرانەی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا هەن . بەگوێرەی ئەو :" ئەو گەلەی بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە چارەسەری ئەو گرفتەی کرد ...ڕووسەکان بوون . چونکە ئەوان وەك گرفتێکی سەربازیی و لەڕێی هەلمەتێکی سەربازییەوە چارەسەریان نەکرد ، بەلکو وەك گرفتێکی ئابووریی کە پەیوەندیی بە برسێتیی خێلەکانەوە بوو مامەلەیان لەگەل کرد ." بە بۆچوونی ئەو ، هەرچەندە هێندێك جار سزای جەردەیی پێویستە ، بەلام وەك سیاسەت بێسوودە .[2]

هەروەها لە ناوەڕاستی ١٩٤٠ەکاندا ، (ئێچ . ئێم . بورتۆن) ئەفسەری ڕامیاریی پێشووی بەریتانیی لە عێراق ، بڕوای وایە کە بەزۆر هەلوەشاندنەوەی خێلەکانی کورد کارێکی هەلەیە و پێویستە بەرنامەیەکی ئاشتییانە بۆ جێگیرکردنیان بدۆزرێتەوە . ئەو جەخت لەوە دەکاتەوە کە کلیلی چارەسەری نیشتەجێکردنی کورد خۆی لە پەرەسەندنی پەیوەندییەکان و بلاوکردنەوەی فێرکردن و خوێندەوارییدا دەبینێتەوە .[3]

بەگوێرەی کۆلۆنێل (دەبلیو . جی . ئێلفینستۆن) یەکێتییەکی ڕۆژهەلات ناوەڕاستیی لەو ولاتانە پێکبێت کە کوردیان تێدایە ، بەشێوەیەکی مەزن بەشداریی لە چارەسەرکردنی گرفتی کورددا دەکات . ئەو لایەنگریی لە یەکێتی گومرگ و پاسپۆرت لە نێوان ئەو ولاتانەدا دەکات بۆ ئەوەی لەمپەری سنوور لەبەردەم کورداندا لە ولاتێکەوە بۆ

---

[1] Burr, 289-292.

[2] M. Phillips Price, " On Kurdish Rising in Persia ," letter to the editor ,Times (London), Apr.24, 1946 .

[3] H.M. Burton ," The Kurds, " Journal of the Royal Central Asian Society 31.part (Jan.1944):64-73.

ولآتێکی تر نەهێڵێت و بتوانن بەشیان لە قازانجی گەشەکردنی ئابووریدا هەبێت . ئێلفینێستۆن گومانی ئاشکرای خۆی لەسەر کرداریی بوونی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی دەربڕی . بە بۆچوونی ئەو ، لەمپەری جوگرافیایی، مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی لە رووی ئابوورییەوە دەکاتە مەسەلەیەکی نەشیاو و نەگونجاو .[1]

هەموو ئەو نووسەرانە جەختیان لە بوار و لایەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی کێشەی کورد کردۆتەوە . وێڕای گرنگی ئەم لایەنانە ،پێویستە ئەوە لەبیردا بچەسپێنرێت ، نەتەوایەتیی کە ریشەی کێشەی کورد پێکدەهێنێت ، بەشێوەیەکی بەرفراوان سروشتێکی رامیاریی و دەروونیی هەیە . هەر چارەسەرێکی گرفتی کورد پێویستە ئەم هۆکارە رامیاریی و دەروونییانە لەبەرچاوبگرێت .

(پیەر راندۆت) کە یەکێکە لە باشترین نووسەرە شارەزاکانی کاروباری کوردیی ، چەندین جار هانی رۆژئاوا و بەتایبەت ولآتە یەکگرتووەکانی داوە کە بێنە پێشەوە و شتێك بۆ کورد بکەن .ئەو زیاتر لەوەش پێی لێداگرتووە و دەڵێت کە دەوڵەتانی رۆژئاوا بەگشتیی و بەریتانیاش بەتایبەتیی ، سیاسەتەکانی خۆیان لەسەر کورد ملکەچی ئەو سیاسەتانەیان کردوە کە لەهەمبەر عەرەب گرتوویانەتە بەر .[2]

شۆڕشی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق کە کورد و کۆمۆنیستەکانی لەو ولآتەدا هێنایە پێشەوە ،کێشەیەکی بایەخداری هێنایە ئارا، داخۆ عێراق وەك بنکەیەك بۆ چالاکییە نەتەوایەتییەکان بەکاردەهێنرێت ، ئەگەر وابێت ، داخۆ جوڵانەوەی نەتەوایەتیی کوردیی لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە بارگاویی و رام دەکرێت .

لێکدانەوەی کەرەسەیی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو دەرئەنجامە مسۆگەر دەکات کە کورد نەتەوەیەکی دیار و ئاشکرا پێکدەهێنن ، هۆش و ئاگایەکی بەهێزیان سەبارەت بە نەتەوایەتیی خۆیان هەیە، هەروەها جوڵانەوە نەتەوەییەکەشیان رەگێکی قووڵی لەو باوەڕ و خولیایانەوە وەرگرتووە کە زادەی نەتەوایەتییەکەیانە .هۆکاری کاریگەریی هاوبەستەگیی و وەفاداریی خێڵەکیی تا دێت بەردەوام رۆڵی کەمتر دەبێتەوە ، ئەوەش بەهۆی کاریگەریی شارستانیەتی هاوچەرخ کە لە رۆژهەلآتی ناوەڕاستدا خەریکی

---

[1] Elphinston, " Kurds and the Kurds Question ."47-49

[2] Rondot , " La nation Kurde ," 55-69 .. Pierre Ronsot . , " Kurdes et communism dans le proche Orient ," la Vie Intllectuel (Parise) 26( Jan. 1959): 109-11.

گۆڕینی کەلتووری سیستەمی باوکسالارییە .

بەشداریی کورد لەگەڵ ئەو نەتەوانەی دیکەی لەژێر دەسەڵاتی بێگانەدا بوون ، بەهەمان خولیا و ئومێدی بەدەستهێنانی ئازادیی و بەدەستەوەگرتنی ئایندەی رامیاریی خۆیان بوو. کاردانەوەی تورک ، ئێرانییەکان و هەروەها عەرەب لەهەمبەر خولیا نەتەوایەتییەکانی کورد مەسەلەیەکی گرنگە ، بەڵام سەرکەوتن یا شکستی کورد بەدەستهێنانی ئامانجەکەیاندا ، بەشێوەیەکی بەرفراوان پشت بە هەلومەرجەکانی نێودەوڵەتیی لەو ناوچەیەی جیهاندا دەبەستێت کە ئەوانی تێدا دەژین .

وەک ئەوەی لە هەرێمەکانی دیکەدا هەیە ، هۆکاری سەرەکیی بڕیتی دەبێت لە سیاسەتەکانی هێزە جیهانییە هەژمونگەرەکان ، کە دەگونجێت هانی خولیا نەتەوایەتییەکانی کوردان بدەن یاخود خۆیانی لێ دوور بگرن و پشتگوێی بخەن ، هیچ کەس ناتوانێت پێشبینیی ئەوە بکات داخۆ ئەم سیاسەتانە لە ئایندەدا چۆن دەبێت .

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵیداوە کە لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی رابردوودا مامەڵە لەگەڵ گرفتی کورددا بکات ، نەک تەنیا سەبارەت بەو دەوڵەتانەی کوردیان تێدا نیشتەجێیە ، بەڵکو سەبارەت بە زلهێزەکانیش ، بۆئەوەی دەرکەوێت کە هیچ وڵاتێکی سەرەکیی خاوەن بەرژەوەندیی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا باری پشتگوێخستنی گرفتی کورد هەڵگرێت یاخود خۆی لە فۆرمەڵەکردنی سیاسەتێکی کوردیی وەک بەشێک لە سیاسەتە گشتییەکەی لەمەڕ رۆژهەڵاتی ناوەراست بەدوور بگرێت

